# پیاوان و ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر ﷺ

چاپی سێیەم






ئامادەکردنی
سەعد یوسف ئەبو عەزیز

وەرگێرانی
ئاشتی ئارا حمه سەعید

# پیاوان و ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ)

ئامادەکردنی : سعد یوسف ابو عزیز
پێشەکی : مامۆستا حسن أیوب
وەرگێڕانی : مافناس تارا حمه سعید حمه کریم

بسم الله الرحمن الرحيم


**ناوی کتێب**

پیاوان و ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر( ﷺ )

**ناوی نوسەر**

سعد یوسف ابو عزیز

**ناوی وەرگێر**

مافناس تارا حمــه سعيد حمه كريم

**تیراژ**

١٠٠٠ دانە

**ژمارەی سپاردن لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکان**

(١٨٦٧)

**ساڵی چاپ و نۆرەی چاپ**

چاپی سێ یەم ی ساڵی ٢٠١٣

**چاپ و تەجلیدی ڕێ نوێ دیزاینی کردووە**

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێشەکی وەرگێڕ:**

**ئەی ئەوانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا وێڵ و سەرگەردانن و هاوەڵێکی هەق نیە دەستتان بگرێت و ڕێگای ڕزگاری و خۆشبەختی تان نیشان بدات ..**

**بۆ من و بۆ ئێوەش نزیکترین هاوەڵ .. ڕۆشنترین چرای ڕێگا و دڵسۆزترین برا .. و ڕاستگۆترین ئامۆژگاریکەر .. و شیاوترین پێشەنگ هەر ئەو یارانەی ئازیزمانن ( ﷺ ) کە پەیمانی فیداکاری خۆیان بە کامڵترین شێوە نیشانی مێژوودا ئەوان لە لوتکەدا بوون لە ئاکاری جوان و بێ وێنەن لە پیادەکردنی واتا و مەبەستەکانی شەریعەت لە خۆیاندا بەڕادەیەك بۆ هەندێ کەس بڕواکردنی مەحاڵە..**

**بەڵام ئایا بۆ ئەوانەش مەحاڵە کە ڕاستگۆیانە دەیانەوێ سەر مەشقێکیان هەبێ لەهەر لایەنێك لە لایەنەکانی ژیاندا ، لە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی ( ﷺ )، لە خۆشویستنی زانست و هەوڵدان بۆی ، لە مەیدانی گیانفیدای و خۆنەویستی و پشت بە خوا بەستن و لە سەرجەم واتا جوانەکانی تری ژیاندا ..**

**هەر بەو ئامانجە و بە هیوای ئاوێتە بوون لەگەڵ ئەو چاخە زێڕینەدا هەوڵسام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەنرخە تا بەرهەمێك زیاد کەم بۆ کتێبخانەی کوردی و بە ئومێدی ئەوەی بتوانین بیانکەینە چاوساغ و پێشڕەومان و شوێنپێی ئەوان بگرین لە ئامانج و هەنگاوەکانماندا و لە پەروەرگاری مەزنیش داواکارم بیکاتە توێشوویەك بۆ قیامەت** "آمين"

" وَاللَّهُ مِنْ وَرَاء القصد "

وەرگێڕ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سەرەتایەك**

**بە پێنووسی: مامۆستا حسن ایوب**

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان ، تەوەکولم بەوە و پشت بەستنم هەر بەو زاتەیە . شایەتی دەدەم لە سەرتاك و تەنهایی خودا و شایەتی دەدەم کە بێ هاوتاو هاوەڵەو و هەموو کاروبارەکانی هەردوو جیهان لە دەستی ئەو دایە ..

وە شایەتی دەدەم کە ( محمد ﷺ ) بەندە و نێردراو و خۆشەویستی خوایە و هەڵگری ئالآی ستایشە لە ڕۆژی پەسلآندا . درووود و سەلامی پەروەردگار لەسەر پێغەمبەر و ئەهل و یارانی و شوێنکەوتوانی بە چاکە لە هەموو حاڵ و لە هەموو کاتێکدا.

وە پاشان ...

برای بەڕێزمان ( سەعید یوسف ئەبو عزیز ) لەناو برایان و هاوەلآنیدا بە کەسێکی باش ناسراوە ، هەروەك خاوەنی ڕێبازێکی دروستە و پێداگرە لەسەر شوێنکەوتنی سوننەت و دژایەتی کردنی بیدعە ، چەند بتوانێت هەوڵی پێشکەشکردنی سوود و خەیر و ڕێنموونی دەدات بۆ هەموو موسڵمانێك .

وە ئەمە ماوەیەکە بەردەوام پەرتووکی سوودمەند ئاسانکراو پێشکەش دەکات .

جا هەندێ لەو پەرتووکانە لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی هەندێ پەرتووکی ترە کە کەسانی دیکە دایانناون هەڵساوە بە تەخریجی ئەو فەرموودانەی کە لەو پەرتووکانەدا تەخریجیان بۆ نەکراوە ، بڕێکی تریان لە کۆشش و کۆ کردنەوە و دانانی خۆیەتی ، کۆتا پەرتوکیشی ئەمەیە کە لەبەردەستاندایە بەناوی " پیاوان و ئافرەتانێکی نموونەیی لە دەوری پێغەمبەردا ﷺ " .

هەڵساوە بە هەڵبژاردنی سەد کەسایەتی لە هاوەلآنی بەڕێزی پێغەمبەر ( ﷺ ) و ئەو فەرموودە و چیرۆك ( ریوایەت ) و ڕووداوانەی کۆ کردوەتەوە کە بەشداری یان لە دەرخستنی ئەم کەسایەتی یانەدا کردووە کە دوای پێغەمبەران و نێردراوانی خوا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نموونەیان نی یە ، هەروەك ئیبن مەسعود خوا لێ ی ڕازی بێت دەڵێت : " هەر لە نێوەندی لێکۆڵینەوەی ئەم کەسایەتی یانەدا ئەو ڕەوشت و ئاکارانە

ئاشکرا دەبن کە پێیان ڕازابوونەوە و هەر بەو هۆیەشەوە بوو بوونە باشترین ئوممەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا " .

هەروەها هەموو ئەم پایە بەرزی و چاکە و ڕەوشتانەی لەم هاوەڵانەدا هەبوون و باسکراون بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو هاوەڵانەش کە ناویان نەبراوە لەسەر هەمان ڕێباز و ڕەوشت و خۆپارێزی و باوەڕ و تەقوا بوون ، هەروەها بەهەمان شێوە پابەند بوون بە هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، وە بە هەموو ئاکارێکی گەورە و بچوك کە لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) فێری بووبێتن .

ئێمەش لەلای خۆمانەوە هیوادارین خوای گەورە یارمەتی ئەم دانەرە بەڕێزە بدات تاوەکو لەسەر ژمارەیەکی زیاتر لەهاوەڵانی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ( ﷺ ) بنوسێت ، خوا یار و یاوەری بێت بۆ ئەوەی زیاتر سوود بە ئیسلام بگەیەنێت و ئیسلام زیاتر پێیان بەهێز و بە تینتر بێت .

آمین ..

حسن أیوب

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

" لە نێو دەستی ئەم پەرتووکەدا "

سوپاس و ستایش بۆ پەروەدگاری هەردوو جیهان ، وە درود و سەلام لەسەر ئەو کەسەی وەك رەحمەت نێراوە بۆ مرۆڤایەتی ، گەورەمان محمد ﷺ و لەسەر ئەهل و یارە پاك و فەزڵو گەورەیی و لەسەر شوێنکەوتووانیان بە چاکە تا رۆژی پەسڵان .

لە پاشدا ... بێ گومان نووسین لەسەر مێژووی ئیسلام و بژار کردنی راوییەکانی و سۆراخ کردنی کەلتوری ئیسلامی کارێکی ئاسان نیە ، هەروەك رووبەرووبوونەوە لەگەڵ ئەو جیاوازی و ناتەبایی یانەی لە نێوان هاوەڵە بەرێزەکاندا رووی داوە پێویستی بە زانیاری یەکی پتەوو وێژەیەکی بەهێز هەیە بەو پێیەی کە چەندین زیادەی زیادەری خراوەتە سەر کەروونیی ژیانی تێك داوە و ئەدەبی خراپ کردووە و لە پلەو پایەی زانایان و پێشەنگانی هێناوەتە خوارەوە و بەمەش هەندێ نەزان فریودراون و رێگای تێگەیشتنیان ون کردووە و لە رێی راست لایانداوە و باوەڕیان بەم ساختە گوماناوی یانە هێناوە .

ئەمە و " خانەی – ئەلفەجری تایبەت بەکەلتور " بە نیازی ئەوەی وێنەیەکی راستەقینە لە ژیانی هاوەڵان بە پیاو و ئافرەتەوە نیشان بدات وەك بەشداری کردنێك لە بڵاو کردنەوەی هۆشیاری راست و دروست و تێگەیشتنێکی روون بۆ ئەم دینە و شوێنکەوتوانی ، داوای لێ کردم هەڵسم بە دانان و رێکخستنی ئەم پەرتووکە " رجال و نساء حول الرسول ﷺ "

منیش لەبەر ئەوەی هەستم بە گرانی و سەختی ئەم سپاردەیە و ئەو بەرپرسیارێتی یە گەورەیە کرد لە ئاستیدا ، هەر زوو پەنام بردە لای خوای گەورە و داوای یارمەتیم لێ کرد و ئەوپەڕی توانام خستە کار بۆ ساغکردنەوەی ریوایەتەکان .. وە هێشتا خۆم بە بێ دەسەڵات و ناتەوان دەزانم لە ئاست بابەتەکەدا ، بەڵام ئەوەندەم بەسەکە هەوڵی خۆم بۆ داوە ، بێ گومان کەماڵییش هەر بۆ خوایە ، بەو پەڕی دڵنیاییم لە وتەی شاعیر کە دەڵێت : –

سيبقى الخط بعدي في الكتاب　　　و تبلى اليد مني في التراب

فيا ليت الذي يقرأ كتبتبو　　　دعالي بالخلاص من الحساب •

" لە کۆتاییدا ، تەنها خوا ئاگای لەمەبەستەکانە .

سعد يوسف محمود ابو عزيز　　　نووسیویەتی

● واتە : پاش خۆم نووسینەکەم لە پەراوەکەدا دەمێنێتەوە　　　وە دەستم لەناو خاك و خۆڵدا تیادەچێت

سا خۆزگە ئەوەی نووسینەکەم دەخوێنێتەوە　　　دوعای ئەوەی بۆ دەکردم لە لێپرسینەوە رزگارم بێت

# " فەزڵ و گەورەیی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت "

خوای پەروەردگار دەفەرموێت : -

﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ سورة التوبة آية ١٠٠ .

**واتە : خوای گەورە لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەتکردنی ئیسلامدا لە کاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی بەرێك و پێکی پێشیانکەوتوون ، ڕازی بووە ئەوانیش لەو ڕازی بوون ، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون چەندەها ڕووبار بەبەردەم کۆشکەکانی وبەژێر درەختەکانیدا دەڕوات ، بەنەمری و هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە ئەو سەرئەنجامە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە .**

**(تێبینی: بۆ مانای ئایەتەپیرۆزەکان پشتم بە تەفسیری ئاسانی- بورهان محمد امین- بەستووە . وەرگێڕ)[1]**

**پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی :** ( إن الله تَبارَكَ وَ تَعالى اختارني و اختار لي اصحاباً فجعل لي منهم وزراء و أنصاراً و اصهاراً ، فمن سبهم فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس اجمعين ، لا يقبل منه يوم القيامة صرف و لاعدل ) [2] .

**واتە : خوای پەروەردگار منی هەڵبژاردووە ، وە هاوەڵانێکی بۆ من هەڵبژاردووە کە لە ناویاندا هەندێکیانی بۆ کردووم بە وەزیر و پشتیوان و خزم و کەس ، لەبەر ئەوە هەر کەسێ جنێویان پێ بدات ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرەو و لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ پەرستشێکی لێ وەرناگیرێت ، نە ئەوەی فەرز و گەرەك کراوە و نە ئەوەیش سوننەت و خۆ نزیك کردنەوە یە لە خوا ) .**

**هەروەها لە ئەبو موسای ئەشعەری یەوە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ڕیوایەتکراوە کە پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموویەتی :** ( النجوم أمنة للسماء ، فإذا ذهبت النجوم آتي السماء ماتوعد ، و أنا أمنة لأصحابي فاذا ذهبت أتي أصحابي مايوعدون ، و أصحابي أمنة لأمتي ، فإذا ذهب أصحابي ، أتي أمتي مايوعدون ) [3] .

---

[1] شوێنیانکەوتوون .

[2] - حاکم ڕیوایەتی کردووە ، دەڵێت : ئیسنادەکەی صەحیحە و ذهبیش هەمان ڕای هەیە ( ٣ / ٦٢٣ ) .

[3] - صحیح مسلم .

واتە : ئەستێرەکان ئارامی بە ئاسمان دەبەخشن ، خۆ ئەگەر ئەستێرەکان لە ناوچوون و نەمان ، ئەوا ئەو وادەیەی بۆ ئاسمان دانراوە دێتەدی [1] ، وە من ئارامی بە هاوەڵانم دەبەخشم ، هەر کاتێ ڕۆیشتم و بە لیقای خوا گەیشتم ئەوا ئەو وادەیەی بە هاوەڵانم دراوە دێتە دی [2] وە هاوەڵانم مایەی هێمنی و ئارامین بۆ ئوممەتەکەم و بە نەمان و وەفاتی ئەوان ئەو وادەیەی بۆ ئوممەتەکەم دانراوە دێتە دی ) .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( تزالون بخير مادام فيكم من رآني و صاحبني ، والله لاتزالون بخير مادام فيكم من رأى من رآني و صاحب من صاحبني ) [3] .

واتە : لە خێر و چاکەدان تا لەناوتاندا کەسانێك هەبن کە منیان بینیوە و هاوەڵایەتی یان کردووم ، سوێند بە خوا لە خێر و چاکەدان تا کەسانێك لەناوتاندا هەبێ چاویان بە کەسانێك کەوتووە کە چاویان بە من کەوتبێ و هاوەڵایەتی کەسانێکیان کردبێ کە هاوەڵانی من بوون ) .

ئیبنو مەسعود ( ڕەزای خوای لێ بێت ) فەرموویەتی : ( خوای تەعالا سەیری دڵی بەندەکانی کرد ، بینی دڵی محمد (ﷺ) باشترینی دڵەکانە ، لەبەر ئەوە هەڵی بژارد بۆ خۆی و پەیامەکانی خۆی پیادا نارد ، پاشان لە دڵی بەندەکانی ڕوانی ، بینی دڵی هاوەڵان باشترینی دڵەکانن ، بۆیە کردنی بەوەزیر و دەستە ڕاستی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) تاوەکو لە پێناو ئایینەکەیدا جیهاد بکەن . هەر بۆیە ئەوەی موسڵمانان بە باشی بزانن ، ئەوە لای خودایش باشە ، وە هەرشتێ موسڵمانان بە خراپی بزانن ئەوە لای خوداش خراپە ) [4].

هەروەها عبدالله کوڕی عمر ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) فەرموویەتی :

( هەرکەسێ لە ئێوە ویستی ڕێگایەك بۆ خۆی هەڵبژێرێ تا بیگرێتەبەر ئەوا با ڕێگای ئەوانە بگرێتەبەر کە وەفاتیان کردووە ، ئەوانە هاوەڵانی ( محمد (ﷺ)) باشترین

[1] - واتە : هەتا ئەستێرەکان بیننەوە ئاسمانیش دەمێنێتەوە ، هەر کاتێ ئەستێرەکان هەڵوەرین و لە جێ ی خۆیان نەمان ئەوا ئاسمانیش دەقڵیشێت و درز دێنێت .

[2] - واتە من لە فیتنە و هەڵگەڕانەوە و جیاوازی دڵەکان دووریان دەخەمەوە .

[3] - فەرموودی ( حسن )ە : ئیبنو ئەبی شەیبە لەوائیلەی کوڕی ئەسقەعەوە ڕیوایەتی کردووە . لە ( روضة المعبين ) ی ( العدوی ) پەڕە ( ٩٠ ) وەرگیراوە .

[4] - احمد و بزار و طبرانیش لە (الکبیر)دا ڕیوایەتیان کردووە و پیاوانی جێ متمانەن. الجمع (١/١٧٧).

کەسی ئەم ئومەتەن ، خێرۆ مەندترینی دڵەکانن ، زاناترینیانن و کەمترینیانن لەوەی لە خۆ بگۆڕێن . ئەوانە کەسانێکن خوای پەروەردگار بۆ هاوەڵایەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و گەیاندنی ئاینەکەی هەڵی بژاردوون ، دە ئێوەش ڕەوشت و ڕێگای ئەوان هەڵبگرن ، چونکە ئەوان هاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) بوون لەسەر ڕێگای ڕاست سوێند بە خوای پەروەردگاری کەعبە )[1]

وە لە ( ئەبی راکە )وە فەرموویەتی : ( لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبوتالیب دا بوون ( ڕەزای خوای لێ بێت ) نوێژی بەیانیم کرد ، کاتێ ڕووی لە لای ڕاست وەرگێڕاو سەلامی دایەوە وەك ئەوەی پەرێشان بێت ، مایەوە تاوەکو خۆردای لە دیواری مزگەوتەکەوە هێندەی ڕمێك بەرز بووە وە ئەو جادوو ڕکات نوێژی تری کرد [2] . پاشان ( ئەبی راکە ) دەستی دا بەدەستدا ( وەك ئەسەفێك ) وتی : سوێند بەخوا هاوەڵانی ( محمد م (ﷺ)) ئاوا بینی کەچی لەم ڕۆژگارەدا هیچ شتێك نئەبونم وەك ئەوان بێت . ئەوانە کاتێ ڕۆژیان دەکردەوە هەڵبزرکاو و سەرو قژ تۆزاوی بوون ، لە نێوان چاوەکانیاندا نیشانەیەك هەر وەك چۆکی بزن هەبوو [3] ، بەردەوام تا بەیانی خەریکی پەرستش و[4] بردن بوون و ئەو بەیان دەکرد لە نێوان نێوچەوان و پێیەکانیاندا (مەبەست هەڵسانەوە و دانیشتن و کڕنوش بردنی نوێژە ) کاتێکیش ڕۆژیان لێ هەڵدەهات و یادی خوایان دەکرد سەریان دەجولاند و ڕاست و چەپیان پێ دەکرد لەبەر زۆریی ملکەچی یان ( خشوع ) هەروەك جووڵەی درەختەکان لە ڕۆژی ڕەشەبادا ، چاوەکانیان بەردەوام فرمێسکی دەڕشت تاوەکو جلەکانیان تەڕ دەبوو ، سوێند بەخوا ئەڵێ ی ئەم خەڵکە [5] بێ ئاگا بوون . پاشان هەڵسا و

---

[1] – ئەبو نعیم لە (الحلیه) (٣٠٥/١) دا ڕیوایەتی کردووە.

[2] - لە فەرموودەدا هاتووە : ( من صلي الصبح في جماعة ، ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ، ثم صلي ركعتين ، كانت له كأجر حجة و عمرة ، تامة تامة تامة ) . فەرموودەی حەسەنە لە صەحیحی تیرمیزی ( ٤٨٠) وەرگیراوە ، ماناکەی : هەر کەس نوێژی بەیانی بە جەماعەت کرد و دانیشت و خۆی بە یادی خواوە خەریك کرد تا خۆرهەلاتن ، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد ، ئەوە پاداشتی وەك ئەوە یە حەجێك و عەمرەیەکی ئەنجام دابێ ، بەتەواوی ، بەتەواوی ، بەتەواوی )

[3] - جۆرێکە لە مەڕومالاتی تورکن ، مەبەست ئەوەیە شوێنەواری سوجدە بردن بە نێو چاوانیانەوە دیارە .

[4] – سەجدە .

[5] - مەبەستی ئەو هاوڕێیانەیەتی کە لەو ڕۆژەدا لەدوایەوە نوێژیان دەکرد .

دوای ئەوە نە بینرا پێ بکەنێت و هەر خەمبار بوو تاوەکو ئیبن مەلجەمی دوژمنی خوای لە دین دەرچوو شەهید کرد )[1] .

هەروەها پێشەوا حەسەنی بەصری ستایشی هاوەڵان بەم جۆرە دەکات : –

پێشەوا ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت : سوێند بەخوا بە چەندین کەسایەتی گەشتووم و هاوەڵایەتی چەندانیانم کردووە ، نەمدەبینی هەرگیز بۆ هیچ شتێکی دنیا کە بەرەو ڕوویان دەهات خۆشحاڵ بن ، و هەرگیز بە هیچ شتێکی دنیایی خەفەتیان نەدەخوارد گەر پشتی لەوان بکردایە . خۆشیەکانی دونیا لەم بێنرختر بوو لەلایان . هەیانبوو پەنجا ساڵ دەژیا ، لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵە لە تەمەنەیدا بەرگێکی هەڵگیراوی نەبوو ، وە هیچ سینی یە خۆراکێکی ( قدر )ێکی[2] بۆ دانەنرا وە هیچ شتێکی لە نێوان خۆی و زەویدا دروست نەکرد بوو[3] هەروەك هیچ كاتێك فەرمانی نەكرد بوو خواردنێك لە ماڵیدا دروست بكرێ كاتێكیش شەو دادەهات خەریكی ( شەو نوێژ ) بوون و بەردەوام سوجدەیان دەبرد . فرمێسكەكانیان بە ڕومەتیاندا دەهاتە خوارەوە و خەریكی موناجاتی خوای خۆیان بوون تا لێیان خۆش بێت ... كاتێ چاكەیەكیان دەكرد بە بەردەوام سوپاسی خوایان لەسەر دەكرد و داوای قبوڵ كردنیان لێ دەكرد ، كاتێكیش خراپەیەكیان ئەنجام بدایە زۆر خەفەتباری دەكردن و داوای لێخۆشبوونیان لە خوا دەكرد .. ئەوان بەردەوام لەسەر ئەو ڕێیە بوون سوێند بێ بە خوا ئەوانە تەنها بە داوای لێخۆشبوون و پاڕانەوە لە خوای خۆیان دەكرد ، ئێوەش ئێستا لە دەرفەتێكی كورت و كردەوەیەكی پارێزراو و هەڵگیراودان . سوێند بێ بە پەروەردگار مردن وا لەگەردنتاندا و ئاگریش لە نێو دەستتاندایە ، دەی هەموو كاتێك چاوەڕێی قەزا و بڕیاری خوای گەورە بن )[4] . ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون (ﷺ) ، جا كێ هەیە ئاستی باوەڕی بە پلەی باوەڕ و ئیمانی ئەوان بگات و خۆی بدات لە دڵسۆزی ئەوان بۆ ئاینەكەیان ، ئەوانە كەسانێك بوون كە : –

---

[1] - ئیبن ئەبی دونیا و ئەبو نعیم لە ( الحلیة ) ٨ / ٦ و ( البدایة و النهایة ) ١ / ٧٦ ڕیوایەتیان كردووە .

[2] - خوانێكی ڕازاوە .

[3] - مەبەست ئەوەیە هەرگیز پەیوەندیەكی لەگەڵ زەویدا دروست نەئەكرد وای لێ بكات پەیوەست بێ پێیەوە ، بەڵكو وەك ڕێبوارێك بوو . (وەرگێڕ)

[4] - كتێبی ( الزهد )ی حسن بصری لاپەڕەی ٣٠ / ٣١ . چاپی دار الحدیث .

" کاتێ خەڵکی لە ڕووی دەرەوەی دنیای دەڕوانی ئەوان سەیری ناو کرۆکی دنیایان دەکرد ، کاتێ خەڵکی سەیری ئێستای دونیایان دەکرد ، ئەوان سەیری داهاتوویان دەکرد ، بۆیە لەهەر شتێکی دنیایی کە ترسی ئەوەیان لێ ی هەبوایە عەیبداریان بکات لە دڵیاندا دەیانمراند و ئەوەی دەیانزانی وازیان لێ دێنێ ، وازیان لێ دەهێنا تاوەکو زۆریی و کەمیی دنیا لایان وەك یەك بوو و باسی دنیایان لە لا وەك شتێکی گوزەراو و تێپەڕ بوو وا بوو . دنیا لە لای ئەوان گوزەرا بوو ڕۆیشتبوو هەرگیز بە دوایدا نە ئەگەڕان تا تازەیکەنەوە وە لە دڵ و دەرونیاندا مرد بوو ، زیندوویان نەدەکردەوە ، بەڵکو دەیانڕماند و ئاخیرەتیان پێ بینا دەکرد، وە دەیانفرۆشت و بەنرخەکەی شتێکیان پێ کڕی کە بۆیان دەمێنێتەوە و بەسەر ناچێت ، ئەوان کەسانێك بوون ، دنیایان ڕەفز کرد بوو ، هەر ئەوانیش لە دنیادا ئاسوودە بوون . خوای خۆیان خۆش دەویست حەزیان بە یاد کردنی بوو ، داوای ڕووناکی ئەویان دەکرد ، هەر بەو دنیایان ڕووناك دەکردەوە . هەواڵێکی سەر سوڕهێنەریان هەیە ، هەروەك هەواڵی سەر سوڕهێنەریان لە لایە : – " قورئان " بە ئەوان هەڵسایەوە هەروەك ئەوان بە قورئان هەڵسابوونەوە ، وە ئەوان زمانحاڵی قورئان بوون ، هەروەك بە قورئان دەکەوتنە ئاخاوتن . لە ڕێ ی ئەوانەوە بەرنامەی خوا بە خەڵکی گەیەنرا و هەر بەقورئان و بەرنامەی خوا ڕەفتاریان دەکرد لە پاڵ ئەو بەهرە و خەڵاتەی بە دەستیان هێنا بوو ، وە پێی گەیشتبوون چاو لە دوای هیچ بەهرەیەکی تر نەبوون ، ئارامیی یان تەنها لەو نزاو پاراوەکانی خۆیاندا دەدیەوە ، ترسیشیان تەنها لەوەدا دەدیەوە کە خۆیان لێی لادەدا و ئاگاداری بوون [1] – کە سزای خوایە – " .

" ئەوان بەڵگەی خودان بەسەر خەڵکەوە ، کراسی نوری درەوشاوەی لە خۆشەویستی خۆی بەباڵادا کردوون و ئاڵای ڕێنمونی بۆ درێژە پێدان لەسەر بەرنامەکەی بۆ بەرز کردوونەتەوە ، سەبر و ئارامیی پێداون لەسەر لانەدان لەو ڕێیە ، وە بە چاودێری کردنیان جەستەیانی پاك کردووەتەوە ، هەروەك بە خۆشەویستی خۆی ڕازاندونیەتەوە ، پاشان لە تفاقی غەیب و دنیای شاراوەی بەدڵەکانیان سپاردووە تا پابەند بێت بە درێژە پێدانی ئەو خۆشەویستی یە . خەمەکانیان بۆ لای ئەو بەرز کردووەتەوە و چاوەکانیان بە

[1] - بڕوانە : " حلیة الأولیاء ( ١ / ١٠ )

**چاوی غەیب پوویان لەو زاتەیە ، لەسەر قاپیی بینایی لە نزیکی زاتی خۆی نیشتەجێی کردوون لەسەر دانیشگەکانی پزیشکانی ئەهلی مەعریفەتی دایانشتاندوون .**

**یاساغی جنێودان بە هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لێ بێ ) : -**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :** ( لاتسبوا اصحابی ، فلو أن احدکم انفق مثل أحــد ذهباً ، ما بلغ أحدهم و لا نصیفه ) [1] .

**واتە : جنێو بە هاوەڵانم مەدەن ، خۆ ئەگەر یەکێ لە ئێوە هێندەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێ ناگات بە مشتێك لەوەی ئەوان تەنانەت نیوەی ئەوە .**

**وە فەرموویەتی :** إذا ذکرأ صحابی فأمسکوا و اذا ذکر النجوم فأمسکوا ، و اذا ذکر القــدر فامسکوا ) [2] .

**واتە : کاتێ باسی هاوەڵانم کرا زمانتان بپارێزن ، وە کاتێ باسی ئەستێرەکان کرا زمانتــان بپــارێزن وە کــاتێ باســی قــەدەر و چــارەنووس کــرا زمانتان بپارێزن .**

**هەروەها ئیمامی زەهەبی " ڕەحمەتی خوای لێ بێت " فەرموویەتی : " هەرکەسێ ڕاما لە کاروبار وسیرەی ژیانی هاوەڵان و شوێنەواریان لە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پاش وەفاتیشی ، بێ گومان ئەو کەسە لە چاکی و فەزڵی ئەوان تێ دەگات ، هەر لە پێشبڕکێ کردنیان بەرەو باوەڕ هێنان و ڕووبەڕووبوونەوەی بێ باوەڕان و بڵاو کردنەوەی ئاین و نیشاندانی ڕەمز و بۆنە ئیسلامی یەکان و بەرز ڕاگرتنی فەرموودەکانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ، تا دێتە سەر فێرکردنی خەڵك بە ئەرك و سوننەتە شەرعی یەکان ئەگەر ئەوان نەبوونایە نە بنچینەیەك ( ئەصلێك ) و نەلقێك لەم ئاینە بە ئێمە نەدەگەیشت [3] . وە لە ئەرك و سوننەتەکان نەئەرکێکمان دەزانی و نەسوننەتێك و هیچ شتێکمان لە فەرموودە و هەواڵەکان نەدەزانی .**

---

[1] - صحیح بوخاری و موسلم .

[2] - تەبەرانی بە ئیسنادێکی باش ڕیوایەتی کردووە . لە ( العراقي في تخرج احادیث الاحیاء ) ( ١ / ٦٣ ) وەرگیراوە .

[3] - هەر لە بەر ئەمەیە دووژمنانی ئیسلام ڕشووی تیرەکانیان کردووەتە هاوەڵان بۆ تانە لێدان و کەمکردنەوەی پلە و پایەیان خوداش خۆی ئاگاداری کردەوەکانیانە و بەسە بۆیان .

لەبەر ئەوە هەر کەس تانەیەکیان لێ بدات یان جنێویان پێ بدات ئەوە لە دین دەرچووە و [1] ، لە میللەتی موسوڵمانان چووەتە دەرێ ، لەبەر ئەوەی تانە لێدان لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئەو کەسە باوەڕی بە خراپە یان هەیە و ڕق و قینێکی لە دڵیدا بۆیان شاردووەتەوە و نکوڵی دەکات لەوستایش و چاکانە و لە وخۆشەویستی یەی کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەیان باسی کردووە ، چونکە ئەوان باشترین نموونەن بۆ نیشاندانی ئەم دینە و باشترین هۆکار و وەسیلەن بۆ گەیاندنی هەر بۆیە تانەدان لە هۆکاری هەر شتێ تانەدانە لە بنچینە و ئەصڵی ئەوشتەوە بە سووك ڕوانین لەگەیەنەر سووك ڕوانینە لە گەیەنراو . ئەمەش ئاشکرایە بۆ هەرکەسێ تێفکرێ و لە دووڕوویی و بێ دینی و بێ باوەڕی بە دوور بێت [2] .

خوشك و برای خوێنەرم .. پاش ئەم سەرەتا پیرۆزەی کە وەك بیرخستنەوە یەك پێشکەشمان کرد " لمن كان له قلب أو ألقى السمع وهو شهيد " ( ق : ٣٧ ) .

هەنگاوی خێرا هەڵدەگرین تا لە لاپەڕەکانی داهاتوو دا بە لیقای باشترین سەدەکان شادبین و لە کاروباریان ئاگاداربین و لە ژیانیان شت فێر بین و لە نێو مێژووی ڕاستەقینەی ژیانیاندا لەگەڵیاندا بین . ئاخر ئەوانە چەند ئاکارێکی دیار و نیشانەی ڕوونیان هەیە کە خاوەن هۆش و پیاوچاکان بۆ شوێنکەوتنیان ڕادەکێشن و شەهیدان و پێغەمبەران پێ ی شادمان و خۆشحاڵ دەبن و تامەزرۆی پلە و پایە یان دەکەن .

" پیاوانێکی باوەڕدار و ئافرەتانێکی باوەڕدار ، خودا سەرزەوی بە ئەوان دەپارێزێت. ناخی دەروون و ڕووی ناوەوەیان وەك ڕووی دەرەوەیانە ، بەڵکو ڕوونترە . نهێنی یان وەك ئاشکرایان وایە ، بەڵکو جوانترە ، هیمەتیان لەلای ئەستێرەکاندایە و بەرزتریش لەوانە سەراپای زەوی خۆشیانی دەوێت و فریشتەکانی ئاسمان پێیان دڵخۆشن ... داوا لە خوای گەورە دەکەین سەرکەوتوومان بکات بۆ شوێنکەوتنیان و بمانکاتە یەکێ لە شوێنکەوتوانیان [3] .

"خوای تەعالاش هەر خۆی ئاگاداری مەبەستەکانە و هەر ئەویش ڕێ نیشاندەرە "

---

[1] - جا خۆزگە ناحەزان و نەك نەناسانی سەردەم لەمە دەگەیشتن و خۆ پارێزی یان دەکرد بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ).

[2] - پەرتووکی ( الكبائر )ی زەهەبی لاپەڕە ( ٢٧٦ ) گوناهی گەورەی جنێودان بە هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لێ بێت) .

[3] - صيد الخاطر .. لاپەڕە ( ١٦ – ١٧ ) .

# بەشی یەکەم

# کەڵە پیاوانێک لە دەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## " ا- ئەبوبەکری صدیق "

**ئەبو بەکر کێ یە ؟**

عبدالله ی کوڕی ئەبی قوحافەیە ، لە ( مرە ) * دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگات [1] . مصعبی کوڕی زوبێر دەڵێت : ( ئوممەت لەسەر ئەوە پێك هاتوون کە ناوی – صدیق " ڕاستپەروەر" ی لێ بنێن [2] .وە لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە ( ﷺ ) فەرموویەتی :– " هەندێ لە بێ باوەڕان هاتنە لای ئەبی بەکر و پێیان ووت : چ وەڵامێکت هەیە بۆ ئەم هاوڕێیەت ؟ بانگەشەی ئەوە ئەکات کە گوایە ئەمشە و ڕەوی ( بیت المقدس) ی پێ کراوە . ئەویش فەرمووی : ( ئەو وای گوت ؟ ) وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : ( ڕاست دەڵێت ، وە من بڕوام بە دوورتر لەوەش هەیە مادام لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بێت، باوەڕم هەیە بە هەواڵی ئاسمان لە بەیانیان و ئێوارانداا لە پێغەمبەر ەوە (ﷺ) ) لەبەر ئەوە ناونرا بە ( صدیق ) [3]

### " هاتنە دنیای "

پێشەوا ئەبوبەکر (ﷺ) دوو ساڵ و چەند مانگێك پاش لە دایك بوونی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لە دایك بووە .

ئیمامی نەوەوی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێت : " لە سەردەمی نەفامیدا (پێش ئیسلام ) یەکێ بووە لە سەرکردەکانی قورەیش و ئەهلی ڕاوێژ و تەکبیریان . وە لە

---

* باوانی هۆزێکە لە قورەیش ئەویش ( مرەی کوڕی کعبی کوڕی لوئی کوڕی غالبی کوڕی فهری کوڕی مالکی کوڕی نضیر . ( معجم الصحاح ) ی جوهەری .

[1] - ( تاریخ الخلفاء ) ی ( سیوطی ) لاپەڕە ( ٢٧ ) بە دەستکاری یەوە .

[2] - (و تهذیب الأسماء و اللغات )ی نووی ( ٢ / ١٨١ ) .

[3] - ئیسنادەکەی باشە . حاکم لە ( المستدرك ) ریوایەتی کردوە ( سیوطی ) دەڵێت : لە ( تاریخ الخلفاء ) لاپەڕە ( ٢٩ ) وەرگیراوە .

ناویاندا کەسێکی خۆشەویست بووە و لە هەموویان شارەزاتر بووە لە کاروبارەکانیاندا . کاتێکیش ئیسلام هات هەڵی بژارد بەسەر هەموو شتێکدا و بە تەواوی باوەشی بە ئیسلامدا کرد ) .

" ڕاسایی ئەبوبەکر لە پێش ئیسلامدا "

عائیشە ( رضي الله عنها ) دەڵێت : ( سوێند بە خوا ئەبو بەکر هەرگیز شیعری نە وتووە نە لە سەردەمی نەفامیدا نە لە پاش هاتنی ئیسلام ، وە هاوڕێ لەگەڵ ( عوسمان ) لە جاهلیەتدا وازیان لە مەشروب خواردن هێنا ) [1] .هەر عائشە (رضي الله عنها) فەرموویەتی : " ئەبو بەکر لە نەفامیدا مەشروبی لە خۆی حەرام کرد بوو [2] .

" ئیسلام بوونی "

لە ئەبی سەعیدی خدری یەوە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) فەرموویەتی : ئەبوبەکر وتی : ئایا کێ وەك من ماف جێنشینایەتی هەیە ؟ مەگەر من یەکەم کەس نەبووم موسڵمان بووم ، ( مەگەر خاوەنی فلانە و فلان هەڵوێست نەبووم ) . [3]ئیمامی سیوطی دەڵێت : وا گوتراوە یەکەمین کەس موسڵمان بووە ( علی ) بووە ، وە وتراوەیشە کە خدیجە بووە وە زانایان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی یەکەمین کەس لە پیاواندا موسڵمان بوو ئەبوبەکر بووە و لە ئافرەتانیشدا خدیجە و لە منالان و کەم تەمەنەکاندا علی بوو . یەکەمین کەسیش باسی ئەم کۆمەڵەی ( جمع ) ی کردووە پێشەوا ئەبو حنیفة بووە ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت . [4]

---

[1] - بە ئیسنادێکی صحیح ئیبنو عەساکر ریوایەتی کردووە ، سیوطی دەڵێت : ئیسنادەکەی دروستە . ( تاریخ الخلفاء ) لاپەڕە ٣٢ .

[2] - ئیسنادەکەی باشە . ئەبو نعیم بەئیسنادێکی باش ریوایەتی کردووە . سیوطی هەمان شتی وتووە . (هەمان سەرچاوە )

[3] - فەرموودی صحیح لە صحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٨٩٨ ) وەرگیراوە .

[4] - تاریخ الخلفاء ( لا ٣٤) .

## " فەزڵ و گەورەیی "

**فەزڵ و گەرەیی " صدیق " (ﷺ) ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن ، ئێمە هەرئەمانەی لێ باس دەکەین :-**

**١ – خوای گەورە دەفەرمێ :** ﴿ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ﴾ سورة التوبة آية " ٤٠ " .[1]

**وە لە ئەبوبەکر خۆیەوە (ﷺ) دەڵێت : ( کاتێ لە ئەشکەوت بووین بە پێغەمبەری خوام (ﷺ)وت : ئەگەر سەیری ژێر پێ ی خۆیان بکەن دەمان بینن ، ئەویش فەرمووی : " گومانت چی یە ئەی ئەبو بەکر بە دووکەس کە سێ یەمیان – اللّٰه – یە .** [2]

**٢ – یەکەمین کەس بوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا نوێژی ئەنجامداوە ، لە زەیدی کوڕی ئەرقەم (ﷺ ) وتوویەتی : " یەکەمین کەس لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی ئەنجامدا ئەبوبەکری صدیق بوو .** [3]

**٣ – ڕزگار کراوی خوا لە ئاگر : –**

**لە عائیشە وە ( ﷺ ) دەڵێت : " جارێك ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ،ئەویش پێ ی فەرموو : تۆ لە لایەن خوداوە لە ئاگر ڕزگار بوویت ( ئازاد بوویت ) . لەو کاتەوە ( بە ئازاد کراو ) ناونراوە .** [4]

**٤ – گەورەی پیرانی ئەهلی بەهەشتە :-**

**لە پێشەوا ( علی )یەوە ( ﷺ ) ، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە ، فەرموویەتی : ئەبوبەکر و عومەر ئەهلی بەهشتن لە ، هەموو میللەتانی پێشوو دواینیشدا، جگە لە پێغەمبەران و نێردراوان ، ئەی عەلی ئەمەیان پێ ڕاگەیەنە ) .** [5]

---

[1] - واتای ئایەتەکە : یەکێك بوو لەو دووکەسە کاتێك هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون .. پێغەمبەریش (ﷺ) دڵی دایەوە و پێی وت : خەفەت مەخۆ ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە .

[2] - صحیح . بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە .

[3] - ئیبنو خیثمە بە ئیسنادێکی ڕاست گێڕاوەیەتیەوە ، تاریخ الخلفاء ص ٣٣ .

[4] - صحیح . صحیح فەرموودەکانی تیرمیزی ( ٢٩٠٥ ) .

[5] - فەرموودەکە : عن علی ( ﷺ ) عن النبی ( ﷺ ) قال " ابوبکر و عمر سیدا کهول اهل الجنه من الاولین و الاخرین ماخلا النبین و المرسلین ، لا تخبرهما یا علی ) .

صحیح . لە صەحیحەکانی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٨٩٧ ) .

٥ – وە لە ( عبدالله کوڕی حنطب )ەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی بە ئەبوبەکر و عومەر کەوت ، فەرمووی : " هذان مني السمع و البصر " واتە : ئەم دووانە بۆ من وەك چاوو گوێدان .[1]

٦ – هەروەها احمد و کەسانی تریش لە علی یەوە گێڕاویانەتەوە ، فەرموویەتی : " باشترین کەسی ئەم ئومەتە پاش پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەبوبەکر و عومەرن " .

زەهەبی دەڵێت : ئەم فەرموودەیە بە ( تواتر ) * لە علی وەرگیراوە ، دەی لەعنەتی خوا لە کۆمەڵی ( رافضة ) بێت چەند بێئاگان ) [2] .

" چەند لاپەڕەیەکی ڕووناك لە ژیانی ئەبوبەکر "

*هەڵوێستی یەکەم / پیاوێك باوەڕەحەی ئاشکرا دەکات :– لە کاتێکدا زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیمانی خۆیان دەشاردەوە تا ڕۆژێك خودا دەوری خێریان لە ڕوودەکاتەوە و ئاینەکەیان سەردەخات ، کەچی ئەبوبەکر لە ڕوودا –وەستانێکی بێ وێنەدا هەڵساو باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد ، با بێ باوەڕان هەر پێیان ناخۆش بێت .

خوێنەری بەڕێز گوێ بگرە بۆ ئەم هەڵوێستە : لە علی کوڕی ئەبی طالیبەوە ، فەرموویەتی : ( بینیم قورەیش ئازاری پێغەمبەری خوا یان دەدا ( ﷺ ) . یە کێ پالی پێوە دەنا ، یەکێ ڕایدەوەشاند و ئەیانووت : ئەمە تۆی خواکانت کردووە بە یەك خوا ؟ عەلی فەرمووی : سوێند بەخوا کەسمان لێ ی نزیك نەبووە وە ئەبوبەکر نەبێ لەمی دەدا و پالێ بەوەوە دەناو ، ئەوی تری ڕادەوەشاند و دەیوت : هاوار بۆ ئێوە ، و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە : ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ﴾ سورة غافر آيـة ( ٢٨ ) .واتە : ئایا ڕەوایە پیاوێك بکوژن تەنها تاوانی ئەوەیە کە دەڵێت : پەروەردگارم – الله – یە .

پاشان پێشەوا عەلی ئەو بوردەیەی * لەسەر شانی بوو لای برد و ئەوەندە گریا تاوەکو ڕیشی تەربوو . پاشان فەرمووی : سوێندتان ئەدەم بەخوا ، داخۆ ئیمانداارانی سەردەمی فیرعەون باش بوون یان ئەبوبەکر ؟ خەڵکەکە بێ دەنگ بوون ، ئەویش فەرمووی

[1] - صحیح . تیرمیزی ریوایەتی کردووە . فەرموودەی ژمارە ( ٨١٤ ) .

* تواتر : = یەکلە دوای یەك .

[2] - لە تاریخ الخلفاء لاپەڕە ٤٥ وەرگیراوە ، رافضة : ئەو کۆمەڵەیەن کە ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان بە هەند وەرناگرن. (وەرگێڕ)

* جۆرێک بەرگی ئەوسەردەمەیە .

: بۆ وەڵام نادەنەوە ؟ سوێند بەخوا یەك سەعاتی ئەبو بەكر باشترە لە هەزار سەعاتی ئیماندارەكەی ئەهلی فیرعەون ، ئەو ئیمانی شاردبوویەوە ، بەڵام ئەبو بەكر ئیمانەكەی خۆی ئاشكرا كرد )[1] .

*هەڵوێستی دووەم : " ڕۆژی بەدر "

ئیبن عەساكر لە ئیبن سیرینەوە تەخریجی كردووە كە عبدالرحمن ی كوڕی ئەبو بەكر لە جەنگی بەدردا لەگەڵ بێ باوەڕاندا بوو !! كاتێ موسڵمان بوو بە باوكی وت : ڕۆژی بەدر هاتیتە پێش چاوم ، بەڵام من خۆمم لێ لادای بۆ ئەوەی نەتكوژم ، كەچی ئەبوبەكر فەرمووی : بەڵام ئەگەر من چاوم پێت بكەوتایە خۆم لێت لانەئەدا ) .

لەم هەڵوێستەوە باوەڕی تەواو ئەبو دەردەكەوێت لەگەڵ ئەو بنەچە و مەعدەنە ڕاستەی كە هەیبوو لە پێشخستنی خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەكەی بەسەر هەموو شتێكدا .پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی : ( لایؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من نفسه ، و ولده و أهله و الناس اجمعين )[2]

واتە : هیچ كەس لە ئێوە باوەڕ ناهێنێت هەتاوەكو منی لە خۆی و منداڵ و ئەهل و هەموو كەسێكی خۆشتر دەوێت .

وە ئەبو یەعقوبی نهرجوری دەڵێت : هەر كەس ئیدیعای خۆشەویستی خوا بكات و بە گوێرەی بەرنامەكەی هەڵس و كەوت نەكا ئەوە ئیدیعاكەی درۆیە ، وە ئەویندارێك لە خوانەترسێت ئەوە لە خۆبایی یە )[3]

*هەڵوێستی سێ یەم : ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر ( ﷺ ) .

لە ئیبن عەباسەوە ( رضي الله عنه ) : كاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی كرد ئەبوبەكر(رضي الله عنه) هاتە دەرەوە عومەر ( رضي الله عنه ) لەوكاتەدا خەریك بوو قسەی بۆ خەڵكی دەكرد)[4] فەرمووی : ئەی عومەر دانیشە ، بەڵام عومەر ڕازی نەبوو دانیشێت ، دیسان فەرمووی :

---

[1] - تاريخ الخلفاء . لاپەڕە : ٣٧ .

[2] - بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردووە .

[3] - جامع العلوم والحكم لاپەڕە ( ٥٢٤ ) .

[4] - لەو وتەكانیشی لەو ڕۆژەدا : ( پیاوانێك لە دوو ڕووەكان وا بانگەشە ئەكەن كە گوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی كردووە ، نەخێر ئەو نەمردووە ، بەڵكو بۆ لای پەروەردگاری ڕۆشتووە هەروەك موسای كوڕی عمران ، سوێند

دانیشە و شایەتومان بێنە . ئینجا فەرمووی : (لە پاشدا ئەی خەڵکینە هەر کەس لە ئێوە (محمد ﷺ) دەپەرستێت ئەوە (محمد ﷺ) ڕۆشت و وەفاتی کرد ، وە هەر کەس لە ئێوە خوا دەپەرستێت ئەوە خودا زیندووە و نامرێ ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِيْن مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ سورة آل عمران آية ١٤٤ .

واتە : ( محمد ﷺ ) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفاتی كرد بێت بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش وەفاتیان كردووە ، ئایا ئەگەر وەفاتی كرد یان كوژرا و شەهید بوو ، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟ خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەز بێتەوە ، ئەوە هەرگیز زیان بە خوا ناگەیەنێت ، لە داهاتوویەكی نزیكدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە ) .

وتی : سوێند بە خوا خەڵكی وەك ئەوەی نەیانزانی بێ كە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاندووە ، هەتا ئەبوبەكر خوێندیەوە و خەڵكی هەموو وەریان گرت و دەیان وتەوە .

ئیبن شەهاب دەڵێت : سەعیدی كوڕی موسەییب هەواڵی پێدام كە عومەری كوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) فەرمووی : سوێند بە خوا هەر ئەوەندە ئەزانم گوێم لە ئەبوبەكر بوو ئەم ئایەتەی خوێند ئیتر لە دەست و پێ كەوتم و لاقەكانم هەڵیان نە ئەگرتم و كەوتمە سەر زەوی و ئەو كاتە زانیم بەراستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی كردووە ) .[1]

*هەڵوێستی چوارەم : ڕۆژانی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام .

( هێشتا چەند ڕۆژێك تێنەپەڕی بوو بەسەر وەفاتی پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) ئیسلام تووشی تێگیران و پێكدادانێكی ترسناك هات لەگەڵ ئەو بتپەرستیەی كە سەر لە نوێ و لە پڕ گەڕایەوە ناو بیروباوەڕی خەڵكی و هەروەها ئەو خاچ پەرستی یەی كە لە

---

بە خوا پێغەمبەر ( ﷺ ) دەگەڕێتەوە و ئەوسا دەست و پێ ی ئەوانەی ئەڵێن وەفاتی كردووە دەبڕێت !! ) لەبەر شۆك و كتوپڕی ڕووداوەكە ئەمەی دەفەرموو .

[1] - بڕوانە : الحلیە ( ١ / ٢٩ )

باکووری دوورگەدا نیشتەجێ بوو ، ڕێگەی لە چوونە ناو ئاینی ئیسلام دەگرت و بە توندی بانگەوازی ڕەت دەکردەوە وە بەرهەڵستی دەکرد )[1] .

پێشەوا زەهەبی دەڵێت : -

کاتێ هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە دەروبەری مەدینە بڵاو بوویەوە ، ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە عەرەبەکان لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە و زەکاتیان نەدەدا ، ئەوە بوو ئەبوبەکر هەڵسایەوە بۆ بەگژا چوون و جەنگ لە دژیان ، بەڵام عومەر و چەند کەسێکی تریش داوای ئەوەیان لێ ئەکرد کە وازبێنێ لە بە جەنگ هاتن لە دژیان . ئەویش فەرمووی : ( و الله لومنعوني عقالاً أوعناقاً ، كانوا يؤدونها الى رسول الله عليه الصلاة و السلام لقا تلتهم على منعها ) واتە : سوێند بەخوا ئەگەر لە ژیانی پێغەمبەر ( ﷺ ) دا زەکاتی ساڵێك یان کارە مێ یەکیان دا بێتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ئێستا نەیدەن ، ئەوا لەسەر نەدانی لە دژیان ئەجەنگم ، عومەر فەرمووی : چۆن ئەتەوێ بەگژ ئەو خەڵکەدا بچیت کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی : ( أمرت أن اقاتل الناس حتى يقولوا : لااله الا الله ، وَ أن محمداً رسول الله ، فمن قالها عصم ماله و دمه الا بحقها و حسابه على الله ) .

واتە : فەرمانم پێ کراوە بجەنگم لەگەڵ هەر یەکێکدا تاوەکو دەڵێت : " : لااله الا الله ، وَ أن محمداً رسول الله " ، خۆ هەر کەسێ ئەمە بڵێ ، ئەوە ماڵ و خوێنی پارێزراو دەبێ مەگەر بە هەق و لێپرسینەوەش لای خوایە .

ئەبوبەکریش فەرموی : ( سوێند بە خوا بە گژی ئەوەدا ئەچمەوە کە جیاوازی ئەکات لە نێوان نوێژ و زەکاتدا ، زەکات مافێکی دارایی یە ، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی : ( الا بحقها – واتە : مەگەر بەهەق ) .

عومەر فەرمووی : سوێند بەخوا هەر ئەوەندەم زانی کە خوا سنگی ئەبوبەکری بۆ جەنگ فراوان کرد بوو ، ئیتر منیش زانیم ئەوە هەقە ) . بوخاری و موسلیم و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە .

ئەوە بوو ئەبوبەکر ( ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت )) لەسەر هەموو بەرە و پێشگەکان لیوای هەڵگرت بۆ شەڕ .

( بیابان لە ژیانی پێغەمبەریشدا ( ﷺ ) نموونەی ئەم جەنگە خوێناوی یەی بەخۆیەوە نەدیبوو .

[1] - بروانە ( فقه السيرة )ی غەزالی – ( ٤٩٣ ) .

ئەوە بوو مەیدانی جەنگە کە فراوان بوو دەستی یارمەتی یەك لە دوای یەك دەهات و هەروەها تێچوونەکانی زۆر بوون وە قوربانیی زۆریشی لێ کەوتەوە ، بەلأم ئەو پیاوانەی کەلەسەر دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەسەر هەقناسی و گیانفیدایی لە پێناویدا پەروەردە بوو بوون ، ئەو بەکردەوە ڕاستگۆیی خۆیان لەگەڵ خوادا سەلماندو وەك پاڵەوانێکی بێ وێنە هەڵسانەوە بەو سەنگە گرانانەی دەیانهاویشت زەبری گورچکبڕیان لە لە بتپەرستی لە جەزیرەدا دیاردەی پاشگەزبوونەوەی بۆ یەکجاری بن بڕکراو ، وە ڕۆمەکانیشیان لە سنوورەکان دەرپەڕاند )[1]

دەسەلأت و هەیبەتی هەڵگەڕاوەکانیان نەهێشت ، ئەوە بوو هەندێکیان گەڕانەوە باوەشی ئیسلام و هەندێکیان تیاچوون.. دوای ئەوە چەند ساڵێکی کەم تێنەپەڕی هەتا ئیسلام لێوانی دەریاو ووشکانی بوو ، لێوانی چاوو گوێ بوو ، لە کاتێکدا ئاینەکانی تر بوونە پەراوێز لە ژیاندا .

*هەڵوێستی پێنجەم : کۆ کردنەوەی قورئان .

بوخاری لە زیدی کوڕی ثابت گێراویەتیەوە ، وتوویەتی : ئەبوبەکر پاش کوژرانی ئەهلی یەمامە ناردی بە دوامدا و عومەریشی لە لابوو . ئەبوبەکر وتی : عومەر هاتووە بۆلام دەڵێت : ڕۆژی ( یەمامە ) کوشتارێکی زۆری لێ کەوتەوە ، وە من لەوە ئەترسم کە کوشتار بگاتە خوێنەرانی قورئان لە جەنگەکاندا وتیابچن و زۆربەی قورئان ون بێت ، با کۆ بکرێتەوە ، وە من وای بە باش ئەزانم قورئان کۆبکرێتەوە ، ئەبوبەکر فەرمووی : منیش بە عومەرم وت : چۆن کارێ بکەم کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێ ی هەڵنەساوە . عومەریش وتی : سوێند بەخوا ئەمە کارێکی باشە و بەردەوام عومەر دەهات بۆ لام بۆ ئەم مەبەستە تاوەکو خوا دڵ و دەروونی بۆ ئەم کارە فراوان کردم و منیش هاتمە سەر ڕای عومەر .

زەید وتی : عومەریش هەر لای دانیشتبوو هیچی نە ئەوت ئەبوبەکر وتی : تۆ گەنجێکی ژیری ، و هیچ تۆمەتێکیشت لەسەر نی یە ، تۆ ئەوسا وەحیت بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەنووسیەوە لەبەر ئەوە داوات لێ ئەکەین کە بە دوای قورئاندا بگەڕێیت و کۆی کەیتەوە .

[1] - بڕوانە ( فقه السیرە ) ی غەزالی ( ٤٩٣ ) .

زەید دەڵێت : سوێند بە خوا تەکلیفی گواستنەوەی کێوێك لە لام ئاسانتر بوولەم فەرمانەی پێم کرا بە کۆ کردنەوەی قورئان ، وتم : چۆن کارێك ئەکەن کە پێغەمبەر ( ﷺ ) نەیکردووە ؟ ئەبوبەکر فەرموی : سوێند بە خوا کارێکی باشە ، ئەوە بوو بە بەردەوام دەچوومەلای تا خوا سینەی فراوانکردم بۆ ئەو کارەی سینەی ئەبوبکر و عومەری بۆ فراوان کرد بوو ، ئەوە بوو گەڕام بە دوای قورئاندا و لەسەر پارچە بەرد و لەسەر پێستە و لەناو سینەی پیاواندا وەرم گرت و کۆم دەکردەوە ، تا دوو ئایەتی سورەتی توبەم لە لای خوزەیمەی کوڕی ثابت وەرگرت کە پێشتر لە غەیری ئەوم نەبیستبوو ئەویش ئەم دوو ئایتە بوو : ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٢٨) فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (١٢٩)﴾ سورة التوبة آية (١٢٨ – ١٢٩) .

ئەوە بوو ئەو لەوحانەی کە قورئانی پیرۆزی لەسەر کۆ کرایەوە لەلای ئەبوبەکر مایەوە تاوە فاتی کرد پاشان لای عومەر بوو تا وەفاتی کرد دواتر لەلای حەفصەی کچی عومەرمایەوە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) .

ئەبویە علی لە علی یەوە دەگێڕێتەوە ، فەرموویەتی : گەورەترین پاداشت لە کۆکردنەوی قورئاندا ( المصاحف ) بۆ ئەبوبەکرە ، ئەبوبەکر یەکەمین کەس بوو قورئانی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردەوە ) .

## " ترسی ئەبوبەکر لەوەی حەرام بخوات "

وەهیبی کوڕی وەرد دەڵێت : – ( چش شەو نوێژ دەکەیت هیچ سوودت پێ ناگەیەنێت تاوەکو ئاگاداری ئەوە نەبیت کە دەچێتە ناوسکت ئایا حەلاڵە یان حەرام ؟ ).

عومەری کوڕی خەتاب ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێت : ئێمە لە دە بەش نۆ بەشی حەلاڵمان واز لێ دەهێنا لە ترسی ئەوەی نەوەك بکەوینە حەرامەوە ) .

خاتوو عائیشە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) باسی ئەبوبەکر مان بۆ دەکات و دەڵێت : کاتێ خۆی ئەبوبەکری صدیق ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) غولامێکی هەبووکە ( خراج ) [1] ی لێ وەردەگرت ، ئەبوبەکر هەمیشە لە خەراجی ئەوی دەخوارد ، ڕۆژێکیان غولامەکەی شتێکی بۆ ئەبو بەکر هێنا ئەویش وەك جاران لێ ی خوارد .

---

[1] – خەراج / شتێکە خاوەنی کۆیلە لەسەر کۆیلەکەی فەرزی دەکات لەوەی هەر ڕۆژێك بەدەستی دەکەوێت شتێکی بداتێ و باقی یەکەی هەڵگری بۆ خۆی .

غولامەکە وتی : ئەزانی ئەمە چی بوو ؟ ئەبو بەکر فەرمووی چی بوو ؟ وتی : لە نەفامیدا ( فالْ)[1] م بۆ کەسێك گرتەوە ، دەزانم کە شتێکی خراپە و درۆیە ، بەلام من هەلمخەلەتاند ، ئەویش پێمگەیشت و بەو هۆیەوە ئەمەی پێ دام کە تۆ لێت خواردە ئەوە بوو ئەبو بەکر هەرئە وەی بیست دەستی بەناو قورگیدا کرد هەتا هەرچی یەك لەگەدەیدا بوو هێنایە دەرەوە ) . بوخاری ڕیوایەتی کردووە[2] .

## " بەخشینی لە پێناوی خوای گەورە دا "

هەلوێستەکانی ئەبوبەکر ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لە مالْ بەخشیندا زۆرن ، ئێمە بەمەندە باس دەکەین چونکە ( مشتێ نمونەی خەرداریکە ) : –

١– خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى (١٧) الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى (١٨) وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى (١٩) إِلاَّ ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الأَعْلَى (٢٠) وَلَسَوْفَ يَرْضَى (٢١)﴾ سورة الليل آية ( ١٧ بۆ ٢١ ) .

واتە : خواناس و پارێزگاران لەو سزا و ئاگر و ناخۆشیە دوور دەخرێنەوە ، ئەو جۆرە کەسەی مالْ و سامانی ( دەبەخشێت ) بەوە دلْ و دەروونی خۆی خاوێن دەکاتەوە ... لە کاتێکدا کە کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نی یە پاداشت بدرێتەوە .. تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوای بەرز و بلندە ، ( سوێند ) بە خوا ڕازی و خۆشنود دەبێت .

ئیمامی قورتوبی دەلێت : ( ڕای زۆر ینە لەسەر ئەوەیە کە ئەم سورەتە لە ئەبوبەکر دا ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) هاتوەتە خوارەوە ، ئیتر چ بەهرە یەك لەمە گەورەتر و چ نیشانێك لەمە بەنرختر هەیە ؟

هەروەها ئیبنو عباس ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەلێت : ( بێ باوەڕان ئازاری بیلالیان دەدا ) ئەویش دەیوت : ( أَحَدٌ .. أَحَدٌ ) واتە : ( خوا تاك و تەنهایە ) .. پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێپەڕی و فەرمووی : ( أَحَدٌ ، يعني الله تعالى ، ينجيك ) مەبەستی لە ( أحد )

---

[1] – فالْ یان ( کهانە ) ، ئیدیعایە بە غەیبزانی ، غەیبیش تەنها خوا دەیزانێ ، ئەوانەش خەریکی ئەم کارانەن دەجال و جەردەن و مالْی خەلکی بەناهەق دەخۆن ، حەرامە هەر کەس بچێتە لای ئەوانە و بڕوای هەیە بیگەیەنێتە پلەی کوفر .

[2] – محمدی ئیبن سیرین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەلێت : ئاگادارنیم هیچ کەسێك لەبەر خواردنێك خوارد بێتی خۆی ڕشاندبێتەوە غەیری ئەبوبەکر ، ئەحمەد لە ( الزهد ) گێراویەتەوە .

خوای گەورەیە ، و خوا ڕزگارت دەکات ) پاشان بە ئەبوبەکری فەرموو ( يا أبا بكر ، ان بــلا ليعذب في الله ) واتە : ( ئەبوبەکر ، دەبینی بیلال وا لە پێناو خوادا ئازار دەدرێت ) .

ئەبو بەکریش ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لە مەبەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشت ، بۆیە خێرا بەرە و ماڵ کەوتە ڕێ و ئۆقیەیەك [1] زێڕی هێنا و بردی بۆ ئومەییەی کوڕی خەلەف کە گەورەی بیلال بوو ، پێ ی فەرموو : بیلالم پێ دەفرۆشی ؟ وتی : بەڵێ ، ئەوە بوو لێ ی کڕی و ئازادی کرد ، کەچی بێ باوەڕان دەیانوت : ئەوە ئەبوبەکر بۆیە بیلالی ئازاد کرد لەبەر چاکەیەك کە بیلال بەسەریەوە هەیبووە ، خوای گەورەش دەرهەق بەم وتانە ئەفەرموێت : ( و ما لأحد عنده من نعمة تجزى الا ابتغاء وجــه ربــه الأعلى و لسوف يرضى ) [2]

٢- پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرموێت : - هەر کەس چاکەیکی بەسەر مانەوە هەبوو بێت پاداشتمان داوەتە ، بێجگە لە ئەبوبەکر ، بەڕاستی فەزڵو گەورەیی ئەو تەنها خوا لە قیامەتدا پاداشتی دەداتەوە ، وە ماڵی هیچ کەس هێندەی ماڵی ئەبوبەکر سوودی بۆ من نەبووە ) [3] .

٣- لە عومەری کوڕی خەتاب ەوە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێت : (پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کردین بە بەخشین ( صدقه ) ، هاوکات منیش لەماڵەوە پارەم هەبوو ، بە خۆم وت : ئەمڕۆ پێشی ئەبوبەکر ئەدەمەوە ، ئەگەر چی تا ئێستا نەمتوانیوە پێشی بدەمەوە ، دەڵێت : نیوەی دارایی یەکەمم هێنا پێغەمبەری خوا(ﷺ ) فەرمووی : ( ما أبقيت لأهلك ؟ ) .

واتە : چیت بۆ ماڵ و منالەکانت جێ هێشتووە ؟ ) وتم : هێندەی ئەمەم بۆ داناون ، ئینجا ئەبوبەکر هات بە خۆی و هەموو دارایی یەکەیەوە . پێغەمبەر ( ﷺ ) پێ ی فەرموو : ( يا أبا بكر ، ما أبقيت لأهلك ؟ ) ئەی هیچت بۆ ماڵ و منال داناوە ؟ وتی : خوا و پێغەمبەرەیان ( ﷺ ) بەسە ( خواو و پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) بۆ بەجێ هێشتوون ) . منیش بە خۆم وت : هەرگیز بۆ هیچ شتێك پێشی ناکەوم . [4]

---

[1] - ئۆقیە / واتە ( ٨٤ ) مسقاڵ .

[2] - بڕوانە ( الجامع الاحكام القران ) ، ( ٢٠ / ٧٨ - ٨٠ ) .

[3] - صحيح / صحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٨٩٥ ) فەرمودەکە : ( ما لأحد عندنا يد الاوقد كافيناه ، ماخلا ابابكر ، فإن له عندنايداً يكافية الله بها يوم القيامة ، و مانفعني مالُ أحد قط مانفعني مال أبي بكر ) .

[4] - فەرموودەی ( حسن )ە : صحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٩٢٠ ) ، المشكاة ( ٦٠٢١ ) .

## " گریانی ئەبوبەکر لە ترسی خوای گەورەدا "

لە عائیشەوە ( رضي الله عنها ) : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : ( مروا ابابکر فلیصل بالناس) واتە : ( بە ئەبو بەکر بڵێن با نوێژ بۆ ئەو خەڵکە دابەسێت – عائیشە وتی : ( ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەگەر ئەبوبەکر بخرێتە جێ ی تۆ خەڵك لە بەر گریانی گوێیان لە هیچ نئەبو ، بفەرموو با عومەر نوێژ دابەسێت بۆ خەڵك ) عائیشە دەڵێت فەرمووی : ( مروا ابابکر فلیصل بالناس ) عائشە دەڵێت : بە حەفصەم وت : پێی بڵێ ئەگەر ئەبوبەکر لەو جێیەدا بوەستێ خەڵك گوێیان لە هیچ نئەبوت ، بڵێ بەڵکو فەرمان بدات عومەر ئەو کارە بکات ، حەفصەش ڕۆشت پێ ی وت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێ فەرموو ( انکن لأنتن صواحب یوسف ، مروا أبابکر فلیصل بالناس ) – بەڕاستی ئێوەش بوون بە هاوەڵەکانی یوسف ، بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن با نوێژ بۆ ئەو خەڵکە دابەسێت – حەفصەش بە عائیشەی وت : (ئەوە من نیم لە تۆوە توشی خێر بم ) .[1]

## " زوهدی ئەبو بەکر لە دونیا "

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە : جارێك ئەبوبەکر تینووی بوو جامێکیان بۆ هێنا کە ئاو و هەنگوینی تیا بوو ، کاتێ نزیکی کردەوە لە دەمی ، دەستی بە گریان کردو ئەوانەی دەورو بەریشی خستە گریان ، ئەو بێ دەنگ بوو کەچی ئەوان هەر ئەگریان ، پاشان دەستی کردەوە بە گریان بەڕادەیەك خەڵکەکە وایاندەزانی ناتوانن پرسیاری لێ بکەن لە هۆی گریانەکەی ، پاشان دەم و چاوی سڕی و هاتەوە سەرخۆ ، پێیان وت : چی وای کرد وا بە کوڵ بگری ؟

فەرمووی : جارێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) بووم ، دەمبینی بەردەوام شتێکی لە خۆی دوور ئەخستەوە و ئەیفەرموو : ( وازم لێ بێنە ، وازم لێ بێنە ) وە من هیچم نە ئەدی ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، دەبینم شتێك لە خۆت لا ئەدەیت و هیچیشت لە گەڵدا نئەبونم ؟

فەرمووی : ( هذه الدنيا تمثلت لي بما فيها ، فقلت لها : اليك عني ، فتنحت و قالت : أما و الله لئن أنفلت مني لا ينفلت مني مَنْ بعــدك ) . واتە : فەرمووی ئەوە دنیایە و خۆیم بە هەموو شتێکیەوە نیشان ئەدات ، منیش پێم وت : وازم لێ بێنە ، ئەویش خۆی لاداو وتی :

---

[1] - صحیح : صحیح سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٩٠٠ ) ، ئیبنو ماجە ( ١٢٣٢ ) .

سوێند بە خوا ئەگەر تۆ لەدەستم دەرچووی ، ئەوانەی دوای تۆ لە دەستم دەرناچن ) .
ئەبو بەکر فەرمووی : منیش ترسام ئەوە دنیا بێت گەیشتبێتە من ، ئەوە گریاندمی )[1]

## " هەندێ گوتار و ئامۆژگاری و وەسیەتی ئەبوبەکر "

١- لە یەحیای کوڕی ئەبی کثیرەوە دەڵێت ( ئەبو بەکر ﷺ ، لە وتاردا دەیفەرموو : ( کوان دەم و چاو جوانو پاکەکان ئەوانەی لە خۆیان ڕازی بوون ، کوان ئەو پاشایانەی کە شارانیان بینا ئەکرد و بەدیوار دەوریان ئەدا بۆ پارێزگاریکردنی ؟
لە کوێن ئەوانەی لە شوێن و جێگاکانی شەڕدا سەر کەوتنیان بە دەست ئەهێنا ؟ بەڕاستی مردن و تیاچوون ملکەچی تاریکی گۆڕەکانی کردن ... دەی خێراکەن ، دەی خێراکەن ، خۆتان ڕزگار کەن .[2]

٢- عبدالله ی کوڕی عکیم دەڵێت : ئەبو بەکر وتاری بۆ ئەداین ، پاش ئەوەی لە ستایشی پەروەردگار بوە وە فەرمووی : ( لە پاشان ، وەسیەتی ئەوەتان بۆ دەکەم کە تەقوای خوا بکەن و ستایشی بکەن بە جوانترین شێوە کە شایستەی ئەوبێت ، وە ترس و خۆشەویستی خوای ئاوێتە بکەن ، هەروەك داوا کردن و پێ داگرتن لەسەری پێکەوە گرێ بدەن ، بەڕاستی خوای گەورە بەم شێوەیە مەدحی زەکەریا و ئەهلەکەی کرد ، فەرمووی : ﴿ ... إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴾ سورة الأنبياء آية ( ٩٠ ) .واتە : بەڕاستی ئەوانە چالاك و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێر و چاکەیەکدا و نزای بە کوڵیان دەکرد ، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئە وان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە..
ئەی بەندەکانی خوا بزانن کە خوا نەفسی ئێوەی بە هەق بە بارمتە گرتووە لەسەر ئەوەش پەیمانی لێوەر گرتوون ، ئەو شتە کەمە لەناو چووەی لێ کڕیون بەشتێك کە زۆر و نەبڕاوەیە ، ئەوەش قورئانە کە فەرمایشتی خوایە و شوێنوارەکانی لەناو ناچێت و ڕووناکی یەکەی هەمیشەیی یە و ناکوژێتەوە ، دە ئێوەش بە ڕاست وەریگرن و پەند و ئامۆژگاریەکانی لە گوێ بگرن و داوای ئەوەبکەن لە خوا کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە نووری قورئان بێ بەش نەبن ، بەڕاستی خوا بۆ بەندایەتی کردنی خۆی بەدیی هێناون ، فریشتە

---

[1] - ئیسنادەکەی باشە ، حاکم و بەزار ڕیوایەتیانی کردووە ، عیراقی دەڵێت : ئیسنادەکەی باشە .
[2] - بڕوانە : صفه الصفوه ( ﷺ / ١٣٦ ) .

بەڕێزە نووسەرەكانی كردەوەو ووتە وەكیلن بە سەرتانەوە و ئاگاداری هەركارێكن كە ئەنجامی ئەدەن ، پاشان ئەی بەندەكانی خوا ئەوە بزانن كە ئێوە لەوادەیەكدا بە یانی و ئێوارە دەكەنەوە كە زانیاریتان لەسەری نی یە و نادیارە ، ئەگەر ئەتوانن كاتەكانتان لە فەرمانبەرداری خوادا تەواو بكەن و بەسەر بەرن ، ئەوا ئەو كارە بكەن ، لە ڕاستیدا ناتوانن ئەوە بكەن بە یارمەتی خوا نە بێت ، دەی هەڵسن پێشبڕكێ بكەن لەسەر ئەو دەرفەتەی بۆ كار كردن پێتان دراوە پێش ئەوەی بوار و فرسەت تان نەمێنێ و بەری خراپەی كارەكانتان بتانگێڕێتەوە ، خەڵكانێك هەن ئەو مۆڵەتەی بۆیان دانراوە داویانە بەكەسانێكی تر و خۆیان لە بیر كردووە ، نەكەن وەك ئەوان بن ، خێراكەن ، خێراكەن ، خۆتان قوتار كەن ، چونكە بەڕاستی تاڵبێكی خێرا و بەپەلەتان لە پێشەوەیە . ( واتە فریشتەی گیانكێش)[١] .

" وەسیەتی ئەبو بەكر بۆ عومەر لەسەرەمەرگدا "

لە عبدالرحمن ی كوڕی عبدالله ی كوڕی سابطە وە دەڵێت : ئیمامی ئەبوبەكر(ﷺ) لە سەرە مرگدا ، بانگی لە عومەر كرد و پێ ی فەرموو : ( ئەی عومەر لە خوابترسە و ئەوە بزانە كە خودا چەند كارێكی هەیە لە ڕۆژدا كە لە شەودا وەریناگرێت ، وە چەند كارێكی بە شەو دا دەوێت كە لەڕۆژدا وەریان ناگرێت و قبوڵی ناكات ، بەڕاستی هەتا فەرزەكان جێ بە جێ نەكەیت خودا سوونەت و چاكەت لێ وەرناگرێت ، بەڕاستی هۆی سەنگینی تەرازوی خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەیە كە لە دنیادا دوای هەق و ڕاستی كەوتوون و لەسەریان دامەزراوبوون ، وە بەڕاستی ئەو تەرازوەی سبەینێ هەقی لەسەردا ئەنرێ ماف خۆیەتی سەنگین بێت ، هەروەها تەرازووی ئەوانەی لە قیامەتدا سووك و بێ وەزنە تەنها لەبەر ئەوەیە لە دنیادا شوێن ناهەق و باتڵ كەوتوون ، بەلایانەوە ئاسان بووە ، لەبەر ئەوە ماف خۆیەتی ئەو تەرازووەی كە سەبەینێ ناهەقی لەسەر دائەنرێ سووك و بێ وەزن بێ .

خوای گەورە كاتێ باسی خەڵكی بەهەشت ئەكات باشترین كارەكانیان وەبیر دەخاتەوە و لە كارە خراپەكان لا ئەدات ، من كاتێ بیر لە ئەهلی بەهەشت ئەكەمەوە لەوە ئەترسم یەكێ نەبم لەوان و پێیان نەگەمەوە ، هەروەها خوای پەروەردگار باسی ئەهلی ئاگر دەكات و خراپترینی كارەكانیان وەبیر دێنێتەوە ، چاكەكەشیان بەڕوودا ئەداتەوە ، من كاتێ بیر لەوان ئەكەمەوە ، بە خۆم ئەڵێم : تكام وایە لەگەڵ ئەوانەدا نەبم ، با هەمیشە

[١] - بروانە صفە الصفوة (١/١٣٦، ١٣٧).

بەندەی خوا لەگەڵ ترس و خۆشەویستی خوادا بژی و جگە لە خوا وبەسەر ئەوزاتەدا تەمەنناى هیچی تر نەکات و هەرگیز بێ هیوا نەبێ لەبەزەیی خوا ، تۆش ئەگەر ئەم ڕاسپاردەیم بپارێزیت ئەوە هیچ نەمات ( غائب )ێك هێندەی مردن لەلات خۆشەویست نی یە ، مردنیش بێ گومان وا بەرێوەیە بۆت ، بەڵام ئەگەر ڕاسپاردەکەم زایەکەیت ئەوا مردن لە هەموو نەهاتەکان لەلات سەختتر و ناخۆشتر دەبێت ، بێ گومان ناشتوانین پێشی پێ بگرین ) .[1]

## " دراساتەکانی ئیمامی ئەبوبکر "

وانە و پەند :-

لە عائیشەوە ( رضي الله عنها ) دەڵێت : کاتێ ئەبوبەکر تووشی نەخۆشی مردن هات فەرمووی : بزانن لەوکاتەوەی هاتوومەتە ئەمارەتەوە – جێنشینایەتی – چی لە ماڵی من زیادی کردووە ، بیدەن بە جێنشینی پاش خۆم !! ئێمەش گەڕاین تەنها بەندەیەکی نوبی ( سۆدانی ) کە منداڵەکانی بۆ هەڵئەگرت لەگەڵ حوشترێکی ئاوکێشدا ئاوی باخەکەی بۆ دەدا و ناردمانن بۆ عومەر عائیشە دەڵێت : با پیرم پێ ی وتم : عومەر دەستی بە گریان کردووە و فەرمویەتی : ( ڕەحمەتی خوا لە ئەبو بەکر بێت ، بەڕاستی ئەوەی پاش خۆی تەواو ماندوو کرد ) .[2]

پاك و بێ گەردی بۆ خوا ، میراتی خەلیفە یەك بریتی بێت لە بەندەیەك و تەنها ئاژەڵێك !! ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾ سورة النازعات آية (٢٦)واتە : ( بەڕاستی لەوبەسەرهاتەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ هەر کەسێ لەخوا بترسێت ) .

هەر لە عائیشەوە ( رضي الله عنها ) دەفەرموێت : ( کاتێ ئەبوبەکر گەیشتە سەرە مەرگ پرسی ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە ؟ وتیان : دوو شەممەیە ، فەرمووی : ئەگەر ئەمشە و مردم مەمهێڵنەوە تا بەیانی ، لەبەر ئەوەی خۆشەویستترین شەو و ڕۆژ لەلام نزیکترینیانە لە پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) ) . احمد ڕیوایەتی کردووە .

لە عەباسی کوڕی قەیسەوە ، دەڵێت : ( پێشەوا ئەبوبەکر لەسەرەمەرگدا بە عائیشەی فەرموو ، ئەم دووبەرگەم بۆ بشۆ و بیکەرە کفنم ، بێ گومان باوکت لە یەکێ لەم دوو پیاوە تێناپەڕێ : یان ئەوە دەبێتە کەسێکی داپۆشراو بە باشترین جل و بەرگ ، یان دەبێتە

[1] - بروانە : الحلية ( ١ / ٣٦ ، ٣٧ ) صفة الصفوة ( ١ / ١٣٧ ، ١٣٨ ) .

[2] - بروانە : صفة الصفوة ( ١٣٨/١ ) .

ڕووت و ڕەجاڵێك بەخرابترین شێوە ) . [١] هەروەها ئیبنو سەعد و غەیری ئەویش لە عائیشەوە ( ﷺ ) گێڕاویانەتەوە فەرموویەتی : ( کاتێ ئەبو بەکر نەخۆشی زۆری بۆ هێنا ئەم بەیتە هۆنراوەیەم وت : –

لعمرك ما يغني الثراء عن الفتى

اذا حشرجت يوماً و ضاق بها الصدر *

**واتە : سوێند بێ دەوڵەمەندی هیچ سودێکی نئەبوت بۆ مرۆڤ**

**کاتێ پەلەپروزەی مەرگ ڕێ ی پێ گرت و هەناسەی سوار بوو**

ئەبو بەکریش دەم و چاوی خۆی لادا و فەرمووی : ( وا نیە ، بەڵکو بڵێ : ﴿ وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴾ سورة ق ، آية ( ١٩ ) .

واتە : ئەی ئینسان ... تەنگانەی مردن و ئازارەکانی هات ، هاوڕێ لەگەڵ ڕاستیەکاندا ، ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕووداوەیە کە خۆتت لێ لادەدا و پەنات لێ دەگرت .فەرمووی : ئەم دوو بەرگەم بێنن بیشۆن و بیکەنە کفنم ، چونکە مردووەکان زیاتر لە زیندووەکان پێویستیان بە بەرگی تازە هەیە .

ئیبنو سەعد لە عور وە و قاسمی کوڕی محمد تخریجی کردووە کە ئەبو بەکر ( ﷺ ) عائیشەی ( ﷺ ) ڕاسپاردووە کە لە تەنیشت پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) بینێژن ، ئەوە بوو کاتێ وەفاتی کردو قەبری بۆ هەڵکەندرا سەری خرایە لای شانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ) و گڵکۆکەی لکێنرا بە قەبری پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) .

هەورەها ئیبنو سعد لە سەعدی کوڕی موسەیب ڕایوایەتی کردووە کە عومەر (ﷺ) نوێژی لەسەر ئەبو بەکر کرد لە نێوان قەبر و مینبەردا و چوار جار ( الله اکبر )ی لەسەر کرد .

ئەهلی سیرە دەڵێن : ( ئەبو بەکر شەوی سێ شەممە لە نێوان ڕۆژئابوون و شێواندا کە مانگی ( جمادى الأخرة ) هەشت شەوی مابوو[١] لەساڵی سیانزەی کۆچی لە تەمەنی ( ٦٣ ) ساڵیدا گەڕایەوە لای پەروەردگاری .

---

[١] - عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمەد لە ( زوائد الزهد )دا ڕیوایەتی کردووە .

* دیارە عائیشە ( ﷺ ) لە پاڵ غەمی مەرگی ئەبو بەکردا غەمباری ئەوەش بووەکە پارچە بەرگێکی تازەیان نەبووە بیکاتە کفنی . (وەرگێڕ)

ڕەحمەت و ڕەزای خوای لەسەر بێ خوا بمانکاتە یەکێ لە گرۆی ئەو لەگەڵ ئەودا حەشرمان بکات .

## " ئەبو بەکر لە دیدەی علی کوڕی ئەبی طالب دا "

ئەسیدی کوڕی صفوان دەڵێت : –

( پاش ئەوەی ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خوای لێبێت وەفاتی کرد و کفن و دفنیان کرد ، شار – مەدینە – هەموو دایە قوڵپەی گریان وەك ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد .

دەڵێت : ( ئەو کات علی کوڕی ئەبو تالیب ( ﷺ ) بەپەلە و خێرا و بەدەم وتنی : (إنا لله و إنا إلية راجعون ) .

فەرمووی : –

ئەمڕۆ نبوەت کۆتایی هات . ئەوجا لەسەر ئەوماڵەی کە ئەبو بەکری تێدا بوو وەستا و فەرمووی : –

" ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەبو بەکر ، تۆ دۆست و هاودەم ئارامگەی پێغەمبەر وجێ متمانە و جێگای نهێنی و ڕاوێژی بوویت ، یەکەمین کەس بویت باوەڕت بە ئیسلام هێنا دڵسۆزترین باوەڕت هەبوو ، دڵنیاترین کەس بوویت لە پەروەردگارت و لە هەموو کەسیش زیاتر لە خوا دەترسایت گەورەترین سامان بووی بۆ ئایینی خوا و باشترین پەرژین بووی بە دەوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هەمیشە بەسۆز بوویت بۆ ئیسلام . تۆ باشترین هاوەڵ و زانا ترینیان بوی ، باشترین پێشینەت هەبوو ، پایە بەرزترین پلەت هەبوو ، نزیکترین وەسیلە بووی ، لە هەموو کەس زیاتر لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەچوویت لە ڕێنموونی و هیدایەتتدا و ڕێزدارترین پلە و پایەت هە بوو ، لە هەمووان بەرزتر بووی لەلای ، وە بەخشندە تر و میهرەبانتر بووی بۆی ، خودا بۆ ئیسلام وبۆ پێغەمبەرەکەی پاداشتت بداتەوە ، کاتێ خەڵکی پێغەمبەری خوایان ( ﷺ ) بە درۆ دەخستە وە تۆ بەڕاستت زانی وە باوەڕت پێ کرد ، تۆ لە لای وێنەی چاو گۆی گرنگ

[1] – بڕوانە: تاریخ الخلفاء(٨٥) . و هیثمی دەڵێت: گێرانی ڕیوایەتی کردووە بە ئیسنادێکی باش.المجمع (١٤٣٩٢).

بووی ، پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە – صدیق – ناوی هێناوی ، دەفەرموێت :
﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ ﴾ سورة زمر آية ٣٣ .

واتە : ئەوکەسەش ڕاستی و هەقیقەتی هێناوە و باوەڕیشی پێیەتی .

کاتێ خەڵکی چاویان بەرویدا هەڵئەنەهات تۆ دڵنەواییت دەکرد ، وە کاتێ خەڵکی لەماڵەکانیاندا دانیشتبوون تۆ لەگەڵ ئەودا لەناڕەحەتی یەکاندا بوویت ، و لەکاتە سەختەکاندا باشترین هاوەڵی بوویت ، تۆ – ثاني اثنين – [١] بوویت ، هاوڕێی ئەشکەوتی بوویت و ... سوکونەت و ئارامیت بەسەردا ئەباراند هاوڕێ ی کۆچی بوویت، باشترین جێنشینی ئەوت کرد لە ئاینیەکەیدا کاتێ خەڵکی هەڵگەڕانەوە لە دین ، و هەڵسایت بە کارێك جێنشینی هیچ پێغەمبەرێك پێ ی هەڵنەساوە ، تۆ ئەو کاتەی هاوەڵان لاواز و دەست و پێ بەسرا و بوون هەڵسایتەوە ، وە کاتێ ئەوان زەلیل و ژێر دەستە بوون تۆ دەرکەوتی ، کاتێ ئەوان بێ هێز بوون تۆ بەهێز بوویت ، وە ئەگەر ئەوان سستی و بێ خەمی یان کردبێ لەبەرنامەی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ئەوا تۆ هەمیشە پابەند بوویت پێیەوە ، بەڕاستی جێنشینایەتیت لە جێگای خۆی بوو .

بە بێ ڕکابەر و بە بێ ئەوەی کەس بتوانێت ملکەچت بکات ، دووڕووکانت ناچار کرد و چاو چنۆکانت سەرکوت کرد ، کاتێك خەڵکی شکستیان هێنا تۆ بەکارەکەیان هەڵساین ئەوانیش شوێنت کەوتن و بەوەش ڕێنموونی کران و هیدایەتیان دۆزیەوە ، تۆ لە هەمووان دەنگت نزمتر و لەسەر خۆتر بوو ، کەچی لەسەروی هەموانەوە بوویت ، کەمترین قسەت دەکرد ، ڕاستگۆترین بوویت لە ئاخاوتندا ، بێ دەنگترین و ڕەوانبێژ ترینیان بوویت ، جوامێرانە ترین ڕات هەبوو ، بەجەرگترین کەس بوویت ، مەزنترین و پایە بەرزترین کارت دەکرد ، تۆ ، بە پەروەردگار قەسەم ، بۆ ئەم ئاینە وێنەی شاهەنگ بوویت ، یەکەمجار کە خەڵکی پشتیان تێ کرد ، وە دووەمجار کاتێ خەڵکی ڕوویان تێ دەکرد .

بۆ باوەڕداران باوکێکی بە بەزەیی بوویت و ئەوان بوو بوونە بەخێو کراوی تۆ . هەموو بارێکی گرانت هەڵگرت کە ئەوان لە تواناییاندا نەبوو هەڵیبگرن ، وە ئەو شتەی ئەوان وازیان لێ هێناو بایەخیان پێنەدەدا تۆ چاودێریت ئەکرد ، ئەوەی ئەوان لێ ی بێ ئاگا بوون تۆ تیایدا زانا بوویت ، خەڵکی سست و لاواز بوون و بێ هیوا بوون ، تۆ قۆڵی

---

[١] - هاوڕێ ی ئەشکەوتی پێغەمبەری ئازیز بوویت .

کار کردن و بەردەوامیت لێ هەڵکرد . ئەگەر ئەوان ئارامیان لەسەر نەگرت ئەوا تۆ بەردەوام لەسەری ڕۆیشتیت ، بەڕاستی تۆ دەرکت بەویست و داواکاری یەکانیان کرد ، بۆیە هەر لە سەر ڕای تۆ و ڕێنمایی تۆ بەخۆیاندا چوونەوە و هاتنەوە هۆشی خۆیان و سەرکەوتوو بوون ، بە ڕاپەسندەکانت شتانێکیان بە دەست هێنا کە بە بیریاندا نەهاتبوو .

تۆ بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەختی بڵێسەدار بوویت ، و بۆ باوەڕداران ڕەحمەت و هاودەمی و قەڵای پۆڵایین بوویت .

سوێند بەخوا تۆ خەڵاتی خواییت بۆ خۆت بە دەست هێنا و پایەبەرزەکانت بۆ خۆت مسۆگەر کرد و دەرکت بە پێشهات و مەترسی یەکان کرد ...

هەرگیز بەڵگەکانت سواو و ناکاریگەر نەبوون ، وە هیچ وەخت زرنگی و چاوساغیت لاواز نەبوو ، هیچ کات ڕێگەت نەدا بە ترسنۆکی توخنی دەروونت بکەوێ ، دڵت هیچ وەختێ نەگۆڕا ، لە بەر ئەوە بوو وەك کێو بوویت کە نەرەشەبا دەیجولێنێت و نە تێکشکەنەرێك لە جێ ی خۆی لایدەبات ، تۆ هەر ئەو زاتەیت کە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەربارەت فەرمووی : ( ضعيفاً في بدنك قوياً في امر الله تعالى ، متواضعا في نفسك ، عظيما عند الله ، جليلا في عين الناس ، كبيراً في انفسهم ) جەستەت لاواز ، بەڵام لە ئاست جێبەجێ کردنی فەرمانی خوادا زۆر بەهێزیت ، کەسێکی لە خۆ بوردەیت و لەلای خۆت کەم ، بەڵام لەلای خوا گەورەیت لە چاوی خەڵکدا پایەبەرز و لەلایان بڵند و گەورەیت ) هیچ نەنگی و عەیبێکت لای هیچ کەس نەبوو، هەگیز کەسێك نەبوو بتکاتە جێگای تانە و تەشەر لێدان ، کەسی لاوازی بێ دەسەڵات لەلات بەهێز بوو تا هەقی خۆیت بۆ وەردەگرتەوە ، نزیك و دوور لەلات وەك یەك بوون ، نزیکترین کەس لەلات ئەو کەسە بوو کە لە هەمووان زیاتر ملکەچی خوا بێت و تەقوای ئەو بکات .کاروبارت هەموی هەق و ڕاستی و نەرم و نیانی بوو ، وتەکانت لەیەك کاتدا فەرمایشت و چەسپاندنیش بوو ، کارەکانت هەمیشە بە میهرەبانی و لەهەمان کاتدا بە توندو تۆڵی ئەنجام دەدا ...

ڕاو و پێشنیارەکانت هەمووی زانیاری و لە هەمانکاتدا عەزیمەت و بێ پەروایی بوو ، ئەم ئایینە بەتۆوە جێگیر و میانەڕە و بوو ، باوەڕ بە تۆوە بە هێز بوو . سوێند بە خوا بەڕاستی پێشڕەوی یەکی ناوازەت کرد و ئەوانەی پاش خۆت خراپ ماندوو کرد و ئەم موصیبەت و کارەساتە خەڵکی پیر کرد ، دەسا ( إنا لله و إنا اليه راجعون ) .ڕازین بە ویست و قەزای خوای پەروەردگار و ملکەچین ، سوێند بەخوا دوای پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیتر موسڵمانان بە وێنەی تۆ بۆ کەسی تر خەمبار و نارەحەت نابن ، تۆ بۆ ئەم ئاینە سەر

بەرزی و قەڵای پۆڵایین و پەناگە بوویت ، سا خوا یە بیگەیێنیتە لای پێغەمبەرەکەت (محمد ) ( ﷺ ) و لە پاداشتی ئەم خەمە بیٚ بەشمان مەکە لە پاش ئەو ڕێگە مەدە گومرا بین و ڕێی هیدایەت ون کەین .. )خەڵکی بیٚ دەنگ بوون تاوەکو لە قسەکانی بوویەوە ، پاشان بەڕادەیەك گریان هەنسك و هاواریان بەرز بوویەوە و هەموو دەیان وت : بەخودا ڕاستت فەرموو [1] .

خوا لە ( صدیق ) خۆش بیٚ و ڕازیشی بکات ..

[1] - صلاح الأمة ( ٦ / ٣٩ – ٤١ ) لە ( التبصرة ) ( ١ / ٤٠١ – ٤٠٣ ) وەرگیراوە .

## " ٢- عومەری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) "

ناوی عومەری کوڕی خەتابی کوڕی نفیلی کوڕی عبد عوزایە ، لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا و لە تەمەنی ( ٢٧ ) ساڵیدا موسڵمان بووە ، وە یەکێکە لەو هاوەڵە بەڕێزانەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە .

ئیسلام بوونی بە هۆی بەرەکەتی دوعای پێغەمبەری خواوە بوو ( ﷺ ) ، لە ئیبن عومەرەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( أللهم أعز الإسلام بأحب هذين الرجلين اليك ، بئةبو جهل ، اوبعمر بن الخطاب ) .

واتە : پەروەردگارا ئیسلام بەهێز کە بەهەر کام لەم دوو پیاوە کە لەلات خۆشەویسترە ، بە ئەبو جەهل یان بە عومەری کوڕی خەتاب ، فەرمووی : عومەر لەلای خوای پەروەردگار خۆشەویستر بوو [١]. وە عومەر یەکەم کەسە ئیسلامی ئاشکرا کرد .

لە ئیبنو عەباسەوە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : ( یەکەم کەس ئیسلامی ئاشکرا کرد عومەری کوڕی خەتاب بوو ) [٢].

### " فەزڵو گەورەیی "

١- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەفەرموێت : ( ان الله جعل الحق على لسان عمر و قلبه)[٣].واتە : پەروەردگار هەقی لەسەر زمان و دڵی عومەرداناوە .

٢ – لە عەقبەی کوڕی عامرەوە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : ( پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی ( لوكان نبـي بعدى لكان عمر بن الخطاب )[٤] .

واتە : ئەگەر پێغەمبەرێك لە دوای من بهاتایە ئەوە عومەری کوڕی خەتاب بوو .

٣ – لە ئەبی سەعیدەوە ، دەڵێت : (پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( تتكلم الملائكة على لسانه ) [٥].

---

[١] - صحیح : تیرمیزی ریوایەتی کردووە ، وە بڕوانە ( المشكاة ) ، ( ٦٠٣٦ ) .

[٢] - صحیح و حسن : ( تاريخ الخلفاء ) ی سیوطی ( ١١٥ ) و دەڵێت ئیسنادەکەی باشە .

[٣] - صحیح : ترمیزی فەرموودەکانی ( ٢٩٠٨ ) لە ئیبنو عومەرەوە .

[٤] - فەرمودەی ( حسن )ە / تیرمیزی ریوایەتی کردووە ( ٢٩٠٩ ) فەرموودەی ( ٣٢٧ ) .

[٥] - ئیسنادەکەی باشە : تەبەرانی ریوایەتی کردووە لە ( الاوسط ) و سیوطی دەڵێت : ئیسنادەکەی باشە . بڕوانە: تاريخ الخلفاء (١١٩ ، ١٢٠).

**واتە : ( فریشتەکان لە زاری عومەرەوە دەدوێن ) .**

**٤ – لە عائیشەی دایکی ئیمانداڕانەوە ( ﷺ ) فەرموویە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:** ( قد كان يكون في الأمم محدثون ، فإن يك في امتي احد / فعمر بن الخطاب )[١] .

**واتە : لەناو ئوممەتاندا کەسانێك ی ( پێشبینی کەر ) هەبوون ، خۆ ئەگەر لەناو ئوممەتی مندا یەکێ هەبێ ئەوە عومەری کوڕی خەتابە ) .**

**٥ – لە ئەنەسەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموی :** ( دخلت الجنة ، فإذا أنا بقصر من ذهب ، فقلت : لمن هذا القصر ؟ قالوا : لشاب من قريش ، فظننت أني أنا هو ، فقلت ، ومن هو ؟ قالوا : عمر بن الخطاب )[٢] **واتە : چوومە ناو بەهەشت ، لەوێ خۆم لەبەردەم کۆشکێکی ئاڵتونیدا بینیەوە پرسیم : ئەم کۆشکە هی کێ یە ؟ وتیان هی گەنجێکی قورەیشی یە ، وامزانی کە ئەوە منم ، وتم : ئەو گەنجە کێ یە ؟ وتیان : عومەری کوڕی خەتاب .**

***هاوەڵان چیان دەربارەی فەرمووە ؟**

**١ – لە علی کوڕی ئەبی تالیب ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( ئەگەر باسی پیاوچاکان کرا خێرا ناوی عومەر بێنن ، ئێمەی هاوەڵانی محمد ( ﷺ ) ئەوەمان بە دوور نە ئەگرت لەسەر زمانی عومەر دێتە گۆ )** [٣]

**٢ – بوخاری لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتی کردووە و دەڵێت : ( ئێمە لەو کاتەوەی عومەر موسڵمان بوو بە هێز و بەدەسەڵات بووین )**

**هەروەها ئەهلی زانست ئەڵێن : ( کاتێ عومەر موسڵمان بوو ئیسلامی بەهێز کردوو بە ئاشکرا کۆچی کرد و بەدر و ئوحود و سەرجەم غەزاکانی بینیوە ، عومەر یەکەمین خەلیفەیە بە ئەمیری ئیماندارن بانگکرا و یەکەمین کەسە مێژووی بۆ موسڵمانان نووسیەوە.**

**وە یەکەمین کەسە قورئانی لە موسحەفێکدا کۆکردەوەتە و ، هەروەها یەکەمین کەسە خەڵکی بۆ نوێژی تەراویح کۆ کردەوە ، هەروەها یەکەمین کەسە شەو ئێشکگری دەکرد**

---

[١] - محدث : ئەو کەسەیە پێشبینی شتەکان دەکات .

[٢] - صحيح :صحيح سونتەکانی تیرمیزی ( ٢٩١١ ) فەرموودەی ( ١٤٠٥ ) .

[٣] - اسنادەکەی ( حسن )ە ، طبرانی ریوایەتی کردووە . هیثمی دەڵێت : ئسنادەکەی باشە . ( الجمع ) بە ژمارە ( ١٤٤٢٧ ) .

بۆ چاودێری کاروباری ڕەعیەتەکەی و قامچی هەڵگرت و خەڵکی پێ پەروەردە ئەکرد ، فتوحاتی ئیسلامی ئەنجامداوە ، ( خەراج )[1] ی داناو سنووری بۆ شارەکان کێشا و دادوەرانی دانا ، دادگا و دیوەخانی بۆ بەڕێوەبردن پێکەوەنا و حەجی بە دایکانی ئیمانداران کرد لە کۆتا حەجیدا کە ئەنجامیدا[2] .

## " دابەزینی قورئان بە ویست و خواستی عومەر ( رضي الله عنه ) "

لە ئەنەسەوە ، عومەری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) فەرمووی : ( لە سێ جێگادا لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هاو دەنگ بووین ، جارێ بە پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) وت : با مەقام و جێگای ئیبراهیم بکەینە نوێژگە و مزگەوت ، پەروەردگارم ئەم ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی : ﴿ ... وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ... ﴾ . جارێکیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خەڵك لە باش و خراپ دێن بەسەر خێزانەکانتدا ، ئەگەر فەرمانت پێ بکردنایە بە خۆ داپۆشین ئەوە بوو ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە .

جاری سێیەم ئەوە بوو خێزانەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) کۆبوونەوە لەسەری بە هۆی ( غیرە ) یانەوە منیش وتم : ﴿عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِنْكُنَّ ﴾[3] سورة تحريم آية ( ٥ ) . ئەوە بوو ئایەتێك دەقا و دەق بەم شێوەیە هاتە خوارەوە ) بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

وە هاو دەنگ بوونی ڕای عومەر لەگەڵ دەقی قورئاندا لەمانەش زیاترە ، هەندێ بە زیاد لە بیست جێگە ئەژماری ئەکەن ، لەوانەش : -

١ - موسلیم لە عومەرەوە ( رضي الله عنه ) ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی : ( وافقت ربي في ثلاث : " في الحجاب ، و في اسارى بدر ، و في مقام ابراهيم ) واتە : لە سێ جێگادا لەگەڵ پەروەردگارمدا هاودەنگ بووم ، لە حیجاب و لە گیراوەکانی شەڕی بەدر و لە مەقامی ئیبراهیم " عليهم السلام " دا .

[1] - خراج / باج .

[2] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ١٤٣ ) .

[3] ماناى ئایەتەکە / ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تە لاقتان بدات ،ئەوە نزیکە خوا هاوسەرانی چاکتر لە ئێوەی پێ ببەخشێ

٢ – هاوەڵانی فەرموودە و حاکم لە عومەرەوە گێراویانەتەوە فەرموویەتی : (ئەی پەروەردگار داوات لێ ئەکەم دەربارەی عەرەق و مەشروب یەکلامان بکەیتەوە و دڵمان شیفا بدەیت ، ئەوە بوو ئایەتی حەرام کردنی دابەزی ، کە خوای گەورە دەفەرموێت :
﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ سورة المائدة آية ٩٠ .

٣ – طبرانی لە ئیبنو عباسەوە ریوایەتی کردووە ، دەڵێت : – ( کاتێ پێغەمبەر(ﷺ ) زۆر داوای لێ خۆش بوونی لە خوا ئەکرد بۆ خەڵکانێك عومەر فەرمووی : وەك یەکە بۆیان ( داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەن یان نا هیچ تەوفیری نیە ) ، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێ : ﴿ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ ... ﴾ سورة المنافقون آية ٦ .واتە : چوون یەکە بۆیان داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت یان نەکەیت .

## " پەرستشی عومەر و ترسی لە پەروەدگار "

پێشەوا عومەر ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) بە هۆی زۆریی گریانەوە دوو هێڵی رەش لەسەر روومەتی پەیدا بوو بوو ، هەمیشە حەزی ئەکرد لە نیوەشەودا نوێژ بکات و ئەیفەرموو : ( ئەگەر گێسکێك لە کەناری فورات بمرێت ( مردار بێتەوە ) ئەترسم خوا لێپرسینەوەم لەسەری بکات ) .

وە لە عبداللە ی کوری عامرەوە ، دەڵێت : عومەرم بینی کایەکی ( پوشێکی ) لەسەر زەوی هەڵگرت و فەرمووی خۆزگە ئەم پوشە بوومایە ، خۆزگە دروست نەکرامایە ، خۆزگە دایکم منی نەدەبوو ، خۆزگە هیچ شتێ نەبوومایە و خۆزکە لە بیر بکرامایە ..

ئەسلەم دەڵێت : عومەر هەموو دەم بەرۆژوو بوو !!

ئیبنو عومەر دەڵێت : عومەر لە دوو ساڵی پێش وەفاتیەوە رۆژوی گرێدابوو بە بەردەوامی مەگەر رۆژانی جەژنی قوربان و جەژنی رەمەزان یان لەکاتی سەفەر کردندا !!.

هەروەها عومەر بەشە و هەتا خوا حەزی پێ دەکرد نوێژی ئەکرد ، تا کۆتایی شەو ئەو کات خێزانەکەی بە خەبەر ئەهێنا و ئەیفەرموو : ( نوێژەکەتان ، نوێژەکەتان ، ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە : ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاَةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾[1] سورة طه ، آية ( ١٣٢ ) .

---

[1] – بروانە: ( سيره لعمر بن الخطاب ) ی احمد البلتاجي ( ص ٢٥٣ ) .

واتە : ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ، ئەی ئیماندار فەرمان بدە بە سەر هەموو تاکەکانی خێزانت تا نوێژەکەیان بە چاکی بکەن و کۆڵنەدەر بن لەسەری .

لە ئوم سەلەمەوە : عبدالرحمن کوڕی عەوف هاتە لای و وتی : دایە ، لەوە ئەترسم ئەو حاڵەی هەمە بە هەلاکەتمدا بەرێت ، دەبینی دەوڵەمەندترین کەسی قورەیشم ، وتی : دەی کوڕم ببەخشە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو : ( ان من اصحنةبو من لا یرانی بعد ان افارقـه ) واتـه : هەندێ لە هاوەڵانم دوای ئەوەی لێیان جیا دەبمەوە و کۆچ دەکەم ئیتر نامبیننەوە ، عبدالرحمن ی کوڕی عوف چووە دەرەوە و بە عومەر ( ﷺ ) گەیشت و ئەوەی ئوم سەلەمەی پێ ی وتبوو بە ئەویشی وت ، عومەریش هاتە لای ئوم سەلەمە ، فەرمووی : توخوا پێم بڵێ ، ئایا من یەکێکم لەوانە ؟ وتی : نەخێر ، بەڵام پاش تۆ ناتوانم بە هیچ کەسێکی کە بڵێم کە یەکێك نیە لەوانە ) [1].

لە حەسەنەوە ، دەڵێت : عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ (٧) مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ﴾ سورة الطور ، آية ( ٧ ، ٨ ) .

واتە : بەڕاستی سزا و ئازاری پەروەدگاری تۆ هەر پێش دێ ، کەسیش ناتوانێ بەری پێ بگرێت و نەهێڵێت .

دوای ئەوەش تووشی هەناسە تەنگی یەك ( پشوو سواری یەك ) هات ، تا بیست ڕۆژ لە جێ کەوت و خەڵکی دەهاتن بۆ لای .

لە عوبەیدی کوڕی عومەرەوە ( ﷺ ) دەڵێت : عمری کوڕی خەتاب نوێژی بەیانی دابەست و دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ( یوسف ) و بەردەوام بوو تا گەیشتە﴿...وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ...﴾ سورة يوسف آية (٨٤).

واتە : ... چاوەکانی سپی هەڵگەڕا و ئاوی سپی تێزا و بینینی نەما لە ئاخ و داخ و خەفەت و ئێشدا ..

عومەر ( ﷺ ) گریا هەتا تار بوو ئەوجا ڕکوعی برد وە لە عبدالله ی کوڕی شەدادە وە ، دەڵێت گوێم لە کرو زانەوە و پرمەی گریانی عومەر بوو لە کاتێکدا من لە ڕیزەکانی کۆتاییدا بووم لە نوێژی بەیانیدا [2] ، و سورەتی ( یوسف ) ی دەخوێندەوە تا گەیشتە ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ سورة يوسف آية (٨٦).

[1] - هەیسەمی دەڵێت : بەزار ڕیوایەتی کردووە پیاوانیشی پیاوانی ڕاستبێژ و ( صحيح )ن . الجمع ژمارە (١٤٤٤٩).
[2] - بڕوانە: حياة الصحابه (٣/٢٦٠).

واتە :بەڕاستی من باسی سکاڵاو غەم و پەژارەم هەر بۆلای خوادەبەم .

هەروەها لە هیشامی کوڕی حەسەنەوە ، دەڵێت : عومەر کاتێ ئایەتێکی دەخوێندەوە هەناسەی لێدەبڕا و دەگریا هەتا دەکەوت ، پاشان لەماڵەوە دەمایەوە تا خەڵکی سەردانیان دەکرد وایان دەزانی نەخۆشە .

هەروەها لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : لەگەڵ عومەردا بووم ، تا چووە پشت دیوارێك بۆ هەندێك کاری خۆی ، گوێم لێ بوو کاتێ دیوارەکە لە نێوان هەردوکماندا بوو ، بە خۆی دەوت : عومەری کوڕی خەتاب : ئەمیری باوەڕداران ، بە هە ، بەهە ، سوێند بەخوا ئەی کوڕی خەتاب ، یان ئەبێ لە خوا بترسی یان ئەوەتا خۆت تووشی سزای خوا دەکەیت .

وە عومەر ( ﷺ ) پاش ئەوەی نوێژی عیشای بۆ خەڵکی دا ئەبەست و نوێژیان دەکرد دەچووە ماڵەوە و تا سبەینان ( فجر ) نوێژی ئەکرد .[1]

" زوهدی عومەر "

عومەر ڕەزای خوای لێبێ هەمیشە لە پێناوی خوادا لە خۆ بووردە بوو ، ژیانی زبر و ڕەق و خواردنی بەهەمان شێوە بوو ، بەلاَم بەرامبەر زاتی پەروەردگاری و بۆ ئەو کەسێکی دلاوەر و بە هێز بوو ، هەمیشە جلەکانی پینەکراو بوون بە پێستەیەك ، کوندەی بەسەرشانی خۆی هەڵدەگرت لەگەڵ ئەو هەموو هەیبەت و سامەی کە هەیبوو ، وە سواری گوێدرێژێکی ڕووتی بێ کورتان دەبوو ، لە کاتێکدا حوشترەکان بەریشاڵ و دەزوو هەوسار کرابوون ، کەسێك بوو زۆر کەم پێ دەکەنی گاڵتەی لەگەڵ کەس نەئەکرد ، مستیلەکەی بەم وتەیە نەخش کردبوو : ( كفى بالموت واعظاً يا عمر ) .[2] .

واتە : ئەی عومەر مردن بەسە ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆت ...

کاتێکیش بوو بە خەلیفە ، فەرمووی : ( لەماڵی خوا لە دوو دەست بەرگ زیاتر بۆ من حەلاَڵ نی یە ، بەرگێك بۆ زستان و بەرگێك بۆ هاوین ، خۆراکی منیش ئەبێ هەر وەك خۆراکی پیاوێکی ئاسایی قورەیش بێت نەك ئەوەیان کە دارایە .. لەپاشدا ، منیش تاکێکم لە موسڵمانان !! .

[1] - بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٢١٥ ) .

[2] - بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٢١٤ ) .

ئەی خالقی ئەم کەڵە پیاوە ، پاکی و بێ گەردی بۆ تۆ ، داخۆ قورئان چی لە دڵ و دەروونی ئەوانە کردووە ؟! .

خوێنەری بەڕێز ورد بەرەوە لە حاڵی ( خەلیفە) و ئەوەی کە بەسیەتی لە خەلیفەیەتی ... دەی خوا پیرۆزی کات ئەو ئاینەی پەروەردەی کردی و ئەو پێغەمبەرەی فێری کردیت .

موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەڵێت : ( سەبارەت ئەبوبەکر ئەوە کەسێك بوو نەدنیای دەویست و نە دنیاش ئەوی دەویست ، سەبارەت بە عومەریش ئەوە دنیا ئەوی ویست ، بەڵام ئەم دونیای نەویست ، هەرچی ئێمەشە ئەوا دنیا بە ئارەزووی خۆی ئەمدیو ئەو دیومان پێ ئەکات و دەمانگەوزێنێ ..

جارێك گلەیی لە عومەر کرا دەربارەی حاڵی خۆی پێ وترا : چی ئەبو ئەگەر خواردنێکی باشت بخواردایە .. باشتر بوو تاوەکو لەش ساخ بیت و بتوانیت بەرگری لە هەق بکەیت ؟ ئەویش فەرمووی : من هەر دوو هاوەڵەکەم لەسەر ڕێ یەك بە جێ هێشتووە ، خۆ ئەگەر ڕێگەکەیانم دۆزیەوە و پێ ی گەیشتم بە شوێنپێگرتنیان پێیان دەگەم ، خۆ بەدانیشتن لەماڵەوە پێیان ناگەم .

هەروەها لە کاتێکدا ئەو جێنشینی پێغەمبەر بوو ( ﷺ ) کەچی جلێکی خوری لەبەر ئەکرد ، هەندێکی بە پێستە پینە کرا بوو و بە بازاڕەکاندا دەسوڕایەوە و قامچی یەکی ( بەدەستەوە بوو ) ، بۆ ڕاست کردنەوە و پەروەردە کردنی خەڵك ، خۆ ئەگەر ناوکە خورمایەکی یان هەر شتێك پێبگەشتایە هەڵی ئەگرت و فڕێ ی دەدایە ماڵی خەڵکی تا سوودی لێ ببینن .[1]

لە وشکە ساڵەکەیشدا تەنها نان و زەیتی دەخوارد تاوەکو پێستی ڕەش بوو بوویەوە ، بەردەوام دەی فەرموو : ( من خراپترین والیم ئەگەر خۆم تێربم و خەڵکیش برسی ) .

## " چەند لاپەڕەیەکی ڕووناك لە ژیانی "

*چۆن ئەکرێ شوێن نهێنی و ڕازەکانی عومەر بکەویت ؟!

تەڵحەی کوڕی عبیداللە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : جارێك و لە شەوێکی تاریکدا عومەر چووە دەرەوە خۆی کرد بە ماڵێکدا کاتێ ڕۆژ بووە وە ، چووم بۆ ئەو ماڵە بینیم پیرە ژنێکی

[1] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٢١٤ ) .

کوڕی پەککەوتە لەوێیە ؟ پرسیم : ئەو پیاوە ئیشی چیە وا دێت بۆ لات ؟ ژنەکە وتی : ئەوە بەینا و بەین هەرچی پێویستم بێ بۆم دێنێ و پیسی و پاشەڕۆکانم فڕێ ئەدات !! منیش بەخۆم وت : دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات تەڵحە ، مەگەر ئەکرێ شوێن نهێنیەکانی عومەر بکەویت ؟ [1]

## " موژدەی کوڕێك بەهاوەڵەکەت بدە "

شتێکی سەیر و نموونەیەکی ناوازەیە .. بەڕاستی ئەمەی لەسەر ئەم لاپەڕانە نیشانی ئەدەین قەڵەم لە ئاستیدا ناتەواون و لاوازە .. داخۆ ئێمە لە جیهانی ئەندێشەداین یان ڕاستەقینە ؟ بخوێنەرەوە : –

ئەسلەم دەڵێت : جارێکیان ئەو کاتەی عومەر ئەمیری ئیمانداران بوو شەوێك لەگەڵیا چوومە دەرەوە ڕۆشتین بەرەو ( دەوروبەری شار ) ، بەردەوام بووین تاماڵێکی لە پوش و پەلاش دروستکراومان پێ گەیشت بەرەو ماڵەکە چووین بینیمان ئافرەتێکی تیایە نزیکی منداڵ بوونیەتی و لەتاو ئازار دەگری ... عومەر هەواڵی پرسی .. ئافرەتەکە وتی : من ئاوارە و غەریبم و هیچ شتێ شك نابەم .. عومەریش دەستی بەگریان کرد و خێرا بەرەو ماڵ کەوتەڕێ به خاتوو ( ئوم کلثوم )ی خێزانی کە کچی پێشەوا علی کوڕی ئەبی تالیبە ( ﷺ ) فەرموو : ئایا خێر و چاکەیەکت ناوێ خوای پەروەردگار هێناویەتیە ڕێت ؟ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی : – بەڵێ ئامادەم ... دواتر پێشەوا عومەر ( ﷺ ) بڕێك ئارد و چەوریی بەشان هەڵگرت و خێزانەکەشی ئەوەی بۆ منداڵ بوون دەست بدات و پێویست بێ لەگەڵ خۆی هەڵیگرت و هێنایان بۆ ئافرەتەکە و خاتوو ئوم کلثوم چووە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتەکە و عومەریش ( ﷺ ) لەگەڵ هاوسەری ژنەکەدا دانیشت ... مێردی ئافرەتەکە پێشەوا عومەری نەدەناسی و بەیەکەوە کەوتبوونە گفتوگۆ .. دواتر ئافرەتەکە کوڕێکی بوو ... خاتوو ئوم کلثوم بە پێشەوا عومەری وت : ( ئەی ئەمیری ئیمانداران ... موژدەی کوڕێك بە هاوڵەکەت بدە ) کاتێ پیاوە ئەمەی بیست زۆر لای گەورە بوو ... داوای لێبوردنی لە پێشەوا عومەر کرد . ئەویش فەرمووی : ( گوێ ی پێ مەدە ... ئاسایی یە ) پاشان بڕێك بژێوی و ئەوەی پێویستی بوو پێ ی دان و ڕۆیشت .. [2]

---

[1] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٢١٥ ) .

[2] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٢١٦ ) .

*بەکۆڵ هەڵیئەگرم !! ئەسلەم دەڵێت : شەوێکیان لەگەڵ عومەردا چووین بۆ (حرە واقم ) تا گەیشتینە ( بصرار) و ئاگرێکمان بەدی کرد .

عومەر فەرمووی : ئەسلەم ، هەر لێرە ڕێبوارانێك هەن شەوگار هێشتونیەتیەوە ، بڕۆ بابچینە لایان ، چوین بینیمان ئافرەتێك لەوێیە لەگەڵ منداڵەکانیدا مەنجەڵێکیان ناوەتە سەر ئاگر و منالەکانی هاواریانە ، عومەر فەرمووی : سڵاوی خواتان لێ بێت ئەی ئەهلی ڕوناکی * ... ئافرەتەکە وتی : سڵاو لە تۆش . عومەر نزیك بووە وە فەرمووی : چیتانە ؟ ئافرەتەکە وتی : شەوو سەرما ڕێگەیان لێ گرتووین لێرەدا ... فەرموی : ئەی ئەو منالأنە بۆ هاوار ئەکەن ؟

ئافرەتەکە وتی : لەبرسانا .. فەرمووی : ئەی ئەوە چی یە لەسەر ئاگرەکە ؟ وتی : ئاوە و خستوومەتە سەر تاوەکو بیانخەڵەتێنم تا دەخەون ، خواشاهیدە ... عومەریش ( ﷺ ) گریا و خێرا بەرەو ئەو جێگایەی ئاردیان تێدا دائەنا ڕۆیشت بڕێك ئارد و کۆشێ ( هەمبانێ ) چەوری دەرهێنا و بە ئەسلەمی فەرموو : بیخەرە سەر پشتم ) ئەسەلەم دەڵێت : وتم با من لەبری تۆ هەڵیبگرم ، فەرمووی : ئایا تۆ لە قیامەتدا ئاواتەکانم هەڵ ئەگری ؟! و ئیتر خستیە سەر پشتی خۆی و چووین بۆ لای ئافرەتەکە و عومەر کۆڵەکەی سەر پشتی داگرت و بە جامێك بڕێ ئاردی دەرهێنا و بڕێك لە چەوری یەکەی کرد بەسەردا و بەردەوام فووی دەکرد بە بنی مەنجەڵەکەدا تا ئاگرەکە هەڵکات و دووکەڵ نزیکەی کاتژمێرێك بەڕیشیدا ڕۆ دەچوو ، دواتر مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگرەکەدا گرت و فەرمووی : قاپێکم بەرێ ، ئافرەتەکەش بۆی هێنا ، لەوخۆراکە پڕی کرد و خستیە بەردەمی منداڵەکان و فەرمووی لێکردن . ئەوانیش هەتا تێر بوون لێیان خوارد ئافرەتەکەش بەردەوام دوعای خێری بۆ دەکرد بێ ئەوەی بیناسێ .. ئەسلەمە دەڵێت : عومەر ( ﷺ ) لایان مایەوە تا منداڵەکان خەویان لێ کەوت ، پاشان بڕێك بژێوی پێدان و ڕۆیشت ، ئەسلەم دەڵێ : پاشان هات بەرەو ڕووم و پێمی فەرموو : ئەی ئەسلەم : برسێتی وای لێ کرد بوون خەویان لێ نەوکەوێت و بگرین ، بۆیە حەزم کرد لایان بمێنمەوە تا ئەمەی کە دیتم ببینم . ) [1]

* واتە ئەی ئەو کەسانەی بەم ئاگرە ئەم ناوەتان ڕووناك کردوەتەوە .

[1] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٢١٦ ) عمر بن الخطاب / ی ئیبنو جوزی ( ٩٦ ، ٩٧ ) .

بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران ، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕاستی فەرمووە کە دەڵێت : خاب عبد و خسر من لم يجعل الله تعالى في قلبه رحمة للبشر ) [1]

واتە : ئەو بەندەی کە خودا لە دڵیدا بەزەیی دروست نەکردووە بەرانبەرمرۆڤەکان ئەوە بەندەیەکی خەسارەوەمەندو هیوا بڕاوە .

" سەر ڕاستی ڕەعیەت لەسەر ڕاستی چاودێرە کەیانەوەیە "

لە سەعدی کوڕی موسەیب ( ﷺ ) دەفەرموێت : عومەر فەرمووی : ( بێ گومان خەڵکی بەسەر ڕاستی و لەسەر ڕێی چاکە دەمێننەوە مادەم پێشەوا و ڕێنمونیکارەکانیان سەر ڕاست بن ) [2] .

وە لە جریری کوڕی عبدالله ی بەجەلیەوە یەوە ( ﷺ ) دەفەرموێت : -

کابرایەك لەگەڵ ئەبی موسای ئەشعەریدا لەیەکێ لە غەزاکاندا بوو ، خاوەنی دەنگێکی دوژمن بەزێن بوو، ئەوە بوو دەستکەوتێکی باشیان بە دەست هێنا ، بەلاّم ئەبو موسای ئەشعری برێك لە بەشەکەی پێ داو ماف تەواوی خۆی پێ نەدا کابرا ناڕەزایی دەربڕی ... بۆیە ئەبو موسای ئەشعەری بیست قامچی لێ داو سەری سفر کرد ! پیاوەکە قژەکانی سەری کۆ کردەوە و چوو بۆ لای عومەر ( ﷺ ) و لەناو کۆڕەکەیدا قژەکەی فڕێ دایە سەر سنگی عومەر و وتی :

( سوێند بە خوا لە ترسی دۆزەخ نەبوایە وەها وەهام بە پیاوەکەت دەکرد (مەبەستی ئەبی موسا ) یە ! ) وە پاشان ئەوەی ئەبو موسا بەسەریدا هێنا بووی گێڕایەوە.. )

عومەریش ( ﷺ ) ئەمەی بۆ ئەبو موسا نووسی :

" سلاّوت لێ بێت ، پاشان .. فلاّن کەس ئەوە و ئەوەی پێ ڕاگەیاندم . ئەگەر تۆ کارێکی وەهات ئەنجام داوە لەبەرچاوی کۆمەڵێ خەڵکدا ، ئەوە سوێندت لەسەر بێت کە ئەبێ لەبەر چاوی خەڵکدا و لەبەردەستیدا دانیشیت و هەقت لێ بکاتەوە ( چیت لێ کردووە وەهات لێ بکاتەوە ) وە ئەگەر لە چۆڵەوانی و لە نێوان خۆت و ئەو دا ئەو کارەت کردووە ئەوا هەر بەو شێوەیە ئەویش لە چۆڵەوانیدا دەبێ ماف خۆیت لێ وەرگرێتەوە "

---

[1] - فەرمووی ( حسن )ە / ئەبو نەعیم وغەیری ئەو ریوایەتی کردووە لە ( المعرفه )دا . ئەلبانی بە باش داینـاوە لە ( صحيح الجامع ) ( ٣٢٠٥ ) دا .

[2] - بڕوانە : سیرەی عومەر – البتاجی ٠ ٩٦ ).

کابرا نووسراوەکەی عومەر ( ﷺ )ی هێنا بۆ ئەبو موسا ، خەڵك بە پیاوەکەیان دەوت کە لیَ ی خۆش بیَ ! .. بەڵام پیاوەکە وتی سوێند بە خوا لەبەر خاتر هیچ کەس لیَ ی خۆش نابم .

ئینجا ئەبوو مووسا ناچار لەبەر دەستی پیاوەدا دانیشت تا ( تۆڵەی )ی لیَ وەرگرێتەوە .. لەوکاتەدا پیاوەکە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە ، وتی : ئەی پەروەردگار ئەوا لیَ خۆش بووم ! [1] .

بە بیَ هیچ لەسەر دوانێك و زیادە ڕۆی یەك دەڵێم کە بەڕاستی ئەمەیە ئیسلام ...

" لە ئامۆژگاری یەکانی ئیمامی عومەر ( ﷺ ) "

" ئەی خەڵکینە : بزانن بەڕاستی ئێمە کاتیَ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەناوماندا بوو وە سروشی بۆ دەهاتەخوارەوە و لە کاتێکدا خوای پەروەردگار هەواڵی ئێوەی پیَ دەداین ، ئێوەمان دەناسی .

ئێستا کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەناوماندا نەماوە سروشیش ئێدی لێمان دا بڕاوە ! بزانن .. بیَ گومان بەوەی کە پێیەوە دەتانناسین قسە دەکەین و لەسەر ئەو بنچینە یە ئەدوێین .

پێتان ئەڵێین : هەر کەس لە ئێوە چاکەی لیَ ئاشکرا بوو ، ئێمەش گومانی باشی پیَ دەبەین و بەچاکە وەڵامی دەدەینەوە هەر کەسیش خراپەی لیَ ئاشکرا بوو .. ئێمەش گومانی خراپی پیَ دەبەین و لەسەر ئەوەش کینەی لیَ دەکەین ڕازەکانتان لە نێوان خۆتان و خوای خۆتاندایە .. سەردەمێك من وامدەزانی ئەوەی قورئان دەخوێنیَ لە بەرخاتری خوا و پاداشتی خوایە ، کەچی لەم دواییانەدا وا هەست دەکەم پیاوانێك هەن قورئان دەخوێنن لەبەر خاتری خەڵك و پاداشتی خەڵکە ...

ئەمەویَ قورئان خوێندنتان بۆ خوا بێت و دەمەویَ کردەوکانتان لەبەر خاتری خوئەبوت .

ئاگادار بن .. سوێند بەخوا من کاربەدەستەکانم بۆ ئەوە نانێرمە لاتان کە لێتان بدەن و ماڵ و سامانتان داگیر بکەن ، بەڵکو بۆ ئەوە دەیاننێرمە لاتان تاوەکو فێری ئاین و سوننەتان بکەن کە باوەڕتان پیَ هێناوە .

---

[1] - سيرة عمر بن خطاب – البلتاجى ( ٩٧ – ٩٨ ) .

کەواتە ئەوەی غەیری ئەمانەی پێکرا با بەرزی کاتەوە بۆم و سکاڵای خۆی بکات .
سوێند بەو خوایە کە نەفسی منی بە دەستە مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە .
لەم کاتەدا عەمری کوڕی عاص هەڵسایەوە وە وتی : ئەی ئەمیری ئیمانداران : ئەی ئەگەر ئەوکەس یەکێ بوو لەو موسڵمانانەی چاو دێر و بەر پرسە بەرامبەر ڕەعیەتەکەی بۆ تەمبی کردنیان ئەم کارەی کرد ، ئایا تۆ هەر ( تۆڵەی )ی لێ وەردەگریتەوە ؟
عومەر فەرمووی : ئەرێ بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ، تۆڵەی لێ وەردەگرمەوە ، چونکە پێغەمبەرم ( ﷺ ) بینیوە لە زاتی خۆی ( تۆڵەی )ی وەرگرتووەتەوە .ئاگاداربن ... نەکەن لە موسڵمانان بدەن و سوکیان کەن .. ماف خۆیانیان لێ زەوت مەکەن و لە ئەنجامدا کافریان بکەن .. و لە بۆ سەو پێشەکاندا دایانمەبەزێنن نەکا لە دەستتان بچن .[1]

## " ئامۆژگاری عومەر بۆ ڕەعیەت "

" خۆتان بە دەستی خۆتان مافەکان بدەن .. وە کەس کەسی تر تاوانبار نەکات تاوەکو لەبەردەم مندا ڕاستی یەکان دەردەخەن و دادبینی دەکەن .. ئەوەش بزانن کە چاکی و باشی هەرکارێك لە سێ شتدایە : —
ئەوشتە بە هەق وەربگرێت و لە هەقدا بدرێت ورێگری ناهەقی لێ بکرێت ...
پەیمانی ئەوەتان ئەدەمێ کە هیچ شتێك نەلەسەرانەتان و نەلەوەی خودا فەرزی کردووە لە سەرتان کۆ نەکەمەوە لێتان مەگەر بە هەق واتە : هەقی — بیت المال .
هەروەها ئەوەش لە ئەستۆ ئەگرم ئەوپارە کەوتە دەستمەوە نئەبو لە دەستم دەرچێت مەگەر بە هەق ، واتە : بەرپرس دەبم لەوەی بەداد پەروەرانە دابەشی کەم .
وە مافی ئێوەیە لەسەرم کە لە بەخشش و ڕۆزی یەکانتان زیاد کەم بە یارمەتی خودا ...

[1] - پێشەوا عومەر سێ کاری لە والی یەکان قەدەغە کرد کە دەرهەق بە ڕەعیەتەکەیان ئەنجامی بدەن : قەدەغەی کرد بوو کە لێیان بدرێت ، تا سووك نەبن و پیاوەتی و هەیبەتیان نەمێنێ . قەدەغەی کرد بوو لە مافی تەواوی خۆیان بێ بەشیان بکەن تاوەکو بێ باوەڕ نەبن و بروایان بە دادپەروەری نەمێنێ کە تەرازوی ئاینەکەیانە ، هەروەها قەدەغەی کرد بوو کە سوپاکەیان جیا بکاتەوە و ە لەناو زەویەکانی دوژمندا بەش بەشیان کات و بەمەش دوژمن ئابلۆقەیان بدات و ناپاکی یان دەرهەق بکات . سیرەی عومەری کوڕی خەتاب ، مامۆستا احمدی بەلتاجی . لاپەڕە ( ٤٣ ) .

وە مافی ئێوە یە لەسەرم کە بەرەو تیاچوون ڕاپێچتان نەکەم و بۆ ماوەیەکی زۆر لە جەنگەکاندا نەتانهێڵمەوە دوور لە کەس و کار وماڵەکانتان [1] .

وە ئەگەر ویستتان بڕۆن بۆ جەنگ ، ئەوە هەتا دەگەڕێنەوە من باوکی منداڵەکانتانم دەی لە خوابترسن – ئەی بەندەکانی خوا – هاوکاریم بکەن لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ، لەودا کە خودا تیایدا منی کردووە بەسەرپەرشتیارتان ئامۆژگاریم بکەن ...

## " خۆراکی عومەر لە ساڵی گرانی یەکەدا ( لە وشکە ساڵی یەکەدا ) "

ئەسلەمی خزمەتکاری عومەر دەڵێت :

کاتێ عومەر ئێوارەی لێ ئەهات لە وشکەساڵی یەکەدا [2] – نانێکی دەهێنا لە ناو ڕۆندا دەی گوشی ، بەلاّم ڕۆژێکیان وشترێکی سەربڕی و دابەشی کرد بەسەر خەڵکدا ..

ئەو ڕۆژە چوو بەژووردا دەبینێت جامێك دووگ و چەوری حوشتر و جگەرێکی لێیە ! بۆی دانراوە .

پرسی : ئەمە مان لە کوێ بوو ؟

وتیان هی ئەو حوشترە یە کە ئەمڕۆ سەرمان بڕی !

عومەریش فەرمووی : بەهـ بەهـ [3] چ والی یەکم کە خۆم شتەباشەکان بخۆم و ئێسك و پروسکەکانیش دەرخواردی خەڵك بدەم .. ئینجا چوو نانێك و بڕێك زەیتی هێنا و کردنی بە ترپت پاشان بە غولاّمەکەی فەرموو : بەلاّت لێ دا ئەی یەرفا !

ئەم کاسەیە هەڵگرە و بیگەیەنە بە فلاّنە ماڵ لە مەدینە ، چونکە من ئەوە سێ ڕۆژە سەرم لێ نەداون . وابزانم زۆر برسین ..

(یەرفا)ش ئەو خواردنەخۆشەی هەڵگرت و بردی بۆ ئەو ماڵەی کە عومەر(ﷺ)ئەوانی دا بەسەر خۆیدا !

## " توندبوونی ئیمامی عومەر لە وشکە ساڵی یەکەدا لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەیدا "

---

[1] - چونکە هەموو کە تیبەیەك لە سوپا مۆڵەتێکیان هەیە بچنەوە ماڵەکانیان .

[2] - وشکەساڵی لە ( ١٨ ) کۆچیدا بوو .. باران نەدەباری و زەوی و زار وشك هەلاّت .

[3] - بە گاڵتە کردنەوە .

لە ئیبنو عومەرەوە ، دەڵێت :( کاتێ عومەر نەهی شتێکی لە خەڵکی ئەکرد ، دەهاتە لای ماڵ و منداڵەکەی و پێیانی دەفەرموو : ئەوا من نەهیم لە خەڵك کردووە بە فلاَنە و فلاَنە شت ... ئەوانیش سەیری ئێوە ئەکەن هەر وەك چۆن باڵندە سەیری گۆشت ئەکا ، خۆ ئەگەر ئێوە کەوتن ، ئەوانیش ئەکەون .. وە ئەگەر ئێوە ڕاپەڕین بۆ ئەنجامدانی ئەوانیش ئەنجامی ئەدەن ، لەبەر ئەوە منیش سوێند بەخوا هەر کەس لە ئێوە بکەوێتە ناو ئەوکارەوە کە نەهیم لە خەڵکی کردووە لە ئەنجامدانی ، ئەوا سزای دوو هێندی ئەدەم لەبەر نزیکیتان لەمنەوە ، ئیتر هەرکەس ئەیەوێ بێتە پێش بئەبوتە پێش ، هەرکەسیش ئەیەوێ دواکەوێ ، بادواکەوێ . )

ئیبنو سەعد دەڵێت :

لە وشکە ساڵی یەکەدا عومەر کاڵەکێکی بچوکی بە دەست یەکێ لە منداڵەکانیەوە بینی ، فەرمووی : بەهـ بەهـ ! کوری ئەمیری ئیمانداران ، ئەوە میوە ئەخۆیت کاتێ ئوممەتی ( ﷺ ) لە برسا لاواز بوون ؟ منداڵەکەشی بەڕاکردن و گریانەوە چووە دەرەوە . خەڵك بە عومەریان وت : منداڵەکە بە مشتێك ناووك کڕیویەتی [1] .

وە لە قەتادەوە ، دەڵێت :

موعەیقیب لە – بیت المال – گەنجینەوان بوو ، جارێك گسکی لەوێ دەدا و درهەمێکی دۆزیەوە دای بەیەکێ لە منداڵەکانی عومەر . موعەیقیب دەڵێ : دواتر چوومەوە بۆ ماڵ ، دەبینم نێردراوێکی عومەر هاتووە بۆ لام و بانگم دەکات .

چووم بۆلای عومەر دەبینم درهەمەکە لەناو دەستیدایە . پێی وتم : بەلاَت لێ دا ئەی موعەیقیب ، چیت لە من داوە [2] چیتە پێمەوە ؟

منیش وتم : ئەی ئەو درهەمە چی یە بەدەستەوە ؟

وتی : ویستت لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتی ( ﷺ ) بۆ ئەم درهەمە ڕووبەڕووم بووەستن ! درهەمەکەی دایەوە بە موعەیقیب . [3]

## " توندی لێپرسینەوەی عومەر بۆ ماڵ و مناڵی "

---

[1] - واتە بە تۆو و ناوکی هەندێ درەختی وەك خورما و هیتر .. واتە شتێکی بێ بایەخ کڕیویەتی کە بۆ کەسانی وەك ئەو ( منداڵ ) ناسانەشتی وا کۆ بکاتەوە .

[2] - چ دوژمنایەتی یەك لە نێوان من و تۆدا هەبووە تا ئێستا ڕقت لێم بێتەوە . .

[3] - سیرەی عومەری کوڕی خەتاب . . بەلتاجی ( ٦٠ – ٦١ ) .

عبدالله کوڕی عومەر ( ﷺ ) دەڵێت :

حوشترێکم کڕی و ناردم بۆ ( حمی ) [1] کە لەوێ وەك حوشتری خەڵکی بلەوەڕێ ، کاتێ گۆشتی گرت .. عومەر هاتە بازاڕ و لەوێ حوشترێکی گۆشتنی بینی ...

فەرمووی : ئەمەهی کێ یە ؟

پێ ی وترا / هی عبدالله ی کوڕی عومەرە .

پێشەوا عومەر لەبەردەم خۆیەوە دەیفەرموو : بەهـ بەهـ ! کوڕی ئەمیری ئیمانداران ! منیش هاتم بۆ لای و پێم وت : – چی بووە ئەی ئەمیری باوەڕداران ؟

پرسی / ئەم حوشترە چی یە ؟

وتم کڕیم و ناردمە ( حمی ) تاوەك ئەو خەڵکە منیش سوودی لێ ببینم .

فەرمووی / تاوەکو بڵێن : حوشتری کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە بیلەوەڕێنن ، حوشتری کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە ئاوی بدەن ، پاشان فەرمووی / بڕۆ ( عبدالله ) پارەی کڕینەکەی خۆتی لێ هەڵگرە و ئەوەشی مایەوە بیخەرە – بیت المال – بۆ موسڵمانان [2]

## " عومەر و هاوسەرەکەی "

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە ، دەڵێت :

( لەبەحرەینەوە بڕێك میسك و عەنبەر هێنرا بۆ عومەر ، فەرمووی / سوێند بەخوا حەزم ئەکرد ئافرەتێك هەبوایە بەباشی کێشانەی بکردایە تاوەکو دابەشی کەم بەسەر خەڵکیدا ) .

عاتکەی خێزانی پێ ی وت : من باش کێشانە دەکەم ، بمدەرێ با بۆت بکێشم .

عومەر فەرمووی : نەخێر .

عاتکە پرسی / بۆچی نا ؟

• فەرموی / ئەترسم وەها بیبەیت و بڕێك لە خۆت بدەی و بەوەش بەشێکی موسڵمانان کەم بێتەوە ...

---

[1] - حمی / لە وەرگایەك بوو لە قەراغ شاردا .

[2] - واتە بیفرۆشە و چەندت پێ دا بو هەڵیگرەوە و ئەوەشی مایەوە بخەرەوە خەزێنەی دەوڵەت بۆ موسڵمانان .

## " عومەر و کەم ئەندامانی جەنگ "

لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ، دەفەرموێت : -

لە کاتێکدا خەڵکی خەریکی وەرگرتنی بەشی خۆیان بوون لە نێو دەستی عومەردا، عومەر ( ﷺ ) سەری بەرز کردەوە چاوی بە پیاوێك کەوت برینێك لە دەم و چاویدا بوو ، لیٚ ی پرسی . ئەویش لە وەڵامدا وتی / لە یەکیٚ لە جەنگەکاندا کە لەگەڵ موو... اندا چوو بوین بریندار بووم .

عومەر فەرموی / هەزار درهەمی بۆ بژمێرن .. هەزار درهەم درا بە پیاوەکە .

پاشان فەرمووی / هەزاری تری بۆ بژمێرن ، هەزاری تری دا بە پیاوەکە .. عومەر چوار جار ئەمەی و تەوە هەرجارێك هەزار درهەم ئەدرا بە کابرا تاوەکو پیاوەکە شەرم گرتی چووە دەرەوە .

عبدالله دەڵێت : عومەر هەواڵی کابرای پرسی ، پێیان وت: وا بزانم شەرم گرتی چووەتە دەرەوە بە هۆی ئەو هەموو بەخششەوە کە پیٚ ی ئەدرا ..

عومەریش فەرموی / دەی سوێند بەخوا ئەگەر بمایەتەوە تادرهەمیٚ هەبوایە بەردەوام پێم ئەدا ، چۆن بم دەرهەق بە پیاوێك لە پێناوی خودا بریندار بووە چاڵێکی لە دەم و چاویدا دروست کردووە .[1]

## " عومەر و خانەوادەی شەهیدان "

لە جابرەوە ( ﷺ ) دەڵێت : شەوێك لەگەڵ عومەردا ( ﷺ ) بەناو شاردا ئێشکگریمان دەکرد تا گەیشتینە لای خەیمەیەك ئاگرێکی کزی تیا بوو ، بەینیٚ دەکوژایەوە و بەینیٚ دادەگیرسایەوە ، و دەنگێکی غەمباری گویٚ لیٚ بوو ، عومەر فەرمووی : لە جیٚ ی خۆتان بوەستن ، ڕۆشت تاگەیشتە لای خەیمەکە ، بینی ئافرەتێکە دەڵێت : -

على محمد صلاة الأبرار　　صلى عليه المصطفون الأخيار

قدكنت قواما على الأسحار　　فليت شعرى و المنايا أطوار

هلى تجمعنى و حبيبى الدار ؟

[1] - سیرەی عومەر . بەلتاجی ( ٧٣ — ٧٤ ) .

عومەر ( ﷺ ) گریا هەتا دەنگی بەرز بووەو ، پاشان چوو هەتا لە خەیمەکەوە نزیك بوویەوە .

فەرمووی / سلاوتان لێ بێت ، سێ جار دووبارەی کردەوە . لە سێیەم جاردا مۆڵەتی پێ درا بچێتە ژوورەوە . عومەر فەرمووی / قسەکانتم بۆ دووبارە بکەرەوە . ئەویش بە دەنگێکی خەفەتبارەوە بۆی دووبارە کردەوە ، عومەریش ( ﷺ ) دەستی بەگریان کرد .پاشان بە ئافرەتەکەی فەرموو : رەحمەتی خوات لێ بێت عومەریشت بیر نەچێت ...

**ئافرەتەکەش وتی** : و عمر اغفر له انك غفار [1]

## " عومەر پلان بۆ سەرکردەکانی جەنگ دادەنێت "

جەنگی قادسیە سێ رۆژی خایاند ، قادسیەش دەرگا یەك بوو لە رێیەوە ئیسلام گەیەنرایە عێراق و فارس و هەموو رۆژهەڵات ، لەبەر ئەوە جەنگێکی چارەنووس ساز بوو لە نێوان موسڵمانان و فارس و مەجوسی یەکاندا .

عومەر ( سعدی کوری ئەبی وەقاص[2] )ی بەسەر کردەی سوپاکەی هەڵبژارد . ئەوە بوو ساڵی ( ١٤ ك ) لە شارچووە دەرێ و لە زەوی عێراق قادسیەی کردە لەشکر بەست .

مەیدانی جەنگەکەی وا هەڵبژارد کە بکەوێتە نێوان بیابان و ئەو تۆرە ئاوی یە ئاڵۆزەی لە زەوی عێراقدایە تاوەکو سوپای موسڵمانان تووشی شەرنەبێت لەسەر زەوی یەك کە پێ ی ئاشنا نەبووە و شارەزایی لە مەترسی یەکانی نی یە .

وە بۆ ئەوەی ئەگەر شەر لە دژی سوپاکەی بەریا بوو بتوانێت بەرەو بیابان پاشەکشەیان پێ بکات و بەو جۆرە هێرش بەرێت و بگەرێتەوە ، لەبەر ئەوەی ئەم ئاشناترە بەرێ و شوێنی بیابان .

بەلام ئەگەر جەنگ لە دژی فارسەکان روویدا ئەوە دوژمن لە بەردەمیاندا بێت و دەریاش لە پشتیانەوە و شمشێرەکانی موسڵمانان لەناو یان دەبات و بەوجۆرەکەسیان نامێنێتەوە . هەر واش بوو ئەوەی ئەو سەرکردە لێهاتووە چاوەروانی کرد هاتەدی .

---

[1] – سیرەی عمر . بەلتاجی (٨٢ ، ٨٣).

[2] – دواتر باسی ژیانی ئەم هاوەڵە بەرێزەش دێتە پێشەوە .

وە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ( ﷺ ) لە قادسیە دابەزی و ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی سوپای فارسەکانی کرد ، بەڵام نەهاتن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی موسڵمانان ، تا چەند شاڵاوێکیان هێنا بۆ سنوورەکانی دەورووبەری عێراق لە ڕووی باکور و باشوورەوە بۆ ئەوەی بیانوورووژێنن...

فارسەکان هاوار و سکاڵایان بردە لای ( یەزدەجرد ) ی پاشا یان و داوای پاراستنیان دەکرد ، ئەویش داوای لە ( روستم )ی سەرکردەی سوپاکەی کرد بەڕووبەڕوو بوونەوەی موسڵمانان لە قادسیە ، بەو جۆرە ( روستم ) سوپاکەی خستە ڕێ و لەبەردەم سوپای موسڵماناندا دەرکەوتن .

جەنگێکی توندی سێ ڕۆژی لە نێوانیاندا ڕووی دا و بەسەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی پێ هات . سەرکەوتنێکی بەزەبر .

جەنگی قادسیە یەکێك بوو لە جەنگە مێژوویی یە یەکلاکەرەوەکان کە پشتی فارسەکانی شکاند و ئیتر دوای ئەوە نەیانتوانی ئەو هێزەی جارانیان بە دەست بێننەوە تاوەکو پاش چەند شکستهێنانێکی یەك لە دوای یەك دەوڵەتەکەیان ڕوخا ..

ئەوە بوو عومەری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) هەندێ ئامۆژگاری سەعدی کرد پێش بەڕێ کردنی سوپاکەیان ، لەوانە : -

( گوێ لە هاوەڵەکانت ڕاگرە و لە فەرمانەکانتدا بەشداریان کە و پەلەمەکە لە بڕیارداندا ، بەڵکو لەسەرخۆ بڕیار بدە .

بزانە ئەمە جەنگە و پیاوی جەنگیش ئەو پیاوەیە کە چاوەڕێ دەکات تابزانێت دەرفەت کامەیە ... لەڕاستیشدا تۆ بەرە و زەوی یەك دەچیت کە بە فێڵ و تەڵەکە و ناپاکی ناسراوە .. بەرەو ڕوی کەسانێك دەچیت کە پرکێشییان کرد بەسەر خراپە داو بێ باکانە ئەنجامیاندا و چاکەیان لە بیر خۆیان بردەوە و لێی بێ ئاگا بوون ، ئیتر بزانە چۆن دەبێت ، زمانت بپارێزەو کەو نهێنیت ئاشکرا مەکە [1] .

[1] - سیرەی عومەر / بێلتاجی ( ١٦٩ ، ١٧٢ ) بە دەستکاریەوە .

## " ئامۆژگاریەکانی عومەر بۆ سوپای موجاهیدەکان "

( حیوە )ی کوڕی ( شریح ) دەڵێت :

کاتێ عومەر سوپاکانی بەرێ دەکرد ئامۆژگاری دەکردن بە تەقوای خوا و پاشان دوای ئەوەی سوپای دابەش دەکرد جیادەکرانەوە دەیفەرموو : -

( بەناوی خوا و بە پشتیوانی خوا ، بەڕێ کەون بە ئومێدی پشتگیری خوا و سەرکەوتن ، بە پەیوەست بوون بە هەق و ئارامگری یەوە ..

لە پێناوی خوا دا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا باوەڕیان بە خوا نی یە و دەستدرێژی مەکەن ، چونکە خوا دەستدرێژکەرانی خۆشناوێت ، پاشان ، کاتێ بە دوژمنتان گەیشتن ترسنۆك مەبن وە کاتێ دەسەڵاتتان هەبوو کوژراوەکان مەشێوێنن ، وە لە کاتی دەرکەوتندا زیادە ڕۆیی مەکەن وە لە کاتی شەڕدا قسەمەکەن .

هەروەها ئافرەت و پیاوی پیر و منداڵ مەکوژن هەروەك کاتێ بەیەك گەیشتن و گەرمەی جەنگ و هێرش بردن خۆتان لە کوشتنیان بپارێزن واتە : ( پیر و منداڵ و ئافرەت)

هەڵپە مەکەن و لە دەستکەوتەکان مەدزن ، جیهاد پاك ڕاگرن و خواستەکانی دنیای تێکەڵ مەکەن و بەوسەرکەوتن و دەستەکەوتانە خۆشحاڵ بن کە لە پەیمانێکدا دەستان دەکەوێت داوتانە بە پەروەردگارتان و هەر ئەوە سەرکەوتنی مەزنە ) .

## "لە ئامۆژگاریەکانی عومەر بۆ
## ( سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ) ( رضي الله عنه ) فەرماندەی سوپاکەی"

کاتێ عومەر ( رضي الله عنه ) ( سەعد )ی کردە فەرماندەی سوپاکەی لە عێراق بەم جۆرە ئامۆژگاری کرد : - ( ئەی سەعد ، ئەوە فریوت نەدا و لە خوا دوورت نەخاتەوە کە پێت بوترێت : خاڵی پێغەمبەری خوا و هاوەڵی .. ، چونکە لە نێوان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هیچ کەسێکی کەدا خزمایەتی یەك نی یە مەگەر بە گوێڕایەڵی کردنی خوا .

دەی تۆش هەر ئەوە بکە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیکرد و ئەوەش واز لێ بێنە کە ئەو وازی لێ دەهێنا ئەمە ئامۆژگاری منە بۆ تۆ ) .

## " چیرۆکی عومەر و جبلەی کوڕی ئەیهەم "

دەگێڕنەوە کە جبلەی کوڕی ئەیهەمی کۆتا پاشای غەساسنەکان کاتێ ویستی لە ئیسلام بوون بوو ، بە کەژاوەیەکی گەورەوە هاتە مەدینە ، کە جل و بەرگێکی ناوازە و تایبەتی یان لەبەردا بوو خۆیشی تاجەکەی بەسەرەوە بوو .

ئەوە بوو پێشەوا عومەر ( ﷺ ) بەهاتنیان خۆشحاڵ بوو دواتر و کاتێ وەرزی حەج هاتە پێشەوە ، جبلە لەگەڵ عومەر چوو بۆ حەج کاتێ جبلە خەریکی تەوافی ماڵی خوا بو پیاوێك لەو خەڵکە پێینا بە جلەکانیدا و ( دڕاند )ی ، ئەویش زللەیەکی لە دەم و لوتی دا پڕی کرد لە خوێن .

## " پیاوەکە چووە لای پێشەوا عومەر بۆ سکاڵا "

عومەر لە جبلەی پرسی : چی وای لێ کردی لەم پیاوە بدەی ؟

وتی : پێ ی بە جلەکانمدا ناو دڕاندی .

عومەر فەرمووی : کەواتە مادەم دانی پێدادەنێیت کە لێت داوە یان ئەبێ کابرا ڕازی کەیت بە جۆرێك یان ئەبێ چیت لێ کردووە وەهات لێ بکاتەوە .

جبیلەش وتی : شتی وائەکرێ ؟ لە کاتێکدا من پادشایەکم و ئەو کەسێکی ڕەش و ڕووتە ؟

عومەر فەرمووی : ئیسلام ئێوەی یەکسان کردووە ، تۆش بە هیچ شتێك چاکە و فەزڵت بەسەریەوە نی یە بەتەقوا نەبێ .

جبیلە وتی : سوێند بە خوا هیوام وا بوو کە بە موسڵمان بوونم زیاتر ڕێزدار و دەستڕۆ شتوو دەبم لەو کاتەم کە لە نەفامیدا بووم .

عومەریش فەرمووی : دەی هەروایە .[1]

جبیلەش وتی : تا بەیانی بۆم دوانی تا بیرێکی لێ بکەمەوە ، ئەی ئەمیری ئیمانداران .

---

[1] - واتە : بەڵێ تۆ ڕێزدار ترین بە ئیسلام بونت مادەم لەسەر هەق بیت ، دەست درێژی کردنە سەر خەڵکیش هەق نی یە .

عومەر فەرمووی : باشە با وئەبوت ... ئەوە بوو کە شەوداهات جبلە خۆی و هاوڕێکانی چوونە دەرەوەی شار و خۆیان گەیاندە قوستەنتینیە بۆ لای هرقل ، و جبلە بوو بە خاچ پەرست و لە لای هرقل مایەوە [1] .

بەو جۆرە عومەر نموونەیەکی جوانی فەرمانڕەوایەکی دادپەروەری نیشاندا و لە ڕاستیدا سەعیدی کوڕی سوەید ڕاستی وت کە لە ( حمص ) و تاری بۆ خەڵکیدا :

( ئەی خەڵکینە ، لە ڕاستیدا ئیسلام دیوارێکی سەخت و دەرگایەکی قایمی هەیە ، دیواری ئیسلام هەق و دادپەروەریش دەرگاکەیەتی . ئیسلامیش تا فەرمانڕەوایەکی بەهێز و بەتوانای هەبێت ، بە بە هێزی دەمێنێتەوە ، هێزی سوڵتان و فەرمانڕەواش بە وە نی یە خەڵکی بە شمشێر بکوژێت یا بە قامچی لێیان بدات ، بەڵکو بەوەیە بەهەق دادگەری بکات و دادپەروەر بێت ) .

## " پێشەوا حەسەنی بەصری لە وەسفی پێشەوای دادپەروەردا "

کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) بوو بە جێنشین ، نووسراوێکی نارد بۆ حەسەنی کوڕی ئەبو لحەسەنی بەصری کە ئاکار و ڕەوشتەکانی پێشەوای دادپەروەری بۆ بنووسێ . حەسەنیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەمەی بۆ نووسی :

( ئەوە بزانە – ئەی ئەمیری ئیمانداران – کە پێشەوای دادپەروەر ڕاستکەرەوەی هەموو لاری یەکە و شکێنەری هەموو ستەمکارێکە ، بنیادنەرەوەی هەموو خراپکراوێکە و هێزی هەر بێدەسەلاتێکە و دادی هەموو ستەملێکراوێك و پەناگەی هەموو لێقەوماوێکە ، وە پێشەوای دادپەروەر – ئەی ئەمیری ئیمانداران – وەك شوانی بە بەزەیی یە بۆ حوشترەکەی کە بۆ باشترین لەوەڕگای دەبات و لە لەوەڕگای وشك و خراپ دوری دەخاتەوە و لەمار دەیپارێزێت و لە ناڕەحەتی گەرماو سەرما دەیشارێتەوە .

هەروەها پێشەوای دادپەروەر – ئەی ئەمیری ئیمانداران – وەك باوکێکی نزیکە لە منداڵەکەیەوە بە منداڵی هەوڵیان بۆ دەدا و بە گەورەیی فێریان دەکات ، تا لە ژیاندایە کاسپیان بۆ دەکات و بۆ کاتی مردنیش بۆیان پاشەکەوت دەکات ..

[1] - سیرەی عومەر – بەلتاجی ( ٢٣١ ، ٢٣٢ ) .

هەروەها پێشەوای دادپەروەر – وەك دایكی بەسۆز و میهرەبان وایە بۆ منداڵەكەی ، بە نارەحەتی هەڵیدەگرێ و بە لێ د نارەحەتی لێی دەبێتەوە و بە منداڵی پەروەردەی ئەكات و شەونخونی پێوە دەكێشێ و ئەو كاتە ئارام دەبێت كە كۆرپەكەی ئارام بێت ، ماوەیەك شیری دەداتێ و ماوەیەك لە شیری دەبڕێتەوە تا فێری خۆراكی بكات ، بە تەندروستی خۆشحاڵ دەبێت و بە نەخۆشی و شەكەتی غەمبار دەبێ .

هەروەها پێشەوای دادپەروەر ئەی ئەمیری ئیمانداران ڕاسپێردراوی هەتیوان و خەزێنەی هەژارانە و منداڵانیان پەروەردە ئەكات و بە گەورە كانیشیان ئازوقە ئەدات ..

هەروەها وەك دڵە لەناو جەستەدا ، بەسەلامە تبونی ئەو جەستەش سەلامەت دەبێ و بە خراپبوونیشی جەستەتێك دەچێ و خراپ دەبێ ..

هەروەها پێشەوای دادپەروەر كەسێكە لە نێوان خودا و بەندەكاندا وە ستاوە گوێ لەو وتەی خوا دەگرێ و دەیدات بە گوێ ی بەندەكاندا و لە پەروەردگاری دەڕوانێ و ئەویان نیشان دەدات ، هەر بەرەو لای خوا ڕێ دەكات و ئەوانیش بۆ لای ئەو دەبات ...

لەبەر ئەوە ئەی ئەمیری ئیمانداران ، لەو موڵكەدا كە خودا پێ ی داویت وەك ئەو عەبدە مەبە كە گەورەكەی متمانەی پێ دەكات و ماڵ و منداڵی ئەداتە دەستی ، كەچی ماڵەكەی پەرش و بڵاو كردەوە و منداڵەكانیشی دەربەدەر كرد و بەو جۆرە مناڵەكانی هەژار كرد و ماڵ و سامانەكەشی بەفیڕۆدا .

ئەوەش بزانە – ئەی ئەمیری ئیمانداران – كە خوای گەورە بۆیە سنوورەكانی دیاری كردووە تا ڕێگری لە پیسی و خراپەكاری بكرێت ، ئیتر بەوكەسە چی دەڵێیت كە ڕاگرتن و جێگیركردنی سنوورەكانی بەدەستە خۆی خراپەكاری ئەكات ، هەروەها خودا ( قصاص )ی لەبەر خاتری پاراستنی ژیانی بەندەكانی بڕیارداوە ، ئەی ئەگەر كەسێك كە دەبێ ( قصاص )ی بۆ وەرگرتنایەتەوە ، خۆی بیانكوژێت ؟

ئەی ئەمیری ئیمانداران ، یادی مەرگ و دوای مردن و كەمی شوێنكەوتەكانت و پشتیوانەكانت لەوكاتەو ساتەدا بكە ، وە توێشوو بۆ ئەو كاتە و بۆ كاتی ڕۆژی بێ كەسی بۆ خۆت ئامادە بكە .

بزانە كەماڵێكی دیكەت هەیە جیاواز لەم ماڵەی ئێستا تیایدایت و لەوێ بە خاك دەسپێردرێیت و خۆشەویستانت جێت دەهێڵن و لە قوڵایی گۆڕدا بە تاك و تەنها

دەمێننەوە. ئەو توێشوەی بۆ هەڵگرە کە لەگەڵت دەمێنێتەوە ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ (٣٤) وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ (٣٦)﴾ سورة عَبَس ، آية ( ٣٤ – ٣٦ )[1]

ئەوەت لە یاد بێ ئەی ئەمیری ئیمانداران کە ئەو ڕۆژەی ﴿... إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ (٩) وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ (١٠)﴾ سورة العاديات ، آية ( ٩ – ١٠ )[2] ئەو ڕۆژە نهێنیەکان ئاشکرا دەبن و پەڕاویش گەورە و بچوك دەخوێنێتەوە ...

ئێستا کە تۆ کاتت لەبەردەم دایە – ئەی ئەمیری ئیمانداران – وە ئەجەلت نەهاتووە و بێ هیوا نەبویت ، بە فەرمانی نەزانەکان حوکمی بەنەکانی خوا مەکەو دەرهەق بەوان ڕێگەی ستەمەکاران مەگرە و خۆبەزلزانەکان زاڵ مەکە بەسەر بێ هێز و چەوساوەکاندا ، چونکە ئەوان دەرهەق بە باوەڕداران هیچ هەلێك لە دەست نایەن و هیچ باکیان نی یە ... تۆش ئەگەر ئەو کارەت کرد ئەوا تاوان و گوناهی خۆت و ئەوانیش هەڵدەگریت ، وریابە ئەو کەسانە هەڵتنەخەڵەتێنن کە لە بەدبەخت کردنی تۆ چێژ وەردەگرن و بۆ خۆیان لە خۆشی یەکانی دونیا ئەخۆن بە نەهێشتنی خۆشیەکانی تۆ لە ئاخیرەتدا ..

سەیری تواناو دەسەڵاتی ئەمڕۆت مەکە ، بەڵکو سەیری بێ دەسەڵاتیی سبەینێت بکە ئەو کاتەی کە دیلی پەتی مەرگیت و لە نێو دەستی خوادا وەستاویت لە بەرچاوی فریشتەکان و پێغەمبەران و نێرراواندا و لە ڕۆژێکدا کە هەموان ڕوویان لە پەروەردگاریانە ...

لە ڕاستیدا من ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەگەر چی بەم ئامۆژگاریەم نەگەشتوومەتە پلەی کاملان و ژیرانی پێش خۆم ئەم نووسراوەت بۆ دەنێرم وەك دەرمانسازێك کە چۆن دەرمان بۆ خۆشەویستەکەی دەنوسێت و دەرمانی تفت و تاڵی پێ دەدات بە ئومێدی سەلامەتی و تەندروستی . لە کۆتاییدا سڵاو ڕەحمەت و بەرەکاتی خوای پەروەردگارت لێ بێت .[3] ئەی ئەمیری ئیمانداران .

---

[1] - ئەو ڕۆژە هێندە سامناکە برا لە دەست براکەی هەڵدێت و ڕادەکات هەروەها لە دەست دایك و باوك و ... لە دەست هاوسەر و کوڕەکانی .

[2] - کاتێ لە گۆڕەکان هێنرانە دەرەوە و هەرچیش لە سینەکاندایە هەر هەموو لە ( کارنامەدا ) بە تۆمار کراوی ئاشکرا کران و خرانە بەر دەست

[3] - العقد الفريد ( ٣٥ ، ٣٦ ) ، صلاح الأمة ( ٦ / ٢٥ – ٢٧ ) .

- سۆز و تاسە کردن بۆ پەروەردگار : -

پاش تەمەنێکی پیرۆز کە ( فاروق ) لەناو ئیسلامدا بەسەری برد ، زەمینەی بۆ ئیسلام ساز کردوو ئاڵای یەکتاپەرستی لەسەر دەمی ئەو دا لە زۆر وڵاتداشەکایەوە لەوانە: -

( بصری ، دمشق ، ئوردون ، بیسان ، طبریة ، فلەستین ، قودس ، مصر ، ترابلوس ، عراق ، ئەهواز ، نەهاوەند ، خوراسان ، ... و زۆری تریش ) کاتی ئەوەهات رەوەندەکە بگاتە مەنزڵ و بەو ئامانجەی بگات کە لە پێناویدا ژیاو لە پێناویدا وەفاتی کرد .

**پێشەوا : ئیبنو کەسیر ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێت**

( عومەر ( ﷺ ) ساڵی ٢٣ ی کۆچی کاتێ لە حەج بوویەوە و لە ئەبتەح دابەزی دەستی بە دوعا کردن کرد سکاڵای خۆی بردە لای پەروەردگاری کە تەمەنی گەورە بووە و هێز و توانای کەم بووەتەوە ورەعیەتەکەشی بلاو بوونەتەوە و لەوە دەترسێت تووشی کەم و کورتی و کەمتەرخەمی ببێت و داوای لە خوای پەروەردگاری کرد بیباتە وە لای خۆی و لە ولاتی پێغەمبەرەکەیدا ( ﷺ ) شەهادەتی بە نسیب بکات ، هەروەك لە ( صحیح )دا هەیە فەرمووی : ( پەروەدگارا .. داوای شەهادەتت لێ ئەکەم لە پێناوی تۆدا و داوای مردنێکت لێ ئەکەم لە شاری پێغەمبەرەکەتدا ( ﷺ ) . [1]

خوای پەروەدگار و میهرەبانیش نزای پێشەوا عومەری گیرا کرد و هەر دوو داواکەی قبوڵ کرد ،شەهادەت لە شاری پێغەمبەرەکەیدا ( ﷺ ) .

ئەمەش زۆر پلەوپایەیەکی گەورە و مەزنە ، بەلام خودا بۆ هەر کەس بیەوێ میهرەبان و بەسۆزە ، ئەوەبوو بڕیاری خودا وا بوو ئەبولو لو ە فەیروزی مەجوسی کە خۆی لە ڕۆمدا نیشتەجێ بوو ، لە کاتی نوێژی بەیانی و لەناو میحرئەبو پیرۆزدا سێ لێدان - وتراویشە شەش لێدان - ی بە خەنجەرێکی دووسەر دا لە پێشەوا عومەر کە یەکێکیانی لە ژێر ناوکی دا بوو - لە جێ ی خۆی کەوت و ( عبدالرحمن ی کوڕی عوف )ی لە جێ ی خۆی دانا ..

کابرای عەجەمی بێ باوەڕ خەنجەرەکەی دەرهێنایەوە و بە هەر کەسێك دەگەیشت لێ ی دەدا و تا لە سیانزە پیاوی دا شەشیانی شەهید کرد ، و لە کۆتاییدا عبالرحمن ی

---

[1] - صحیحی بوخاری ( ٣ ، ٣٠ ) .

کوڕی عوف کلاّو ( تەقلە ) کەی خۆی هەڵدا بەسەریدا و کەوت ، ئەویش نەفرەتی خوای لێ بێت خۆی کوشت .. دواتر عومەر ( ﷺ ) هەڵگیرا و برایەوە بۆماڵی خۆی پێش خۆرهەڵاتن ..

پێشەوا لە حاڵەتێکدا بوو برینەکەی خوێنی لێ دەڕۆشت بۆیە لە هۆش خۆی دەچوو ، و دەهاتەوە هۆشی خۆی پاشان نوێژیان وە بیر دەخستەوە کەوا کاتی نوێژی بەیانی یە .. ئەویش بەهۆشی خۆی دەهاتەوە و دەیفەرموو : " بەڵێ ، ئەوەی نوێژ واز لێ بێنێت هیچ پشکێکی لە ئیسلامدا نیە " . [1] پاشان لەکاتی خۆیدا نوێژەکەی ئەنجامدا.[2]

گەشتیارێك بۆ بەهەشت : –

وەرن با لەگەڵ بەرێ کردنی سات بە ساتی ئەم بەندە چاکە خوازە بۆ بەهەشت ، بڕین ، بەلاّم ئەوە کێ یە وێنەیەکی زیندوومان بۆ دەگوازێتەوە لە کۆتا کاتژمێرەکانی پێش کۆچی عومەر ؟ ئەو کەسە عبداللە ی کوڕی عمری کوڕی خەتابە ڕەزای خوایان لەسەر بێ ، عبداللە دەڵێت : –

( کاتێ ئەبو لؤلؤە دووجار خەنجەرەکەیدا لە عومەر ، عومەر وایزانی تاوانێکی لەلای خەڵکی هەیە و نازانێ ، بۆیە ئیبنو عەباسی بانگکرد ، ئەو ئیبنو عەباسی خۆش دەویست و لێ ی نزیك بوو وە گوێ ی بۆ دەگرت ، پرسی : ئەمەوێ بزانم ئایا ئەمەی ئەم کارەی کرد یەکێ بوو لە خەڵکەکە ؟ ئیبنو عەباس یش چووە دەرەوە ، بە هەرکەسێك دەگەیشت دەیبینی کە دەگریان ، ئەویش گەڕایەوە لای عومەر فەرمووی : –

ئەی ئەمیری ئیمانداران ، بەهەر کەسێ دەگەیشتم وەها دەگریان وەك ئەوەی ڕۆڵەیان جوانە مەرگ بووبێ .

ئەویش فەرمووی : کێ منی کوشت ؟

ئیبنو عەباس فەرمووی : ئەبو لؤلؤە ی مەجوسی کە بەندەی موغەیرەی کوڕی شوعبەیە . [3]

---

[1] - ئیسنادەکەی باشە : ئەحمەد و غەیر ئەویش ریوایەتیان کردوە ز ( الترغيب و الرهيب )ی مونزری ( ١ / ١٩٧ ).

[2] - بڕوانە / البداية و النهاية ( ٥ / ٢١٧ ) بە کەمێ دەستکاریەوە .

[3] - هەندێ لە بوختانچیان دەیانگوت کە گوایە موغەیرەی کوڕی شعبە ئەم پلانەی ڕێك خستووە – بە کوشت چن درۆزنان و بوختانچیان .

ئیبنو عباس دەڵێت : کەوام پێ وت ئاسوودەیم لە دەم و چاویدا بەدی کرد . ئینجا فەرمووی سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەکەسێك تاقی نەکردمەوە وتبێتی ﴿لااله الا الله﴾ و بێتە بەڵگە بەسەرمەوە .[1]

فەرمووی : بەلاّم من پێم وتبوون کە هیچ کەس بەندەی عەجەمی نەهێنێ کە چی سەرپێچیتان کردم ، پاشان فەرمووی : براکانم بۆ بانگ کەن ، پرسیان کێ ؟ فەرمووی : عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبێر و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو و قاص ) ئەوانیش ناردیان بە دوایاندا و پاشان سەری لەسەر کۆشم دانا کاتێ گەیشتن پێم وت : ئەوانەی داوات کرد بوون گەیشتوون ، فەمووی : بەڵێ .. لە کاروباری موسڵمانانم ڕوانی ، بینیم ئێوە ئەو شەش کەسەتان سەرانی خەڵك و پێشەوایانن و ئەم کاروبارەش هەر بە ئێوە دەکرێ ، ئەگەر لەسەر ڕێ ی ڕاست بمێنن ئەوا خەڵکیش لەسەر ڕێ ڕاست دەمێننەوە . خۆ ئەگەر جیاوازی یەکیش هەبێ ئەوە لەناو ئێوەدایە .. منیش کاتێك گوێم لێ بوو باسی ناکۆکی و پەرت پەرت بوونی دەکرد وا مزانی کە ڕووی داوە ، چونکە بەدەگمەن شتێکی و تووە و ڕوی نەدئەبو ، پاشان ئەوەندە خوێنی لەبەر ڕۆشت تا تەواو بێ هێز بوو ئەوانیش دەستیانکرد بە ورتە ورت هەتا لەوە ترسام لەناو خۆیاندا بەیعەت بە یەکێك لە خۆیان بدەن ، وتم : ئەمیر هێشتا زیندووە خۆ نەئەبو دوو جێنشین هەبن یەك سەیری ئەوی تر بکات ، عومەر فەرمووی : هەڵمگرن .. ئێمەش هەڵمانگرت .. فەرمووی ( لەگەڵ سێ لایەن ( سێ کۆمەڵ – ڕاوێژ بکەن و پاشان صوهەیب نوێژ بۆ خەڵکی بکات (دابەستێ).

وتیان / لەگەڵ کێ ڕاوێژ بکەین ئەی ئەمیری باوەڕداران ؟

فەرمووی : ( ڕاوێژ بکەن لەگەڵ کۆچکەران و پشتیوانان و جوامێرانێك لەناو سەربازەکاندا ) .

پاشان داوای قومە شیرێکی کرد کە خواردیەوە سپیایی شیرەکە لە هەردوو برینەکەیەوە هاتە دەرەوە ، زانیی کە ئاماژەیە بە مردنی ، فەرمووی : " ئێستا ئەگەر هەموو دنیا هی من بوایە ئەمکرد بە فیدای سامناکیی ڕۆژی قیامەت " .

---

[1] - لە ڕیوایەتی تردا ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی چارەنووسی منی نەخستە دەستی کەسێك ئیدەیعای باوەڕ بکات و تەنها کڕنوشێکیشی بۆ خوا نەبرد بێ ) البدایە ( ٥ / ٢١٨ ) .

ئیبن عباس یش فەرمووی : دەی خوا خۆی پاداشتت بداتەوە ، مەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو کاتەی موسڵمانان لەمەککەدا لە ترسدا دەژیان داوای لە خوا نەکرد کە ئیسلام و موسڵمانان بە هۆی تۆوە بە هێز و بە توانا بکات ، و کاتێ موسڵمان بویت ، موسڵمانبونت بوە عیززەت و بە تۆوە ئیسلام و پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵان دەرکەوتن و ئاشکرا بوون .

وە بە کۆچکردنت بۆ مەدینە ڕزگاریت هێنا ، ئەوجا لە هیچ جەنگێکدا نەبووە کە ئامادە نەبوو بیت هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر ی خوا ( ﷺ ) بۆ کوشتنی بێ باوەڕان لە فلاّنە و فلاّن ڕۆژدا ، و پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد و لێت ڕازی بوو ، دوای ئەویش هاوکاری جێنشینە کەیت کرد لەسەر خستنی بەرنامەکەی خوادا و بە کەسانێك کە بەرەوڕووی ئیسلام دەهاتن لەوانەت دەدا کە پشتیان لە ئیسلام هەڵدەکرد ، هەتا خەڵکی بەویستی خۆیان هاتنە ناو ئیسلام ، پاشان خەلیفەش وەفاتی کرد و لێت ڕازی بوو ، پاشان کرایتە والی بە باشترین شێوە کە خەڵکی پێ بکرێتە والی و براگەورە، و خودا بە هۆی تۆوە ولاّتانێکی پێ ئاوەدان کردیتەوە و ماڵ و سامانێکی بۆ موسڵمانان لەسەر دەستی تۆ کۆ کردەوە و دوژمنانی ئیسلامی لەسەر دەستت وەدەرناو تیابرد ، پاشان خوای گەورە هەر لە ڕێ ی تۆوە چەندین خێزانی لە ئاینی نزیك کردەوە و ڕۆزی دان و لە کۆتاییشدا شەهادەتی پێ بەخشیت... دەی خۆشی لە خۆت ئەی ئەمیری ئیمانداران .

ئەویش فەرمووی : " سوێند بەخوا لە خۆبایی ئەو کەسەیە فریو خواردووی ئەکەن " پاشان فەرمووی : ئەی عبدالله لە ڕۆژی قیامەتدا ئامادەی لەلای خوا شایەتیم بۆ بدەی ؟ وتی : بەڵێ ، عومەریش ( ﷺ ) فەرمووی / ئەی پەروەردگار سوپاس بۆ تۆ ، ئەی عبدالله ی کوڕی عومەر ڕوومەتم بخەرە سەر زەویەوە .[1]

منیش لەسەر ڕانم دامگرت و خستمە سەر لاقم فەرمووی : " ڕوومەتەم بدە لە زەوی " و ڕیش و ڕوومەتی هینایە خوارەوە تا کەوتە سەر زەوی و فەرمووی : " خۆت و دایکت بەد بەخت دەبن – یان بەد بەختی بۆ خۆت و دایکت – ئەگەر خوا لێت خۆش نەبێ ئەی عومەر " .

[1] – وەك ئەوەی عبدالله ی کوڕی عباس ی لێ بوو بێتە کوڕی عومەر .

ئەوجا وەفاتی کرد ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای لەسەر بێ ، وناردیان بە دوای عبداللە ی کوڕی عمردا فەرمووی : لەگەڵتان نایەم تا ئەو کارە نەکەن کە عومەر فەرمانی پێ کردن ئەویش ڕاوێژ کردنە لەگەڵ ئەنصار و کۆچکردوان وچەند پیاوێکی جوامێر لەناو سەربازەکاندا ) .

حەسەن دەڵێت : باسی عومەری بۆ کرا لەسەرەمەرگیدا چۆن لە پەروەردگاری ترساوە . ئەویش فەرمووی : " موسڵمان بەم جۆرەیە چاکە و بەزەیی تێدا کۆ بۆتەوە ، وەك چۆن دووڕوان خراپە و هەڵە و لە خۆبایی بوونیان تیا کۆ بۆتەوە .

سوێند بەخوا نە لە ڕابردوو و نەلە ئێستادا هیچ بەندەیەکی خوام نەدیوە چاکەکارتر و لە خواترستر و بەبەزییتر لە عومەر ، هەروەها لە ڕابردوو ئێستاشدا هەر کەسێکم دیبێ خراپەی زیادی کردبێ ئەوە هەڵە و ساویلکەیشی زیادی کردووە " .[1]

خودا حافیزی : –

لە کۆتایی ڕێدا و لە کاتێکدا خواحافیزی لە ئەمیری باوەڕداران ئەکەین وشەیەك بۆ وتن نادۆزمەوە ئەمە نەبێت کە ئبنو مەسعود دەڵێت : –

" عومەر قەڵایەکی پۆڵایین بو بۆ ئیسلام کە خەڵکی دەهاتنە ناوی و ئیدی نەئەچوونە دەرەوە ، بەڵام پاش ئەو ئەو قەڵایە ڕما و ئیدی خەڵکی لێ دێنە دەرەوە لەبری ئەوەی بچنە ناوی " .[2]

هەروەها دەفەرموێ : " حەزم ئەکرد خزمەتکارێك بووما یە لە بەردەستی عومەردا هەتا مردن)[3]

وە دەڵێت : " ئەگەر عومەر سەگێکی خۆشبویستایە ، ئەو سەگە دەبووە خۆشەویسترینی سەگێك لە لام )[4] سوێند بەخوا ئیبنو مەسعود ڕاستی وتووە ..

" سەلام لەسەر گیانی عومەری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) لەگەڵ ئەمراندا "

---

[1] - ئیسنادەکەی ( حسن )ە : تەبەرانی لە ئەوسەت دا ڕیوایەتی کردووە هەیسەمی دەڵێت : ئیسنادەکەی (حسن )ە الجمع ژمارە ( ١٤٤٦٣ ) .

[2] - تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە الکبیردا . الجمع ( ١٤٤٦٦ ، ١٤٤٧٩ ) .

[3] - تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە الکبیردا . الجمع ( ١٤٤٦٦ ، ١٤٤٧٠ ) .

[4] - تەبەرانی ڕوایەتی کردووە لە الکبیردا بە ژمارەی ( ٨٨١٥ ) .

## " ٣ - عوسمانی کوڕی عەففان( رضي الله عنه ) "

**ناسنامەی : -**

**عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبی لعاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبد شەمسی کوڕی عبدمەنافە ...**

**عوسمان ( رضي الله عنه ) لە ساڵی شەشی فیل دا لە دایك بووە و هەر زوو موسڵمان بووە و هەردوو کۆچەکەی کردووە ، کۆچی یەکەمی حەبەشە و کۆچ بۆ مەدینە ..**

**خاتوو ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ی هێناوە و لە شەوەکانی بەدردا خاتوو ڕوقیە وەفاتی کردووە ، دوای ئەویش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خاتوو ئوم کەلسوم ی ( خوشکی ڕوقیە )ی پێداوە .**

**زانایان دەڵێن : " جگە لە عوسمان نەزانراوە کەسێکی تر دوو کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوسەری بووبێت . لەبەر ئەوە ناونراوە بە " ذالنوریز "[1] عوسمان ( رضي الله عنه ) یەکێکە لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە و هەروەها یەکێکە لە و هاوەڵانەی قورئانیان کۆ کردەوە ". " کەسێکی ڕیش درێژ و جوان بووە "[2] و لە جوانترین کەسان بووە[3] .**

**لە عبدالرحمن ی کوڕی عوسمانی قورەشی یەوە : - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتووە بۆ ماڵی عوسمان ( رضي الله عنه ) دیویەتی کچەکەی سەری عوسمان بەملدا دەشوات فەرمووی : " یا بنیة احسیني الی ئەبو عبداللە ، فإنه أشبه اصحئەبو بي خلقاً "[4] واتە : کچم باشبە بۆ باوکی عبداللە ، چونکە لەناو هاوەڵانمدا لە هەمویان زیاتر لە من دەچێ لە ڕەوشت و ئاکاریدا .**

---

[1] - واتە خاوەنی دوو ڕووناکی .

[2] - نیـــادەکەی ( حسن )ە . تەبەرانی لە عبداللە ی کوڕی شداد بەڕاگیراوی ڕیوایەتی کردووە . ( الجمع ) (١٤٤٩٢ ).

[3] - هەیەمی دەڵێت : عبداللە ریوایەتی کردوە و پیاوانی فەرموودەکە پیاوانی ( الصحیح ) ن . جگە لە ئوم موسی کە ئەمیش جێی متمانەیە . الجمع ( ١٤٤٩٦ ) .

[4] - پیاوانی جێ ی متمانەن / تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە ، الجمع ( ١٤٥٠٠ ) .

## " فەزڵو گەورەیی "

١ – لە ئەبو هورەیرەوە ( ﷺ ) : پێغەمبەری خوا لەسەر کێوی ئوحود بوو لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەلحە و زوبێر دا ، کێوەکە هاتە لەرزە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کێوەکەی فەرموو " إهدأ فما عليك الانبـي ، أو صديق أو شـهيد " [1]

واتە: هێمن بە ، خۆ جگە لە پێغەمبەرێك یان ( صدیق )ێك یان شەهیدێکت لەسەر نی یە.

نووسەرێك دەڵێت : ئەم فەرمووده گشتگیر ترە لە و فەرموودەیەی ناوی دوو شەهیدی تیاداهاتووە ، هەروەها فەرموودەکە یەکێك لە موعجیزەکانی ( پەرجوو ) پێغەمبەرایەتی تێدایە ، ئەوە بوو هەریەك لە عوسمان و علی و عمر و تەلحە و زبێر شەهید بوون .

٢ – لە ئەبو موسای ئەشعەری یەوە ، دەڵێت : ( لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چووینە دەرەوە ، و لە رێدا چووە پشت یەکێ باخەکانی ئەنصار بۆ کاری تایبەتی خۆی فەرمووی : ( يا ابا موسى املك علي الباب فلا يدخلن عَلَيّ احد الاّباذن ) ئەی ئەبو موسا دەرگاکەم لێ بگرە تا کەس بە بێ مۆڵەت نەیەتە ژوورێ . ئەوە بوو پیاوێك هات و لە دەرگای دا پرسیم ، کێیە ؟ وتی : ئەبوبەکر ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبوبەکر هاتووە و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی دەوێ ؟ فەرمووی : ( أئذن له وبشره بالجنة ) مۆڵەتی بدە و مـوژدەی بەهەشتیشی پـێ بـدە . ئەویش چـووە ژوورەوە و مـوژدەی بەهـشتم پـێ دا . پیاوێکی تر هات و لە دەرگای دا ، وتم : کێیت ؟ وتی : عومەرم وتم ئەی پێغەمبەری خوا عومەرە هاتووە داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە دەکات . فەرمووی ( أفتح له و بشره بالجنة ) .

فەرمووی : بۆی بکەرەوە و موژدەی بەهەشتی پێ بدە ، منیش دەرگاکەم بۆ کردەوە کە هات ژوورەوە موژدەی بەهشتم پێ دا .

پیاوێکی تر هات و لە دەرگای دا ، پرسیم ، کێیە ؟ وتی : عوسمان ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عوسمانە داوای مۆڵەت دەکات . فەرمووی : ( إفتح له وبشره بالجنة علي بلوى تصيبه ) [2] واتە / بۆی بکەرەوە و موژدەی بەهەشتی پێ بدە لەسەر بەڵایەك کە توشی ئەبێت .

---

[1] - صحیح : موسلیم و تیرمیزی ریوایەت کردووە بڕوانە صەحیحی ژمارە ( ٢ / ٥٦٢ ) .

[2] - صەحیحە / صەحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٢٩٢٧ ) .

٣ - لە عوسمانەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " من حفر رومة فله الجنــة " هەر کەسێ بیری ڕۆمە بکڕی دەچێتە بەهەشتەوە . منیش بیرەکەم کڕی هەروەها فەرموی " من جهز جيش العسرة فله الجنة " واتە : هەر کەسێ سوپای نارەحەتی و نەبوونیدا ساز بکات ( بەچەك و تفاق ) ئەوا دەچێتە بەهەشت منیش سازو ئامادەم کرد .[١]

٤ - هەروەها عوسمان ( ﷺ ) فەرموویەتی / سوێند بە خوا نە لە جاهیلیدا (پێش ئیسلام ) و نە لە موسڵمان بوونمدا هەرگیز زینام نەکردووە .[٢]

## " شەرمی عوسمان "

لە خاتوو عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانیشتبو ڕانی بەدەرەوە بوو، ئەبوبەکر مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگت ئەویش هەر بەو شێوەیە مۆڵەتی دا ، ئەوجا عومەر مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگرت ، بۆ ئەویش بەهەمان شێوە مۆڵەتی دا ، بەڵام کاتێ عوسمان مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی وەرگرت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جلەکانی دا بەسەر ڕانیدا و دایپۆشی .

دوای ئەوەی هەڵسان ، پرسیم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەبوبەکر و عمەر مۆڵەتیان وەرگرت تۆش فەرمووت لێ کردن لەکاتێکدا هەر بەو حاڵە بوویت کە بوویت ( ڕانەکانت بە دەرەوە بوون ) ، کەچی کاتێ عوسمان مۆڵەتی وەرگرت جلەکانت دا بەسەر ڕانتدا ، فەرمووی : ( يا عائشة ، الا أستحي من رجل ، والله و ان الملائكة تستحى منه ) .[٣]

واتە : ئەی عائیشە ، ئایا شەرم لە پیاوێك نەکەم کە سوێند بە خوا فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن .

نووسەرێك دەڵێت ، وتم : باشە پیاوێك فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەرمی لێ دەکات ، ئەی ئەو تانە و تەشەر لێدەرانە شەرم ناکەن درۆی بۆ هەڵدەبەستن ؟!

---

[١] - صحیح ، بوخاری بە هەڵبەسیراوی ڕیوایەتی کردووە بڕوانە : روضة المحبين ( ٢٠ ) .

[٢] - صحیح / ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە . بڕوانە روضة المحبين ی عەددەوی ( ٢٠ ) .

[٣] - موسلیم ڕیوایەتی کردووە بۆ فەرموودەکە لە بابی ( فضائل عوسمان ) وا بە چەند دەربڕینێکی نزیك لەم ڕیوایەتەوە.

وە حەسەن ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) ، باسی عوسمان و زۆریی حەیای عوسمان دەکات ، دەڵێت : ( هەتا ئەگەر لەماڵ بێت و دەرگاشی لەسەر داخرئەبو ، جلەکانی داناکەنێ تا ئاو بە خۆیدا بکات .[1]

**" پەرستشی "**

لە ئیبنو عومەرەوە ( ﷺ ): دەڵێ : ئەوەی فەرموودەی پەروەردگار لەم ئایەتەدا دەفەرموێت : ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ سورة الزمر آية ( ٩ ) .

واتە : یان ئەو ئیماندارەی کە لە دووتوێ ی شەوگاردا هەڵدەسێت بۆ خوا پەرستی، سوجدە دەبات و بە پێوە دەوەستێت لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت و هیوای بە میهرەبانی پەروەردگاری هەیە.

دەڵێت : مەبەست عوسمانی کوڕی عەفانە .[2] هەروەها ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) کە هەڵدەسا بۆ شەو نوێژ هەرگیز کەسی لەئەندامانی خێزانەکەی بەخەبەر نەئەهێنا تا یارمەتی بدەن لە دەست نوێژ گرتنیدا ، مەگەر خۆیان بەخەبەر بونایە . هەروەها هەمیشە بەڕۆژوو بوو . گلەیی لێ دەکرا کە بۆچی خزمەتکارێکی بە خەبەر ناهێنی ؟ دەیفەرموو : نەخێر ! شەویش بۆ ئەوانە با پشوو بدەن .[3]

وە لە حەسەنەوە ، دەڵێت : عوسمان فەرمووی : ( ئەگەر دڵەکانمان پاك بوایەتەوە هەرگیز لە فەرموودەکانی پەروەردگارمان تێر نەدەبوین ، لە ڕاستیدا حەز ناکەم ڕۆژێکم بەسەردا بڕوات و سەیری قورئانی پیرۆزی تیانەکەم ( نەیخوێنمەوە ) ، کاتێك وەفاتیشی کرد ( مصحف )ەکەی بەهۆی زۆر خوێندنەوە و مانەوەی بەدەستیەوە کۆن و شڕ بوو بوو .[4] هەروەها کاتێ شەهید کرا ( مصحف )ەکەی لە کۆشیدا بوو ، هەروەها انس و محمدی ابن سیرین دەڵێن : خێزانی عوسمان ڕۆژی ( الدار )[5] ، وتی :( یان بیکوژن ، یان وازی لێ بێنن ، سوێند بەخوا شەوی بە قورئان لەیەك ڕکاتدا زیندوو ئەکردەوە ! )[6]

---

[1] - پیاوانی جێ متمانەن : هەیسەمی دەڵێت : ئەحمەد گێراویتیەوە . الجمع ( ٩ / ٨٢ ) .

[2] - بروانە البداية و النهاية ( ٥ / ٣٠٧ ) — ئیبنو عباس دەڵێت : کێ حەز ئەکات خوای پەروەردگار ڕۆژی قیامەتی لا ئاسان بکات با خودا اە تاریکی شەودا بە کڕنوش بردن و نوێژ کردنەوە ببینێت و لە خەمی ئاخیرەتدا بێ و تکای ڕەحمەت و بەزەیی ئەو بکات . تەفسیری قرتوبی ( ١٥ / ٢١٤ ) .

[3] - البداية و النهاية ( ٥ / ٣٠٧ ) .

[4] - البداية ( ٥ / ٣٠٧ ) .

[5] - يوم الدار / ئەو ڕۆژەی ئاشوبەکان هێرشیان بردە سەر عوسمان ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) ، بۆ شەهید کردنی

## "ترسی عوسمان "

لە عبدالله ی کوڕی ڕۆمی یەوە ، دەڵێت : " پێم گەیشتووە کە عوسمان (ﷺ) فەرمووییەتی : ئەگەر لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دامنێن و نەزانم دەخرێمە کامیان ، ئەوەم هەڵدەبژارد ببومایە بە خۆڵ پێش ئەوەی بزانم چارەنووسم بۆ کاملایە " . هەروەها عوسمان ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) کاتێ لەسەر گۆڕێك دەوەستا ئەوەندە ئەگریا تا ڕیشی تەڕ دەبوو . پێیان ئەوت : - کاتێ یادی بەهەشت و ئاگر دەکرێت ناگری ، کەچی یادی گۆڕ دەکەیت دەگریت ؟ عوسمان ( ﷺ ) فەرمووی : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ ) فەرمووی : " القبر أول منزل من منازل ألأخرة ، فأن نجا منه ، فما بعده أسير ، إن لم ينج منه فما بعده أشد " واتە : گۆڕ یەکەمین مەنزڵگایە لە مەنزڵگاکانی ئاخیرەت ، ئەگەر ڕزگارت بوو لێ ی ئەوە هەرچی لە دوای ئەو دێت ئاسانترە ، خۆ ئەگەر ڕزگارت نەبوو لێ ی ئەوا هەرچی لە دوای ئەو دێت قورستر و توندترە ..

وە فەرمووی : گوێم لێ ی بوو پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی " ما رأيت منظرا قـط الا و القبر افظع منه "[1] واتە : هەرگیز هیچ دیمەنێکم نەدیوە لە دیمەنی گۆڕ ترسناکتر بێت .

## بێ فیزی ( تواضع )ی عوسمان ( ﷺ )

لە حەسەنەوە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) ، دەڵێت : " عوسمانم بینی(ﷺ) لە مزگەوت بەلێفەیەکەوە خەوی لێ کەوتبوو ، لە کاتێکدا ئەمیری ئیمانداران بوو " [3]

وەلأمدانەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو گومانانەی لەسەر پێشەوا عوسمان دروستکرا بوون : -

بوختانچیان چەندین شتیان بۆ ( ذو النورين ) هەڵبەستووە لە درۆ و بوختان و شتی دور لە ڕاستی تاوەکو بەم کارەیان ڕاستی یەکان بسرنەوە و تانە لە سێیەمین

---

[1] - زەهەبی دەڵێت : لە چەند ڕوویەکەوە ئەم فەرموودەیە ڕاستەکە عوسمان قورئانی هەموو لەیەك ڕکاتدا خوێندەوە ، (سير أعلام النبلاء )،بەشی / الخلفاء ، لاپەڕە ( ١٥٧ ) وە بڕوانە :( التبيان )ی نەوەوی( ل ٥٧ ) . نوسەرێك دەڵێت : ئەوەش ڕاستە کە نەهی لە خوێندنی هەموو قورئان لە کەمتر لە ( ٣ ) ڕکاتدا کراوە . ئیبنو ڕەجەب دەڵێت : ( بەڵکو ئەم نەهی یە بۆ کاتێکە بەردەوام بی لەسەری ( أ . هـ ی ( طائف المعارف ) ٢٩١ .

[2] - فەرموودەی ( حسن )ە / تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە . ئەلبانی دەڵێت : ( حسن )ە ، ( صحيحى ) سوننەتەکانی ئیبنو ماجە ( ٣٤٦١ ) .

[3] - بڕوانە : الحلية ( ١ - ٦٠ ) .

(خەلیفەی ڕاشدین ) بدەن ، کە زانایان لە کۆن و ئێستاشدا هەمیشە لە ئاست وەڵامدانەوەیاندا بوون و ئەو تیرەی بو پێشەوا عوسمانیان هەڵدا ، گێرایانەوە بۆ سەر سنگی خۆیان و هەمیشە درۆ و ساختەکاریەکانیان ئاشکرا کردووە "والله غالب علی امره".
بەڕاستی خودا فەرمان و ویستی خۆی سەر دەخات .

لەو هەڵبەستراوانە : -

١ - ئەوەی کە گوایە پێشەوا عوسمان ( عبیدالله ی کوڕی عومەر )ی لە هەقی (هرمزان ) دا نەکوشتووەتەوە .

وەڵامیش ئەمەیە : کە عوسمان ( ﷺ ) خوێنبایی یەکەی لە ماڵی خۆی داوە دوای ئەوەی ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵاندا کردووە ، چونکە ئەو وەلی و سەرپەرشتیاری خوێنی کوژراوە ئەگەر هیچ کەسی تری نەبوو بێتە وەلی ، بە پێی بنەمای ( السلطان ولي من لا ولي له) .

وە لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە ( قمازبان )ی کوڕی ( هورمزان ) لە بکوژەکەی باوکی کە ( عبیدالله ) بووە خۆش بووە ، وە هەندێ ڕیوایەتیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ( هرمزان ) پلانی بۆ کوشتنی ( عومەر ) داناوە .[1]

٢ - هەروەها وتویانە کە گوایە پێشەوا عوسمان کە سەنزیکەکانی خۆی وەك (عبدالله ی کوڕی عامر و وەلیدی کوڕی عوتبە و مەروانی کوڕی حەکەم و عبدالله ی کوڕی ئەبی سرح )ی کردووەتە والی و هاوەڵانی لەسەر کار لابردووە و عەزل کردووە . وەڵامیش ئەمەیە : عبدالله ی کوڕی عامر جوامێریی زۆری تیادا بووە ، خۆراسان و دەوروبەری فارس و سەجستان و چەند جێیەکی تری ڕزگار کردووە .ئیبنو تەیمیەش دەربارەی وتویەتی : ئەوەندەی چاکە و خۆشەویستی هەیە لە دڵی خەڵکیدا کە ناکرێ نکوڵی لێ بکرێت .[2] سەبارەت بە وەلیدی کوڕی عوتبە ش : پێشەوا عوسمان لەبەر ئەوە کردیە والی، چونکە پورزای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو هەروەها پێشتریش ئەبوبەکری صدیق یش (ﷺ ) کرد بوویە والی ، ئەوەش کەڕیوایەت دەکەن قورئان بە ( فاسق ) لە قەڵەمی

---

[1] - بڕوانە ( تاریخ الأمم و الملوك )ی ئیبنو جەوزی ( ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) / ٢٣٩ ، ٢٤٠ ) و ( عوسمان)ی محمد حسن هیکل ( ٥١ )

[2] - بڕوانە : (مناهج السنة النبوية )ی پێشەوا ئیبنو تیمە ( ٣ - ١٨٩ - ١٩٠ ) لێکۆڵینەوەی/محمد رشاد سالم .

دئەبو لەم ئایەتە پیرۆزەدا : ﴿ ... إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا ... ﴾ سورة الحجرات ، آية ( ٦ ) . ڕاست نیە ، چونکە لە کاتی دابەزینی ئەم ئایەتەدا وەلید منداڵێکی کەم تەمەن بوو .[١]

وە ئەو تۆمەتەش گوایە خواردوویەتیەوە ، ئەمە پیلان و ( مؤامرة )ەیەکە لە دژی ئەنجام دراوە و هیچ بەڵگەیەکی ڕاست نی یە موسڵمانان پەنای بۆ بەرن و جێگەی بڕوا بێت ، وە سوێندی خواردووە بۆ پێشەوا ( عوسمان ) کە مەشروبی نەخواردۆتەوە ، عوسمان یش ( ﷺ ) فەرموویەتی : " ئێمە سنورەکانی شەرع جێبەجێ دەکەین وشایەتی درۆش جێگایەك لە ئاگردا بۆ خۆی ئامادە دەکات " [٢]

هەرچی مەروانی کوڕی حەکەمیشە : پیاوێکی دادپەروەر بووە ئەوەندە بەسە فەرموودەی لە ( صحاح ) دا هەیە .

سەبارەت بەخستنە سەر کاری ( عبدالله )ی کوڕی ئەبی سرح یش کە پاش موسڵمان بوون لە دین هەڵگەڕابوویەوە ، ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە دواتر تەوبەی کردوە و گەڕاوەتەوە باوەشی ئیسلام و کەسێکی پەیوەست بووە بە ئاینەوە و هاوشێوەی پیاوچاکان جیهادی کردووە . هەروەها لە نێوان هەردوو سەلامدانەوەی نوێژدا وەفاتی کردووە .

٣ – ئەوەی کە دەڵێن پێشەوا عوسمان پەڕاوی قورئانی سوتاندووە : –

وەڵام ئەمەیە : علی کوڕی ئەبی تالیب ( ﷺ ) دەفەرموێت : " سوێند بەخوا پێشەوا عوسمان پاش ڕاوێژ کردن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ ئەو پرسە و کۆکردنەوەیان لەسەری ئەو جا ئەو کارەی ئەنجام دا . فەرمووی : ئێوە چی دەڵێن دەربارەی ئەم خوێندنەوەیەی کە خەڵکی توشی جیاوازی و ناتەبایی بوون لە بارەیەوە و کاتێ بە یەکتر دەگەن ، ئەم دەڵێ خوێندنەوەی من لەوەی تۆ باشترە و ئەوی تر بە هەمان شێوە و ئەمانەش سەردەکێشن بۆ کوفر .

ئێمەش وتمان : ڕای تۆ چی یە ؟ فەرمووی / ئەمەوێ خەڵکی لەسەر یەك پەڕاو ( مصحف ) کۆ بکەمەوە ، خۆ ئەگەر ئەمڕۆ جیاوازی بکەوێتە نێوان ئێوەوە ، ئەوا ئەوانەی دوای ئێوە دێن خراپتر جیاوازی ئەکەوێتەوە نێوانیانەوە . ئێمەش وتمان : ئەمە باشترین ڕاو بۆچوونە .[٣]

---

[١] - بڕوانە ( العواصم من القواصم ) ی ابوبکر عەرەبی ( ٩٠ ، ٩١ ) لێکۆڵینەوە محی-الدین الخطیب .

[٢] - بڕوانە: انصاف الخلیفة عثمان من افرازات صاحب الکشف و البیان( ٤٣ ، ٤٤ )د.عبدالله جمال الدین .

[٣] - بڕوانە مناهج السنه ( ٦ / ٢٥٢ ، ٢٥٣ ) .

هەرچی سەبارەت ناکۆکی و جیاوازی عوسمانە ( رضي الله عنه ) لەگەڵ ئیبنو مەسعودا ( رضي الله عنه) دا . دکتۆر تەها حسین دەڵێت : " مەسەلەی بوونی جیاوازی لە نێوان ئەم دوانە ناڕاست و دروست کراوە " .[1]

٤ – هەروەها ئەوەی کە گوایە لە ئیبنو مەسعود و عەماری کوڕی یاسری داوە !!

وەڵام / دیارە کە ئەمە بوختانێکی شاخدار ، باشە کوا بەڵگەی پەیوەست و ڕاوی دادپەروەر بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە ؟ گریمان ئەمەش چەسپا بێت ، خۆ ئیبنو تیمیە دەفەرموێت : " ئەگەر بوترێت عوسمان ( رضي الله عنه ) لە ئیبنو مەسعود و عەمماری داوە ئەمە نەبوتە هیچ خراپی و ( ذم ) ێك بۆ هیچ کامیان ، چونکە هەموومان شایەتین کە ئەو سێ کەسە بە هەشتین و لە گەورەپانی ئەولیایانی خودان کە هەمیشە تەقوای خوایان کردووە ، خۆ پێشەوا عومەریش بە ( درّە ) دای لە ئەبو کوڕی کعب کاتێ بینی خەڵکی لە دوایەوە دەچن و فەرموی : ئەمە سەر شۆڕی یە کە بۆ ئەوانەی لە دوایەوە دەچن و فیتنە و بەڵایشە بۆ ئەو کەسەی شوێنی کەوتوون .[2]

٥ – ئەوەی کە دەڵێن : ( حەکەمی کوڕی عاص )ی دەرکراوی لە لایەن پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ەوە گەڕاندوەتەوە !!

وەڵام / ئیبنو تیمیە دەڵێت : " لە بنچینە دا شتی وا نەسەلمێنراوە و نە چەسپاوە ، هەروەها هیچ ئیسنادێکی نیە .

٦ – دەڵێن کە فەرمانی نەفی کردنی ئەبی زەری داوە ( رضي الله عنه ) بۆ ( ڕەبزە ) !!

وەڵام : ئەبازەر خۆی ئەوەی هەڵبژاردووە و عوسمانیش ( رضي الله عنه ) ڕازی بووە لە سەری .[3]

### گەمارۆ ستەمکارانەکە

ئەو بوختانانەی پێشەوە بوونە هۆی ئەوەی ئاژاوەگێڕان لە ئەهلی میصر و کوفە و بەصرە بکەونە جووڵە جولّ و پەیوەندیکردن بەیەکەوە و لەسەر زاری کۆمەڵێك لە هاوەڵان کە لە مەدینە بوون چەند نامەیەك تەزویر کرا و هەروەها لەسەر زمانی تەڵحە و زوبێر (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ) کە گوایە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ

[1] – بڕوانە : الفتنە الکبری ( ١ / ١٦٢ ) .
[2] – بڕوانە : منهاج السنە ( ٣ / ١٩٢ ) چاپی یەکەم .
[3] – بڕوانە : العواصم ( ٧٣ / ٧٧ ) .

عوسماندا ( ﷺ ) و لە پێناو سەرخستنی دیندا !! و گوایە ئەمە گەورەترین جیهادە بۆ ئەمڕۆ .

ئاژاوەچیان کەوتنە بزوتن و ئابلۆقەی ماڵی عوسمانیاندا ، کەڕای پەسەند ئەوەیە چل ڕۆژی خایاندبێ .

لە حەسنەوە ، فەرمووی : ویثاب هەواڵی پێ دام وتی : عوسمان ناردمی بە دوای ( اشتر ) دا کە یەکێ بوو لە ئەمیرەکانی ئاژاوەچیان کە هاتبوونە سەر پێشەوا عوسمان ( ﷺ ) منیش بۆم بانگ کرد ، فەرمووی : ئەو خەڵکە چیان ئەوێت ؟ ئەشتەر وتی : سێ شتیان دەوێت کە دەست لە هیچیان هەڵناگرن ، ووتی کامانەن ؟

وتی : یان ئەوەتا دەست هەڵگریت و واز بێنی و کار بدەیتە دەست خۆیان و پێیان بڵێ ی کە بەویستی خۆیان کەسێك هەڵبژێرن ، یان ئەوەتا ( قصاص ) لە خۆت وەرگریتەوە .. ئەگەر یەکێ لەم دوو کارە نەکەیت ئەوا ئەو خەڵکە ئەتکوژن . ئەویش فەرمووی : سەبارەت بەوەی دەست هەڵگرم و کار بدەمە دەست خۆیان ئەوە هەرگیز ناکەم و ئەو کراسەی خوا کردوویە بە بەرمدا دایناکەنم .[1]

هەروەها سەبارەت بەوەش کە ( قصاص ) لە خۆم بکەمەوە ، سوێند بەخوا هەردوو هاوەڵانم ( ابوبکر و عومەر ) ( ﷺ ) ( لە نزیکەوە لە گەڵیاندا بووم ) ئاگاداریانم کە سزای تاوانباریان ئەدا ( هیچ ماڵێکیش هەلنەدەسابە ( قصاص ) وەرگرتن.

هەروەها ئەگەریش ئەتانەوێ بمکوژن ، سوێند بە خوا دوای کوشتنی من خۆشەویستی لە نێوانتاندا نامێنی و هەرگیز بەیەکەوە سەرجەم ناجەنگن لەگەڵ هیچ دوژمنێکدا .[2]

وە لە ابو عبدالرحمن ی سلمی یەوە ، دەڵێت : کاتێ گەمارۆی عوسمانیاندا(ﷺ) ، لەسەربانی ماڵەکەیەوە کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا و فەرمووی / سوێندتان ئەدەم بەخوا ئایا ئەزانن کاتێ کێوی ( ئوحود ) بزواو لە جێ ی خۆی ڕاتەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ ) پێ ی فەرموو : –

---

[1] – ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە عوسمانی فەرموو ( ﷺ ) : – ( یا عثمان لعل الله یقمصك قمیصاً فان ارادوك علی خلعة فلا تخلعة لهم ) صحیح : صحیح ( ٢٩٢٣ ) واتە : ئەی عوسمان ڕەنگە خودا کراسێکت بە بەردا بکات ، هەرکات ویستیان پێت دابکەنن ئەوا بۆیان دانەکەنیت ( مەبەست جێنشینایەتی یە ) .

[2] – بڕوانە / البدایە و النهایە ( ٥ / ٢٧١ ) .

" اثبت احد فليس عليك الا نبـــي أو صديق او شهيد ؟ " واتـه : ئـەی ئوحـود جێگیر بـه و مەجوڵێ خۆ کەست بەسەرەوە نی یە ، جگە پێغەمبەرێك یان ڕاستگۆیەك یان شەهیدێك ؟ وتیان : بەڵێ .

فەرمووی : بۆ خوا پێم بڵێن : ئایا ئەزانن پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەبارەت سوپای ( العسرة ) [1] فەرمووی : کێ ئەیەوێ خەرجی یەکی قبوڵ کراو بدات ؟ خەڵکیش هەموو ماندوو بێ دەسەلآت بوون ، من ئەو سوپایەم بە تفاق ئامادەکرد ؟ ) وتیـان : بـەڵێ ... پاشان فەرمووی : سوێندتان ئەدەم بەخوا مەگەر نازانن کەس نەیدەتوانی بیری( رومە ) [2] ئاو بخوات بە بێ پارە ، منیش کڕیم و بەخشیم بە هەژار و دەوڵەمەند و ڕێبواران، وتیـان ( اللهم ) بەڵێ .. دواتر چەند شتێکی تری بیر خستنەوە . [3] بەلآم ئەو خەڵکە گوێچکەیان لە ئاستیدا کـەڕ کـرد بـوو ، دوای نەفـسی بـەد کرداریـان کـەوتبوون کـە دەیوروژانـدن لـە بەدبەختی و چارە ڕەشی یان هیچ شتێکیان نەدەویست جگە لە کوشتنی عوسمان ( ﷺ ) !! .

**داوایەکی پڕ ڕێز لە بەهەشتەوە : ئەی عوسمان لەلامان بەربانگ بکەرەوە:**

لە موسلیمی کوڕی سەعیدی خزمەتکاری عوسمانی کوڕی عەفانەوە ( ﷺ ) دەڵێت :

عوسمان بیست بەندەی ئازاد کردوو داوای چەند شەرواڵێکی کرد و لـە ( لەبـەری کرد ) لە کاتێکدا عوسمان نەلە جا هلیەت و نەلە ئیسلامدا لەبـەری نـەکرد بوو [4] ، پاشـان فەرمووی : " لەخەونمدا پێغەمبەری خودا ( ﷺ ) و ئەبوبەکر و عومەرم بینی ، پێیـان وتم : ئارام بگرە ، تۆ لـە لای ئێمـە شـەوی داهـاتوو بـەربانگ دەکەیتـەوە ) [5] . پاشـان پێشەوا عوسمان داوای قورئانێکی کرد و لە نێو دەستەکانیدا پەراوەکانی کردەوە و بەو حاڵەوە شەهیدا کرا کە قورئانەکە لە نێو دەستیدا بوو ، تەسلیمی فەرمانی خوای پەروەردگاری

---

[1] – ئەو سوپایە بوو کە بەرەو تەبوك ڕۆیشت .

[2] بیرێکە عوسمان ( ﷺ ) کڕی بۆ موسڵمانان .

[3] صحیح / صحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ١٩٢٩ ) و ئینو ماجە ( ١٠٩ ) .

[4] – ئیبنو کثیر دەڵێت / ئەو ڕۆژە لەبەر ئەوە شەرواڵی لە پێ کرد تا ئەگەر کوژرا عەورەتی بەدەرنەکەوێت ) بڕوانە البدایە ( ٥ / ٢٧٠ ) .

[5] – پێشەوا عوسمان ( ﷺ ) ئەو ڕۆژەی شەهید کرا بە ڕۆژوو بوو .

بوو و بە هیچ جۆرێ ڕووبەڕووی خەڵکەکە نەوەستا و خۆی لە کۆشتاریان بە دوور خست و جەختی کردەوە لە خەڵکانی دەور و پشتی کە لەبەر ئەم شەڕ نەکەن و دەستیان لەکەس بەرز نەکەنەوە ، خۆ ئەگەر پێداگری ئەم نەبوایە لەسەر ئەوە ، ئەوا هاوەڵان پشتگیری یان دەکرد و سەریان دەخست لە دژی ئاژاوەچی یەکان ، بەڵام ویست و فەرمانی خوا گێڕانەوەی بۆنی یە . ئەوە بوو کاتێ عوسمان سوێندی ئەهلەکەی (ئەوانەی لەماڵدا لەگەڵیبوون) دا بڕۆن و واز بێنن لە شەڕ کردن ، ئاژاوە چیەکان بەسەرماڵەکەیدا سەرکەوتن و دەرگای ماڵەکەیان سوتاند و چوونە ژوورەوە ، هیچ کەس لە هاوەڵانی تێدانەبوو .. کاتێ لێیان دا قورئانی پیرۆز لە نێو دەستیدا بوو ، وە تەمەنی نزیکەی ( ٩٠ ) ساڵ دەبوو . [١]

ئیبنو کثیر دەڵێت : چەسپاوە کە یەکەمین دڵۆپە خوێنی کەوتوەتە سەر ئەم ئایەتی خوای پەروەردگار ﴿ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ سورة البقرة ، آية ( ١٣٧ ) .

واتە : ( بەڵام دڵنیابە ئەی ( محمد ) (ئەی ئیماندار ) خوا تۆ دەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان ، چونکە ئەو خوایە زۆر بیسەر و زانایە ) . ئەمەش هیچ دوور نیە لە کاتێکدا ئەو قورئانی لە نێو دەستدا بووە و دەیخوێندەوە [٢]

ئیبنو عەساکر دەگێڕێتەوە : کاتێ لە عوسمان درا ، فەرمووی : ( بسم الله ، توكلت على الله ) کاتێکیش خوێنی ڕژا فەرمووی : ( سبحان الله العظيم ) .

ئەصمەعی لە عەلائی کوڕی فەضلە وە لە باوکیەوە دەڵێت :

پاش کوشتنی پێشەوا عوسمان ( ﷺ ) خەزێنەکەیان پشکنی صندوقێکی داخراوی لەناودا بوو لەناو صندوقەکەدا قاپێکی لەناودا بوو کە ئەمیش پارچە کاغەزێکی تیا بوو لەسەری نووسرا بوو : " ئەمە وەسیەتنامەی عوسمانە ، بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، عوسمانی کوڕی عەفان شایەتی دەدات کە هیچ خودایەك نیە جگە لە ( الله ) و بێ هاوەڵە و ( محمد ) بەندەو نێردراوی خوایە و بەهەشت و ئاگر هەقن و خودا هەموو مردووانی ناو گۆڕەکان زیندوو ئەکاتەوە بۆ ڕۆژێك کە هاتنی هیچ گومانێکی تێدا نیە و بێ گومان خودا وادەی خۆی جێ بە جێ دەکات . لەسەر ئەم زەوی یە دروست کراوان و

---

[١] – قەتادەی دەڵێت : تەمەنی عوسمان ( ﷺ ) ئەوکاتەی کوژرا نەوەد یان هەشتا و هەشت ساڵێك دەبوو ، پیاوانی فەرموودەکە جێ ی متمانەن ، تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە .

[٢] – بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٢٧٣ ) .

دەتان ژیێنیٚ دەژێنێت و هەر لەسەر ئەویش دەیانمرێنێت و دیسان لەسەر ئەم زەوی یە بونەوەران زیندوو دەکاتەوە بە ویستی زاتی خۆی )[1] پاش شەهید بوونی عوسمان ( رضي الله عنه ) زوبێر نوێژی لەسەر کرد ( رەحمەتی خوا لەهەموویان بێت ) و ئەو جا لە ( بحش کوکب ) کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی بقیع بەخاك سپێردرا .[2]

## دادپەروەریی خوا

لە محمدی کوڕی سیرینەوە ، دەڵێت : لە کەعبە تەوافم دەکرد گوێم لە پیاوێك بوو ئەیوت : خوایە لێم خۆش بی ، باوەڕ ناکەم لێم خۆش بی ، منیش پێم وت : ئەی بەندەی خوا ئەوە چی دەڵێیت ؟ تا ئێستا گوێم لە هیچ کەس نەبووە وەك ئەم دوعایەی تۆ بکات...

وتی : پەیمانم بە خودا دا بوو کە هەر کاتیٚ دەسەلاٚتم هەبوو زللەیەك لە ڕووی عوسمان دەم ، ئەوە دریٚغی ناکەم و لیٚ ی ئەدەم .. ئەوە بوو کاتێکوژرا و لە ماڵەکەی خۆیاندا لەسەر نوێنەکەی دانرا بوو خەڵکی ئەهاتن نوێژیان لەسەر ئەکرد ، منیش بەناوی ئەوە وە کە نوێژی لەسەر دەکەم هاتمە ژوورەوە ، خەڵوەتێکم بۆ هەڵکەوت ، لە و خەڵوەتەدا بەرگەکەم لەسەر ڕووی هەڵدایە و زللەیەکم لیٚ دا ، کە بووە هۆی ئەوەی لای ڕاستم وشك بوو .

ئیبن سیرین دەڵێت : بینیم لای ڕاستی هەروەك دار وشك بووە .[3]

*" یاویلاه النار "[4] : —

لە ئەبی قلابەوە ، دەڵێت : لەگەشتێکدا بووم لە شام ، گوێم لە دەنگی کابرایەك بوو دەیوت : " یاویلاه النار " ، منیش چووم بۆ لای بینیم کابرایەکە هەر چوارپەلی بڕاوە لە نیوەیدا ، هەر دوو چاوی کوێرە بووە ، دەم و چاوی لار بووە ، هەواڵیم پرسی ، وتی :

من یەکیٚ بووم لەوانەی چوینە سەرماڵی عوسمان ، کاتیٚ لە عوسمان نزیك بوومەوە خێزانەکەی[5] هاواری کرد ، منیش زللەیەکم لیٚ دا ، عوسمانیش فەرمووی : " بۆ

---

[1] – ئەبو یعلی و عبدالله ی کوڕی پێشەوا ئەحمەد گێڕاویانەتەوە ، بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٢٧٠ ) .

[2] – البدایە / ( ٥ / ٢٨٠ ) .

[3] – بڕوانە البدایە و النهایە ( ٥ / ٢٨١ ) .

[4] – ئای واوەیلا لە ئاگر .

[5] – نائلەی کچی فرافصە ( رضي الله عنها ) .

وادەکەی ، خوا دەست و پێکانت ببڕێت و چاوت کوێر کات و بتخاتە ئاگرەوە ) لەو کاتەداتووشی پەشۆکان و هەڵ لەرزێنێکی گەورە بووم و بەڕاکردن چوومە دەرەوە ، ئەمەم بەسەرهات کە دەیبینی و لە دوعاکانی عوسمان هیچ نەماوە نەهاتبێتە دی جگە لەوەی بچمە ئاگر ... منیش پێم وت : خراپترت بەسەر بێنێ [1] ، وە یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب دەڵێت : ( سەرجەم ئەوانەی چوونە سەر ماڵی عوسمان دواتر شێت بوون . ) [2]

ئیتر بۆ خۆت ئارامی چاولێك بنێ ئەی ( ذي النورين ) بەڕاستی دواڕۆژ و عاقیبەت هەر بۆ لەخواترسانە ...

---

[1] – بڕوانە / الرياض النضرة فى مناقب العشرة ى ( طبرى ) ( ٥٠٧ ) لێکۆڵینەوە د . حمزة النشرتي .

[2] – بە ئیسنادێکی باش تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە و هیثمي أسنادەکەی بە ( حسن ) داناوە . (المجمع) بە ژمارە ( ١٤٥٥٢ ) .

## " ٤ - علی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنه) "

پێناسەکەی : -

علی کوڕی و الیبی کوڕی عبدالمطلب و ئامۆزای پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) .
مەشخەڵی ڕێنمونکەران و ڕووناکی فەرمانبرداران و پێشەوای دادپەروەران و خاوەن دڵێکی ژیر و زمانێکی هەمیشە بە دوعا ..

لە هەمووان پێشترە لە باوەڕهێناندا و هاوسەری خاتو فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) .

### " فەزڵ و گەورەیی "

١ - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " من كنت مولاه فعلي مولاه "[1] واتە : هەرکەس من خۆشەویستی بم ئەبێ عەلیش خۆشەویستی بێت ..

٢ - لە سەعدی کوڕی ئەبی وقاصەوە ( رضي الله عنه ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە عەلی فەرموو : " أنت مني بمنزلة هارون من موسى ، الا أنه لا نبـي بعدى " .[2]

واتە : تۆ بۆ من لە پلەو پایەی هاروندای بۆ موسا ، بەڵام تەنها ئەوەندە هەیە ، لە دوای من پێغەمبەرێکی دیکە نیە .

٣- لە ( علی )یەوە ( رضي الله عنه ) دەفەرموێت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پیێ ڕاسپاردم کە " أنه لايحبك الا مؤمن ، ولا يبغضك الا منافق "[3] واتە : بێ گومان تەنها ئیماندار تۆی خۆش دەوێت و تەنها دووڕوانیش ڕق لێیە و خۆشیان ناوێت .

٤- حوبشی کوڕی جنادەت دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) دەیفەرمووی : ( علي مني و انا منه ، ولا يؤدى عني الا علي )[4]

واتە : عەلی لە منە و منیش لە ئەوم ، و هیچ کەسیش جگە لە علی کارەکانم بۆ جێ بەجێ ناکات .

---

[1] - صحيح / ئیبنو ماجە ( ٩٨ ) ، ژمارەی فەرموودە ( ٤ / ٣٣٥ ) .
[2] - صحيح / ئیبنو ماجە ( ٩٨ ) ، و ترمیزی ( ٢٩٢٣ ) .
[3] -صحيح / صحيحی ( ٢٩٣٨ ) و ئیبنو ماجە ١١٤٠ ) .
[4] - صحيح / صحيحی س ( ٢٩٣١ ) و ئیبنو ماجە ( ١١٩ ) .

٥- لە ئیبنو عومەرەوە ، دەفەرموێت : " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموی : " الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة ، و ابوهما خير منهما " "[١]

واتە : " حەسەن و حوسەین ( رەحمەتی خوایان لێ بێت ) سەروەری لاوانی بەهەشتن باوکیشیان لەوان باشترە .

٦- لە عبدالرحمن کوڕی ئەبی ( لیلی )وە دەڵێت : ئەبو لیلی لەگەڵ علی(ﷺ) شەونشین بوو ( گفتوگۆی دەکرد ) ، دەڵێت ، ئەو لە هاویندا جل و بەرگی زستان و لە زستانیشدا جل و بەرگی هاوینی لەبەر ئەکرد ( واتە گرنگ نەبوو بەلایەوە ) .

وتمان : بۆ لێ ی ناپرسی ؟! لەوەڵامدا فەرموی / لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بە دوامدا ڕۆژی خەیبەر و منیش ئەوکاتە چاوم ژانی دەکرد . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاوم ژان دەکات ئەویش تفی موبارەکی لە چاوم دا و پاشان فەمووی : " اللهم اذهب عنه الحر و البرد " واتە : خوایە گەرما و سەرمای لەسەر لابەرە ...

دەفەرموێت : لە دوای ئەو کاتەوە ئیتر هەستم بە سەرما و گەرمانە دەکرد ، ئەو جا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " لأبعثن رجلاً يحب الله و رسوله ، ويحبه الله و رسوله و ليس بفرّار " .

واتە : پیاوێك دەنێرم کە خوا و پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) خۆشدەوێت خوا و پێغەمبەریش ( ﷺ ) ئەویان خۆشدەوێت و لەو کەسانەش نی یە هەڵبێت ..

خەڵکی سەیریان کرد بزانن کێ یە . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناردی بەدوای عەلیدا و کارەکەی پێ سپارد ..[٢]

٧ – لە ئیبنو مەسعودەوە ( ﷺ ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " ألنظر الى علي عبادة[٣] " واتە : سەیرکردنی علی پەرستشە .

---

[١] – صحيح / صحیحی سوننەتەکانی ئیبنو ماجە ( ٩٦ ) ژمارە ( ٧٩٧ ) .

[٢] – فەرموودەی ( حسن )ە / صەحیحی سوننتەکانی ئیبنو ماجە ( ٩٥ ) و هیثمی لە ( المجمع) دا بە (حسن ) دایناوە بە ژمارە ( ٩ / ١٢٢ ) .

[٣] – تەبەرانی و حاکم ڕیوایەتیان کردووە ، سیوتی دەڵێت : ئیسنادەکەی ( حسن )ە ، تاریخ لخلفاء (ص ١٧٢ ) ئیبنو کەسیر لە ( البدایە و النهایە ) ٥ / ٤٧٣ ) بە لاواز دایناوە .

## "چەند هەڵوێستێك لە جیهادی عەلی لە پێناو خوادا "

پێش ئەوەی کۆمەڵێ لە هەڵوێستەکانی جیهادی علی ( ﷺ ) هەڵدەینەوە ، دەڵێم: ئیسلام جیهادی بۆ پارێزگاریکردن لە هەق و ڕەت کردنەوەی ناهەق و سەرکوتکردنی دەستدرێژکاران و سەرشۆڕ کردن و شکاندنی ستەمکاران داناوە .

هەرچی درۆ هەڵبەستنی ڕۆژهەلاتناسانی ئاینەکانی تریشە کە ئیدیعای ئەوە ئەکەن موسڵمانان هێزیان لە جێگایەکدا بە کار هێناوە کە بیانووی نیە ، ئەمانە هەموو قسەی بێ مانا و بێ بەڵگەن و بەشێکە لەو پلانانەی بۆ سڕینەوەی ئیسلام و هێشتنەوەی ئەهلەکەی وەك کۆیلەی خاچپەرستەکان و زایۆنی یەکان دایان ڕشتووە ..

وە هیچ ڕۆژێك جیهاد پێویستتر نی یە لەلایەن موسڵمانانەوە لەو ڕۆژەی کە ئیسلام وئەهلەکەی هەرەشەی لەناو چوونیان لێ ئەکرێ و چەندین هێز لەسەریان کۆ هاتوون، بەڵکو ئەوانەش کە دوژمنی خوێنڕێژی یەکترین ، لە پێناو لەناو بردنی ئەم ئاینە و ئەهلەکەیدا بۆ هەمیشە ، ئاشت ئەبنەوە و دەسازێن . ئەمەش لە ڕاستیدا لەسەرەتای ئیسلام و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ڕووی داوە و وڵاتی موسڵمانان کەوتوەتە دەستی جەردەکانی سەرزەوی و ئەوجا پیسترین سیاسەتیان پیادەکردووە بۆ ئەوەی هەنگاو بەهەنگاو ئیسلام لەناو ببەن .

چۆن نکوڵی لە بازاڕی مەرگ دەکرێ لەناو ئوممەتێکدا کە سەر بڕو خوێنڕێژان لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ دێنن . [1]

ئەمە پێشەکی یەك بوو کە دەبوایە باسبکرێت ، ئێستا بئەبوینە سەرمەبەستەکەمان : –

*هەڵوێستی یەکەم / ڕۆژی بەدر : –

لەسەرەتای جەنگی بەدرا ، لە بێ باوەڕان هەریەك لە عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە هاتنە پێشەوە و لە بەرامبەر دا چەند لاوێك لە ئەنسار هاتنە مەیدان بۆ ڕووبەڕوو بونەوەیان .. بێ باوەڕان بانگیان کرد : ئەی ( محمد ) ئە وانەمان بۆ بێنە مەیدان کە لە هۆزی خۆمانن و لە ئاستی ئێمەدان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( قم يا عبيدة بن الحارث ، قم يا حمزة ، قم يا علـي ) واتە : ئەی عوبەیدەی کوڕی حارث و ئەی حەمزە ، ئەی عەلی ئێوە هەڵسن ..

---

[1] – بڕوانە : فقه السيرەی ( غەزالی ) ( ٢٢٥ ) بە دەستکاریەوە .

ئەوە بوو عوبەیدە لەگەڵ عوتبە و حەمزە لەگەڵ شەیبە و علی لەگەڵ وەلید بەرامبەر وەستان . هەرچی ( حەمزە )یە هیچ بواری بەشەیبە نەدا و خێرا کوشتی .. هەروەها علیش بەهەمان شێوە بەرامبەرەکەی کوشت ... بەڵام عوبەیدە و عوتبە یەکتریان بریندار کرد تا حەمزە و علی بە شمشێر دایان بەسەر عوتبەدا و ئەو دوژمنەی خویان کوشت و هاوەڵە بەرێزەکەیان هەڵگرت [1]

ئیبنو عەباس دەڵێت : کە عوبەیدەی کوڕی حارث لە ( صفراء ) پاش گەڕانەوە لەبەدر وەفاتی کردووە هەر لەوێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەخاکی سپارد[2]

*هەڵوێستی دووەم / ڕۆژی خەندەق : -

عەمری کوڕی وەد کە دەمامکی ئاسنی بەستبوو هاتە دەر و بانگی کرد : کێ بەرامبەرم ئەوەستێ ؟ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ( رضي الله عنه ) هەڵساو فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) من بەرامبەری دەوەستم ، پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی " انه عمرو ، اجلس " ، " دانیشە ، ئەوە عەمرە " .

پاشان عەمر بانگی کردەوە : ئایا پیاوێك نیە بەرامبەرم بوەستێت ؟ دەستی کرد بە تانە و تەشەردان لە موسڵمانان و دەیوت : ئەی کوا ئەو بەهەشتەتان کە ئەڵێن هەر کەس لە ئێوە بمرێت جێگەی بەهەشتە ؟ پیاوێکتان تیا نیە بێتە دەرەوە و ڕووبەڕووم بوەستێ ؟ عەلی هەڵسایەوە و فەرمووی : من ، ئەی پێغەمبەری خوا ... فەرمووی ( ﷺ ) ، "اجلس"دانیشە.

پاشان بۆ جاری سێیەم بانگی کردەوە و هۆنراوەیەکی خوێندەوە عەلی ( رضي الله عنه ) هەڵسایەوە و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، من ... فەرمووی ( ﷺ ) " انه عمرو " ئەوە عومەرە...

عەلی فەرمووی ، با عەمریش بێت ، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مۆڵەتی داو ئەویش بەرەو ڕووی عەمر ڕۆیشت و کاتێ گەیشتە بەردەمی فەرمووی :

---

[1] – صحیح / ئەبو داود لە ( ١ / ٤١٦ ) و احمد ڕیوایەتیان کردووە . ئەلبانی لە ( تخریج فقه السیره ) ( ٢٤٣ ) بە ( صحیح ) دایناوە ...

[2] – حسن / حاکم ڕیوایەتیان کردووە ، دەڵێت ( صحیح )ە زەهەبیش لەسەر هەمان ڕایە . وە ئەلبانی لە ( تخریج فقه السیره ) دا بە ( حسن ) دایناوە بە ژمارە ( ٢٤٣ ) .

لا تعجلن فقدأ تاك مجيب صوتك غير عاجز
في نيـــة و بـــصيرة الصدق منجي كـل فـائز
انـي لأ رجوان اقيم عليـك نائحـــة الجـنائز
مـن ضـــربة بخلاء يبقى ذكرها عند الهز هز "[1]

عـەمریش پرسـی : تـۆ كێیـت ؟ فـەرمووی : عـەلی ،.. وتـی : كـوڕی عبـد منـاف ؟ فـەرموی / مـن ( علـی كـوڕی ابـو تالیـب )م وتـی : بـرازا ، لـە مامـەكانت هـەن كـە لـە تـۆ بەتەمەنترن ، من حەزناكەم خوێنت برژێنم ، ( علی ) فـەرمووی : بـەڵام ، سـوێند بـەخوا مـن حەز ئەكەم خوێنت برێژم .

عەمریش توڕە بوو هاتە پێشەوە و شمشێرەكەی وەك بڵێسە ئاگر دەرهێنا و بـەرەو ڕووی علـی ( ﷺ ) بـە تـوڕەیی هـات . پێشـەوا ( علـی ﷺ )ش بـە ( سـوپـەرەكەی ) كـەی بەرامبـەری وەسـتا عـەمر شمشـێرێكی دا لـە سـوپەرەكەی و دایـدڕی و شمشێرەكەی تیـا جێگیر كـرد و دای لەسـەری و قڵیشـاندی ، پێشـەوا ( علـی ﷺ )ش دای لـە چـەقە دەمـاری عەمر و خستی .. تۆز بەرزبووەوە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گوێ ی لە وتنـی " ﷲ " بـوو ، ئیتر زانیمان كە ( علی ﷺ ) عەمری كوشتووە . پاشان علی ( ﷺ ) بەرەولای پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) دەهات و دەم و چاوی لە خۆشی دا دەگەشـایەوە . عومـەر ( ﷺ ) فـەرمووی : بۆچی درعەكەیت لێ نەكردووەوە بیهێنیت ؟ عەرەب لـەم درعـە باشـتریان نیـە . فـەرمووی : كاتێ لێمدا وەها كەوت كە ئەگەر درعەكەیم لێ بكردایتەوە عەورەتی بەدەر دەكەوت منیش كوڕە مامم بوو شەرمم دەكرد ڕووتی بكەمەوە " .[2]

*هەڵوێستی سێیەم : ڕۆژی خەیبەر ...

جولەكە پشت بە سوڕاندنەوەی سوپا لـە مەیدانی فراوانـدا نابەسـتن كە لێیـان بدرێت یـان ئەوان لەبەرامبەر بدەن و هەمیشە ڕقیان لە مەیدانە والأكانە بۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوە و ئـەو ئاینـەی هـەرگیز دەسـتی لـێ هـەڵناگرن بـریتی یـە لـە : هـەوڵـدان و تێكۆشـان لـە پـشت

[1] – ماناى شيعرەكە : " پەلەت نەبێ .. وا ئەوەی بانگت دەكرد بەرەو ڕووت هات بە بێ ترس .. بە نیەت و بەرچاو ڕوونیەكی ڕاست بۆ ڕزگار كردنی هەموو سەر فرازێك .. هیـوادارم كـارێكی وات بەسـەر بێـنم هـاوار و هەڵای جەنازەت بۆ بگێڕن ، بە لێدانێكی بەرین و گوشاد كەلە هەموو جەنگ و نەهامەتی یەكدا بـاس بكرێـت " ..

[2] – ئیبنو كەثیر لە ( البدایە )( ٤ / ١٠٦ ) باسی كردووە ، لە ڕێگەی بەیهەقیەوە لە ئیبنو ئیسحاقەوە .

دیوارەکانەوە . [1] ڕۆژی خەیبەریش ئەوە بوو ئالأی موسڵمانان بە دەست ( عەلی کوڕی ئەبو تالیب )ەوە بوو ( ﷺ ) یەهودیش لەناو قەلأ هەڵچنراوەکانیاندا خۆیان قایم کرد بوو، کاتێ شەڕ لە نێوان موسڵمانان و جوولەکەدا دەستی پێ کرد و موسڵمانان ڕووی هێرشەکانیان کردە قەلأکان و قەلأ دوای قەلأ لە ژێر فشاری موسڵماناندا چۆکی پێ دەدرا. لە یەکێ لە قەلأکاندا ئەسپ سوارێك بەناوی ( مرحب ) هاتە دەرەوە و بانگی لە موسڵمانان کرد : کێ هەیە بتوانێ بێتە مەیدانی منەوە ...

( عەلی ) ش ( ﷺ ) بۆی هاتە پێش و شمشێرێکی لێ دا سەری لەت کرد و ئەمەش بۆ خۆی فەتح بوو . [2] بەو جۆرە هەموو قەلأکان تێکشکان و موسڵمانان سەرکەوتن و وانەیەکی وایان نیشانی جولەکەدا کە هەرگیز لە یادی نەکەن ، بەم جۆرە دەبینین چۆن ئەو ئاوەدانی و شارە خراپەکارانە بەو خراپەکاری یە یان خۆیان بەرە و هەلاکەت و لەناوچوون دەبەن ئەمڕۆ بێت یان سبەی .. هەر نەتەوەیەك لەگەڵ بوونی ئازادیدا خۆ بەزلزانی بنوێنێت ، خاوەنێتی خۆی لە دەست دەدات و دەکەوێتە ژێر دەستی کەسانی تر.

## " زانستی عەلی "

پێغەمبەر ( ﷺ ) بە ( فاتیمە )ی کچی فەرموو : " أما ترضين أن ازوجك اقدم امتي سلماً، و أكثرهم علماً ، و اعظمهم حلما " . [3]

واتە : ئاتەوێ بتدەم بە کەسێك لە هەموو ئومەت لە پێشتر بووە لە ئیسلامدا و لە هەموویان زانا تر و لە هەموویان هێمنتر و لەسەر خۆ ترە .

هەروەها ئیبنو سەعد لە ( علی ﷺ ) دەیگێڕێتەوە کردووە فەرمویەتی:سوێند بە خوا هەر ئایەتێ دابەزیبێت ،زانیومە بۆچی دابەزیوە و لەکوێ دابەزیوە و لەسەرکێ دابەزیوە ؟

خوای پەروەردگارم دڵێکی ژیر و زمانێکی ڕاستبێژ و پاراوی پێداوم ... [1]

---

[1] – بڕوانە: فقه السیرەی غزالی (٣٦٣).

[2] – صەحیحە / لە صحیح ی موسلیم و کەسانی تریشدا جێگیر کراوە ، ئلبانی دەڵێت : هەواڵە متواترەکان ئەڵێن کە دەڵێن بکوژی ( مرحب ) عەلی یە . التلیق علی فقه النسه ( ٣٦٥ ) .

[3] – هەیسەمی دەڵێت : ئەحمەد و تەبەرانی لە ڕێ ی پیاوێکی جێ متمانەوە ڕیوایەتیان کردووە . بە ژمارە ( ١٤٦٦٩ ) .

هەروەها ئیبنو سەعد و غەیری ئەویش دەیگێڕنەوە لە پێشەوا ( علی)ەوە ، فەرموویەتی: ( دەربارەی پەڕاوی خوای گەورە " قورئان " پرسیارم لێ بکەن ، لەبەر ئەوەی ئایەت بە ئایەتی ئەزانم بە شەو دابەزیوە یان بە ڕۆژ ، لە دەشت دابەزیوە یان لە کێو دا ... [2]

## " دوونیا نەویستی علی "+

ـ علی کوڕی ئەحمەدەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت :

" علیم بینی ( ﷺ ) لە بازاڕ شمشێرێکی ئەفرۆشت ، دەیفەرموو : ( کێ ئەم شمشێرەم لێ ئەکڕێ سوێند بەو زاتەی تۆوەکان سەوز دەکات هەمیشە ڕووی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )م پێ پاراستووە لە ناڕەحەتی و ئەگەر نرخی پۆشاکێکم بوایە هەرگیز ئەم ئەفرۆشت " [3]

ئای لە نەفسی بەرزیت ، ئەی باوکی حەسەن ! بەڕاستی ئەوەی لای خوایە باشترە و هەر ئەوە دەمێنێتەوە ، دەی ئارامبە و لەسەر ناڕەحەتیەکانی دنیا خۆگربە چاوەڕێ ی وادەی خوای گەورە بە .

## " خۆشحاڵی لە زاهیدان "

ئامۆژگاری یەکە بە ئاوی ئاڵتون لەسەر لاپەڕەی دڵەکان دەنووسرێتەوە : —

لەنەوف بوکالی یەوە دەڵێت : —

" علی کوڕی ئەبو تالیبم شەوێك بینی چووە دەرەوە ، سەیرێکی ئەستێرەکانی کرد و فەرمووی : ئەی نەوف خەوتویت یان تۆش دەڕوانی ؟ وتم / منیش دەڕوانم . ئەی ئەمیری ئیمانداران . فەرمووی بەختەوەری بۆ ئەوانەی پشت لە دنیا هەڵدەکەن و تامەزرۆی ئاخیرەتن .. بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن زەوی وەك ڕاخەر و خۆڵەکەی وەك فەرش دەبینن و ئاوەکەی وەك بۆنێکی خۆش و قورئان و دوعایش وەك داپۆشەر و دارستانێکی چڕو پڕ دەبینن .. بەو جۆرە بە دنیایان قایل بوون لەسەر ڕێبازی عیسا ( سەلامی خوای لێبێت) .

---

[1] — بڕوانە — تاریخ الخلفاء ( ١٨٥ ) .

[2] — بڕوانە — تاریخ الخلفاء ( ١٨٥ ) .

[3] — بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ١٦٧ ، ١٦٨ ) .

ئەی نەوف ، خوای پەروەردگار سروشی بۆ ( عیسی ) نارد ( علیهم السلام )تا فەرمان بکات بە بەنی ئیسرائیل نەچنە هیچ ماڵێك لە ماڵەکانی بە دڵێکی پاك و گەردن کەچی و دەست و پەلێکی لە گوناه پارێزراو نەبێ ، ئەگەر وانەکەن وەڵامی هیچ کامیان نادەمەوە ، هەروەك وەڵامی هیچ کەسێك نادەمەوە مافی کەسێکی لە لەبوت .

ئەی نەوف نە هۆنەر [1] بەو نە سەرۆکار بەو نەپۆلیس بەو نەباجگر و نە (دەودوو وەرگر ) [2] بە ، چونکە لە ڕاستیدا ( داوود ) " علیه السلام " لە کاتژمێرێکی شەودا هەڵساو فەرمووی : ( ئای چ سەعاتێکە ! کە دوعای هەموو کەسێکی تیاگیرا ئەبێ مەگەر (عریف ) یان پۆلیس یان باجگر یان ( دەو دوو وەرگر بە ) یا خود مۆسیقا ژەن بێت بە ( سەمتور و دەهۆڵ) یاخود کەسێك شەترنج بکات . [3]

" ڕاسپاردەیەکی دیکە کە بە وشە گەلێك لە نوور دەنووسرێتەوە "

لە ( کمیل )ی کوڕی ( زیاد )ەوە دەڵێت : علی کوڕی ئەبو تالیب دەستی گرتم و بردمیە لای گۆڕستانێك ، کە گەیشتینە چۆڵەوانی دانیشت و پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشا و فەرمووی : -

" ئەی کمیلی کوڕی زیاد ، دڵەکان ، باشترینشیان دڵێکە باش شت هەڵگرێ ، ئەمەی پێت دەڵێم لەبەری بکە و هەردەم با لە یادت بێ "

خەڵکی سێ کەسن : زانایەکی خوا پەرست و فێر خوازێك لە پێناوی ڕزگاریدا یان گێل و هەرچی و پەرچی یەك کە شوێن هەر قیڕە و هاوارێك دەکەون و لەگەڵ هەموو بایەکدا شەن دەکەن و نەبە نوری زانست ژیانی خۆیان ڕۆشن کردوەتەوە نەپەنایان بردووەتە بەر پایەیەکی پتەو .

زانست لە ماڵ و سامان باشترە ، زانست پارێزگاری لە تۆ ئەکات لە کاتێکدا تۆ ئەبێ پارێزگاری لە ماڵ و سامانەکەت بکەی . زانست بە کار پێ کردنی گەشە ئەکات بەڵام

---

[1] - مەبەست لێ شیعری خراپە وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە : ﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ ﴾ سورة الشعراء آية (٢٢٤) هەرچی شیعری باش و چاکە ئەوە هیچی لەسەر نیە و هەندێ جار دانایی دەنوێنن .

[2] - ( عشار ) باجێکە لە بازرگانی ناموسڵمان وەردەگیرێ لە برێتی ڕێپێدانی هاتنەناوەوەی خاکی ئیسلام .

[3] - بڕوانە / البدایە ( ٥ / ٤٩٦ ) .

ماڵ و سامان  بە خەرج کردن کەم دەکەن . هەروەها خۆشویستی زانایان فەرزێکە و ئەبێ لە خۆتدا بەدی بێنیت .

هەڵگری زانست وا لە خاوەنەکەی ئەکات لە ژیانیدا ئیتاعە بکرێ و لە پاش مردنیشی بە باشی ناو ببرێت ، بەڵام ماڵ و سامان هەر بە لەناوچونی نامێنێ و لە دەست دەچێ ..

ئەوانەی پارە و پوڵ کۆ دەکەنەوە هەر بە زیندوویی مردوون ، بەڵام زانایان هەتا دنیا بمێنێ دەمێنن . خۆیان دەسڕن و وەفات دەکەن، بەڵام وێنەی بەرزیان هەر لە دڵدا یە .. و لێرەدا " ئاماژەی بۆ سنگی کرد " ئەگەر زانستێك نەبێ ئەوا مرۆڤ نازانێ چۆن هەنگاوەکانی هەڵدەگرێ .. دەبینی فەرمانبەرداری ئەهلی هەقە ، بەڵام بۆ زیندوو ڕاگرتنی ئەو بیر و باوەڕەی بەرچاو ڕۆشن نی یە بە تەنها نیشانەیەك لە گومان دوودڵی لەلا دروست ئەبێ و نە ئەوەتا بەم لادا بێت و نە ئەوە تا بەو لادا بڕوات.

یاخود زۆر بە ئاسانی بەرەو حەزەکانی ئەڕوات یان بە کۆ کردنەوەی پارە و پول نغرۆ دەبێ و ، بەو جۆرە لێ ی دڵنیا نیت ...

بۆیە زانست بە مردنی هەڵگرانی دەمرێت .. دەسا ئەی پەروەردگار زەوی خاڵی مەکە لە کەسانێك هەڵدەسن بە چەسپاندن و دامەزراندنی بەڵگەکانی تۆ ، بۆ ئەوەی بەڵگەکانت لەسەر زەوی بەتاڵ نەبنەوە ..

ئەوانە (واتا زانایان) کەمترین ژمارە یان هەیە و ڕێزیان لەلای خوا لە هەموان زیاترە ، هەر لە ڕێ ی ئەوانەوە خودا پارێزگاری لە (بەڵگەکانی) ئایاتەکانی  دەکات تا دەیدەنە دەست هاوشانانیان و لە دڵی ئەوانیشدا دەیچێنن .

زانست ڕاستیی شتەکانی لەسەر دەستیان ڕوون کردووتەوە تا ئەوەی خۆشگوزەرانان بە بەردەڵان و سەختیان دەزانی ئەمان نەرمی و سادەیی یان دەرخست و لەلای ئەمان خۆشنودی بوو وە ئەوەی بێ ئاگایان لێ ی دوورە پەرێز بوون ئەمان هۆگری بوون .

هاوڕێیەتی دنیایان بە جەستەیەك دەکرد کە ڕۆحەکەی بە ( مەلەکوتی باڵا )وە پەیوەست بوو . ئەوان جێنشینی پەروەردگارن سەرزەویدا  و بانگخوازانی ئاینەکەی ئەون ، ئای ، ئای چەندە تامەزرۆی دیداریانم .. خوا لە من و تۆش خۆش بێ ئەی کومەیل .. ئەگەر دەتەوێ هەڵسە " [1]

---

[1] – بڕوانە / حلیة الاولیاء ( ۱ / ۷۹ ، ۸۰ ) .

## " لە دەربڕینە پتەو و ئاماژە وردەکانی عەلی ( ﷺ ) "

" ببنە چاوگی زانست و کانگای دانایی و چرای شەوان ، پۆشاك شڕو کۆن و دڵ زیندووبن .. لەلای ئەهلی ئاسمانەکان ببنە ئاشناو لە ئەهلی زەوی شاراوە و نادیاربن با لە لای پەروەردگارتان باس بکرێن .

ئاگاداربن شارەزای ڕاستەقینە کەسێکە خەڵکی لە ڕەحمەتی خوا بێ هیوا ناکات و هەروەك لە سزای خوا ئەمینیان ناکات و ڕێیان نادات بەسەرپێچی کردن یان لایان ئاسان و سادە ناکات .. و قورئان و ازلێ ناهێنێت بۆ شتێکی تر .. بەڕاستی خێر لە پەرستشێکدا نی یە بە بێ ئاگایی و بە بێ زانیاری ئەنجام بدرێت .

هەروەك خێر لە زانستێکدا نی یە تێگەیشتنی لەگەڵدا نەبێ و خێریش لە قورئان خوێند نێکدا نیە کە ئامۆژگاریت نەکات و پەیڕەوی لەگەڵدا نەبێ .

چاکە و خێر ئەوەنی یە ماڵ و منداڵت زۆر بێت ، بەڵکەو خێر لەوەدایە زانستت زۆر بێ و لەسەر خۆتر بیت و شانازی بە خوا پەرستیەوە بکە . ئەگەر چاکەت کرد سوپاسی خوای لەسەر بکە ، ئەگەر خراپەشت کرد داوای لێ خۆش بوون لە خوا ..

بەڕاستی خێر لە دنیادا نی یە بۆ دوو کەس نەبێ :

کەسێك تاوانگەلێکی زۆری ئەنجام داوە و دواتر تەوبەی کردووە ، وە پیاوێك خێرا بەدەم چاکە کردنەوە دەڕوات و هەوڵ بۆ ئەوە دەدات لەلای خوا پلەی بەرز بێتەوە و هەموو کارەکانی تەقوای لەگەڵدایە ، چۆن تەقوای خوا بەکەم دەزانێ کاتێ هەموو کارێکی لەلایەن خوداوە وەرگیراوە ..

هەروەها امام علی ( ﷺ ) فەرموویەتی :ئاگاتان لە پێنج شت بێت و چاودێری لێ بکەن کە ئەگەر بچنە سەرپشتی حوشتریش بۆ بەدەست هێنانیان دەستتان ناکەوێت و هێندەی بەدوادا دەگەڕێن تا حوشترەکە لاواز دەکەن پێش بە دەستهێنانیان : –

لە هیچ کەس تکا مەکەن جگە لە پەروەردگارتان ، لە تاوانەکانتان نەبێ لە هیچی تر مەترسن ، کەسی نەزان و نەشارەزایش شەرم لەوە نەکات پرسیار لە شتێك بکات کە نایزانێ ، وە زانایش لەوە شەرم نەکات کە ئەگەر پرسیاری لە شتێك لێ کرا و نەیزانی ، بڵێ : خوا دەیزانێ ، ئارامگرتن لە باوەڕەوەیەو لە پلەی سەر بۆ جەستەدا یە ( واتە : جەستەی مرۆڤ بایەخی چیە بەبێ سەر ) و کەسێك ئارامی نەبێ باوەڕیشی نی یە .

وە فەرموویەتی : -

سەختترین و دژوارترین کار سێ کارە : - مافدانەوە لە لایەن خۆتەوە ( دانەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی لەلایەن خۆتەوە ) ، یادی خوا لە هەموو کاتێك و لە هەموو بارێکدا ، و دڵنەوایی کردنی بەماڵ و پارە .. [1]

## " یەکێ لە وتارەکانی علی ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) "

لە یەکێ لە پیاوانی هۆزی بەنی شەیبانەوە دەگێڕێتەوە : -

عەلی کوری ئەبی تالیب ( ﷺ ) وتارێکی دا تیایدا فەرمووی : " سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و پشت و پەنام هەر ئەوە و باوەڕ و یەقینم پێ ی هەیە و شایەتی ئەدەم کە هیچ خوایەك جگە لە ( اللّٰه ) نی یە و بێ هاوەڵە ، وە ( محمد ) بەندە و نێرراوی خودایە و بۆ ڕێنموونی کردنی خەڵکی و ئاینی هەقی پێدانارددووە تا بیانووی خەڵکی نەهێڵێ و دەرد و نەخۆشی لەناوتاندا لابەرێت و لە خەوی بێ ئاگایی وەخەبەرتان بێنێ .. بزانن کە ئێوە دەمرن و پاش مردنتان زیندوو ئەکرێنەوە ، لەسەر کار و کردەوە کانتان ڕادەگیرێن و هەربەوان پاداشت وەردەگرن ، ئیتر ژیانی دنیا لوت بەرزتان نەکات ، چونکە ئەم دنیایە ماڵێکە بە بەڵاو نەهامەتی دەورە دراوە و ئاشکرایشە کە لەناو دەچێت و دەڕوات و بە بێ دادیش وەسف کراوە ..

هەرچی تیایە بەرە و لەناو چوون دەڕوات لە کاتێکدا لە نێو کەس و کاریدا بۆخۆی دەوڵەتە .. هەروەها مەترسی یەکانیشی بەردەوام نابن و ئەوەشی لە دنیادایە ئەمین نئەبو لە شەڕ و خراپەی دنیا ، ئەو کاتەی ئەهلەکەی لە خۆشگوزەرانی و ڕەفاهیەتدان ئەو کاتە لە ناو بەڵا و لە خۆبایی بووندان ، دنیا بریتی یە لە چەندین بارودۆخی جیاواز ، چەندین هاتن و چوون و تێپەڕ بوون ، ژیان لەناویدا بێزراوە و خۆشیەکانی تاسەر نامێنن ، بەڵکو خەڵکەکەی وەك ئامانجێکی پێکراون بە تیرەکانی . هەروەك هەمووان چارەنووسیان تیایدا دیاریکراوە و بەشیان دئەبون کراوە .

ئاگاداربن ئەی بەندەکانی خوا ، ئێوە کەلەناو گوڵی ژیاندان ، لەسەر ڕێی پێشینەکانتانن لەوانەی کە لە ئێوە تەمەن درێژتر و بەدەسەڵات تر و شوێنەوار دیارتر

[1] - واتە : هەریەك لەم سێ کارە بەلای مرۆڤەوە ئەرکێکی سەختە ، بەڵام پاداشتی زۆر گەورەیە(وەرگێڕ).

بـوون .. چـی بـوو ؟ مـالْ و سـامان لـە دەسـت چـوو ، جەسـتەیان بـووە هـاوڕێی خـاك ماڵـەكانیان خـالْی و چـۆلْ و بـیْ نـشین .. شـوێنەواریان سـڕاوەتەوە .. ئـەوان كۆشـك و تـەلاریان بـووە بـە خـۆلْ و بـە بـەرد كـە بیناكـەی بـە خـۆلْ پێكـەوە نـراوە ، ئـەوەی تیایدا نیشتەجیْ یە ئاوارە و غەریبە لەناو كۆمەڵێك گۆڕی دیكەدا كە هەر كەس بـەخۆی سـەرقاڵە و كەس هات و چۆ و سەردانی كەس ناكات لەگەلْ ئەو هەموو نزیكی و هاوسێیەتی یـەش كـە لـە نێوانیاندایـە چۆن هـات و چـۆی یـەك بكـەن ، كاتیْ بـەلاّو سـەختڵەتی یـەكانی گـۆڕ هاریونی و پاش ژیان بوونەتە مردوو .

پاش گوزەرانێكی گەش بوونەتە ئێسك و پروسك ، بۆ ئازیزانیان بوونە كارەسات . بوونە نیشتەجیْ ی خاك و هاتنەوەیان نی یە هـەرگیزا و هـەرگیز : ﴿كَلاَّ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ سورة المؤمنون آية (١٠٠) [١]

ئێـوەش كـە وەك ئـەوان تووشـی بـەلاّو تـەنهایی دەبـن لـە گـۆڕەكانتانـا و لـەو ئارامگەیەدا بە بارمتە دەگیرێن و سپاردەی ئەو جێگەیە دەكرێن .. ئەی ئەو ساتە چی كە كاروبارەكان جلّە و گیردەبن و هەرچی لەناو گۆڕەكاندایە هەڵدەرێـژرێن و لە نێو دەستی پەروەردگاری بەدەسەلاّت و بلّند دا ڕادەوەستێنرێن بۆ لێپرسینەوە لەو ساتەدا كە دلّـەكان لـەتاو تـرس و تـوقین لـە تاوانـەكانیان لەسـینەكاندا دەردەپـەڕن و هەرچـی پـەردە هەیـە بەسەرتانەوە لا دەبریْ و هەرچی نەنگ و نهێنی یەكانتانە ئاشكرا دەبن ، لەوێدا ﴿ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ سورة غافر آية ١٧ . [٢]

پـەروەردگاری بالاّ دەسـت دەفـەرمووێت : ﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴾ سورة النجم ، آية (٣١) . [٣]

وە دەفـەرمووێت ﴿ وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِراً وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً ﴾ سـورة الكهف ، آية (٤٩) . [١]

---

[١] – واتە : نەخێر ئەو قسەیەكە ئەو بۆ خۆی دەیلێت ، بەڵكو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا ، لە نێوان مـردن و زیندوو بوونەوەدا تا كاتێك زیندوو دەكرێنەوە چاوەڕیْ بێت .

[٢] – واتە : هەموو كەس پاداشتی كار و كردەوەی خۆی وەردەگرێت .

[٣] – واتە : بۆ ئەوەی تۆڵە بـسێنێت لەوانـەی كـە خراپـەیان كـردووە بـە گـوێرەی كردەوەكانیـان پاداشـتی ئەوانەش كە چاكەیان كردووە بە باشترین شێوە بداتەوە .

خوا منیش و ئێوەش بکاتە یەکێ لەوانەی کە ئیش بە قورئانەکەی دەکەن و شوێن پیاوچاکان و خواناسان (ئەولیاکان) دەکەون تا ئەو کاتەی دەگەینە مالی هەتاهەتاییمان بە چاکەی خۆی .. بەراستی هەر ئەو زاتە سوپاسکراو بە دەسەلاتە . [٢]

وە لە ( جعفری کوری محمد )ەوە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیرەیەوە دەلێت : - عەلی ( ﷺ ) جەنازەیەکی بەرێکرد کاتێ مردووەکە خرایە گۆرەکەی کەس و کارەکەی هاوار و گریانیان لێ بەرز بوویەوە ، فەرمووی : -

" ئەوانە بۆچی ئەگرین ؟ سوێند بەخوا ئەوەی مردووەکەیان دەیبینێت ئەگەر ئەمان بیاندیایە سەرسامی ئەو دیمەنانە مردووەکەی لەبیر ئەبردنەوە ، وە یەکە بە یەکە ئەگەرێتەوە لایان تا کەسیان نامێنێ.. " پاشان فەرمووی : - ئەی بەندەکانی خوا ، ئامۆژگاریتان ئەکەم بەتەقوای ئەو خوایەی کە نموونەی بۆ هێناونەتەوە و وادەکانی بۆ دیاریکردوون و ئەندامی بیستنی پێداون کە لە مەبەستەکانی بگەن و بینایی پێ بەخشیون تا ئەوەی پێ ببینن کە خوا دەیەوێت دلێنیکی پێ داوون کە بگات لەوەی بە دانایی و ژیری رەفتار بکات ... تا بزانن خوای گەورە ئێوەی بێ هودە خەلق نەکردووە ، بەلکو ئەو زاتە بە بەخششەکانی رێزی لێ ناون و پاداشتی بۆ ئامادە کردوون ، دەی ئێوەش ئەی بەندەکانی خوا لە خوا بترسن و پێ داگرین لە دوعاکانتاندا . وە پێش ئەوەی مردن رێتان پێ بگرێت ، کاری چاکە پێشبخەن ، چونکە خۆشی یەکانی دنیا هەمیشەیی نین ، و کەس لە ئازار و خەمەکانی دنیا ئەمین نی یە . بەراستی لە خۆبایی بوونێکی تێپەر بوو و کۆلەکەیەکی لارە .

ئەی بەندەکانی خوا ئامۆژگاری لە گۆر وەرگرن و بە هەرەشەکان داچلەکێن و وریاببنەوە وسوود لە ئامۆژگاری وەرگرن ، هەروەك ئەوەی ئێستا چنگی مردن پێتان گەشتبێ و خاك و خۆل لە باوەشی گرتبن و تۆقێنەرەکان بەفو کردن بە بووقدا ( کەرەنا ) کتوپر رێی پێگرتبن و هەروەها بە پەرش و بلاو بوونەوەی گۆرەکان و راپێچ کردنتان بەرە و مەحشەر و راوەستان لەمەیدانی لێپرسینەوەدا و بە دەسەلات و توانای خودای مەزن ،

[١] - واتە : نامەی کردەوەی هەر کەس دائەنرێت ، تاوانباران دەبینین دلە لەرزێ و دلە راوکێیانە لەکار و کردەوەی ناپەسەندی تۆمار کراویان بۆیە دەلێت : هاوار لە ئێمە ئەم نوسیانە چین ؟ هیچ گوناهێکی وردی جێ نامێلن ، بەلکو هەموو تۆمار دەکەن ، ئەو خەلکە هەرچی یان کردووە ئامادەیە ، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات .

[٢] - صفه الصفوه ( ١ / ١٧٠ ) .

ئەوکاتەی هەموو کەس ( سائق ) یێکی هەیە و بەرە و حەشر راپێچی ئەکات و (شاهد )یێکی هەیە شایەتی لەسەر دەدات .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَأَشْرَقَتْ الأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِـيءَ بِـالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْحَقِّ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾ سورة الزمر ، آية (٦٩). [١]

کە وڵات بۆ ئەو ڕۆژە کەوتە لەرزین و بانگبێژ بانگی دا و گیانلەبەران حەشرکران و نهێنیەکان دەرکەوتن و دڵەکان کەوتنە لەرزین و دۆزەخ دەرکەوت بە جۆرێ کڵپەی دەهات و بڵێسەی بەرز بووەوە .

ئەی بەندەکانی خوا : تەقوای خوا بکەن ، تەقوای کەسێکی ترساو و بە ئاگا و بەرچاو ڕوون و داچڵەکاو ، تەقوای کەسێك پێداگر بووە لە دوعاکانیا ، هەڵا تووە تا ڕزگاری بە دەست بێنێ و بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە کاری چاکەی پێشخستووە و بەو تێشووە پشتی قایم کردووە .. بەڕاستی خوا بەسە کە تۆڵەسێن و لە هەمان کاتدا پشت و پەنا بێت ... وە قورئانیش بەسە بۆت ببێتە بەڵگە و لە هەمان کاتدا لەسەرت بەڵگە بێت .

وە بەهەشت بەسە پاداشت بێت ، هەروەك ئاگر بەسە سزا و ئاکامێکی خراپ بێت .. خوا لە من و لە ئێوەش خۆش بێت . [٢]

## " شەهید بوونی علی ( رضي الله عنه ) "

پاش تەمەنێکی موبارەك کە عەلی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لە ئیسلامدا بەسەری برد وەك داکۆکیکەرێك لەو ئاینەکە ماڵ و گیانی لە پێناویدا دانا بوو ، وادەی خوای پەروەردگاری پێ گەیشت ..

یەکێ لە پەر جووەکانی ( معجزەکانی ) پێغەمبەرایەتی ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) وێنەی شەهید بوونی عەلی نیشانی ( علی رضي الله عنه ) داوە !!

---

[١] – واتە : ئەوسا بە نورێك کە خوا فەراهەمی دەهێنێت زەوی ڕووناك دەبێتەوە کارنامە و دۆسیەکانش دانراون ، سەرەتا پێغەمبەران و شەهیدان دەهێنرێن و دادوەری لە نێوانیندا ئەنجام دەدرێت بە شێوەیەکی حەق و ڕاستی ، بێگومان ئەوان هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت .

[٢] صفة الصفوة ( ١ / ١٧١ ، ١٧٢ ) .

ئەوەتا لە عەمماری کوڕی یاسرەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە علی ( رضي الله عنه )
فەرمووی : ( أشقى الناس رجلان : أحيمر ثمود الذي عقر الناقة ، والذي يضربك يا علي على هذه يعني قرنه - حتى تبتل منك هذه من الدم ، يعني لحيته )[1]

واتە : بەد بەختترین کەسان دوو پیاون : یەکەمیان ( اصیری ثمود ) کە لەحوشترەکەی دا و کوشتی و دووەمیان ئەو پیاوەیە بە ئێرەتدا ئەکێشێ – واتە بەری سەریدا تاوەکو خوێنەکەی ئەمە تەڕ دەکات – واتە ریشی ) بۆیە پێشەوا علی هەمیشە یەقینی بەوە هەبوو کە وەها شەهید دەکرێ ...

زەیدی کوڕی وەهەب دەڵێت : ( علی هات بۆلای چەند تیرەیەك لە ئەهلی بەصرە لە ( خوارج ) ەکان ، پیاوێکیان لەناو دا بوو بە ( جەعدی کوڕی بەعجە ) ناسرا بوو ، پێ ی وت : ئەی عەلی لە خوا بترسە ، بێ گومان تۆ ئەمریت .

پێشەوا ( علی ) فەرمووی : " بەڵکو دەکوژرێم ، بەلێدانێك لە ئێرەم ( ئاماژەی بۆلا سەری کرد ) ، کە ئێرەم خوێناوی دەکات ( واتە ریشم ) بەڵێنێکە و دراوە و چارەنووسێکە و دیاریکراوە ئەوەش درۆ هەڵبەسێت ، بێ گومان خەسارەو مەندە "[2]

## " کاتی زەماوەند بۆ بەهەشتی نەبراوە "

ئەصبەغی حەنزەلی دەڵێت : ئەو شەوەی ( علی رضي الله عنه ) بووکی گواستەوە ئیبنو التیاح لە دەمەوبەیاندا هات بۆ لای وتی : کە وەختی نوێژە ( بانگ دانە ) پێشەوا علی ڕاکشا بوو قورس بوو گوێ ی پێ نەدا ... دووبارە هاتەوە لای هەروا بوو .. بۆ سێیەم جار هاتەوە لای ، پێشەوا ( علی رضي الله عنه ) هەڵساو ڕۆیشت و بەدەم ڕۆشتنەوە فەرمووی : –

اشدد حيازيمك للموت      فأن الموت لا قيكا

و لا تجزع من الموت      اذا حل بواديكا

ئەوە بو هەر کە گەیشتە دەرگا بچووکەکەی مزگەوت ( ئیبنو ملجەم ) ڕێ ی پێ گرت و لێ ی دا .

وە لە شێخێکی قورەشی یەوە ، دەڵێت : کە ئیبنو ملجەم دای لە ( علی رضي الله عنه ) فەرمووی : ( سەرکەوتم .. بە پەروەردگاری کەعبە قەسەم ) .

[1] – صحيح / احمد و حاكم بە سەنەدێکی ڕاست ریوایەتیان کردوە .

[2] بڕوانە – صفة الصفوة ( ١ / ١٧٤ ) .

وە لە ( محمد )ی کوڕی علی ەوە ، کە لە علی درا ( ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وەسیەتی کرد بۆ کوڕەکانی و دواتر هیچی نەوت جگە لە وشەی ( لا الـه الا الله ) هەتا گیانی سپارد .[1]

ئەو جا هەردوو کوڕەکەی حەسەن و حوسەین لەگەڵ ( عبدالله ی کوڕی جعفر ) شۆردیان و ( حسن رضي الله عنه ) نوێژی لەسەر کرد .

## " گریانی موعاویە ( رضي الله عنه ) لەسەری "

لە ئەبی صالحەوە ، دەڵێت : ضراری کوڕی ضمرە ی کنانی هاتە لای معاویە وە پێی وت : وەسفی ( علی )م بۆ بکە ، ئەویش فەرمووی / ئەکرێ ئەم داوایەم لێ نەکەی ؟ وتی / ناکرێ ، ئەویش فەرمووی / مادەم وایە ناچارم وەسفی (علی رضي الله عنه) بکەم : -

" سوێند بە خوا .. ئەو زۆر دوور بین و بە هێز بوو .. کە قسەی دەکرد بابەتەکەی یەکلا دەکردەوە و بەدادپەروەریش حوکمی دەکرد ، زانست لە هەموو لایەکیەوە هەڵدەقولا و دانایی لە هەموو ڕوویەکیەوە هاتبووە ئاخاوتن . لە ئاست دنیا و خۆشی یەکاندا خۆی بە غەریب دائەناو هاودەم و هۆگری شەو و تاریکی شەو بوو ، ئەو سوێند بە خوا فرمێسکی وەك باران بوو بیری درێژی بوو ، پشتی دەستی هەڵدەگێرایەوە و لەگەڵ خۆی گفتوگۆی ئەکرد .. حەزی لە جل و بەرگێك ئەکرد لەسەر ووی پێیەکانیەوە بێت . وە حەزی بە خۆراکی وشك و ڕەق دەکرد ، سوێند بێ بەخوا ئەو وەك یەکێك لە ئێمە وابوو ، کاتێ ئەهاتینە لای ، لێمان نزیك دەبوویەوە ، کاتێك پرسیارمان لێ بکردایە بە باشترین شێوە وەڵامی ئەداینەوە .

ئێمەش هەر چەندە کە لێوەی نزیك بووین ، بەڵام لەبەر ئەو سام و هەیبەتەی کە هەیبوو قسەمان لەگەڵ نەئەکرد ، خۆ ئەگەر پێ بکەنیایە ئەوە ددانەکانی وەك مرواری ڕێك کراو دەردەکەوتن ..

ئەهلی ئاینی بەگەورە سەیر ئەکرد و هەژارانی خۆش ئەویست و هەرگیز فەرمانبەرداری کەسی بەهێز نەبوو ، ئەگەر لەسەر ناهەق بوایە و هەروەك بێ دەسەڵاتانی لەدادپەروەری خۆی بێ هیوا نە ئەکرد ... شایەتی ئەدەم بە خوا کە هەندێ جار بینیومە

---

[1] - بڕوانە / احیاء علوم الدین ( ٤ / ٤٧٩ ) و بڕوانە البدایە و النهایە ( ٥ / ٤٣٧ ) .

شەو باڵی بەسەر دنیادا کێشاوە و ئەستێرەکانی دەدرەو شانەوە ( علی ﷺ ) لە میحرابەکەیدا دەستی بەریشیەوە گرتبوو وەك مارانگازێك ئۆقرەی نەبوو ، هەروەك خەفەتبارێك ئەگریا ...وەك ئەوەی ئێستا گوێم لێ بێت وایە ، کە دەیوت :

" ئەی پەروەردگارا ، ئەی پەروەردگارا " و لەبەر دەستی پەروەردگاریدا دەلالایەوە و پاشان بە دنیای ئەوت : " چیە ؟ ئەتەوێ فریوم بدەی ؟ چاوت لە منە ؟ هەرگیز و هەرگیز ، برۆ غەیری من فریو بدە ، چونکە من سێ بە سێ تەلاقم داویت ، لەبەر ئەوەی تەمەنت کورتە و جێگات بێ نرخە و مەترسیشت زۆرە ، ئای لە کەمی توێشوو ! ودووریی سەفەر و تەنهایی ڕێ ! "

دەڵێت : لێرەدا فرمێسکەکانی معاویە دەکەوتن بەسەر ڕیشیدا و بۆی ڕاگیر نەئەکرا و بە قۆڵی کراسەکەی دەیسڕی .. خەڵکەکەش دایانە قوڵپەی گریان ، معاویە وتی / ( ئەبولحسن ) بەم جۆرە بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێت .. تۆ چ ناڕەحەتی و ئازارێکت بۆی هەیە ئەی ضرار ؟

وتی : ناڕەحەتی کەسێك تاقانەکەی لە ئامێزیدا سەربڕا بێت و فرمێسکی نەگیرسێتەوە و خەفەت و ئازاری دا نەمرکێتەوە .. پاشان هەڵساو ڕۆیشت .[1]

**خوا حافیزی : -**

پێشەوا ( علی ﷺ ) ، دەفەرموێت: بۆ خەڵکی وەك هەنگ بۆ باڵندە بن ، لەناو باڵندەکاندا نی یە بە بچوك و بێ دەسەلات لە هەنگ نە ڕوانێ و نەیچەوسێنێتەوە خۆ ئەگەر باڵندەکان بیانزانیایە چ بەرەکەتێك لە ناخی هەنگدایە ، ئەوەیان پێ نەئەکرد .

" بە زمان و جەستەتان تێکەڵی خەڵك بکەن ، بەلام کردەوە و دڵەکانتان لەخەڵکی جیابکەنەوە ، چونکە ئەوەی بۆ مرۆۆ دەمێنێتەوە کردەوە کانیەتی ، وە ڕۆژی دوایش لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت "

---

[1] – تەبەرانی / ریوایەتی کردووە البدایە : ( ٥ / ٤٩٥ ) .

## " ٥ – تەڵحەی کوڕی عبیداللە ( رضي الله عنه ) "

## شەهیدێک بە سەرزەویدا دەڕوات

کێ یە ؟

تەڵحەی کوڕی عبیداللە ی قریشی و تەیمی مەککی و باوکی محمد ە ، یەکێکە لەو دە هاوەڵەی مـوژدەی بەهەشتیان پـێ دراوە ، لەسـەر دەسـتی ئەبوبـەکری صـدیق(رضي الله عنه) موسڵمان بووە .. کەسێکی شەنگ وشۆخ و جوان بـووە ، لە ڕۆشتنندا زۆر خێرا بوو [1] وە یەکێ بوو لە هاوەڵە دەوڵەمەندەکان .

### " فەزڵو گەورەیی "

١ – لـە جابرەوە ، تەڵحـە بـەلای پێغەمبـەری خـوادا ( ﷺ ) تێپـەڕی .. پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " شهيد يمشي على وجه الأرض " [2]

٢ – هەر لە جابرەوە ، دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەر ( ﷺ )بووە فەرموویەتی : " مـن سره أن ينظر الى شهيد يمشي على وجه الأرض ، فلينظر الى طلحة بن عبيدالله " [3]

واتـە : کـێ حەز ئـەکات سـەیری شـەهیدێك بکـات کـە بەسـەر زەویـدا ئـەڕوات ، بـا سەیری تەڵحەی کوڕی عبیداللە بکات .

### " بەخشندەیی تەڵحە "

لە سوعدای کچی عەوفی خێزانی تەڵحەوە ، دەڵێت : تەڵحە هات بە ژووردا ، بینیم زۆر خەمبار بوو . پرسیم : چیتە ؟ شتێك بووە ؟

وتی ئەو سەروەت و سامانەی هەیە زۆر بووە ، ئەمەش ئازارم ئەدات ، منیش پێم وت : گوێ ی مەدەرێ ، دابەشی بکە بەسەر خەڵکیدا . ئەویش دەستی کرد بە بەشکردنی تا دوا درهەمی ...

---

[1] - بڕوانە : طبقات ئیبنو سعد ( ٣ / ١ / ١٥٦ ) .

[2] - صەحیحە / صەحیحە سوننەتەکانی ئیبنو ماجە یە ( ١٠٢ ) ، فەرموودەی ژمارە ( ١٢٦ ) .

[3] – صەحیحە / صەحیحە سوننەتەکانی ترمیزی ( ٢٩٤٠ ) .

تەڵحەی کوڕی یەحیا دەڵێت : پرسیارم لە خەزنەداری تەڵحە کرد کە ئەو پارەیە چەند بوو ؟ وتی : چوار سەد هەزار . [1] وە بە هۆی زۆر بەخشندەیی تەڵحەوە بە ( تەڵحەی خەیر ) ناسرا بوو .

## " جیهادی تەڵحە لە پێناوی خوادا "

تەڵحە لە پێناو ئەم ئاینەدا تووشی سەختی و بەڵای زۆر هاتووە و لە هەموو غەزاکاندا بەشداری کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا جگە لە (بەدر) وە زۆر بەسەرکەوتوویی لەوتاقیکردنەوانەدا دەرچووە .

وە لە ڕۆژی ( ئوحود ) دا خاوەنی دەستێکی سپی بوو . ئەوە بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مایەوە و بە دەستی پارێزگاری لێ کرد تاوەکو پەنجەکانی لە ئیش کەوتن ، لەو ڕۆژەدا تەڵحە لە ( ٢٤ ) لاوە بریندار کرا ، وتراویشە کە لە (٧٥) لاوە بریندار بووە لە نێوان لێدان و پێکان و بۆ هاویژتندا .. بۆیە لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ( ﷺ ) ناوی نا بە ( تەڵحەی خەیر ) [2] پێشەوا ئەبوبەکر هەر کە باسی ڕۆژی ئوحود بکرایە ئەیفەرموو : ئەو ڕۆژە هەمووی ڕۆژی تەڵحە بوو " .

وە لە جابرەوە ، دەڵێت : ڕۆژی ئوحود کاتێ خەڵکی پشتیان هەڵکرد و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە لایەکەوە لەگەڵ ( ١٢ ) پیاودا مایەوە کە تەڵحە یەکێکیان بوو ، بێ باوەڕان لێیان هاتنە پێشەوە ، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

" من للقوم ؟ " کێ ڕووبەڕووی ئەوانە دەبێتەوە ؟ تەڵحە فەرمووی : من ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی ( کما انت ) تۆ لە جێی خۆت بمێنە ئەوجا پیاوێك وتی: من، فەرموی : تۆ هەڵسە بۆیان ئەویش لەگەڵیان جەنگا هەتا شەهید بوو، پاشان ... پێغەمبەر ( ﷺ ) ئاوڕی دایەوە دەیبینی بێباوەڕان دەوریان داوە .. فەرمووی :

---

[1] - پیاوانی فەرموودەکە جێ ی متمانەن ، هەیثەمی لە الجمع ( ٩ / ١٤٨ ) باسی کردووە و دەڵێت : تەبەرانی ریوایەتی کردووە .. پیاوانی فەرموودەکە جێ ی متمانەن .

[2] - بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ١٧٦ ) فەرموودەکە لاوازە . ڕای پەسەند ئەوەیە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ( جوامێر) ناوی لێ ناوە، هەیثەمی دەڵێت / تەبەرانی ریوایەتی کردووە ، ئیسنادەکەیشی باشە ، الجمع ( ١٤٨٠٣ )

" من للقوم ؟ " تەڵحە فەرمووی : من فەرمووی ( ﷺ ) : - تۆ لە جیێ ی خۆت بمێنە .. پیاوێك لە ئەنصار وتی : من ، فەرمووی ( تۆ هەڵسە ) ، پیاوەکە جەنگا هەتا شەهید بوو ... کارەکە بەردەوام بوو تاوەکو بە تەنها تەڵحە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا مایەوە .

فەرمووی : " من للقوم ؟ " تەڵحە فەرمووی :

من ئەوە بو تەڵحە بە توانای هەر یانزە پیاوەکە شەڕی کرد تاوەکو پەنجەکانی قرتا و فەرمووی : پەنجەکانم قرتان ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " لوقلت : بسم الله لرفعتك الملائكة ، والناس ينظرون " واتە: گەر بتوتایە بەناوی خوا ، فریشتەکان بەرزیان ئەکردیتەوە بە بەرچاوی ئەو خەڵکەوە . دواتر خوای پەروەردگار بێ باوەڕانی ڕەت کردەوە .[1]

ئەو ڕۆژەپێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " أوجب طلحة " . تەڵحە بەهەشتی واجب کرد .. لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوو قەڵغان پێوە بوو بوو ویستی هەڵسێتەوە تاوەکو بچێتە سەر بەردێك کە لەوناوەدا بوو ، نەیتوانی ، تەڵحە خۆی بۆ دانەواند ، ئەویش چوە سەر پشتی تا هەڵسایەوە ، ئەو جا فەرمووی " أوجب طلحة"[2]

## " شەهید بوونی تەڵحە "

لەگەڵ ئەوەداکە تەڵحە ( ﷺ ) لە جەنگی ئوحود دا شەهید نەبوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵی دا بە شەهید بوونی کە ئیتر هەواڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قسەی تیا نیە .

لە ( تەڵحە )وە ، دەڵێت : هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دەشتەکی یەکی نەخوێندەواریان وت : دەربارەی ئەو کەسەی شەهید دەبێ پرسیاری لێ بکە بزانە کێ بوو ؟ ئەوان خۆیان نەیاندەوێرا ئەو پرسیارەی لێ بکەن .. شەرمیان لێ دەهات و سامیان لێ دەکرد لەبەرهەیبەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) . ئەوە بوو دەشتەکی یەکە پرسی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پشتی هەڵکرد . دیسان پرسی یەوە . دیسان پشتی هەڵکردەوە ، ئەمجارەیش

[1] -راویەکانی جێ متمانەن : نەسائی ریوایەتی کردووە ، زەهەبی دەڵێت : راویەکانی جێگەی متمانەن ، بڕوانە ( سیر ) ( ١ / ٢٧١ ) .

[2] بڕوانە : البدایە ( ٥ / ٣٤٤ ) .

پرسی یەوە و دووبارە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پشتی هەڵکرد . ئەو جا من لە دەرگای مزگەوتەکەوە ڕوانیم و بەرگێکی سەوزم لە بەردا بوو ، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ ) منی بینی فەرمووی : " أين السائل عمن قضى نحبه ؟ " واتە : کوا ئەو کەسەی پرسیارلی لە شەهیدەکە ئەکرد ؟ دەشتەکی یەکە وتی من بووم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : " هذا ممن قضى نحبه " واتە : ئەمەیەکێ بوو لە شەهیدەکان .[1]

ڕۆژان تێپەرین و تەڵحە هەر بە دەوری پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بوو ، لە هەموو هەڵوێستەکاندا و کاتێکیش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد لە تەڵحە ڕازی بوو .

ئەو کاتەی مەسەلەکەی پێشەوا ( عوسمان ) ( ﷺ ) هاتە پێشەوە ، تەڵحە کەنارگیری کرد ، ئەوە بوو هەندێ کەس ئەمەیان گێڕایەوە بۆ ئەوەی شتێکی لە دڵدا هەڵگرتبێ ، لەبەر ئەوە لەڕۆژی ( الجمل )[2] دا ئامادە بوو وە علی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ ) لەگەڵی کۆ بوویەوە و ئامۆژگاری کرد . ئەویش چووە دواوە و لە ناو یەکێ لە ڕیزەکاندا وەستا ، لەوێدا تیرێکی نادیاری[3] لێ دراو بەر ئەژنۆی کەوت ، وە دەشوترێ کە بەرملی کەوتووە ، لەوێدا وەفاتی کرد ( ﷺ ) . زەهەبی دەڵێت : بکوژی تەڵحە لە تاوان و گوناهیدا وەك بکوژی ( علی ﷺ ) وایە .[4]

## " سۆزی علی بۆ تەڵحە "

لە تەڵحەی کوڕی مەترەفەوە : عەلی ( ﷺ ) هاتە لای ( تەڵحە ) ، ئەو کاتەی تەڵحە گیانی سپارد بوو . لەسەر وڵاخەکەی دابەزی و تۆزی سەردەم و چاو و ڕیشی تەکاند بە جۆرێك ڕەحمی بۆی دەچوو ، فەرمووی " خۆزگە بیست ساڵ پێش ئەم ڕۆژە بمردمایە".[5]

وە لە قەیسی کوڕی عەبادەوە ، دەڵێت : " گوێم لە ( علی ) بوو ( ﷺ ) ڕۆژی ( الجمل ) بە ( حسن )ی کوڕی فەرموو : " ئەی حەسەن ، حەزم ئەکرد بیست ساڵ پێش ئێستا بمردمایە " . وە لە ( علی ) یەوە ( ﷺ ) فەرمووی : " مژدەی ئاگر بە بکوژی تەڵحە بدەن . ( سير اعلام النبلاء) ، ( ١ / ٣٧ ).

---

[1] - فەرموودە ( حسن )ی ( صحيح )ە / صەحیحی سونەنەکانی تیرمیزی ( ٢٩٤٢ ) .

[2] - ڕووداوی ( الجمل ) لە نێوان ( علی ) لە لایەك و عائیشە و تەڵحە و زبێر لەلایەکی دیکەوە " ڕەزای خوا لە هەموویان بێت " وە هۆکەشی ئەو پیلانانە بوو کە دژی دەوڵەتی ئیسلامی دەکرا بڕوانە ( العواصم من القواصم ).

[3] - واتە نازانرێ تیرهاوێژەکەی کێ بوو .

[4] - اسنادەکەی ( حسن )ە . هەیثەمی دەڵێت : تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە . ئیسنادەکەی ( حسن )ە . الجمع (٩ / ١٥٠ )

[5] - سەنەدەکەی ( باشە ) ، تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە ، پیاوانی فەرموودەکە جێ ی متمانەن هەیثەمیش وا دەڵێت : الجمع ( ٩ / ١٥٠ ) .

## " ٦ – زوبێری كوڕی عەووام( رضي الله عنه ) "

## " یەكەمین كەسێك كە شمشێرەكەی لە پێناوی خوادا لە كالان دەكرد"

**كێ یە ؟**

**زوبێری كوڕی عەووامی كوڕی خوەیلیدە ، ( حواری )[1] ی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و كوڕە پوری بووە كە خاتوو ( صفیەی كچی عبدالمطلب )ە و یەكێكە لەو دە هاوەڵەی كە موژدەی بەهەشتی پێ دراوە ، و یەكەمین كەسێك لە پێناو خوادا شمشێرەكەی لە كالانی دەرهێنا [2] .**

**باوكی ( عبدالله ی كوڕی زوبێر )ە ( رضي الله عنه ) لەسەر دەستی ( صدیق رضي الله عنه ) موسڵمان بووە و ئیسلام بوونیشی دوای ئیسلام بوونی ئەبوبەكر و ، واتە چوارەم یان پێنجەم كەسە موسڵمان بوو . كەسێكی زۆر بەخشندە و خێرۆمەند بوو.**

### " فەزڵی زوبێر"

**١– لە زوبێرەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی گرتم و فەرمووی :** " لكـل نـبي حواري ، حورايّ الزبير و ابن عمتي " [3] .

**واتە : هەر پێغەمبەرێك ( حواری ) یەكی هەیە ( حواری ) منیش زوبێرە كە كوڕی پوریشمە .**

**٢– لە عورووەوە ، كە عائیشە ( رضي الله عنها ) پێ ی فەرموو : ئەی خوشكە زا ، باوكت (واتە زوبێر) و ئەبوبەكر لەوانە بوون كە خوای پەروەردگار دەربارە یان فەرموویەتی :** ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ ...﴾ سورة ال عمران ، آية ( ١٧٢ )*

---

[1] – حواری : سەرخەو پاڵپشت ،و تراویشە : پوخت و بێ گەرد لە هەموو شتێك و لەوەشەوە هاوەڵانی ( عیسی ) سەلامی خوای لەسەر بێ بە ( حواریون ) ناو براون .

[2] – پیاوانی جێ متمانەن : تەبەرانی ریوایەتی كردووە بە مەوقوف لەسەر ( عروەی كوڕی زبێر ) ، بڕوانە الجمع ( ١٤٨٣٠ ) .

[3] – صحیح : حاكم ریوایەتی كردووە ، دەڵێت : صەحیحە ، زەهەبیش ئەم رایەی هەیە . شێخ شوعەیب ئەرنە ئوت دەڵێت هەر بەو جۆرە یەكە ئەو دووانە وتیان ، سیر ( ١ / ٤٨ ) .

واتە : ئەوانەی کە بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) چوون ، دوای ئەوەی کە تووشی ناخۆشی و زام و ئێش بوون ...

## " خۆ گری زوبێر لەسەر ئازاردانی لە پێناوی خوادا "

لە یەتیمی عوروەوە ، دەڵێت : زوبێر کاتێ هیجرەتی کرد هەژدە ساڵان بوو مامی ئەیبەستەوە و حگەرەی لەسەر ئەکێشا ، ئەویش ئەیوت " هەرگیز ناگەڕێمەوە سەر کوفر"[1]

وە لە عوروەوە ، دەڵێت : زوبێر بە ( ٨ ) ساڵی موسڵمان بوو ، فریشکێك (نفحة) لە شەیتانەوە هات کە گوایە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەسەر مەککەوە فڕێنراوە ، ئەوە بوو زوبێر کە نەوجەوانێکی ( ١٢ ) ساڵان بوو. ئەو کاتە ، بە خۆی و شمشێرەکەیەوە هاتە دەرەوە و هەر کەس ئەیبینی سەری سوڕدەما و ئەیوت ئەم نەوجەوانە شمشێری پێ یە ، تا گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێ ی فەرموو : " مالك یا زبیر " چیتە زوبێر ؟ ئەویش هەواڵی پێ دا و وتی :

" هاتووم بە شمشێرەکەم بدەم لەوەی کە تۆی ڕفاندوە !!

پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) دوعای بۆ خۆی و شمشێرەکەی کرد .[2]

نووسەر دەڵێت : ئەی ئێستا کێ هەیە داکۆکی لە ئیسلام بکات ئەی پیاو نیە ؟ لە کاتێکدا حورمەتی ئاین پێشێل ئەکرێ و بێ شەرمی بەرامبەر پیرۆزی لەکانی دەکرێت ، کوان گەنجەکانمان لەم ڕۆژەدا ؟ کوا غیرەت و پیاوەتیمان لە کاتێکدا هەرچی هێزی سەر زەوی هەیە کۆ بوونەتەوە بۆ نەهێشتنی شوێنەوارەکانی ئەم دینە و سەر شۆڕکردنی ئەهلەکەی ؟

وە لە هیشامی کوڕی عوروە وە ، دەڵێت : زوبێر سەر لەبەیانی ڕۆژی ( الجمل ) وەسیەتی کرد بۆ ( عبداللە )ی کوڕی و فەرمووی : " هیچ ئەندامێکی نی یە لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بیرندار نەبوبێ هەتا عەورەتیشی .[1]

---

* صحیح: صحیح ی سوننەتەکانی نسنو ماجه (١٠١).

[1] - پیاوانی جێ متمانەن : هەیثەمی دەڵێت : تەبەرانی لە( الكبیر ) دا ڕیوایەتی کردووە ، بەڵام دەڵێت : (مرسل)ە . الجمع ( ٩ / ١٥٢ ) .

[2] - پیاوانی جێ متمانەن ئەحمەد و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کرووە ، ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن، سیر ( ١ / ٤٢ ) .

## " خەباتی زوبێر لە ڕۆژی بەدر "

ڕۆژی بەدر دوو ئەسپ سوار لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا بوون ( ﷺ ) ، زوبێر لەسەر ئەسپێك لەلای ڕاستی یەوە و ( میقدادی کوڕی ئەسوەد )یش لەسەر ئەسپێك لەلای چەپیەوە .

لە هیشامی کوڕی عورەوە وە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : زوبێر ڕۆژی بەدر مێزەرەیەکی زەردی بەسەرەوە بوو ، ئەوە بوو جبرەئیل سەلامی خوای لێ بێ لە سیمای زوبێردا هاتە خوارەوە .[٢]

## " جیهادی زوبێر هەر لە ڕۆژی بەدرا "

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ( ﷺ ) دەفەرموێت : ئازاترین پیاو زوبێرە و کەسیش قەدری پیاو نازانێت پیاو نەبێت ..

لە زوبێرەوە دەڵێت :

ڕۆژی بەدر بە ( عوبەیدەی کوڕی عاص ) گەیشتم کە ئەو هەموو گیانی پرچەك بوو تەنها چاوەکانی دەبینران ، نازناوی ( اباذات الكرش )[٣] بوو . منیش نوکی ڕمەکەم بۆی هەڵگرت و کردم بە چاویدا تا مرد ، وە فەرمووی : قاچم خستە سەری و بە زەحمەت سەرە ڕەمەکەم کێشایەوە دەرەوە ، لە ڕاستیدا سەرەکەی نوشتا بووەوە .[٤]

عوروە دەڵێت :

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە زوبێریان وت : خۆت نابەستیتەوە (ئامادە ناکەیت ) تا ئێمەش لەگەڵ تۆدا خۆمان توندکەینەوە ؟ فەرمووی : ئاخر ئەگەر من خۆم ببەستمەوە ئێوە قسەکەتان نابەنەسەر .

وتیان : درۆ ناکەین .

ئەویش خۆی توندکردەوە و بە ناویاندا ڕۆیی تا ڕیزەکانیانی بڕی وئەوە بوو لێیان تێپەڕی و هیچ کەسیش لەگەڵ نەبوو ، پاشان گەڕایەوە ، ئەوانیش لە غاوەکەی یان گرت

---

[١] - اسنادەکەی ( صحیح ) ە / صەحیحی ( ٢٩٤٥ ) .

[٢] - ئیسنادەکەی ( صحیح )ە / ( مرسل )ە ، تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە . المجمع ( ٦ / ٨٤ ) .

[٣] - گوشتن : یاخود مژن و دەم و چاو دراو بەیەکدا .

[٤] - صحیح : بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

و دووردانەیان لە شانی دا ، لە نێوان ئەو دوو لێدانەدا لێدانێکی دیکە هەبوو کە لەڕۆژی بەدرا تووشی هاتبوو .

عوروە دەڵێت : کاتێ منداڵ بووم پەنجەم ئەخستە سەر شوێنی ئەو لێدانانە و یاریم ئەکرد .[1]

## " جیهادی زوبێر ڕۆژی یەرموك "

ئیبنو کەثیر دەڵێت : لەوانەی کە بەشدار بوون لە ڕۆژی یەرموکدا ( زوبێری کوڕی عەوام ) بو ، لە هەموو ئەو هاوەڵانەی کە لەوێ بوون باشتر بوو ، یەکێ بوو لە ئەسپ سواران و پیاوە بە جەرگەکان ، ئەوە بوو کۆمەڵێك لە پیاوانی پاڵەوان و بەجەرگ ئەو ڕۆژە لەلای کۆبوونەوە و پێیان وت : ئایا خۆت ئامادە ناکەیت تا ئێمەش خۆمان ئامادە کەین ؟ فەرمووی: ئەترسم ئێوە خۆگرنەبن.

وتیان : بۆنا ، ئەوە بوو خۆیان ئامادەکرد ، کاتێ ڕوبەڕووی ڕیزەکانی ڕۆم بوونەوە دەستیان کێشایەوە، بەڵام ئەو هەربەرە و پێشەوە هات تا ڕیزەکانی ڕۆمی بری و لەلایەکی ترەوە سەری کێشایە دەرەوە و گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی ، پاشان جارێکی تر هاتنەوە بۆ لای ، هەروەك یەکەمجاری کرد و لەو ڕۆژەوە لە دوولاوە لە نێو شانەکانیدا بریندار بوو .

هەر ئیبنو کەثیر لە جێگایەکی تردا دەڵێت : " وە زوبێریش لەگەڵ خەڵکیدا بەرەو شام بەڕێ کەوتن بۆ جیهاد و لەوێ بەشداری یەرموکی کرد ، ئەوە بوو بە ئامادە بوونی ئەو موسڵمانان شەرەفمەند بوون وە دەستێکی باڵاو هیمەتێکی بەرزی لەو ڕۆژەدا نواند ، دوجار ڕیزەکانی سوپای ڕۆمی بڕی لە یەکەمیانەوە تا ئەخیریان ( دواهەمینیان ).

## " جیهادی زوبێر لە جەنگی حونەین دا "

ڕۆژی حونەین زوبێر دای لە بێباوەڕان تا لە جێگای خۆیان دەریپەڕاندن ، سەرکردەی بێ باوەڕان چاودێری ڕێ و شوێنی شەڕەکەی ئەکرد ، یەکێ لە هاوڕێکانی پێ ی ڕاگەیاندن کەوا ئەسپ سوارێك ئەبینن ڕمەکەی بەسەر شانیەوەیەتی و سەری بە مێزەرێکی سوور پێچاوە .

---

[1] - سیرا اعلام النبلاء ( ١ / ٦٢ ، ٦٣ ) .

وتی : ئەوە زوبێری کوڕی عەووامە ، سوێند بێ بەلات و عوززا ئەزانم کە تێکەڵتان ئەبێت ، ئێوەش وریابن و خۆتانی بۆ ئامادە بکەن ، ئەوە بوو کاتێ زوبێر گەیشتە ئەو شوێنەی بێباوەڕانی لێ بوو دیتنی ، ئەوجا بەرەو ڕوویان ڕۆیشت و بەردەوام لێ ی دەدان تا دەریپەڕاندن .

کاتێکیش(عەمری کوڕی عاص) بەرەو( میصر ) ڕۆشت بۆ ڕزگار کردنی ، هێزێکی (٣٥٠٠) کەسی لەگەڵدا بوو ، بۆیە نامەیەکی نارد بۆ پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) تیایدا داوای یارمەتی هێزی تری لێ دەکرد . عومەریش ( ﷺ ) لە خەمی کەمی ژمارەی هێزەکەی عەمر دا بوو ، بۆیە زوبێری لەگەڵ ( ١٢ ) هەزار جەنگاوەردا نارد . وتراویشە کە ( عمر ) چوار هەزار پیاوی ناردووە بەسەرکردایەتی چەند هاوەڵێك لە پاڵەوانان و لەوانە : زوبێر و مقدادی کوڕی ئەسوەد و عەبادەی کوڕی صامت و مەسلەمەی کوڕی موخەلەد و...

کۆمەڵی تر دەڵێت : خارجەی کوڕی حوزافە چوارەمیان بووە . ئینجا عومەر (ﷺ) ئەمەی بۆ عەمر نووسیوە : " ئەوە من بە چوار هەزار پیاو هاوکاریت ئەکەم ، لە بری هەزار کەس پیاوێکم داناوە بەرانبەر هەزار پیاو ، ئەوە بوو ( زوبێر) ئەمیری هەموویان بوو . [1]

کاتێ زوبێر گەیشتە لای عەمر بینی ئابلۆقەی قەڵای ( بابلیون )ی داوە . زۆری پێ نەچوو زوبێر چووە سەر ئەسپەکەی و بەدەوری ئەو کەندرەدا ( خەندەق ) کە بەدەوری قەڵاکەدا هەڵکەنرا بوو سوڕایەوە ، پاشان سوپاکەی دابەشکرد بە دەوری خەندەقەکەدا...

ئابلۆقەدانەکە درێژەی کێشا بۆ ( ٧ ) مانگ .. ئینجا بە زوبێر وترا لەناو قەڵاکەدا تاعوون بڵاو بۆتەوە . ئەویش فەرمووی : " ئێمە هاتووین بۆ لێدان و بۆ تاعونیش " .

ئەوە بوو ڕزگاری عەمری کوڕی عاص دواکەوت ، بۆیە زوبێر وتی : "

من خۆم بەخش ئەکەم بۆ خوا ، بەڵکو بەم کارەم خوا ڕزگاری بێنێت بۆ موسڵمانان . "

هەڵسا پلەکانەیەکی هێنا و لە ڕووی (سوق الحمام ) ەوە پاڵی دا بەلایەکی قەڵاکەوە و بەسەریدا سەرکەوت و فەرمانی پێ کردن کە هەر گوێیان لە ( تکبیر ) کردنی بوو هەموویان وەڵامی بدەنەوە .. هێندەی نەبرد هەستیان کرد زوبێر بەسەر قەڵاکەوە (تکبیر) دەکات و شمشێرەکەی بەدەستەوەیە ، ئەوە بوو خەڵکەکە هەموو بەسەر پلەکانەکەوە سەرکەوتن ، تاوەکو عەمر ڕێگەی لێ گرتن لە ترسی ئەوەی پەیژەکە بشکێ .

[1] - سەرکردەکانی فەتحی میصر و شام ( ص ٢٠٨ ، ٢٢٧ ) ، صلاح الامە ( ٣ / ٣٢٢ ، ٣٢٣ ) .

ئەوە بوو کاتێ ڕۆمەکان بینییان وا موسڵمانەکان زەفەریان بەقەڵاکە بردووە پاشەکشەیان کرد ، بەوەش دەروازەکانی قەڵای بابلیون بەڕووی موسڵماناندا کرایەوە و بەفەتح کردنیشی ئەو جەنگەی بۆ ڕزگاری میصر کرا بوو یەکلایی کرایەوە .

لە ڕاستیدا ئەو پاڵەوانێتی و بە جەرگی یە دەگمەنەی زوبێر هۆی ڕاستەوخۆی سەرکەوتنی موسڵمانان بوو بەسەر ( مقوقس )دا .. [1]

## " خەباتی زوبێر ڕۆژی ئوحود "

لە عائیشەی دایکی ئیمانداارانەوە ، دەڵێت : کاتێ بێ باوەڕان ئوحودیان بە جێ هێشت و ئەوەی بەسەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هاوەڵانیدا هات ، هات و پێغەمبەر(ﷺ) ترسالەوەی بێ باوەڕان بگەڕێنەوە ، بۆیە فەرمووی " من ينتدب لهؤلاء في آثارهم ، حتى فيعلموا أن بنا قوة ؟ " واتە :" کێ دوای موشریکاندا دەچێ تا بزانن هێشتا خاوەنی هێزو بازوین؟ " ئەبو بەکر و زوبێری لەگەڵ حەفتا جەنگاوەر دا هەڵبژارد ئەوانیش دوای بێ باوەڕان کەوتن .. بێ باوەڕان ئەمەیان بیست بۆیە ڕۆشتن نەگەڕانەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ ﴾ سورة آل عمران آية،(١٧٤) .

واتە : ئەوسا ئیتر موسڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و ناز و نیعمەتی خوایی دا ، هیچ ناخۆشی یەکیشیان بۆ پێش نەهات . بەو جۆرە بە هیچ کەس لە دوژمنانیان نەگەیشتن . [2]

## " ڕۆژی خەندەق "

لە عورەوە وە ، کوڕی زوبێر [3]( ؓ ) پێ ی وتووە : بابەگیان چاوم لێت بوو ڕۆژی خەندەق بەسەر ئەسپە زەردە کەتەوە شاڵاوت دەبرد .

فەرمووی : منت بینی کوڕم ؟ وتی : بەڵێ ، فەرمووی : دەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ڕۆژە دایك و باوکی بۆ باوکت کۆ دەکاتەوە و دەفەرموێت : " ارم فداك ئەبو و أمي " .

---

[1] - سەرکردەکانی فەتحی میصر و شام ( ص ٢٠٨ ، ٢٢٧ ) ، صلاح الامه ( ٣ ، ٣٢٢ ، ٣٢٣ ) .

[2] - صەحیح : بەشی یەکەمی بوخاری ڕێوایەتی کردووە ، وە موسلیم و ئیبنو ماجە و غەیری ئەویش ریوایەتیان کردووە .

[3] - مەبەست عبداللە ی کوڕی زوبێرە ( ؓ ) ، چونکە ( عوروە ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ی نەبینیوە .

[1] واتە : بیهاوێژە دایكم و باوكم بە فیدات بن ... وە لە هەردوو صەحیحەكەدا هاتووە ، لە زوبێرەوە ، فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی ( قریظە ) دایك و باوكی بۆم كۆكردەوە و فەرمووی : " بئەبو و امی " دایك و باوكم بە قوربانت بن .. ، ( ٢٩٤٣ ) .
نووسەر دەڵێت : ئەمەش وتەی ئەوا نەڕەت دەكاتەوە كە ئەڵێن تەنها سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصی بەمە تایبەت كردووە .

" بەخشندەیی زوبێر "

ئەبو نەعیم لە ( الحلیة ) ، ( ١ / ٩٠ ) دا گێڕاویەتیەوە لە سەعیدی كوڕی عبدالعزیزەوە دەڵێت : زوبێری كوڕی عەوام هەزار كۆیلە ( مملوك )ی هەبوو كە ( خەراج ) یان پێ دەدا ، ئەویش هەموو شەوێك دابەشی ئەكرد و بە دەستی خاڵی ئەچووە ماڵەكەی . وە ئیبن عویینە دەڵێت : سامانی زوبێر دابەش ئەكرا بەسەر " چل هەزار هەژاردا . [2]
نووسەر دەڵێت : ئەمەش وەڵامدانەوەیەكە بۆ ئەوانەی ئەڵێن كە گوایە ئیسلام شوێنكەوتوانی بە هەژاری ڕادەسپێرێ تاوەكو ئومەتی ئیسلام بە سواڵكەری بمێنێتەوە ، جارێ ڕوو لە ڕۆژ هەڵات و جارێ لە ڕۆژئاوا دەكات .

" شەهید بوونی زوبێر ( رضي الله عنه ) "

ڕۆژی ( الجمل ) زوبێر لەگەڵ تەڵحە و عائیشە دا بوو ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) ، بەڵام كاتێ عەلی كوڕی ئەبی تالیب ( رضي الله عنه ) فەرموودەكەی پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) بیر خستەوە.. ڕۆیشت و ئەوێی بە جێ هێشت .
لە ئەبی حەربی كوڕی ئەسوەدی دوئلیەوە یەوە ، دەڵێت :
زوبێرم بینی بۆ شەڕ كردن لەگەڵ ( علی ) چووە دەرەوە ، ( علی )یش ( رضي الله عنه ) پێی فەرموو : سوێندت ئەدەم بە خوا ، گوێت لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەبووە كە

---

[1] - پیاوانی فەرموودەكە جێ ی متمانەن ، ئەحمەد لە ( ١ / ١٦٤ ) و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان كردووە ، ئەرنئوط دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن . سیر ( ١ / ٥٠ ) .
[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن : حاكم ڕیوایەتی كردووە ( ٣ / ٣٦١ ) هەروەها غەیری ئەویش . ارنووط دەڵێت : پیاوانی جێ ی متمانەن ، بڕوانە : سیر ( ١ / ٦٥ ) .

دەیفەرموو : " ئەتەوێ لەگەڵی بەشەڕ بێیت لە کاتێکدا کە بەو شەڕ کردنە ستەمی لێ ئەکەیت ؟ " ئەویش فەرمووی : لەبیرمە و ، پاشان ڕۆشت و ئەوێی بە جێ هێشت ... [1]

ئەوە بوو کە زوبێر ( ﷺ ) ڕۆیشت و نەیویست شەڕ بکات .. لەڕێدا (عبدالله)ی کوڕی پێ گەیشت پێ وت: دەترسیت .. دەترسیت، ئەویش فەرمووی : " خەڵك ئەزانن کە من ترسنۆك نیم ، بەڵام ( علی ) شتێکی وەبیر هێنام کە لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )م بیستبوو ، لەبەر ئەوە سوێندم خوارد کە شەڕی لەگەڵ نەکەم ، پاشان فەرمووی :

ترك الأمور التي اخشى عواقبها　　　في الله أحسن في الدنيا و في الدين

واتە : واز هێنان لە پێناوی خوادا لە کارێك کە لە دەرئەنجامەکەی ئەترسم ، باشترە بۆ دین وبۆ دنیاش ...

لەوێ ( ئیبن جرموز ) لێی دا و کوشتی ...

ئەم هاوەڵە بەڕێزە لە دۆڵی ( السباع ) کفن و دفن کرا وبە وەفاتیشی پێشەوا (علی) و هاوەڵانی گریاند ...

( زەر ) دەڵێت : بکوژی زوبێر داوای مۆڵەتی لە پێشەوا ( علی ) کرد ، ئەویش فەرمووی : سوێند بێ بەخوا بکوژی کوڕی صەفیە ( واتە زوبێر ) جێگای لە ئاگردایە ، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو ، دەیفەرموو : " هەر پێغەمبەرێك حەواری یەکی هەیە ، حەورای من زوبێرە ." [2]

---

[1] - حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٣٦٦ ) ، دەڵێت / ئیسنادەکەی صحیحە . ذەهەبیش لەسەر ئەم ڕایەیە .

[2] - اسنادەکەی ( حسن )ە : حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٣٦٧ ) ، و دەڵێت : صحیحە زەهەبیش هەمان ڕای هەیە . ارنووط دەڵێت : اسنادەکەی ٠ حسن ) ە . بڕوانە ( سیر ) ( ١ / ٦١ ) .

## " ٧ – ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ( رضي الله عنه ) "

## ( سەر ڕاستی ئەم ئوممەتە )

عوبەیدەی کوڕی جەڕراحی قورەیشی فیهری مەککی یە . یەکێکە لە پێشەنگەکان لە ئیسلام بووندا و ئەو کەسەشە کە ( صدیق ) بڕیاریدا بوو جێنشینی پێ بسپێرێت و لە ڕۆژی ( سقیفە )شدا ڕاوێژی پێ کردووە بە هۆی کامڵی و ئەهلیەتی لەلای ئەبوبەکر( رضي الله عنه ).

لەگەڵ ( عوسمانی کوڕ مظعون ) موسڵمان بووە و لە هەموو غوزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) بەشداری کردووە و لە ڕۆژی ئوحودیشدا بە خۆگری جێگیری مایەوە .

### " فوزڵ و گەورەییەکانی "

١- لە حوزەیفەوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ئەهلی نەجرانی فەرموە : " سأبعث معکم رجلا أمینا ، حق آمین " . واتە / پیاوێکی سەرڕاستتان لەگەڵدا ئەنێرم کە بەهەق سەر ڕاستە

دەڵێت / ئیدی خەڵکەکە پێ ی شەرەفمەند بوون ، ئەوەبوو ( ابوعبیدە کوڕی جراح )ی لەگەڵ ناردن .[1]

٢- لە ( عبدالله ) وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ئەبو عبیدەی کوڕی جراحی فەرمووە : " هذا آمین هذه الأمة " .[2] واتە : ئەم پیاوە سەر ڕاست و ئەمینی ئەم نەتەوەیە.

٣- لە ئەبو هریرە وە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " نعم الرجل ابوبکر ، نعم الرجل عمر ، نعم الرجل أبو عبیدة بن الجراح " .[3] واتە : باشترین پیاو ئەبوبەکرە ، باشترین پیاو عومەرە ، باشترین پیاو ئەبوو عبیدەی کوڕی جەڕاحە .

---

[1] - بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە . صەحیحە .

[2] - صەحیحە : مسلم ڕیوایەتی کردووە ، بڕوانە : صحیحی سوننەتەکانی ئیبنو ماجە ( ١١٣ ) .

[3] - صحیحی ( ٢٩٥٩ ) . فەرموودەی ( ٢ / ٩٦٢ ) .

٤- کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، پێشەوا ئەبوبەکر ( رضي الله عنه ) لەسەر سەکۆی ( بني ساعدە ) وەفەرمووی : یەکێ لەم دوو پیاوەم پێ باشە بۆ پێشڕەویتان و لە سەریان ڕەزامەندم : عمر و أبوعبیدە .[1]

٥- لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : عومەری کوڕی خەتاب بە هاوەڵانی فەرمووە : ئاواتتان چی یە ؟ یەکێکیان وتی : ئاواتی من ئەوەیە پڕی ئەمماڵە سامان و درهەمم هەبێ و ببیەخشم لە پێناوی خوادا .

ئینجا فەرمووی : ئاواتتان چی یە ؟ یەکێ تریان وتی : من ئاواتی ئەوە ئەخوازم کە بەپڕی ئەم ماڵە زێڕ و ئاڵتونم هە بێ و لە پێناوی خوادا ببیەخشم .

دیسان فەرمووی : ئاواتتان چی یە ؟ یەکێکی تر وتی : من ئاواتم ئەوەیە ئەم ماڵە پڕ بێ لەگەوهەر یان هاوشێوەی گەوهەر و ببیەخشم لە پێناوی خوادا . ئینجا عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی : ئاوات بخوازن ... وتیان : جگە لەمە ئاواتی ترمان نیە .

ئەوجا پێشەوا ( رضي الله عنه ) فەرمووی ، بەلاَم من ئاواتم ئەوەیە پڕی ئەم ماڵە پیاوی وەك ئەبو عبیدەی کوڕی جراح و موعازی کوڕی جبل و حوزەیفەی کوڕ یەمان بێ و لە فەرمانبەرداری خوادا بەکاریان بێنم .

زەید دەڵێت : پاشان عومەر ( رضي الله عنه ) بڕێك پارەی نارد بۆ ( حزیفە ) و وتی بزانە چی لێ ئەکات بینی دابەشی کرد بەسەر هەژاراندا . پاشان بڕێك پارەی نارد بۆ ( معاذی کوڕی جبل ) ئەویش دابەشی کرد بەسەر هەژاراندا .. ئینجا بڕێکیش پارەی نارد بۆ ( أبو عبیدە ) و وتی : بزانە چی لێ دەکات .. ئەویش هەروەك دووهاوەڵەکەی پێشووی : پێشەوا (عمر رضي الله عنه) فەرمووی خۆ پێم وتن : هەروا دەرچوون کە گومانم پێ دەبردن .[2]

٦- لە تەمیمی کوڕی سەلەمەوە ، دەڵێت : عومەر بە ئەبوعبیدە گەیشت تەوقەی لەگەڵ کردو دەستی ماچ کردو هەر دووکیان بەدەم گریانەوە یەکیان بە جێ هێشت .[3]

---

[1] - بڕوانە : سیر أعلام النبلاء ( ١ / ٨ ) .

[2] - پیاوانی جێ متمانەن ، جگە لە ئەبی صەخر ، ئەویش حمیدی کوڕی زیادی خراطە ، ئەویش کەسێکی مەقبوڵە ن بڕوانە : سیر ( ١ / ١٤ ) ڕاوێژ .

[3] - پیاوانی جێ متمانەن ، بەلاَم پچڕ پچڕ هاتووە . سیر ( ١ / ١٥ ) .

## " چەند لاپەڕەیەکی ڕووناك لە جیهادی ئەبو عبیدە "

### " ڕۆژی بەدر "

باوەڕی ئەبو عبیدە لە جەنگی بەدر دا زۆر بە جوانی دەرکەوت و نموونەیەکی قەشەنگمان لە ڕاستگۆیی ڕوو لە خوا کردن و پشت بەستنی تەواو بە پەروەردگار پیشان دەدات . ئەوەتە لە ( عبدالله ی کوڕی شەو زەبەوە ) ، دەڵێت : " لە ڕۆژی بەدرا باوکی ئەبو عبیدەی کوڕی جەراح ( کە عامری کوڕی جراح )ە ، بەردەوام بە دوای ئەبوعبیدە دەگەڕا و دەیویست ڕووبەڕووی بێتەوە ، بەڵام ئەبو عبیدە هەر خۆی لێ لادەدا تا ئەوە بوو ، ئەبو عبیدە زانی کە باوکی هەر بەردەوامە لە ڕووبەڕووی بوونەوەی ، کوشتی .

خوای پەروەردگاریش لەوکاتەی کە ئەبو عبیدە باوکی کوشت ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاندە خوارەوە : ﴿ لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ ﴾ سورة المجادلة ، آية ( ٢٢ ) .

واتە : کەسانێك دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بەخوا و بەڕۆژی دوایی ، لە کاتێکدا کەسانێکیان خۆشبوێن کە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردبێت ، ئەگەر چی ئەو دوژمنانە باو و باپیریان بن .

شێخ محمد غزالی دەڵێت : لەم جەنگەدا ، واتە لە جەنگی بەدر دا باوکەکان بە کوڕەکانیان دەگەیشتن ، برا بە برا دەگەیشت ، کە بیر و باوەڕێکی جیا کردبوونەوە ، و شمشێرەکان لەیەکی دابڕیبوون [١] .

### " ڕۆژی ئوحود "

لە ڕۆژی ئوحود دا ئەبو عبیدە نموونەی خۆ بەختکردن و پاڵەوانێتی بوو . لەو ڕۆژەدا بە ددانەکانی ئەو دوو ئەڵقەی دەرهێنا کە چوو بوونە ڕومەتەکانی پێغەمبەری خوا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە کڵاو زرێکەیەوە بە هۆی لێدانێکەوە بەری کەوتبوو ، ئەوە بوو ددانەکانی پێشەوەی ( بڕۆك ) لە ڕیشەوە هەڵکەنران ، بەڵام بەنەمانی ئەو دوو ددانە دەم و ددانی جوانتر بوو هەتا وتراوە کە جوانترین ددانی شکئەبو ئەوەی ئەبو عبیدە بووە [٢] .

---

١ - بروانە : فقه السيرە ( ٢٤٩ ) .

٢ - حاکم لە ( المستدرك ) دا ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٢٦٦ ) .

## " کەرامەتی ئەبو عبیدە "

لە جابرەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناردینی بەدوای کاروانێکی قورەیشدا و ئەبوعبیدەی کوڕی جەراحی کردە ئەمیرمان و توێشە بەرەیەك خورمای پێ داین کە غەیری ئەوە هیچی بۆمان دەست نەکەوت پێمان بدات ، ئەوە بوو ئەبو عبیدە دەنکە دەنکە خورمای پێ دەداین .. وتم : ئەی چیتان لێ دەکرد ؟

وتی : هەروەك منداڵ دەمانمژی و پاشان بڕێك ئاومان دەکرد بەسەردا ئەو ڕۆژە هەتا شەو بەسمان بوو ، دواتر بەرە و کەناری ڕووبار دەرچووین لەوێ قەوارەیەکی گەورە دەرکەوت هێنامان سەیر ئەکەین گیانلەبەرێکە پێ ی ئەوترێت (عنبر ) . [1]

ئەبو عبیدە وتی : مردارەوە بوو !! پاشان وتی : نە ، بەڵکو ئێمە نێرراوی پێغەمبەری خواین ( ﷺ ) و لە پێناوی خوای پەروەردگار دا شەڕ ئەکەین ، ئێمە ئێستا ناچارین ، لەبەر ئەوە لێ ی بخۆن .

جابر وتی : یەك مانگ خواردنمان ئەو گیاندارە بوو لە کاتێکدا ژمارەمان ( ۳۰۰ ) کەس بوو هەتا گۆشتمان گرت .. پاشان بڕێکی زۆریشمان لەگەڵ خۆمان هێنایەوە . کە گەڕاینەوە مەدینە چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆمان گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی : " هورزق أخرجه الله عزوجل لكم / فهل معكم من شيئ فتگعمونا ؟ " واتە : ئەوە ڕۆزی یە کە و لە لایەن خوای پەروردگارەوە بۆتان نێرراوە ، ئایا هیچتان پێماوە لە گۆشتەکەی بەشی ئێمەش بدەن ؟ ئێمەش بۆمان ناردوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لێی خوارد . [2]

## " ئامۆژگاریەکانی "

لە ئەبول حسن ، عمرانی کوڕی نمران ، دەڵێت : ئەبو عبیدە بەناو سەربازەکاندا دەڕۆشت و دەیفەرموو : کەسانێك هەن جلەکانیان سپی و پاك دەکەنەوە ، بەڵام

---

[1] - نەهەنگی ئاوی کە ( ۱۰ ) متر درێژ دەبێ .

[2] - صەحیحە / ئیبنو الحجر لە مەسنەدەکەیدا ( ۲/ ۹۵۲ ، ۹۵۳ ) بە ژمارە ( ۲۷٤۲ ) ریوایەتی کردووە . لەلای بوخاری و موسلیم یش هەیە ، بڕوانە ( السیرە النبویە )ی و . عبدالمهدی عبدالقادر ( ص ۲٦ ، ۲۷ ) .

ئاینەکەیان پیس دەکەن ! کەسانێك وا ئەزانن رێز لە خۆیان دەنێن ، کەچی خۆیان سووك ئەکەن لە بری ئەوەی رێزی لێ بنێن ، خراپە کۆنەکانتان بە چاکە تازەکانتان بسڕنەوە .[1]

## " زوهدی ئەبا عبیدە "

لە هشامی کوڕی عوروە وە ، لەباوکیەوە ، دەڵێت : پێشەوا ( عمر ) هات بۆ شام لەوێ ئەمیر و پیاوە گەورەکان پێشوازی یان لێ کرد ، فەرمووی : ئەی کوا براکەم ئەبو عبیدە ؟ وتیان : ئێستا دێت بۆ لات ، دەڵێت : ئەبو عبیدە بە سواری وشترێکەوە هات و سەلامی کرد ، پاشان بە خەڵکەکەی وت: بە جێمان بێڵن . ئەوجا ( عمر ) ( ﷺ ) لەگەڵیدا چوو بۆماڵیان و لەوێ تەنها شمشێرێك و قەڵغانێك و کۆچبارەکەی زیاتری تیانەبوو ، عمر فەرمووی : بۆچی برێك کەل و پەل بۆ خۆت لەماڵەکەتدا دانانێیت ؟ ئەویش فەرمووی : ئەی ئەمیری ئیمانداران : ئەمانە بە نیوە ڕۆژمان دەگەیەنێت[2] ، واتە : ئەکرێ ژیانتی پێ بەریتەسەر .

## " ڕازی بوون بە قەزا و فەرمانی خوا "

کاتێ تاعونی ( عمواس ) بڵاو بوویەوە و خەڵکێکی زۆر پێ ی شەهید بوون ، ئەبا عبیدە لە ئاست ئەم فەرمان و بڕیارەی پەروەردگاریدا وەك کێوی بڵند و شاخی خۆگر ڕاوەستاوە کە بە هیچ شێوەیەك بەرامبەر شەپۆلەکانی ئەم بەڵایە لاواز نەبوو ، بەڵکو بۆنی ڕازی بوون و شەهادەتی لێوە دەکردن و لەم بوارەدا وانەیەکی باشی پێشکەش کردین بەڕازی بوون بە قەدەری ئیلاهی و پێشوازیکردن لە فەرمانی پەروەردگار بە ئارامگرتنێکی جوان . لە تارقی کوڕی شەهابەوە ، دەڵێت : عومەر ( ﷺ ) دەربارەی تاعونەکە نووسراوێکی بۆ ئەبو عبیدە نارد نو سیبوی ، لەڕاستیدا پێویستیم بە تۆ هەیە و ناتوانم دەستبەردارت بم ، خێرا وەرە بۆ لام .

ئەوە بوو کاتێ ئەبو عبیدە نووسراوەکەی خوێندەوە فەرمووی : ئەزانم ئەمیری ئیمانداران چی دەوێت ، ئەیەوێ کەسێك بهێنێتەوە کە ئەجەلی نزیکەو نامێنێتەوە ، پاشان ئەمەی بۆ

---

[1] - بروانە : الحلیە ( ۱ / ۱۰۲ ) ، الاصابە ( ٥ / ۲۸۸ ) . حافظ دەڵێت : سەنەدەکەی ( مرسل )ە .

[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن ، بەڵام بە بچڕ بچڕی هاتووە ، ئیبنو المبارك لە زاهید و احمد لە ( الزهد ) ابونعیم لە ( الحلیە ) ( ۱ / ۱۰۱ ) ڕیوایەتیان کردووە ، بروانە سیر ( ۱ / ۱۷ ) .

نووسی : " بەڕاستی لە پێویستی یەکەت گەیشتم ، دەی لەو ویستەت ئازادم کە ، چونکە من بەڕاستی لەگەڵ سەربازانێك لە موسڵمانانندام و نامەوێ خۆم بە بێ ئەوان دەرکەم و ئەوان لە ناوتاعوندا بهێڵمەوە .. " ئەوە بوو کە ( عمر ) ( ﷺ ) نامەکەی خوێندەوە ، گریا ، وتیان چی بوو ؟ ئەبو عبیدە وەفاتی کرد ؟ فەرمووی : نەخێر ، بەڵام وەك ئەوەیە وەفاتی کرد بێ .[1] ئەوەبوو ئەبو عبیدە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) بەو تاعونە وەفاتی کرد و شەهید بوو ، کاتێ تانەیەك لەسەر شانی ئەبو عبیدە دەرکەوت بە هۆی تووش بوون بە تاعونەکەوە ، خۆشحاڵ بوو و فەرمووی : سوێند بەخوا نامەوێ لە جێ ی ئەم تانەیە خەز و بەز بوایە .[2] ( ڕەزای خوای لێ بێت )

---

[1] - حاکم لە ( ٣ / ٢٦٣ ) لەمە درێژتر باسی کردووە دەڵێت / ڕاوی یەکانی هەموویان جێ متمانەن ، بڕوانە سیر (١/ ١٩ ) .

[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن ، جگە لە ( شهر ) کە جیاوازی ڕای لەسەرە ، تەبەرانی لە ( الکبیر )دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە ( ٣٦٤ ) .

## " ٨ – عبدالرحمن ی کوڕی عوف ( رضي الله عنه ) "

### " پەروەردگارا..عبدالرحمن ی کوڕە عەوف بەسەلسەبیلی بەهەشت ئاوبدە ( فەرمووده )"

### " ناسنامەی "

عبدالرحمن کوڕی عوف ی کوڕی عبد عوفی کوڕی عبدالحارثە . هەر زوو پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بچێتە ماڵی ئەرقەم ، موسڵمان بووە ، وە هەر دوو هیجرەتی حەبەشەی کردووە و لە هەموو غەزاکاندا ئامادە بوو و لە ڕۆژی ئوحود دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ماوەتەوە و لە جەنگی تەبوکدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە پشتیەوە نوێژی کردووە .هەروەها یەکێکە لەو دە هاوەڵەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە و یەکێکە لەو شەش کەسەی ئەهلی ڕاوێژ و یەکێکە لەو هەشت کەسەی لە سەرەتادا موسڵمان بوون .

لە ئیبن سیرینەوە ، دەڵێت : لە جاهلیەتدا عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ناوی ( عبد الكعبە ) بوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناوی نا ( عبدالرحمن ) . [1]

### " فەزڵ و گەورەیی "

١ – لە ئوم سەلەمەوە ، دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو ، بە خێزانەکانی فەرموو : " إن الذين يعفو عليكن بعدى لهو الصادق البار ، اللهم اسق عبد الرحمن بن عوف من سلسبيل الجنة " . [2]

واتە : ئەوەی پاش من بە سۆز و میهرەبانە بۆ تان کەسێکە ڕاستگۆ و چاکەکارە ، ئەی پەروەردگار لەبەهەشتەکەتدا بەسەلسەبیلی بەهەشت عبدالرحمن ی کوڕی عەوف تێر ئاو بکە .

٢ – لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆ لای عبدالرحمن کە لە نوێژدا بووە ، پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) بینی و ویستی دوا بکەوێت ،

---

[1] - هیثمی دەڵێت : تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە ، پیاوانی ( صحیح ) ن ، الجمع ( ١٤٨٨٣ ) .

[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن ك هەیثەمی دەڵێت : احمد و تەبەرانی ڕیوایەتیان کردووە ، پیاوانی جێ ی متمانەن . الجمع بۆ ژمارە ( ١٤٨٩٨ ) .

**پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئاماژەی بۆ کرد کە لە جێ ی خۆی بمێنێ ئەوە بوو بە ئیمامەتی عبدالرحمن پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژەکەی ئەنجام دا .**[1]

**٣- لە بوسرەی کچی صەفوانەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لێی پرسی :** " من يخطب ام كلثوم بنت عقبة ؟ " **کێ داخوازی ئوم کەلسومی کچی عقبە دەکات ؟ وتی : فلاّن و فلاّن و عبدالرحمن کوڕی عەوف ، فەرمووی :** " انكحوا عبدالرحمن بن عوف ، فأنه من خيار المسلمين ، ومن خيارهم من كان مثله " .[2]

**واتە : بیدەن بە عبدالرحمن ، چونکە بەڕاستی ئەو لە چاکترین پیاوانی موسڵمانانە و هەر کەسێکیش وەك ئەم بێت لە چاکترین پیاوانە .**

## " جیهادی عبدالرحمنی کوڕی عەوف ( رضي الله عنه ) "

**لە ئیبنو ئیسحاقەوە ، عبدالرحمن کوڕی عەوف کەسێك بوو هەر دوو ددانی پێشەوەی کەوتبوو ، (تەنها دەستی چەپی ئیشی ئەکرد) و ( شەل )یش بوو ، ئەوە بوو ڕۆژی ئوحود بریندار کرا و ددانەکانی پێشەوەی لە بنەوە شکان و بیست برینی پێوە بوو یان زیاتر لەوەش کە هەندێکیان لە لاقیدا بوو شەلی کرد بوو .**[3]

## " بەخشندەیی عبدالرحمن کوڕی عەوف ( رضي الله عنه ) "

**١- لە ئەبو هریرەوە ( رضي الله عنه ) ،پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :**"خياركم خياركم لنسائي " **واتە : باشترینتان ئەوەتانە کە بۆ خێزانەکانم باشترین بێت ، (عبدالرحمن )یش وەسیەتی لە باخچەیەك بۆ کردن کە بە چوار سەد هەزار دەخەملێنرا .**[4]

---

[1] - سەنەدەکی ( صحیح ) ە / ابویعلی و بزار بە دانە ( صحیح ) ریوایەتیان کردووە ، بڕوانە : مجمع الزائد بە ژمارە ( ١٤٩٠١ ) .

[2] - هەیثەمی دەڵێت : تەبەرانی ریوایەتی کردووە ، هەریەکە لە یعقوب کوڕی حمید و سلیمانی کوڕی سالم )ی تێدایە کە جێگەی متمانەن ، باقی پیاوانی تری فەرموودەکە پیاوانی دا ( الصحیح )ن الجمیع ( ١٤٨٩٣ ) .

[3] - پیاوانی جێ ی متمانەن ، تەبەرانی لە ( الجمع ) ریوایەتی کردووە بە ژمارە ( ١٤٨٨٧ ) .

[4] - حاکم ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٣١١ ، ٣١٢ ) ، دەڵێت : صحیحە بە مەرجی ( مسلم ) زەهەبیش هەمان ڕای هەیە .

٢- لە قەتادەوە ، دەربارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە : ﴿ الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ ﴾ سورة التوبة ، آية ( ٧٩ ) . واتە : ئەو بێ باوەڕانە کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کەزیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان، دەڵێت : عبدالرحمن ی کوڕی عوف چوار هەزار دیناری لە ماڵەکەی بەخشی ، کۆمەڵێك لە دووڕووەکان وتیان : عبدالرحمن چەند ریابازە، خودای پەروەردگاریش وەڵامی ئەوانەی دایەوە .[١]

## " ترس و گریانی عبدالرحمن لەسەر خۆشیەکانی دنیا "

لە ( سەعدی کوڕی ابراهیم )ەوە ، لە باوکیەوە ، عبدالرحمن بە ڕۆژو بوو (رضي الله عنه) ، خواردنێکی بۆ هێنرا فەرمووی مصعبی کوڕی عمیر کە لە من باشتر بو ، کاتێ کوژرا بە بوردەیەك کفنیان کرد کە ئەگەر سەریان داپۆشیبایە، قاچی بە دەرئەکەوت ئەگەر قاچیان داپۆشتایە سەری بەدەر ئەکەوت ، وە فەرمووی : حەمزەش کە لە من باشتر بوو ( رضي الله عنه ) کوژرا ... دوای ئەوان دنیا بەڕووی ئێمەدا کراوەتەوە ، یان وتویەتی : لە دنیا هەرچی پێمان دراوە دراوە ، بە جۆرێك، دەترسین کە چاکەکانمان بۆ پێشخرئەبو بۆ دنیا ، پاشان دەستی بە گریان کرد و ئەوەندە گریا تا خواردنەکەی بە جێ هێشت .[٢]

## " پارێزکاری ( عیففەت )ی عبدالرحمن ( رضي الله عنه ) لە داوا کردندا "

عبدالرحمن ( رضي الله عنه ) دەفەرموێت : کاتێ هاتینە مەدینە و پێغەمبەری خوا( ﷺ ) من و ( سەعدی کوڕی رەبیع )ی[٣] کردە برا ، سەعد پێ ی وت : من لە ناو پشتیوانانندا (انصار ) لە هەمووان دەوڵەمەند ترم ماڵ و سامانەکەم لە گەڵتدا ئەکەم بەدوو بەشەوە و بڕوانە لە خێزانەکانم کامیانت بە دڵە بۆتی تەڵاق ئە دەم و دوای عیددە تۆ بیخوازە عبدالرحمن پێ ی وت : پێویستم بە وانە نیە ، بەڵام تۆ بازاڕێکم نیشاندە بازرگانی تیا بکرێت ، وتی : بازاڕی قینقاع .

---

[١] - بڕوانە / الدار المنثور ( ٣ / ٢٦٢ ) ، تەبەرانی ( ١٠ / ١٩٥ ) .

[٢] - صحیح / بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

[٣] - دواتر باسی ژیانی ئەم بەڕێزەش دەکەین .

عبدالرحمن چووە ئەو بازاڕەوە و کەشك و چەوری و ئەو جۆرە شتانەی دەهێنا بەردەوام بوو .. تا هێندەی نەبرد عبدالرحمن دەرکەوت و شوێنەوارێکی زەرد بە کراسەکەیەوە دیار بوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی : ژنت هێناوە ؟ وتی : بەڵێ .. فەرمووی : کێ یە ؟ وتی : ئافرەتێکی ئەنصاری یە ، فەرمووی : چەندی تێ چوو فەرمووی : کێشی ناوکە خورمایەك زێڕ .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " اولم و لوبشاە " ئەگەر بە مەڕێك یان بزنێکیش بووە خەڵکی داوەتکە و میوانداریان بکە .[1]

نووسەر دەڵێت : -

بەم جۆرە هاوەڵان دونیا و ئاخیرەتیشیان گرێداوە و بوونە خاوەنی ماڵی هەردوو دنیایان ، بەڕاستی ئەوانەی بە تەممەنّی ئەم دنیایەدا دەژین و لەسەر بێ کاری و سواڵکردن خۆیان ڕاهێناوە ، ئەوانە تاوانیان بەرامبەر خۆیان و ماڵ و منداڵەکانیشیان ئەنجام داوە و خراپە بەرامبەر نەتەوە و میللەتی خۆیان ئەکەن .. هاوەڵان ئەویان زانیوە کە هەر کەسێ ژیانی خۆی بۆ هەق و چاکە تەرخان بکات ، ئەوە هەموو کارەکانی پەرستشەو هەر دڵۆپە ئارەقێك لە پێناویدا ئایەتێکە لە جیهاد ، و لە تەرازووی چاکەکانیدا لەگەڵ نوێژ و زەکات دانەکاندا بۆی ئەژمار ئەکرێت ، چونکە بەڕاستی کار کردن هۆکارێکە بۆ مانەوە و هۆکاریش شوێن ئامانج دەکەوێت لە گەورەیی و بەرزی یان لە سووکی و بێ بایەخیدا .[2]

## " ئایا عبدالرحمن ( ﷺ ) بە سنگە خشێ ( حبواً ) دەچێتە بەهەشتەوە ؟!!

بەڕاستی نووسەرە هاوچەرخەکان بە هۆی نەبوونی پوختە کردنێکی وردی ڕیوایەتەکانەوە کەوتوونەتە هەڵە و لادان کەوا گومان ئەبەن عبدارحمن ( ﷺ ) بە سنگە خشێ دەچێتەوە بەهەشتەوە ؟!جا ئەگەر ئەم سەروەر و پێشەوایە بەو جۆرە بچێتە بەهەشتەوە ، ئەی ئەوانەی لەخوار پلە و پایەی ئەوەوەن چۆن دەچنە بەهەشت ؟ ﴿ نَبِّئُونِي بِعِلْمٍ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ سورة الأنعام ، آية (١٤٣). واتە : ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بەڵگەیەکی زانستیتان هەیە . بۆمان ڕوون بکەنەوە ؟!

[1] - صەحیحە بوخاری لە بابی ( البيوع ) ، ( ٢٠٤٨ ) ڕیوایەتی کردووە .

[2] - بڕوانە : ( حقوق الاسلام بين تعاليم الاسلام و اعلان الامم المقدة . ی شێخ محمد غزالی ( ١٧٣ ) .

**سۆراخ کردنی ئەو ڕیوایەتانەی لەم بارەیەوە هاتوون : -**

**ڕیوایەتی یەکەم : - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :** " يا ابن عوف ، أنك من الاغنياء ، و لن تدخل الجنة الازحفاً ، فأقرض الله تعالى ، يطلق لك قدميك " [1]

**واتە : ئەی کوڕی عوف تۆ لەدەوڵەمەندانیت وە بەسنگە خشێ نەبێ ناچیتە بەهەشت ، لەبەر ئەوە قەرز بدە بە پەروەدگارت تا پێیەکانت بکاتەوە ...**

**ڕیوایەتی دووەم : لە عائیشەوە ، دەفەرموێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو ، فەرمووی** " عبدالرحمن لا يدخل الجنــة الاحبــواً " **. واتە : عبدالرحمن بەسەر سنگەوە نەبێ ناچێتە بەهەشت . فەرموودەکە ( مونکەرە ) احمد ڕیوایەتی کردووە ( ٦ / ١١٥ ) و دەڵێت : فەرموودەیەکی نا پەسەندە ( منكر ) بڕوانە : سیر ( ١ / ٢٦ ) .**

**ڕێوایەتی سێیەم : ئەمەیان ڕیوایەتێکی دوور و درێژە کە ئەحمەد لە ئەبی ئیمامەوە گێڕاویەتیەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :** " دخلــت الجنــة ، فسمعت فيها خشفة بين يدى " **، دەڵێت : چوومە بەهەشت لەوێ گوێم لە خشپە و جووڵەیەك بوو لە نزیکمەوە . وە تیایدا هاتووە** " ... و عرضت أمتي رحلا رحلا ، فجعلوا يمرون ، فأستبطات عبدالرحمن بن عوف ، ثم جاء بعد الاياس .... " **واتە : ... پیاو بە پیاوی ئوممەتەکەم نیشاندرا هەموویان تێپەڕ ئەبوون ، بەڵام دەمبینی عبدالرحمن زۆر دواکەوتووە ، پاشتر دوای بێ هیوا بوون ، هات ... ئیسنادەکەی بێ بنەمایە : زەهەبیش وا دەڵێ . سیر (١/٧٧ ) و لە ناوڕاوی یەکانیدا ( علی کوڕی یزیدی ئەلهانی هەیە ، کە ئەویش لاوازە .**

**لەو سۆراخ کردنەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەی وا گومان دەبات عبدالرحمن بەسنگە خشێ ( زحفاً ) دەچێتە بەهەشتەوە ، چەند لەهەڵەدایەو و هەموو ڕیوایەتەکان کە لەم بارەیەوە هاتوون یان لاوازن یان هەڵبەستراون ، سوپاس بۆ خوا ...**

## " عبدالرحمن لەسەرەمەرگدا "

**پاش ژیانێکی ڕووناك و پڕ بەخشندەیی کە ئیبنو عوف ( رضي الله عنه ) بە تێکۆشان بە ماڵ و شمشێرەکەی لە پێناوی خوادا بەسەری برد .. کاتی ئەوەهات کە پشوو بدات .**

---

[1] - فەرموودەکە لاوازە حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٣١١ ) و بە صحیح دایناوە ، بەڵام زەهەبی دەڵێت : خالد بەکۆ بەلاواز دایناوە نەسانی دەڵێت : جێ متمانە نی یە ، بڕوانە : پەراوێزی ( سیر ) ( ١ / ٨١ ) .

لە ئیبراهیمی کوڕی ( عبدالرحن )ەوە ، دەڵێت : عبدالرحمن ی کوڕی عوف بەدەم ئازارەوە لە هۆش خۆی چوو ، خەڵکەکەی دەوروبەری وایانزانی گیانی دەرچووە ، بۆیە لەلای هەڵسان و دەستیان بە پیاهەڵدانی کرد . ئەویش بە هۆش خۆیدا هاتەوە و تەکبیرەی خوای گەورەی دەکرد ، ئەهلی ماڵەکەشی تەکبیرەیان کرد .

ئینجا فەرمووی : تۆزێ لەمەو پێش لە هۆش خۆم چوو بوم ؟ وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : ڕاستتان کرد ، لەوکاتەدا کەلە هۆش خۆم چووم دوو پیاو منیان پەلکێش کرد کە توندی و ڕەقیم تیابەدی ئەکردن ، وتیان پێم لەگەڵمان وەرە تا لەلای ( العزیز الأمین ) دادوەریت ئەکەین ، بردمیان تا گەیشتینە لای پیاوێك ، وتی : ئەمە بۆ کوێ ئەبەین ؟ وتیان دادوەری ئەکەین لەلای ( العزیز الأمـین ) . وتی : بگەڕێنەوە ، چونکە ئەمە یەکێکە لەوانەی کە خوای گەورە هەر لەو کاتەوەی لەسکی دایکیاندا بوون بەختەوەری و لێخشبوونی بۆ نووسیووە ... وە ئەمە جارێ تا خوا دەیەوێ لەناو ماڵ و منداڵەکانیدا دەمێنێتەوە .. ئەوە بوو مانگێك دوای ئەوە ژیا .[1]

### " حاڵی هاوەڵان ئەو ڕۆژەی عبدالرحمن وەفاتی کرد "

١- ئیبراهیمی کوڕی سەعد ، لە باوکیەوە ، ئەمیش لەباپیریەوە ، دەڵێت : ئەو ڕۆژەی عبدالرحمن وەفاتی کرد گوێ ی لە ( علی ) بووە فەرموویەتی : " بە ڕێ ی خۆتدا برۆ ئەی کوڕی عەوف ، بەڕاستی بەرەوشەن و ئاسوودەیی بەهەشت گەیشتی و پێشگریت کرد لە خەم و ناڕەحەتی یەکان ... "[2]

٢- سەعدی کوڕی ابراهیم ، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ، وتوویەتی : لە جەنازەی ( عبدالرحمن )دا سعدم دیووە لەناو پێخەفی ( عبدالرحمن ) دا بوو ، دەیفەرموو : " واجبلاه " .[3]

عبدالرحمن ( ﷺ ) لە تەمەنی ( ٧٥ ) ساڵیدا وەفاتی کرد و پێشەوا عوسمان کوڕی عەففان ( ﷺ ) نوێژی لەسەر کرد .

---

[1] - ئیسنادەکەی ( صحیح )ە : حاکم دەرهێنانی بۆ کردووە ( ٣ / ٣٠٧ ) بو صیری دەڵێت : اسنادەکەی باشە . پەراوێزی ( سیر ) ( ١ / ٨٩ ) .

[2] - اسنادەکەی ( صحیح ) ە / تەبەرانی ریوایەتی کردووە ( ٢٦٣ ) لە ( الکبیر ) دا .

[3] - واجبلاه / ئاخی بۆ ڕۆشتنی ئەم کەڵە پیاوە هەڵکێشا وە کە وەك کێو خۆڕاگر بوو . ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ١ / ٩٦ ) حاکمیش لە ( ٣ / ٣٠٨ ) .

# " ٩ – سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ( ﷺ ) "

## " شێری ناو بێشە "

کێ یە ؟

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ( مالکی کوڕی ئوهەیب )ی کوڕی ( عبد مناف ) ئەمیر ابو ئیسحاقی قورەیشی مەککی یە و یەکێکە لەو دەهاوەڵەی موژدەی چوونە ناو بەهەشتیان پێ دراوە و یەکێکە لە پێشینەکان لە ئیسلامدا و یەکێکە لەوانەی (بەدر و حودەیبیە )ی دیوە هەروەها یەکێکە لەو شەش کەسەی ئەهلی ڕاوێژ ...

وە یەکەم کەسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تیری هاویشتبێ .[1] ( ابنو مندە ) دەڵێت: سەعد بە حەڤدە ساڵی موسڵمان بووە . وە لە سەعیدی کوڕی موسەیبە ، دەڵێت: گوێم لە سەعد بوو دەیفەرموو:ئەو ڕۆژەی من تیایدا موسڵمان بووم هیچ کەسی دیکە موسڵمان نەبوو وە من : حەوت شەوانم بەڕێ کرد تیایدا سێ یەکی ئیسلام بووم .[2]

## " فەزڵ و گەورەیی "

١– لە جابرەوە ، دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا دانیشتبووین سەعدی کوڕی ئەبو وقاص بەرەو لامان هات ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " هذا خالي فليرني امرؤ خاله " .[3]

واتە : ئەمە خاڵی منە ، دەی ئێوەش خاڵی خۆتانم نیشاندەن .

٢– سعدی کوڕی ئەبو وەقاص دەڵێت : ئەم ئایەتە دەربارەی من هاتووەتە خوارەوە : ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ ....﴾ سورة الأنعام آية ( ٥٢ ) .

واتە : ئەی محمد نەکەیت ئەوانە دەربکەیت کە لە بەیانیان و ئێوارانـدا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە ...

---

[1] - ( بزار ) و · تەبەرانی ڕیوایەتیان کردووە . پیاوانی (صحیح )ن ، جگە لە ( ابی خالد الوالبی ، کە ئەمیش جێ ی متمانەیە ، بڕوانە : المجمع بە ژمارە ( ١٤٨٥٩ ) .

[2] - صحیح : بوخاری لە ( الفضائل ) دا ڕیوایەتی کردووە ( ٣٧٢٦ ) ( ٣٧٢٧ ) .

[3] - صحیح / حاکم لە ( المستدرك ) ( ٣ / ٤٩٨ ) دا ڕیوایەتی کردووە . دەڵێت ( صحیح )ە زەهەبی هەمان ڕای هەیە .

دەفەرموێت : دەربارەی شەش کەس هاتە خوارەوە لەناویاندا من و ئیبنو مەسعود بووین . بێ باوەڕان وتبویان بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئا ئەمانە لە خۆت نزیک ئەکەیتەوە؟ [1]

٣ — سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : "أللهم استجب له اذا دعاك " يعني سعدا . [2] واتە : ئەی پەروەردگار سەعد هەر داوایەکت لێ دەکات وەڵامی بەرەوە .

٤ — لە ( عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " اول من يدخل الباب رجل من اهل الجنة " ، [3] واتە : یەکەم کەس کەلەم دەرگایەوە دێتە ژوورەوە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشت ، ئەوە بوو ( سعدی کوڕی ئەبو وەقاص ) هاتە ژوورەوە .

## " چەند لاپەڕەیەکی پرشنگ لە خەباتی سەعد ( رضي الله عنه ) "

## " لە غەزای بەدر دا "

لە سەعدەوە ، دەڵێت : کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا لە جەنگی بەدر دا ئامادە بووم تەنها منداڵێکم هەبوو ، دواتر خوای گەورە هی تری پێ بەخشیم* .

وە لە ( ابنو مسعود )ەوە ، دەڵێت / سەعد ڕۆژی بەدر وەك پیادە و وەك ئەسپ سواریش دەجەنگا .

وە لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) تیری دەهاویشت و نموونەیەکی جوانی پاڵەوانێتی نیشاندا و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوعای خێری بۆ کرد .

---

[1] - صحیح موسلیم ریوایەتی کردووە .

[2] - صحیح / بروانە ( موارد الظمأن الى زوائد ئیبنو صبان ) شێخی ( عەدوی ) دەڵێت : ( صحیح )ە بروانە / روضة المحبین ( ٢٥ ) .

[3] - اسنادەکەی ( حسن )ە : احمد ریوایەتی کردووە .الجمع بە ژمارە ( ١٤٨٦٣ ) .

* بزار و طبرانی ریوایەتیان کردوە، پیاوانیشی یاوانی(صحیح)ن. الجمع (١٤٨٦٨).

لە عامری شوعەبی یەوە ، دەڵێت : بەسەعدیان وت : چ کاتێك نزات بۆ کراوە ؟ فەرمووی : ڕۆژی بەدر ، کاتێ لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا تیرم دەهاویشت ئەم وت: خوایەگیان پێیەکانیان بهێنەرە لەرزین و دڵیان بتۆقێنە و کارێکیان پێ بکە وەها کارێك ...

پێغەمبەری خوا ش ( ﷺ ) فەرمووی : " اللهم استجب لـسعد " [1] ئەی پەروەردگار داواکەی سەعد وەڵام بدەرەوە ..

## " لە غەزای ئوحود دا "

لەو غەزایەدا وەك پاڵەوانان لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جیهادی دەکرد و بە خۆڕاگری مایەوە .

سەعد دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ هیچ کەسێك پێش من دایك و باوکی بۆی کۆنە کردووەتەوە ... گوێم لێ ی بووفەرمووی " یا سعد ارم فداك ئەبو و أمي " بیهاوێژە سەعد ، دایك و باوکم بە قوربانت بن .. وە من یەکەم موسڵمان بووم کە تیرم بەرامبەر بێ باوەڕان هاویشتبێ . [2]

وە لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێت : پیاوێ لە بێ باوەڕان خەریك بوو موسڵمانانی دەسوتاند ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " أرم فداك ئەبو و امی " لێدە دایك و باوکم بە قوربانت بن .. منیش تیرێکم دەرهێنا کەسەری ( نووکی ) نەبوو ، دام لە نێو چاوانی کابرا ، کابرا کەوت و عەورەتی بەدەرکەوت ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەها پێکەنی دانەکانی دەرکەوت . [3]

یەکێ لەو فەزڵەی خوا داویەتی بەم هاوەڵە بەڕێزە ، ئەوەیە کە هەردوو فریشتەی بەڕێز ( جبرئیل و میکائیل ) ی لەسەر مەیدانی جەنگە کە بینیوە .

---

[1] - اسنادەکەی ( حسن )ە تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە ، هیثمی دانە پاڵەکەی بە ( حسن ) داناوە . الجميع بە ژمارە ( ١٤٨٥١ ) .

[2] - صحيح : زانایان لەسەری کۆکن ، پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ( زوبێر )یشی ئەمەی فەرمووە ( ﷺ ) .

[3] - صحيح : مسلم لە ( الفضائل ) دا ( ٢٤١٢ ) ڕیوایەتی کردووە ، لە ( باب ) ی ( مناقب سعد ) .

لەسەعدەوە ، دەفەرموێت : دوو پیاوم لەلای ڕاست و چەپی پێغەمبەری خوا دا (ﷺ) بینی لە ڕۆژەی ئوحود دا کە جل و بەرگێکی سپی یان لەبەردا بوو ، بەو پەڕی تواناوە شەڕیان دەکرد ، من ئەو دوانەم پێشتر نەدیبوو ، دواتریش نەمبینینەوە .

دەبینین ئەم ڕیوایەتە لە هەردوو صەحیح دا هاتووە ، بەلام لەم سەردەمانەدا دەبینین کە خەلکانێك هەن ئەوە بە درۆ ئەخەنەوە کە فریشتەکان لە جەنگەکاندا بەشدار بووبن ، جا بۆ چی درۆ ئەکەن ؟! خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُنْزَلِينَ ﴾ سورة آل عمران ، آية(١٢٤).

واتە : ( بیریان بخەرەوە ) ئەو کاتەی دەت وت بە بڕوادارەکان ئایا بەستان نیە پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بە سێ هەزار لە فریشتە دابەزێنراوەکان .

مەگەر شتی وا لە ڕووی عەقڵ و لۆژیکەوە مەحاڵە ؟! نەخێر، ئیتر بۆ بەرژەوەندی کێ هەوا و ڕاوبۆچوون پێش هەقیقەتە جێگیرەکان لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بخەین ، وە ئەم هێرشە گوماناوی یە بۆچی و بە ناوی کێوە ئەم واتایانە دەستکاری دەکرێن و تەزویر ئەکرێن ، بەڕاستی خوا هەمیشە فەرمانی خۆی سەر دەخات ؟

## " ڕۆژی قادسیە "

### " ئەمە بەڕاستی ڕۆژێکی لەیاد نەکراوە لە ژیانی ئەم ئوممەتەدا "

پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی هەڵبژارد بۆ کارێکی پاڵەوانانەی هەرە گەورە لە کاتی جێنشینایەتی خۆیدا ، کە بە باشترین شێوە ئەنجامی دا ، ئەویش ئەوە بوو فارسەکان بڕیاریان دا کە ڕێزەکانیان یەکبخەن بۆ ( وە دەرنانی ) موسڵمانەکان لەو ناوچانەدا کە ڕزگاریان کرد بوو ، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشت بە ( عمر ) خەڵکی ڕایاندەکرد و خۆیان بەکەنار دەگرت لە ڕووبەڕوو بوونەوەیان ، بڕیاریدا خۆی سەرکردایەتی بکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیان ، بەلام هاوەلان ئامادەیان بۆ کرد ئەو بمێنێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان و هەڵبژاردنی سەرکردەیەکی تر کە گونجاو بێ بۆ ئەم کار و ئەرکە گران و ناڕەحەتە .

ئـەوە بـوو پـاش بیرکردنـەوە و گـەڕان بـەدوای سـەرکردەیەکی وادا لـە ئاسـتی ئەوکارەدا بیّ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص هەڵبژێردرا .[1]

ئەوە بوو پێشەوا ( عمر ) سەعدی ڕاسپارد و ، پیّ ی فەرموو : " ئەوا من تۆم کردە بەرپرس بۆ شەڕ کردن لە عێراقدا ، دەی تـۆش ئـەم وەسـیەتەم بپارێزە ، چونکە بەڕاستی تۆ بەرەو کارێکی زۆر نارەحەت و گران دەڕۆیت کە تـەنها هـەق تیایدا ڕزگاری دەبێت وە خـۆت و ئەوانـەی لەگەڵتـدان ڕەنبونـە لەسـەر چاکە و خـەیر و ببکە هۆکارێك بـۆ فـەتح و ڕزگاری و ئەوەش بزانە کە هەر کارو فەرمانێك توێشووی خۆی هەیە ، توێشووی خـەیر و چاکەیش ، ئارامگری یە "[2]

ئـەوە بـوو سـەعد بـەڕیّ کـەوت و لـە ( قادسـیە ) دابـەزی[3] سـوپای فارسـەکانیش بەسەرکردایەتی ( روستەم ) دەرکەوتن کە ( ٨٠ ) هەزار جەنگاوەر ئەبوون و ژمارەیەك فیل پێشیان کەوتبوو ...

پێش ئەوەی شەڕ دەست پیّ بکات ، سەعد چەند پیاوێکی گـەورەی نـارد بـۆ لای (روسـتم ) لـە ناویانـدا ( نعمـانی کـوڕی مقـرن و موغـیرەی کـوڕی شعبە و عـەمری کـوڕی معدی یکرب ) ، تـا داوای موسـلمان بـون لـە ( روسـتم ) بکـەن . روسـتم پـیّ ی وتـن : چـی ئێـوەی بـەرەو ئێـرە هێنـاوە ؟ وتیـان : بـە لێنێـك کـە پـەروەردگارمان پـیّ داویـن ، ئـەویش ئازادکردنی .

ئـەوە بـوو چـەند وتـوو وێـژێك لـە نێوانیانـدا ئەنجامـدرا و چـەند نامـە گۆڕینـەوە و دانیـــشتنێك لـــە نێوانیانـــدا کـــرا ، یـــەکیّ لـــەو دانیـــشتانە پێـــك گەیـــشتنی ( ربعی کوڕی عامر ( ﷺ ) بوو لەگەڵ ( روستم ) دا کە ئەمە کورتە کەیەتی : -

"روسـتم پرسـی : چـی ئێـوەی هێنـاوە ؟ فـەرمووی : لەسـەر فـەرمانی خـوای گـەورە هـاتووین ، تـاوەکو ئـەوەی خـوا دەیـەوێت لـە بەندایـەتی کردنـی بەنـدەکان دەربێـنین بـۆ بەندایەتی کردنی خوای پەروەردگار وە لە تەنگی و تەسکی دنیا بۆ فراوانی ئاخیرەت ، وە لە جەور و ستەمی ئاینـەکان بۆ دادی ئیسلام .. لەبەر ئـەوە بـە ئاینەکـەی خـۆی ئێمـەی ناردووە بۆ لای بەنـدەکانی تـاوەکو بانگیـان بکـەین بۆ لای پـەروەردگار .. هـەر کـەس بـەوە

[1] - بڕوانە : ( حیاة الصالحین )ی مامۆستا عبدالنعم قندیل ( ١ / ٩٤ ) .

[2] - بڕوانە هەمان سەرچاوە .

[3] بە ( ٣٠ ) هەزار جەنگاوەرەوە . بڕوانە الدایە ( ٥ / ١٠٤ ) .

ڕازی بوو ئێمەش لێ ی ڕازی ئەبین و دەستی لێ دەکێشینەوە ، ئەوەشی بەمەڕازی نەبوو لەگەڵی دەجەنگین تا مل دەدات..

وتیان : ئەی ئەو بەڵێنەی خوا چی یە ؟ فەرمووی : بەهەشتە بۆ ئەو کەسەی لەگەڵ بێ باوەڕاندا دەجەنگێ و دەکوژرێ ، وەسەر کەوتنە بۆ ئەوانەمان کە دەمێنن ، ڕوستم وتی : ئەوا من گوێم لە قسەکانتان بوو ، ئەکرێ ئەم کارە دوابخەن تاوەکو بیرێکی لێ بکەینەوە و چاوەڕێمان بکەن ؟ فەرمووی : بەڵێ ، چەندە باشە چاوەڕێ بین ، ڕۆژێ ؟ دوان ؟ وتی : نا ، بەڵکو تاوەکو هەڵوێستی خاوەن ڕاوێژ و سەرۆکەکانمان وەردەگرین .

ربیع فەرمووی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەیکردووە بە سوننەت بۆمان کە دوژمنانمان لە سێ ڕۆژ زیاتر مۆڵەت بدەین لە کاتی بەیەکگەیشتندا، لەبەر ئەوە بیری لێ بکەرەوە و ڕای ئەوانیش وەرگرەو یەکێ لەو سێ ماوەیە هەڵبژێرە بۆ تەواو بوونی مۆڵەتەکە ..

پرسی / تۆ گەورەیانی ؟ فەرموی : نەخێر ، بەلاّم موسڵمانان هەموو وەك یەك بەستەوان ، خوارترینیان بەسەر بالاّترینیاندا قسەی دەروات .

ئەوە بوو ( روستم ) لەگەڵ سەرکردەکانی هۆزەکەیدا کۆبوویەوە و پاش ڕاگۆڕینەوە بڕیاریاندا بە جەنگ ..

( سیف ) دەڵێت : کە سەعد نەخۆشی ( عرق النسا )ی [1] هەبوو ئەوکاتە ، وتاری دا بۆ خەڵکەکە و لەو وتارەکەیدا ئەم ئایەتی خوێندەوە : ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾ سورة ألأنبياء ، آية (١٠٥) .

واتە : سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە کتێبی زەبوردا دوای تەورات بڕیارمانداوە کە بێ گومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی .

وە پێش نوێژی بۆ کردن لە نیوەڕۆدا ، پاشان چوار جار ( الله اكبر ) ی کردوو پاش ئەوەی فەرمانی پێ کردن بە وتنی ( لاحول ولا قوة الا بالله ) خۆیان توند کرد بۆ شەڕ .. ئەوە بوو شەڕ لە نێوانیاندا ڕووی داو موسڵمانان ئایەتەکانی جیهادیان دەوتەوە و بانگ و هەلاّی ( الله اكبر ) یان بەرز بوو بوویەوە .. هەرچی سەرانی بێباوەڕانیشە بەهەوا دا ئەکەوت و ئەکوژران و خوێنە پیسەکەیان تێکەڵ بە خاك و خۆڵ دەبوو ، ئەوەشیان کەمان پشتیان هەڵکردوو و هەڵهاتن ( سەعد ) یش کاری جەنگەکەی هەڵدەسوڕاند لە

---

[1] - عرق النسا : جۆرێ نەخۆشی دەمار توند بوونەوە .. دەرد و ئێشێکە لە دامێنی پشتەوە تا پێ .

حاڵەتێکدا کەلەسەر نوێنێك بەسەر سنگیدا کەتبوو [1] نەیدە توانی سواری ئەسپەکەی بێت بە هۆی ئەو دوومەڵانەی پێوەی بوون . ئەوە بوو ( روستم ) کوژراو فارسەکان تێکشکان .. سوپاس و ستایش و منەت بۆ پەروەردگار .. کوژراوانی فارسەکان گەیشتە ( ١٠ ) هەزار کەس " .

## " رزگار کردنی ( بیت الئەبوض ) کۆشکی سپی "

لە ( جابری کوڕی سمرە ) وە ( ﷺ ) فەرمووی " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " عصبة من أمتي يفتحون البيت ألئەبوض يعيى بيت كسرى " [2]

واتە : دەستەیەك لە ئوممەتەکەم کۆشکی سپی کەماڵی ( کسری )یە رزگار ئەکەن .

وە لە ریوایەتێکی تردا : " بێگومان کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم دەست بەسەر زێرەکانی ( کسری ) دا دەگرن کەوا لە ( ئەبوض ) دا . [3]

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ( ﷺ ) پاش جەنگی قادسیە دوو مانگ لە قادسیەدا مایەوە دواتر نووسراوی نارد بۆ پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) کەوا پێ ی رابگەیە نێت چی بکات .. ( عمر ) فەرمووی کە بەرەو ( مدائن )ی پایتەختی ( کسری ) بەڕێ کەون .. ئەوە بوو سوپا سەرکەتووەکەی موسڵمانان بەڕێ کەوتن بەرەو ( مدائن ) و بەردەوام لەسەر کەوتنێکەوە بەرەو و سەرکەوتنێکی دیکە دەڕۆشتن لە ( برس )ەوە بۆ ( بابل ) و ( بهر سیر ) تا سوپای موسڵمانان گەیشتە ئاراستەی بەرامبەر ( مدائن ) .. لەوێدا سەعد ( ﷺ ) هەوڵیدا پەڕینەوە سوپاکەی لەڕێ ی کەشتی یەوە دئەبون کات ، بەڵام بۆی نەکرا لەبەر ئەوەی فارسەکان هەموو کەشتی یەکانیان دەست بەسەردا گرتبوو تاوەکو موسڵمانان سوودی لێ وەرنەگرن و رووبارەکەش زۆر بەرین و فراوان بوو ، لێوان بوو بە ئاو و لە توندی شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانیدا کە ملی دەماویشت و بەرادەیەکی زۆر ئاوەکەی بەرز بو بۆوە زیادی کرد بوو ... ئەوە بوو شەوێك لە شەوان سەعد ( ﷺ ) خەوێکی بینی ، لە خەوکەیدا ئەسپەکانی موسڵمانان ئاوی بە شەپۆلی دیجلەی بڕی و تێپەڕاند ..

---

[1] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ١١٢ ).

[2] صحیح : مسلم و احمد ریوایەتیان کردووە .

[3] - صحیح : مسلم ریوایەتی کردووە ، فەرموودەکە : " لتفتحن عصابة من أمتي كنز ال كسرى الذي في الأبيض ".

" تێپەڕینێکی بێ وێنە "

ئەوە بوو خەونەکەی سەعد هاتە دی و بڕیاریدا بە ڕووبارەکەدا تێپەڕن ، بۆیە سوپاکەی کۆ کردەوە و وتاری بۆ دان ، پاش ستایشی پەروەردگار فەرمووی : " لە ڕاستیدا دوژمنەکەتان بەم ڕوبارە خۆی لە ئێوە پاراستوو و بەبوونی ئەمە لە نێوانماندا بە دوژمنانمان ناگەین ، لە کاتێکدا کە ئەگەر ئەوان بیانەوێ دەدەن بە سەرتاندا بە کەشتی یەکانیانەوە .. وە ئێوە هیچ شتێك نی یە لێ ی بترسن ، چونکە ئەوان ئێستا گومانی ئەم پەڕینەوەی ئێمە نابەن و سەرباز و پاسەوانیان لەو دەورووبەرەدا نیە ، لەبەر ئەوە من وای دەبینم کە باشتر وایە ئێوە دەست پێشخەری بکەن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنەکەتاندا و نیەتی لێ بێنن ، پێش ئەوەی دنیا ئابلوقەتان بدات ، بزانن . من بڕیارمداوە کە ئەم ڕووبارەی نێوانمان ببڕم .. هەموو وتیان : لەسەر فەرمانی خوای پەروەردگار بۆ ئێمە و بۆ تۆش ئەو کارە بکە . "

سەعد هانی خەڵکەکەی دا بۆ پەڕینەوە و پاشان فەرمووی : " کێ دەست پێ دەکات و ( سەری پردەکە ) یان (کەنار ڕووبارەکەمان ) بۆ دەپارێزێت ، تاوەکو ڕێگرمان نەکەن لە پەڕینەوە ؟ "

ئەوە بوو ( عاصم ی کوڕی عەمری تیمی ) هەڵبژارد لەگەڵ شەش کەس لە ئەهلی ( نجدات ) . ئەو پاڵەوانانە ڕوبارەکەیان بڕی و پاشان ( سەعد ﷺ ) بە خۆی و سوپاکەیەوە لە دوای ئەوان لە ڕووبارەکە پەڕینەوە ، بەم کارەشی ئەهلی فارسی سەرسام کرد کە هیچ حیسئەبوکیان بۆ نەکرد بوو .

سەعد لەو کاتەدا بەناو ڕووبارەکەدا دەڕۆیشت بەرەو کەناری ( اسبانیر ) دەیفەرموو : بڵێن : " نَسْعينُ بِاللهِ وَ نَتَوَكَّلُ عَلَيهِ ، حَسْبُنَا اللهُ وَنِعمَ الوَكِيلُ ، وَ لاحَولَ وَلا قُـوَةَ ألا بِاللهِ العَلِيِّ العَظِيمَ " واتە : پشت و کۆمەکیمان خودایە و خوامان بەسە ، و چاکترین کار پێ سپێرراوە ، وە هیچ گۆڕان و توانایەك نیە مەگەر بە خوای باڵاو مەزنەوە .

بەوجۆرە پلانەکەی سەعد سەرکەوتوو بوو بەڕادەیەك مێژوو نووسانی سەرسام کردووە سەرکەوتنێك کە سەعد خۆیشی وە هەروەها هاوەڵەکەی سەلمانی فارسی ، سەرسام کرد بوو.

سەعد دەیفەرموو : " هەر خوا پشت و پەنامانە و باشترین پەناگایە .. سوێندبێ بەزاتی پیرۆزی ... کە دۆستانی خۆی سەر دەخات و ئاینەکەی باڵادەست دەکات و

دوژمنەکەی تێک دەشکێنێت ، ئەگەر لەناو سوپاکەدا تاوانگەلێك یان ستەمێك نەبێ بدابەسەر چاکەکاندا " .[1]

( سەلمان )یش پێ ی وت : ئیسلام تازەیە ، سوێند بەخوا ڕووبار بۆیان سەری نەوی کردووە ، هەروەك چۆن وشکانی سەری بۆ یان نەوی کرد ، بەڵام سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کۆمەڵ ، کۆمەڵ لێ ی دێنە دەرەوە وەك چۆن کۆمەڵ ، کۆمەڵ چوونە ناوی بە بێ ئەوەی لفاوی ولاخێك لە دەست بدەن .

ئینجا دایان بەسەر ئاوەکەدا بە جۆرێ لەگەڵ کەنارەکەدا جیا نەدەکرایەوە و لە کەنارەکەوە ئاو نەدەبینرا .

بەو جۆرە لە ئاوەکە تێپەڕیان کردوو هاتنە دەرەوە هەروەك سەلمان دەڵێت : هیچ شتێکیان لە دەست نەچوو وە هیچ کەسێکیان لە ئاوەکەدا نقوم نەبوو ، جگە لە پیاوێك لە ( بارق ) بە ناوی ( غرقدە )وە کە لەسەر پشتی ئەسپە زەردەکەی خلیسکا .

" ئەبو عوسمان نهری " دەڵێت :

وەك لەبەر چاوما بێت وایە کاتێ ئەسپەکە لەبەر سەرما خۆی ڕاتەکاند و (غرقدە ) ی فڕیدایە ناو ئاوەکەوە ، لەو کاتەدا ( قعقاع ی کوڕی عەمر ) جڵەوی ئەسپەکەی خۆی بۆ هەڵدا تا دەستی پێوە بگرێت ، بەو جۆرە ڕایکێشا تا تێپەڕین لە ڕووبارەکە ، کابرای (بارق )ی کە پیاوێکی زۆر بەهێز بوو ، وتی / بەڕاستی خوشکەکان ( واتە ئافرەتان ) نەیانتوانیوە وێنەی پیاوێکی وەك تۆیان ببێ ئەی قەعقاع .[2]

## " سکالأیەکی درۆ "

عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) سەعدی کردە والی ( کوفە ) .. ڕۆژان تێپەڕین ئەهلی کوفە سکالأی سەعد یان لەلای ( عمر ) کرد ، وتیان : کە بە باشی نوێژ ناکات !!

جابر دەفەرمێ خەڵکی کوفە لەلای ئیمامی عومەر سکالأیان لەسەعد کرد ، ئەویش سەعدی لابردو عەماری لەجێ دانا، هێندە سکالأیان لەدەست کرد تا وتیان تەنانەت ناشزانێ بەجوانی نوێژ بکات،ئیمامی عومەر ناردی بەدوایدا پێی فەرموو باوکی ئیسحاق!

[1] - ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تاوان و گوناه هۆی لەناوچوون و بەهەلاکەت چوونی نەتەوەکانە .

[2] - تارخ الطبری و صلاح الامە ( ٣ / ٥٣٤ – ٥٣٦ ) .

حاڵەتێكدا كەلەسەر نوێنێك بەسەر سنگیدا كەتبوو [1] نەیدە توانی سواری ئەسپەكەی بێت بە هۆی ئەو دوومەڵانەی پێوەی بوون . ئەوە بوو ( روستم ) كوژراو فارسەكان تێك شكان .. سوپاس و ستایش و منەت بۆ پەروەردگار .. كوژراوانی فارسەكان گەیشتە ( ١٠ ) هەزار كەس " .

## " ڕزگار كردنی ( بیت الئەبوض ) كۆشكی سپی "

لە ( جابری كوڕی سمرە ) وە ( ﷺ ) فەرمووی " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " عصبة من أمتي يفتحون البيت ألئەبوض يعيى بيت كسرى " ٢

واتە : دەستەیەك لە ئوممەتەكەم كۆشكی سپی كەماڵی ( كسری )یە ڕزگار ئەكەن .

وە لە ڕیوایەتێكی تردا : " بێگومان كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم دەست بەسەر زێڕەكانی ( كسری ) دا دەگرن كەوا لە ( ئەبوض ) دا . [3]

سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ( ﷺ ) پاش جەنگی قادسیە دوو مانگ لە قادسیەدا مایەوە دواتر نووسراوی نارد بۆ پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) كەوا پێ ی ڕابگەیە نێت چی بكات .. ( عمر ) فەرمووی كە بەرەو ( مدائن )ی پایتەختی ( كسری ) بەڕێ كەون .. ئەوە بوو سوپا سەركەتووەكەی موسڵمانان بەڕێ كەوتن بەرەو ( مدائن ) و بەردەوام لەسەر كەوتنێكەوە بەرەو و سەركەوتنێكی دیكە دەڕۆشتن لە ( برس )ەوە بۆ ( بابل ) و ( بهر سیر ) تا سوپای موسڵمانان گەیشتە ئاراستەی بەرامبەر ( مدائن ) .. لەوێدا سەعد ( ﷺ) هەوڵیدا پەڕینەوە سوپاكەی لەڕێ ی كەشتی یەوە دئەبون كات ، بەڵام بۆی نەكرا لەبەر ئەوەی فارسەكان هەموو كەشتی یەكانیان دەست بەسەردا گرتبوو تاوەكو موسڵمانان سوودی لێ وەرنەگرن و ڕووبارەكەش زۆر بەرین و فراوان بوو ، لێوان بوو بە ئاو و لە توندی شەپۆلە یەك لە دوای یەكەكانیدا كە ملی دەهاویشت و بەڕادەیەكی زۆر ئاوەكەی بەرز بو بۆوە زیادی كرد بوو ... ئەوە بوو شەوێك لە شەوان سەعد ( ﷺ ) خەوێكی دی ، لە خەوكەیدا ئەسپەكانی موسڵمانان ئاوی بە شەپۆلی دیجلەی بڕی و تێپەڕاند ..

---

[1] - بڕوانە : البدایە ( ٥ / ١١٢ ).

[2] صحیح : مسلم و احمد ڕیوایەتیان كردووە .

[3] - صحیح : مسلم ڕیوایەتی كردووە ، فەرموودەكە : " لتفتحن عصابة من أمتي كنز ال كسرى الذي في الأبيض ".

## " تێپەڕینێکی بێ وێنە "

ئەوە بوو خەونەکەی سەعد هاتە دی و بڕیاریدا بە ڕووبارەکەدا تێپەڕن ، بۆیە سوپاکەی کۆ کردەوە و وتاری بۆ دان ، پاش ستایشی پەروەردگار فەرمووی : " لە ڕاستیدا دوژمنەکەتان بەم ڕوبارە خۆی لە ئێوە پاراستوو و بەبوونی ئەمە لە نێوانماندا بە دوژمنانمان ناگەین ، لە کاتێکدا کە ئەگەر ئەوان بیانەوێ دەدەن بە سەرتاندا بە کەشتی یەکانیانەوە .. وە ئێوە هیچ شتێك نی یە لێ ی بترسن ، چونکە ئەوان ئێستا گومانی ئەم پەڕینەوەی ئێمە نابەن و سەرباز و پاسەوانیان لەو دەورووبەرەدا نیە ، لەبەر ئەوە من وای دەبینم کە باشتر وایە ئێوە دەستِ پێشخەری بکەن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنەکەتاندا و نیەتی لێ بێنن ، پێش ئەوەی دنیا ئابلوقەتان بدات ، بزانن . من بڕیارمداوە کە ئەم ڕووبارەی نێوانمان ببڕم .. هەموو وتیان : لەسەر فەرمانی خوای پەروەردگار بۆ ئێمە و بۆ تۆش ئەو کارە بکە . "

سەعد هانی خەڵکەکەی دا بۆ پەڕینەوە و پاشان فەرمووی : " کێ دەستْ پێ دەکات و ( سەری پردەکە ) یان (کەنار ڕووبارەکەمان ) بۆ دەپارێزێت ، تاوەکو ڕێگرمان نەکەن لە پەڕینەوە ؟ "

ئەوە بوو ( عاصم ی کوڕی عەمری تمیمی ) هەڵبژارد لەگەڵ شەش کەس لە ئەهلی ( نجدات ) . ئەو پاڵەوانانە ڕوبارەکەیان بڕی و پاشان ( سەعد ﷺ ) بە خۆی و سوپاکەیەوە لە دوای ئەوان لە ڕووبارەکە پەڕینەوە ، بەم کارەشی ئەهلی فارسی سەرسام کرد کە هیچ حیسئەبوکیان بۆ نەکرد بوو .

سەعد لەو کاتەدا بەناو ڕووبارەکەدا دەڕۆیشت بەرەو کەناری ( اسبانیر ) دەیفەرموو : بڵێن : " نَستَعينُ بِاللهِ وَ نَتَوَكَّلُ عَلَيهِ ، حَسْبُنَا اللهُ وَنِعمَ الْوَكِيلُ ، وَ لاحَولَ وَلا قُـوَةَ أَلا بِاللهِ الْعَلِيِّ العَظِيمَ " واتە : پشت و کۆمەکیمان خودایە و خوامان بەسە ، و چاکترین کار پێ سپێرراوە ، وە هیچ گۆڕان و توانایەك نیە مەگەر بە خوای باڵاو مەزنەوە .

بەوجۆرە پلانەکەی سەعد سەرکەوتوو بوو بەڕادەیەك مێژوو نووسانی سەرسام کردووە سەرکەوتنێك کە سەعد خۆیشی وە هەروەها هاوەڵەکەی سەلمانی فارسی ، سەرسام کرد بوو.

سەعد دەیفەرموو : " هەر خوا پشت و پەنامانە و باشترین پەناگایە .. سوێندبێ بەزاتی پیرۆزی ... کە دۆستانی خۆی سەر دەخات و ئاینەکەی باڵادەست دەکات و

حاڵەتێكدا كەلەسەر نوێنێك بەسەر سنگیدا كەتبوو [1] نەیدە توانی سواری ئەسپەكەی بێت بە هۆی ئەو دوومەڵانەی پێوەی بوون . ئەوە بوو ( روستم ) كوژراو فارسەكان تێك شكان .. سوپاس و ستایش و منەت بۆ پەروەردگار .. كوژراوانی فارسەكان گەیشتە ( ١٠ ) هەزار كەس " .

## " رزگار كردنی ( بیت الثقبوض ) كۆشكی سپی "

لە ( جابری كوڕی سمرە ) وە ( ﷺ ) فەرمووی " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " عصبة من أمتي یفتحون البیت ألثقبوض یعیی بیت كسری " ٢

واتە : دەستەیەك لە ئوممەتەكەم كۆشكی سپی كەماڵی ( كسری )یە رزگار ئەكەن .

وە لە ریوایەتێكی تردا : " بێگومان كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم دەست بەسەر زێرەكانی ( كسری ) دا دەگرن كەوا لە ( ئقبوض ) دا . [3]

سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ( ﷺ ) پاش جەنگی قادسیە دوو مانگ لە قادسیەدا مایەوە دواتر نووسراوی نارد بۆ پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) كەوا پێ ی رابگەیە نێت چی بكات .. ( عمر ) فەرمووی كە بەرەو ( مدائن )ی پایتەختی ( كسری ) بەرێ كەون .. ئەوە بوو سوپا سەركەتووەكەی موسڵمانان بەرێ كەوتن بەرەو ( مدائن ) و بەردەوام لەسەر كەوتنێكەوە بەرەو و سەركەوتنێكی دیكە دەرۆشتن لە ( برس )ەوە بۆ ( بابل ) و ( بهر سیر ) تا سوپای موسڵمانان گەیشتە ئاراستەی بەرامبەر ( مدائن ) .. لەوێدا سەعد ( ﷺ) هەوڵیدا پەرینەوە سوپاكەی لەرێ ی كەشتی یەوە دئەبون كات ، بەڵام بۆی نەكرا لەبەر ئەوەی فارسەكان هەموو كەشتی یەكانیان دەست بەسەردا گرتبوو تاوەكو موسڵمانان سوودی لێ وەرنەگرن و رووبارەكەش زۆر بەرین و فراوان بوو ، لێوان بوو بە ئاو و لە توندی شەپۆلە یەك لە دوای یەكەكانیدا كە ملی دەماویشت و بەرادەیەكی زۆر ئاوەكەی بەرز بو بۆوە زیادی كرد بوو ... ئەوە بوو شەوێك لە شەوان سەعد ( ﷺ ) خەوێكی دی ، لە خەوكەیدا ئەسپەكانی موسڵمانان ئاوی بە شەپۆلی دیجلەی بری و تێپەراند ..

---

[1] - بروانە : البدایە ( ٥ / ١١٢ ).

[2] صحیح : مسلم و احمد ریوایەتیان كردووە .

[3] - صحیح : مسلم ریوایەتی كردووە ، فەرموودەكە : " لتفتحن عصابة من أمتي كنز ال كسری الذي في الأبیض ".

دوژمنەکەی تێک دەشکێنێت ، ئەگەر لەناو سوپاکەدا تاوانگەلێك یان ستەمێك نەبێ بدابەسەر چاکەکاندا " .[1]

( سەلمان )یش پێ ی وت : ئیسلام تازەیە ، سوێند بەخوا ڕووبار بۆیان سەری نەوی کردووە ، هەروەك چۆن وشکانی سەری بۆ یان نەوی کرد ، بەلاّم سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کۆمەڵ ، کۆمەڵ لێ ی دێنە دەرەوە وەك چۆن کۆمەڵ ، کۆمەڵ چوونە ناوی بە بێ ئەوەی لغاوی ولاّخێك لە دەست بدەن .

ئینجا دایان بەسەر ئاوەکەدا بە جۆرێ لەگەڵ کەنارەکەدا جیا نەدەکرایەوە و لە کەنارەکەوە ئاو نەدەبینرا .

بەو جۆرە لە ئاوەکە تێپەڕیان کردوو هاتنە دەرەوە هەروەك سەلمان دەڵێت : هیچ شتێکیان لە دەست نەچوو وە هیچ کەسێکیان لە ئاوەکەدا نقوم نەبوو ، جگە لە پیاوێك لە ( بارق ) بە ناوی ( غرقدە )وە کە لەسەر پشتی ئەسپە زەردەکەی خلیسکا .

" ئەبو عوسمان نهری " دەڵێت :

وەك لەبەر چاوما بێت وایە کاتێ ئەسپەکە لەبەر سەرما خۆی ڕاتەکاند و (غرقدە ) ی فڕیدایە ناو ئاوەکەوە ، لەو کاتەدا ( قعقاع ی کوڕی عەمر ) جڵەوی ئەسپەکەی خۆی بۆ هەڵدا تا دەستی پێوە بگرێت ، بەو جۆرە ڕایکێشا تا تێپەڕین لە ڕووبارەکە ، کابرای (بارق )ی کە پیاوێکی زۆر بەهێز بوو ، وتی / بەڕاستی خوشکەکان ( واتە ئافرەتان ) نەیانتوانیوە وێنەی پیاوێکی وەك تۆیان ببێ ئەی قەعقاع .[2]

## " سکالاّیەکی درۆ "

عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) سەعدی کردە والی ( کوفە ) .. ڕۆژان تێپەڕین ئەهلی کوفە سکالاّی سەعد یان لەلای ( عمر ) کرد ، وتیان : کە بە باشی نوێژ ناکات !!

جابر دەفەرمێ خەڵکی کوفە لەلای ئیمامی عومەر سکالاّیان لەسەعد کرد ، ئەویش سەعدی لابردو عەماری لەجێ دانا، هێندە سکالاّیان لەدەست کرد تا وتیان تەنانەت ناشزانێ بەجوانی نوێژ بکات،ئیمامی عومەر ناردی بەدوایدا پێی فەرموو باوکی ئیسحاق!

---

[1] - ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تاوان و گوناە هێزی لەناوچوون و بەهەلاکەت چوونی نەتەوەکانە .

[2] - تارخ الطبری و صلاح الامە ( ٣ / ٥٣٤ – ٥٣٦ ) .

ئەمانە دەڵێن نازانی بەجوانی نوێژ بکەیت،ئەویش فەرموی : بەخوا من بەجوانی نوێژ دەکەم،وەك ئەو نوێژەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیکرد ، بەبێ کەموو زیاد، لێی لانادەم، نوێژی شێوانیان بۆ دەکەم لە دوو رکاتی یەکەمدا کەمێ درێژیان دەکەم و سێهەمو چوارەمیش بەکورتی ، ئیمامی عومەر فەرموی:هەر گومانی وامان بەتۆ بوو، پیاوێ یا دوو پیاوی نارد لەگەڵیدا بۆ کوفە ، لەخەڵکی شار پرسیاری لەبارەوە کرد ،مزگەوتاو مزگەوت گەڕان لەهەمویاندا پرسیاریان لەبارەوە کرد، هەمویان تاریفیان دەکردو پەسنی چاکیان دەکرد، تا گەشتنە مزگەوتێکی بەنی عەبەس، لەناویاندا پایوێ هەستا ناوی ئوسامەی کوڕی قەتادە بوو،سەر ناویشی ئەبو سەعدە بوو، وتی: چوونکە داوای شایەتیمان لێدەکەن من سێ شتم لەسەری هەیە ، یەکیان ئەوەیە خۆی لەغەزا دەدزێتەوەو ناچێ لەگەڵ سوپادا،دەسکەوتو غەنیمەش بەیەکسانی و وەکو یەك بەش ناکات،لەداد پرسی و دادگاییشدا نادادگەرو ناعادیلە، سەعدیش فەرموی منیش سێ دوعا دەکەم : خوایە ئەگەر ئەم بەندەیەت درۆزنە، ئەم قسانە بۆ ریایی دەکات و بۆچاوەو رووپامایی هەستاوە ، تەمەنی درێژ بکە ،بەدرێژایی تەمەنیشی هەژاری بکە ، تووشی ئاژاوەشی بکە،دوایی هەرکات پرسیاری لێبکرایە دەیگوت پیرەمێردێکی دێوانە، نزاو دوعاکەی سەعد گرتومی ، عەبدول مەلیك ئەڵێ: من دوایی بینیم لەبەر پیری برۆکانی بەسەر چاویدا کەوتبوون رێگەی بەکچۆڵە دەگرت و چرنووکی لێدەگرتن.[1]

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : ئەو پیاوە نەمرد هەتا کوێر بوو دەستی بە دیوارەکانەوە دەگرت و وەها هەژار کەوت کە سواڵی دەکرد هەروەها کەوتە ناو فیتنەی ( المختار ) و تیایدا کوژرا .[2]

---

[1] ـ ئیمامی بوخاری بەژمارەی (٧٥٥) و ئیمامی موسلم بەژمارەی(٤٥٣) ریوایەتی ئەکەن.

[2] - ( موختاری ثقفی ) درۆزن کە ئیدیعای خوایەتی ئەکرد . بڕوانە : تاریخ الاسلام ( ٢ / ٣٦٩ – ٣٧٧ ) .

## " خۆبەکەنار گرتنی سەعد لە فیتنەکە "

کاتێ ئاژاوەکە ( فیتنەکە ) سەری هەڵدا و بڵاو بوویەوە ، کۆمەڵێك خۆیان لێ بەکەنار گرت لەوانە : سەعد کە دەیفەرموو : " من شەڕ ناکەم تاوەکو شمشێرێکم بۆ نەهێنن دووچاو و زمانێکی هەبێ وپێم بڵێ : ئەمە باوەڕدارە و ئەوە بێ باوەڕە " . [1]

عومەری کوڕی سعد ، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە کە عامری کوڕی هاتووە بۆلای ، سەعد فەرمووی : کوڕم ، ئەتەوێ سەرێك بم لەناو ئەو فیتنەیەدا ؟ نا بەخوا ، مەگەر شمشێرێکم بۆ بێنن کە لە موسڵمانێکم پێ دا خۆی لێ دورخاتەوە و لە بێ باوەڕێکم پێ دا بیکوژێ ، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو ، فەرمووی : " ان الله يحب الغني الخفي التقي " [2]

واتە : خوای پەروەردگار بێ نیازی پەنهانی لە خواترسی خۆشدەوێ .

زەهەبی دەڵێت :

سەعد خۆی بەکەنار گرت لە ئاژاوەکە و نە لە ( الجمل ) و ن: لە ( صفين ) و نە لە (التحكيم ) ئامادە نەبوو ، کە بەڕاستی سەعد کەسێکی شیاو بوو بۆ پێشەوایەتی و زۆر پلە و پایەی بەرز بوو . [3]

وە لە کاتی سەرەمەرگدا دەفەرمووێ : ـێ گومان پەروەدگارم سزام نادات ":– لە ( مصعب )ی کوڕی( سعد )ەوە ، دەڵێت : " سەری باوکم لە کۆشمدا بوو کاتێ دوا هەناسەکانی ژیانی دەدا ، گریام ، سەری بەرز کردەوە و فەرمووی : کوڕم ، بۆچی دەگرییەیت ؟ وتم : بۆ ئەم حاڵەی کە تۆی تیایە دەگریم .. فەرمووی : مەگری ، چونکە بەڕاستی خوا هەرگیز ئەشکەنجەم نادات و من لە ئەهلی بەهەشتم " . [4] پێشەوا (ذهبي) دەڵێت : وتم : ڕاست ئەکات بە خودا ، خۆشی لە خۆی .. [5]

---

[1] - پیاوانی جێ ی متمانەن : تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە ، هەیثەمی دەڵێت ، پیاوانی پیاوانی ( الصحیح )ن ، الجمع ( ٧ / ٢٩٩ ) .

[2] - اسنادەکەی · حسن )ە ، احمد ( ١ / ١٧٧ ) ، الحلیه ( ١ / ٩٤ ) ، ئەرنە ئوط دەڵێت ، ( حسن )ە ، سیر ( ١ / ١١٩ ) .

[3] - بڕوانە : سیر اعلام انبلاء ( ١ / ١٢٢ ) .

[4] - بڕوانە : طبقات ئیبنو سعد ( ٣ / ١ / ١٠٤ ) .

[5] - بڕوانە سیر اعلام النبلاء ( ١ / ١٢٢ ) .

## " بە بەرگی جیهادەوە کفن دەکرێ "

سەعد ( ﷺ ) پێش وەفاتی و لە کاتێکدا خۆی ئامادە ئەکات بۆ لیقای پەروەردگاری ، ئەوە لەبیر ناکات وانەیەکمان پێشکەش بکات .. ئەبێ بە چ جۆرێ بە لیقای خوای بالأدەست شاد بێ ؟ هیچ باشتر نەبونێتەوە لەبەرگی جیهاد .. کە نیشانەی شەرەف و ناونیشانی پیاوەتی یە ... خۆزگە قەومەکەم ئەمەیان ئەزانی .

لە ( الزهری ) وە ، دەڵێت : کاتێ سەعد کەوتە سەرەمەرگ داوای جبەیەکی خوری کردووە فەرمووی : بەمە کفنم بکەن ، چونکە ڕۆژی بەدر بەم بەرگەوە ڕووبەڕووی بێ باوەڕن بوومەوە و هەر بۆ ئەم ڕۆژەم هەڵگرتووە " [1]

ئەی ئوممەتی ئیسلام گوێتان لێ بێت ...

سەعد ( ﷺ ) لە زەمانی موعاوەیەدا پاش حەجی یەکەمی وەفاتی کرد لە تەمەنی (٨٣) ساڵیدا و ( مروان ) نوێژی لەسەر کردو لە ( بقیع ) بە خاکیان سپارد .. ( ڕەزای خوای لێ بێت ) .

[1] - تەبەرانی لە ( الکبیر ) دا ڕیوایەتی کردووە ، هەیثەمیش لە ( المجمع ٣ / ٢٥ ) دا باسی کردووە و دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن ، بەڵام زەهری بەسەعد نەگەشتووە .

## " ١٠ – سەعیدی كوڕی زەید ( رضي الله عنه ) "

### وە سەعید لە بەهەشتیانە"

**كێ یە ؟**

سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی عەبدعوزای قورەیشی عەدوی یە ..

هەر پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بچێتە ماڵی ( ارقم ) موسڵمان بوو و لە هەموو جەنگ و بۆنەكاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بەشداری كردووە جگە لە (بەدر ) .

لە ( عروە )وە ، دەڵێت : [1]

" سعیدی كوری زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نفیل پاش گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ) لە بەدر ، لە شامەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی بە ئاخاوتن كرد لەگەڵیدا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەو غنیمەتەی گرتبوویان بەشەكەی پێدا ، سعید فەرمووی / ئەمە پاداشتەكەمە ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ئەوەك وا دەزانن ، افی خۆمم نی یە ؟ فەرمووی / ئەوە پاداشتەكەتە .

هەروەها ئابلۆقە و فەتحی ( دیمەشق )ی بینیوە ، و ئەبو عبیدەی كوڕی جەڕاح كردوویەتی بەوالی بەسەر دیمەشقەوە [2]

وە یەكێكە لەو دە هاوەڵەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە . لە ( سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نفیل )ەوە ، ئەفەرموێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دە كەسی ژمارد و فەرمووی :

" ابوبكر في الجنة ، و عمر في الجنة ، و عثمان في الجنة ، و علي في الجنة ، و طلحة في الجنــة ، زبير في الجنة ، سعد في الجنة ، و عبدالرحمن في الجنة "

فەرمووی : " ابوبكر لە بەهەشتدایە ، و عمر لە بەهەشتدایە ، و عثمان لە بەهەشتدایە ، و علي لە بەهەشتدایە ، و تەڵحە لە بەهەشتدایە ، زبیر لە بەهەشتدایە ، سعد لە بەهەشتدایە ، و عبدالرحمن لە بەهەشتدایە " پێ وترا : نۆیەمیان كێ بوو ؟ فەرمووی : من بووم . [3]

---

[1] - دانە پاڵەكەی ( حسن ) : تەبەرانی ریوایەتی كردووە . بڕوانە : المجمع بە ژمارە ( ١٤٨٧٦ ) .

[2] - الاصابە ( ٤ / ١٨٨ ) ، ( الاستعیاب ) ی ئیبنو عبدالبر ( ٤ / ١٨٨ ) .

[3] - صحیح : صحیحی سوننەتەكانی ئیبنو ماجە ( ١١٠ ) .

هەروەها لە ( عبدالرحمن ی کوڕی عوف )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " ابوبکر في الجنة ، و عمر في الجنة ، و عثمان في الجنة ، و علي في الجنة ، و طلحة في الجنة ، زبير في الجنة ، سعد بن ابي وقاص في الجنة ، و عبدالرحمن في الجنة ، سعيد بن زيد في الجنة ، و ابو عبيدة بن الجراح في الجنة " [1]

فەرمووی : " ابوبکر لە بەهەشتدایە ، و عمر لە بەهەشتدایە ، و عثمان لە بەهەشتدایە ، و علی لە بەهەشتدایە ، و تەڵحە لە بەهەشتدایە ، زبیر لە بەهەشتدایە ، سعد لە بەهەشتدایە ، و عبدالرحمن لە بەهەشتدایە ، سعید بن زید لە بەهەشتدایە ، و ابو عبیده بن الجراح لە بەهەشتدایە "

زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نفیل ( باوکی سعید ) لەوانە بوو لە پەرستنی بتەکان پشتی هەڵکرد و بەدوای پەرستنی خوای تاك و تەنیادا هەڵات ، پێش پێغەمبەرایەتی (محمد ) ی ئازیزمان ( ﷺ ) ،لە شام گەڕا بەدوای ئاینی هەقدا و لەوێ جولەکە و گاورەکانی بینی ، بەڵام ڕقی لە ئاینەکەیان بووە و وتی : ئەی خوای پەروەدگار ئەوا من لەسەر ئاینی ( ئیبراهیم )م ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) ، بەڵام زەید لە ئاینی ( ابراهیم ) ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) بە گوێرەی پێویست شارەزا نەبوو کەسێکی واش نەبوو ڕێنمونی بکات بۆ لای ئەو ئاینە ، وە ئەم ( زید )ە لە ئەهلی ڕزگار بوانە ، وەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شایەتی بۆ داوە کە " يبعث امة واحدة " [2]

واتە : بە تەنها وەك ئوممەتێك زیندوو دەکرێتەوە .

هەروەها زەید کوڕە مامی پێشەوا ( عمری کوڕی خەتاب )ە [3] ، ئەم پیاوە پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) بینیوە ، بەڵام ئەوەندە نەژیاوە تاوەکو بەرنامەی ئیسلام ببینێت. [4]

لە خاتوو ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) ، فەرمووی ( زەیدی کوڕی عمری کوڕی نفیل )م بینی ڕاوەستا بوو پشتی نوساند بوو بە کەعبەوە و دەیوت : ئەی هۆزی قورەیش ، سوێند بەخوا لە خۆم زیاتر کەس لە ئێوە نەبونم لەسەر

---

[1] - صحیح : صحیح ی سونەتەکانی تیرمیزی ( ٢٩٤٦ ) ، المشکاة ( ٦١١٠ ، ٦١١١ )،تخرج الطاويه(٧٢٨).

[2] - بەم دەربڕینە ( يأتي امة واحدة ) تەبەرانی و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە. الجمع ( ٩ / ٤١٧ ) .

[3] - سعیدی کوڕی زید ، ( فاتمە )ی خوشکی پێشەوا عمری کوڕی خەتابی هێناوە ، چیرۆکێکی بەناوبانگیان هەیە لە موسڵمان کردنی ( عمر ) دا .

[4] - بڕوانە / سير اعلام النبلاء ( ١ / ١٢٦ ، ١٢٧ ) .

ئاینی ئیبراهیم بێ ، هەروەها ڕێگری ئەکرد لە زیندە بەچاڵ کردنی ئەو کیژۆڵانەی باوکیان دەیانویست زیندە بەچاڵیان کەن ، و بەباوکەکەی دەوت : مەیکوژە ، من بژێوی و خەرجی ئەوت لە کۆڵ ئەکەمەوە ، و ئەیبردە لای خۆی تا کەمێك پێ دەگەیشت ئەوسا بە باوکی کچەکەی دەووت : ئەگەر ئەتەوێ کچەکەت ئەدەمەوە ، ئەگەر ناشتەوێ ئەوا هەر خۆم بژێوی ئەدەم . [1]

هەروەك قورەیشی بەوە عەیبدار ئەکرد کە لەکاتی سەر برینی ئاژەڵدا ناوي خوای تاك وتەنها یان نە ئەبرد ، ئەیوت : " مەڕو ماڵات خوا دروستی کردوون و لە ئاسمانەوە دایبەزاندووە و لەزەویش خۆراکی بۆ وەبەرهێناوە ، کەچی دوایی ئێوە لەکاتی سەربڕیندا لە جیاتی ئەوەی ناوی خوای لەسەر بێنن ، ناوی غەیری خوای لەسەر دەهێنن . ( بوخاری ڕیوایەتی کردووە )

هەرچی سەعیدی کوڕیەتی ئەوا بە هۆی ئیسلام بوونیەوە بەشی خۆی ئەشکەنجە و ئازاری چەشتووە .

لە قەیسی کوڕی حازمەوە ، دەڵێت : سەعیدی کوڕی زەید فەرمووی : " دەبینی ، عمری کوڕی خەتاب پێش ئەوەی موسڵمان بێ لەسەر ئێسلامەتیم ئەیبەستمەوە ، بەڵام دواتر دەستی باڵای لەسەر خستنی ئیسلامدا هەبوو ( رضي الله عنه ) . [2]

## " چەند لاپەرەیەکی پرشنگداری لە جیهادی ( رضي الله عنه ) "

سەعیدی کوڕی زەید بەباشترین شێوە تاقیکراوەتەوە لە پێناوی پەروەردگاریدا بە ئەوپەڕی لێبوردەیی و خوا ویستی یەوە خەباتی کردووە :

---

[1] - صحیح : بوخاری بەهەڵپەسێراوی لە ( المناقب ) ( ٣٨٢٨ ) دا ڕیوایەتی کردووە ، ( حاکم )یش بە (صحیح) دایناوە ( ٣ / ٤٠٤ ) زەهەبیش لەسەرمان رایە .

[2] - صحیح / بوخاری ڕیوایەتی کردووە (٣٨٦٢) لە ( باب )ی ( من اختار الضرب و القتل و الهوان على الكفر).

" خەباتی سەعید ( ﷺ ) ڕۆژی ( أجنادین ) "

لەو ڕۆژەدا سەرکردەی ئەسپسوارەکان بوو ، لە بەهێز ترینیان بوو ، هەر ئەویش بوو کە پێشنیاری کرد بۆ خالدی کوڕی ولید بەدەستپێکردنی شەڕ لە ڕۆژی ( اجنادین ) دا ، کاتێ ڕۆمەکان موسڵمانانیان کردە ئامانجی تیرەکانیان ، ئەوەبوو سەعید هاواری کردە خالد و فەرمووی : " لەسەر چی ببینە ئامانج بۆ ئەو خوانەناسانە ، و ئەوەندە تیریان بۆ هاویشتین تاوەکو ئەسپەکانمان وایان لێ هات ڕێگریمان بکەن لەوەی بچینە سەر پشتیان " .

ئینجا ( خالد ) بەرەو لای موسڵمانان هات و فەرمووی : " بەناوی خوا ، خۆتان توندکەنەوە ، ڕەحمەتی خواتان لێ بێت " . بەو جۆرە خالد و موسڵمانانیش لەگەڵیاندا چەکەکانیان بەڕووی ڕۆمەکاندا بەرز کردەوە و ئارامیان لەسەر دووجار هێرشی ڕۆمەکان گرت ، جارێک لەلای ڕاستیانەوە جارێك لەلای چەپیانەوە ، پاشان سوپای موسڵمانان بەرەو ڕۆم ڕۆیشت کە ڕۆمیەکان نەیانتوانی بۆ کاتێکی کەمیش بێ لەبەردەمیاندا ئارام بگرن و زۆر خراپ شکستیان خوارد و موسڵمانان هەر چۆن بیانویستایە لێیان ئەکوشتن وسەربازگە و هەموو ئەوانەش لەسەربازگەکەیاندا بوو دەستیان بەسەردا گرت .

" خەباتی سەعید ( ﷺ ) ڕۆژی ( یرموك ) "

( حبیب ی کوڕی سلمە ) دەڵێت : ڕۆژی یەرموك زۆر پێویستیان بە سەعید بوو ، خوا پاداشتی بداتەوە ، بەڕاستی ئەو ڕۆژە هەروەك شێر بوو ، کاتێ لە ڕۆمەکانی ڕوانی وەك ئەوەی بترسێ ، لەسەر ئەژنۆ چۆکی دادا تا ئەوەندەی ڕۆمەکان لێ ی نزیك بوونەوە یەکسەر بە ڕویاندا هەروەك شێر بڵند بوویەوە و بە حەربەکە دای لە یەکەمین پیاویان و کوشتی و سوێند بەخوا بەردەوام لە سەرپێ شەڕی ئەکرد وێنەی کەڵەپیاوە چاو نەترسەکان ، وەك ئەسپ سواران هەڵمەتی دەبرد ، لەڕاستیدا سۆزی خەڵکی بۆلای خۆی ڕاکێشا بوو .[1]

" دوعایەك و وەڵامێك لە پەروەردگارەوە "

لە ( هشامی کوڕی عروە ) وە ، ئەمیش لە باوکیەوە ، دەگێڕێتەوە کە ( أروای کچی اویس ) ئیدعای ئەوەی کردکە سەعیدی کوڕی زەید شتێکی لە زەوی یەکەی

[1] - تاریخ ی ئیبنو عسکر ( ١ / ٥٤١ ) ، و صلاح الامەی ، د . سید العفانی ( ٣ / ٣٥٦ ، ٣٥٧ ) .

داگیر کردووە ، بۆ ئەمەش لای ( مروان ) سکالای سەعیدی کرد .. سەعیدیش (ﷺ) فەرمووی : من کەسێك نیم کە لە زەوی ئەوبەرم پاش ئەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو ، فەرمووی : هەرکەس بە ناهەق و ستەم شتێك لە زەوی خەڵکی داگیر کات ئەوە لە قیامەتدا خودا ئەیباتە ناو حەوت تەبەقەی ( چینی ) زەویدا . مەروان وتی : پاش ئەم فەرموودەیە ئیتر داوای بەڵگەی دیکەت لێ ناکەم ، سەعیدش ( ﷺ ) فەرموی : " ئەی خوایەگیان ، ئەگەر ئەو ژنە درۆ ئەکات و ڕاست ناڵێت ، ئەوا چاوەکانی کوێر کە و هەر لە ناو زەوی یەکەیدا بە کوشتی بدە " ئەوە بوو ژنەکە چاوەکانی کوێر بوون و کاتێ بەناو زەوی یەکەیدا دەڕۆیشت کەوتە ناو چاڵێك و مرد .[1] بڕوانە ... خوێنەری بەڕێز چۆن تۆمەتی ناپەسەند و ناهەق دەدرێتە پاڵ شەرەفمەندان .. لە کاتێکدا هەندێ جار ئەو تۆمەتانە لەکەسانێکەوەیە کە خۆیان ئەهل و شایستەی تاوانەکەن ، چەندەها تاوانبار هەن لە دەرەوەی قەفەزی تاوان ڕادەبوێرن و چەندەها بێ تاوانیش یان چاکە خوازیش بونەتە ئامانجی تیری تەڵەکە بازان ، بەڵام پاداشت و جەزا لە کۆتاییدا بەسە پێشگری هەموو کارەکان بێت و سەر بڵندی بۆ بێ تاوان و سەر شۆڕی بۆ تاوانباران دەمێنێتەوە : ﴿ ... وَقَدْ خَابَ مَنْ افْتَرَى ﴾ سورة طه ، آیـة ٦١ . واتە : وە بەڕاستی ئەوەی شتی ناڕەوای هەڵبەستووە نا ئومێد و ڕەنجەڕۆ بووە .

ئەوەشی دڵنەوایی بێ تاوانان ئەکات ئەوەیە کە دەزانن تەنانەت پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) دوورنەبوو لە تانەی شەیتانەکانی مرۆیی " ئەوەتە لە غەزای ( حنین ) دا کۆمەڵێ خەڵك دەستیان بە بۆڵە بۆڵ کرد و دەیانووت کە سوێند بەخوا ئەم دابەشکردنە دادپەروەرانە نیە و لە پێناوی خوادا نیە !! [2]

سەعید ( ﷺ ) ، ساڵی ( ٥١ )ی کۆچی لە ( عقیق ) کۆچی دوایی کرد و لە (مدینە) بە خاکیان سپارد پاش ئەوەی سعدی کوڕی ئەبی وەقاص شۆردی و سەعد و ئیبنو عومەر چوونەتە ناو گۆڕەکەی .. ئەوکاتە سەعید حەفتا و ئەوەندە ساڵ بوو ... خواش باشتر دەزانێ ..

---

[1] - صحیح : مسلم لـه ( المساقاة ) ( ١٦١٠ ) ، ( ١٣٩ ) دا ڕیوایـەتی کردووە لـە ( بـابی / تحریم الظلم و غضب الأرض.

[2] - بڕوانە : الحدود فی الإسلام . د . محمود عمارە ( لاپەڕە ١٤٨ ) .

یحیی کوڕی سعید ، دەڵێت : نافع بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە بەسەر سعیدی کوڕی زەیددا ڕۆژی هەینی پاش بەرز بوونەوەی هەتاو هاوار کرا (هاواری مەرگی کرا ) ئەوە بوو ، ئینوعومەر هات بۆ لای لە ( عەقیق ) و وازی لەجمعەکەی هێنا .[1]

نووسەر دەڵێت : ئەمەش بەڕاستی کەرامەتێکی ترە ، ئەو تا لە عبداللە ی کوڕی عمر ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " ما من مسلم يموت يوم الجمعة ليلة، الجمعة ، الاوقاه الله فتنة القبر " .[2] واتە : هەر موسڵمانێك ڕۆژی هەینی یان شەوی هەینی وەفات بکات ، ئەو بێ گومان خوای پەروەردگار لە ناڕەحەتی گۆڕ دەیپارێزێت .

---

[1] - صحیح / بوخاری ریوایەتی کردووە لە ( المغازی ) دا بە ژمارە ( ٣٩٩٠ ) هەروەها ( حاکم )یش ، وە پیاوانی جێ ی متمانەن . سیر ( ١ / ١٣٩ ) .

[2] - ئەلبانی دەڵێت : احمد ریوایەتی کردووە ( ٦٥٨٢ — ٦٦٤٦ ) لەگەڵ ( تیرمیزی )شدا ، شاهیدیش هەیە ( انس و جابری کوڕی عبداللە و غەیری ئەوانیش . واتە فەرموودەکە لە گشت ڕێگەکانیوە ( حسن ) یان (صحیح)ە . بڕوانە احکام الجنائز ( ٣٥ ) .

## ١١ - حەمزەی كوڕی عبدالمطلب ( رضي الله عنه )
## " شێری خودا ( جل جلاله ) و شێری پێغەمبەرەكەی ( ﷺ ) "

میوانی ئەم چەند لاپەڕەیەمان یەكێكە لەو كەڵە پیاوانەی یاد كردنەوەیان دڵەكان دەژێنێتەوە ، ئەویش : -

(حمزەی كوڕی عبدالمطلب كوڕی هاشمی كوڕی عبدمناف ) ە ، حەمزە پێشەوای پاڵەوان و شێری خودا و گەورەی شەهیدان ، وە مامی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هەروەها برای شیرییەتی . حەمزە موسڵمان بوو ، بە موسڵمان بوونیشی بووە عیززەت و توانا بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ )و بۆ موسڵمانان ، ئەویش لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە ماڵی ( الارقم ) .[1]

### " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( جابری كوڕی عبدالله )وە ( رضي الله عنه ) لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) ڕیوایەتی دەكات : فەرمویەتی : " سيد الشهداء حمزة عبدالمطلب " [2] ، واتە : گەورەی شەهیدان (حەمزەی كوڕی عبدالمطلب)ە .

٢- وە لە سعدی كوڕی ئەبو وەقاصەوە ( رضي الله عنه ) دەفەرموێ :" لە جەنگی ئوحود دا حەمزە لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) شەڕی دەكرد و دەیفەرموو : من شێری خودام "* .

### " سەرەتای موسڵمان بوونی "

كاتێ خوای پەروەرگار چاكەی بۆ كەسێك دەوێ ، ئەوا هۆكارەكانی بۆ ئاسان دەكات .

لە محمد ی كوڕی كعبی قورتوبییەوە ، دەڵێت : موسڵمان بوونی حەمزە( رضي الله عنه ) لە جوامێری و پیاوەتی یەوە سەرچاوەی گرت . ئەو پیاوێكی تیر وەشێن بوو ، وە لە

[1] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ١٩٥ ) .

[2] - فەرموودەی ( حسن )ە ، بە هەموو ڕێگەكانیەوە . حاكم لە ( المستدرك ) دا ڕیوایەتی كردووە . بڕوانە (فضائل صحابه النبي )ی ( عدوی ) ( ٢٧ ) .

* ئیسنادەكەی (صحیح)ە: حاكم لە (المستدرك) دا ڕیوایەتی كردووە. (فضائل الصحابه)ی عدوی (٢٧).

حەرەمی مەککە دەچووە دەرەوە بۆ ڕاو کردن و کاتێ ئەگەڕایەوە و بەدانیشتنەکانی (مجالس ) قورەشیدا تێپەڕ ئەبوو لەلای صەفادا ، دەیفەرموو وەها و وەهام هاویشت و ئەوە و ئەوەم کرد ، ئینجا دەچووە ماڵەکەی .

ئەوە بوو جارێ لە ڕاو کردن دەهاتەوە ، ئافرەتێکی پێ گەیشت پێ ی وت : ئەی ئابو عەممارە دەزانی برازاکەت چی چەشتووە ؟ ( مەبەستی پێغەمبەری خوا یە ) ( ﷺ ) بە دەستی ئەبو جەهلی کوڕی هشام ؟ لە جنێو پێدان ودەست لێ کردنەوە و ... کارگەلێکی دەرهەق ئەنجام داوە ... ئەو کاتە حمزە ( رضي الله عنه ) هێشتا موسڵمان نەبوو بوو ، فەرمووی : کەس بەو حاڵەوە بینیویەتی ؟ وتی : بە بەرچاوی خەڵکەوە ئەم کارەی کرد .

حەمزە هات .. تا گەیشتە ئەو دانیشگەی لای صەفا و مەروەدا بوو ، بینی خەڵکانێك دانیشتوون و ئەبو جەهلیان لەناودایە ، حەمزە دەستی لەسەر کەوانەکەی دانا ( خۆی بەکەوانەکەوە ڕاگرت ) و فەرمووی :

ئەمڕۆ وەها و وەهام هاویشت و ئەوە و ئەوەم کرد ، پاشان هەردوو دەستی بەکەوانەکەیەوە جووت کرد و کێشای بە نێو گوێچکەکانی ئەبو جەهل دا و فەرمووی : چیت لە دەست دێت درێغی مەکە ، ئەوا من شایەتی ئەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و لەلایەن خواوە هەق و ڕاستی هێناوە .

وتیان : ئەیٰ ئەبو عەممارە ، ئەو قسەی بە خواکانمان و تووە ، هەتا ئەگەر تۆش بویتایە کەلەلامان لەو باشتری ، بە کارێکی وەها کە لێت بوەشێتەوە ڕازی نەئەبوین ، وە تۆ ئەی ئەبو عەممارە پیاوێکی خراپەکار نەبوویت .[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : -

ئەبو جەهل لە صەفا ڕێگەی بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گرتووە ئازاری داوە ... حەمزەش ( رضي الله عنه ) کە خاوەنی جوامێری لێهاتووی یەکی زۆر بوو لە تیرهاوێژی و ڕاوکردندا ، لەو ڕۆژەدا تیرو کەوانەکەی پێ بوو .. کاتێ گەڕاوەتەوە خێزانەکەی ئەوەی ئەبو جەهل دەرهەق بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەنجامی دابوو گەڕاندەوە ، ئەم بینیویەتی ، وتویەتی : ئەی ئەبا عەممارە ، ئاگات لێ نەبوو ئەبو جەهل چی بە برازاکەت کرد ! حەمزەش تووڕە بووە و هەر بەو کەل و پەلٚ ڕاوەوە ڕۆشتووە و کەوانەکەی لە گەردنیدا

[1] - تەبەرانی بە ( مرسل )ی ڕیوایەتی کردووە ، پیاوانی فەرموودەکە پیاوانی ( صحیح )ن الجمع بە ژمارە ( ١٥٤٦٠ ) .

ئالآنـدووە تـا گەشـتوەتە مزگـەوت لـەویّ ئـەبو جـەهلی لەگـەلّ کۆمـەلّیّ خەلّکیـدا لـە دانیشگەکەیاندا بینیوە ، لیّ ی چووتە پێشەوە بیّ ئەوەی هیچ بلّیّ بە کەوانەکەی سەری ئەبو جەهلی بەرز کردەوەتەوە و بریندداری کردووە .

لەوێدا کۆمەلّیّ پیاو لە قورەیش هەلّساون دەستی حەمزە یان گرتووە تا ئازاری ئەبوجـەهل نـەدا .. حـەمزەش ( ﷺ ) فەرموویـەتی : ئـاینی مـن ئـاینی ( محمـد ﷺ )ە ، شـایەتی ئـەدەم کە ئەو پێغەمبەر و نێرراوی خوایە .. وە سوێند بـە خـوا لـەو ئاینـەش لانادەم ، ئێوەش ئەگەر ڕاست ئەکەن ( ئەگەر ئەتوانن ) ڕێگریم بکەن .

بەو جۆرە کاتیّ حەمزە موسلّمان بوو ، بوە پالّپشت و هێز و توانا بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆ موسـلّمانان ، وە هەندیّ لە کاروبارەکـانی بۆ جێگیر کـردن و قورەیشی توشی ترس کرد . ئەوان ئەیانزانی کە حەمزە ( ﷺ ) پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکات .[1]

حـەمزە ( ﷺ ) کـە ئـەم وشـانەی بـە قـورەیش دەوت ، هاوکـات لەگـەلّ وتنـی ئـەو وشانەدا ڕەحمەتی ئیلاهی بۆی دادەبەزیّ و سنگی بۆ ئیسلام فراوان دەبیّ و دەچێتە ژێر ئالآی هەق و دەبێتە کەسایەتی یەکی وەها لە هـەموو جیّ و سـەردەمێکدا نموونە بێت بۆ جوامێری .

ئیسلام بوونی حەمزە ( ﷺ ) شۆکێکی قورس و زللەیەکی توند بوو بۆ قورەیش .. جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەم ئاینە تازە ڕێگای بلآو بوونـەوەی گرتووەتە بەر بەبیّ ئەوەی هیچ ڕێگرێك بتوانیّ ڕێگای پیّ بگرێت .

پاشـان ڕۆژان تێپەڕین و پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) و موسـلّمانان کۆچیان کـرد بـۆ مەدینە و لەویّ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی بـەدانانی بنچینەکانی دەولّـەتی ئیسلامی کرد و زۆری پـیّ نەچوو جەنگی بەدری گـەورە ڕووی دا کـە حـەمزە ( ﷺ ) پالّەوانی ئـەو جەنگە بوو .

## " چەند لاپەڕەیەکی پڕشنگدار لە جیهادی حەمزە ( ﷺ ) "

یەکەمین لیوایەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێکەوەی نا کاتیّ هاتە مەدینە ، بۆ حەمزە بوو ( ﷺ ) .

[1] ئەبەرانی ( مرسل )ی ڕیوایەتی کردووە . پیاوانی جیّ متمانەن . الجمع بە ژمارە ( ١٥٤٦١ ) .

## " ڕۆڵی حمزە لە غەزای بەدر دا "

یەکەمین هەڵگیرسێنەری غەزاکە ( ئەسوەدی کوڕی عبدالاسد )ی مەخزومی بوو کە پیاوێکی دڕندە و بەد ڕفتار بوو ، هاتە دەرەوە و وتی : پەیمان ئەدەم بە خواکانم کە ئەبێ لەو حەوزەیان بخۆمەوە یاخود بیڕوخێنم یان بمرم . [1] ئەوە بوو کاتێ لە ڕیزەکان هاتە دەرەوە ، حەمزەش بۆی هاتە دەرەوە ، کە بەیەك گەیشتنن حەمزە شمشێرێکی لێدا و قاچی لە ڕانیەوە لەت کرد ئەویش بەسەرپشیدا کەوت و خوێنی قاچی بەرەو هاوڕێکانی جۆگەلەی بەست ، پاشان بەرەو حەوزەکە بە سنگە خشێ ڕۆیشت تا گەیشتە لای حەوزەکە دەیویست سوێندەکەی بە جێ بێنێت ، بەڵام حەمزە ( ﷺ ) شمشێرێکی تری لێ داو و لەناو حەوزەکەدا کوشتی . [2] ئەمە یەکەمین کوشتن بوو کە ئاگری شەڕی بەدری هەڵگیرساند .

## " بەرانبەرکێ (ڕووبەڕووبونەوە) "

پاش ئەمە سێ ئەسپ سوار لە باشترین ئەسپ سوارەکانی قورەیش کەلەیەك خێزان بوون هاتنە مەیدان ، ئەوانیش ( عوتبە و شەیبەی برای کە کوڕی ڕەبیعە ) بوون لەگەڵ (ولیدی کوڕی عوتبە ) کاتێ لە ڕیزەکان جیابوونەوە داوای بەرامبەرکێیان کرد . ئەوەبوو چەند لاوێکی ئە نصاری هاتنە مەیدان کە ( عوف و معوزی کوڕانی حارس ) بوون کە دایکیان ناوی ( عفرا ) بوو لەگەڵ ( عبداللە ی کوڕی ڕواحە ) ، وتیان :ئێوە کێن ؟ فەرموویان :

کۆمەڵێکن لە پشتیوانان وتیان : ئێوە هاوشان و جوامێرن ، بەڵام کارمان بە ئێوە نیە ، بەڵکو کوڕە مامەکانمان دەوێت ، ئینجا بانگکەرێکیان هاواری کرد : ئەی محمد هاوشانەکانمان لە خزمانمان بۆ بێنەرە مەیدان . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : هەڵسە ئەی عبیدەی کوڕی حارس و هەڵسە ئەی حەمزە و هەڵسە ئەی علی . [3]

---

[1] - موسڵمانان حەوزێکیان دروست کرد بوو لە پشت سوپاکەوە تا ئاوی لێ بخۆن .

[2] - بڕوانە : الرحيق المختوم ( ١٩٦ ) .

[3] - فەرموودەکە : " قم ياعبيدة بن الحارث ، و قم ياحمزة ، و قم يا علي "

هەر سێ هاوەڵی بەڕێز هەڵستان و لە بێ باوەڕان نزیك بوونەوە . پرسیان : ئێوە کێن ؟ ئەوانیش هەواڵیان پێدان کە کێن . ئینجا بێ باوەڕان وتیان : باشە ، ئێوە هاوشانی ئێمەن . ئەوە بوو عبیدە ( کە لە هەمووان بە تەمەنتر بوو ) لەگەڵ عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ڕووبەڕوو بوویەوە ، حەمزەش لەگەڵ شەیبەو علی کوڕی ئەی تالیب ( ڕەزای خوای لێ بێت ) لەگەڵ وەلید دا ڕووبەڕوو بوویەوە .[1]

( حمزە و علی ) ، هیچ مۆڵەتی بەرامبەرەکەیان نەدا و خێرا کوشتنیان ، بەڵام عبیدە چەند لێدانێك لە نێوان ئەو و بەرامبەرەکەیدا ڕووی دا و هەریەکەیان ئە وی تری بریندار کرد ، پاشان علی و حمزە دایان بەسەر عوتبەدا و کوشتیان و هاوەڵەکەیان هەڵگرت کە قاچی بریندار کرا بوو .. ئەو هاوەڵە بەڕێزە هەر بەبرینداری مایەوە تاوەکو پاش چواریان پێنج ڕۆژ لە دوای شەڕی بەدر لە ( صفراء )گیانی سپارد ، ئەو کاتەی کە موسڵمانان بەرەو مەدینە دەگەڕانەوە .[2]

لەو جەنگەدا ( حمزە ) ( رضي الله عنه ) ژمارەیەکی لە بێ باوەڕان کوشت و بە پەڕێکی نەعامە جیا دەکرایەوە .

( عبدالرحمن کوڕی عوف ) دەفەرموێت : ئومەییەی کوڕی خەلەف پێی وتم : ئەی ( عبدالا لە ) ئەو پیاوە کێ بوو کە ڕۆژی بەدر پەڕێکی نەعامەی لەسەر سنگیەوە بوو ؟ وتم : ئەوە ( حمزەی کوڕی عبدالمطلب ) ی مامی پێغەمبەری خوا یە ( ﷺ ) . وتی : ئا ئەوە چ کارێکی پێ کردین ئەو ڕۆژە ![3]

---

[1] - لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە ل ابی داوودەوە : کەعبیدە لەگەڵ وەلید و علی لەگەڵ شەیبە حمزە لەگەڵ عوتبە ڕووبەڕوو بوونەتەوە . ( صحیح ) ی سوننەتەکانی ئەبی داوود بە ژمارە ( ۲۳۲۱ ) .

[2] - بڕوانە / الرحيق المختوم ( ۱۹٦ ) .

[3] - هەیثەمی دەڵێت : ( البزار ) لە دوو ڕێگاوە ڕیوایەتی کردووە لە یەکێکیان دا لە مامۆستای ( علی بن الفضل المراسبی ) بوو کە نەمدەناسی و باقی پیاوانی ( صحیح )ن ڕێگەکەی تر ( لاوازە ) . بڕوانە الجمع بە ژمارە ( ۹۹۷٦ ) .

## بە دوو شمێشر لە ڕۆژی ئوحود دا دەجەنگێت

لە ( عمیری کوڕی اسحاقەوە ) ، دەفەرموێ ( حمزەی کوڕی عبدالمطلب ڕۆژی ئوحود لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بە دوو شمێشر شەڕی ئەکرد و ئەیفەرموو : من شێرێ خودا و شێری پێغەمبەرەکەیم ( ﷺ ) .[1]

## " وێنەیەکی زیندووی مەیدانی جەنگەکە "

گەرمەی شەڕە و حەمزە بەشمشێرەکەی گەردنی بێ باوەڕان دەدورێتەوە ( یحصد ) چۆن دورانەوە یەك ، ( وحشی )ش کە بۆ تەنها کارێك هاتبووەناو ئەم مەیدانی شەڕەوە ،ئەویش کوشتنی حمزەیە ، ئەگەر توانی بیکوژێ ئەوە ( جبیری کوڕی مطعم ) لە کۆیلەیەتی ئازادی ئەکات .

" وەحشی لە پشت دارێکەوە وەستاوە قەمەکەی ( حەربەکەی ) بە دەستەوەیە و چاودێری جوڵەکانی ( حمزە ) دەکات و دەنگی جبیری کوڕی مطعم لە خەیاڵیدا دەزەنگێتەوە کە دەڵێت : ئەگەر حمزەی مامی محمدت لە تۆڵەی مامم کوشتەوە ،[2] ئەوە تۆ ئازادیت تەنها لێدانێکە لەسەر سنگی حەمزە و پاشان ئازاد ئەبی... بۆیە بەردەوام شوێن حەمزە دەکەوت بە چاوەکانی ، حەمزەش ( رضي الله عنه ) بەردەوام بە شمشێرەکەی بێ باوەڕانی تەفروتونا ئەکرد ، هەروەك شێرێك کەڵبەکانی تیژ کردبێتەوە دەیدا بە سەریاندا و بەیەك لێدان لە جووڵەی ئەخستن و ئەیفەرموو : " من شێری خودا و شێری پێغەمبەرەکەیم " .

حەمزە یەکێکی دا لە پیاوێك و سەری لە لاشەی جیا کردەوە ، لەوکاتەدا (وحشی) کە بەردەوام لە چاودێریدا بوو خۆی گرد کردەووە ، حەمزە کە ( ٣٠ ) پیاوی تەنها لە قورەیش کوشتبوو ، خۆ ئەگەر ئاوڕی بەلای دارەکەوە بدایەتەوە وئەوەی بە خەیاڵدا بهاتایە کە ( وحشی ) خۆی بۆ مەلاس داوە ، ئەوا وەك هەورەگرمە دەیدا بەسەریدا و دەیکوشت پێش ئەوەی ئازادی ببینێت.

[1] - حاکم ریوایەتی کردووە ( ٣ / ١٩٦ ) دەڵێت : ( صحیح ) د زەهەبیش هەمان رای هەیە هەیثەمی دەڵێت تەبەرانی ریوایەتی کردووە بەگوێرەی وتەی ئەو پیاوانی فەرموودە پیوانی ( الصحیح )ن.الجمع بە ژمارە (١٥٤٦٣).

[2] - حمزە ( رضي الله عنه ) رۆژی بەدر مامی ئەمی کوشتبوو .

بۆیە خێرا ( وحشی ) حەربەکەی بە ئاراستەی حەمزە ڕاست کردووە و پێش ئەوەی هەڵیدا ، حەمزە ڕووی لە ( سباع ی کوڕی عبدالعزیز ) کردوو ، پێ ی فەرموو: وەرە پێشەوە ، ئەی کوڕی خەتەنەکارەکە .

ئەوە بوو ( ام انمار ) ی دایکی کە خزمەتکاری ( شریق ی باوکی اخنس ) بوو ئافرەتێك بوو خەتەنەی ئافرەتانی دەکرد لە مەککە . ( سباع )ی کوڕیشی کەسێکی دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەی بوو .. یەکێ بوو لەوانەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە درۆ دەزانی بۆیە حەمزە ( ﷺ ) خۆی بۆ توند کردەوە و شمشێرێکی بەسەردا بەرزکردەوە و لێ ی دا . هەرچی ( سباع )یشە هێندەی چاو تروکانێك کەوتە سەر زەوی و دوایین هەناسەکانی ژیانی هەڵمژی .

بەمە دەروونی ( وحشی ) هاتەوەیەك ، چونکە ئەمە سێ و یەکەمین کوژراوی دەستی حەمزە بوو ، بۆیە ترس دڵی وەحشی داگیر کرد لەوەی شەڕەکە بە دۆڕان و شکستی قورەیش کۆتایی بێت بێ ئەوەی ئەم توانیبێتی ( حمزە ) بکوژێ و بە و جۆرەش هەتا هەتایە بە کۆیلەیەتی بمێنێتەوە ، بۆیە ئەمجارە بە ئەوپەڕی وردی و عەزیمەتەوە خۆی بۆ مەڵاس داو سەرنجی هاتن و چوونەکانی دەدا لە نێوان لاشەی بێ باوەڕاندا ، بەڵکو لە فرسەتێکدا بتوانێ بیکوژێ و ئازاد بێ .

وە خالد کوڕی وەلید و عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل [1] و چەند ئەسپ سوارێك لە قورەیش دایانەوە بەسەر موسڵماناندا ، دەبینن تیری ئەو تیر ئەندازانەی کە پشتیان بەکێوی ئوحودەوە دابوو بە ئاسماندا بلاو بووەوە بە ئاراستەی چاو وگەردن و سنگی ئەسپەکانیان ، بۆیە ئەسپ سوارەکان پشتیان هەڵکرد و لەناو دۆڵەکەدا بلاو بوونەوە تا لەوێ ببنەوە بە ئامانجی شمشێرەکانی حەمزە و علی و زبیر و ئەبو دجانە و کەڵە پیاوانی موسڵمانان ...

هاوار لە سەر کێوی ئوحود بەرز بوویەو و موسڵمانان هاواریان ئەکرد : ( امت ، امت ) [2] و موژدەی سەرکەوتنی خوایی یان دەدا ، بێ باوەڕانیش هاواریان ئەکردە لات و عوززا .

---

[1] - ئەو کاتە خالد و عکرمە ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) هێشتا موسڵمان نەبوو بوون .

[2] - بەمانای ئەوە دێت کە وا دەی خوداهاتەدی و فەرمانی جێ بەجێ بوو .

لەو لایشەوە ئافرەتانی قورەیش مـوژدەی ورەی جەنگاوەرانیان بـەدەف لێدان بەرزدەکردەوە ، حەمزەش هاتـە پێشەوە و شمێشرەکەی بـە دەستەو لـە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا شەڕی دەکردوو دەیفەرموو : " من شێری خودام .... "

لەو کاتەدا قاچی لە زەوی هەڵکەوت و بەسەر پشتیدا کەوت و زرێکەی ( درع ) بەری لەسەر سکی لاچوو .. هەرچی ( وحشی ) یە ئەم هەلەی قۆستەوە کە لە سەرەتای شەڕەکەوە چاوەڕێ ی بوو ، بۆیە حەز بکەی خستە جووڵە و ئاراستەی (حمزە ) و بۆی هەڵدا .. حەربەکە بە موسلدانی دا ڕۆشت و لەنێو لاقەکانیدا هاتەوە دەرەوە .

لەوێدا هاوارێکی بێ دەنگ لە حەمزەوە دەبینرا .. و چاوی گێڕا ، بینی ( وحشی ) لەپشت دارێکەوەیە ، هەوڵی دا هەڵسێت و بەرەو ( وحشی ) بڕوات تاوەکو ئەو کۆیلە حەبەشی یە بکوژێت کە بە ناپاکی لێیدا [1] ، بەڵام نەیتوانی بەردەوام بێت و کەوتە سەر زەوی ...

سەری بەرز کـردەوە تـا بڕوانـێ .. بینـی کێـوی ئوحـود بەسـەر ئاسمانـەوە دەسـوڕێتەوە و شـاری مەدینـەی دووره شـاریش تـاریکی دایگرتـووە ، هـاواری موسڵمانانیش کە وەك هەورە بروسکە دەڵێت ( امت ، امت ) بێدەنگ بوویەوە ... ئەو ئیتر نەیدەتوای بە چاو ببینێت ، بەڵام بە چاوی بە سیرەتی یەکەم ڕۆژی ئاشکرا کردنی موسڵمان بوونی خۆی دەبینی کە چووە سەر ئەبو جەهل و کەوانەکەی لە ملی ئاڵاند ، ئەو کاتەی ئەبوجەهل لە دانیشگەیەکی لای کەعبە دابوو کاتێ بیستی ئەبو جەهل خەریکی خراپەکاری و ئازاردانی برازاکەی بووە .

هەروەها پیاوە ئازاکانی قورەیشی دەبینی کە ڕۆژی بەدر لە ژێر لێدانی شمشێرە تیژەکەیدا بەلاشەیەکی سارد و سڕەوە جێ دەمان بەو جۆرە دنیای بە جێ هێشت لە ماڵێکدا کە دەنگی نەرم و شیرین بە گوێچکەیدا دەیچرپاند و موژدەی بەهەشتێکی پێ دەدا کە فراوانی یەکی هێندەی زەوی و ئاسمانەکانە .. و دڵ و دەروونی ئاسوودە بوو ، ڕۆحە پاکەکەی بەرەو لای پەروەردگاری بە دڵنیایی و ئاسوودەی گەڕایەوە .

ئینجا ( وەحشی ) هاتە سەری .. ئێستا وحشی ئیتر ترسی لێ ی نی یە .. بۆیە حەربەکەی دەرهێنایەوەو بەرە و سەربازکەگە گەڕایەوە ، چونکە ئەو تەنها کارەی بە ئەو سپێردرا بوو ئەنجامی دا . [1]

---

[1] - واتە لە مەیدانی شەڕدا ڕووبەڕووی نەوەستا ، بەڵکو لە پشتەوە بە ( غدر ) لێیدا .

دواتر ( وەحشی ) موسڵمان بوو ، بووە موسڵمانێکی باش و هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ )، لێرەدا بوارێك دەکەینەوە تا بزانین ئەو وتووێژەی کەلەم چاوپێکەوتنە ڕوویدا چی بوو ؟

( وحشی ) دەڵێت : هاتم بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی : وحشییت ؟ وتم : بەڵێ . فەرمووی : " إجلس ، فحدثني كيف قتلت حمزة " ، فەرمووی : دانیشە ، بۆم باسکە ، چۆن حەمزەت کوشت ؟ منیش بۆم باس کرد ، فەرمووی : " ويحك ! غيب عني وجهك ، فلا أرينك " فەرمووی : " ئیتر بەسە ، ڕووم لێ وەرگێڕە و ئیتر با نەتبینم " ئەوە بو ئیتر من خۆم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەکەنار ئەگرت هەتاوەفاتی کرد .

کاتێکیش کە موسڵمانەکان چوون بۆ ( مسیلیمەی درۆزن ) منیش لەگەڵیاندا چووم و ئەو حەربەیەم هەڵگرت کە ( حمزە )م پێ کوشت ، کاتێ خەڵکە بەیەگەشتن ، سەیری (مسلیمە )م کرد کە شمشێری بەدەستەوە بو ، سوێند بەخوا نەمدەناسی ، بەلآم بینم پیاوێك لە پشتیوانان لەلایەکی ترەوە ئەیەوێ هەڵمەت بەرێتە سەر ( مسلیمە )ئیتر هەر دووکمان خۆمان بۆ ئامادە کرد تا من بوارم بۆ ڕەخسا و حەربەکەم بۆ هاویشت و لێمدا ، ئەنصاری یەکەش بە شمشێر لێیدا ، خوا دەزانێ کاممان کوشتمان . خۆ ئەگەر من کوشتبێتم ئەوا باشترین کەس پاش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وە خراپترین کەسم کوشتووە.[٢]

## " پاش شەهید بوونی حەمزە بێ باوەڕان لاشەکەیان شێواند "

لە ئەنەسەوە ، دەفەرموێ : ڕۆژی ئوحود پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتە سەر لاشەی ( حمزە ) کە لوت و گوێ بڕا بوو شێوێنرا بوو . فەرمووی :

" لولا أن تجد صفية في نفسها ، لتركته حتى يحشره الله من بطون السباع و الطير " فەرمووی : لەبەر ئەوە نەبوایە ( صفیە ) دڵگران ئەبێ ، وازم لێ ئەهێنا تاوەکو خوای پەروەردگار لەناو سکی جانەوەر و چیکڵدانۆچکەی باڵندەکاندا زیندووی بکردایەتەوە .

---

[١] - بڕوانە ( محمد رسول الله والذين معه ... ) ( ٢٧ – ٣٠ ) ( غزوة احد )ی مامۆستا عبدالحميد جودە السحار.

[٢] – دانە پاڵەکەی بەهێزە / بۆ ( وحشی ) دەگەڕێتەوە . ئیبنو هشام دەرهێنانی بۆ کردووە ( ٢ / ٧٠ – ٧٣ ) هەروەها ( بوخاری ) لە ( المغازی ) دا ( ٤٠٧٢ ) .

ئینجا کەوایـەك ( بوردەیـەك ) کرایە کفنی کە ئەگەر سەریان دا پۆشیایە ، قاچی دەردەکەوت ، ئەگەر قاچیت دا پۆشیایە سەری بەدەردەکەوت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەو جەنگەدا نوێژی لەسەر هیچ کام لە شەهیدەکان نەکرد و فەرمووی : " انا شهید علیکم " ، من شاهیدم بەسەرتانەوە ... و سێ سێ یان دوو دوو لە گۆڕێکدا کۆی دەکردنەوە و دەیپرسی کامیان زیاتر قورئانی لەبەرە ، ئەوەی پێشتر لە گۆڕەکەدا دا ئەناو هەروەك دوو دوو سێ سێ دەیخستنەیەك کفن . [1] وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە / بینرا کە حەمزە سکی هەڵدڕا بوو ( و حشی ) جگەری بۆ ( هندی کچی عتبە ) برد بوو لەبەر پەیمانێك ( نزرێك ) کە هینددا بووی کاتێ لەبەدر دا باوکی کوشتبوو . [2]

لە ئیبنو عومەرەوە ، فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گوێ ی لە ئافرەتانی ئەنصار بوو هاواریان بەسەر کوژراوەکانیاندا ئەکرد .. فەرمووی : " لکن حمزە لابواکی لە " ، بەڵام حەمزە کەس نی یە بۆی بگری ... ئافرەتیش هاتن و لەلای پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بەسەر حەمەزەدا گریان تاوەکو فەرمووی : " مروهن لایبکین علی هالك بعد الیوم " [3] واتە : پێیان بڵێن لەم ڕۆژە بەدوواوە بەسەر هیچ مردوویەکیاندا نەگریەن .

وانەیـەك : لەهـەر دوو ( صـحیح )ە کـەدا هـاتووە لـە فەرمایـشتی ( عقبـە )وە ، کـە پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) نوێـژی مـردووی لەسـەر کوژراوەکـانی جەنگی ئوحـود کـردووە ، ئەمەش بە چەند ڕۆژێك پێش وەفاتی پێغەمبەر ( ﷺ ) .

پێشەوا ئیبنو لقەیم دەفەرموێ / ڕاستی باسەکە ئەوەیە کە ئەو سەرپشکە لەوەدا نوێژیان لەسەر بکات یان نەیکات ، لەبەر ئەوەی بەڵگە لەسەر هەردوو جۆرەکە هاتووە ، ئەمەش یەکێکە لەو ڕیوایەتانەی لە ئەحمەد وەرگیراون کە ئەم ڕایەش لایەقترە (وەرگیراو ترە ) بە پێ ی بنچینە و بنەماکانی ڕێچکەی ئەو . [4]

---

[1] - اسنادەکەی ( حسن )ی / أحمد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ١٢٨ ) وە ابوداوود لە الجنائز ( ٣١٣٦ ) دا و ئەرنائوط بە ( حسن ) دایناوە .

[2] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ١ / ١٧٩ ) .

[3] – دانە پاڵەکەی بە هێزە : احمد درەهێنانی بۆ کردووە ٢٠ / ٨٤ ) بڕوانە لێکۆڵینـەوەی ( ئـەرنائوط ) لەسـەر ( سیر اعلام النبلاء ) ( ١ / ١٧٣ ) .

[4] – بڕوانە : ( تهذیب السنە) ی ئیبنو القیم ( ٤ / ٢٩٥ ) .

## " کەرامەتیّ ( ڕێز لیّ نانێك ) پاش مردن ﷺ "

لەجابرەوە ، دەڵێت : موعاویە ویستی ئەو سەرچاوە ئاوەی لیّ بدا کە لە ئوحود هەیبوو[*]. بۆیان نووسی کە :

ناتوانین ئاوی لیّ بێنین مەگەر لەسەر گۆڕی شەهیدەکان . ئەویش نووسی بۆیان : کە لە گۆڕەکان دەریان بێنن ... دەڵێت : دەمبینین بەسەر شانی پیاوانەوە وەك خەوتوو بوون !! وە بێڵە کە، کە گۆڕەکانیان پیّ هەڵدایەوە بەر لایەك لە قاچی ( حمزە ) کەوت .. خوێنی لیّ هێنا !..

[*] صفە الصفوە(١/١٩٨)

# " ١٢ - بەرائی کوڕی مالک ( رضي الله عنه ) "
# " سەد پاڵەوانی بەمەیدانکاری کوشت !! "

خوای پەروەردگار هەروەك چۆن دەزانێ پەیامەکەی بە کوێ دەگەیەنێت وەهاش دەزانێ کێ هەڵبژێری ببنە هاوەڵ و پشتیوان بۆ پێغەمبەرەکەی .

( براء ) کێ یە ؟ ئەم پاڵەوان و جوامێرە ، هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لە هەمان کاتدا برای (انس ی کوڕی مالك )ی خولامی پێغەمبەری خوایە . لە جەنگی ئوحود بەشدار بووە و لە پەیمانی ژێر دارەکەشدا بەیعەتی داوە ..

زەهەبی دەڵێت / براء بەوە بەناوبانگە لە جەنگەکانیدا سەد کەسی بە مەیدانکاری (مبارزە ) لە پاڵەوانان کوشتووە .[1]

ئیمامی عومەر ( رضي الله عنه ) کاتێ پەیامی بۆ ئەمیرەکانی سوپا دەنارد ، دەینووسی : " براء بەکار مەهێنن بەسەر سوپاوە ، چونکە بەڕاستی ئەو لەناویان ئەبات بە هۆی ئەوە وە کە هەر بەرەو پێشەوە دەیانبات .[2]

کەواتە ئەو تەنها بەدوای سەرکەوتندا ناگەڕێ ، بەڵکو بەدوای شەهادەت دا دەگەڕێ و پەلەی هاتنیەتی ، بەڕاستی نموونەیەکی بێ وێنەیە و زەمان هاوشێوەی ئەم پیاوەی کەم تێدایە ...

براء هێندەی گرنگی بەناخی دەروونی دەدا ، ئەوەندە گرنگی بەڕووکەش نەئەدا ، دەیزانی کە خوای گەورە مامەڵە لەگەڵ دڵدا دەکات .. براء لە ژێر ئەو بەرگە ڕەش و ڕووتەیدا ... گەورەیی شاردبووە وە ...

لە ( انس ی کوڕی مالك )ەوە ( رضي الله عنه ) ، دەفەرموێ : " چەندەها سەر گژی تەپ و تۆزاوی و جل و بەرگ شڕ هەیە کە گوێی پێ نادرێ ، کەچی ئەگەر سوێند بە پەروەردگاری بخوات ، ئەوا سوێندەکەی بە جێ ئەهێنێ (یاخود ئەوەندە چاکەکارە هەرگیز سوێندەکەی ناشکێنێ)، لەوانە براء ی کوڕی مالك .[3]

---

[1] - بروانە / سير اعلام النبلاء ( ١ / ١٩٦ ) .

[2] - حاکم لە ( المستدرك ) دا ریوایەتی کردووە( ٣ / ٢٩١ ) بە دانە پاڵێکی ( مرسل ).حياة الصحابة (١٢٨/٢) .

[3] - حسن صحيح / تیرمیزی ریوایەتی کردووە ( ٣٨٥٣ ) و دەفەرموێ : ئەمەی ( حسن )ی ( صحيح ) ە . (ئەرنائوط) یش ئەم ڕایەی هەیە .

## " چەند هەڵوێستێکی پاڵەوانانەی دەستی ئیسلام "

لەسەردەمی جێ نشینایەتی پێشەوا ( ابوبکری صدیق ) دا ( ﷺ ) ئەوەی ویستی لە ئیسلام هەڵگەڕابوەوە و فیتنە و ئاژاوە سەری کێشاو وەك لافاوی ڕاپێچکرا و کەوتە بزوتن بە ئامانجی سڕینەوەی شوێنەوار و مەشخەڵی ئەم ئایینە پیرۆزە ، بۆیە ئیمامی ئەبوبەکر لە دژیان ڕاپەڕی و چەند لیوایەکی پێکەوە نا و بە پشت بەستن بەخوای تاك و تەنها ، ئاژاوەکەی دامرکاندەوە و فەرمانی خوا هاتەدی و ئاشکرا بوو ... جا با بێ باوەڕانیش بەمە دڵگران بن ...

بەو جۆرە ڕووداوی ( یمامە ) ڕووی دا لە نێوان موسڵمانان و سوپای ( موسلیمەی درۆزن) و یەکێ بوو لەو جەنگانەی لە نێوان سەربازانی خوا و سەر بازانی شەیتاندا ڕووی دا .

لەم جەنگەدا (براء ی کوڕی مالك ) جوانترین هەڵوێستی لە ژیانی ئوممەتەکەی و نەتەوەکەیدا تۆمارکرد .

لە ( انس )ەوە ، دەڵێت / ڕۆژی ( یمامە ) ، خالدی کوڕی ولید بە (براء )ی فەرموو : هەڵسە ئەی (براء ) ، دەڵێت : براء هەستاو چووە سەر ئەسپەکەی و ستایشی پەروەردگاری کرد و فەرمووی :

" ئەی ئەهلی مەدینە ، ئەمڕۆ مەدینە بۆ ئێوە نیە ، بەڵکو تەنها خوای تاك و تەنها و بەهەشت بۆ ئێوەیە " . لە پاشدا چەکی هەڵگرت و خەڵکیش بە دوایدا چەکەکانیان هەڵگرت . بەو جۆرە ئەهلی ( یمامە ) شکستیان خوارد . لەوێ (براء ) ( ﷺ ) گەیشت بە ( محکم ی یەمام ) ی سەر کردەی سوپای موسەیلەمە و شمشێرێکی لێدا و کوشتی و شمشێرەکەی ( محکم )ی هەڵگرت و شەڕی پێ کرد هەتا لەت بوو . [1]

ئیبن اسحاق ، دەڵێت : موسڵمانان هێرشیان بردەسەر بێ باوەڕان تا هەڵهاتنە ناو باخچەیەکەو کە موسەیلەمەی دوژمنی خوای تیا بوو ، براء وتی : موسڵمانان بمخەنە سەر شانتان ، ئەوانیش بەرزیان کردەوە تاوەکو خۆی گەیاندە سەر دیوارەکە و بەسەریدا سەرکەوت و خۆی هەڵواسی و لەوێ بەسەر باخچەکەوە بەردەوام شەڕی لەگەڵ دەکردن تاوەکو بەروی موسڵمانەکاندا دەروازەکەی کردەوە و چوونە ژوورەوە بۆیان و خوای پەروەردگار موسەیلەمەی بەدەستی موسڵمانان لەناو برد . [2]

---

[1] – بڕوانە : حیاة الصحابة ( ٢ / ١٢٧ ) .

[2] - بڕوانە : الاستیعاب ( ئیبنو عبدالبر ) ( ١ / ١٣٨ ) .

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە ، براء لەسەر قەڵغانێك دانیشتووە و وتویەتی : بەڕمەکانتان بەرزم کەنەوە و بمگەیەننە لایان ، ئەوانیش بەڕمەکانیان بەرزیان کردەوەتەوە و خستویانەتە پشت دەرگاکەوە .. دوایی زانیان لەوێ دە کەسی لە بێ باوەڕانی کوشتووە..[1]

بەم شێوەیە جەنگەکە بەسەرکەوتنێکی گەورەی موسڵمانان کۆتایی پێ هات ، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو پاڵەوانێتی و تێکۆشانەی براو لەم جەنگەدا و خۆخستنە بەرمەترسی لە پێناو بەدەست هێنانی شەرەفی شەهادەتدا ، بەڵام لەم شەڕەدا شەهیدی بەنسیب نەبوو ﴿ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴾ سورة الرعد ، آية (٣٨) .

لەگەڵ ئەمەشدا دڵنیا بوو کە خوای پەروەردگار بێ بەشی ناکات لەو ڕێزە گەورە و ئەو شانازی یە بێ وێنەیە ، بەڕاستی خودا ئەو کەسانە بێ ئومێد ناکات کە لێی دەپاڕێنەوە و داوای لێ دەکەن .

لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : چووم بۆ لای براء بینیم کەوانەکەی دەلاواندەوە پێم وت : تاکەی ئەم کارە ئەکەیت ؟ وتی : تۆ وائەزانی من لەسەر جێگا ئەمرم ؟ سوێند بەخوا نەوە دو ئەوەندە کافرو بێباوەڕم کوشتووە .[2]

ڕۆژان تێپەڕین و جەنگێکی گەورە لە نێوان موسڵمانان و فارسەکاندا لە" تستر " ڕووی دا ، لەوێ لە گەرم و کڵپەسەندنی جەنگ و خستنەکاری ئەوپەڕی توانا و هێز لەلایەن دوژمنانەوە و لە بارو دۆخێکی تەنگاودا ( حرج ) دا ، هەندێ لە موسڵمانان بە ( براء ) یان وت : ئەی ( براء ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " إنك لو اقسمت على الله لأبرك ، فأقسم على الله " واتە: تۆ ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخۆیت ( داوای لێ بکەیت ) وەڵامت دەداتەوە لەبەر ئەوە سوێندی لەسەر بخۆ ...

ئەویش فەرمووی : سوێندت پێ ئەخۆم ئەی پەروەردگار ، بیانخەیتە ژێر چنگمان پاشان لە پردی ( سوس ) بەیەکگەیشتن ، موسڵمانانیان نارەحەت کرد . وتیان / ئەی براء سوێند لەسەر پەروەردگات بخۆ ، فەرمووی : " ئەی خوای پەروەردگار ... سوێندت پێ

---

[1] - بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە . اسنادەکەی ( مرسل )ە . بڕوانە پەراوێزی ( حیاة الصحابة ) ( ٢ / ١٢٨ ) .

[2] - اسنادەکەی ( صحیح )ە ، ئیبن سەعد لە ( الطبقات ) ( ٧ / ١ / ١٠ ) ڕیوایەتی کردووە ، ئەرناتوط سیر (١٩٨/١) .

دەخۆم بیانخەیتە ژێر چنگمان و بمگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت ، ئەوە بو خوای گەورە فارسەکانی خستە ژێر دەستی موسڵمانان و شکستیان هێناو ( براء ) یش شەهید کرا .[1]

لەسەر مەیدانی جەنگ و شەرەفدا ئەم پاڵەوانە شەهید بوو ، زەوی بە خوێنی پاکی ئاودرا کەلە بۆنی میسك خۆشتر بوو ...

بەڕاستی ئەوەی ئامەزرۆی بوو بەدەستی هێنا و بە ئاواتی خۆی گەیشت و شوێنەواری ئاسوودەیی لە سنگ و ڕوخساریدا بەدی کرا و لەناو ویژدانیدا دەنگی ئەم ئایەتانەی پەروەردگاری دەزرنگایەوە : ﴿ ... ثُمَّ قُتِلُوا أَوْ مَاتُوا لَيَرْزُقَنَّهُمْ اللَّهُ رِزْقاً حَسَناً وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ، لَيُدْخِلَنَّهُمْ مُدْخَلاً يَرْضَوْنَهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾ سورة الحج آية ( ٥٨ – ٥٩ )

واتە : ئەوانەی لە پێناوی خوادا کوژران و شەهید کران یاخود مردن ، سوێند بێ بێگومان خوا لەرزق و ڕۆزی چاك بەهرەوەریان دەکات ، بەڕاستی خوا هەر خۆی چاکترین ڕزق و ڕۆزی بەخشە .سوێند بێ خوای گەورە ئەو جۆرە کەسانە دەخاتە شوێنێکەوە کە زۆر پێ ی ڕازی و خۆشنود دەبن ، بەڕاستی خوا زانایە ( بە هەوڵ و نیەتتان ) و خۆگرە ( زۆرپەلە ناکات لە تۆڵەسەندندا ) . .

[1] – بروانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣١٧ ، ٣١٨ ) .

# " ١٣ - عبدالله ی کوڕی مسعود ( ﷺ ) "
# " نزیکترین کەس لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )
# لە ڕووی ڕێنموونی و شوێن پێ هەڵگرتنەوە"

ابن مسعود کێ یە ؟

پێشەوای تێگەیشتوو ، [١] و زانای ئەم ئوممەتە ( ابو عبدالرحمن )ی هـزلی مکی موهاجیری و بەدری )یە ، یەکێکە لە ( السابقین الاولین ) [٢] و لە نەجیبزادە زاناکان . لەبەدر بەشدار بووە ، و هەردوو هیجرەتەکەی کردووە ، وە ڕۆژی ( یەرموك ) بەسەر (غەنیمە )وە بووە . چاکە و ئاکاری گەلێك زۆرە و زانستی زۆری لێ وەرگیراوە .

پێش چوونی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ مالی ( ارقم ) ، موسڵمان بووە هەموو بەشداری هەموو غەزاکانی کردووە .. خاوەنی نهێنی [٣] و هاوەڵی سەرین و سیواك و نەعلەکانی و هەروەها هەڵگری دەست نوێژ شۆری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووە لەسەفەردا .

لە ڕووی شوێن پێ هەڵگرتن و ڕێنموونیەوە بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەشوبهێنرێ و کەسێکی کەم گۆشت و باریکە لە بووە و قاچەکانیشی ورد و باریك بوون . وە یەکێ بووە لەوانەی باشترین پۆشاك و خۆشترین بۆنی هەبوو .

دادگای کوفەو گەنجینە ، ( بیت المال ) ی لەسەردەمی ( عمر ) و سەرەتای سەردەمی جێنشینایەتی ( عوسمان ) یشدا ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ، گرتووەتە دەست ، پاشان چووە بۆ ( مدینە ) و لەوێ سالی ( ٣٢ )ی کۆچی وەفاتی کردووە و لە ( بقیع ) سپاردە کرا لە تەمەنی شەست و ئەوەندە سالیدا . [٤]

---

[١] - هەروەها ( ئیبنو عباس ) یش ( ﷺ ) هەروەك ئەم بە ( حبرالامة ) ناونرا بوو .

[٢] - السابقین الاولین : ئەو هاوەڵە بەڕێزانەن کە هەر لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیدا ئیمانیان هێناوە .

[٣] - هەروەها ( حزیفەی کوڕی یمان ) ( ﷺ ) بە خاوەنی نهێنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەناو بانگ بووە .

[٤] - بڕوانە سیر اعلام النبلاء ( / ٤٦١ ) ، صفة الصفوة ( ١ / ٢٠٨ ) .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( عبدالله ی کوڕی عەمر ) ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا( ﷺ ) فەرموویەتی : " خذوا القرآن من أربعة ، من ابن مسعود ، ئةبو بن كعب ، و معاذ بن جبل ن و سالم مولى ئةبو حذيفة" [١]

واتە : قورئان لە چوار کەس وەرگرن ، لە ئیبنو مسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و مەعازی کوڕی جبل و سالمی ( مولى ) ی ئەبو حوزیفە .

٢- لە ئیبنو مەسعودەوە ، دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : "أقتدوا باللذين من بعدى من اصحئةبو ، ئةبو بكر و عمر ،واهتدوا بهدى عمار ، وتمسكوا بعهد ابن مسعود " [٢]

واتە : شوێنی هاوەڵانم پاش خۆم هەڵگرن ، لە ئەبی بەکر و عمر و لەسەر ڕێنمویی ( عمار ) بڕۆن و دەست بە پەیمانی ابن مسعودەوە بگرن ...

٣- لە عبدالرحمن ی کوڕی یەزیدەوە ، دەفەرموێ : هاتین بۆلای حوزەیفە و پێمان وت : باسی نزیکترین کەسمان لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) بۆ بکە لە ڕووی ڕێنمونی و هەڵگرتنی ڕاستە ڕێگاوە ، تاوەکو ئێمەش شتی لێ وەرگرین و گوێی بۆ ڕاگرتین ، فەرمووی : نزیکترین کەس لەو ڕووەوە ئیبنو مەسعودە ، هەتا لەماڵەکەی خۆیدا شەرممان لێ دەکات ، هاوەڵانی پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) زانیویانە کە کوڕی ( ئوم عەبد ) لە هەمووان زیاتر ڕوو لە خوایە . [٣]

٤- لە عبدالله ی کوڕی مسعودەوە ، ئەفەرموێ: کە ئەبو بەکر و عمر ( رضي الله عنهما ) موژدەی ئەوەیان پێداوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمویەتی : " من أحب أن يقرأ القرآن غضاً كما انزل فليقرأه على قراءة ابن ام عبد " *

واتە : کێ حەز ئەکات قورئان بە پاراوی هەر بەو جۆرەی کە دابەزیوە بیخوێنێ با لەسەر خوێندنەوە ( ابنو ام عبد ) بیخوێنێ .

٥- ڕەحمەتی خوات لێ بێت ، بەڕاستی تۆ غولامێکی فێر کراویت .

ئەمە سەرەتای ناسینی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو لەگەڵ ئیبنو مەسعود دا ، کە چیرۆکەکەی بەم جۆرەیە :

---

[١] - صحیح/صحیحی سوننەتەکانی( ترمیزی ) ( ٢٩٩٥ ) ، صەحیحەی( ١٨٢٧ )و لە هەردوو صحیحەکەشدا هاتووە .

[٢] - صحیح / صحیحی سوننەتەکانی ( ترمیزی ) ( ٢٩٩٢ ) ، ئیبنو ماجە ( ٩٧ ) .

[٣] - صحیح / صحیحی سوننەتەکانی ( ترمیزی ) ( ٢٩٩٤ ) .

* صحیح: صحیحی سوننەتەکانی (ئیبنو حاجە) (١١٤ ، فەرموودەی (٢٣٠١).

ئیبنو مەسعود ، دەفەرموێ / شوانیم بۆ ( عقبەی کوڕی ئەبو معیط ) ئەکرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ئەبو بەکر بەلامدا تێپەڕین . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " یا غلام هل من لبن ؟ قلت : نعم ، و لكني مؤتمن ، قال : فهل من شاة لم ينز عليه الفحـــل ؟ " فأتيتـــه بشاة ، فمسح ضرعها ، فنزل لبن ، فحلب في اناء ، فشرب ، وسقى أبابكر ، ثم قال للضرع أقلص ، فقلص".

واتە : فەرمووی : ئەی کوڕی لاو ( غولاٌم ) شیرت لا هەیە ؟ وتم : بەڵێ ، بەلاٌم من خاوەنی نیم و تەنها راسپێراوم ، فەرمووی : ئەی هیچ مەڕێکت لا هەیە ، نێرەی لێ نەپەڕیبێ . منیش مەڕێکم بۆ هێنا و دەستی پیرۆزی هێنا بەسەر گوانی مەڕەکەدا ، شیری لێوەهات و دایدۆشیە ناو جامێك ، ئەو لێ ی خواردەوە و بەشی ابوبکریشی دا و پاشان بەگوانەکەی فەرمووی بچۆرەوە یەك ، ئەویش چووە یەك . لای ( ئەحمەد ) ئەمەش لەسەر ریوایەتەکە هەیە کە ابن مسعود ، دەڵێت : دوای ئەوە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پێم وت : ئەی پێغەمبەری خوا ، شتێکم لەم وتەیە فێرکە .... ئەویش دەستی بەسەرمدا هێناو فەرمووی : " يرحمك الله انك غليم معلم " [1] ،

واتـــە : خـــوا رەحمـــت پـــێ بفـــەرمێ ، بەڕاســـتی تـــۆ لاوێکـــی فێرکراویـــت ( زیرەکیت ) . لە ریوایەتێکی دیکەدا هاتووە دەڵێت : ئیتر منیش موسڵمان بووم و هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) . [2]

٦- لە عبداللە ی کوڕی مسعودەوە ( رضي الله عنه ) ، دەفەرموێ : کاتێ ئایەتی : ﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ ﴾[3] سورة المائدة ، آية ٩٣ . هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ ) پێمی فەرموو : " انت منهم "[4] واتە : تۆ لە وانەیت .

٧- لە ( ئەبو الاحوص )ەوە ، دەڵێت : گوێم لە ( ئەبو مسعودی بەدری ) و (ئەبو موسی ) بوو کاتێ عبداللە ی کوڕی مسعود وەفاتی کرد ، بەیەکتریان ئەوت : تۆ بڵێ ی دوای خۆی کەسی وەك خۆی بە جێ هێشتبێ ؟ ئەوی تر دەیوت : مادەم تۆ وا دەڵێیت با پێت بڵێم کە

---

[1] - فەرموودەی ( حسن )ە ، احمد ریوایەتی کردووە ( ١ / ٣٧٩ ) . زەهەبیش بە هیچ دایناوە لە ( سير اعلام النبلاء ) ( ١ / ٤٦٥ ) .

[2] - احمد ریوایەتی کردووە ( ١ / ٤٦٢ ) .

[3] - مانای ئایەتەکە / هیچ گوناهێك نیە لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردارە چاکەکانیان ئەنجامداوە .

[4] - صحيح : موسلم لە ( الفضائل ) ، ( ٢٤٥٩ ) ریوایەتی کردووە لە بابی ( فضائل عبدالله ) .

ئەو کەسێکی وابوو کاتێ خەڵکی ڕێگەیان بە ئێمە و مانان نەئەدا مۆڵەتی ئەویان دەدا و کاتێ ئێمە لە هەڵوێست و بۆنەیەکدا نادیار و ئامادە نەبووبین ئەو لەوێ بوو .[1]

نووسەر دەڵێت : بێ گومان جگەلەمانەی باسمان کرد ، چەندین چاکە و فەزڵی دیکەی هەیە ئێمەش بەڕاستی دەمانەوێت زیاتر لەسەری بڕۆین ، چونکە ئیبنو مەسعودیش ( ﷺ ) بێ بەش نەبووە لە بوختان و زمان خراپ لەم چاخەماندا لەلایەن کەسانێکەوە کە پسپۆڕن لە تەزویر کردنی واتاکان و تانەدان لە ڕەمزە ئیسلامیەکان : ﴿وَاللَّهُ مِنْ وَرَائِهِمْ مُحِيطٌ﴾ سورة البروج ، آية (٢٠) .

واتە : ( بابزانن ) دەسەڵاتی خوا لە پشتانەوە دەورەی داوون و لە دەستی دەرناچن.

## " زانستی ئینو مەسعود ( ﷺ ) "

١- لە ( ئەبو مسعودی بەدری )یەوە ، دەڵێت / کەسێك ناناسم کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پاش خۆی بە جێ ی هێشتبێ زاناتر لە ئیبنو مەسعود ، لە قورئاندا " .[2]

٢- لە ( مەسروق )ەوە ، دەڵێت : عبداللە ( ﷺ ) فەرمووی : سوێند بەوزاتەی هیچ خوایەك نی یە بێجگە لەو .. هیچ سوورە تێك نی یە دابەزیبێت و من نەمزانیبێ لە کوێ دابەزیوە ، وە هیچ ئایەتێك نی یە دابەزیبێ و من نەمزانیبێ لە سەرکێ دابەزیوە ، وە ئەگەر بزانم کەسێك لە من زانا ترە بە فەرموودەی خوا ( قورئانی پیرۆز ) ، ئەوە دەچووم بۆلای . ( بوخاری ڕیوایەتی کردووە ) .

٣- لە ( ئەبو وائل ) ەوە ، لە عبداللە وە دەگێڕێتەوە کە چەند کەسێك باسی قورئان خوێندنەوەی ( عبداالله ) یان دەکرد ، وەك ئەوەی سەرزەنشت و ڕەخنەی لێ بگرن ، ئەویش فەرمووی : بەڕاستی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیانزانی کە من لە هەموویان باشتر قورئان دەخوێنمەوە ، پاشان وەك ئەوەی پەشیمان بێ لەمەی کە وتی ، فەرمووی : بەلآم من باشترینیان نیم .[3]

---

[1] - صحیح / مسلم ریوایەتی کردووە ( ٢٤٦٦ )( ٢٤٦٣ ) لە ( فضائل الصحابة ) ، فضائل عبدالله بن مسعود.

[2] - صحیح / مسلم لە بابی ( فضائل الصحابە) ( ٢٤٦١ ) ( ١١٣ ) ریوایەتی کردووە .

[3] - پیاوانی جێ متمانەن، بوخاریش بە هاوشێوەی ئەم ریوایەتی کردووە ( ٥٠٠٠ ) ، بڕوانە پەرواێزی سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٤٧٤ ) .

**" لاقی عبدالله لە تەرازوودا لە کێوی ئوحود قورسترە"**

**لە ( علی کوڕی ئەبو تالیب )ەوە ، ( ﷺ ) فەرموویەی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی کرد بە ( ئیبنو مسعود ) تا بچێتە سەرداریك داوای شتێکی لێ کرد و کە چووە سەردارەکە هاوەڵان سەیری لاقی (عبدالله) یانکرد، لەبەر باریکی لاقی دەستیان بە پێکەنین کرد . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێیانی فەرموو :** " ما تضحكون ؟ لرجل عبدالله اثقل في الميزان يوم القيامة من احد "[*] .

**پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەبەردەم ئیبنو مسعود دا دەگری ، عبدالله دەفەرمووێ:- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی کە قورئانی بەسەردا بخوێنم منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەتەوێ من قورئانت بەسەردا بخوێنم لە کاتێکدا بەسەر تۆدا دابەزیوە ؟ فەرمووی** " اشتهي أن اسمعه من غيري " **واتە : حەز ئەکەم و تامەزرۆم لە غەیری خۆمی ببیستم .**

**منیش سورەتی ( النساء )م بەسەردا خوێندەوە تا گەشیتمە :** ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيداً ﴾ سورة النساء ، آية (٤١) .

**واتە : ئینجا دەبێ حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت، کاتێ لەهەر میللەتێك شایەتێکیان هێناو تۆشی هێنا ( ئەی محمد ( ﷺ ) ) بە شایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە .**

**لەوێدا ئیدی ئاماژەی بۆ کردم کە بەسە ... دەبینم فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارێ.**[1]

**" عومەر بەرگری لە ئیبنو مەسعود ( ﷺ ) دەکات "**

**لە ( ئەبو وائل ) ەوە ، ئیبنو مەسعود کابرایەکی بینی کە جلکەکەی زۆر شۆڕ بوو بووەوە پێ ی فەرموو : جلکەکەت بەرز کەرەوە .. ئەویش وتی : ئەی تۆش خۆت جلکەکەت بەرزکەرەوە ، ئەویش فەرمووی ، بەڵام من قاچم عەیبێکی هەیە کە باریکی یە و من ئیمامەتی بۆ خەڵك ئەکەم ...**

**ئەمە بە ( عمر ) گەیشت ،ئەویش دەستی بە لێدانی کابرا کردوو ئەیفەرموو : ئەتەوێ وەڵامی ئیبنو مەسعود بدەیتەوە ؟**[2]

* - صحیح احمد ، دەریهێناوە ( ١ / ١١٤ ) بڕوانە ( المجموع ) ( ٩ / ٢٨٨ ) .

1 - صحیح : بوخاری و مسلم و تیرمیزی ریوایەتیان کردووە .

2 - پیاوانی جێ ی متمانەن : حافظ لە ( الاصابة ) دا دیگێڕێتەوە بۆ ( البغوی ) ، بڕوانە پەراوێزی سیر (٤٩١/١)

نووسەر دەڵێت : پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) ئەم کارەی بۆ بەرزڕاگرتنی زانست و ڕێزگرتن لە زانایان کرد ، بەلاَم لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەندێ کەس هەن سەربزێوی بە سەر زانایانی ئەم ئوممەتەوە دەکەن ، ئەمانە بەڕاستی پێویستیان بە کەسێکە فێری ئەدەب و و ئاقڵیان بکات .

## " ئیبنو مەسعود لەگەڵ قورئاندا "

لە ( عونی کوڕی عبداللە ) و لە عبیداللە ی برایەوە ، دەڵێت : ئەوکاتەی چاوەکان لێك ئەنران و خەڵکی دەنووستن عبداللە هەڵدەساو گوێم لە دەنگی بوو وەك دەنگی هەنگ.

وە لە ( زیادی " مەولا " ی ئیبنو عیاش)ەوە ، دەڵێت ئیبنو مەسعود ( ﷺ ) دەنگێکی زوڵاڵی بۆ قورئان خوێندن هەبووە .

وە لە ( زەیدی کوڕی وهب ) ەوە ، دەڵێت : بە چاوی خۆم دوو شوێنەورای ڕەشم بە چاوەکانی ئیبنو مەسعودەوە بینی بە هۆی گریانی زۆرەوە ..

## " لە خۆبوردەیی ( تواضع ) ئیبنو مەسعود ( ﷺ ) "

لە ( عبداللە ) وە ، دەفەرموێ : ئەگەر بەتاوانەکانمتان بزانیایە و بتزانیایە چەندە گوناهبارم ، تەنها دوو کەس لە شوێنم نەئەهات وە خاك بەسەرتان دەکردم ، وە من حەز ئەکەم بە ( عبداللە ی کوڕی ڕوثة ) [1] بانگ بکرێم، بەلاَم خوا لە تاکە تاوانێك لە تاوانەکانم خۆش بێت .. [2]

وە لە قاسمی کوڕی عبدالرحمن )ەوە ، ئیبنو مەسعود لە پاڕانەوەکانیدا ئەیفەرموو : ترساوێکم تکای دالدە دەکەم ، تەوبەکارێکم داوای لێخۆش بوون ئەکەم ، تامەزرۆیەك و تۆقیوێکم.

## " جیهادی لە پێناوی خوادا "

ئیبنو مسعود هەر لەمەککە وکاتێ قورئانی ئاشکرا کرد ، جیهادی خۆی دەستپێکرد ، لە ( یحیی کوڕی عروە ) ، لە باوکیەوە ، دەگێڕێتەوە کە ئیبنو مەسعود

---

[1] - ڕوثة / تەپاڵە .

[2] - حاکم ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٣١٦ ) .

یەکەم کەس بوو لە مەککەو لەماڵی خودا قورئانی بە ئاشکرا خوێند ، پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کاتیٚ قورەیش لە دانیشتگاکانیاندا بوون ، سورەتی ( الرحمن علم القرآن )ی خوێندەوە ، ئەوانیش هەڵسان بۆی و لێیاندا .[1]

لە هەموو غەزاکانـدا ئامادەبووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لە چەندین هەڵوێست ( موقف ) دا بەشدار بووە وەك ( یەرموك ) و غەیری ئەویش ، ئەو بوو لە جەنگی بەدردا ( ئەبو جەهل )ی کوشت پاش ئەوەی کوڕانی ( عفراء ) لێیان دا بوو .

لە ( ئەبو عبیدە )وە ، دەفەرموێ : عبدالله فەرمووی : گەیشتمە ئەبو جەهل بە بریندار خەریك بوو بە شمشێرەکەی خەڵکی لە خۆی دور ئەخستەوە ، وتم : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە سەرشۆڕی کردیت ئەی دوژمنی خوا ، ئەویش وتی / مەگەر زیاتر لە پیاوێکم کە هۆزەکەی خۆی کوشتوویانە .. منیش بە شمشێرەکەم لێم دا و دەسێکم پێکا ، شمشێرەکەی لێکەوت .. شمشێرەکەیم هەڵگرت و لێم دا تا کوشتم ، پاشان چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هەواڵەکەم پێ دا ... فەرمووی : " والله الذي لااله الا هو " .. و لەگەڵمدا هات تاگەیشتینە سەر لاشەی ئەبو جەهل . فەرمووی : " الحمد لله الذي أخزاك ياعدو الله ، هذا كان فرعون هذه الأمة " ...[2]

واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە سەرشۆڕی کردیت ئەی دوژمنی خوا ، ئائەمە فرعەونی ئەم ئوومەتە بوو .. بەو جۆرە ئەو زۆردارە لە ژێر پیٚ ی ئیبنو مەسعود ( رضي الله عنه ) دا مرد .

### " لە ئامۆژگاری یەکانی ئیبنو مەسعود ( رضي الله عنه ) "

لە ( عبدالرحمن ی کوڕی حجیرە ) وە ، لە باوکیەوە ، لە ئیبنو مەسعودەوە ، ئەگێڕنەوە کاتیٚ دا ئەنیشت بۆ یادی خوا ئەیفەرموو :

" ئێوە لە ڕێڕەوی شەو و ڕۆژدا لەناو تەمەنێکی کەمکردوو کردەوەیەکی پارێزراودان و مردنیش لە پڕ دێت ، ئەو کەسەی چاکەی ناشتبیٚ ئەوە خەریکە ئاسودەی و ڕەزامەندی دەدورێتەوە ، وە ئەوەشی شەڕ و خراپەی ناشتبیٚ ئەوە خەریکە پەشیمانی دەدورێتەوە .. وە هەموو جوتیارێکیش هەر ئەوەی دەست ئەکەویٚ کە ئەیچێنیٚ و ئەیڕوێنیٚ ..

---

[1] - بڕوانە : البداية و النهاية ( ٥ / ٢٤٦ ) .

[2] - پیاوانی جیٚ ی متمانەن / احمد و ابو داود بە کورتی ڕیوایەتیان کردووە بخاریش بە هاوشێوەی دەرهێنانی کردووە ( ٣٩٦٢ ) .

هەرگیز کەسی تەمەڵ پێش ی چارەنووسی ناداتەوە ، هەروەك هیچ پێداگرێکیش بە ئامانجەکەی ناگات بەویستی خوا نەبێت .. خۆ ئەگەر چاکەیەکی پێ درا ئەوە لەلایەن خواوەیە ، ئەوەشی لە خراپەیەك پارێزرا ئەوە خوا پاراستوویەتی بە ڕاستی پارێزکاران گەورە و سەردارن و زانایانیش پێشەوان و کۆڕو مەجلیسەکان زیادە خێرە .[1]

وە لە ( عونی کوڕی عبدالله )وە ، دەڵێت : عبدالله فەرمووی : زانست بەزۆریی گێڕانەوە نیە ، بەڵکو زانست لە خوا ترسانە .[2]

هەروەها فەرموویەتی / هەر کەس لە ئێوە میوانە ، ماڵ و سامانەکەشی سپاردەیە ، میوانیش هەر دەبێ بڕوات و سپاردەش دەبێ بدرێتەوە خاوەنەکەی .

لە عبدالرحمن کوڕی عبدالله ی کوڕی مسعودەوە ، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە ، دەڵێت : کابرایەك هات بۆ لای ، پێ ی وت ئەی باوکی عبدالرحمن ، چەند وشەیەکی کورتی پڕ مانام فێر ناکەیت؟...

عبدالله فەرمووی : هیچ کەسێك مەکە بە هاوەڵی خوا ، و لەگەڵ قورئاندا بمێنەرەوە ، بۆ هەر جێ یەك ڕۆشت و هەرکەسێ هەقی پێ وتی ئەوە لێ ی وەرگرە با کەسێکی نەیاریش بێ وە هەر کەسێك پوچ و ناهەقی پێ وتی ڕەتی کەرەوە باکەسێکی خۆشەویست و خزمیشت بێت .[3]

## " هەندێکی تر لە ئامۆژگاری یەکانی ئیبنو مەسعود ( رضي الله عنه ) "

بێ گومان ڕاستترین وتە ، فەرموودەی خوایە ، توندوتۆڵ ترین شتێك خۆی پێوە ڕاگریێ وشەی ( تقوی ) یە .. باشترین نەتەوە ، نەتەوەی ئیبراهیمە ، چاکترین سوننەتیش سوننەتی ( محمد ) ە ( ﷺ ) و باشترین ڕێنموونی ڕێنموونیی پێغەمبەرانە ( علیهم السلام ) . ڕێزدارترین گوفتاریش یادی خوایە . باشترین چیرۆکیش قورئانە ، و باشترین شتەکان کۆتایی یەکەیەتی خراپترینی شتەکان ئەوانەن کە هەڵبەستراون ، و شتی کەم و ڕەسەڵ باشترە لە شتی زۆر و بێ بایەخ ... تاکە نەفسێك بتوانی ڕزگاری کەیت باشترە لە ئیمارەتێك کە بۆت ئەژمار نەکرێت .. خراپترین گەڕانەوە و پەشیمانی ئەوەیە لەکاتی

[1] - احمد ریوایەتی کردووە . صفة الصفوة ( ١ / ٢١٥ ) .
[2] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٨ ) .
[3] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٩ ، ٢٢٠ ) .

سەرمەرگدا بێت . خراپترین پەشیمانیش پەشیمانی ڕۆژی قیامەتە ، خراپترین گومڕایی ئەوەیە دوای دۆزینەوەی ڕێ ی ڕاست گومڕئەبوتەوە ، باشترین بێ نیازی ، بێ نیازیی دەروونە .. باشترین توێشوو تەقوایە و باشترین شتێك ، دڵنیایی (یەقین) دڵەکانە . شەراب و مەستکەرەکان سەری هەموو گوناه و تاوانەکانن ، ئافرەتان تەڵەی شەیتانن ، گەنجییش بەشێکە لە شێتی ... شیوەن لە زانستی جاهلیەتەوە وەرگیراوە ، خەڵکانێك هەن لە دواوە نەبێ نایەنە نوێژی جومعەوە و لە دوورەوە نەبێ یادی خوا ناکەن ، گەورەترین گوناه درۆکردنە و جنێودان بە موسڵمانان لە دین دەرچوونە ( فسق ) و کوشتنیشی کوفرە . حەرامی ماڵی موسڵمان وەك حەرامی خوێنی وایە .. ئەوەشی عیففەتی بوێ خوا پێ ی دەبەخشێ ئەوەی ڕقی خۆی بخواتەوە خوا پاداشتی ئەداتەوە ، ئەوەی لە خەڵکی ببورێ ، خوا لێ ی دەبورێت ، ئەوەی لەسەر نەهامەتیەکان ئارام بگرێت ، خوا پاداشتی ئەداتەوە و جێی بۆ پڕئەکاتەوە ، خراپترین خۆراك خواردنی ماڵی هەتیوە ، بەختەوەر کەسێکە لە غەیری خۆی ئامۆژگاری وەرگرێ ، بەدبەختیش کەسێکە لە سکی دایکیەوە بە بەدبەختی لە دایك بێ .. بەڕاستی ئەوەی دەروونت قەناعەتی پێ ی هەیە بەسە بۆت .. مایەی هەرکارێك کۆتایی یەکەیەتی .. خراپترین ڕیوایەتکاران ئەوانەن کە بەدرۆ هەواڵەکان دەگێڕنەوە . شەرەف مەندترین مردن کوژرانی شەهیدەکانە ، ئەوەی بەڵابناسێ ئارامی لەسەر ئەگرێ ، ئەوەشی نەیانناسێ نکوڵی لێ دەکات ... ئەوەی خۆی بە زل بگرێ خوانزمی ئەکاتەوە ، ئەوەشی شوێن دنیا بکەوێ پێ ی ناگاتەوە ، ئەوەشی گوێڕایەڵی شەیتان بێ ئەوە سەرپێچکارە بۆ خوا ، ئەوەشی سەرپێچی خوا بکات ، سزا و ئەشکەنجەی ئەدا .[1]

لە ( ئەبو ایاس البجلي )ەوە ، دەڵێت : گوێم لە عبداللە ی کوڕی مسعود بوو ، دەیفەرموو : " هەر کەسێ بۆ خۆزل کردن سەربزێوی بکات ، ئەوە خوا نزمی دەکاتەوە ، ئەوەشی لەبەر ملکەچی و گوێدێری خودا لە خۆ بووردەیی بنوێنێ ئەوە خوا سەری بەرزدەکاتەوە ، بەڕاستی فریشتەکان جێ دەستێکیان هەیە ( لمس ) ، شەیتانیش جێ دەستێکی هەیە ... جێ دەستی فریشتەکان بریتیە لە ڕاهێنان و خوگرتن بە چاکە و بەڕاست دانانی هەق ، خۆ ئەگەر شتی وەهات بینی لە خۆتدا ، ئەوە سوپاسی خوای

[1] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٦ ) .

لەسەر بکە ، جێ دەستی شەیتانیش خوگرتن و ڕاهێنانە بە خراپە و بەدرۆ خستنەوەی هەق ، خۆ ئەگەر شتێکی واتان بە دی کرد ، پەنا بە خوا بگرن " .[1]

وە لە ( مسیب ی کوڕی رافع )ەوە ، دەڵێت : عبداللە ی کوڕی مسعود ، فەرمووی :

" بەڕاستی ڕقم لە پیاوێك ئەبێتەوە دەست بە تاڵ بێت ونەبەکارێك بۆ دنیای خەریکە و نەبەکارێك بۆ قیامەتی " .[2]

ئیبنو مەسعود ( ﷺ ) دەفەرموێ :

" تا لە نوێژدایت ، ئەوە تۆ لە دەرگای خوداوەند دەدەیت ، ئەوەشی لە دەرگای خوداوەند بدات ، بۆی دەکاتەوە " .[3]

ئیبنو مەسعود ( ﷺ ) دەفەرموێ :

" ببنە چاوگەی زانست و چرای ڕێنمونی و چەتری ماڵەکانتان و ڕووناکی شەوان .. و کەسانێك بن دڵ زیندوو بەرگ شڕ ، کە ببنە ئاشنا و ناسیاو و لەلایەن ئەهلی ئاسمانەکان و نەناسراو و نامۆ لەلای ئەهلی زەوی " .[4]

لە عبداللە ( ﷺ ) دەفەرموێ :

" سوێند بەو زاتەی کە هیچ پەرەستراوێکی هەق نی یە جگە لە ئەو ، هیچ شتێك نی یە لەسەر زەوی لەزمان زیاتر پێویستی بەبەند کـ ـنێکی درێژ خایەن بێت ".[5]

لە عبداللە ( ﷺ ) دەفەرموێت :

" هەر کەس لە ئێوە توانی گەنجینەکەی لە ئاسماندا هەڵگری ، لەوێ کەنەمۆرانە دەیخوات و نەدزان ئەیدزن باوا بکات ، چونکە دڵی مرۆڤ لەگەڵ گەنجینەکەیدایە " .[6]

هەر لە عبداللە وە گێڕدراوەتەوە ( ﷺ ) :

" کەس لە ئێوە لە ئاینەکەیدا چاولێکەری کەس نەکات ، بە جۆرێ ئەگەر کەسێ بڕوای هێنا ئەمیش باوەڕ بێنێت و ئەگەر بێ باوەڕ بوو ( هەڵگەڕایەوە ) ئەمیش

---

[1] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٧ ، ٢١٨ ) .
[2] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٧ ، ٢١٨ ) .
[3] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ١٧ ، ٢١٨ ) .
[4] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢١٨ ) .
[5] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٢٠ ، ٢٢١ ) .
[6] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٢٠ ، ٢٢١ ) .

هەڵگەڕێتەوە ، وە ئەگەر هەر چاولێکەریان کرد ، ئەوا شوێن پێ ی مردوان بگرن ، چونکە زیندوان دوورنین لە فیتنەو تاقیکردنەوە " .[1]

وە دەفەرموێت :

" لە ڕۆژی دواییدا بەندەی خوا دێنن و پێ ی دەوترێت : سپاردەکەت بدە ( جێ بەجێی کە ) ، ئەڵێت ، لە کوێ بێنم ئەی پەروەردگار ؟ خۆ دنیا ڕۆشتووە و تەواو بووە ، ئینجا دنیا لەناو چاڵی دۆزەخدا لەو شێوەدا خۆی دەنوێنێ کە ئەم ڕۆژگارێك باوەشی پێدا کرد بوو ، کابرا دادەبەزێت و هەڵی دەگرێت و دەیخاتە سەرشانی تا بیهێنێتە سەرەوە ، و تا ئەو کاتە وا ئەزانێ خەریکە دەیگەیێنێتە سەرەوە ، لەسەر شانی دەکەوێت و ئەمیش بەدوای خۆیدا فڕێ دەداتە دۆزەخەوە بۆ هەتا هەتایی " .[2]

وە دەفەرموێت :

" لەو کەسانە مەبە کەبە هەر بایەك شەن دەکات ، وتیان کامن ئەوانە ؟ فەرمووی / کەسێکە بڵێ من لەگەڵ خەڵکیدام ، ئەگەر هیدایەت دران ئەوە منیش هیدایەت وەرئەگرم ، ئەگەر گومڕا بوون منیش گومڕا ئەبم ، ئاگادارین ، ئێوە دەروونی خۆتان وا ڕائەبونن کە ئەگەر خەڵکی بێ باوەڕ بوون ئێوە بێ باوەڕ مەبن " .[3]

## " دیداری پەروەردگار "

پاش تەمەنێکی موبارەك کە عبدالله ی کوڕی مەسعود ( ﷺ ) لە ناو ئیسلامدا بەسەری برد و هاوبەشی کرد لە بنیاتنانی بینای ئەم ئاینەو ڕوخاندنی بونیادە پوچ و ناهەقەکان ، مردن لێ ی هاتە پێش ، چونکە ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو کە بارگەی بپێچێتەوە و بە قافڵەی خۆشەویستانی بگات ...

لە سەرەمەرگدا پێشەوا ( عوسمان ) ( ﷺ ) سەردانی کرد و ئەم وتوێژە لە نێوانیاندا تێپەڕی :

لە ( ظبیة )وە ، دەڵێت : کە عبدالله نەخۆش کەوت ، عوسمان هات بۆلای و فەرمووی : سکاڵای چی ئەکەیت ؟ فەرمووی / گوناهەکانم ، پرسی / ئەی ئامەزرۆی چی

[1] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٢٠ ، ٢٢١ ) .
[2] – هەمان سەرچاوە .
[3] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٢٠ ، ٢٢١ ) .

ئەکەیت ؟ فەرمووی / بەزەیی پەروەردگارم .. پرسی / پزیشکت بۆ نەهێنم ؟ فەرمووی / پزیشك خۆی نەخۆشی خستووم . فەرمووی / ئەی هیچ شتێکت ناوێ ؟ فەرمووی پێویستم پیێ ی نی یە .[1]

پاشان وەسیەتی کرد کە – زبێری کوڕی عوام ) نوێژی لەسەر بکات .. و ڕۆحی پاکی بەرەو لای پەروەردگار و خالقی هەڵفڕی تاوەکو لەوێ لە بەهەشتدا بحەوێتەوە .. :

﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ، فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ ﴾سورة القمر ، آية ( ٥٤ – ٥٥ ) .

واتە : پارێزگاران و خواناسان بێ گومان لە ناو باخ و ڕووبار و تاڤگەکانی بەهەشتدا ژیانی پڕ لە بەختیاری و کامەرانی هەمیشەیی دەبەنە سەر ، لە شوێنی ڕاست و پەسەندان لەلای خواوەندی بەدەسەلات .

- پاشان لە بقیع بەخاك سپێردرا ...

خوات لەگەڵ بێت گەورەم ..

---

[1] - بروانە / سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٤٩٨ ) .

## " ١٤ - عبدالله ی كوڕی عباس ( ﷠ ) "

## " ڕەببانیی* ئەم ئوممەتە "

زاناو دانای ئوممەتی ئیسلام و پێشەوای تەفسیر ، ( ابو العباس ) ( عبدالله ی ) كوڕی عباسی كوڕی عبدالمطلب . ئامۆزای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ە .
نزیكەی ( ٣٠ ) مانگ هاوەڵایەتی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا بەسەر برد .[١]
- لە ئیبنو عەباس ەوە ( ﷠ ) ، دەفەرموێ / كاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی كرد من تەمەنم ( ١٥ ) ساڵان بوو ، وە خەتەنەكرا بووم .[٢]

### " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵی لە دایك بوونی دەدات ( ﷠ ) "

لە ئیبنو عەباسەوە ، دەفەرموێ : " ئوم فەصل ی كچی حارث بۆی گێڕامەوە وتی : كاتێ تێپەڕ ئەبووم و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەبەردەم دەرگا دا بوو فەرمووی : " يا أم الفضل " وتم : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " انك حامل بغلام " واتە : كوڕێك لە سكتدایە .. وتم : چۆن ؟ لە كاتێكدا قورەیش پەیمانیان بە یەكداوە ژنەكانیان منداڵی نەبێ ، فەرمووی : " هو ما اقول لك ، فاذا وضعتيه فأتيني بـه " فەرمووی : ئەوەی پێم وتی وایە ، جا ئەگەر لە دایك بوو بیهێنە بۆلام . منیش كاتێ لە دایك بوو ، هێنام بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش ناوی نا (عبدالله ) و لیكی موبارەكی هێنا بە ملاشوویدا و فەرمووی : " إذهبي بـه ، فلتجدنـه كيساً " ، فەرمووی : " بیبە ، بەڕاستی ئەو كەسێكی زانا وبەهرەمەند لێهاتووی لێ دەردەچێ ..
دەڵێ : هاتم بۆ لای عباس و هەواڵەكەم پێدا ، ئەویش زەردەخەنەیەكی كردو هەڵسا و چوو بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ( عباس ) ( ﷠ ) كە پیاوێكی جوان و چاك و بالاَ بەرز بووە ... كاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاوی پێی كەوت ، هەڵسایەوە نێو چەوانی ماچ كردو لەلای ڕاستی خۆی دا نیشاند و پاشان فەرمووی : " هذا عمي ، فمن شاء فليباه بعمه " فەرمووی : " ئەمە مامی منە ، كێیش لە ئێوە حەز ئەكات بەمامەیەوە بنازێ ... عباس ( ﷠ ) هەندێ شتی وت : " وەك ئەوەی تەریق بێتەوە .

---

* ڕەببانی : واتە خواناس و خودا پەرست ، كەسێك زۆر خەریكی پەرستشی خودای گەورە بێت .
[١] - بڕوانە / سير اعلام النبلاء ( ٣ / ٣٣٢ ) .
[٢] - هیثمی دەڵێت / تەبەرانی ریوایەتی كردووە ، پیاوانی ، پیاوانی ( صحيح )ن . الجمع بە ژمارە (١٥٥٣٤).

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : و لم لا اقول و أنت عمي ، و بقية أبائي ، و العم و الد "[1] ... واتە: جابۆچی ئەمە نەڵێم کە تۆ مامی منی و پاشماوەی باوانمی، چونکە مام لە جێی باوکە (یاخود وەك باوکە).

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ئبنو عەباسەوە ( رضي الله عنه ) دەفەرموێ : -

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەباوەشی گرتم و فەرمووی : " اللهم علمه الحكمة "[2] ئەی پەروەردگار فێری دانایی بکە ..

٢- وە لە ئیبنو عەباسەوە ( رضي الله عنه ) فەرموویەتی :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ماڵی ( میمونە ) بوو ، منیش شەو ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادەکرد و دامنا ، دەڵێت : میمونە فەرمووی / ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەم ئاوی دەستنوێژە عبدالله ی کوڕی عباس بۆی داناویت ، فەرمووی : " اللهم فقهه في الدين ، و علمه التأويل " .[3]

واتە : ئەی خوای پەروەردگار شارەزایی ئاینی بکە و ڕاڤەی قورئانی فێر بکە .

٣- ئیبنو مەسعود ( رضي الله عنه ) دەفەرموێ : باشترین وەرگری قورئان ئیبنو عەباسە .[4]

٤- لە ( مجاهد )ەوە ، دەفەرموێ : کاتێ ئیبنو عەباس تەفسیری شتێکی بکردایە ، ڕووناکی یەکم لەسەری بەدی ئەکرد .[5]

٥- لە ( شقيق )ەوە ، دەڵێ : ئیبنو عباس لە وەرزی ( حەج ) دا بوو ، وتاری دا و بە سوورەتی ( نور ) دەستی پێ کرد ، هەر شتێکی دەخوێندەوە ، بەدوایدا تەفسیریشی دەکرد ، شێخێك لە ( الحی ) وتی : پاك و بێ گەردی بۆ خوا ، بەڕاستی هیچ وتارێکم

---

[1] - ئیسنادەکەی ( حسن )ە ، تەبەرانی گێڕاویەتەوە ، هیثمی دەڵێت : دانە پاڵەکەی ( حسن )ە ، الجمع بە ژمارە ( ١٢٢١٤ ) .

[2] - صحيح / سوننەتەکانی ( تیرمیزی ) ( ٣٠٠٤ ) ... لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوو بە ( ... تأويل الكتب ) صحیحە . ئیبنو ماجە / ١٣٦ .

[3] - حسن / احمد لە ( المسند ) دا ، شێخی ( عدوی ) دەڵێت : ( حسن )ە ، ( فضائل صحابة النبي ) ٦٥ .

[4] - صحيح : ئیبنو ابی شیبە ڕیوایەتی کردوە ، شەیخی عدوی دەڵێت : صحيحة ، فضائل صحابة النبيى ، ٦٥.

[5] - صحيح : عبدالله ی کوڕی احمد لە ( زوائد الفضائل )دا ڕیوایەتی کردوە ، شێخی ( عدوی ) دەڵێت : (صحيح)ە . هەمان سەرچاوە .

نەدیوە لەسەری پیاوێکەوە دەرچێت و ( تورك ) یش ئەگەر گوێ ی لێ بێ پێ ی موسڵمان دەبێ .[1]

– هەروەها ئیبنو عباس ( ﷺ ) جوان و پاك و بۆنخۆش بوو .

عطاء ، دەڵێت / هەر کەمانگم لە شەوی چواردەدا بدیبایە ، ڕووی ئیبنو عەباسم بیر دەکەوتەوە ..

وە لە ( عکرمە ) وە ، دەفەرموێ : کاتێ ئیبنوعەباس بەڕێیەکدا ئەڕۆیشت ، ئافرەتان لە پاڵ دیوارەکانەوە ئەیانوت ، ئاخۆ ئەوە ( میسك ) بوو تێپەڕی یان ئیبنو عەباس ؟[2]

## " ئیبنو عەباس بەدوای زانستدا دەچێت بە ئارامگریەوە"

– لە ڕاستیدا ئەم زانستە بە ئاسانی وەرناگیرێت، بەڵکو بۆ ئەوەی بەشێکیت پێشکەش بکات تۆ دەبێ هەموو خۆتی پێشکەش کەیت .

–هەر لەو ڕاسپاردانەش لەم بارەیەوە هاتوون : ئارامگریە لەسەر سەختی و نارەحەتی زانست ، سەربەرزیت پێ ئەبەخشێت ..

وە ئیبنو عباس ( ﷺ ) پێشەنگ بوو بۆ فێر خوازی زانست و بڵندگۆ و چرایەك بوو بۆ ڕووناك کردنەوەی ڕێی ئەوانەی شوێن پێی زانایان دەگرن ..

عبدالله ی کوڕی عباس ( ﷺ ) ، دەفەرموێ : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، بە پیاوێك لە ( انصار )م وت : هەڵسە بابچین پرسیار لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکەین ، چونکە ئێستا ئەوان زۆرن ...

– وتی : بەڕاستی کەسێکی سەیری ، ئیبنو عەباس ! وا ئەزانی خەڵك پێویستیان بە تۆ ئەبێ ، لە کاتێکدا ئەم کۆمەڵە هاوەڵانەیان لەناودایە کە ئەیان بینیت ؟ ئەو ڕۆیشت و منیش چووم بەدوای پرسیار کردنی خۆمەوە . ب سەرخەوی پێش نیوەڕۆ ) منیش لەبەردەم دەرگاکەی دائەنیشتم تاوەکو دوای زانستدا دەچووم هەرکەسم بناسیایە فەرمودەی لەبەرە دەچووم بۆلای کاتێ قەیلە لودا بوایە خۆڵ و خاکم بەسەر کۆ ئەبوویەوە

[1] – صحیحە : عبدالله ی کوڕی احمد لە ( زوائد الفضائل ) دا گێراویەتەوە ، شێخی ( عدوی ) دەڵێت : (صحیح)ە . هەمان سەرچاوە .

[2] – بڕوانە : سیر النبلاء ( ٣ / ٣٣٧ ) .

، پیاوەکە ئەهاتە دەرەوە ، کە بەو شێوە منی دەبینی ، دەیوت : ئەی کوڕە مامی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ﷺ بۆچی کەسێکت نەنارد بەدواما کە من بێم بۆلات ؟ منیش دەموت : حەق وایە من بێم بۆ لات و پرسیارت لێ بکەم ، دەڵێت : پیاوە ئەنصاری یەکە مایەوە و نەمرد هەتا منی بینی خەڵکی لە دەورم کۆ بوونەوە ( بۆ وەرگرتنی زانست ) ، وتی : " ئەم کوڕە لە من عاقڵ ترە" .[1]

## " زانستی ئیبنو عەباس ( ﷺ ) "

لە ( سعیدی کوڕی جبیر ) ەوە ، لە ئیبنو عەباسەوە ( ﷺ ) ، دەفەرموێ : پێشەوا ( عمر ) منی لەگەڵ خۆیدا دەبردە کۆڕو مەجلیسەکانی شێخانی بەدر ، هەندێکیان وەك ئەوەی پێ ی خۆش نەبێ دەیوت : بۆ ئەمەمان لەگەڵدا رووبەڕوو ئەکەیتەوە لە کاتێکدا ئێمەش کوڕی هاوتەمەنی ئەومان هەیە ؟ عومەریش دەیفەرموو : .. ئەویش یەکێکە لە ئێوە (واتە زانایان). ڕۆژێك بانگی ئیبنو عباسی کردوو لەگەڵیدا کردیە ژوورەوە ، ئەو ڕۆژە تەنها بۆ ئەوەی زانستی منیان نیشان بدات منی بردە ژوورەوە ، فەرمووی : ئێوە چی ئەڵێن دەربارەی ئەم ئایەتەی خوای گەورە : ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ ؟ سورة النصر ، آیة (١) .

هەندێکیان وتیان : –

فەرمانمان پێ کراوە سوپاسی خوا بکەین و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین کاتێ سەرکەوتن بوو بەنسیبمان و ڕزگاریمان هات ، وە هەندێکی تریان بێ دەنگ بوون و هیچیان نەوت ، فەرمووی : تۆش هەمان ڕات هەیە ، ئەی ئیبنو عەباس ؟

وتم : نەخێر ، فەرمووی : ئەی چی دەڵێیت ؟ وتم : بەڵکو ئەوە ئەجەل و وادەی پێغەمبەری خوا یە ( ﷺ ) کە پەروەردگار پێی فەرموو : ﴿ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّـهِ وَالْفَـتْحُ ﴾ ، ئەوەش نیشانەی هاتنی ( ئەجەل ) ی تۆیە : ﴿ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّـهِ أَفْوَاجـاً ، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً ﴾ سورة النصر ، آیة (٢ – ٣) .

عومەر فەرمووی : منیش هەروەك ئەوەی لێ ئەزانم کە تۆ ئەیلێیت .[2] وە عومەر ڕاوێژی پێ دەکرد لە هەرکارێکدا لەلای گرنگ بوایە و ئەیفەرموو ( غص غواص ) .[1]

---

[1] – دانە پاڵەکەی ( صحیح )ە / حاکم ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٥٣٨ ) . و دەڵێت : صحیح و زەهەبیش هەمان ڕای هەیە .

[2] – صحیح : بوخاری لە ( المغازی ) ( ٨ / ٩٩ ) ریوایەتی کردووە . هەروەها غەیری ئەویش .

عکرمە ، دەڵێت : پێشەوا ( علی ) ، چەند کەسێکی سوتاند کە هەڵگەڕا بوونەوە لە ئاینی ئیسلام ، ئەمە گەیشت بە ئیبنو عەباس ، فەرمووی :

ئەگەر من بوومایە ، بە ئاگر نەمدەسوتاندن ، چونکە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :

" لاتعذبوا بعذاب الله " . واتە : بە سزاو ئەشکەنجەی خودا ، سزای کەس مەدەن ، بەڵکو ئەمکوشتن هەروەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :

" من بدل دینه فاقتلوه " هەر کەس ئایینی خۆی گۆڕی ، بیکوژن " . ئەمە گەیشتەوە بە ( علی ) فەرمووی : ئای لە ئیبنو عەباس ( وەك مەدحێك ) ، بەڕاستی ئەو ڕۆچووە لە ناوشتەکاندا – لە زانستی شتەکاندا – .[2]

هەر لە ( عکرمە )وە ، دەڵێت : گوێم لە معاویە بوو پێ ی ئەوتم مەولاکەت – واتە ئیبنو عباس – سوێند بێ بەخوا زاناترینە لەناو مردوان و زیندواندا .

و لە ( طاوس ) ەوە ، دەڵێت : " لەگەڵ حەفتا یان هەشتا کەس لە شێخەکانی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا دانیشتووم ، کەسیان نەبوو ڕای دژی ڕای ئبنو عباس بێت ، بەڵکو هەر لە باسێکدا بەیەك دەگەیشتن پێیان دەوت : ئەوەیە کە تۆ دەیڵێیت ، یان ڕاست ئەیڵێیت .[3]

## " ڕێز و ئەدەبی ئیبنو عەباس ( رضي الله عنه ) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا "

ئیبنو عباس ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : لە کۆتایی شەوێکدا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ ) و لە پشتیەوە نوێژم کرد ، ئەویش دەستی وتم و ڕایکێشام تا گەیاندمیە لای ڕاستی کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕووی کردە ڕووگە ( قبلە ) چوومەوە دواوە و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژەکەی کرد و کە لێ بوویەوە ، فەرمووی : " ما شأنك أجعلك حذائي فتخنس ؟ " ، واتە : چیتە ، بۆچی دەتخەمە تەنیشت خۆمەوە ، بەلاَم تۆ ئەچیتەوە

---

[1] – ( عض غواص ) واتە ئەی ئەو کەسەی لە ناو زانستدا ڕۆچویت و مەلە دەکەیت ، ڕای خۆتمان نیشاندە لەو بابەتەدا .

[2] – سەنەدەکی ( صحیح )ە ، بوخاری بە بێ ئەم بەشە " فبلغ ذلك ... " ڕیوایەتی کردووە ، هەروەها ابو داوود و غەیری ئەویش .

[3] – هیثمی دەڵێت : تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە . پیاوانی ( الصحیح ) ن . الجمع ( ١٥٥٢٢ ) .

دواوە ؟ " وتم :ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەکرێ کەسێك لە تەنیشت تۆوە نوێژ بکات ، کە پێغەمبەری خوایت و خودا ئەو ڕێزەی بە تۆ بەخشیوە ؟

دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەرسام بوو ( معجب ) بە قسەکانم و دوعای بۆ کردم کە خودا زیاتر زانست و تێگەیشتنم پێ ببەخشێت .. [1]

## " ترسی لە پەروەردگار "

لە ( ابن ئەبو ملیکە )ەوە ، دەڵێت : لەگەڵ ئیبنو عباس لە مەککەوە هاوڕێ بووم تا مەدینە ، کاتێ لە جێ یەك دا ئەبەزین ، بەشێك لە شەو هەڵدەساو شەو نوێژی ئەکرد .

ایوب پرسی : خوێندنەوەی چۆن بوو ؟ وتی : جارێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴾ سورة ق ، آية ( ١٩ ) [2].

بەردەوام ئایەتەکەی ئەوتەوە و لەگەڵ وتنەوەیدا پرمەی گریانی زیاتر ئەبوو . [3]

## " کۆبوونەوەی لەگەڵ ( خوارج )ەکاندا "

کاتێ فیتنەی ( خوارج )ەکان سەری هەڵدا عبداللە ی کوڕی عباس ( رضي الله عنه ) چوو بۆ لایان و کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا دەربارەی ئەو بابەتانەی کە کەوتبوونە هەڵەوە تیایاندا و چەند وتوێژ و ڕاگۆڕینەوە یەك لە نێوانیاندا ئەنجامدرا بوە هۆی ئەوەی بیست هەزاریان قەناعەت بکەن و بچنەوە ڕیزی پێشەوا ( علی کوڕی ئەبی تالیب ) .

## " وەفات وماڵئاوایی "

ئیبنو عباس وەهاژیا ... بەردەوام ڕوناکی بانگەوازی بڵاو دەکردەوە و ڕاڤەی قورئانی دەکرد ... و لە کۆتایی یەکانی تەمەنیدا بینایی لە دەست دا .

---

[1] – هیثمی دەڵێت : احمد ریوایەتی کردوە . پیاوانی ( الصحیح ) ن . الجمع ( ١٥٥٢٦ ) .

[2] – واتە : ئەی ئینسان .. تەنگانەی مردن و ئازارەکانی هات ، هاوڕێ لەگەڵ ڕاستیەکاندا ئەوسا پێت دەوترێ : ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕووداوەیەکە کە خۆتت لێ لادەدا و پەنات لێ دەگرت .

[3] – بڕوانە حلیة الاولیاء ( ١ / ٣٢٧ ) .

پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) هەواڵی ئەمەی دابوو : لە ( موسای کوڕی میسرە )وە ، عەباس عبدالله ی کوڕی نارد بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ کارێك ، عبدالله پیاوێکی لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بینی ، بۆیە گەڕایەوە و هیچی نەوت ، پاش ئەمە عباس (ﷺ) بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت و فەرمووی : کوڕەکەم نارد بۆلات ، بەڵام کەسێکی لەلات بینی ، لەبەر ئەوە نەیتوانی قسەت لەگەڵ بکات .

– پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " یا عم ! تدری من ذاك الرجل ؟ " دەزانی ئەو پیاوە کێ بوو ، مامە ؟ وتی / نەخێر . فەرمووی :

" ذاك جبریل لقینی ، ولن یموت ابنك حتی یذهب بصره ، و یؤتی علماً " .[1] فەرمووی : ئەوە جبریل بوو هاتبوو بۆلام .. وە کوڕەکەت نامرێ هەتاوەکو بینایی نەڕوات و زانستێکی باش وەرنەگرێت ..

لە ساڵی ( ٦٧ یان ٦٨ )کۆچیدا دا ئیبنو عباس وەفاتی کرد و ڕۆحی پاکی بۆ لای پەروەردگاری بەرزبوویەوە .

## " ئایەتێك لە کاتی مەرگدا "

لە ( سعیدی کوڕی جبیر ) وە ، دەڵێت : ئیبنو عباس ( لە ( طائف ) وەفاتی کرد و ئێمە لەگەڵ جەنازەکەیدا بووین ، دیمان باڵندەیەك کە پێشتر نەبینرا بوو (هاوشێوەی نەبینرابوو ) هات و چووە ناو تابوتەکەی و پاشان نەبینرایەوە کە لێ ی بێتە دەرەوە ، ئەوە بوو کاتێ ئیبنو عباس سپاردەکرا ئەم ئایەتە لەسەر لێواری گۆڕەکەوە خوێنرایەوە کە نەزانرا کێ بوو خوێندیەوە :

﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي ﴾ سورة الفجر ، آية (٢٧ – ٣٠) .[2]

واتە : ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی ، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆڕازیە ، دەبچۆرە ڕیزی بەندە چاکە و بەڕێزەکانمەوە ،

---

[1] – هیثمی دەڵێت تەبەرانی ریوایەتی کردووە بە چەند ئیسنادێك و پیاوانی فەرموودەکە جێ ی متمانەن . الجمع ( ٩ / ٢٧٧ ) .

[2] – هیثمی دەڵێت : تەبەرانی ریوایەتی کردوە .. پیاوانی ن پیاوانی ( الصحیح )ن المجمع ( ٩ / ٢٨٥ ) بە ژمارە ( ١٥٥٣٥ ) .

بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە .

پێشەوا ( ذهبي ) دەڵێت : ئەمە بابەتێکی متواترە – دەماودەمە – [1]

وە ئەوان وابۆی دەچوون کە ئەم باڵندەیە زانستی عبداللە بێت ( ﷺ ) .. وە کاتێ ئیبنو عباس سپاردە کرا ( ابن الحنفیە ) فەرمووی : ئەمڕۆ ڕەببانی ئەم نەتەوەیە کۆچی کرد.. [2]

لە ژێر خاکی ( طائف ) دا جەستەی ڕوناکی بەباوەر و عەقیدە .. و بۆنخۆشکراو بە گوڵاوی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی داپۆشرا ...

[1] – بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٣٥٨ ) بەم لەفزە لەوانەیە مەبەستی ( چیرۆکی متواتر ) بێت .

[2] – ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٢ / ٣٦٨ ) .

## " ١٥ - ئەبو دەرداء ( رضي الله عنه ) "

## " دانای ئەم ئوممەتە "

ناسنامەی : -

پێــشەوای ڕابــەر و دادوەری دیمەشــق و هــاوەڵی پێغەمبــەری خــوا ( ﷺ ) ( ئەبو دەرداء عوەیمری کوڕی زیدی کوڕی قیس ی ئەنصاری خەزرەجی )یە و دانای ئوممەت و گەورەی قورئان خوێنەکانی دیمەشقە ..

سعیدی کوڕی عبدالعزیز ، دەڵێت / ئەبو دەرداء ڕۆژی بەدر موسڵمان بوو ، پاشان لە غەزای ئوحود بەشداری کرد ، ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کرد کە ئەوانەی وان بەسەر کێوی ( ئوحود ) ەوە بگێڕێتەوە دواوە ، ئەویش خۆی بە تەنها هەموویانی گەڕاندەوە.

### " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( انس )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، جگە لە چوار کەس نەبێ کەسی تر قورئانی لەبەر نەبوو ، ئەوانیش ( ئەبو دەرداء و معاذ و زەیدی کوڕی ثابت و ئەبو زەید ) بوون .[١]

( ارنئــووط ) دەڵێــت : ئــەو کــورت کردنەوەیــە ( قــصر ) ، لەم فەرموودە دا شتێکی زیاد کراوە نەك ڕاستەقینە ، بەڵکو ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت ) قورئانی پیرۆزیان لەبەر بووە و ( حافظ ) ناوی هەندێکیانی هێناوە لە ( الفتح ) دا ( ٩ / ٤٧ ، ٤٨ ) .[٢]

٢- ئیبنو عمر دەیفەرمووی / باسی هەردوو ژیر و هۆشمەندەکەمان بۆ بکەن ، ئەوترا کێن ئەو دوانە ؟ ئەیفەرموو : معاذ و ئەبو دەرداء .[٣]

---

[١] - صحیح : بوخاری ریوایەتی کردوە ( ٩ / ٤٧ ، ٤٨ ) . ( أبو زید ) یش وتراوە کە ( ثابت ی کوڕی زید )ە ، وتراویشە ( سعدی کوڕی عبید ) ە .

[٢] - بڕوانە / پەراوێزی ( سیر اعلام النبلاء ) ، ( ٢ / ٣٣٩ ) .

[٣] - پیاوانی جێ متمانەن ( ئیبنو سعد ) ریوایەتی کردووە ( ٢ / ٣٥٠ ) .

## " دونیا نەویستی ئەبو دەرداء ( ﷺ ) "

ئەبو دەرداء ، دەفەرموێ : پێش هاتنی ئیسلام بازرگان بووم ، بەڵام دوای ئەوەی ئیسلام هات ، بازرگانی و خوا پەرستیم بەیەکەوە کۆ کردەوە ، بینیم کۆنابنەوە ، لەبەر ئەوە وازم لە بازرگانی هێناو خووم دایە خواپەرستی .[1]

## " لەسەر وتنێکی گرنگی پێشەوا ( ذهبي ) "

پێشەوا ذهبي لەسەر ئەم قسەیەی ( ئەبو دەرداء ) ( ﷺ ) ، دەڵێت : " من دەڵێم باشتر وایە هەردوو جا ئەگەر لەگەڵ( جیهاد ) دا کۆبکرێتەوە ، وە ئەمەی کە فەرمووی رێگەی کۆمەڵێکە ( لەسەلەف و سۆفیەت ) ، گومانیش لەوەدا نیە کە سروشتی کەسەکان لەمەدا جیاوازە ، هەیانە تواناى گرێدانی هەر سێ حاڵەتەکەی هەیە هەر وەك پێشەوا ( صدیق و عبدالرحمن کوڕی عەوف و ابن مبارك ) ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) ، وە هەندێ کەسی تر ئەم توانایە یان نی یە و تەنها خەریکی خواپەرستی دەبن . هەمیشە لەسەرەتاوە تواناى کۆکردنەوەی هەرسێ حاڵەتەکەی هەیە ، و دواتر تواناى نامێنێ وە هەموو ئەم بۆ چوونانە گونجاون ، بەڵام پێویستە مرۆڤ کۆشش بکات بۆ بە دەست هێنان لە پێناو پێشێل نەکردنی مافی ماڵ و منداڵیدا .[2]

## " دیمەنێك لە خەباتی ئەبو دەرداء ( ﷺ ) "

( شریح ی کوڕی عبیدی حمص ) دەڵێت : کاتێ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ئوحود شکستیان هێنا ، ئەبو دەرداء یەکێ بوو لەوانەی لەو ڕۆژەدا بووە سێبەر لە دەوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، وە کاتێ بێ باوەڕان بەڕاسەری موسڵمانانەوە بوون ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " اللهم ليس لهم أن يعلونا " ئەی پەروەردگارا ئەوان بۆیان نیە لەسەر ومانەوە بن . ئینجا چەند کەسێك لە هاوەڵان خۆیان تەرخان کرد بۆ ڕووبەڕووبوەیان کە ( عومیر ابو دەرداء ) یەکێك بوو لەناویاندا و توانی یان بێ باوەڕان لە

---

[1] – هیثمی دەڵێت : ئەبەرانی ریوایەتی کردوە پیاوانیش پیاوانی ( الصحيح ) ن ، المجمع ( ٩ / ٣٦٧ ) .
[2] – بڕوانە ( سير اعلام النبلاء ) ( ٢ / ٣٣٨ ) .

جێگای خۆیان وە لانێن . و لەو ڕۆژەدا ئەبو دەرداء لە تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتوودا بوو ، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " نعم الفارس عويمر " بەه ، چ سوارچاکێکە عوەیمر[1] .

## " زانستی ئەبو دەرداء ( رضي الله عنه ) "

لە ( مسروق )ەوە ، دەڵێت :- بەدوای کاروباری هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) چووم ، بینیم زانستیان لە ( عمر و علي و عبدالله و معاذ و ئەبی دەرداء و زیدەی کوڕی ثابت ) دا ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) کۆبۆتەوە .[2]

وە لە ( سعیدی کوڕی عبدالعزيز )ەوە ، لە ( مسلم ی کوڕی مشکم )ەوە ، دەڵێت : ئەبو دەرداء پێی وتم : بزانە ئەم دانیشتنەمان چەند کەسی تیایە . دەڵێت : دەگەیشتە زیاتر لە ( ١,٦٠٠ ) کەس . دە دە قورئانیان دەخوێند و پێشبڕکێیان ئەکرد ، ئەوجا کە ئەبو دەرداء نوێژی بەیانی ئەنجام دا لەگەڵ سوننەتەکەیدا و ( جوٗ ) یێك لە قورئانی دەخوێندەوە ، هەموو چاویان تێ ئەبڕی و گوێیان لە وشەکانی ئەگرت وە ( ابن عامر ) پێشەنگیان بوو .[3]

نووسەر دەڵێت: بەڕاستی بانگەواز بۆ لای خوا بە بێ بوونی کۆششێکی وەها و بە بێ بوونی هیمەتی لەو جۆرە ، دەرئەنجامەکەی لادان و بێ بەرهەمی یە .. و بەڕاستی خودا زانست بە هەڵگرتنی ناباتەوە ، بەڵکو لەدنیا دەرچوون کۆچی زانایان هەڵدەگرێ .

## " چەند وتە و ئامۆژگاری یەك بە ئاوی ئاڵتون دەنووسرێت "

ئەبو دەرداء چەند ئامۆژگاری و وتەیەکی هەیە کە دەبێت لەسەر دڵ بنوسرێن و دەنەخشرێنێت . لەوانە : -

١- دەفەرلموێت : چیە ، وا ئەبیستم زاناکانتان ئەڕۆن و نەزانەکانیشتان زانست وەرنا گرن !.. زانست وەرگرن ، چونکە زانا و زانستخواز لە پاداشتدا هاوبەشن .

---

[1] - فەرمودەی ( مرسل ) ە : ئیبنو لسکر ریوایەتی کردووە هەروەها ( حاکم )یش لە ( المستدرك ) (٣٣٧/٣) دا.

[2] - سەنەدەکی ( صحيح )ە ئیبنو سعد ( ٢ / ٣٥١ ) ریوایەتی کردووە .

[3] - ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی جێ ی متمانەن پەراوێزی سير اعلام النبلاء ( ٢ / ٣٤٦ ) .

٢- فەرمووی : وەیل بۆ ئەو کەسەی بۆ جارێکیش بووە فێر نەبو ، وە وەیل بۆ ئەوکەسەی کە ئەزانێت و ، بەڵام حەوت جار کاری پێ ناکات .

٣- دەفەرموێت : وەها خواپەرستی بکەن وەك ئەوەی پەروەردگار ببینن ، وەخۆتان لەریزی مردوان دابنێن ، هەروەها خۆتان لە دوعای ستەم لێکراو بپارێزن .

٤- بزانن کە شتێکی کەم بێ نیازت بکات ، باشترە لە شتێکی زۆر کە سەرقاڵت بکات و گومڕات بکات . چاکە و بەخشندەیی لەناو ناچێت .. و خراپەش لە بیرناچێتەوە .

٥-دەفەرموێ : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە وای لە دەوڵەمەندەکان کردووە ، لە کاتی مردندا ئاوات بە ئێمە بخوازن و لەو کاتەدا ئێمە ئاواتیان پێ ناخوازین .. برا دەوڵەمەندەکانمان لەگەڵماندا دادپەروەر نین ، ئەوان ئێمەیان لەسەر ئاینەکەمان خۆش دەوێت ، بەڵام لەسەر دنیا دوژمنایەتیمان لەگەڵدا دەکەن .[1]

٦- دەفەرموێ : ئەی نەوەی ئادەم بە قاچەکانت ملکەچی بۆزەوی بنوێنە (واتە بەفیزەوە بەسەریدامەڕۆ) .. ، چونکە پاش کەمێك ئەبێتە گۆڕت ، ئەی نەوەی ئادەم ، بێ گومان تۆ پێکهاتویت لە چەند ڕۆژێك کە بەڕۆشتنی هەر ڕۆژێك ، بەشێك لە تۆ دەڕوات ئەی نەوەی ئادەم ، تۆ هەر لەو ڕۆژەوەی لە دایك بوویت بەردەوامی لە ڕوخاندنی تەمەنتدا ..

٧- هەروەها دیفەرموو : پەروەردگارا ، پەنات لێ ئەگرم لە پەرت پەرتی دڵ ، وترا پەرت پەرتیی دڵ چی یە ؟ فەرمووی : ئەوەیە لەهەر دۆڵێك ماڵێك دابنرێت .

٨- وە دەفەرموویێت : خەڵکی گەڵایەکی بێ دڕك بوون ، بوونە دڕکێکی بێ گەڵا ، ئەگەر ڕەخنەیان لێ بگریت ، ڕەخنەت لێ ئەگرن ، وە ئەگەر وازیان لێ بێنیت ، ئەوان واز لە تۆ ناهێنن . وتیان ، ئەی چی بکەین ؟ فەرمووی / شتێك لە ( عرض – ناموست ) بە قەرز بدەپێیان بۆ ڕۆژێ کە هەژار دەبیت .

٩- هەروەها فەرموویەتی : وەیل بۆ ئەو کەسانەی پارەو پول کۆ ئەکەنەو و دەمیان داچەقاندووە و وەك شێت هەر ئەوە دەبینن کە لەلای خەڵکە و ئەوە نەبونن کە لەلای پەروەدگارە ، ئەگەر بیانتوانیایە شەویان بە ڕۆژەوە دەبەستەوە ( شەویان ئەخستە سەر ڕۆژ ) . وەیل بۆ ئەوانە لە لێپرسینەوەیەکی توند و سزایەکی قورس .

---

[1] – ئەم ئامۆژگاری یانەی باسمان کرد لە ( سیر اعلام النبلاء ) لە بەشی ژیانی دا ( ﷺ ) وەرمانگرتووە .

١٠- هەروەها دەفەرموێ : ئەوانەی زمانیان بە یادی خوای پەروەردگار تەڕ و پاراوە ، ئەوە بە بزەو خەندەو دەچنە بەهەشت .[١]

" بەندەکان چەند سووک و بێ نرخن لە لای خوا کاتێ سەرپێچی ئەکەن "

لە ( ابن جبیر )ەوە ، ئەویش لە باوکیەوە ، دەڵێت : کاتێ ( قبرص ) ڕزگار کرا و دیلەکان بە بەردەم ( ابی دەرداء ) دا تێپەڕ بوون ، دەستی بە گریان کرد ، لێم پرسی : ئا لەم ڕۆژەدا دەگریت کە وا خوای پەروەردگار ئیسلام و ئەهلەکەی سەر بەرز کردووە ؟

فەرمووی : - ئەی جبیر ، دەبینی ئەمانە خاوەن دەسەلآت و پلەوپایە بوون ، بەلآم پەروەردگار بینی کە سەرپێچی دەکەن ئەمەی بەسەر هێنان کە ئەیبینیت ، ئای بەندەکان چەند بێ نرخن لەلای خوا کاتێ سەرپێچی ئەکەن .[٢]

لە ڕاستیدا لادان لە ڕێگەی ڕاستەقینەی ئیسلام ، و ڕۆچوون لە ناوڕێگای گومرایی و سەرپێچی و ئارەزووەکاندا ، هۆی بەهەلاکەت چوونی نەتەوە و گەلەکانە : ﴿ وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ فَحَاسَبْنَاهَا حِسَاباً شَدِيداً وَعَذَّبْنَاهَا عَذَاباً نُكْراً (٨) فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْراً (٩) ﴾ سورة الطلاق ، آية ( ٨ - ٩ ) .

واتە : لە سەدەکانی پێشوودا چەندەها شار و شارۆچکە یاخی بوون لە فەرمانی پەروەردگاریان و پێغەمبەرەکانی ، ئێمە زۆر بەتوندی حسابمان بۆ کردن و سزایەکی توند و پڕ ئێشمان بۆ پێشهێنان . ئیتر گیرۆدەی بەلآی خۆیان بوون و ئەو سزایە یان چەشت کە خۆیان دەست پێشکەری یان بۆ کرد بوو ، سەرئەنجامی کار و کردەوەی خەڵکی ئەو شوێنانەش زیانێکی گەورە بوو .

" بەرەو لای ( اَلرَّفِيقَ اَلأَعْلَى ) "

پاش بەڕێ کردنی تەمەنێك لە تێکۆشان بە شمشێر و بە زمان و بەهەر چی گونجا بۆی ، کاتی ئەوەهات تەمەنی کۆتایی بێت .. لە کۆتایی تەمەنیدا لەسەرەمەرگدا ئەبوو دەرداء دوایین ئامۆژگاری پێشکەش دەکات ، پێش ئەوەی یەکەمین هەنگاوی ڕێگای ئاخیرەتی هەڵگرێ .

---

[١] - لە صفة الصفوة ئەم ئامۆژگاریانە مان وەرگرتووە .

[٢] ، بڕوانە : ئیبنو عساکر ( ١٣ / ٣٨٩ / ١ ) .

ئوم دەرداء دەڵێت : کاتێ ئەبو دەرداء کەوتە سەرەمەرگ ، بەردەوام دەیوت : کێ کار بۆ ئەم ڕۆژەی من ئەکات ؟ کێ کار بۆ ئەم جێگایەی من ئەکات ؟

و لە سەر زەوی دیمەشق .. ڕۆحی پاکی بە شوێن بانگی پەروەردگاریدا بەرزبووەوە .. تا لەوێ ئارام بگرێ : ﴿ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَئِكَ رَفِيقاً ﴾ سورة النساء ، آية (٦٩) .

٭ ئەمەش لە ساڵی ( ٣٢ ) کۆچیدا بوو .. ( ڕەزای خوای لێ بێت ) .

# " ١٦ - قەتادەی کوڕی نوعمان ( رضي الله عنه ) "

## " ئەمیری تێکۆشەر "

ناوی : -

قەتادەی کوڕی نوعمانی کوڕی زەیدی کوڕی عامرە ، ئەبو عمری ئەنصاری بەدر یە و یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکان .

لەگەڵ ( ٧٠ ) کەسەکەدا ئامادەی ( عقبە ) بووە . وەیەکێ بووە لە تیرهاوێژە ناودارەکان .. لە هەردوو غەزای بەدر و ئوحودا بەشداری کردووە و لەو ڕۆژەدا لە چاوی درا و گلێنەی چاوی هاتەدەر .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دەستی موبارەکی خستیەوە جێ ی خۆی و بینایی هێنایەوە بۆ قەتادە و ئەو چاوەی بووە بیناترین چاوی .

لە ( عاصم ) ی کوڕی عمری کوڕی قەتادەوە ، لە باوکیەوە ئەمیش لە ( قتادەی کوڕی نعمان )ەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : ڕۆژی بەدر [١] لە چاوی درا و گلێنەی بەسەر گۆنایدا هاتە خوارەوە ، خەڵکی دەوروبەری ویستیان لیێ کەنەوە وتیان : بابچین بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ڕای ئەو وەرگرین ( ڕاوێژی پێ بکەین ) ، هەواڵەکە درا بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ... ئەویش لە خۆی نزیك کردەوە و گلێنەکەی بەرزکردەوە و لە جێ ی خۆی دانایەوە و ئەوجا لەپی دەستی پێدا هێناو فەرمووی : " اللهم اكسه جمالا " ، ئەی پەروەردگار جوانی یەك بکە بەبەریدا ، ئەوە بوو کاتێ قەتادە ( رضي الله عنه ) وەفاتی کرد ، ئەو کەسەی کە کفنی کرد . نەیزانی کام چاوەیان بوو کە پێکرا بوو .

وە لە ڕیوایەتێکی ( تەبرانی ) دا هاتووە ، [٢] پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی: " اللهم ان قتادة قد وقى نبيك بوجهه ، فاجعلها احسن عينيه و احدهما نظراً ".

فەرمووی / ئەی پەروەردگار ، قەتادە بەڕووی خۆی پێغەمبەرەکەی پاراست ، دەسا ئەو چاوەی بکەرە باشترین و بیناترینیان .

ئەوە بوو ئەو چاوەی قەتادە ( رضي الله عنه ) باشترین بوو دوای ڕووداوەکە ..

---

[١] - لە ڕیوایەتی ( دار قطنی )دا هاتووە کە ڕۆژی ( ئوحود )وای بەسەر هاتووە و لە ڕیوایەتێکی ( بیهقی ) دا لە ( ولائل النبوة ) دا هاتووە کەڕۆژی بەدر توشی ئەو ڕووداوە بووە . ارنۆط دەڵێت : پیاوانی جێ ی متمانەن . سەیر ( ٢ / ٣٣٢ ) .

[٢] - لاوازیەکی تێدایە .

قەتادە بەردەوام ، هاوڕێ لە گەڵ موسڵماناندا لە خەبات و جیهاد دا بوو ، لە دەست پێشی ئەمیری موسلمانان ( عمری کوڕی خەتاب ) دا بوو ، کاتێ بەرەو شام بەڕێ کەوتن و یەکێ بوو لەو تیرهاوێژانەی بە پەنجەی دەست دەژمێردران .

ئەم هاوەڵە بەڕێزە ساڵی ( ۲۳ )ی کۆچیدا لە مەدینە وەفاتی کردووە پێشەوا ( عمری کوڕی خەتاب ) ( ﷺ ) ئەو ڕۆژە چووە ناو گۆڕەکەیەوە و دواتریش نوێژی لەسەر کرد .

## " ١٧ - عامری کوڕی فهیره ( رضي الله عنه ) "

## " ئەو هاوەڵەی کە فریشتەکان سپاردەیان کرد "

هەندێ جار مرۆڤ بەخوا پەرستی و نزیك بوونەوەی لە پەروەردگاری ، ئەگاتە ڕیزی فریشتە نزیکەکان و وای لێ دێت لەسەرزەوی نامۆ و لە ئاسمانەکان ئاشنا دەبێت .. ئەگەر نەخۆش کەوێت ، فریشتەکان سەردانی دەکەن .. و کاتێکیش وەفات دەکات جەنازەکەی بەرێ دەکەن و هەندێ جار بەشداریی شۆردنیشی دەکەن و کفنی دەکەن و جار جاریش تابوتەکەی هەڵدەگرن و بەخۆیشیان بە گۆڕی دەسپێرن !!

بۆچی نا .. مەگەر ئەولیاکانی خوا خاوەنی کەرامات نین !! بۆ چی نین ؟ .. ﴿ لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ ﴾ سورة يونس ، آية ( ٦٤ ) . واتە : هەر بۆ ئەوانە موژدەی کامەرانی ( کە موژدەی قورئان و فەرموودەیە لە قیامەتیشدا (موژدەکان دەبنە واقع و بەزیادەوە دێنەدی ) ..

### " عامری کوڕی فهیره ( رضي الله عنه ) کێ یە ؟ "

مەولای پێشەوا ابوبکر ( رضي الله عنه ) و لە کۆچکەرە پێشینەکانە ، پێشەوا ئەبوبەکر کڕی و ئازادی کرد ، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بچێتە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبو ئەرقەم ، عامر موسڵمان بوو ، وە بۆ پەشیمان کردنەوەی لە ئاینەکەی ، تووشی ئەشکەنجەی بێ باوەڕان بووە ، بەڵام ئەو بەسەر ئەو ئەزمون و ناڕەحەتیانە دا زاڵ بوو ، و گوێی بە ئازار و ئەشکەنجە نەدا لە پێناوی پەروەردگاریدا .. پاشان کۆچی کرد لە مەککەوە بۆمەدینە ..

لەبەدر و ئوحود بەشدار بووە و پاشان لە ڕۆژی ( بئر معونە ) دا شەهید بووە .. چیرۆکی شەهید بوونیشی بەم جۆرەیە : -

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چەند کەسێکی‌نارد بۆ لای ( بنی سليم ) لە ناویاندا (عامری کوڕی فهیره ) بوو ، لەوێ لەلای ( بئر معونە ) دا عامری کوڕی طفیل دای بەسەریاندا و شەهیدکردن ، ( زهری ) دەڵێت : پێم گەیشتووە کە بە دوای لاشەی عامر

کوڕی فهیرە داگەڕان ، بەڵام نەیان دۆزییەوە ، دەڵێت : وای دەبینن کە فریشتەکان سپاردەیان کردبێت .[1]

ئبنو ئیسحاق دەڵێت : هشامی کوڕی عروە لە باوکیەوە بۆی باسکردم کە عامری کوڕی طفیل دەیوت : ئەو پیاوە کێ بوو کاتێ کوژرا ، بینیم لە نێوان ئاسمان و زەویدا بەرزکرایەوە تا دواتر لە ئاسمانیشدا دیار نەما ؟ وتیان : عامری کوڕی فهیرە بووە.[2]

عـروەی کـوڕی زبـێر دەڵێـت : وای دەبیـنین کـە فریـشتەکان ناشـتبێتیان ) ، ( صفه الصفوه / ١ / ٢٢٦ ) .

نووسەر دەڵێت : سوێند بەخوا ڕێزێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوهاوەڵە کەوا بە دەستی ئەو فریشتانە سپاردە کراوە کە پەروەردگار وەصفیان دەکات و دەفەرموێ : ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ * كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ سورة عَبَس ، آية ( ١٥ – ١٦ ) .

---

[1] - بڕوانە صفه الصفوه ( ١ / ٢٢٦ ) .

[2] - صحیحە ، بوخاری لە بابی ( المغازی ) ( ٧ / ٤٠٩٣ / فتح ) دا ڕیوایەتی کردووە .

# " ١٨ – بڵاڵی کوڕی ڕباح ( رضي الله عنه ) "

## " لە پێناوی خوادا هەمیشە خۆی بەستبوو بۆ خەبات تا مردن "

بیلالی کوڕی ڕباح ی ( مەولا )ی ئەبو بەکری صدیق و بانگبێژی پێغەمبەری خوا( ﷺ ) و لە پێشینە یەکەمینە بەڕێزەکانە لە ئیسلامدا ، لەوانەی کە لە پێناوی خوادا تووشی ئەشکەنجە هاتن . لەبەدر دا ئامادە بوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دەستنیشانکردن شایەتی چوونە بەهەشتی بۆ داوە .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە (ئەبو هریرە )وە ، دەفەرموێ / پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتی نوێژی بەیانی بە بیلالی فەرموو : ( حدثني بأرجى عمل عملته في الإسلام فأني قد سمعت الليلة خشفة نعليك بين يدي في الجنة ) ، فەرمووی باسی ئومێدەوارترین کارێکتم پێ بڵێ لە ئیسلامدا ئەنجامت دەئەبو ، چونکە من ئەمشەو گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بوو لەبەردەممدا لە بەهەشتدا ...

بیلال فەرمووی : هیچ کارێکم ئەنجام نەداوە باشتر لەوەی کە هەر کاتێ دەستنوێژێکی تەواوم گرتبێ لەکاتێ لە کاتەکانی شەو یان ڕۆژدا ئەوەی خوا نووسیبێتی نوێژم ئەنجام داوە .[1]

٢- وە لە ( انس ) ەوە ، ( رضي الله عنه ) دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( بلال سابق الحبشه ) .[2]

واتە / بیلال پێشی حەبەشی یەکانی داوەتەوە ..

٣- عمری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) فەرمووی : ئەبو بەکر گەورەمانە و هەروەك گەورەمانی ئازاد کرد – مەبەستی بلال بوو .[3]

---

[1] - صحیح : زانایان یەکران لەسەری ( منتفق علیه ) .

[2] - حسن لشواهده ، حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٢٨٥ ) شێخی عەدوی دەڵێت ( حسن لشواهدة ) . فضائل الصحابة ( ٣١ ) .

[3] - صحیح / بوخاری .

٤- وە لە ( عمر )ەوە ( ﷺ ) ئەبو سوفیان لەگەڵ چەند کەسێکدا هات بۆ لای (سلمان و صهیب و بلال ) فەرموویان : سوێند بەخوا شمشێرەکانی خوا جێگای خۆیان لەگەردنی دوژمنی خوادا نەگرتووە .

دەڵێت / ئینجا ابوبکر ، فەرمووی : چۆن ئەمە بە گەورە و شێخێك لە قورەیش دەڵێن . ئینجا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هەواڵەکەی پێ دا ئەویش فەرمووی : ( یا ابابکر لعلك اغضبتهم ، لئن کنت اغضبتهم لقد اغضبت ربك ) .
فەرمووی : ئەی ئەبوبەکر لەوانەیە بەوقسەت تووڕەت کرد بێتن ، خۆ ئەگەر تووڕەت کردبێتن ، ئەوا خوای خۆت تورە کردووە .

ئینجا ئەبوبکر ( ﷺ ) هاتەوە لایان و فەرمووی : برایانم ! بمبورن تووڕەم کردن ؟
وتیان : نەخێر ، خوا لێت خۆش بێ براگیان .[1]

٥- وە لە ( ئەبو هریرە )وە ، لە پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) دەفەرموێ :
( مثل بلال مثل النحلة غدت تأكل من الحلو والمر ثم هو حلو كله )[2]

واتە : نموونەی بلال وەك هەنگ وایە کە لە تاڵ و شیرین دەخوات و خۆیشی هەموو شتێکی هەر شیرینە .

## " بەرگە گرتنی ئەشکەنجە لە پێناوی خوادا "

لە ( ابن مسعود )ەوە ، دەڵێت : ( یەکەمینی ئەوانەی ئیسلامیان ئاشکرا کرد حەوت کەس بوون پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ، ئەبوبەکر ، عمار ، سمیەی دایکی و ، صهیب و بلال و مقداد ) ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) .

هەرچی سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەوا خوا بە هۆی مامیەوە پاراستی ، ئەبوبەکریش بە هۆی تیرە و هۆزەکەیەوە پارێزرا ، ئەوانی تر هەموویان بێ باوەڕان بردنیان و بەرگی ئاسنینیان لەبەر ئەکردن ولەبەر خۆردا ڕایان دەگرتن ، ئینجا هەریەکە لەوانە یان شەهیدیان دەکردن یان ناچاریان دەکردن بە پەشیمان بوونەوە ، جگە لە بیلال کە نەفسی خۆی لە پێناوی خوادا بە کەم دەزانی و هەروەك لای قەومەکەشی بێ نرخ بوو

[1] - صحیح / مسلم .
[2] - سەنەدەکی ( حسن )ە ، هەیثەمی دەڵێت : تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە و اسنادەکەی ( حسن )ە ، بەژمارە (٣٩/ ١٥٦) .

، لەبەر ئەوە بردیان و دایانە دەست منالە وردە و ئەوانیش بەدەوری کێوەکانی مەککە دا دەیان سوڕاندەوە .. بەلاّم بلال بەردەوام زمانی بە وشەی ﴿ أَحَدٌ ... أَحَدٌ ﴾ ەوە بوو .[1]

ئومەییەی کوڕی خەلەف کە گەورەی بیلال بوو ، لە قرچەی نیوەڕۆدا دەهات و خۆر گەرم دەبوو ، بیلالی دەتلاندەوە بەسەر ئەو خۆڵەی کە لەبەر هەتاوەکەدا قرچەی دەهات و فەرمانی ئەکرد بەردی گەورەیان ئەخستە سەر سنگی و پێ ی ئەوت هەروا ئەبیت تاوەکو محمد بەدرۆ ئەخەیتەوە لات و عوزا دەپەرستیت یاخود ئەمریت ، بەلاّم بیلال بێ دەنگ نەدەبوو لە وتنەوەی ﴿ أَحَدٌ ... أَحَدٌ ﴾ .

ئیبنو کەسیر دەڵێت : ( کاتێ لەمەدینەدا بڕیاری بانگدرا ، بیلال لەگەڵ ( ابن ام مکتوم ) بە نۆرە و لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بانگیان دەدا . جارێ ئەم و جارێ ئەو . وە بیلال دەنگێکی خۆش و زولاّلی هەبوو .. ئەوەشی کە دەگێڕنەوە وە گوایە ( سین )ی بیلال لە لای خودا ( شین )ە ) هیچ بنەمایەکی نی یە .. هەروەك لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا لەسەر کەعبەی پیرۆز بانگی فەرموو .. و کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد بیلال وازی لە بانگدان هێناو .. پاشان چوو بەرەو شام بۆ جیهاد . )[2]

## " دابەزینی قورئان سەبارەت بە بیلال "

لە ( سعدی کوڕی ئبو وەقاص )ەوە ( ﷺ ) ، دەفەرموێ : ئێمە شەش کەس بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بێباوەڕان وتیان : ئەوانەی وا لەگەڵتن دەرکە ، چونکە ئەوانە کەسانێکن لە شانی ئێمەدانین . شەشە کەسەکەش من و ابن مسعود و بلال و پیاوێك لە ( هذیل ) و دوانی تر بووین .. ئیدی خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند :

﴿ ... الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ ... ﴾ سورة الأنعام ، آية ( ٥٢ ) .

واتە : ( ئەی محمد ( ﷺ ) نەکەیت ئەوانە دەربکەیت ( لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین ) کە لە بەیانیان و ئێوارانـدا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە ... ) تا کۆتایی ئایەتەکان .

---

[1] - حاکم ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٢٨٤ ) . دەڵێت : سەنەدەکی ( صحیح )ە زەهەبیش بە صحیح دایناوە . (حیاه الصحابه ، ١ / ٢٢٠ ) .

[2] - بڕوانە : البدایه و النهایه ( ٥ / ١٧٨ ) .

## " سۆزی بیلال ( رضي الله عنه ) بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە سەعیدی کوڕی عبدالعزیز و غەیری ئەویشەوە دەگێڕنەوە کە : بیلال دوای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ هیچ کەس بانگی نەدا بەڵکو ڕووی لە جیهاد کرد .. ئەبوبەکر ( رضي الله عنه ) ویستی ڕێگەی لێ بگرێت ، فەرمووی / ئەگەر لەبەر خوا منت ئازاد کردووە ، ئەوا دەست بەردارم بە .

دەڵێت : بیلال لە شام مایەوە تاوەکو عمر ( رضي الله عنه ) هاتە .. ( جنەبوە ) و موسڵمانان داوایان لە عمر کرد داوا لە بیلال بکات بانگیان بۆ بدات ئەویش داوای لێ کرد . ئەوە بوو بیلال ڕۆژێك بانگیدا ، لەو ڕۆژەدا هێندە گریا بوو کە پێشتر وەها نەبینرا بوو بگری .. ئەویش بە هۆی یادکردنەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ولید وتی : لەو ڕۆژەوە خەڵکی شام لە جیاتی بیلال خۆیان بانگیان دەدا !! .[1]

بیلال ( رضي الله عنه ) لە شام بە خەریك بوون بە خەباتەوە و لەوێ مایەوە تاوەکو لە تاعونەکەی (عمواس ) دا ساڵی ( ١٨ ) کۆچیدا وەفاتی کرد .[2]

سعیدی کوڕی عبدالعزیز دەڵێت : کاتێ بیلال کەوتە سەرەمەرگ فەرمووی : سبەی دەگەم بەخۆشەویستان ، ( ﷺ ) و هاوەڵانی . لەوێدا خێزانەکەی وتی : واوەیلا بۆ من ! بیلالیش وتی : بەڵام خۆشی بۆ من !

بەڵێ ئەی گەورە و سەروەر ( خۆشی لە خۆت ) بۆچی نا ؟ مەگەر مردن بۆ باوەڕدار پردێك نی یە کە خۆشەویستان بەیەك دەگەیەنێت .

---

[1] - ارنۆوط دەڵێت : پیاوانی جێ ی متمانەن ، بەڵام بە بچڕ بچڕی هاتووە ، سیر ( ١ / ٣٥٧ ) . وەلیدیش (وەلیدی کوڕی مسلم )ە .

[2] - ئیبنو کثیر ئەم ڕایەی پەسەند کردووە / بدایە : ( ٥ / ١٧٩ ) .

## " ١٩ – عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی حرام ( ﷺ ) "
## " پەروەردگار بەبێ پەردە لەگەڵی دەدوێ !! "

بەراستی بەڕێزان .. ئەمەی دەیخوێنینەوە جێگای سەرسوڕمانە .. کەسێك پەروەردگار بە بێ پەردە لەگەڵی بدوێ !! بەڵام هەر بە خوێندنەوەی ئەم فەرموودەیەی زاتی ئیلاهی ئەو سەرسوڕمانەمان نامێنێ کە دەفەرموێ : ﴿ ... وَلَكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ... ﴾ سورة ابراهم ، آية ( ١١ ) . واتە : بەڵام خودا خۆی منەت دەخاتە سەر هەر کەسێ ذاتی خۆی ویستی لەسەری بێ لە بەندەکانی ...

### " ئەم خۆشەویستەی خوا کێ یە ؟ "

عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی حەرامی ئەنصاری یە ، باوکی جابر و یەکێکە لە خاوەن ڕێزەکانی شەوی عەقەبە . لەبەدر دا بەشداری کردووە ، و لە ئوحود شەهید کراوە.. چیرۆکەکەی بەم جۆرەیە : –

لە جابری کوڕی عبداللە وە ( ﷺ ) دەفەرموێ : کاتێ غەزای ئوحود هاتە پێش شەو باوکم هات بۆ لام و فەرمووی / من هەست ئەکەم لەم جەنگەدا دەکوژرێم لەگەڵ یەکەمین هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، سوێند بەخوا پاش خۆم لە دوای گیانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە تۆ نازیز ترم نیە ، وە من قەرزێکم بەسەرەوەیە بۆم جێ بەجێ کە و لەگەڵ خوشکەکانت باش بجوڵێوە ، دەڵێت : کە ڕۆژمان کردەوە ، باوکم یەکەم شەهید بوو لە جەنگەکەدا و لەگەڵ کەسێکی کەدا خستمە گۆڕێك . ئەبینم دڵم ناهێنێ کە لەکەڵ کەسێکی کەدا بەیەك گۆڕی بسپێرم بۆیە پاش شەش مانگ دەرم هێنایەوە ، دەبینم هەروەك ئەو ڕۆژەیە کە خستبوومە گۆڕەکەوە جگە لە گوێچکەی نەبێت .[1]

وە لە ( جابری کوڕی عبداللە ) وە ، دەڵێت : کاتێ عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی حرام ڕۆژی ئوحود شەهید کرا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێ ی فەرمووم:

(.یا جابر ! ألا أخبرك ما قال الله عزوجل لەبوك ؟ ) فەرمووی :

---

[1] - حاکم ریوایەتی کردوە ( ٣ / ٢٠٣ ) دەڵێت : فەرموودەی ( صحیح ) لەسەر مەرجی ( مسلم ) .

ئەتەویٰ ، پێت بڵێم کە خوای پەروەردگار چی بە باوکت فەرموو ؟ وتم ! بەڵێ ، فەرمووی : ( ماكلم الله احداً إلا من وراء حجاب ، و كلم أباك كفاحاً [1] ، فقال : يا عبدي تمن علي أعطك ، قال : يارب ! تحيني فأقتل فيك ثانية . قال إنه سبق مني ( أنهم اليها لايرجعون ) قال : يــارب فأبلغ من ورائي ) [2]

فەرمووی : ( خوای گەورە لەگەڵ هیچ کەس قسەی نەکردووە لە پشتی پەردەوە نەبێت ، بەڵام لەگەڵ باوکتدا ڕووبەڕوو دواوە و فەرموویەتی ، ئەی بەندەکەم ئاواتەکانتم پێ بڵێ با بیهێنمەدی ، ئەویش دەڵێت پەروەدگارم ! ئاواتم ئەوەیە زیندووم کەیتەوە تاوەکو لە پێناوتدا دووبارە بکوژرێمەوە ، فەرمووی : بەڕاستی ئەوە شتێکە بڕاوەتەوە کە ( انهم اليها لايرجعون ) [3]

دەڵێت : ئەی پەروەردگار ! دەی بەوانەی دوای خۆم ڕابگەیەنە .

پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً ...﴾ سورة آل عمران ، آية ( ١٦٩ ) .

واتە : وانەزانن ئەوانەی لە پێناوی خوادا کوژراون ، مردوون .... .

هەروەها لە جابرەوە دەڵێ : باوکمیان بۆ هێنام ڕۆژی ئوحود کە شێوێنرا بوو ، ئەوە بوو گەیەنرایە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە جلێکی بەسەردا درا بوو ، ویستم لایبەرم و دەری خەم ، بەڵام هۆزەکەم ڕێیان نەدام ، دیسان هەوڵمدایەوە لایبەرم بەسەریەوە ، ئەمجارەش هۆزەکەم ڕێگەیان لێ گرتم ، ئینجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی کرد بە لابردنی . لەو کاتەدا گوێ ی لە دەنگێ بوو هاواری کرد . فەرمووی : ئەمە کێ یە وا هاوکار دەکات وتیان ، کچی عەمرە یان خوشکی عەمرە ، فەرمووی : ( فلم ؟ تبکی أو لاتبکی ، فمازالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفع ) . [4]

فەرمووی : جا بۆچی دەگری ؟ یان بانەگری ، ئەو بەردەوام فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ کرد تا بەرز کرایەوە .

---

[1] - واتە : ڕووبەڕوو بە بێ هیچ پەردەیك یان پەیامنێرێك . ئەمەش پاش مردنیەتی و پێش مردنی نەبووە .

[2] - حسن : صحيح ی سوننەتەکانی ئیبنو ماجە ( ٢٢٧٦ ) ارئوط بە ( حسن ) دایناوە . سیر ( ١ / ٣٢٨ ) .

[3] - واتە بێ گومان کە ناگەڕێتەوە ژیانی دونیا .

[4] - صحيح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە .

وە شەهیدەکان هەر لەوێدا کە شەهید کرا بوون بە خاك سپێردران .. و کاتیٚ پێغەمبەری خوا ( ﷺ )( هات بۆ دفن کردنیان فەرمووی : ( زملوهم بجراحهم ، فأنا شهيد عليهم)[1] فەرمووی : بەبرینەکانیانەوە دایانپۆشن ، بیٚ گومان کە من شایەتم لە سەریان .

وە ( ابن سعد ) ، ( ٣ / ٥٦٣ ) لە جابرەوە ، ( ڕەزای خوای لیٚ بێت ) دەفەرمووێ : ( کاتیٚ ( معاویە ) بیرەکەی لیٚ دا و فەرمانکرا بە دەرهێنانی شەهیدەکانی ڕۆژی ئوحود ، کاتیٚ دەرمانهێنان پاش چل ساڵ جەستەیان نەرم بوو ، چوار پەلیان دەنوشتێنرایەوە . ئەمەش مانای ئەوەیە کە زەوی لاشەیانی نە خواردووە !! ( ڕەزای خوایان لیٚ بێت ) .

[1] - سەنەدەکی ( صحیح ) ە / ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە . ( ٣ / ٢ / ١٠٥ ) .

## " ٢٠ – عەمری کوڕی جموح ( رضي الله عنه ) "

## " ڕێی لێ مەگرن ، بەڵکو خوای گەورە شەهیدی پێ ببەخشێت "

فەرمودەی پێغەمبەر ( ﷺ )...

کێ یە ؟

عەمری کوڕی جموح کوڕی زەیدی خەزرەجی ئەنصاری یە .

ئامادەی ئوحود بوو ، ئەم کوڕانەی هەیە : معاذ و معوذ و خلاد . کە هەموویان ئامادەی بەدر بوون ، وە عەمری کوڕی جموح لەگەڵ ( خلاد ) ی کوڕی ڕۆژی ئوحود شەهید بوون.

### " مسوڵمان بوونی عەمر "

لە عکرمەوە ، دەڵێت : مصعبی کوڕی عمیر هاتە مەدینە و خەڵکی فێر دەکرد . عەمری کوڕی جموح کەسێکی ناردە لای وْ وتی : ئەمە چی یە هێناوتانە بۆمان ؟ وتیان : ئەگەر دەتەوێ دێین بۆ لات و قورئان دەدەین بە گوێتدا تا بزانیت چی یە ؟ وتی : باش ، ئینجا چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتی ( یوسف )ی بۆ خوێندەوە عەمر وتی : با ڕاوێژێك لەگەڵ هۆزەکەمدا بکەم .. عەمر گەورەی ( بنی سلمە ) بوو .

ئەوجا عەمر چووە لای مناف ( کە یەکێ بوو لەو بتانەی پێش ئیسلام دەیانپەرست) وتی : ئەی مناف ! سوێند بەخوا ئەزانیت کە هۆزەکەم غەیری تۆیان ناوێت، تۆ دەڵێیت چی ؟

ئینجا شمشێرەکەی لەگەردنی ( مناف ) کرد و ڕۆیشت ، ئەوجا ئەهلەکەی هەڵسان شمشێرەکەیان برد ، کاتێ عەمر گەڕایەوە : وتی : باشە کوا شمشێرەکە ئەی مناف ؟ تیاچوو ڕیسوا بێت ، خۆ بزن بە بزنی خۆی پارێزگاری لە عەورەتی خۆی ئەکات . سوێند بەخوا ئەزانم سبەی خێر لە ( ئەبوی جعار ) دا نئەبونم پاشان پێیانی وت : ئەوا من دەڕۆم بەلای ماڵەکەمەوە ئێوەش داوای چاکە لە مناف بکەن . لێیداو ڕۆیشت ..

ئەوانیش هەڵسان بەشکاندنی و بەسەگێکی مردارەوە بووە وە بەستیانەوە و فڕێیاندایە ناو بیرێك [1] کاتێ گەڕایەوە ، وتی : حاڵتان چۆنە ؟ وتیان : باشین . گەورەم ، خوای پەروەردگار ماڵەکانمانی لە پیسی پاك کردەوە .

[1] - کوڕەکانی پێش خۆی موسڵمان بوو بوون .

وتی : سوێند بە خوا ئەبینم کە پاش خۆم خراپ جێنشینیتان کردووم دەربارەی ( مناف ) . وتیان : ئەوەتا ، لێ ی بڕوانە لەناو بیرەکەدا ، ئەویش هات و سەیرێکی کرد پاشان ناردی بە دوای قەومەکەیدا و پێ ی وتن : ئایا من هەر ڕێیەك بگرم ئێوەش شوێنم دەکەون ؟ وتیان : بەڵێ ، تۆ گەورەمانی ، ئەویش فەرمووی : دەی ئەوا من ئێوە دەکەم بە شاهد کەوا من باوەڕم هێنا بەوەی بۆ (محمد ﷺ ) دابەزیوە ...

لە ( ابن المنکر )ەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ئەی هۆزی ( بنی سەلەمە ) کێ گەورەتانە ؟ [1]

وتیان : باپیرمان ( ابن قیس ) ، بەڕاستی ئێمە ، چاومان پیایدا هەڵنایە ، چونکە کەسێکی چروکە . فەرمووی : ( جا چ دەردێك هەیە لەمە خراپتر ، بەڵکو گەورەتان خاوەن کەرەم عەمری کوڕی جموحە ).

## " دڵنیام دەچمە بەهەشت !! "

واقدی دەڵێت : لەبەدر دا ئامادە نەبوو ، چونکە کەسێکی شەل بووە ، بەڵام کاتێ خەڵکی خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگی ئوحود و کوڕەکانی ڕێگەیان لێ گرت لەوەی بەشدار بێت و وتیان تۆ کەسێکی خوا بیانووی پێداویت کەنە جەنگیت . [2]

ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و سکالآیانی لاکرد فەرمووی : ( لا علیکم أن لاتمنعوه ، لعل الله یرزقه الشهادة ) [3] فەرمووی : بۆتان نیە ڕێی لێ بگرن ، بەڵکو خوا شەهادەتی پێ ببەخشێ .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عەمری کوڕی جموح بە کوڕەکانی دەڵێت : ئێوە ڕۆژی بەدر ڕێگەی بەهەشتتان لێ گرتم ، سوێند بە خوا ئەگەرمام ، هەر دەچمە

---

[1] - فەرموودەکە : ( یئیبنوی سلمة ! من سیدکم ؟ ) قالوا : الجدبن قیس ، و انا لنبخلة ، قال : ( و أي داء أدوى من البخل ؟ بل سیدکم الجعد الأبیض عمر و بن المجوح ) پیاوانی فەرموودەکە جێ متمانەن ، بەلام (مرسل )ە ابونعیم لە ( اکلة ) ( ٧ / ٣١٧ ) ریوایەتی کردوە هەروەها بوخاری لە ( الأدب المفرد ) دا .

[2] - خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَلا عَلَى الأَعْرَجِ حَرَجٌ ﴾( سورة نور ، آية ٦١ )

[3] - پیاوانی جێ ی متمانە : ئیبنو هشام ( ٢ / ٩٠ ) .

بەهەشتەوە!!ئەوەبوو کە غەزای ئوحود هاتە پێشێ ، عمر ( ﷺ ) فەرمووی : جگە لە خەمی ئەو هیچ خەمێکی ترم نەبوو ، بۆیە داوام کرد ، دەبینم لەبەرەکانی پێشەوەدایە .[1]

### پەروەردگارا .. مەمگێڕەوە !

خێزانی عەمر دەڵێت : چاوم لێ بوو ، وەك ئەوەی خۆی ئامادە کات بۆ جەنگ ڕۆژی ئوحود ، لەبەر خۆیەوە دەیوت : ئەی خوای پەروەردگار مەمگێڕەوە . ئەوە بوو خۆی و ( خلاد )ی کوڕیشی لەو جەنگەدا شەهید بوون . عەمری کوڕی جموح سواری حوشترەکەی بوو ، و شمشێرەکەی بە دەستەوە و بەزمانیشی لە خودا دەپاڕایەوە کەمنەتی شەهادەتی بەسەردا برێژێت و بە نائومێدی نەیگەڕێنێتەوە !!

### " پەیژەیەك بەرەو ئاسمان "

کاتێ کۆمەڵی موسڵمانان و کۆمەڵی بێ باوەڕان بە یەك گەیشتن : عەمری کوڕی جموح هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وپرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئەگەر من لە پێناوی خوادا ( بجەنگم ) هەتا دەکوژرێم ، ئەم قاچەم لە بەهەشتدا بە ساغی ڕێ ئەکات؟

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : بەڵێ ، ئەوە بوو کاتێ لە ڕۆژی ئوحود دا عەمر لەگەڵ برازاکەی و ( بەندەیەکیدا ) یەکیدا شەهید کران و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەلای لاشەکەیاندا تێپەڕی فەرمووی : ( كأني أنظر اليك تمشي برجلك هذه صحيحة في الجنة )

فەرمووی : وەك ئەوەی بە چاوی خۆم دەتبینم و لێت دەڕوانم کەوا بەو قاچەتەوە بە ساغی لەبەهەشتدا ڕێ ئەکەیت .. و پاشان فەرمانی کرد هەرسیانیان بخرێنەیەك گۆڕەوە .[2] لە ڕیوایەتێکی تردا ڕۆژی ئوحود پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( قوموا الى جنة عرضها السموات و الارض أعدتْ للمتقين ) .

واتە : خۆتان ئامادەکەن بۆ بەهەشتێك فراوانی یەکەی هێندەی فراوانی ئاسمانەکان و زەوی یە وبۆ تەقواداران ئامادەکراوە . عەمریش کە قاچێکی ئەشەلی

---

[1] - پیاوانی جێ متمانەن : بەلام بچڕ بچڕە . بڕوانە پەراوێزی سير أعلام النبلاء ( ١ / ٢٥٥ ) .

[2] - سەنەدەکی ( حسن )ە / احمد تخريجی بۆ کردووە ( ٥ / ٢٩٩ ) ( حافظ )یش لە ( الفتح ) دا بە (حسن ) دایناوە ( ٣ / ١٧٣ ) .

هەڵسایەوە و وتی : ( سوێند بە خوا ئەبێ لە بەهەشتدا بارگە دانێم – واتە لەسەر پشتی ئەم ولاّخەم دانا بەزم لەبەهەشتدا نەبێ ) ئەوەبوو جەنگا هەتاوەکو شەهیدیان کرد.

مالك دەڵێت : عەمر لەگەڵ ( عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی حرام ) دا خرانە یەك کفن و هەر لەو جێیەی جەنگەکەی تیا ئەنجامدا بەخاك سپێردرا ( ﷺ ) .

لەسەردەمی ( معاویە ) دا بوو کە ئاوی باران و لافاو گۆڕەکەی تێك دابوون بۆیە دەریان هێنان و جێیەکە یانیان گۆڕی ، بینیان هیچ نەگۆڕابوون وەك ئەوەی دوێنێ مرد بێتن، یەکێکیان کە بریندار کرا بوو دەستی خستبووە سەر برینەکەی و بەو جۆرە شەهید بوو بوو ، بۆیە هەر بەو جۆرە دفنیان کردبوو ، وە ئەو ڕۆژەی دەریان هێنایەوە تاوەکو جێگەکەی بگۆڕن ، دەستیان لابرد لەسەر برینەکەی و پاشان بەریان دا وەك خۆی گەڕایەوە سەر برینەکەی ، ئەمەش دوای ٤٦ساڵ بوو . [١]

بەو جۆرە شەهادەتی کردە پەیژەیەك بەرەو ئاسمان ( ڕەزای خوای لێ بێت ) .

[١] - صحیح : ( ئیبنو سعد ) بە درێژ تر لەمە تخریجی کردووە ، حافظ : لە ( الفتح )دا دەفەرموێ (صحیح)ە ، (١٧٣/٣) .

## " ٢١ – ئەبو دوجانە ( رضي الله عنه ) "

## " خاوەنی سەروپێچی مەرگ "

کێ یە ؟

ئەو پاڵەوانە شێرە ئاسا یە کە بە ( ابو دوجانه ) بەناوبانگە ناوی ( سماکی کوڕی خەرشی کوڕی زەیدی ساعدی ) یە .

لەبەدر و ئوحود دا بەشدار بووە لە جەنگی ئوحود دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە و بەیعەتی دایە لەسەر مردن ، وە ڕۆژی ( یەمامە ) شەهید بوو. یەکێ بوو لەوانەی بەشداریان لە کوشتنی موسەیلەمەی درۆزندا کرد .

ئەم پاڵەوانە مان بەوە لە هاوەڵانی تر جیا ئەکرێتەوە کە ڕێگەیەکی تاک و تایبەتی هەبوو لەشەڕ کردندا ، لە جەنگدا .. وەها دەبینرا کە سەر و پێچێکی سووری لەسەری دەپێچا وەك دروشمێك بۆ ئازایەتی و لەڕۆشتنیدا فەخر و شانازی ئەکرد وەك ئەوەی گاڵتەی بە باتڵ و ئەهلەکەی بێت .. و شمشێرەکەی بەرز دەکردەوە وەك مەشخەڵێکی ئاگرین .. و هەر کە لە گەردنی بێ باوەڕێکی دەدا ، بەڕاست و چەپیدا ڕووی وەردەگێڕا و وەك شێر هاواری دەکرد : " من ئەبو دوجانەم " .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەربارەی ڕێ ڕۆشتنی ئەبو دوجانە فەرمووی :

( إنها لمشية يبغضها الله و رسوله الا في مثل هذا الموطن ) [1]

واتە : ئەم ڕێ و ڕۆشتنە خوا و پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) ڕقیان لێ ی دەبێتەوە ، مەگەر لەم جۆرە جێگایانەدا نەبێت – واتە مەگەر لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕو بوونەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا .

### " ئەبو دجانە ( رضي الله عنه ) بە شمشێری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەڕ دەکات "

( انس ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی ئوحود فەرمووی : ( من يأخذ مني هذا ؟ ) کێ ئەم شمشێرەم لێ دەگرێ ؟ هەموو دەستیان درێژ کردوو هەرکەس دەیوت : من، من ، فەرمووی : ( فمن يأخذه بحقه ؟ ) فەرمووی: ئەی کێ مافی خۆی پێدەدات کاتێ هەڵی دەگرێت ؟ خەڵکەکە هەموو کشانەوە . ( سماك ی کوڕی خرشەی ئەبو دجانە ) وتی: من هەڵی دەگرم و مافی خۆی پێ دەدەم .

---

[1] – هیثمی لە ( المجمع ) دا ( ٦ / ١٠٩ ) گێراویەتیەوە طبرانی و دەڵێت : کەسانێکی تیایەکە نەمناسین .

دەڵێت : هەڵی گرت و دەستی کرد بە لەت کردنی ( شەق کردنی ) سەری بێ باوەڕان .[1]

## " ئەدەب و ڕێز لەگەڵ شمشێری پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) "

لە زبێری کوڕی عوامەوە ( ﷺ ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شمشێرێکی لە ڕۆژی ئوحوددا نیشانی خەڵکی دا کە کامیان هەڵیدەگرن و فەرمووی : ( من اخذ هذا السیف بحقه ؟ ) ئەبو دجانە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! من هەڵیدەگرم و مافی خۆی پێ دەدەم . ئەبێ مافەکەی چی بێت ؟ دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شمشێرەکەی پێدا . ئەبو دجانە چووەدەر و منیش شوێنی کەوتم . هەر کە بەلای شتێکدا تێدەپەڕی لەت و پەتی دەکرد تاگەیشت بە کۆمەڵێ ئافرەت لە بناری چیاکەدا و (هند) یان لەگەڵدا بوو ( پێش موسڵمان بوونی ) .

هند ئەم هۆنراوەیەی وت :

نحن بنات طـارق نمشي علی النمارق

والمسك في المفارق إن تقبلـوا نعـانق

أوتـدبرا نـفـارق فـراق غيـر وامـق

دەڵێت : ئەبو دجابە ویستی بیکوژێت ، هند هاواری کرد لە ڕووی بیابانەکەوە ، بەلام کەس وەلامی نەدایەوە ، ئەویش وازی لێ هێنا ، بە ئەبو دجانەم وت : هەموو کارەکانتم بینی و پێیان سەرسام بووم ( موعجیب بووم ) ئەوە نەبێ بۆچی ئەو ئافرەتەت نەکوشت ؟

دەڵێت : ئاخر ئەو هاواری کرد و کەس وەلامی نەدایەوە ، منیش حەزم نەکرد بە شمشێرەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بدەم لە ئافرەتێك کە هیچ پشت و پەنایەکی نەبوو[2]

نووسەر دەڵێت :

سوێند بەخوا ئەمەیە پیاوەتی لە بەرزترین پلەیدا .. ئیتر دەجال و درۆزنەکانی سەردەم چی دەڵێن بەبەرامبەر بەم هەڵویستانە ؟ ئەوانەی خراپە دەڵێن لەسەر ئیسلام ؟ کوا ئەم بنەما پیرۆزانە لەلای دوژمنانی خوا ، کە سنووری پیرۆزی یەکانیان شکاندووە و

---

[1] - صحیح : مسلم ریوایەتی کردوە ( ٢٤٧٠ ) .

[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن ( البزار ) ریوایەتی کردووە . الجمع ( ٦ / ١٠٩ ) .

نامووسی ئافرەتان و موسڵمانانیان هەتك كردووە و زگی ئافرەتانی دووگیانیان هەڵدڕیوە ؟! سكالاّمان هەر بۆ لای خوایە ..

ڕۆژانی ئەم تێكۆشەرە تێ ئەپەڕین بەبێ ئەوەی هیچ كۆششێك وەلانێت لە پێناوی سەرخستنی ئیسلام و سەر بڵند كردنی ئەهلەكەیدا و لە هەموو غەزایەكدا بە دوای شەهادەتدا بوو ، و ئەوپەڕی ئاواتی بوو كە لەلای پەروەردگاری لە ناو شەهیداندا ئەژمار بكرێت و تاكە ئامانجی بوو ..

ڕەوڕەوەی ژیان تێپەڕی و جەنگی ( یەمامە ) هاتە پێش و هاوەڵانی لە باخچەكەیاندا ( باخچەی مەرگ ) خۆیان حەشاردا .. وە ئەم پاڵەوانە ، لە كاتێكدا لەسەر مەیدانی جەنگەكەدا بوو ، لە بیر كردنەوەدا بوو كە چۆن خۆیان بگەیەننە باخچەكە و .. ئەهلەكەی وەدەرنێن و تووشی سزای شایستەی خۆیانیان بكەن ..

لە قوربانیدانێكی سەر سوڕهێنەردا كۆمەڵێك لە هاوەڵان خۆیان كرد بە باخچەكەدا ... كە پاڵەوانی ئەم باسەمان یەكێ بوو لە ناویاندا و قاچی شكا ، بەلاّم وەك شێر هەڵسایەوە و شمشێرە پیرۆزەكەی بەرزكردەوە .

لە سەر یەك قاچ شەڕی دەكرد !! چ سەر سوڕمانێك .. دەیڕوانی .. چاوی كەوت بە مسیلیمەی درۆزن و وەك حوشتێرێكی ( اورق ) [1] دەهاتە پێش چاوی ... لەولاشەوە (وەحشی كوڕی حرب ) بكوژی حەمزە ( ﷺ ) هاتە پێشەوە و ڕمەكەی بۆ هاویشت ، لێ یدا و لەلایەكی دیكەیەوە هاتەوە دەرەوە ، و هێندەی چاوتروكانێك ئەبوو دجانە بەرەو (مسیلمە ) چوو ، بە شمشێر لێ ی دا ، هەرچی ( مسلیمە ) ی ستەمكارە لە خوێنی خۆیدا دەگلا و بەسزای شایستەی خۆی گەشت لەسەر ئەو درۆیەی بەدەم پەروەردگارەوە كرد بووی و خەڵكی پێ گومڕا كرد بوو .

ئەوە بوو موسڵمانان وەك باهۆزی لەناو بەرخۆیان كرد بە باخچەكەدا ، لەسوپای مسیلمە نزیكەی ( ١٠ ) هەزار كەسیان كوشت ...

لەموسڵمانانیش سەدان شەهید بوون ( هەندێ دەڵێن ( ٦٠٠ ) كەس دەبوون ) ، لەناویاندا ( ابو دجانە ) بوو ( ﷺ ) [2] ... كە بە ئامانجی خۆی گەیشت .

---

[1] - وشترێكە ڕەنگی سپیەكی ڕەشباوە و گزشتەكەی زۆربەتامە ، بەلاّم كارو ڕێگە كردنی باش نیە - ( معجم الصحاح )ی جوهری .

[2] - بڕوانە سیرەی ژیانی ( ﷺ ) لە : البدايە ( ٥ / ٣١ / ٤٤ ) سير اعلام النبلاء ( ١ / ٢٤٣ ، ٢٤٦ ) .

## " ٢٢ – مصعبی کوڕی عمیر ( رضي الله عنه ) "

## " بانگخوازی بەکاریگەر و خەباتکاری پشوو درێژ "

بانگ کردن بۆلای ئاینی خوا تەنها چەند ئامۆژگاری یەك و چەند دەربڕینێك نی یە لە زار بێتە دەر ، بەڵکو پرۆگرامی ژیانە بۆ کەسی بانگخواز .. کە لەناو ویژداندا سەقامگیر دەبێت و شوێنەوارەکەشی لەسەر هەڵس و کەوت و جەستەی مرۆڤ دەردەکەوێت ... وە بانگخوازی ڕەببانی هەموو شتێکی بۆ خوای میهرەبان و بێ هاوتایە .. ( مصعب )یش یەکێکە لەم نموونە بەرزو ناوازانە ...

مصعب کێ یە ؟

مصعبی کوڕی عمیری کوڕی عبدمناف ... گەورە و شەهیدی پێشینەی بەدریی قورەیشی یە .. بەدوای پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) هاتە ماڵی ئەرقەم و ... ئیسلام بوونی خۆی شاردەوە ..

وە بە نهێنی سەردانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ی دەکرد ، کاتێکیش پێیان زانی بەندیان کرد و بە بەند کراوی مایەوە تاوەکو هیجرەتی یەکەمی کرد بۆ حەبەشە .

دواتریش هیجرەتی دووەمی کرد .. پێش موسڵمان بوونی ، یەکێ بوو لە خۆشگوزەرانترین کەسی مەککە ، بەڵام کە موسڵمان بوو ، وازی لە دنیا و خۆشی یەکانی هێنا و بووە زاهد تاوەکو پێستی وەك پێستی مار کرژ و ووشك بوویەوە .[١]

لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : هاتم بۆ مزگەوت لەوێ بووم ( مصعبی کوڕی عمیر ) دەرکەوت کە بوردەیەکی پینە کراوی لەبەردا بوو ،کە پێشتر خۆش گوزەرانترین لاو و جوانترین و چاکترینیان بوو لە مەککە ، ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەها بینیی ، ئەو خۆشگوزەرانی و ڕەفاهیەتەی ئەوسای وە بیرکەوتەوە ، حاڵی ئێستاشی بینی کە تێیدایە ... بۆیە فرمێسك لە چاوەکانی هاتە خوارەوە بۆی .. و پاشان فەرمووی: ( أنتم اليوم خير ، أم إذا غدى احدكم بجفنة من خبز و لحم ؟)

---

[١] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٠٥ ) .

فەرمووی : ئێوە ئەمڕۆ باشن ، یان ئەو کاتەی کە بە کاسەیەك لە نان و گۆشت ڕۆژ بکەنەوە ؟

وتمان : ئەوکاتە باشتر ئەبووین بەشی مانەوەمان هەبوو خۆشمان بۆ پەرستش یەکلایی دەکردەوە . ئەویش فەرمووی : ( بل أنتم اليوم خير ، منكم يومئذ ) [1] فەرمووی : بەڵکو ئێوە ئەمڕۆ باشترن لەو کاتەتان .

## " بانگخوازی بەکاریگەر "

پاش ئەوەی کۆمەڵێ پشتیوانان بەیعەتی یەکەمیان دایە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مصعبی نارد بۆ مەدینە تاوەکو قورئانیان فێر بکات و لە دین تێیان گەیەنێت ، مصعب دەهاتە ماڵەکانیان و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام ، خەڵکێکی زۆر موسڵمان بوون وئیسلامیان لەناودا بلاْو بوویەوە ، پاشان پەیامێکی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و داوای مۆڵەتی لێ کرد کە موسڵمانان کۆ بکاتەوە ، ئەویش مۆڵەتی داو ( مصعب )یش ( ﷺ ) لە ماڵی ( بنی خیثمة ) کۆی کردنەوە .

پاشان لەگەڵ ئەو ( ٧٠ ) کەسەی کەلەگەڵیدا بوون لە عەقەبەی دووەمدا ، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ماوەیەکی کەم لە مەککە مایەوە پاشان پێش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە مەدینە و ئەو یەکەم کەس بوو کە پیٚ ی خستە مەدینە ..

لە ئیبنو شهابەوە ، دەڵێت : کاتێ ئەهلی ( عەقەبە ) بەیعەتیان دایە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و گەڕانەوە لای هۆزەکەیان و بەنهێنی بانگیان دەکردن بۆ ئیسلام و قورئانیان بەسەردا دەخوێندن ( معاذی کوڕی عفراء ) و ( رافع ی کوڕی مالك ) یان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و داوایان کرد کەسێکیان بۆ بنێرێت لە لایەن خۆیەوە تا خەڵکی بۆلای قورئانی پیرۆز بانگ بکات وتیان : چونکە ئێستا دڵنیاین کە خەڵکی شوێنی دەکەون ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یش ( مصعب ی کوڕی عمیر ) ی بۆ ناردن ئەویش بەردەوام بانگی دەکردن و ڕێنمونی دەکردن بۆ سەر ڕێگەی پەروەردگار ، وە لەسەردەستی ، کەم ماڵ هەبوو لەماڵی ئەنصاری یەکاندا کە دینی وەرنەگرتبێ و مسوڵمان نەبوو بێ .

---

[1] - تیرمیزی ریوایەتی کردووە ( ٢٤٧٨ ) دەڵێت : فەرموودەی ( حسن غریب ) ە .

ئەوە بوو ( عمری کوڕی جموح ) موسڵمان بوو بتەکانانی تێکشاند ... و کە بەعیززەتترین کەسی ئەهلی مەدینە بوو ، ئەوکات ( مصعب ) گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بە ( المقرئ ) [1]ناویان دەبرد .

## " خەباتکاری ئارامگار "

ڕۆژی ئوحود ( مصعب ) ئاڵای موسڵمانانی بەرزکردبوەوە ئەوە بوو کاتێ موسڵمانان ئەوەیان بەسەرداهات ، کە هات ، مصعب ئاڵاکەی هەر بەبەرزی هێشتەوە ، تا ( ئبنو قمیئە ) لێ ی هاتە پێش و لە دەستی ڕاستی داو پەڕاندی ( مصعب )یش دەیفەرموو : ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ ﴾ سورة آل عمران ، آية ( ١٤٤ ) . و ئاڵاکەی بەدەستی چەپی بەرزکردەوە ، ( ئیبنو قمیئە ) ی خوانە ناس لەو دەستەشی دا و ئەویشی پەڕاند ، ئەو جا مصعب ئاڵاکەی لە خۆگرت و بە هەردوو قۆڵی لە ئامێزی گرت و ئەیفەرموو : ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ ﴾ ئینجا بۆ سێیەم جار بە ( ڕم ) لێ ی داو شەهیدی کرد .

ئیبنو سەعد ، دەڵێت : عبدالله ی کوڕی فضل وتی : کە مصعب شەهید کرا ، فریشتەیەك لە شێوەیدا ئاڵاکەی بەرزکردەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە کۆتایی ڕۆژدا دەیفەرموو: (تقدم یا مصعب ) وەرە پێشەوە مصعب فریشتە کە ئاوڕی دایەوە بۆی و فەرمووی: (مصعب نیم ) ئەو کاتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زانی کە فریشتە یە و خودا بۆ پشتگیری لێ کردنی ناردوویەتی . [2]

وە لە ڕیوایەتی ( ابنو هشام ) دا هاتووە / کاتێ مصعب شەهید کرا ، پێغەمبەری خوا(ﷺ ) ئاڵاکەی دا بە علی کوڕی ئەبو تالیب و کۆمەڵێك لە موسڵمانان .

وە لە ( عبیدی کوڕی عمیر )ەوە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ( ئوحود ) بوویەوە دای بەلای مصعبی کوڕی عمیردا بە شەهیدی ، ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾ سورة الأحزاب ، آية ( ٢٣ )

وە لە ( خباب )ەوە ، دەڵێت : ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە پێناوی خوادا کۆچمان کرد و پاداشتمان کەوتە سەر خوای پەروەردگار . هەیە لە ئێمە کە هەر لە دنیادا

---

[1] - کەسێکە خوێندنەوەی قورئان فێری خەڵکی بکات .

[2] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٠٦ ) .

بەشێك لە پاداشتی خۆی وەرگرت ، هەیشبوو ڕۆیشت و هیچی لە پاداشتەکەی لە دنیادا وەرنەگرت ، لەوانە ( مصعب ی کوڕی عمیر ) بوو کە ڕۆژی ئوحود شەهید کرا ، هیچمان نەدیەوە بیکەینە کفنی جگە لە بووردەیەك کە ئەگەر بماندایە بە سەریدا پێیەکانی دەردەکەوتن و بماندایە بەقاچیدا سەری بە دەردەکەوت ، تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پیێ کردین کە سەری پیێ داپۆشین و بە بڕێك لە ڕووەکی ( إذخر ) [1] قاچی داپۆشین .

[1] - صحیح / زانایان کۆکن لەسەری . ( أذخر ) یش ڕوەکێکی بۆن خۆشە .

## " ٢٣ - جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ( ﷛ ) "
## " لەگەڵ فریشتەکاندا لە ئاسماندا دەفڕێ !! "

میوانی ئەم چەند لاپەڕەیەمان ، شەهیدی پایە بەرز و بەڕێز ، بەیداخی تێکۆشەران ئەبو عبدالله ی کوڕە مامی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )، (جعفری کوڕی ئەبو تالیب ( ﷛ ) ) ی برای ( علی کوڕی ئەبو تالیب )ە و بە دەساڵ لە پێشەوا علی گەورەترە ..

هەردوو هیجرەتەکەی کردووە ، و لە حەبەشەوە بۆ مەدینە هیجرەتی کردووە و پاش ئازادکردنی خەیبەر لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵان گەڕایەوە بۆ مەدینە ، دواتریش لە مەدینە چەند مانگێك مایەوە ، پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کرد بە سەر سوپایەکەوە بۆ جەنگی ( مؤتە )( ڕێ کەون لەناوچەی ( کەرەك ) .. لەوێ شەهید بوو .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەهاتنی جەعفەر و گەڕانەوە زۆر خۆشحاڵ بووە هەروەك سوێند بە خوا بە وەفاتی زۆ نارەحەت بوو ..

### " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( براء ) ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە جعفری فەرموو : ( أشبهت خلقي و خلقي )[1]

واتە : لە ڕوخسار و لە ڕەوشتیشدا لە من دەچیت ..

٢- لە ( ئەبو هریرە ) وە ( ﷛ ) ، دەفەرموێ : لە پاش پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەس باشتر لە جعفری کوڕی ئەبو تالیب سواری خۆی تاونەداوە لە بەخشندەیی و ڕێزگرتندا.[2]

[1] - صحیح : بوخاری ریوایەتی کردووە ( ٢٦٩٨ ) لە بابی ( الصلح ) دا .

[2] - سەنەدەکی ( جید )ە / احمد و تیرمیزی ریوایەتیان کردووە و دەڵێت : فەرموودەی ( حسن و غریب و صحیح)ە

## " چاوپێکەوتنی جەعفەر و نەجاشی پاشای حەبەشە "

لە ( أم سەلەمە ) وە ، دەڵێت : پاش ئەوەی مەککە بۆ ئێمە تەسك بووەوە و هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەشکەنجە دەدران و توشی بەڵاو فیتنە دەهاتن و ئەیشیانزانی کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناتوانێت ئەو نارەحەتی و بەڵایەیان لەسەر هەڵگرێ ، لە کاتێکدا ئەو لە ژێر پارێزگاری مام و هۆزەکەیدا بوو و بەو هۆیەوە کەمتر تووشی نارەحەتی دەبوو ، بۆیە پێیانی فەرموو : ( أن بأرض الحبشة ملك لا يُظلم أحد عنده ، فالحقوا ببلاده حتى يجعل الله لكم فرجا و مخرجاً ) فەرمووی : ( لە زەوی حەبەشە پادشایەکی لێ یە ، هەرگیز ستەم لە هیچ کەسێك ناکرێت لە لای ، لەبەر ئەوە بڕۆن بۆ وڵاتەکەی ئەو تا ئەوکاتەی خوادەرووی خێر دەکاتەوە ) ئێمەش بە جیاجیا دەرچووین بۆ لای تا هەموو کۆ بووینەوە لەلای و ژیانمان باشتر بوو ئاینیشمان پارێزراو .[1]

لە ریوایەتێکی تردا :...

ئوم و سەلەمە دەڵێت :

" کە گەیشتینە حەبەشە ، بە باشترین دراوسێمان گەیشتین کە نجاشی بوو ، بەڕاستی دڵنیا بووین لە ئایینەکەمان و خواپەرستی خۆمانمان دەکرد بە بێ ئەوەی ئازار بدرێن و هیچ شتێکی خراپ ببینین .

کە ئەمە بە قورەیش گەیشت دەستیان کرد بە پلان دانان ، تا دوو پیاوی بەهێز بنێرنە لای نجاشی بە چەند دیاری یەکی گرانبەهاو گرانی مەککەوە ، جوانترین دیاری کە بۆیان هێنا بوو پێستە بوو ، ئەوە بوو پێستەیکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو بۆ نجاشی و کەسیان لە ( بطارق ) (واتە : زاناو ڕاوێژکارە ئایینی یەکان )ی نجاشی بە بێ دیاری نەهێشتەوە و لەگەڵ دیاری یەکاندا ( عبدالله ی کوڕی ئەبی ربیعە ) و ( عەمری کوڕی عاص ) یان نارد .

فەرمانیان پێ کردن و پێیان ڕاگەیاندبوون کە بەهەریەکە لەو ( بطارق )انە دیاری یەك بدەن پێش ئەوەی باسی ئەوان لای نجاشی بکەن و پاشان دیاری یەکانی نجاشی پێشکەش بکەن و دوای لێ بکەن کە موسڵمانەکانیان بداتەوە دەست پێش ئەوەی قسەیان لەگەڵ بکات . ( واتە دەیانوسیت بوار بە موسڵمانان نەدرێت قسەی خۆیان بکەن).

---

[1] - سەنەدەکی ( صحيح )ە / ئیبنو هشان ( ١ / ٣٣٤ ) ابو نعیم لە ( الحلية ) ( ١ / ١١٥ ) .

ئوم سەلەمە دەڵێت :

ئەوە بوو ئەو دوانە هاتن و گەیشتن بە نجاشی کەلەلای ئەو لە باشترین جێگادا بووین و باشترین یارمەتی دەرم بوو بۆمان ، وە پێش ئەوەی بێنە لای نجاشی وەك پێیان وترا بوو ، هیچ کەسیان لە ( بطارق )ەکانی نجاشی بە بێ دیاری نەهێشتەوە و بەهەر یەکێکیشیانیان دەوت : چەند غولامی نەزان لە ئێمە بەشەو پەنایان هێناوەتە لای پاشاکەتان ، کە لە ئاینی باوباپیرانیان هەڵگەڕاونەتەوە و نەیشهاتونەتە ناو ئاینەکەی ئێوە ، بەڵکو ئاینێکی تازەیان داهێناوە نە ئێمە و نە ئێوە لیّ ی ئاگادارنین ، وە ئێمە ئێستا لەلایەن پیاو ماقولانی هۆزەکانیانەوە نێراوین بۆلای پاشای نجاشی تاوەکو بیانگێڕێتەوە بۆلای هۆزەکانیان ، لەبەر ئەوە ئەگەر قسەمان لەگەڵ پادشاکرد دەربارەیان ئێوە ئامارژەی بۆ بکەن کە بیانداتە دەستمان و هیچ قسەیان لەگەڵدا نەکات ، چونکە ئەوان قەوم و کەسەکانیان بەرچاو ڕونترن بەو نەنگییەی کە بەسەر خۆیانیاندا هێناوە .

ئەوانیش وتیان بیّ خەم بن .. پاشان هەردو نێرراو دیاری یەکانیان پێشکەشی نەجاشی کرد و ئەویش لێی وەرگرتن .

ئەوجا دەستیان کرد بە قسە کردن : -

وتیان :- ئەی پاشای بەڕێز ، لە ڕاستیدا چەند غولام و نەزانێك لە ئێمە بەشەو پەنایان هێناوەتە ولاتەکەت و وازیان لە ئاینی قەومەکەی خۆیان هێناوە و نەشهاتوونەتە ناو ئاینەکەی تۆوە ، بەڵکو ئاینێکی تازەیان داهێناوە کە ئێمەش و ئێوەش نەمانبیستووە . ئێستا پیاو ماقولانی قەومی ئەمانە لە باوان و مام و تیرەکانیان ئێمە یان ناردووە بۆ لای بەڕێزت ، تاوەکو بیانگێڕیتەوە ، چونکە گەورەکانیان بەرچاو ڕوونترن لەمان و زاناترن بە و نەنگی یەی هێناویانە تە ڕێیان تاوەکو سزایان بدەن.

ئوم سەلەمە ، دەڵێت : هیچ شتێك ناخۆشتر نەبوو لە لای عبداللە ی کوڕی ربیعە و عەمری کوڕی عاص [1] ، لەوەی کە نجاشی گویّ بۆ موسڵمانان ڕابگرێت ، دەڵێت : خێرا ( بطارق ) ەکانی دەوری وتیان : ڕاست دەڵێن گەورەم ، قەومەکەیان بەر چاو ڕوونترن لێیان و زاناترن ، بیاندەرەوە دەستیان با بیانبەنەوە ناو ولات و قەومی خۆیان .

دەڵێت : نجاشی تووڕە بوو ، پاشان وتی : نا بەخوا نایاندەمە دەستتان ، کەسانێك نادەمە دەستتان کە پەنایان هێناوەتە ولاتەکەم و منیان هەڵبژاردووە و غەیری منیان

---

[1] - ئەم چیرۆکە پێش موسڵمان بوونی ( عمری کوڕی عاص )ە ( رضي الله عنه ) .

هەڵنەبژاردووە کە پەنای بۆ ببەن ، هەتاوەکو پرسیاریان لێ ئەکەم دەربارەی ئەمەی کە ئەم دوانە باسی ئەکەن ، ئەگەر وا بوون ئەوا ئەیاندەمە دەستیان و ئەیاننێرمەوە بۆ هۆزەکانیان ، ئەگەر واشنەبوون ، ڕێگەیاننادەم بیانبنەوە و باشترین یارمەتی دەر دەبم بۆیان تا ئەو کاتەی لەلام بمێننەوە .

دەڵێت : ناردی بەدوای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە بێنە ناو دانیشتنەکەوە . کاتێ پەیامبەرەکەی نەجاشی هات و پێ ی ڕاگەیاندن کەوا پادشا داوایان دەکات ، کۆ بوونەوە و بەیەکتریان وت : چوینە لای نجشای ، چی پێ بڵێین ؟ ئەوانی تریان وتیان : سوێند بەخوا هەر ئەوە دەڵێین کە دەیزانین و پێغەمبەرمان ( ﷺ ) فەرمانی پێ کردوین ، هەرچیش ئەبێ با ببێ . کاتێ هاتن نجاشی فەرمانی کرد بەزانا ئایینی یەکانی کە پەڕاوەکانیان لە دەوری کۆ بکەوە .

## " جعفر ئیسلام نومایش دەکات "

نجاشی پرسی : ئەم ئاینە چی یە کەوای لێ کردوون لە ئاینی قەومەکەتان پاشگەز بینەوەو نەشیەنە ناو ئاینی ئێمە یان ئاینی یەکێ لەم نەتەوانە ؟ ئوم سەلەمە دەڵێت : ئەوەی وەڵامی نجاشی دایەوە ( جعفری کوڕی ئەبو تالیب ) بوو ( ﷺ ) .

فەرمووی : ئەی پاشا ، ئێمە قەومێکی نەزان بووین ، بتمان دەپەرست و مردارەو بوومان دەخوارد و خراپە کاریمان دەکرد و سیلەی ڕەحممان دەپچڕاند و دراوسێیەتیمان نەدەزانی و ئەوەمان کە بە هێز بوو لاوازەکانمانی دەچەوساندەوە ، هەر لەسەر ئەمە بەردەوام بووین تاخوا پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ناردین کە نەژادی دەناسین و لە ڕاستگۆیی و ئەمینی و پاکی دڵنیاین ، بانگی کردین بۆ یەکتاپەرەستی خودا و خۆپاککردنەوە لەوەی کە خۆمان و باوباپیرانمان دەمانپەرست لەبەر دوو بت و ، فەرمانی پێ کردین کە ڕاستگۆبین و ئەمانەت بپارێزین و ڕەحم بگەیەنین و دراوسێیەتی بەباشی بکەین و ، دەست هەڵگرین لەحەرام و خوێنڕشتن و ، ڕێگری کردین لە خراپەکاری و درۆ کردن و ، خواردنی ماڵی هەتیوو خۆ پارێزکردن لە تاوانبارکردنی ئافرەتانی داوێنپاك و ، فەرمانی پێ کردین کە تەنها خودا بپەرستین و هاوەڵی بۆ دانەنێین و هەروەها فەرمانی پێ کردین بە ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژ و زەکات .

دەڵێت : دواتر باسی ئیسلامی بۆ کردو فەرمووی / ئێمەش باوەڕمان پێ هێناو شوێنی کەوتین لەسەر ئەوەی کە لە خواوە بۆی هاتووەو دەستمان کرد بە پەرستنی خوای تاك و بێ هاوتا و ئەوەی حەرام بوو دەستمان لێ هەڵگرت و ئەوەی حەلاڵ بوو بە حەلاڵمان زانی و لەسەری ڕۆشتین ..

لەسەر ئەمانە ، قەومەکەمان دەستیان کرد بە دوژمنایەتی کردن لەگەڵمان و ئەشکەنجە دانمان و چەندین بەلایان بەسەردا هێناین تا لە ئاینەکەمان واز بێنین و بگەڕێینەوە سەر بتپەرستی و ئەو خراپەکاری یەی ئەوسا دەمان کرد ، ئەوە بوو کە ئێمەیان چەوساندەوە و دەستیان کرد بە ستەمکردن لێمان و دنیایان بەرووماندا تەسك کردەوە بۆ ئەوەی لە ئاینەکەمان پاشگەزببینەوە . ئێمەش هاتین بۆ وڵاتەکەی تۆو تۆمان هەڵبژارد بەسەرکەسانی تردا و حەزمان بە پەنا و پاڵپشتی تۆ کرد ، بەهیوای ئەوەی کە لەلای تۆستەممان لێ نەکرێت ، ئەی پادشای بەڕێز ...

ئوم سەلەمە دەڵێت :

نجاشی پرسی : هچیت لەوە لەلایە کە خودا بە پێغەمبەرکەتاندا ناردوویەتی ؟

جعفر / بەڵێ .

نجاشی / بۆم بخوێنە .

دەڵێت : جعفر چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتی مریم ی خوێندەوە .

دەڵێت / نجاشی کە گوێ ی لەو چەند ئایەتە بوو دەستی بەگریان کرد هەتا ڕیشی تەڕ بوو هەروەك زانا ئاینیەکانیش دەستیان بە گریان کرد ، تا پەراوەکانی دەستیان تەڕبوو ، پاشان نجاشی پێی وتن : بەڕاستی ئەمە و ئەوەی کە بۆ ( عیسی ) هاتە خوارەوە هەردووکیان لە یەك شوێنەوە سەرچاوەیان گرتووە . بڕۆن ، سوێند بەخوا نایاندەمە دەستتان وشتی واناکەم ...

دەڵێت :

کاتێ لەلای نجاشی هاتنەدەرەوە عەمری کوڕی عاص وتی / سوێند بەخوا ئەبێ سبەینێ شتێکی وابکەم کە ڕەچەڵەکیان دەربێنم .

دەڵێت : بەلاّم عبدالله ی کوڕیربیعە کە لە عمر پارێزگار تر بوو ، وتی : شتی وانەکەیت ، چونکە ئەمانە هیچ نەبێت کەس و کاریان هەیە ، با لە ئێمەش لایاندا بێت . وتی / سوێند بەخوا ئەبێ پێی بڵێم ئەمانە بە ( عیسی )ی کوڕی مریەم دەڵێن : ( بەندەی خوا )یە .

پاشان بۆ سبەینێ هات بۆ لای نەجاشی و پێ ی وت : ئەی پاشا ، ئەمانە شتێکی گەورە دەرهەق بە ( عیسی )ی کوڕی مریم دەڵێن . بنێرە بەدوایاندا و لێیان بپرسە بزانە چی دەڵێن ...

دەڵێت / ئەویش ناردی بەدوایاندا لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ بکات .

دەڵێت : هەرگیز وامان بەسەر نەهاتبوو ، بۆیە موسڵمانان کۆبوونەوە و یەك بە یەکتریان وت : ئەگەر لێیان پرسین دەربارەی ( عیسی )ی کوڕی مەریم ، چی دەڵێن ؟

وتیان / سوێند بە پەروەردگارمان ، ئەوە دەڵێین : کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەرمان بۆی باس کردووین ، چی ئەبێ باببێت .

دەڵێت : جعفری کوڕی ئەبو تالیب ( ﷺ ) پاش ئەوەی پرسیاریان لێ کردن دەربارەی ( عیسی )ی کوڕی مریم " سەلامی خوای لێ بێت " ، فەرمووی :

دەڵێین : کە پێغەمبەری خوامان ( محمد ) ( ﷺ ) بۆی باس کردووین و ئەویش ئەوەیەکە ( عیسی ) بەندەەو نێردراوی خوا گیانێکە لەلایەن خوا بەخشراوەو بە ووتەی خوای گەورە (ببە) دروستکراوەو بە جوبرەئیلدا ناردوویەتی بۆ مەریەم .

دەڵێت : نەجاشی دەستی برد بۆ زەوی و چیلکەیەکی هەڵگرت و پاشان وتی : سوێند بەخوا ، عیسای کوڕی مریم هێندەی ئەم چیلکە لەوەی کەوتت لاینەداوە . دەڵێت: لەوێدا ( بطارق )ەکانی دەوری نجاشی دەستیان بە وورتە ورت و بۆڵەبۆڵ کرد .

نەجاشی پێی وتن : ئێوە با هەر قسە بکەن و پێتان ناخۆش بێ پاشان ڕووی لە موسڵمانان کردوو پێی وتن : بڕۆن .. ئێوە ئەمین و پارێزراون لەلای من و لەسەر زەوی من ، هەر کەس جنێوتان پێ بدات غەرامە دەکرێت . هەروەها وتی : هەر کەس جنێوتان پێ بدات غەرامە دەکرێت ، تا سێ جار ..

پاشان وتی : حەزناکەم ببمە خاوەنی کێوێك زێڕ و لەبری ئەوەدا ئازاری کەسێك لە ئێوە بدەم .

پاشان وتی : دیاریەکانیان بدەنەوە ، پێویستیم پێیان نییە ، سوێند بەخوا ، خودا بەرتیلی لە من وەرنەگرت ئەوکاتەی ئەم موڵکەی بۆ گێڕامەوە ، هەتا ئێستا بەرتیلی لەسەر وەرگرم وە خەڵکیش بە بەرتیل گوێڕایەڵم نەبوون تاوەکو منیش بە بەرتیل گوێڕایەڵیان بم .

دەڵێت : بەو جۆرە بەسەر شۆڕی چوونە دەرەوە و هەرچییەکیان هێنا بوو درایەوە بەسەریاندا .. ئێمەش لەلای باشترین پشتیوان و یارمەتی دەر ، ماینەوە و باشترین حاڵ و ژیانمان هەبوو لەلای تا ئەوکاتەی گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .[١] م – هـ

نووسەر دەڵێت : بانگخوازی ئەبێ بەم جۆرە بێ .. بزانێت چۆن ئیسلام نیشانی خەڵك بدات .. و لە قسە کردنیشدا چاودێریی ئەدەب و ڕێز بکات .. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ، ئیسلام چەند پێویستی بەوەها بانگخوازێك هەیە ، چونك ئیسلام خۆی پرسێکی دادپەروەرە ، بەڵام بەداخەوە کەوتۆتە نێو دەستی پارێزەرانێکی دۆڕاوەوە ...!!

زۆر جاران گوێبیستی کەسانێك ئەبم لەسەر ئیسلام قسە ئەکەن ، تەمەننا ئەکەم کە بێ دەنگ بوونایە و وشەیان لە زار نەهاتبایە دەرەوە ،؟ وە زۆرینە یان بەوجۆرە لە ئیسلام حاڵی نەبوون کە پەروەردگار دایبەزاندووە ، کەسانێکی کەمیان بەو شێوەیەی خۆی لێ ی حاڵی بوون کە ئەوانیش ناتوانن بە باشی و بەڕێگا و ئوسلوبێکی گونجاو بیگەیەنن..!! ئەمەش هەمووی لە ڕۆژگارێکدا کە هەرچی بنەما پڕوپوچەکانە ڕازێنراونەتەوە و ، لە چەندین بەرگی فێلاوی و خەڵەتێنەردا نیشانی خەڵك دەدرێن .. سروشتی خەڵکیش وایە کە دەبنە دوژمنی هەرشتێ کە لێی بێ ئاگا و بێ خەبەر بن ...

بڕوانە موسڵمانان لە چ کەم و کورتی یەکی ترسناکدان ئەگەر نەتوانن ئایینەکەیان بەوردی وەکو خۆی ڕاڤە نەکەن بە جۆرێك کە نە لێی کەم کەن و نەبۆی زیاد کەن ؟ ڕاڤەکردنێك کە تەنها مەبەست و ئامانجی دەرخستن و بەیان کردنی هەق بێ و هیچی تر

" ئەوەی تازە ئاتاجی ئەوەیە کە بە زمانێکی هاوچەرخ و گونجاو و ڕێگەیەکی نزیك ڕێنمونی بکرێن بۆ گەشتن لە پەیامی ئیسلام و شارەزا بوون لێی .. و ئەو بۆشاییە دەروونی یە یان بۆ پڕ بکاتەوە و هەموو ئەو گومان و شوبوهاتانە پوچەڵ کاتەوە و بە درۆ بخاتەوە کە بێ دینی و بەدڕەوشتی پاش ئەم داگیر کاری یە دواییەی ئیستعمار بۆ وڵاتەکانمان ، هەڵیانبەستووە .

بەڕاستی ئیسلام ئەو مافەی بەسەر هەڵگرانیەوە هەیە کە بەهەرچی یەك هەیانە لە کەلتوری ئەمری ئیسلام ڕووبەڕووی دنیابینەوە .. بەڵێ ، چونکە ئێمە پەراوێکمان هەیە

[١] - سەنەدەکی ( صحیح )ە : أحمد لە ( المسند ) ( ١ / ٢٠٢ / ١٧٤٠ ) ڕیوایەتی کردووە . بە لێکۆڵینەوەی شێخ احمد شاكر ..

کۆنبوونی نیە و ئەو سامانەی لە خۆی گرتووە ون نەبوت وە پێغەمبەرێکمان هەیە کە خاوەن سیرەتێکی دڵخوڕێن و سوننەتێکی بێ گەردە "[1]

کۆچکەران لەحەبەشەوە گەڕانەوە بۆ مەککە ، بەڵام گەورەمان ( جعفر )مایەوە تا ساڵی " فەتحی خەیبەر " و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە هاتنەوەی شاد و دڵخۆش بوو .. لە ( شعبی )یەوە دەگێڕنەوە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا لە خەیبەر گەڕایەوە ، بە جعفر گەیشت .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە باوەشی گرت و نێو چاوانی ماچ کرد و فەرمووی : (نازانم بە کامیان دڵخۆش بم ، بە گەڕانەوەی جەعفەر یان ڕزگار کردنی خەیبەر )[2]

## " شەهیدبوون لە پێناوی خوا دا "

جعفر ( ﷺ ) وەك ( ئەمیر ) لە غەزای ( مؤتە ) دا ، بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی ڕۆمەکان کەوتەڕێ .لە ( ئەبو قتادە )وە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سوپای مؤتەی بەرێکرد ، کە ناسراوە بە ( سوپاس سالارەکان ) وو فەرمووی : ( علیکم زید ، أی زید بن حارثة ، فإن أصیب ، فجعفر ، أي ابن ئەبو طالب ، فإن أصیب جعفر ، فأبن رواحة و هو عبدالله بن رواحة ) .

فەرمووی : زەیدی کوڕی حارث سوپاسالار بێت .. ئەگەر پێکرا ، ئەوا جعفر کوڕی ئە بو تالیب ، ئەگەر جعفریش پێکرا ، ئەوا عبدالله ی کوڕی رواحە ...

لێرەدا ( جعفر ) ( ﷺ ) هەڵساو فەرمووی : دایك و باوکم بە قوربانت بن من خۆنە ئەترسام تاوەکو زەید لە پێش منەوە بکەیتە ئەمیر ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( بڕۆن بەڕاستی تۆ نازانیت کامە بۆتۆ خەیر ، ئینجا سوپاکە بەڕێ کەوت ، دوای چەند ماوەیەك بەسەر چوونی سوپاکەدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە سەرمینبەر و فەرمانی کرد کە بانگ بدرێت بۆ نوێژی جەماعەت ، و فەرمووی : ( ألا أخبركم عن جيشكم ، إنهم لقوا العدو ، فأصيب زيد شهيداً ، فأستغفروا له ، ثم أخذ اللواء جعفر ، فشد على الناس حتى قتل ، ثم أخذه ابن رواحة ، فأثبت قدميه حتى أصيب شهيداً ، ثم أخذ اللواء خالد ، و لم يكن من الامراء ، هو أمر نفسه ، فرفع رسول الله ( ﷺ ) إصبعيه وقال : ( اللهم هو سيف من سيوفك فأنصره ) فيومئذ سمي سيف الله ، ثم قال : ( انفروا فامدوا إخوانكم ، و لا يتخلف أحد).[3]

---

١ - ( هذا ديننا )ی شێخ محمد غزالی ( ٤ ، ٥ ) .

٢ - فەرموودەکە : ( ما أدری بأيهما أنا أفرح ، بقدوم جعفر ، أم بفتح خيبر ) بە صحیحی ( مرسل ) بە شێوە ئەم دانەپاڵە ( صحیح )ە هاتووە . ذهبی دەڵێت : ئەمە ڕاستە .

٣ - دانە پاڵەکەی ( صحیح )ە : أحمد ( ٥ / ٢٩٩ ، ٣٠٠ ، ٣٠١ ) ارنوئوط پەراوێزی ( سیر ) ، ( ١ / ٢٠٩)

فەرمووی : ئایا ئەتانەوێ هەواڵی سوپاکەتان پێ بدەم ، ئەوان بە دوژمن گەیشتن ، زەید پێکرا و شەهید بوو ، داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکەن ، پاشان جەعفەر ئاڵاکەی بەرز کردەوە و ڕووبەڕووی خەڵکەکە بووە وە تا شەهید بوو ، پاشان کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و لەسەر پێ مایەوە تا شەهید کرا ، ئەو جا خالد ئاڵاکەی بەرزکردەوە کە ئەوە یەکێ نەبوو لە پێشەواکانی سوپا ، بەڵکو ئەو خۆی خۆی کردە ئەمیر ، ئینجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پەنجەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی : ( ئەی پەروەردگارا خالد شمشێرێکە لە شمشێرەکانت ، دەسا سەری خەو پشتیوانی بە ) . لەو ڕۆژەوە خالد ناونرا ( شمشێری خوا ) پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی ( بڕۆن دەستی یارمەتی بۆ براکانتان درێژکەن و کەستان دوانەکەون ) خەڵکەکەش لە گەرمایەکی بەتیندا بەڕێ کەوتن بۆ یارمەتی دان .

## " پاڵەوانێتی جەعفەر "

جەعفەر ( ﷺ ) لەم ڕوداوەدا سەر کەوتووانە ئازایەتی و لێوەشاوی خۆی سەلماند . لە ئیبنو عەباسەوە ، کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانیشتبوو ، ئەسمای کچی عمیسی ( کە خێزانی جعفر بوو ) لەو دەوروبەرەدا بوو ، فەرمووی : ( يا أسماء ! هذا جعفر مع جبريل و ميكائيل مر ، فأخبرني أنه لقي المشركين يوم كذا و كذا فسلم ، فردى عليه السلام ، و قال : انه لقي المشركين ، فأصابه في مقاديمه ثلاث و سبعون ، فأخذ اللواء بيده اليمنى فقطعت ، ثم أخذ باليسرى فقطعت . قال : فعوضني الله من يدى جناحين أطيرهما مع جبريل و ميكائل في الجنة آكل من ثمارها ) .[1]

فەرمووی : " ئەی ئەسما ! ئەمە جعفرە لەگەڵ جبریل و میکائیل دا تێپەڕی و هەواڵی پێ دام کە لەفلان و فلان ڕۆژدا ڕووبەڕووی دوژمنان بووەوە ، سەلامیش دەکات ، وەڵامی سەلامەکەی بدەرەوە ، وە وتی / ئەو ڕووبەڕووی بێ باوەڕان بوویەوە و لە پێشیەوە حەفتاو سێ جار برینداركراو لیواکەی بە دەستی ڕاستی هەڵگرت تا ، پەڕاندیان ، ئینجا بە دەستی چەپی تا ئەو یشیان پەڕاند ، وتی : خوای پەروەردگار لە دەستی ڕاستیان بری هەردوو دەستم ، دوو باڵی پێدام کە لەگەڵ جبریل و میکائیل بەسەر بەهەشتدا بفڕم و لەبەرو بوومەکەی بخۆم " .

[1] - هیثمی لە المجمع ( ٩ / ٢٧٢ / ٢٧٣ ) باسی کردووە و دەیگێڕێتەوە بۆ طبرانی و دەڵێت : ( سعدان کوڕی ولید )ی تیایە کە نەم ناسی ، باقی پیاوانی فەرموودەکە جێی متمانەن ) .

## " لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕێت "

لە ( ابن عمر )ەوە ، دەڵێت : ڕۆژی مؤتە ( جعفر )م لە ئامێز گرت بینیم لە ڕووی پێشەوەی جەستەی ، چل و ئەوەندە جار بریندار بووە .

وە لە ڕیوایەتێك تردا لای بوخاری ( ٤٢٦٠ ) ، هاتووە لەنافعەوە کە ( ابن عمر ) هەواڵی پێ دا کە چووەتە سەر لاشەی جعفر شەهیدی ، پەنجا لێدان و برینداری لەسەر ژمارد کە هەمووی لە پێشەوەی لێ درابوو ( واتە هیچییان لە پشتەوە لێی نەدرا بوو ).

وە لە ( ابن عباس )ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

" رأیت جعفر بن أبو طالب ملکاً في الجنة مضر جة قوادمه بالدماء ، یطیر في الجنة " .[1]

فەرمووی : " جعفری کوڕی ئەبو طالب – م بە فریشتەیی لە بەهەشتدا بینی ڕووی پێشەوەی جەستەی لە خوێندا گەوزا بوو ، لە بەهەشتدا دەفڕی ..

وە لە عەبداللە ی کوڕی جعفرەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : هنیئاً یا عبدالله بن جعفر أبوك یطیر مع الملائکة في السماء " .[2] فەرمووی : خۆشی لە خۆت ، عبداللە ی کوڕی جعفر ، باوکت لەگەڵ فریشتەکاندا لە ئاسماندا دەفڕێ .

## " پێغەمبەر ( ﷺ ) دەگری "

لە ( اسماء )ەوە دەفەرموێ ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆ سەردانم و بانگی کورەکانی جعفری کرد ، بینیم بۆنی دەکردن و چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵێکت دەربارەی جعفر پێ گەشتووە ؟ فەرمووی : "نعم ، قتل الیوم " فەرمووی : " بەڵێ ئەمڕۆ شەهیدکرا " ئێمەش دەستمان بەگریان کرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆیشت و فەرمووی : " اطعموا آل جعفر طعاماً ،فقد شغلوا عن أنفسهم " .

فەرمووی : خواردنێك بۆ ئەهلی ( ماڵی ) جعفر دروست بکەن ، چونکە ئەوان ئێستا خۆیان لەبیر کردووە .

---

[1] - سەنەدەکی ( جیدە )ە ، حاکم ڕیوایەتی کردووە و بەصحیح دایناوە ، حافظ لە ( الفتح ) دا ( ٧ / ٧٦ ) دەڵێت لە ڕێگەیەکی ترەوە سەنەدەکی ( باشە ) .

[2] - طبرانی ڕیوایەتی کردووە ، سەنەدەکی ( حسن )ە ، هیثمی لە ( المجمع ) دا بە ژمارە ( ١٥٤٩٨ ) .

# " ٢٤ – ئەبو ذەری غەفاری ( رضي الله عنه ) "

" خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر زانایان کە هەق بڵێن باتاڵیش بێت و هەرگیز لە پێناو خوادا لە لۆمەی لۆمەکەران نەترسن ... "

داخوازانی هەقیش پێویستە لەگەڵ هەقدا بژین ، ئەگەرنا ئەوان ناوسکی زەوی بۆیان باشترە لەسەر پشتی زەوی ... ئەبو ذەریش ( رضي الله عنه ) لەو کەسایەتی یە دەگمەنانەیە..

کێ یە ؟

( جندب ی کوڕی جنادە )ی غیفاریە یە ، پێی وتراوە ( بریری کوڕی جنادە ) .

لە زەیدی کوڕی اسلمەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ئەبو زەری دەفەرموو: (ئەی بەریر ) [1] یەکێکە لە پێشینە یەکەمینەکان لە ئیسلامدا و لە هاوەڵە خانەدان و هەڵبژێراوەکانی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) .. ئەبو ذەر ( رضي الله عنه ) دەیفەرموو : من چوار یەکی ئیسلام بووم ، کەپێش من تەنها پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ئەبوبەکر و بلال موسڵمان بوو بوون . [2]

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( ئەبو دەداو ) ەوە ( رضي الله عنه ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرموویەتی : ( ماأظلت الخضراء ولا اقلت الغبراء من ذي لهجة اصدق من ئةبو ذر ) [3] .

واتە : نە ئاسمان سێبەری کردووە و نە زەوی قسە کەرێکی ( بێژەر ) لە خۆگرتووە لە ئەبو ذەر ڕاستگۆتر .

( یاخود لە ژێر سێبەری ئاسمان و لەسەر فەرشی زەوی بێژەرێکی ڕاستگۆ تر لە ئەبو ذەر نیە ) .

---

[1] – هیثمی دەڵێت : طبرانی ریوایەتی کردوە لە فەرموودەیەکدا کە کورتمان کردوەتەوە فەرموودەکە ( مرسل ) ، و پیاوانی جێ متمانەن . المجمع ( ١٥٨١٢ ) .

[2] – هیثمی دەڵێت: گبرانی بەدوو ئیسناد گێڕاویەتیەوە، یەکێکیان (متصل)ە و پیاوانی جێ متمانەن (١٥٨١٣).

[3] – فەرموودەیەکە ( شواهد )ەکانی بەهێزە ، تیرمیزی ریوایەتی کردووە و غەیری ئەویش .

**٢ – وە فەرموویەتی ( ﷺ ) :** ( من أحب ان ينظر الى المسيح عيسى ابن مريم ، الى بــره و صدقه و جده ، فلينظر الى ئەبو ذر ) .[١]

**واتە هەر کەس لە ئێوە حەز ئەکات لە عیسای کوڕی مریەم بڕوانێ ، لە چاکەکاری و ڕاستگۆیی و بەهێزیدا ، باسەیری ئەبو ذەر بکات .**

## " سەرەتای موسڵمان بوونی "

**( ابو حمزه ) دەڵێت : ئیبنو عباس پێ ی وتین : ئەتانەوێ باسی موسڵمان بوونی (ئەبو ذەر ) تان بۆ بکەم ؟ وتمان : بۆچی نا .. دەڵێت : ئەبو ذەر وتی : ( پێم گەیشت کە پیاوێك لە مەککە سەری هەڵداوە و ئیدیعای پێغەمبەرایەتی ئەکات ، منیش براکەمم ناردەلای تا قسەی لەگەڵدا بکات .**

**پێم وت : ( بڕۆ بۆ لای ئەو پیاوە و لەگەڵی بدوێ . ) ئەویش چووە مەککە و بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت و پاشان گەڕایەوە ، پرسیم : هیچت پێیە ؟ وتی : ( سوێند بەخوا پیاوێکم بینی فەرمانی بە چاکە دەکرد و ڕێگری لە خراپە . وتم : دڵم تەنها بەمە تێر ئاو نەبو ..**

**بۆیە : توێشەبەرەیك و دارە دەستێـم هەڵگرت و بەرەو مەککە کەوتمە ڕێ من نەمدەناسی و حەزیشم نەئەکرد هەواڵی بپرسم ، چوومە لای ( زەمزەم ) بڕێك ئاوم خواردەوە و دواتر چوومە مزگەوت . علی کوڕی ئەبو تالیب بەلامدا تێپەڕی . فەرمووی : غەریبیت ؟ وتم : بەڵێ .**

**فەرمووی لێ کردم لەگەڵی بچم بۆماڵەوە ، منیش لەگەڵی چووم ، بێ ئەوەی پرسیاری هیچی لێ بکەم ، ئەویش هەواڵی هیچ شتێکم بداتێ !**

**بۆ سبەی بەیانی ، هاتمەوە مزگەوت و هەواڵیشم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نە ئەپرسی . کەسێکیش نەبوو هەواڵێکم پێ بدات ..**

**دیسان ( علی ) بەلامدا تێپەڕیەوە . فەرمووی / ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بگەڕێیتەوە ؟ وتم / نەخێر . فەرمووی : ئیشت چی یە و بۆچی هاتوویت ؟ وتم : ئەگەر نهێنی بپارێزیت پێت دەڵێم ...**

---

[١] – هیثمی دەڵێت : احمد گێڕاویەتەوە ، پیاوانیشی خاوەنی متمانەن ، هەندێکیان نەبێ کە خلافیان لەسەرە . المجمع ( ٧ / ١٥٨ ) .

فەرمووی : دەیپارێزم .. وتم : پێمان گەیشتووە پێغەمبەرێك سەری هەڵداوە ، فەرمووی : ئایا هێشتا تێ نەگەیشتووی ! ئەوە من بۆلای ئەو دەڕۆم .. تۆش شوێنم کەوە و چوومە هەرشوێنێ تۆش خۆت بکە بەوشوێنەدا ، وە هەرکاتێ کەسێکم بینی مەترسی بۆت هەبێ بەرەو دیوارەکە ئەچم وەك ئەوەی پێلاوەکانم چاك بکەم ، بەڵام تۆ هەر بەردەوام بە لەڕۆشتندا .

ئەوە بوو ڕۆیشت و منیش لەگەڵی ڕۆشتم ، چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێم وت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئیسلامم نیشاندە ، ئەویش نیشانی دام و هەر لە جێ ی خۆمدا موسڵمان بووم ...

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( یا أباذر ، أکتم هذا الامر ، وارجع الی قومك ، فاذا بلغت ظهورنا ، فأقبل ) .

فەرمووی : ئەی ئەبو ذەر .. ئەم بابەتە بە نهێنی بهێڵەوە و بگەڕێرەوە لای قەومەکەت ! هەر کاتێ هەواڵی دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی ئێمەت پێگەشت ، وەرەوە

وتم : سوێند بەوکەسەی تۆی بەهەق ناردەوە ئەبێ لەنێو دەستیاندا هاواربکەم کە موسڵمانم ..

ئەوە بوو هاتە ناو مەزگەوت ، قوریش لەوێ بوون ، وتی : ئەی هۆزی قورەیش ، من شایەتی ئەدەم کە هیچ خودایە نی یە جگە لە ( الله ) و ( محمد )یش بەندە و نێرراوی خوایە .

ئەوانیش وتیان / هەڵسن بۆ ئەم لە دین دەرچووە . ئەوانیش هەڵسان و وەها لێیاندام کە بمرم ! لەوکاتەدا ( عباس ) فریام کەوت و هەڵیساندمەوە و فەرمووی : هاوار بۆ ئێوە ، ئەوە خەریکە پیاوێك ئەکوژن لە ( غفار ) کە جێگاو ڕاڕەوی بازرگانیتانە ! ئەوانیش دەستیان لێم بەردا .

بۆسبەینێ گەڕامەوە هەمان شتی دوێنێم وت : ئەوانیش وتیان هەڵسن بۆ تێهەڵدانی ئەم لەدین دەرچووە ، کەوتنەوە لێدانم ، بۆ جاری دووەم ( عباس ) فریام کەوت و لە ژێر چنگیان دەری هێنام ئەمە سەرەتای موسڵمان بوونی ئەبو ذەر بوو .[1]

زەهەبی ، دەڵێت : ئەبو ذەر ( ﷺ ) لەسەر دەمی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش فەتوای داوە .

[1] - صحیح / بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( ٦ / ٤٠٠ ) وە مسلم ( ٢٤٧٤ ) لە (فضائل الصحابة ) دا .

وە نمونەیەك بووە لە زوهد و ڕاستگۆیی و زانست و كارپێكردنی ، هەمیشە ڕاستبێژ بووە و لە پێناو خوادا لە لۆمەی هیچ لۆمەكارێك نەترساوە ..

هەروەها ئامادەی ڕزگار كردنی ( بیت المقدس ) بووە لەگەڵ عمردا ( ﷺ ) . [1]

واقدی دەڵێت / ڕۆژی ( حنین ) ئەبو ذەر هەڵگری ئاڵای ( غفار ) بووە . ( ... وە كاتێ ئەبو ذەر موسڵمان بوو گەڕایەوە وڵاتی خۆی و لەوێ مایەوە تا دوای بەدر و ئوحود و خەندەق . پاشان هات بۆ مەدینە ) . [2]

## " لە ئامۆژگاریەكانی "

لە ( سوفیانی ثوری )یەوە ، دەڵێت : ئەبو ذەر لەلای كەعبەدا هەڵسایەوە و فەرمووی : " ئەی خەڵكینە ، من ( جندبی غفاری ) م ، وەرن بۆلای ئەم برا ئامۆژگاریكارە بەسۆزەتان ، خەڵكیش لێ كۆبوونەوە .

فەرمووی : ( ئایا هەر كەس لە ئێوە كە بیەوێت سەفەر بكات توێشوویەكی وەها بۆخۆی هەڵناگرێ كە فریای بكەوێ ؟

وتیان : بەڵێ ، وایە .

فەرمووی : دەی سەفەری ڕێگەی قیامەت دوورترین سەفەرێكە كە دەتانەوێ و گرتووتانەبەر ، لەبەر ئەوە توێشووی باشی بۆ هەڵگرن .

وتیان : جا ... چ توێشوویەك باشە ، فەرمووی : حەجێك بەجێ بهێنن بۆ ئاسان كردنی كاروبارە گەورەكان ، وە ڕۆژووی ڕۆژێكی زۆر گەرم بگرن بۆ درێژی ڕۆژی لێپرسینەوە ، وە دوو ڕكات نوێژ لە تاریكی شەودا ئەنجام دەن بۆ تاریكی ناوگۆڕ .. وە وشەیەكی باش بڵێن یان بێ دەنگ بن لەوتنی وشەیەكی خراپ ، بۆ ڕاوەستان لە ڕۆژێكی زۆر گەورەدا .. لەماڵ و سامانتان ببەخشن ، بەڵكو لە نارەحەتی ئەو ڕۆژە ڕزگارتان بێت . دونیا بكەنە دوو دانیشگایەكێ بۆ داوای حەڵاڵ و گەڕان بەدوای ماڵی حەڵاڵدا ، ئەوی تریش بۆ گەڕان بە دوای ئاخیرەتدا .. سێیەم ( واتە غەیری ئەو دوانە ) زیانتان پێ دەگەیەنێت و سوودی بۆتان نیە نەتانەوێ .

---

[1] - بڕوانە / سیر أعلام النبلاء ( ٢ / ٤٦ ، ٤٧ ، ٥٦ ) .

[2] - بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٢٩٨ ) .

ماڵ و سامانیش بکەن بە دوو بەشەوە ، بەشێکیان لە حەڵاڵدا و بەسەر ماڵ و منداڵتدا خەرجی کە و ، بەشەکەی تریان پێشکەشی ئاخیرەتتان بکەن . سێ یەمینیان زیانی بۆتان هەیە و سوودی بۆتان نیە ، نەتانەوێ ...

پاشان بە دەنگی بەرز هاواری کرد : ئەی خەڵکینە ، پێ داگری یەك بۆ دنیا کە هەرگیز هەستی پێ ناکەن ،ئێوەی کوشتووە .[1]

## " دنیا نەویستی "

لە ( عبداللە ی کوڕی صامت )ەوە ، دەڵێت : لەگەڵ ئەبو ذەر چووین بۆ لای عوسمان ، کاتێ ئەبو ذەر چووە ژوورەوە سەری نەوی کرد و فەرمووی : سوێند بەخوا من لە وانە نیم ئەی ئەمیری ئیمانداران ( مەبەستی خوارج ) بوو .[2]

( ئیبنو شوزب ) دەڵێت : ( خوارج ) بەوە دەناسرێن ریش تاشراون ، ( یاخود موتاشراون ) .

پێشەوا ( عوسمان ) پێی فەرموو : ئەی ئەبو ذەر ، ڕاست دەڵێیت ، بەڵکو ئێمە بۆیە ناردمان بەدواتدا تاوەکو لە مەدینە لەلامان بمێنیتەوە . فەرمووی : پێویستم بەمانە وە نیە لێرە ، مۆڵەتم بدە بابچم بۆ ( ڕەبزە ) . فەرمووی: باشە ، وە فەرمانیش دەکەین کە بەخششێکی باش بکرێت و بەیانی و ئێوارەی پێ بکەیتەوە

فەرمووی : پێویستم بەوە نیە ، ئەبو ذەر ماڵاتەکەی خۆی لە حوشتر و مەڕ بەسە . ئەوە بوو کاتێ چووە دەرەوە ، فەرمووی : ئەی قورەیش دونیای خۆتان بۆ خۆتان و قەپی پێدا بکەن ، واز لە ئێمە بێنن لەگەڵ خوای خۆماندا بین )

نووسەر دەڵێت : ئەم ڕیوایەتەش ئەو هەڵبەستراوانە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێن گوایە عوسمان فەرمانی بە نەفی کردنی ئەو ذەر کربێ .

---

[1] - بروانە / صفة الصفوة ( ١ / ٣٠٢ ).

[2] - چەند جیاوازی یەکی ڕاو بۆ چوون هەبوو لە نێوان ئەبی ذەر و پێشەوا عوسماندا ( ڕەزای خویان لێ بێت ) .

## " ژیری بانگخواز "

لە ( عـوام ی کـوری حوشـب )ەوە ، دەڵێـت : پیاوێـك لـە هـەردوو شـێخی ( بـەنی ثعلب )ە وە بـۆی گێرامـەوە کـە وتبویـان : چـووین بـۆ ( ڕەبـزە ) شـێخێك لـەوێ بەلاماندا تێپـەڕی قژێکی قژ بژو سـەر و ریشێکی سپی پێوە بـوو . وتیـان : ئەمە لـە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) ، چوون مۆڵەتی سەر شۆردنیان لێ وەرگرت ، ئەویش مۆڵەتی داین و لەگەڵمان بووە ئاشنا .. لە کاتێکدا لەگەڵ ئەودا بووین ، چەند کەسێك لە ئەهلی عێراق بەلاماندا تێپەڕین ، وا بزانم فەرمووی : لە ئەهلی کوفەن ، وتیان : ئەی ئەبو ذەر ئەو پیاوە ئەوەی کردی لەگەڵت ، کردی ، ( مەبەستیان پێشەوا عوسمان بوو ( ﷺ ) ! بۆچی ئالآیەك بۆ خۆت هەڵناکەیت ئێمەش بە پیاوەکانمان پشتت دەگرین ؟

فـەرمووی : ئـەی ئـەهلی ئیسلام شـتی وام نیشان مـەدەن و ( سـوڵتان ) سـووك مەکەن ، چونکە هەر کەس سوڵتان سووك بکات ، ئەوە تەوبەی بۆ نیە ، سـوێند بـەخوا ئەگەر ئەو کەسەی ئێوە باسی دەکەن لەسەر درێژترین تەختە یاخود لەسەر کێوێك لە خاچم بدات، ئەوە هەر گوێڕایـەڵی دەبم و ئارامیشی لەسـەر دەگرم و هـەر ئـەو کارەش بە باش دەزانم .[1]

بەو جۆرە بانگخواز ئەبێ ژیر بێت لە ئاست ئەو پلانانەی کە لە دەوروبەریدا ئەنجام ئەدرێت و ئەبی لە ڕەفتاریدا دانئەبوت ...وە بزانێت کەسانێك هەن خۆیان مەڵاس داوە بۆ ئوممەتی ئیسلام و بەدوای پیلانێکەوەن بۆی ... ئەبو ذەر وەها ژیا ... کە هەمیشە پشتی لە دنیا هەڵکرد بوو ، ڕووی لە ئاخیرەت بوو ... و ڕقی لە کۆ کردنەوەی ماڵی دنیا بوو ، لە ( ڕەبزە ) مایەوە تاوەفاتی کرد و بە قافڵەی پیاوچاکان گەیشت ...

## " وەفاتی ئەبو ذەر ( ﷺ ) "

لە ئوم ذەرەوە ، دەڵێت : " کاتێ ئەبو ذەر کەوتە سەرە مەرگ دەگریام .. پرسی ، بۆچی دەگرییەیت ؟ وتم چۆن نەگریەم لە کاتێکدا کە تۆ لە چۆڵەوانیەکدا وا دەمریت و هیچم پێ ناکرێ بۆت و پارچە جلێکیشمان پێ نیە بەشی کفنت بکات !!! ، فەرمووی :

---

[1] - احمد تخریجی بۆ کردووە ( ٥ / ١٦٥ ) . تیایدا ئەو پیاوەی کە بـۆ ( عـوام )ی گێڕاوەتـەوە و لەگـەڵ هـەردوو شێخەکەی ( بنی ثعلبة ) نەناسراون و باقی پیاوانی جێ متمانەن ، بڕوانە پەڕاوێزی سیر اعلام النبلاء (٢/ ٧٢ ) .

مەگری ، بەڵكو خۆشحاڵم ، چونكە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) فەرمووی : (لايموت بين امرأين مسلمين ، ولدان أو ثلاثة فيصبران و يحتسبان فيريان النـــار أبـــداً )[1] . واتە : ( هەر ژن و پیاوێك ی موسڵمان ) ، دوو یان سێ منداڵیان لێ بمرێ و ئەمانیش ئارامی لەسەر بگرن و چاوەڕێی پاداشت بن ، ئەوە هەرگیز ئاگر نەبونن .

وە من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) بە چەند كەسێكی فەرموو : ( كە من یەكێ بووم لە ناویاندا ) : " ليموتن رجل منكم بفلاة من الأرض تشهد عصابة من المؤمنين "[2].

فەرمووی : پیاوێك لە ئێوە لە چۆڵەوانیەكدا وەفات ئەكات كە كۆمەڵێ لە باوەڕداران شایەتی مردنی دەبن ... وە هیچ كەس نەبووە لەوانەی ئەو ڕۆژە لەگەڵمدا بوون ، لە گوندێك یان لە ناوخەڵكیدا وەفاتی نەكردبێ ، تەنها منم كەوا لە چۆڵەوانیەكدا خەریكە دەمرم ، سوێند بەخوا نەدرۆم كردووە و نە بە درۆش خراومەتەوە ، دەی لە ڕێگاكە بڕوانە. ئوم ذەر دەڵێت : وتم : چۆن ئەبێ ، لەكاتێكدا حاجیەكان ڕۆشتوون و ڕێگاش بەستراوە ؟فەرمووی : بڕوانە ، منیش بەردەوام ئەچوومە سەرەوە و پاشان ئەگەڕامەوە ، تا ئاگام لە ئەبو ذەر بێت ...

دەڵێت : كاتێ من لەم حاڵەتەدا بووم دەبینم پیاوانێك دەركەوتن بەسەر وڵاخەكانیانەوە ، خێرا خۆم گەیاندە لایان ، ئەوانیش زۆر بەخێرایی هاتن بەدەممەوە ، وتیان : ئەی بەندەی خوا ، چیتە ؟ وتم : پیاوێك لە موسڵمانان لێرەیە دەمەوێ كفنی بكەن ، وا دەمرێ ..

وتیان : كێ یە ؟ وتم : ئەبو ذەر . وتیان : هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ وتم : بەڵێ ، دەڵێت : " باوك و دایكیان كردە قوربانی و ، خێرا چوون بۆلای ئەبو ذەر و سڵاویان عەرز كردو ئەویش وەڵامی دانەوە .. " پاشان دوای وەفاتی ، شۆردیان و كفنیان كرد و نوێژیان لەسەر كرد ، وتراویشە ئیبنو مەسعود یەكێ بووە لەناویاندا .

ئیبنو كەسیر باسی وەفاتی ئەبو ذەر دەكات ( ﷺ ) ، دەڵێت : " پاشان لە ( ربزە) دابەزی و لەوێ مایەوە تاوەكو لە مانگی ( ذي الحجـــة )ی ساڵی ٣٢ )ی كۆچی وەفاتی كرد ، هیچ كەسی لانە بوو ، جگە لە خێزان و منداڵەكانی... ئەوە بوو كاتێ لەوحاڵەدا بوون كەنەیان ئەتوانی سپاردەی بكەن ، عبدالله ی كوڕی مسعود لە عێراقەوە لەگەڵ كۆمەڵی لە هاوەڵانیدا هاتن و

---

[1] - صحیح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان كردوە .

[2] - احمد ریوایەتی كردوە لە ( مسند )ەكەیدا .

شایەتی مردنی بوون و ئەویش وەسیەتی ئەوەی کردن کە چی لیٚ بکەن . وتراویشە کە پاش مردنی گەیشتوون و شۆردویانە و کفن و دفنیان کردووە . فەرمانی کرد بوو بە ئەهلەکەی کە سەریٚ لە مالآتەکەی ( مەڕو مالآتەکەی ) بۆیان لیٚ بنێت ، تا بیخۆن پاش مردنی ، دواتر عوسمانی کوڕی عفان ( ﷛ ) ناردی بەدوای ئەهلەکەیدا و هێنانی بۆلای خۆی [1] ...

[1] - بروانە : البداية والنهاية ( ٥ / ٢٤٨ ) .

# " ٢٥ – عومەیری کوڕی ئەبی وقاص ( رضي الله عنه ) "
# " نەوجەوانی شەهید "

عومەیری کوڕی ئەبی و قاص ، برای ( سەعدی کوڕی ئەبی وقاص )ە ( رضي الله عنه ) .

لە سەعدەوە ، دەڵێت : پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ جەنگی بەدر پیاوانمان هەڵبژێرێ ، چاوم بە عومەیری برام کەوت ، دەبینم خۆی دەشاردەوە ، پرسیم ، چیتە براکەم ؟

وتی : ئەترسم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بمبینێت و بە بچوکم بزانێ و نەهێڵێ بێم بۆ جیهاد ، لە کاتێکدا حەز ئەکەم منیش بێم و جیهاد بکەم ، بەڵکو خوا شەهادەتم پێ ببەخشێ .

دەڵێت : ئینجا نیشانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) درا ، بە بچوکی زانی و فەرمووی : " بگەڕێرەوە " ،ئەویش دەستی کرد بە گریان، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مۆڵەتی پێدا.

سەعد دەڵێت / لەبەر بچوکی عومەیر من کوڵ و شمشێرەکەیم بۆ دەبەست ، عومەیر لەبەدر شەهید بوو ، ئەو کاتە تەمەنی ( ١٦ ) ساڵان بوو . عەمری کوڕی یەنی عەبدود کوشتی .[1]

ئا بەم جۆرە ئیسلام ئەهلی خۆی لە لاوو لە پیر پەروەردە کردووە .. ئاخۆ کەی ئەم شکۆیی و سەربەرزی یەمان دەگەڕێنینەوە ؟

" بەڕاستی نەوەیەکی سەرکەوتوو کە چاوی لە شکۆداری بێت ، پێویستی بە ئامادە بوونێکی هەنگاو بە هەنگاو و توندو تۆڵ هەیە ، تاوەکو بتوانێ ئەو کەلێن و بۆشایی یانە پڕ بکاتەوە کە هەیە و ئەو بارەگرانانە هەڵگرێ کە قەدەر خستویەتیە سەر شانی .. لەبەر ئەوە پێویستە لایەنی ئیمانی لە دەروندا ڕووناک بکەینەوە ، چونکە بەڕاستی بیروباوەڕ و عەقیدەی پتەو بەردی بناغەی هەموو کارێکی بەرهەمداری بیناکەرە.

وە ئەو بانگەوازانەی هەوڵی ئەوەدەدەن گومان لە دەرونی لاواندا دروست بکەن دەربارەی ئەو ئاینە هەق و ڕاستە ، بانگەوازێکی داگیرکاری ژەهراویی ڕوخێنەرن کە بەنهێنی نەخشەی بۆ کێشراوە .

[1] - بڕوانە : ( المنتظم )ی ئیبنو الجوزی ( ٣ / ١٤١ ) ، صفة الصفوة ( ١ / ٢٠٧ ) .

لە ڕاستیدا ئیسلام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ، لە ژیانی تاك و كۆمەڵگاكانماندا ستەملێكراوە و خەریكە لە دەست دەچێ لە نێوان ئەوانەی خۆیان وانیشان ئەدەن كە لە ئامێزیان گرتووە لە ڕاستیشدا لە هەقیقەتی ئەم ئاینەوە زۆر دوورن ، وە لە نێوان ئەوانەی كە نكۆڵی دەكەن بەهۆی بێ ئاگایی یان ، یاخود بەمەبەستێكەوە .[1]

[1] - ( معركة الصحف في العالم الاسلامي )ی شێخ محمد الغزالي ، ص : ( ٥٠ ) .

## " ٢٦ - ثابتی کوڕی دەحداح ( رضي الله عنه ) "
## " خۆی و ماڵ و سامانی پێشکەشی خوا کرد "

ئەگەر لە سیرەی ژیانی بە ئاگئەبون ، دەبینین کە : -لەو پشتیوانانەیە کە دالْدەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )یاندا و پشتگیریان لێ کرد و شوێن ئەو ڕووناکی یە کەوتن کە لەگەڵ خۆی هێنا بووی بۆتان ، وە قوتئەبو یەکی بلیمەتە لە قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیدا ... و ئەسپسوارێکی بەجەرگەو بەناو نارەحەتی یەکاندا هەنگاو دەنێت و ڕووبەڕووی مەترس یەکان دەبێتەوە و لەگەڵ نەهامەتی و درك و دالەکانی ڕێدا لە زۆراندایە و بەناو ڕێگاکانی مەرگدا دەڕوات ..

هاوڕێلەگەڵ ئەمانەدا ، پێشبڕکێ دەکات بۆ بەدەمەوە چوونی داماو و لێقەوماوان و فریاکەوتنی ستەملێکراوان و دڵدانەوەی خەمباران . لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە لە لوتکەدایە بۆ خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و بانگی جیهاد دەڵێتەوە و .. بەشەوقە بۆ جەنگ و بۆنی بەهەشت لە سێبەری شمشێرەکانەوە دەکات[1]...

لە نیشانەکانی خۆشەویستی ( ثابت " رضي الله عنه " ) بۆ پەروەردگاری : - ئیبنو مسعود ( رضي الله عنه ) دەگێڕێتەوەوە ، دەڵێت : کاتێ ئایەتی : ﴿ مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً ... ﴾ سورة البقرة ، آية ( ٢٤٥ ) . دابەزی ، ئەبو دەحداح پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەڵێی خوای پەروەدگار داوای قەرزمان لێ دەکات ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەی ئەبو دەحداح ، وتی : دەستم بەرێ ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی دایە ، وتی : ئەوا من باخێکم دابە قەرز بە خودای خۆم کە ( ٦٠٠ ) دارخورمای تیایە ، پاشان هات بۆ لای باخەکە لەوێ دایکی دەحداح و منالەکانی لێ بوو بانگی کرد : ئەی دایکی دەحداح ، وتی فەرموو .. وتی : وەرە دەرەوە لەم باخە ، لەبەر ئەوەی من بە قەرز داومەتە خوای پەروەردگار [2].

---

[1] - حياة الصالحين / ی مامۆستا عبدالنعم قنديل ( ٣ / ٩٧ ) . بەدەستکاریەوە .

[2] - هیثمی دەڵێت لە ( الجمع ) ( ٩ / ٣٢٤ ) دا ، ابو علی ریوایەتی کردوە هەروەها تەبەرانیش ، وە پیاوانی فەرموودەکە جێی متمانەن .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا ( زەیدی کوڕی ئەسلەم ) دەڵێت : کاتێ ئایەتی ﴿ مَـنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً ... ﴾ سورة بقرة ، آيـة ( ٢٤٥ ) . دابەزی ، ئەبو دەحداح وتی : دایك و باوکم بە قوربانت بن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پەروەردگار داوای قەرزمان لێ ئەکات ، لە کاتێکدا ئەو بێ نیازە لە قەرز ؟ فەرمووی : " نعم يريد أن يدخلكم الجنة به " .

فەرمووی : " بەڵێ ، ئەیەوێ بەو قەرزە بتانخاتە بەهەشتەکەیەوە " وتی : دەی ئەگەر من قەرزێکم دایە پەروەردگارم ، زامنی چوونە بەهەشتی خۆم و منداڵەکانم ئەبێت ؟ فەرمووی : بەڵێ ، وتی : دەی دەستم بەرێ ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی دایە . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، دوو باخچەم هەیە یەکێکیان لە باشوور و یەکێکیان لە باکوور ، هیچی ترم نیە ، ئەوا دام بە قەرز بە خوای گەورە .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموی : " أجعل احداهما لله و والأخرى دعها معيشة لك و لعيالك " .

فەرمووی : " یەکێکیان ببەخشە بە پەروەردگار و ئەوی تریان دانێ بۆ ژیانی خۆت و خێزانەکەت .. "

وتی : دەی تۆ شاهید بە ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەوامن باشترینیان دائەنێم بۆ پەروەردگارم ، ئەویش ئەوەیانە کە ( ٦٠٠ ) دارخورمای تیایە ... پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرموی : " اذاً يجزيك الله به الجنة " . خوداش لە پاداشتی دا بەهەشتت پێ ئەدات . ئەبو دەحداح ڕۆیشت ، تا گەیشتە لای ئوم دەحداح کە لەگەڵ مناڵەکانیدا بوو لە دەروبەری بنە دارخورمایەکی باخەکەدا .. ئەمەی وت :

هــداك ربي سبل الرشاد — الى سبيل الخير و السداد
بيـنى من الحائط بالــوداد — فقد مضى قرضاً الى التناد
أقرضته الله على اعتمادي — بالطوع لا من ولا ارتداد
إلارجـاء الضعف في المعاد — فارتحلي بالنفس و الاولاد
والبـر لاشــك فخـير زاد — قدّمه المرء الى المعاد [1]

---

[1] - واتە : خودا ڕێنموێنیت بکات بۆ ڕێگای ڕاست ، بۆ ڕێگای چاکە و پایەداری ، لەو باخە بە دڵی ساخەوە وەرە دەرەوە ، چونکە ئەو ئیتر بەقەرز دراوە تا ڕۆژی خۆی ( قیامەت و پاداشت ) ن داومە بە قەرز بە پەروەردگارم بەویستی خۆم بە بێ منەت و دوو دڵی و تەنها لە ترسی لاوازی و بێ دەسەلاتیم لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا ، دەی خۆت و منالەکانت ئەو باخە بە جێ بێلن ، چونکە بەڕاستی چاکە باشترین توێشووە مرۆڤ بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە پێشکەشی بکات .

( ئوم دەحداح ) یش پێی وت : بەڕاستی قازانجت لە فرۆشتنەکەت کرد ! خوا ئەوەت لێ موبارەك کات کە کڕیت ، و ئینجا وتی :

بشرك الله بخير و فرح ۰ مثلك ادى ماالديه و نصح

قد متع الله عيالي و منح بالعجوة السوداء و الزهر البلح

والعبد سعى و له ماكدح طول الليالى و عليه ما اجترح [1]

پاشان ئوم دەحداح هەڵسا ئەوەی بەدەم منداڵەکانیەوە بوو دەری هێنایەوە و هەرچییش لە کۆشاندا بوو دایناوە و تەکاندی ، تا چونە ناو باخەکەی تر ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( کم من عذق رداح و دار فیاح لةبو الدحداح ) .»[2]

فەرمووی : ئای لە ئەبی دەحداح ، چ بۆڵە دارخورمایەکی چڕ و پڕ و ماڵێکی دڵفراوانی هەیە – مەبەستی لە خێزانەکەی بوو کەچەندە بەختەوەرن .

ثابتی کوڕی دحداح ( ﷺ ) ، هەروەك ماڵ و سامانی خستبووە خزمەتی پەروەدگاری ، ڕۆژێکیش هات کە گیانی خۆیشی پێشکەش پەروەردگاری کرد .

ڕۆژی ئوحود لێوان پڕ بوو لەوانەی ئیلاهی .. پێغەمبەری سەرکردە نەخشەی بەرگری کردن و هێرش بردنیشی کێشاو پەیمانی لە پیاوەکانی وەرگرت کە لە فەرمانی دەرنەچن ، بەڵام بەهۆی حیکمەتێکی باڵاوە ، تیر هاوێژەکان کە ژمارەیان پەنجا کەس دەبوو ، و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە پەنایەکی کێوەکەدا ڕیزی کرد بوون ، لە فەرمان دەرچوون .. و بەو جۆرە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تووشی شکستێکی کتوپڕی و چاوەڕوان نەکراو بوون و هەندێ لە بێباوەڕان هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوایاندا (ﷺ) ، هەتا بێ باوەڕان وا گومانیان برد کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کوژراوە .. ئەمەیان لەناو موسوڵماناندا کردە پڕوپاگەندە تاوەکو لە هیمەتیان بدەن و وورەیان دابەزێنن و ئەگەریش توانی یان لە ئاینەکەیان هەڵیانگەڕێننەوە ، بەڵام موسوڵمانان زۆر لەوە جێگیر تر و پێداگرتر بوون لەسەر ئاینەکەیان ، سەرەڕای تاڵی شکستهێنان وسەرەڕای زۆریی شەهیدەکان .

---

[1] - واتە : خودا مژدەی خۆشی و بەختەوەریت بداتێ .. بەڕاستی وێنەی کەسی وەك تۆ ئەوەی لەسەری بۆ ئەدای کرد و بووە ئامۆژگاری و نمونەی باش .. خودا منالەکانی بێ بەش نەکردووە لە خورمای ( عجوة السوداء ) و گوڵی ( بلح ) بەری خورمایە کە هێشتا پێنەگەیشتبێ – بەندەی خوایش هەوڵی خۆی دەدا و ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە کە هەوڵی بۆ دەدا بە درێژایی شەوان و هەر گوناهێکیش ئەنجام بدات هەر دیسان ئەنجامەکەی بەسەرخۆیدا ئەشکێتەوە.

[2] - بڕوانە تفسير القرتبى ( ٣ / ٢١٧ ) .

لەو نێوانەدا ( ثابتی کوڕی دەحداح ) هەڵسایەوە و بەهەموو دەنگی هاواری کرد بەڕادەیەك لە کێوەکە وە دەنگی دەدایەوە :

" ئەی هۆزی ئەنصار .. بەرەو لای من بێن .. بەرەو لای من بێن .. ئەگەر محمد کوژرا بێت .. خۆ خودا زیندووە و نامرێ ، دەی لە پێناوی ئاینەکەتاندا بجەنگن ) ، وە هێشتا لەو بانگ و هاوارەی نەبوو بوویەوە ، ژمارەیەك لە پشتیوانان هەڵسان چوون بۆلای و دەستیان بە ڕووبەڕوو بوونەوەی بیباوەران کرد بەو پەڕی بە جەرگی و ئازایەتیەوە ، بەلاّم ئەمان ڕووبەڕووی سوپایەك بوو بوونەوە کەبە چەك و تفاقی تێرو تەسەل پڕچەك بوون و ( خالدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل و ضراری کوڕی خەتاب ) لە پێشیانەوە بوون .. ئەوە بوو ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی توند لە نێوان ئەو چەند کەسە لە پشتیوانان و بێ باوەراندا ڕوویدا ، بەلاّم بە لێدانێکی ( خالد ) لە ( ثابت ) بەرمێك یەکسەر ثابت کەوت و دەستبەجێ شەهید بوو .. دواتریش هەموو ئەو پشتیوانانەی کە لەگەڵی بوون ئەوانیش کشەهید بوون .. و لەوێدا لە باوەشی کێوی ئوحوددا جەستەی پاکی شەهیدەکانی ئەم جەنگە نوستوون .[1]

قورئانی پیرۆزیش موژدەیان پێ دەدات : ﴿وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ (٤) سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ (٥) وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ (٦)﴾ سورة محمد ، آية ٤ ، ٦ .

واتە : ئەوانەش لە پێناوی خوادا شەهید بوون ، هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششیان بەزایەنادات ، ئەوانە ڕێنموونی دەکات بۆ جێگە و ڕێگەی خۆش و دڵ و دەروون و بیر و هۆشیان ئاسوودە ئەکات ، هەروەها دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بە جۆرەها شێواز بۆی باس کردوون .

[1] - بڕوانە : حیاة الصالحین ( ٣ م ٩٨ ، ٩٩ ) بە دەستکاری یەوە .

## " ٢٧ - ئەبو تەڵحەی ئەنصاری ( رضي الله عنه ) "

## " دەنگی لەناو سوپادا باشترە لە هەزار پیاو !! "

ئەبو تەڵحە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و یەکێکە لە خاڵۆزایانی و یەکێکە لە گەورە پیاوانی بەدر و و هەروەها لە دوانزە کەسە بەرێزەکەی شەوی عەقەبەیە .

ناوی / زەیدی کوڕی سهلی کوڕی ئەسوەدی ... خەزرەجی بوخاری یە و کەسێکە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەربارەی فەرموویەتی : " صوت ئەبو طلحة في جيش خير من مائة " .[1]

و في لفظ : " خير من ألف رجل " "[2]

واتە : دەنگی ئەبو تەڵحە لە سوپادا باشترە لە سەد کەس . لە گێڕانەوەیەکی تردا : " باشترە لە هەزار پیاو " .

لە ڕیوایەتێکی تردا : " لصوت ئەبو طلحة اشد على المشركين من مائة " .[3] واتە : دەنگی ئەبو تەڵحە لە سەد کەس توندترە لەسەر بێ باوەڕان .

ئیبنو اسحاق دەڵێت : ئەبو تەلحە یەکێکە لەوانەی ئامادەی ( عەقەبە و بەدر ) بوون .

### " هاوسەرگیی ئەبوتەڵحە لەگەڵ ( ئوم سولەیم ) ( رضي الله عنها ) "

لە ( انس )ەوە ، دەڵێت : " ئەبو تەڵحە داخوازی ئوم سولەیمی کرد ، ئوم سولەیم پێی وت : ئەوەی ڕاستی بێت من ڕەغبەتم لە تۆ هەیە و وێنەی کەسێکی وەك تۆ ڕەت ناکرێتەوە ، بەڵام تۆ پیاوێکی بێ باوەڕیت ، ئەگەر موسڵمان بیت ، ئەوا موسڵمان بونت دەکەمە مارەیم و هیچی ترم لێت ناوێ .. ئەویش موسڵمان بوو ..

ثابت ، دەڵێت : " هەرگیز گوێبیستی هیچ مارەیی یەك نەبووین ڕێزدار تر لە مارەیی ئوم سولەیم : کە ( ئیسلام ) بوو .[1]

---

[1] - سەنەدەکی ( صحيح )ە ، احمد تخريجی بۆ كردووە ( ٣ / ٢٠٣ ) .

[2] - سەنەدەکی لە شاهیدەکانیدا ( حسن )ە، ئیبنو سعد لە ( الطبقات )(٣ / ٥٠٥ )،بەراوێزی ( سير،٢/٢٨) .

[3] - سەنەدەکی ( صحيح )ە ، احمد لە ( المسند ) دا ، شێخی عەدوی دەڵێت: ( صحيح )ە، فضائل الصحابة:٥٠ .

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە : ئوم سولەیم پێی وتووە : " کەس وێنەی تۆ ڕەت ناکاتەوە ، بەڵام تۆ پیاوێکی بێ باوەڕیت ، منیش هیچ مارەیی یەکم ناوێت ، جگە لە ئیسلام بوونت ، ئەویش وتی : دەی بچمە لای کێ بۆ ئەو مەبەستە ؟ وتی : بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) . ئەویش چووە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ). پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

" جاءكم أبو طلحة و غرة الإسلام بين عينيه " . [2]

فەرمووی : ئەوە ئەبو تەڵحە بەرەو لای ئێوە دێت و روناکی ئیسلام لە نێو چاوانیدا دەدرەو شێتەوە .

## " جیهادی ئەبو طلحە ( ﷺ ) ڕۆژی ئوحود "

ئەبو تەڵحە ( ﷺ ) ڕۆژی ئوحود لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تیری دەهاویشت .. ئەو پیاوێکی تیر هاوێژ بوو . ئەوەبوو کاتێ تیرەکەی دەهاویشت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیڕوانی تا بزانێ بە کوێ دەگات .

ئەبو تەڵحە بە دەستی ، سنگی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی دەپاراست و ئەیوت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەم جۆرە بەنەبا تیرێکت پێ بگات . [3]

وە لە ( انس )ەوە ، دەڵێت / ڕۆژی ئوحود .. خەڵکانێك هەڵهاتن .. لە کاتێکدا ئەبو تەڵحە لە نێو دەستیدا بەرگری لێ دەکرد ، ئەو کەسێك بوو زۆر بەتوندی تیرەکەی لە کەوانی هەڵدەکێشا ، ئەو ڕۆژە دوتا سێ کەوانی شکاند هەر پیاوێك بەلایدا تێپەر ئەبوو تیری پێ بوایە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیفەرموو : " أنثرها لـأبو طلحـة " دەیفەرموو داینێ بۆ ئەبو تەڵحە ... و پاشان خۆیشی چاودێری خەڵکەکەی دەکرد .

ئەبو تەڵحەش ( ﷺ ) پێی دەوت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دایك و باوکم بە فیدات بن ، تۆ چاودێری مەکە و خۆت بپارێزە ، نەبا تیرێك لێت بدات ، با بیدات لە سنگی من لە جیاتی سنگی تۆ ..

---

[1] - سەنەدەکی ( صحیح )ە ، عبدالرزاق ریوایەتی کردووە ( ٧ / ١٠٤ ) و غەیری ئەویش .

[2] - طیالسي لە مەنسندەکەیدا ریوایەتی کردووە ( ٢ / ١٥٩ ، ١٦٠ ) .

[3] - سەنەدەکی ( صحیح )ە ، احمد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٢٨٦ ، ٢٨٧ ) .

## " ڕۆژی حنین "

لە ( انس ) ەوە ، دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی حنین فەرمووی : مـن قتل قتيلا فله سلبُه . فەرمووی : هەرکەسێ کەسێ بکوژێت لەم ڕۆژەدا ئەوە غەنیمەکەی بۆ خۆی دەبێت .

ئەبو تەڵحە ئەو ڕۆژە بیست پیاوی کوشت و لەسەر قسەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) غەنیمەی هەربیستەکەی پێ درا* .

## " پەرستشی "

لە ( انس )ەوە / ئەبو تەڵحە پاش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چل ساڵ بە ڕۆژ و بوو ، تەنها لە هەردوو جەژنی قوربان و ڕەمەزان دا نەبێت .

هەر لە خۆیەوە دەگێڕنەوە کە پاش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەمیشە بە ڕۆژ و بوو مەگەر لەسەفەردا یان لەنەخۆشیدا نەبێت ..

## " بەخشینی لە پێناوی خوا دا "

هەر لە ( انس ) ەوە ، دەڵێت : کاتێ ئایەتی : ﴿ لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ..﴾ سورة آل عمران ، آية ٩٢ . هاتە خوارەوە ، ئەبو تەڵحە وتی : پەروەردگارمان داوای ماڵمان لێ دەکات ، دەی ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوا من زەوی یەکەمم دا بە خودای پەروەدگار ..

پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی : " اجعلها في قرابتك في حسان بن ثابت ، و ئەبو بن كعب " نسائی گێڕاویەتیەوە . واتە : بیدە بە نزیکەکانت ، حەسانی کوڕی ثابت و ابو کعب .

وە لە ( المؤطا ) دا هاتووە : " خۆشەویسترین ماڵی ئەبو تەڵحە بەلایەوە (بەیروحاء ) بوو ، چونکە ڕووی لە مزگەوت بوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەهاتە ناوی و ئاوی لێ دەخواردەوە [1] . لە ڕیوایەتێکی تردا لە ( انس ) ەوە ، ئەبو تەڵحە لە هەموو

---

* سەنەدەکی ( صحیح )ە ، ابوداود و حاکم تخریجی بۆ کردووە ( ٣ / ٣٥٣ ) ، دەڵێت اسنادەکەی (صحیح)ە ، و زەهەبیش لەسەهاوڕێیەتی..

[1] - صحیح: الموطأ (١٨٧٥).

ئەنصاریەکانی مەدینە داراتر بوو لە بوونی دار خورما و خۆشەویسترین ماڵی لەلای (بەیروحاء) بوو کە ڕووی لە مزگەوت بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو ، لەو ئاوە پاکەی کە تیایدا بوو ئاوی دەخواردەوە .

انس ، دەڵێت : کاتێ ئایەتی : ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ... ﴾ دابەزی ، ئەبو تەڵحە هەڵساو بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی وت : ( ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، خوای تەعالا دەفەرموێ : ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ... ﴾ . وە من خۆشەویسترین ماڵم لەلام " بەیروحا )ە ، و ئەوا دەیکەم بە بەخشش ( صدقە ) و تکام وایە بێتە چاکە و توێشوو بۆم لەلای خوا ، لەبەر ئەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا( ﷺ ) دەیدەمە دەست تۆ تابەو جۆرەی پەروەردگار نیشانی داویت بەکاری بێنیت .. دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( بخ ، بخ ذلك مال رابح ، وقد سمعت ما قلت ، و اني ارى ان تجعلها في الاقربين ) .

فەرمووی : بەهـ ، بەهـ ئەمە ماڵێکی قازانج لێ کراوە ، گوێم لە قسەکانت بوو ، وە من وای دەبینم کە بیدەیە کەسە نزیکەکانت ..

ئەبو تەڵحەش وتی : وا ئەکەم ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، و بەوجۆرە دابەشی کرد بەسەر کەسە نزیکەکانی و ئامۆزاکانیدا .[1]

## " ئایەتێك پاش مردن "

ئەبو تەڵحە بە ساڵاچوو ، ... و هەرگیز لە هیچ جەنگێك دوانەکەوت !! ئەوە بوو لە پێش یەکێ لە غەزاکاندا .. کورەکانی پێیان وت :

" بابەگیان ، ئەوا تۆ لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ئەبو بەکر و عومەریشدا ( ﷺ ) جەنگاویت ، وازبێنە و ئێمە لە جیاتی تۆ دەجەنگین ، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو ، بۆیە چوو بۆ شەڕ و لە دەریادا و لەوێ وەفاتی کرد .[2]

وە هەر لە ( انس )ەوە ، ئەبو تەڵحە سورەتی ( براءة )ی دەخوێندەوە .. تا گەیشتە ئایەتی : ﴿ انفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً ... ﴾ سورة التوبة ، آية ( ٤١ ) .

---

[1] - صحیح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە .

[2] - پیاوانی جێ ی متمانەن : حاکم تخریجی بۆ کردووە ( ٣ / ٣٥ ) لە ( المستدرك ) دا وە دەڵێت : (صحیح الاسنادە ) و زەهەبیش دانی پێوەداناوە .

فەرمووی : ئەوەتا خوای گەورە بەلاوی و بە پیری داوام لێ دەكات بڕۆم بۆ جەنگ، دەی تفاقم بۆ ئامادەكەن ، كوڕەكانیشی وتیان : ( بابەگیان تۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەنگایت هەتا وەفاتی كرد ، و لەگەڵ ئەبوبەكردا جەنگایت تا وەفاتی كرد و لەگەڵ عومەر جەنگایت تا ئەویش وەفاتی كرد ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) ، ئێستا ئێمە لە جیاتی تۆش دەجەنگین ، بەلاّم ئەو وتی : نەخێر تفاقی جەنگم دەبێ بۆ ڕێخەن .. تا بەندەریادا ڕۆشت و وەفاتی كرد ، تا ( حەوت ) ڕۆژ دوورگەیەكیان نەدیەوە تیایدا بینێژن .. لە دوای ئەو ماوەیە هەروەك خۆی مابوو بە بێ ئەوەی لاشەكەی بگۆڕێ . [١]

---

[١] - هیثمی دەڵێت : ئەبو یعلی ڕیوایەتی كردووە و پیاوانی ، پیاوانی ( صحیح )ن ، الجمع ( ١٥٧٣٠ ) .

## " ٢٨ – معاذی کوڕی جبل ( ﵁ ) "

## " ئەی معاذ ! بەڕاستی خۆشم دەوێیت ، لەبەر خوا "

### فەرموودەی پیرۆز

معاذ کێ یە ؟ سەرداری پێشەوا ( ابو عبدالرحمن ی ئەنصاریی خەزرەجی مەدەنی بەدری )یە ، هێشتا لاوێك بوو دەم و چاوی موی لێ نەهاتبوو ، لە عەقەبەدا بەشدار بوو ، کەسێکی بالأبەرزی پێکەوتوی جوان ، چاك بوو . ئەبو سلمەی خولانی ، دەڵێت : چوومە مزگەوتی " حمص " نزیکەی سی کەسی بە سالأچوو لە هاوەلأنی لێ بوو ، لە ناویاندا لاوێکی چاوڕەش ی دان درەوشاوە ، بە بێ دەنگی دانیشتوە ، و خەڵکی بەرەولای ئەچوون و پرسیاریان لێ ئەکرد ، پرسیم : ئەمە کێ یە ؟ وتیان معاذی کوڕی جبل ، هەر لەو کاتەوە خۆشەویستی چووە ناو دڵم [1] .

وە لە ( ئەبو بحریە ) وە ، دەڵێت : چوومە ناو مزگەوتی ( حمص ) ، ئەبینم لاوێکی لێ یە کە خەڵکی لە دەوری کۆبوونەتەوە . کەسێك بوو قژی زۆر لول بوو ، کەقسەی دەکرد [2] ، وەك ئەوەی لە دەم و ددانیەوە مرواری و ڕوناکی بێتە دەر وا بوو ، پرسیم ئەمە کێ یە ؟ وتیان : معاذی کوڕی جبل ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ، هەندێ جار لە دوای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سواری ولأخ دەبوو .

لە معاذ خۆیەوە ( ﵁ ) ، دەڵێت : هاوپشتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووم لەسەر یەك گوێدرێژ کە پێی دەوترا ( عُفیر ) [3] .

### " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( عبدالله ی کوڕی عەمر ) ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( خذوا القرآن من أربعة ، من ابن مسعود ، وئەبو و معاذ بن جبل ، و سالم مولى ئەبو حذيفة ) [4].

واتە : قورئان لە چوار کەس وەرگرن : ( ابن مسعود ) و ( ئەبو ) و (معاذ)ی کوڕی ( جبل ) و ( سالم ) ی مەولای ئەبو ( حذیفة ) .

---

[1] - حاکم تخریجی بۆ کردووە ( ٣ / ٢٦٩ ) ، وە ئیبنو سعد ( ٣ / ٢ / ١٢٥ ) .

[2] - ابو نعیم لە ( الحلیە ) دا تخریجی بۆ کردووە ( ١ / ٢٣١ ) . ( ایوب ی کوڕی سیار )یش ناکرێتە بەڵگە.

[3] - صحیح : بوخاری لە بابی ( جهاد )دا ( ٦ / ٤٤ ) ریوایەتی کردووە .

[4] - ( صحیح )ە ، بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە .

**٢- لە ( انس )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :** " أرحم امتي بأمتي ابوبكر ، و اشدها في دين عمر ، و اصدقها حياء عثمان ، و اعلمهم بالحلال و الحرام معاذ ، و افرضهم زيد ، و لكل امة امين و امين هذه الأمة ابو عبيدة " [١]

**واتە : بە بەزەیی ترین کەسی ئوممەتە کەم بۆ ئوممە تەکەم ئەبوبەکرە ، و توندترین کەسیش لە پارێزگاری کردنی ئایندا ( عمر )ە و بە شەرمترینیان عوسمان و زاناترینیان بە حەلال و حەرام معاذە زاناترینیشیان بە دابەشکردنی میرات زەیدە و هەموو ئومەتێك سەر ڕاست و ئەمینی خۆی هەیە . سەر ڕاستی ئەم ئوممەتەش ابو عبیدەیە .**

**٣- لە ( ئەبو هریرە ) وە ( ﷺ ) ، دەڵێت . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :**(نعم الرجل ابوبكر ، نعم الرجل عمر ، نعم الرجل معاذ بن جبل ) [٢] . **واتە : باشترین پیاو ئەبوبەکرە ، باشترین پیاو عومەرە ، باشترین پیاو معاذی کوڕی جبلە .**

**٤- وە لە (معاذ ) ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) پێ گەیشت پێی فەرمووم :** ( يا معاذ ! ابي لاحبك في الله ، قلت : و انا و الله يا رسول الله ! احبك في الله . قال : افلا اعلمك كلمات تقولهن دبر كل صلاة : رب اعني على ذكرك و شكرك و حسن عبادتك ) [٣].

**دەفەرموێت : ئەی معاذ بەڕاستی لەبەر خوا ، خۆشم دەوێیت .. منیش پێم وت : سوێند بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، منیش بە هەمان شێوە خۆشم دەوێیت : فەرمووی : ئەتەوێ چەند و وشەیەکت فێرکەم کە لە دوای هەر نوێژێکەوە بیانڵێیت : بڵێ : ئەی پەروەردگار دەستم بگرە تا هەمیشە یادی تۆ بکەم و شوکرانە بژێرت بم و بەباشی پەرستش بکەم ..**

**٥- لە ( ابی الاحوص ) ەوە ، دەڵێت : عبداللە ی کوڕی مسعود خەریك بوو قسەی بۆ ئەکردن ، فەرمووی :**

**" معاذ ئومەتێك بوو ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بوو ، و لە هەموو بیروباوەڕێکی چەوت بەدوور بوو ، لە هاوەڵگەڕانیش نەبوو .** [٤]

---

[١] - سەنەدەکی ( صحیح )ە : احمد ( ٣ / ١٨٤ ) و ترمیزی ( ٣٧٩٣ ) و غەیری ئەوانیش .

[٢] - سەنەدەکی ( حسن )ە / تیرمیزی ریوایەتی کردووە لە ( المناقب ) دا ( ٣٧٩٧ ) .

[٣] - سەنەدەکی ( صحیح )ە ، ابی داود ریوایەتیکردووە ( ١٥٢٢ ) لە ( الصلاة ) دا بابی( الاستغفار ) .

[٤] - حاکم تخریجی بۆ کردووە ( ٣ / ٢٧١ ، ٢٧٢ ) و زەهەبیش بە صحیح دایناوە و لەسەری هاوڕایە .

وە ( ابن مسعود ) ( رضي الله عنه ) دەربارەی معاذ ، دەفەرموێ : ئێمە دەمانشوبهاند بە ئیبراهیم پێغەمبەرەوە سەلامی خوای لەسەر بێت .[1]

## " پێغەمبەر ( ﷺ ) پرۆگرامی بانگخوازیی بۆ دەستنیشان دەکات "

لە ( ئەبو موسای ئەشعەری )یەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو و معاذی نارد بۆ یەمەن پێی وتن : " يسرا ولاتعسرا ، و تطاوعا و لاتنفرا " ، واتە : ئاسانکاری بکەن و شتەکان قورس و گران مەکەن و خەڵکی بەرەو گوێدێری بێنن نەوەك وایان لێ بکەن پشت هەڵکەن ..

ابو موسایش پێی وت : لە و خواردنەوەیەك هەیەلاتی ئێمەدا لە هەنگوین دروست ئەکرێ پێی ئەوترێت : " البتع " و جۆرێکیشمان هەیە لە جۆ دروست ئەکرێ پێ ی ئەوترێت : " المزر " ..

فەرمووی : " كل مسكر حرام " ، واتە : هەرشتێ سەرخۆشت بکات حەرامە .

معاذیش پێی وتم : چۆن قورئان دەخوێنیت ؟ وتم : لە نوێژدا و بەسەر ولاخەکەمەوە ، و لە هەڵسان و دانیشتنمدا و هەر چۆن بۆم بکرێت .. ، دەڵێت ، معاذ وتی : بەلام من دەخەوم و پاشان هەڵدەسم ، و هەروەك چۆن چاوەڕێی پاداشتم لە هەڵسانمدا ( لەشەو نوێژەکانمدا ) وەهاش چاوەڕێ پاداشتم لە بۆ خەوتنم .[2]

## " زانستی معاذ "

لە ( عمری کوڕی خەتاب ) ەوە ( رضي الله عنه ) فەرمووی : کێ ئەیەوێ تێ بگات و فێر بێت، با بێت بۆلای معاذی کوڕی جبل .[3]

## " لە ڕاسپاردە کۆکراوەکانی معاذ "

لە ( ابی قلابە ) و غەیری ئەویشەوە ، کەسێك چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ی بەلادا تێپەری . داوای لێ کردن کە وەسیەتی بۆ بکەن . ئەوانیش یەك لە دوای

[1] - بڕوانە / سير اعلام النبلاء ( ١ / ٤٥١ ) .

[2] - صحیحی / بوخاری و مسلم و احمد و غەیری ئەوانیش .

[3] - حاکم تخریجی بۆ کردووە ( ٣ / ٢٧١ ، ٢٧٢ ) دەڵێت : ئسنادەکەی ( صحيح )ە ، زەهەبیش هەمان ڕای هەیە .

یەك ڕاسپاردەی خۆیان پێ دەوت .. معاذی کوڕی جبل لە دوای هەموویانەوە بوو .
کابراکە پێی وت : ئامۆژگاریم بکە ، بەر ڕەحمەتی خوا کەویت ، معاذ فەرمووی : ئەمانەی پێش من ئامۆژگار و ڕایان کردووین ئامۆژگاریەکانیشیان هیچ گومانێکی تیانیە ، وە منیش کارەکانت لە دوو شتدا بۆ کۆدەکەمەوە : بزانە کەتۆ :

لە چارەنووس و بەشی خۆت لە دنیادا ، هەرگیز بێ بەش نیت بەلاّم تۆ زیاتر ئاتاج و هەژاری بەشی ئاخیرەتتی لەبەر ئەوە بە بەدەستهێنانی بەشی ئاخیرەتت دەست پێ بکە، چونکە نەسیبی دنیاشت بۆ ڕێك دەخات کە بۆ هەرجێ یەك بڕۆیت لەگەڵ دێت [1] ..

## " ترسی معاذ لە پەروەردگاری "

لە ( شقیق )ەوە ، دەڵێت : معاذ لە یەمەن هاتەوە و چەند بەندەیەکی پێ بوو ، لە مەککە بە ( عمری کوڕی خەتاب ) گەیشت ، پێشەوا عمر ( رضي الله عنه ) پرسی : ئەمانە چین ؟ فەرمووی :پێشکەشم کراوە ، فەرمووی : بیانـدەرە دەست ابـو بکر ، ئەویش ڕازی نەبوویەوە .

کە شەوداهات و نوست ، خەونێکی دی ، لە خەویدا وەك ئەوەی بەرەو ئاگر ڕاپێچ بکرێ ، بەلاّم عمر ( رضي الله عنه ) ڕایدەکێشا تا نەخرێتە ناو ئاگرەوە ، کاتێ ڕۆژ بوویەوە ، وتی : ئەی کوڕی خەتاب ، دەبێ هەر گوێڕایەڵیت بکەم .

وتی : ئەوجا بەندەکانی دایە دەست ئەبوبەکر ( رضي الله عنه ) ئەویش دایەوە بە خۆی .. بۆ سبەی ڕۆژ ، دەبینێ نوێژە ئەکەن ، پرسی بۆ کێ نوێژ ئەکەن . وتیان بۆ خوای پەروەردگار .. ئەویش فەرمووی : دەی ئێوەش لەبەر خوا ئەوا ئازادن [2] .

## " چەند لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە خەباتی معاذ ( رضي الله عنه ) "

لە جەنگی ( اجنادین ) دا معاذ ڕەزای خوای لێ بێت ، پێشەوای دەستە ڕاستی سوپا کە بوو ، هەڵساو بە هاوەڵەکانی فەرموو : ئەی موسڵمانان ، ئەمڕۆ خۆتان بفرۆشن بە پەروەردگارتان ، چونکە ئەگەر ئێوە بیانبەزێنن و شکستیان پێ بێنن ئەوا ئەم ولآتانە

[1] - احمد ریوایەتی بۆ کردووە لە ( الزهد ) دا ( ١٨٢ ) .

[2] - حاکم ریوایەتی کردوە ( ٣ / ٢ / ٢٧٢ ) دەڵێت : ( صحیح الاسناد ) ە و زهبیش هەمان ڕای هەیە .

هەتاهەتایە دەبێتە ماڵی ئیسلام ، سەرباری ڕەزامەندی خوا و ئەو پاداشتە گەورەیەی خودا ئامادەی کردووە . هەروەها لە ( فحل بیسان )یشدا هەر سەرکردەی دەستە ڕاستی سوپای موسڵمانان بوو ( ﷺ ) .

( ثابت ی کوڕی سهل ی کوڕی سعد) دەڵێت : معاذ کوڕی جبل ئەو ڕۆژە لە هەمووان زیاتر سەرگەرمەمان بوو ، وە لە هەموانیش زیاتر شمشێرەکەی لە کاردا بوو بۆ گەردنی ڕۆمەکان ، لە کاتێکدا ئەو لە لای ڕاستی موسڵمانانەوە خەریك بوو شەڕی دەکرد ، سەربازانی ڕۆم لە موسڵمانان هاتنە پێش و سەربازگەکەیانیان دەورەدا ، لەوێدا معاذی کوڕی جبل بە خۆی و پیاوەکانیەوە پەیدا بوون ، معاذ بانگی کردوو فەرمووی : " ئەی خەڵکینە – ڕەحمەتی خواتان لێ بێت – بزانن کە خودا پەیمانی سەرکەوتنی بە ئێوە دا وە و بە باوەڕەکەتان پشتگیری کردوون ، دە ئێوەش خودا سەرخەن تا سەرتانخات و پێیەکانتان جێگیر کات ، ئاگادارین .. ئێوە خواتان لەگەڵە و بێ گومان بەسەر بتپەرستاندا سەرتان دەخات "

کاتێ خەریك بوو وتوێژی دەکرد لەگەڵ ماقوڵانی ڕۆم دا پێش جەنگی ( محل ) و ڕازی نەبوو لەگەڵیاندا لەسەر ڕاخەرەکانیان دانیشێت : فەرمووی : دانانیشم ، چونکە ئەم ڕاخەرانەی ئێوە و دانیشتن لەسەر ئەم ( دۆشەکانەی ) کە بۆ خۆتان هەڵتان بژاردووە و چەوساوە و بێ دەسەڵاتەکانتان لێ بێ بەش کردووە لەگەڵ ئەهلی نەتەوەکەتان ، ئەمە لە جوانی و لە خۆبایی بوونی دنیا زیاتر هیچی تر نیە ، خوداش دونیای ناوێ و نەهی کردووە کەستەمی لەسەر بکرێت و زیادەڕەوی تێدا بکرێت ، من ئەوەتا لێرە ، لەسەر ئەم زەویە دائەنیشم ، ئێوەش چیتان هەیە بیڵێن ، ئەوانیش کاتێ پێیان وت : " بڕۆ بۆلای هاوەڵانت ، سوێند بەخوا ئێمە بە ئومێدین کە سبەینێ بەرەو شاخەکان و ( کێوەکان ) دەرتان پەڕێنین . معاذیش فەرمووی :

" سەبارەت بەوەی دەرمانپەڕێنن بۆ کێوەکان ئەمەیان ڕوونادات ، بەڵام سوێند بەخوا یان ئەوەتا هەموومان شەهید دەکەن یان لەسەر ئەم زەوی یە بە سەرشۆڕی و زەلیلی وە دەرتان دەنێین [1] .

---

[1] – الطريق الى دمشق ( ٤٧٢ ) .

## " ڕۆژی یەرموك "

لەوێشدا معاذ ( ﷺ ) هەر سەرکردەی دەستەڕاستی سوپا بوو ، سەر لە بەیانی ڕۆژی جەنگەکە هەساو وتاری بۆ دان ، فەمووی : ئەی هەڵگرانی قورئان و پشتیوانانی ڕێگای ڕاست و دۆستانی هەق ، سوێند بێ بە پەروەردگار ، بەزەیی خودا و بەهەشتی خوا بە ئاوات خواستن بە دەست ناهێنرێت ، وە خودا لێخۆش بوون و بەزەیی فراوانی خۆی بە ڕاستگۆیان و ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان بە پەیمانەکانی خوا هەیە ، بەکەسی تر نابەخشێ ، مەگەر گوێتان لە خوای تەعالا نەبووە کە دەفەرموێ : ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ...﴾ سورة النور ، آية ٥٥ .

واتە : ((خوا بەڵێنی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات هەر وەك چۆن ئیماندارنی پێش ئەمانی جێنشین کردووە)) ، ئێوە بە ویستی خوا سەرکەوتوو دەبن دەی گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی بن ، و ناکۆك مەبن چونکە شکست دێنن و ناوتان نامێنێ ، ئارام بگرن ، چونکە خودا لەگەڵ ئارامگرانداییە ، و شەرم لە پەروەردگارتان بکەن و نەکەن لە دوژمن هەڵبێن و ڕاکەن لە کاتێکدا ئێوە لە چنگی پەروەردگاردان و لە ژێر ڕەحمەتی ئەو دان ، وە هیچ کەس لە ئێوە پەناگەیەکی دیکەی نیە جگە لە پەروەردگاری وە هیچ کەس بە بێ ویستی خودا سەر بڵند و سەرکەوتوو نەبوت [1] .

وە کاتێ ڕۆمەکان دایان بەسەر لای ڕاستی سوپادا ، معاذ هاواری کرد : ( ئەی بەندە موسڵمانەکانی خودا ، ئەوانە وابەرە و لای چەپیی سوپاوە دەڕۆن تا بدەن بەسەرتاندا ، وە سوێند بەخوا هیچ شتێ ڕەتیان ناکاتەوە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەقینە و ئارامگرتن نەبێت لەسەر بەڵاو سەختی یەکان ) . ئەوجا لەسەر وڵاخەکەی هاتە خوارەوە و فەرمووی : کێ ئەیەوێ وڵاخەکەم بەرێت تا بەسەر یەوە شەڕ بکات ، با بیبات . وە خۆی لەسەر پێ و بە بێ وڵاخ لەگەڵ پیادەکاندا شەڕی دەکرد ، تا ( عبدالرحمن )ی کوڕی کە لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو ، هەڵساو وتی : بابەگیان ، من تکام وایە بەسواری وڵاخەوە باشتر بجەنگم لەوەی کە بە پیادە شەڕ بکەم و موسڵمانان لێم بێ نیاز بن ، وە تۆش بە پیادە باشتر دەجەنگێیت تا بەسەر وڵاخەوە ، زۆربەی سەربازانی

[1] – دیوانی ( هاشم ) الرفاعی ) ، بڕوانە : صلاح الامة ( ٣ / ٤٩٧ ، ٤٩٨ ) .

سوپاش پیادەن ، وە ئەگەر تۆ ببینن کە بە پیادە بە ئارامگری یەوە بجەنگیت – بە ویستی خوا – ئەوانیش ورەیان بەرز دەبێتەوە و ئارامگر و پشوو درێژ دەبن .. معاذیش پێ ی وت : خودا یارمەتی منیش و تۆیش بدات ، کوڕم [1] .

## " دادپەروەری لە ژیانیدا "

( یەزیدی کوڕی عومەیرە ) کەیەکێ بوو لە هاوەڵانی معاذی کوڕی جبل وتی : هەر کاتێ معاذ لە جێیەك – دانیشتگایە – دانیشتایە ئەیفەرموو :

" الله ، دادوەری دادپەروەرە ، بەرز و پیرۆز بێت ناوی ، بەد گومانان لە ناوچن "

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێش وەفاتی خواحافیزی لێ دەکات ، لە عاصم ی کوڕی حومەیدی سەکوونی یەوە : –

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) معاذی نارد بۆ یەمەن ، هەڵسا بە ڕاسپاردنی ، لە کاتێکدا معاذ بەسەر ئەسپەکەیەوەیەتی فەرمووی : " یا معاذ ! انك عسى ان لا تلقانی بعد عامی هذا ، و لعلك ان تمر بمسجدي و قبري .

واتە : ئەی معاذ ! لەوانەیە لەم ساڵ بەدواوە نەمبینیتەوە ، و لەوانەیە بەلای مزگەوت و گۆڕەکەمدا تێپەڕبیت .. (معاذ )یش دەستی بە گریان کرد ، فەرمووی : ( لا تبك یا معاذ ، او ان البكاء من الشیطان ) [2] .

واتە : مەگری معاذ ، فەرمووی بەڕاستی گریان لە شەیتانەوەیە .

## " پشوو درێژی لەسەر بەڵاو ناڕەحەتی "

کاتێ تەنگانە و نەهاتەکان دادەبارێنن و داوەکانی ئاڵۆز دەبن و سەخڵەتی یەکان یەکلەدوای یەك دێن و شەوگاریان درێژ دەبێت ، ئەوە هەر ئارامگری یە ڕووناکی یەکی وادەداتە موسڵمان کە نەشڵەژێ و دان بە خۆداگرتنە ڕێنوێنی دەکات تا بێ هیوام بێت ،

---

[1] – الطریق الی دمشق ( ٤٧٦ ) .

[2] – پیاوانی فەرموودەکە جێ ی باوەڕەن : احمد ریوایەتی کردوە ( ٥ / ٢٣٥ ) ، وە مۆڵەتی گریان لە چەند فەرموودە داهاتووە .

ئـارامیش لـە ڕەگـەزەکانی پیـاوەتی یـە ... چـونکە لـە ڕاسـتیدا کەسـانی لاواز بەرگـەی بارەقورسەکانی ژیان ناگرن .. بەڵکو پیاوانی شان و بازوویتە و دەتوانن بچنەژێرباری !! ژیـان بـەو جۆرەیـە ، تـەنها گـەورە پیـاوان و کەسـانی پاڵـەوان و پـشوو درێـژ دەتـوانن پەیامەکەی هەڵگران و تێگەیشتن ... وە بێگومـان ، کـە معـاذ لـەم کەڵـە پیاوانەیـە ، بـەڵکو گەورەیان و لە پێشیانەوەیە لە خەباتدا و لەکاتی نەخۆشیشدا ..

لە ئوم سەلەمەوە ، ( ﷺ ) : کاتێ ئەبو عبیدە لە تاعونەکەی ( عمواس ) دا تووش بوو ، و کەوت و ئازار و ژان زۆری بۆ هێنا ، (معـاذی کـوڕی جبـل ) ی کـردە جێنـشینی ، خەڵکی هاواریان کرد لە معاذ : داوا لە خوای پەروەردگار بکە ، بەڵکو ئەم دەردە پیسەمان لەسەر هەڵگرێت ، ئەویش فەرمووی :

" ئەمە پیسی نیە ، بەڵکو دوعای پێغەمبەرەکەتان ( ﷺ ) و ، مـەرگی پیاوچاکانی پێش خۆتان و شەهید بوونی کەسانێکە کە خودا بەویستی خۆی تایبەتمەندی کردوون ، ئەی خەڵکینە ! چوار خەسڵەت هەیە ، کێ لە ئێو دەتوانێ بانەیگەرێتەوە ، وتیان : چی یە ؟ فـەرمووی : - سـەردەمێك دێـت باتـڵ و ناهـەق دەردەکـەوێت ( دەسـەڵاتدار دەبێـت ) و سەردەمێك دێت پیاو دەڵێت : سوێند بەخوا نازانم من چیم ، نەبە بەرچاو ڕوونـی دەژی و نەبەبەرچاو ڕوونی دەمرێت[1] .

لە ( عبدالرحمن ی کوڕی غەنم )ەوە ، دەڵێت :

تاعون لە شام بڵاو بوویەوە ، عمری کوڕی عاص هەڵساو وتـارێکی بـۆ خـەڵکی دا ، فـەرمووی : ئـەم تاعونـە دەردێکـی پیسـە ، لێـی هـەڵبێن و بـەرەو دۆڵ و دامێنی کێوەکـان بڕۆن ، ئەمە بە ( شرحبیل ی کـوڕی حەسـەنە ) گەیـشت ، تـوڕە بـوو ، و هـات بـە جۆرێـك جلەکانی بەسەزەویدا ڕائەکێشا و نەعلەکانی بە دەستی یـەوە بوون ، فـەرمووی : هـاوەڵی پێغەمبـەری خـوام ( ﷺ ) کـردووە ، بـەڵام ئەمـە ڕەحمـەتی پـەروەردگارە و دوعـای پێغەمبەرەکەتانە ( ﷺ ) و مەرگی پیاوچاکانە پێش مەرگی ئێوە ...

ئەوجا ئەم هەواڵە بە معاذ گەیشت ، فـەرمووی : ئـەی خـوای پـەروەردگار زۆرتـرین بەشی لێ بدە بە ئەهلی معاذ [2] .

---

[1] - بڕوانە : ئیبنو سعد لە ( التطبقات ) دا ( ٣ / ٢ / ١٢٤ )

[2] - پێغەمبەری خوا (ﷺ ) پەنای بە خودا دەگرت لەم دەردە بێ دەرمانانە ، بەڵام دەبینین معاذی کوڕی جبل و دوعای تووشبوونی بەم دەردە دەکرد بە ئومێدی شەهید بوون :

ئـەوەبوو بـەو دەردەوە هـەردوو کـچەکەی مـردن و لەیـەك گـۆڕدا سـپاردنی . وە ( عبدالحمن )ی کوڕیشی تووش بوو ، کاتێ لە کوڕەکەی پرسی حاڵت چۆنە ؟ فەرمووی : ﴿ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلا تَكُنْ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴾ سورة آل عمـران ( ٦٠ ) . واتە : هەقیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە کە لەلایەن خواوەیە .

کەواتە : نەکەیت لەوانە بیت کە گومان کاریان تێدەکات.

ئەویش فەرمووی : ﴿ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴾ سورة الصافات ، آية (١٠٢) .

واتە : دەمبینی ، بەویستی خوا ، لە ئارامگران دەبم .

دەڵێت : دەستی معاذیش تووشی نەخۆشی یەکە بوو ، بەردەوام ئەم دیو دیوی پێ دەکرد و ئەیفەرموو ئەم دەستەم لە ئەوە و ئەوە خۆشتر دەوێت ، و دەیفەرموو : (ئەی پـەروەردگار ! بمبـەرەوە و بـە لیقـات شـادم کـە ، خـۆت دەزانـی کـە خۆشـم دەوێـت ) وە پیاوێکی بینی دەگریا ، پرسی : بۆچی دەگریەیت ؟ وتی : لەبەر دنیایەك ناگریەم کە لە تۆوە چنگم کەوتبێ و پاش تۆ لێم دابڕێ ، بەڵکو بۆ زانستێك دەگریم لە تۆم وەردەگرت دوای تۆ لەکێ وەرگرم ، فەرمووی : جا بۆچی دەگریەیت ، خۆ ئیبراهیم ( علیهم السلام ) کاتێ لەسەر زەوی بوو ، هیچ زانیاری یەکی تیانەبوو ، خوای گەورە خۆی زانستی پێ گەیاند ، ئەگەر من مردم ئەوا لە لای چوار کەس زانست بخوازە : عبدالله ی کوڕی مسعود، سلمانی فارسی ، عبدالله ی کوڕی سلام و عویمر ئەبو الدرداء [1].

وە لە ( حارثی کوڕی عمیرە ) وە ، دەڵێت : کـاتێ لـە تەنیشت ( معاذ )وە بووم لـە سـەرەمەرگیدا ، لـە هۆشـی خـۆی دەچـوو ، دەهاتـەوە سـەر هـۆش ، دەیفـەرموو : (بمرێنە – ئەی پەروەردگار – چونکە سوێند بە گەورەیت ، خۆشم دەوێیت [2].

وە دوای گەشتێکی پیرۆز ... کە معاذ گرتیەبەر و پاش بەشداری یەکی بەرفراوانی لەگەیاندنی بانگی هەق و چەسپاندنی بنەماکانیدا... و پاش گەڕانێکی دوور درێژ بەدوای شەهادەتدا لە مەیدانی جەنگ ، دواجار لەسەر جێگەی مەرگ ئەو ئاواتە ی بە دەست هێنا ( وکان امر الله قدرا مقدورا ) .

ڕەحمەتی خوات لێ بێت ، ئەی پێشەوای زانایان ... وە خوا بۆ خۆی پاداشت و بەخششی بەسەرتدا بباری‌نێ ...

---

[1] – بوخاری ریوایەتی کردووە لە ( التاریخ الصغیر ) ( ١ / ٧٣ / ٧٤ ) و ( شهر صغیف )

[2] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٢ / ٢ / ١٢٥ ) .

## ٣٩ – سەعدی کوڕی معاذ ( رضي الله عنه )

## " ئەو پاڵەوانەی عەرشی پەروەردگار بۆ مەرگی لەرزی !! "

کێ یە ؟

شەهیدی پایەبەرز سەعدی کوڕی معاذی کوڕی نعمانی کوڕی عبد الاشهل ، ئەبو عمری ئەنصاری ئەوسی ئەشهەلی ، بەدری یە ، عەرشی پەروەردگار بە مەرگی لەرزی !! سەعد ( رضي الله عنه ) پیاوێکی سپی پێستی بالاّ بەرزی جوانچاك و پیێ کەوتوو بوو ...

لە سەر دەستی ( مصعب ی کوڕی عمیر ) ( رضي الله عنه ) موسڵمان بووە . ابن اسحاق ، دەڵێت : ( کاتێ موسڵمان بوو ، چوو بۆلای هۆزەکەی و پێی وتن ، ئەی نەوەی ( عبد الاشهل ) چۆن لە من دەڕوانن ؟

وتیان : لە فەزڵ و چاکەدا ، گەورەمانی و لە هەموومان ڕاستڕەوتری لە ڕابەری کردنتدا . فەرمووی : دەی قسەکردنم لەگەڵ پیاو و ئافرەتتان حەرام بێت ، ئەگەر باوەڕ نەهێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی .

دەڵێت : سوێند بەخوا کەس نەما لە ماڵی ( بنی عبد الاشهل ) لە پیاو و لە ئافرەت موسڵمان نەبێت و هەموویان باوەڕیان هێنا [١].

ابن الشهاب ، دەڵێت : سەعدی کوڕی معاذ لە ( بەدر ) دا بەشدار بووە ، و لە ڕۆژی ( خندق ) دا برندار کراوە و دوای ئەوە مانگێك ژیاوە و بەهۆی برینەکەیەوە و خوێن لێڕۆیشتنەوە وەفاتی کردووە .

نووسەر دەڵێت : لەگەڵ ئەوەشدا کە سعدی کوڕی معاذ ( رضي الله عنه ) چەند ساڵێکی کەم لەناو ئیسلامدا ژیا ، بەلاّم ئەو پێشبڕکێی لەگەڵ کاتدا دەکرد و توانی لەو ماوەکەمەدا سەروەری یەکی گەورە بۆ خۆی و بۆ ئایینەکەی بنیات بنێت .

[١] – بڕوانە : سیرە ئیبنو هشام ( ١ / ٤٣٧ ) .

## " چەند هەڵوێستێکی نەمر لە ژیانی سەعد "

لە ڕاستیدا هەڵوێستە زیندوو نەمرەکانی ئەم بەندە چاکە خوازە زۆرن ، کەسێك عەرشی پەروەدگار بە مەرگی بێتە لەرزین و فریشتەکان پێشبڕکێ بکەن بۆ بەڕێ کردنی جەنازەکەی و هەڵگرتنی تابوتەکەی .. بەڕاستی کەسێکە شایستەی بەرزڕاگرتن و ڕێز لێ گرتنە .. هەندێ لەو هەڵوێستانەش :

لە ڕۆژی ( بنی قریظة )دا :

خاتوو ( عائشە ) ی دایکی ئیمانداران ( ﵂ ) ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئوم سەعدا لە قەڵای ( بنی حارثە ) دا بوون ، سەعد بەلایاندا تێپەڕ بوو سپەرەکەی بەستبوو کە چوو بوویەوە یەك و کورت بوو بوویەوە کە باڵی هەمووی لێیەوە هاتبووە دەرەوە ، حەربەیەکی بە دەستەوە بوو .. عائشە ( ﵂ ) بە ئوم سەعدی فەرموو : خۆزگە (درع )ەکەی کەمێك فراوانتر و باشتر بوایە ، ئەوە بوو تیرێك لەلایەن ( ابن العرقە )وە لە ( سەعد ) درا و ڕەگی ناوەڕاستی باڵی بڕی . ( ابن العرقە ) کاتێ تیرەکەی لێ دا وتی : بیگرە ، منم ( ابن العرقە) ئەوش فەرمووی :

(عـــــرق الله و جهـــــــك في النــــــار ) واتــە : خــوا لــە ئــاگردا ئارەقــە بــە دەم و چاوتا بێنێت ..

دەیفەرموو : ئەی پەروەردگار .. ئەگەر هێشتا ڕووبەڕوو بوونەوە و شەڕێك لەگەڵ قورەیشدا ماوە ، ئەوا بمهێڵە بۆی ، چونکە هیچ لەوە خۆشتر نیە بەلامەوە کە دژی هۆزێك بجەنگم لە پێناوی تۆدا کە ئەو هۆزە ئازاری پێغەمبەرەکەی تۆیان دەدا و بەدرۆیان خستبێتەوە و وەدەریان نابێ . وە ئەگەر کۆتاییت بەشەڕ هێناوە لە نێوانماندا ، ئەمەم بۆ بکە بە هۆکاری شەهادەت و مەمرێنە تا بە چاوی خۆم شکست و تیاچوونی ( بنی قریظة ) دەبینم [1] .

ئەوەبوو بەنو قریظە پەیمانشکێنییان دەرهەق پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کردبوو وە لەگەڵ ( قورەیشو هاوپەیمانانی ) ڕێك کەوتبوون کەوا بنی قریظة ڕێگەی چوونە ناو مەدینەو دان بەسەر موسڵمانانیان بۆ خۆش کات .. ئەگەر بەزەیی خودا نەبوایە ..

[1] – پیاوانی جێ باوەڕن : ئیبنو هشام ( ٢ / ٢٢٦ ) و احمد تۆزێ لەمە درێژتر باسی کردووە .

وە پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) سـەعدی بـۆ نـادر بـوون تـاوەکو پەیمانەکـەیان وەبـیر بێنێتـەوە کـە دابوویـان بـە پێغەمبـەری خـوا ... ئـەوە بـوو دەسـتیان بـە جنێـو پێـدان و ئازاردانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد ، لەبەر ئەوە بوو سەعد ئەم دوعایەی کرد ...

وە کاتێك خوای پەروەردگار بە دەسـەلاتی خـۆی ( احـزاب )ی شکسـت پـێ هێنـا .. پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) ئابلۆقـەی ( بنـی قریظـةی ) دا تـا کەوتنـە ژێـر فـەرمانی سـەعدی کوڕی معاذ ...

پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) پـەیامێکی نـارد بـۆ سـەعد ، ڕاوێـژی کـرد سـەبارەت بـە هەڵوێست [1] ، پیاوانی بنی قریظة بکوژرێن و ئافرەتەکانیشان دیل بکرێن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمەی پێ گەیشت ، فەرمووی : لقد حکم فیهم بحکم الله الذی حکم به مـن فـوق سبع سموات ) [2] .

واتە : بەڕاستی ئەو فەرمانەی سەعد بەسەریاندا جێبەجێ ی کـرد ، خـوای گـەورە لەسەر و حەوت ئاسمانەوە هەمان فەرمانی بڕیاردابوو ...

لە ڕیوایەتی پێشەوا ( احمد ) دا ، لە جابرەوە ، دەڵێت : پیاوانی بنی قریظة (٤٠٠ ) چـوار سـەد کـەس بـوون ، کـاتێ پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) لـە کوشـتنیان بوویـەوە .. برینەکەی سەعد سەری هەڵدایەوە ...

## " وەفاتی سەعد ( رضي الله عنه ) "

لـە ( مـحمـودی کـوڕی لبیـد )ەوە ، دەڵێـت : کـاتێ دەمـاری بـاڵی سـەعد لـێ درا، ، بردیان بۆ لای ئافرەتێك کە برینداری تیمار ئەکرد بەناوی ( رفیدة ) وە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەردەوام هەواڵپرسی لێ دەکرد و دەیفەرموو : کیف امسیت ، و کیف اصبحت ؟ )

واتە : ئەمشەو چۆن بوویت ؟ چۆن ڕۆژت کردەوە ؟ .. ئەویش هەواڵی پێ دەدا ، تا ئەو شەوەی کە هۆزەکەی گواستیانەوە پاش ئەوەی حاڵی خراپ بوو ، هەڵیان گرت و بردیان بۆلای ماڵی ( بنی عبدالاشهل ) . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات و فەرمووی : دەرچن بـابڕۆین .. چـوە دەرەوە و ئێمـەش لەگـەڵی چـووینە دەرەوە ، ئەوەنـدە خێـرا دەڕۆشـت

---

[1] – بەرامبەرایەتی قورەیزە ، سەعدیش فەرماوی .

[2] – سەنەدەکی ( حسن )ە ، ئیبنو سعد ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٢ / ٦ ) و ارنؤوط بە (حسن ) دایناوە ، هامش سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٢٨٩ ) .

قەیتانی نەعلەکانمان بچڕا ڕۆیەکانمان بەسەرەوە کەوت ، هاوەڵان سکاڵای ئەمەمان لای پێغەمبەری خوا کرد ( ﷺ ) – کە بەڵکو کەمێك لەسەر خۆتر ڕێ بکەن – پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : انی اخاف ان تسبقنا الیه الملائکة فتغسله کما غسلت حنظلة ) .

فەرمووی : ئەترسم فریشتەکان پێش ئێمە بگەنە سەری و بیشۆرن هەروەك چۆن (حنظلە ) یان شۆرد .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هاوەڵان گەشتنە ماڵەکە ، دەبینن دەیشۆرن و دایکی خەریکە بۆی دەگری و دەڵێت :

ویل ام سعد سعدا    خرامة وجدا [1]

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : کل باکیة تکذب الا ام سعد

واتە : هەموو گریاوێك کە بۆ مردووەکەی دەگری درۆ دەکات ، بێجگە لە ئوم سەعد . (مەبەستی ئەوانەیە کەبەسەر مردووەکانیاندا هەڵدەدەن ) . پاشان چووە دەرەوە ..

محمودی کوڕی لبید دەڵێت : خەڵکەکە وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، تا ئێستا هیچ مردوویەکمان هەڵنەگرتووە لە سەعدکێشی سوکتر بوو بێت .

فەرمووی : ( ما یمنعه ان یخف وقد هبط من الملائکة کذا وکذا لم یهبطوا قط قبل یومهم ، قد حملوه معکم ) [2]

واتە : چۆن سوك نەبێت ، لەکاتێکدا ئەوەندە و ئەوەندە لە فریشتەکان دابەزیون کە تا ئێستا دانەبەزیون ، وە لەگەڵ ئێوەدا ئەویان هەڵگرتووە ..

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەردانی سەعدی کردووە کاتێ کە برینەکەی زۆری بۆ هێناوە و پێش ئەوەی وەفات بکات .

لە ( عبدالله ی کوڕی شداد ) ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆلای سەعد (ﷺ ) لە کاتێکدا لەبەر ئازار پێچی دەخوارد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرمووی : (جزاك الله خیرا من سید قوم ، فقد انجزت ماوعدته و لینجزنك الله ماوعدك ) [3]

واتە : خوا پاداشتت بداتەوە ، کە چ سەرەك هۆزێکی باش بوویت .

---

[1] – واتە / واوەیلا بۆ دایکی سەعد ، بۆ دایکی کەسێکی سەر ڕاست و پاڵەوان .

[2] – سەنەدەکی ( حسن )ە ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٢ / ٧ ، ٨ ) ( ارنؤوط ) یش سەنەدەکی بە ( حسن ) داناوە سیر ( ١ / ٢٨٧ ) .

[3] – پیاوانی جێی باوەڕن : ئیبنو سعد لە ( الطبقات ) ( ٣ / ٢ / ٩ ) . بەراوێزی سیر اعلام النبلاء (٢٨٨/١) .

بەڕاستی ئەوپەیمانەی بە خوای خۆتت دابوو بەجێت هێنا ، وە دڵنیا بە کە خودای پەروەردگاریش ئەوپەیمانانەی بە تۆی داوە بە جێی دەهێنێت ..

## " لەرزینی عەرش بە مردنی "

چ بەهرەیەك و چ ڕێزێك لەمە گەورەترە ، وە چ نیشانێك لەمە بەرزترە ؟! بەندەیەك لە سەر زەوی وەفات دەکات ، عەرشی پەروەردگار لەسەری حەوت ئاسمانەوە بێتە لەرزین !!

## " ( إقرأ ) بخوێنە "

لە جابرەوە ، دەڵێت : جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و فەرمووی : ( ئەم بەندە چاکە کێ بوو وەفاتی کرد ؟ دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کرایەوە و عەرشی خوا لەرزی ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە دەرەوە دەبینێ ( سەعد )ە وەفاتی کردووە . دەڵێت : بەسەر گۆڕەکەیەوە دانیشت [1].

پێشەوا ( ذهبي ) دەڵێت : چەند جار فەرموودەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتووە بە ( تواتر ) کە فەرموویەتی : ( ان العرش اهتز لموت سعد فرحا به ) .

واتە : عەرشی خودا لە خۆشی هاتنی سەعد ، بەوەفاتی لەرزی ...

لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوە چەسپاوە کە دەربارەی کراسێك ( حلّة ) کە هەموان لە جوانی یەکەی سەریان سوڕماوە فەرموویەتی : ( لمناديل سعد ابن معاذ في الجنة خير من هذا ) [2]

واتە : دەستە سڕەکانی سەعدی کوڕی معاذ لە بەهەشتدا لەمە جوانترو باشترن ..

ذهبي " ڕەحمەتی خوای لێ بێت " دەڵێت : " ( عەرش ) یەکێکە لە دروستکراوەکانی خودای پەروەردگار و ڕام کراوە کە بەویستی خودا هەرکاتێ بیەوێ دەهەژێ و دەلەرزێ و هەستی خۆشەویستی ( سعد )ی تیابەدی کردووە ، هەروەك چۆن هەستی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی لە کێوی ئوحود دا بەدی کردووە .

[1] – احمد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ٣٢٧ ) . الحاکم ( ١ / ٢٠٦ ) وە دەڵێت : ( صحيح الاسناد )ە و زەهەبیش هەمان ڕای هەیە .

[2] – صحيح / احمد ریوایەتیکردووە ، وە حاکمیش ( ٣ / ٢٠٦ ) زەهەبیش بە ( صحيح ) داناوە و لەسەری هاوڕایە .

خوای گەورە دەفەرموێ : ( يا جبال اوبي معه ) سورة سبأ ، آية( ١٠ ) [١] ... ئەمەش هەق و ڕاستەقینەیە .

وە لە ( صحيح )ی بوخاری دا هاتووە کە ئیبن مسعود فەرموویەتی : " گوێمان لە تەسبیحاتی خواردن ئەکرد لە کاتێکدا دەخورا ) [٢] ئەمەش بەڕاستی دەرگایەکی فراوانە و ڕێگاکەی ئیمان و باوەڕە [٣] .

## " فریشتە لە جەنازەی ( سعد ﷺ )دا "

پاك و بێگەردی بۆ خوا ، پایەی مرۆڤ چەند بەرزە کاتێ خودای خۆی دەناسێت و چەند جوان و چەند بەپێزە ... وەفدەکانی ڕەحمان دەستە دەستە لەکاتی مردنیدا دادەبەزنە سەری : ( الا تخافوا و لاتحزنوا و ابشروا بالجنة التي كنتم توعدون ):٣٠ .

واتە : هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لە داهاتوودا ، هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ ڕابردوو ، موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا .

ئەوەتا دەوری جەنازەی سەعدیان داوە و لە کەژاوەیەکی بەهەیبەتدا کە قەڵەم ناتوانێ وەسفی بکات لەگەڵیدا ڕێ ئەکەن ..

لەئیبن عمر ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( هذا العبد الصالح الذي تحرك له العرش ، و فتحت ابواب السماء ، و شهده سبعون الفامن الملائكة لم ينزلوا الى الارض قبل ذلك ، لقد ضم ضمة ثم افرج عنه يعني سعدا [٤].

واتە : ئەم بەندە چاکەکارەی کە عەرشی پەروەردگاری بۆ لەرزی و دەرگاکانی ئاسمانی بەڕوودا کرایەو و حەفتا هەزار فریشتەکە تا ئێستا دانەبەزیبوونە سەر زەوی شاهیدی بەرێکردنی جەنازە کەیین ، ئەم بەندەیە هێندەی لە باوەش کردنێك ( گوشار)دراو دواتر ئازاد کرا واتە سەعد )..

---

[١] - ماناکەی : ئەی کێوەکان تەسبیحاتی لەگەڵدا بڵێنەوە .

[٢] - صحيح : بوخاری ( ٣٥٧٩ ) .احمد ( ١ / ٤٦٠ ) .

[٣] - بڕوانە : سير اعلام النبلاء ( ١ / ٢٩٥ ) .

[٤] - سەنەدەکی ( صحيح )ە / نسائی دەری هێناوە ( ٤ / ١٠٠ ) ئیبنو سعد ( ٣ / ٢ / ٩ ) .

## " گۆڕە وشار "

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " لونجا احد من ضمة القبر ، لنجا منها سعد" [1] واتە : ئەگەر کەسێك بوایە لە گۆڕە وشار ڕزگاری بوایە ، ئەوە سەعد بوو ...

*ڕای پێشەوا زەهەبی : پێشەوا زەهەبی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەڵێت : " دەڵێم : ئەم گوشینە هیچ پەیوەندیەکی بەسزای گۆڕەوە نیە ، بەڵکو شتێکە باوەڕدار لە خۆیدا بەدی ئەکات وەك چۆن ئازاری لە دەست دانی منالْ و دۆستانی لەدنیادا هەست پێ ئەکات ، هەروەك چۆن ئازاری نەخۆشی و ئازاری ڕۆح کێشان و ئازاری پرس و جۆی گۆڕ و تاقیکردنەوە و ئازاری کاریگەر بوونی بەگریانی ئەهلەکەی بۆی و ئازاری هەڵسانەوەی لە گۆڕەکەی و ئازار و تۆقینی ڕاوەستانی ڕۆژی مەحشەر و ئازاری ڕۆشتن بەسەر پردی ( سراط )دا بەدی ئەکات ..

کەواتە هەموو ئەم ترس و ئازارانە هەیە و مرۆڤ تووشی دەبێت وە هیچیان نەسزای گۆڕن و نەسزای دۆزەخن ، بەلاّم بەندە لە خواترس و تەقوادارەکان لە هەندێ یان هەموویاندا سۆز و نەرمیی لەگەڵدا دەبێت و لەسەری سوك دەکرێت وە باوەڕدار بە بێ لیقای پەروەردگاری ئاسودە نەبو . خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ ... ﴾ سورة مريم ، آية ( ٣٩ )

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ستەمکاران بترسێنە لە ڕۆژی ئاهو ناڵە .

وە دەفەرموێ : ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ ... ﴾ سورة غافر ، آية ( ١٨ ) . واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بیانترسێنە و ئاگاداریان بکە لە ڕۆژەنزیکەکە ، ڕۆژی قیامەت ، کاتێ کە دڵەکان دەگەنە گەروو .

تکامان وایە خوای پەروەردگار لە سۆز و لێبوردەیی شاراوەی خۆی بێ بەشمان نەکات .

سەعد ( ﷺ ) لەگەڵ بوونی ئەم هەژاندنانەشدا ، دەزانین کە لە ئەهلی بەهەشتە و یەکێکە لە شەهیدە پایە بەرزەکان ( ڕەزای خوای لەسەر بێت ) .

کەواتە وا نەزانیت سەرفرازان لەهەردوو دنیادا توشی ترس و تۆقین و ئازار نابن ... بەڵکو داوای سەلامەتی لە خوای پەروەردگار بکەن و داوا بکەن بمانکاتە هاوشێوەی سەعد و لەگەڵ ئەودا حەشرمان بکات [2].

---

[1] - دانپاڵەکەی ( صحيح ) : احمد لە مەسنەدەکەیدا ( ٦ / ٥٥ / ٩٨ ) ریوایەتی کردوە .

[2] - بڕوانە : سير اعلام النبلاء ( ١ / ٢٩٠ / ٢٩١ ) .

وە کاتێ سەعدی کوڕی معاذ وەفاتی کرد دایکی هاواری کرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموو : ( الا يرقأدمعك و يذهب حزنك ؟ فإن ابنك ، اول من ضحك الله اليه ، و اهتز له العرش ) . زەهەبی دەڵێت : فەرموودەیەکی ( مرسل )ە .

واتە : لەبەرچی فرمێسك دەڕێژێت و خەفەت دەخۆیت ؟ کوڕەکەی تۆ یەکەم کەسە خوای پەروەردگار بەدەمیەوە پێکەنیبێت و عەرش بۆی لەرزی بێت .

## " گریانی هاوەڵان بەسەریەوە "

کاتێ برینەکەی سەعد کولایەوە و سەری هەڵدایەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خێرا چوو بۆلای و لە ئامێزی گرت ، خوێن لە برینەکەیەوە دەچۆڕا . پێشەوا ابوبکر ( ﷺ ) هات و فەرمووی : ( ئای چ پشت شکانێکە ڕوشتنی سەعد ! ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( مهلا ابابکر ) لەسەر خۆبە ، ئەبوبەکر ، ئەوجا پێشەوا ( عمر ) هات ، فەرمووی : ﴿ .. إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ [1] .

وە لە عائشەوە ( ﷺ ) دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ابوبکر و عمر هاتن بۆلای سەعدی کوڕی معاذ لە کاتێکدا خەریك بوو وەفاتی دەکرد . دەڵێت : سوێند بەوکەسەی گیانی ( محمد )ی بەدەستە گریانی ( ئەبوبەکر و عمر )م لێك جیا دەکردەوە ، لە کاتێکدا لە ژوورەکەی خۆمدا بووم و ئەوان لە مزگەوت بوون ئەوان هەروەها بوون کە پەروەردگار دەربارەیان فەرموویەتی : ﴿ ... رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ... ﴾ سورة الفتح ، آية ( ٢٩ ) [2]
واتە لە نێوان یەکتریدا بەبەزەیین ..

سەعد ، وەفاتی کرد لە تەمەنی سی و حەوت ساڵیدا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژی لەسەر کرد و لە ( بقیع ) سپاردە کرا .

لە ژێر خاکی ( بقیع ) دا گەورەمان ( سەعد ) نووستوە و سیرەی پاك و ڕوناکی بە بۆنخۆشی و بە درەوشاوەیی ماوەتەوە خوات لەگەڵ بێت سەروەرم ... وە لە هەردوو جیهان سەلامەت لێ بێت ...

"والحمد لله رب العالمين"

---

[1] – پیاوانی جێ ی باوەڕن بەڵام ( مرسل )ە بەڕای ارنؤوط . ( سير اعلام النبلاء ) ١ / ٢٨٥ پەراوێز .
[2] – سەنەدەکی ( حسن )ە : احمد ریوایەتیکردووە ( ٦ / ١٤١٢ / ١٤٢ ) .

# ٣٠ – عوسمانی کوڕی مظعون ( رضي الله عنه )

# " یەکەم کەسە لە ( بقیع ) سپاردە کرا بێت "

پێناس :

عوسمانی کوڕی مظعونی کوڕی حبیب ی کوڕی وهب ی ( جمحی )یەو بە ( ابو السائب )یش بانگ کراوە . یەکێکە لە کۆچەرە بەڕێزەکان و لە ئەولیا لە خواترسەکانە / ئەوانەی سەرفراز بوون بە وەفات کردنیان لە ژیانی پێغەمبەری خوادا و نوێژی لەسەر کردن ، ابو السائب ( رضي الله عنه ) یەکەم کەس بوو لە ( بقیع ) نێژرا [١] .

چواردەهەمین پیاو بوو ئیمانی هێناو موسڵمان بوو ، هەردوو هیجرەتی کردووە و دوای جەنگی بەدر وەفاتی کردووە .

کەسێکی خواپەرست و بەکۆشش بوو . لەگەڵ ( علی ) و ( ابوزەر )دا ویستیان واز لە ژن هێنان بێنن ، بەڵام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەزۆڵی ئەمەی لێ کردن .

سعیدی کوڕی مسیب ، دەڵێت : گوێم لە سعد بوو ئەیوت : پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ئەوەی لە عوسمانی کوڕی مظعون ڕەت کردەوە کە ویستی واز لە ئافرەت بێنێ و هەرگیز ژن نەهێنێت ، خۆ ئەگەر وانەبوایە و مۆڵەتی ئەوی بدایە ئێمەش وامان دەکرد [٢]. هەروەها عوسمانی کوڕی مظعون ( رضي الله عنه ) یەکێ بوو لەوانەی لە جاهیلەتیشدا مەی نەخواردۆتەوە . عوسمانی کوڕی مظعون دەڵێت : خواردنەوەیەك ناخۆمەوە کە هۆش و عەقڵم بەرێت و کەسانی خوار خۆیشم پێم پێکەنن و وام لێ بکات کچی خۆم مارەبکەم – واتە زینا لەگەڵ کچی خۆم بکەم – . زەهەبی دەڵێت : ئەمە هەواڵێکە بە بچڕبچڕی هاتووە و نەچەسپاوە .

## " ئارامگری عوسمان لەسەر ئازاردانی لە پێناو خوادا "

کاتێ عوسمانی کوڕی مظعون هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی دەبینی کە چۆن وا لە مەککەدا ئازار و ئەشکەنجە دەدرێن ، لە کاتێکدا ئەم بەهۆی ( ولیدی کوڕی مغیره )

---

[١] – بڕوانە : الاصابة ( ٦ / ٣٩٥ ) .

[٢] – صحیح / بوخاری و مسلم و تیرمیزی ( ١٠٨٣ ) و غەیری ئەوانی ڕیوایەتیان کردوە .

وە پارێزراوە ، فەرمووی : سوێند بەخوا ئەمەی کەمنی تیایە و لە پاڵ پیاوێک ی بێ باوەڕدا وا من خۆم پاراستووە و هاوەڵان و هاوئایینەکانم تووشی ئەشکەنجە و بەڵا گەلێک دەبن کە من توشی نابم ، ئەمە کەموکورتیەکی گەورەیە لە دەروندا ، بۆیە چوو بۆ لای (وەلیدی کوڕی مغیرە ) و پێ ی وت : ئەی ( ابا عبدشمس ) ئەوە لە ئەستۆی تۆدا نەمام و پێویست ناکات پارێزگاریم لێ بکەیت . ئەویش پرسی : بۆچی ، برازا ؟ کەسێ لە قەومەکەم ئازاری داویت ؟ فەرمووی : نەخێر ، بەڵام من ئەمەوێت لەپەنای خوادابم و لە پەنای کەسی دیکەدا نەبم .

وتی : دەی کەواتە بچۆ بۆ مزگەوت ( واتە مسجد الحرام ) ، لەوێ بە ئاشکرا ڕەدی پەنای من بکەرەوە وەکو چۆن بە ئاشکرا پەنام دایت ..

ئەفەرموێت : چووین تاگەیشتینە مزگەوت ، وەلید پێ ی وتن : ئەوە ( عوسمان )ە ئەیەوێ مانەوەی لە پەنای مندا ڕەت کاتەوە . عوسمان فەرمووی ، ڕاست ئەڵێت : وە من هەتا لە پەنایدا بووم کەسێکی بەوەفابوو باش پارێزگاری لێ دەکردم ، بەڵام من حەز ئەکەم تەنها لە پەنای خوادابم و کەسی تر ، بۆیە داڵدە و ( جوار )یم بۆ گێڕایەوە .

پاشان عوسمان ڕۆیشت ، و لەیەکێ لە دانیشگاکانی قورەیشدا ( لبیدی کوڕی ربیعە ) هۆنراوەی بۆ دەوتن ، عوسمان لەناویاندا دانیشت ، ( لبید ) بەدەم هۆنراوە وە وتی :

" ألا كل شيء ما خلا الله باطل "

( واتە بێ گومان هەموو شتێ جگە لە ( الله ) پوچ و بێ بایەخە )

عوسمانیش فەرمووی : ڕاستت وت .

ئەوجا ( لبید ) وتی :

" وكل نعيم لا محالة زائل "

( وە هەموو خۆشی و نیعمەتێك گومان لە نەمانیدا نیە و تەواو دەبێت )

عوسمان فەرمووی : درۆت کرد ، خۆشیەکانی بەهەشت نەبڕاوەیە .

لبید وتی : ئەی هۆزی قورەیش ، سوێند بەخوا تا ئێستا ئازاری کەسێك نەدراوە لەگەڵتان هاونشین بو بێت ، ئەمە لەکەیەوە ئەمەتان تیایە ئازاری یەکێك لە ناوخۆتاندا بدەن ؟ پیاوێك لەناویاندا هەڵسایەوە و وتی : گوێ مەدەرێ ئەمە نەزانێکە و لەگەڵ چەند نەزانێکی تردا ئاینی ئێمەیان واز لێ هێناوە ، لەبەر ئەوە گوێ بەقسەکانی مەدە .

عوسمانیش ، وەڵامی دایەوە بوویە دەمەقرەیان تا پیاوەکە هەڵسایەوە بۆ عوسمان و زللیەکی لە چاوی دا شینی کردەوە ، وەلیدی کوڕی مغیرەش لەو نزیکانە یەو ئاگاداری عوسمانە ..

وتی : سوێند بەخوا ، برازا ، نەئەبوو چاوت وەهای لێ بەسەر بهاتایە و بێ نیاز بوو لەشتی وا ، تۆ خۆت بێ بەش کرد لە پەنایەکی بەهێز ..

عوسمان فەرمووی : بەڵکو سوێند بەخوا چاوەکەی ترم پێویستی بەوەیە کە وەك ئەم چاوەی لێ بەسەر بێ لە پێناوی خوادا ، وە من ئێستا لەپەنای کەسێکدام لە تۆ بەدەسەلاتر و عەزیزترە .[1]

## " خوا پەرستی عوسمان ( ﷺ ) "

عوسمان ی کوڕی مظعون (ﷺ) ئەوەندەزیادەڕەوی کردبوو لە خوا پەرستیدا ، خەریك بوو لە سنووری ناوەندێتی و میانڕەوی دەردەچوو لە ترسی خوای پەروەردگار ، بەلام مامۆستای مرۆڤایەتی و خۆشەویست ( ﷺ ) ، عوسمانی گێڕایەوە ناو بازنەی ناوەندێتی و ( اعتدال ) ..

لە عائشەوە ( ﷺ ) ، دەفەرموێت :

خێزانی عوسمانی کوڕی مظعون کە ناوی ( خولەی کچی حکیم ) بوو هاتە لام سەرو شکڵی نارێك و پێك بوو ( واتە دیار بوو گوێ بە خۆی نادات ) پرسیم چیتە ؟ بۆچی بەم شێوەیەیت ؟ ئەویش وتی : هاوسەرەکەم شەو تابەیانی شەونوێژ ئەکات و ڕۆژیش بەڕۆژو ئەبێت[2] ، کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆلای عائشە ، خاتوو عائشە ئەمەی بۆ باس کرد ، پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) بە عوسمان گەشت و پێ ی فەرموو : ( يا عثمان ! إن الرهبانية لم تكتب علينا ، أمالك في أسوة ؟ فوالله إني أخشاكم لله ، و احفظكم لحدوده)[3].

فەرمووی : ئەی عوسمان ! گۆشەنشینی بۆ ئوممەتی ئیسلام نەنووسراوە ، مەگەر تۆ ناتەوێ شوێن من بکەوی و چاو لە من بکەیت ؟ دەی سوێند بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا ئەترسم و لە هەمووتان زیاتر سنوورەکانی دەپارێزم .

---

[1] – ( صحيح الاسناد ) ه ، لە ئیبنو اسحاقەوەیە ، بەلام ڕاوی یەکی تیایە کە ناوی نەبراوە .

[2] – واتە : کاتی نیە بۆ ئافرەتان.

[3] – پیاوانی جێ باوەڕن : ئیبنو سعد ( ٣ / ١ / ٢٨٧ ) . عبدالرزاق ( ١٠٣٧٥ ) .

## " کۆچ بۆ ماڵی ئاخیرەت "

نەخۆشی زۆری بۆ عوسمان ( ﷺ ) هێنا و ئازاری زیادی کرد تا پێیەوە وەفاتی کرد و چووە پەنای خوای پەروەردگاری ، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناوچەوانی ماچ کردوو دەستی بەگریان کرد .

لە عائشەوە ، ( ﷺ ) : " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عوسمانی کوڕی مظعون بە مردوویی ماچ کرد و فرمێسکەکانی بەسەر ڕوومەتی عوسمانەوە دەهاتە خوارەوە ، تیرمیزی دەڵێت : " فەرموودەی صحیح "ە ، لە عبدالمطلب ی کوڕی عبدالله وە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عوسمانی کوڕی مظعون سپاردە کرد ، پیاوێك وتی : ( با ئەو بەردەبێنم و بیخەمە تەنیشت گۆڕی براکەمەوە بیناسمەوە تا دواتر هەرکەس ویستم لە ئەهلەکەم لەم نزیکانەوە دەفنی کەم ) . پیاوەکە هەڵسا ، بەڵام بەردەکەی بۆ هەڵنەگیرا ، دەڵێت : واتە ئەوەی قسەی بۆ دەکرد : ( چاوم بە قۆڵە سپیەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەوت بەردەکەی هەڵدەگرت و خستیە پاڵ گۆڕەکەی . [1]

وە لە ( ابی النضر )ەوە ، دەڵێت : کاتێ جەنازەی عوسمانی کوڕی مظعون بەڕێ کرا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( ذهبت و لم تلبس منها بشيء ) [2]

واتە : ڕۆیشتیت و تێکەڵی هیچ شتێکی دنیات نەکرد .

ئوم عەلاء کە یەکێ بوو لەوانەی بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا ، لە خەویدا کانی یەکی بینی کە عوسمان خاوەنی بوو ، ئەم هەواڵەی دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، ئەیوش فەرمووی : ( ذاك عمله ) [3] ئەوە کارو کردەوەکانیەتی ..

ڕۆژان تێپەڕین .. عوسمان هەر لە بیر و زەینی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دایە و لە یادی ناکات .. بەردەوام سۆزی بۆی هەیە و هەمیشە بە چاکە باسی دەکات .. وە کاتێ کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، پێی فەرموو : ( الحق بسلفنا الخير عوثمان بن مظعون ) واتە : بە کاروانی پێشینە چاکەکەمان بگە بە عوسمانی کوڕی مظعون .

وە لە ژێر خاکی ( بقیع )دا جەستە پاکەکەی عوسمان نووستوە و پرشنگ و ڕووناکی کردەوە فەزڵو گەورەیی پاش خۆی دنیایان پڕ کردوەتەوە هەروەك گۆڕەکەی ڕووناك کردووەتەوە ...

---

[1] – سەنەدەکی ( حسن )ە ، بەڵام ( مرسل )ە ، ابوداود ڕیوایەتی کردووە ( ٣٢٠٦ ) و بەیهەقیش (٤١٢/٣) .

[2] – مالك کردووە ( ص ١٦٦ ) لە بابی ( الجنائز ) .

[3] – صحیح / بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( ٣٩٢٩ ) لە (مناقب الانصار ) دا .

## " ٣١ - حودەیر ( رضي الله عنه ) "

## " گەشتیارێک پشت بەخوابەستن ( توکل ) توێشوویەتی !! "

توکل ، واتە : ڕاپەڕموونی دڵ بە خواوە پشت پێوە بەستنی و سکوونەتی لە تەنیشتی پەروەردگاریدا ، بە جۆرێك هیچ شڵەژان و دڵەڕاوکێی یەك لە شپرزبوون و نا ئارامی لە هۆکارەکاندا بەدی نەکات و هەموو بگەڕێنێتەوە بۆ خوای پەروەردگار .[1]

عبدالله ی قورەیشی دەربارەی ( توکل ) پرسیاری لێ کرا ؟ وتی : بریتیە لە پەیوەست بوون بە خواوە لە هەموو حاڵەتێکدا .[2] وە خوای پەروەردگار بە جوانترین شێوە بەیانی دەکات : ﴿ ... وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ... ﴾ سورة الطلاق ، آية (٣).[3]

میوانی ئەم چەند لاپەڕەیەشمان ... نموونەی تەواو پشت بەستنە بە پەروەردگاری .. و ڕازی بوونە پێی .. وە نموونەی نیەت پاکی و ئامانجی ڕاستە .. وە چیرۆکی ئەم بەرێزە ئامۆژگاری و پەندە بۆ ئەوانەی گومانی باش نابەن بە پەروەردگاریان ، ( توکل ) یان پێی کەم بووتەو و پەیوەستبوونیان بەڕێکخەری هۆکارەکان لاواز بووە ، چیرۆکی ژیانی ( حودەیر ) بانگیان دەکات پێیان دەڵێت کە خوای گەورە ئەو کەسانە لەیاد ناکات کە پشتیان پێی بەستووە ، مەگەر دەکرێ پەروەردگار کەسانێك لە بیرکات کاریان داوەتە دەستی و یەقینیان پێیەتی ؟! پاك و بێ گەردی بۆ خوای گەورە ...

ئەم چیرۆکە چۆنە ؟

لە ( نافع )ەوە، لە ( ابن عمر ) ەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سوپایەکی بەڕێ کرد پیاوێکیان لەناودا بو بەناوی ( حدیر ) .

وە ئەو ساڵە ساڵی گرانی بوو خۆراك زۆر بەکەمی دەست دەکەوت وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆراکی بەشی هەموویان دا و ( حدیر ) ی لە یادچوو ، بەڵام ( حدیر ) بە ئارامی و ئومێدی پاداشتی خودا لەگەڵ سوپاکەدا بەڕێ کەوت ، و لە دوای هەموویانەوە بوو ، دەیفەرموو : ( لااله الا الله ، و الله اکبر ، و الحمدلله ، و سبحان الله ، و لا حول ولا قـوة الا

---

[1] - بڕوانە : تهذيب مدارج السالكين ی ئیبنو القيم ، شێخ محمد بيومی ص ٢٧٠ .

[2] - بڕوانە : احياء علوم الدين ( ٤ / ٢٦٤ ) .

[3] - واتە : جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت ، ئەو خوایەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت .

بالله ) ئەیفەرموو : ( ئائەمانە باشترین توێشووە ، پەروەردگار ) . و بەردەوام ئەو زیکرانەی دەوتەوە و هەر لە دوای کۆمەڵەکەوە بوو .

دەڵێت : جبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموو : ( إن ربی ارسلنی الیك یخبرك انك زودت اصحابك و نسیت ان تزود حدیراً ، وهو فی آخر الرکب یقول : ( لااله الا الله ، و الله اکبر ، و الحمدلله ، و سبحان الله ، و لا حول ولا قوة الا بالله ) ویقول : ( نعم الزاد هو یارب ) .

جوبرەئیل دەفەرموێت : ( پەروەردگارم ناردومی بۆ لات .. تا پێت بڵێم کە توێشووت بۆ هاوەڵانت ڕێکخستووە و ( حدیر )ت بیرچووە .. کە ئەو لە دوای قافڵەکەیانەوەیە و بەردەوام دەڵێت : ( هیچ خودایەك نیە جگە لە ( الله ) ، ( الله ) لە هەموو شت گەورەترە ، پاك و بێ گەردی بۆخوا ، سوپاس و ستایش بۆ خوا ، وە هیچ گۆڕان و هیچ هێز و توانایەك نیە مەگەر بە ویستی خوا ، دەڵێت : ( ئائەمە باشترین توێشووە ، پەروەردگار ) .

جبریل ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) دەڵێت : ئەو وشانەی کە دەیڵێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە ڕوناکی یەك کە نێوان زەوی و ئاسمان دەگرێتەوە . ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەشی خۆی توێشووی بۆ بنێرە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پیاوێکی بانگ کرد و بڕێك خۆراك و توێشووی دایە ( کە بەشی حدیر بوو ) و فەرمانی پێ کرد کە گەیشتە لای ( حدیر ) و کەل و پەلەکەی دایە گوێی بۆ ڕاگریٚ بزانێ دەڵێت چی و لەبەری بکات و ئەوجا پێی بڵێت : ان رسول الله ( ﷺ ) یقرأ علیك السلام ورحمة الله ، و یخبرك انه کان نسي ان یزودك ، ان ربي تبارك و تعالی ارسل الی جبریل یذکرني بك ، فذکره جبریل و اعلمه مکانك .

فەرمووی بڵێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەلام و ڕحمەتی خوات بۆ دەنێرێت و هەواڵت پێ دەدات کە ئەو لە یادی چوو بوو توێشووت پێ بدات ، وە خوای پەروەردگار جبریل ی ناردە لام تا تۆم وەبیرخاتەوە ، ( جبریل )یش ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) تۆی خستەوە بیرم و جێگاکەتی نیشان دام .

پیاوەکە گەیشتە لای ( حدیر ) : دەبینێ هەر ئەمانە دەڵێتەوە : ( لااله الا الله ، و الله اکبر ، و الحمدلله ، و سبحان الله ، و لا حول ولا قوة الا بالله ) و دەڵێت : ( ئائەمە باشترین توێشووە ، ئەی پەروەردگار ) .

دەڵێـت : ئـەوجا پیاوەکـە لێـی نزیـك بوویـەوە و پێـی وت : پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) سەلام و رەحمەتی خوات بۆ دەنێرێت و منی لەگەڵ برێك توێشووودا ناردووە و پێت دەڵێت : لە راستیدا تۆم لەبیر چوو ، بەڵام خودا جبریل ی لە ئاسمانەوە بۆ ناردم تا تۆم وە بیربخاتەوە ) . پیاوەکە دەڵێت : ( حدیر )یش سوپاس و ستایشی خوای کرد و درود و سەڵاواتی دا لەسەر دیاری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پاشان وتی : ( سوپاس بۆ خوای جیهانیان ، کە منی لەبیرە لە سەرو حەوت ئاسمانەوە لەسەر عەرشی موبارەکی و بەزەیی بەبرسێتی و لاوازیمدا هاتووەتەوە ، ( ئەی خوای پەروەردگار هەروەك چۆن تۆ (حدیر )ت بیر نەچووە ، وا بکە لە ( حدیر )یش تۆ لە بیرنەکات .

پیاوەکـەش ، ئەمانـەی لەبـەر کـرد و گەڕایـەوە بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) و هەموو شتەکانی بۆ گێڕایەوە لەو کاتەوەی کە بە حدیر گەیشت تا ئەوکاتەی خواحافیزی لێ کرد ، پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) فەرمووی : ( اما انك لورفعت راسك الى السماء لرأيت لكلامة ذلك نوراً ساطعاً ما بين السماء و الأرض ) .[1]

· دەفـەرموێت : ئەگـەر سـەرت بـۆ ئاسمـان بـەرز کردبایەتـەوە ، ڕووناکیـەکی پرشنگدارت لە وتەکانیدا بەدی ئەکرد لە نێوان زەوی و ئاسماندا .

---

[1] – ئیبنو الجوزی لە ( صفه الصفوه ) ( ١ / ٣٥٦ ، ٣٧٨ ) باسی کردووە بە بێ ( سند ) ، هەروەها ( ابو نعیم )یش لە ( الحلیه )دا .

# ٣٢ – أبوسەلەمە ( رضي الله عنه )

## (خوایە لە ئەبو سەلەمە خۆشبەو پلەی نێوان ئەوانەی لەسەر ڕێگەی ڕاستن)

ئەو پیاوە بەڕێز و گەورەیە کەناوی ( ابوسلمە )ی کوڕی عبدالاسدی مخزومی یەو برای شیری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و کوڕە پوریەتی ( لە خاتوو برەی کچی عبدالمطلب)ە و یەکێکە لە پێشینە یەکەمینەکان لە ئیسلامدا . کۆچی کردووە بۆ حەبەشەو دواتریش بۆ مەدینە ... لەبەدر دا ئامادە بووە و پاش بەدر بە چەند مانگێك وەفاتی کردووە .[١]

### " ئارمگرتنی لەسەر ئەشکەنجەدانی لە کاتی کۆچکردنیدا "

ابن اسحاق ، لە أم سەلەمەوە ( رضي الله عنها ) تەخریجی کردووە ، دەفەرموێت : کاتێ ئەبوسەلەمە ( رضي الله عنه ) خۆی کۆ کردەوە بەرەو مەدینە بڕوات و کۆچ بکات ، ولاخەکەی بۆ من ڕێکخست و خستمیە سەر پشتی و کوڕەکەشم ( سلمەی کوڕی ئەبو سلمە )ی لەباوەشمدا دانا ، خۆیشی ولاخەکەی بۆ بەرێ دەکردین و لغاوەکەی بە دەستەوە گرتبوو لە پێشمانەوە دەڕۆیشت ... کاتێ پیاوانی ( ابن المغیرە ) بینیان ، هەلسان بۆی و پێیان وت : سەبارەت نەفسی خۆت ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە ، بەلام بۆچی بێلین ئەم ئافرەتە لەگەل خۆتدا بەریت ؟

دەلێت : ئەو جا لغاوی ولاخەکەیان لە دەستی سەند و منیان لێ سەند .. ئەمەش ( بنو عبدالاسد )ی کە خێلی ئەبو سەلەمە بوون تووڕەکرد و وتیان : سوێند بەخوا مادەم ئافرەتەکەی خۆیان بردەوە و لە هاوسەرەکەیان سەندەوە ، ئێمەش نایەلین کوڕەکەمانیان لە لا بمێنێتەوە .

دەلێت : ئەوەبوو بە هەردوو لاوە ( سلمە )ی کوڕمیان ڕائەکێشا هەتا دەستیان لە جێ چاند ، و ئەوجا ( بنو عبدالاسد ) کوڕەکەمیان بردو و ( بنو المغیرة) ش منیان لەلای خۆیان بەند کرد ، ابو سەلەمەی هاوسەریشم بەرەو مەدینە بەڕێ کەوت ..

[١] – بڕوانە : سر اعلام النبلاء ( ١ / ١٥١ ) .

دەڵێت : بەو جۆرە من و کوڕەکەم و هاوسەرەکەمیان لەیەك جیاکردەوە .

دەڵێت : منیش هەموو نیوەڕیەك ئەچوومە دەرەوە و لە ( ابطح ) دائەنیشتم و دەستم بەگریان ئەکرد ، تا نزیکەی ساڵێك ئەمە حاڵم بوو ، تا ئەو کاتەی پیاوێك لە کوڕە مامانم کەیەکێ بوو لە کوڕانی (المغیرة) بەلامدا تێپەڕ بوو ، بەزەیی پێمدا هاتەوە . ڕۆشت بە ( بنی المغیرة )ی وت : بۆ وازئەکەن لەم ئافرەتە هەژارە ، لەبەرچی لە کوڕ و هاوسەرەکەیتان جیا کردوەتەوە ؟ ئەوانیش وتیان پێم : دەی باشە ، ئەگەر ئەتەوێ بڕۆ بۆلای هاوسەرەکەت .

دەڵێت : بەو جۆرە ( بنو عبدالاسد )یش کوڕەکەمیان پێ دامەوە ، دەڵێت : منیش ولاخەکەم ئامادەکرد و کوڕەکەمم هەڵگرت و لەباوەشم ناو بەرەو مەدینە بۆ لای هاوسەرەکەم بەڕێ کەوتم .

دەڵێت : هیچ کەسم لەگەڵ نەبوو تا گەیشتمە ( تنعیم ) [1] لەوێ ( عوسمان کوڕی طه لحەی کوڕی ئەبی طه لحەی برای بنی عبدالدار )* پێ گەشت .

پرسی : بۆ کوێ دەڕۆیت ، کچی ئەبی ئومەیە ؟ وتم : ئەچم بۆ مەدینە بۆ لای هاوسەرەکەم . پرسی : ئەڵێی کەست لەگەڵدا نیە؟ وتم :نەخێر تەنها خودام لەگەڵە و کوڕەکەم .

ئەویش وتی : سوێند بەخوا ! وازت لێ ناهێنم بە تەنها ، ئەوجا لغاوی ولاخەکەی گرت و پێشمکەوت بە خێرایی بەرەو مەدینە ، سوێند بە گەورەیی خوا ! هاوڕێ یەتی هیچ پیاوێکم لە عەرەب نەکرد وە لەم بەڕێزتر . هەرکە ئەگەشتە جێیەك بۆ حەوانەوە ، و ولاخەکەی بۆ ڕائەگرتم و پشتی هەڵ ئەکرد تا لەسەر پشتی ولاخەکە ( حوشترەکە )دا ئەبەزیم و ئینجا ولاخەکەی بەدارێکەوە ئەبەستەوە و بۆخۆیشی لە تەنیشت دارێکەوە ڕائەکشا . ئەو جا کاتی ڕۆیشتن ولاخەکەی بۆ ئامادە ئەکردەوە پشتی هەڵئەکردەوە دەیوت : سەرکەوە پاش ئەوەی سەر ئەکەوتم و لەسەر پشتی ولاخەکەم خۆم ئەگرت ، دووبارە ڕەشوە ولاخەکەی بەدەستەوە ئەگرت و پێشمدەکەوت و بەڕێ ئەکەوت ، هەر بەم جۆرە بووین تا گەیشتینە مەدینە ، کاتێ بەدێی ( بەنی عەمری کوڕی عەوف ) گەیشتین لە ( قباء ) وتی :

---

[1] – دۆڵێکی نزیك مەککەیە .

* ئەوکاتە عوسمان هێشتا باوەڕی نەهێنابوو، لەکاتی هودنەکەی حدیبیەدا موسڵمان بوو لە (أجنادین) شەهیدکرا.

مێردەکەت لەناو ئەم گوندەدایە – ئەوە بوو ئەبو سەلەمە لێرەدابەزیبوو پشت بەخوا برۆ ناو دێیەکەوە ، و خۆی گەڕایەوە بۆ مەککە .

ئوم سەلەمە هەمیشە دەیوت : هیچ ماڵێك لە ماڵەکانی موسڵمانان وەك ماڵی (خێزانی سلمە )یان بەسەر نەهات ، وە هەرگیز هیچ هاوەڵێکم نەدیوە هێندەی عوسمان ی کوڕی تەڵحە ڕێزدار تر و باشتر [1] .

## " خەباتی ابوسەلەمە ( رضي الله عنه ) "

ابو سەلەمە ( رضي الله عنه ) لە جەنگی ئوحوددا بریندار کرا ، یەك مانگ تیماری برینەکەی دەکرد، وە پاش نەکسەکەی ئوحود هەندێ تیرە و هۆز ڕێگەیان بە خۆیان دا بچنە سەر موسڵمانان .

( یەکەمینی ئەوانەی دوای لێ قەومانەکەی ئوحود لە دژی موسڵمانەکان هەڵسان (بنو اسدی کوڕی خزیمە ) بوون ، هەواڵدەرانی مەدینە هەواڵی ئەوەیان دا تەڵحە و سەلەمەی کوڕانی خوەلید [2] ، چوونەتە لای هۆزەکانیان و ئەوانەیان کە گوێڕایەڵی یان دەکردن ، وە داوایان لێ کردوون ( واتە لە بنی اسدی کوڕی خزیمە ) بجەنگن لە دژی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خێرا ( سریە ) یەکی پێك هاتوو لە سەدوپەنجا جەنگاوەری لە پشتیوانان و کۆچکردوان بەسەرکردایەتی ( ابا سەلەمە ) ناردبوویان و لیوایەکی بۆ پێکەوە نان ، ئەبوو سەلەمەش کتوپڕ و بەشەودا پێشدەستی کردو دای بەسەر ( بنی اسد بن خزیمە ) دا لە ماڵەکانیاندا پێش ئەوەی ئەمان هەڵسن بە هێرش کردن بۆ سەر موسڵمانان ، وایان لێ کردن سەریان لێ شێواو موسڵمانانیش چەندین سەر وشتر و ماڵاتیان غەنیمە کرد و بە سەلامەتی و بە دەستی پڕەوە بە بێ ئەوەی ، ڕوو بەڕووبینەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا و جەنگ ڕووبدات ، گەڕانەوە بۆ مەدینە . [3] .

---

[1] – بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٣ / ١٦٩ ) . ئیبنو هشام ( ٢ / ٧٥ / ٧٦ ) لەناوسندەکەیدا ( سەلەمەی کوڕی عبداللە ی کوڕی عمری کوڕی ابی سلمەی تیا بوو کە غەیری ( ئیبنو حیان ) کەس بە بەڵگەداینەناوە حافظ لە ( التقریب ) ( ١ / ٣١٠ ) دەڵێت : مەقبول و وەرگیراوە .

[2] – تەڵحەی کوڕی خوەلید لە ئیسلام پاشگەز بووبوویەوە ن بەلام دواتر موسڵمانا بوویەوە و بووە ئیماندارێکی باش ( رضي الله عنه ) .

[3] – بڕوانە : زاد العاد ( ٢ / ١٠٨ ) .

## " گەیشتن بە لیقای پەروەردگار "

دوای گەڕانـەوەی لـەم ( سـریە )ی باسـمـان کـرد ، ئـەبو سـەلـەمە ( ﷺ ) برینەکـەی کولایەوە و سەری هەڵدایەوە و زۆری نەبرد بە هۆیەوە وەفاتی کرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەر کە زانی ، هات بۆلای .

ئوم سەلەمە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتەلای ابو سەلەمە چاوی کرابوە وە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆی داخست و فەرمووی ( ان الروح اذا قبض تبعه البـــصر ) ... فەرمووی : کاتێ مرۆڤ گیانی دەردەچێت ، چاوەکانی شوێنی دەکەون ، ئینجا کەسانێك لە ئەهلەکەی هاوار و گریانیان دەستپێکرد ، پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) فەرمووی پێیان : ( لاتدعوا علی انفسکم الابخیر ، فأن الملائکه یومنون علی ما تقولون ) واتە : بە چاکە نەبێت ، دوعا لەسەر خۆتان مەکەن ، چونکە فریشتەکان ( ئامین ) دەڵێن بەسەر ئەوەوەکە دەیلێن .

ئەوجا فەرمووی : ( اللهم اغفر لثبو سلمة ، وارفع درجته في المهدين واخلفـه في عقبـه في الغابرين ، واغفر لنا و له يارب العالمين ، و أفسح له في قبره و نور له فيه ) [1] .

واتە : پەروەردگارا لە ئەبی سەلەمە خۆش بەو ، پلەو پایەی لەناو ڕێنموونی کراواندا بەرزکەرەوە و نەوەیەك لە نەمران لە شوێنی دانێ و لە ئێمە و لە ئەویش خۆش بەو گۆڕەکەی بۆ ڕوناك و فراوان کە .

## " ڕێنوێنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەکاتی دابەزینی کارەساتەکاندا "

لە ئوم سەلەمەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( اذا اصابت احدكم مصيبة ، فليقل ، انا لله و انا اليه راجعون ، اللهم عندك احتسب مصيبتي فأجرني فيها ، و ابدلني خيرا منها) . واتە : ئەگەر کەسێکتان کارەساتێکی بۆ هاتە پێش : با بڵێت : ( اناللہ و انا الیه راجعون ) ، ئەی پەروەردگار ناڕەحەتی ئەم کارەساتەم حەواڵەی تۆ ئەکەم ، تکاکارم پاداشتم بدەیتەوە و باشتر لە جێگەیدا دانێیت .

وە کاتێ ابو سەلەمە گیانی دەدا ، ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فێری کردین و تەمەوە ، ویستم بڵێم : وەباشتر لە جێگەیدا دانێیت ) ، بە خۆمم وت : جا کێ لە ئەبو

---

[1] – صحیح / احمد و مسلم و بیهقی ریوایەتیان کردووە ، احکام الجنائز / ئەلبانی ( ١٢ ) .

سەلەمە باشترە ؟ هەروا بیرم دەکردەوە تا لە کۆتایی دا وتم ، ئەوەبوو دوای تەواو بوونی عیددەکەی پێشەوا ئەبو بەکر داخوازی کرد ، ڕەتی کردەوە ، پێشەوا عومەر داخوازی کرد، ئەویشی ڕەت کردەوە ، ئەوجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی نارد بۆ داخوازی کردنی ، ئەویش فەرمووی : سڵاو لە پێغەمبەری خوا(ﷺ ) و لە پەیامنێرەکەشی .[1]

[1] – صحیح / مسلم ڕیوایەتی کردووە ( ٩١٨ ) لە بابی ( الجنائز ) دا .

## ٣٣ – ( سالم ) مەولای ( ابی حذیفە ) ( رضي الله عنه )

### " سوپاس بۆ ئەو خوایەی شێوەی تۆی لەناو نەتەوەکەمدا دروستکردووە "

لە پێشینە یەکەمینە بەدری یەکان و لە نزیکان و زانایانە ، ناو ( سالم ی کوڕی مەعقل )ە ، و لە بنەچەدا لە هۆزی ( اصطخر ) ە . دۆست و هاودەمی ( موطی ) ئەبی حذیفة بوو [1] ، دواتر خاتوو ( بثینە ی کچی یعاری ئەنصاری ) خێزانی ئەبی حذیفة ی کوڕی عوتبە ئازادی کرد و دواتر ئەبو حذیفە کردیە کوڕی خۆی ( تبنی کرد)[2] . ئبن عمر دەڵێت : سالم ئیمامەتی بۆ مسوڵمانان لە مەککە دەکرد ، هەتا هاتە مەدینە ، چونکە لە هەمووان زیاتر قورئان خوێن بووە وە لە قورئان شارەزا بوو (لەناویشیاندا هەر دوو پێشەوا ابوبکر و عمر هەبوون ) [3] .

### " فەزڵو گەورەیی "

١- دایکی ئیمانداران ( عائشە ) ( رضي الله عنها ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەوێکیان پێی فەرمووم : ( ما حبسك ؟ ) بۆچی وا دواکەوتی و درەنگ گەشتی ؟ وتم / لە مزگەوت دەنگێك هات خۆشترین دەنگ بوو بیستبێتم لە قورئان خوێندندا – واتە : گوێم بۆی ڕاگرتبوو – پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) ڕۆیەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە و گوێی بۆ ڕاگرت ، دەبینێ ( سالم ) ی مەولای ئەبی حذیفەیە ، فەرمووی: ( الحمدلله الذي جعل في امتي مثلك )[4] واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی وێنەی کەسێکی وەك تۆی لەناو ئومەتی ئیسلامدا بەدی هێناوە .

٢- لە ( عەمری کوڕی عاص )ەوە ، دەڵێت : هاوار و ترسێك لە مەدینە پەیدا بوو ، هاتم بۆلای ( سالم )ی مەولای ئەبی حذیفە دەبینم خۆی بە شمشێر و بارەکەیەوە

---

[1] – حزیفەی کوڕی عوتبەیە ( رضي الله عنه ) و دواتر باسی ژیانی دێتە پێش .

[2] – بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ١ / ١٦٧ ) ئەمەش پێش دابەزینی ئایەتی ( ادعوهم لابائهم ) (الاحزاب:٥) بوو .

[3] – بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٢٠٢ ) .

[4] – سەنەدەکی ( صحیح )ە / احمد و حاکم ( ٣ / ٢٢٦ ) کردووە . زەهەبیش بە صحیح دایناوە .

دەپێچیتەوە ، منیش شمشێرەکەمم هەڵگرت و بارم پێچایەوە ( بەست ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی بەخەڵکە :

( يا ايها الناس ، الاكان مفزعكم الى الله و الى رسوله ؟ ) قال : ( الا فعلتم كما فعل هذان الرجلان المؤمنان ؟ ) [1] .

فەرمووی : ئەی خەڵکینە ، با ئەو ترس و داچڵەکینەتان بەرەوخوا و پێغەمبەرەکەیتان بەرێت و دواییش فەرمووی : ( بۆ ئێوەش وەك ئەو دوو پیاوە ئیماندارە ناکەن ؟ ) .

" شەهید بوونی "

سالم ( ﷺ ) بە هەموو توانایەکەوە لە پێناوی خوادا جیهادی کرد ... و بە وپەڕی پێداگری یەوە رووبەڕووی دوژمنان دەبوویەوە و هیچ کۆششێکی نەخستە لاوە بۆ سەرخستنی ئیسلام و سەربڵند کردنی ئەهلەکەی ...

پەیوەندیەکی بەتین لە نێوان ئەم و ئەبو حذیفە دا هەبوو ، بە جۆرێك کەسیان نەیئەتوانی لەوی تر دابڕێت ... هەردووکیان تەمەننای ئەوە بوون لەیەك ڕۆژدا بمرن !!

وە لە ڕووداوی ( یمامە ) دا سالم ئە[...]ەی پاڵەوانێتی و جوامێری بوو .. کاتێ موسڵمانان لەو ڕۆژەدا ئاشکرابوون و کەوتنە [...]ناوی دوژمنان ، سالم ( ﷺ ) فەرمووی : لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەی ئێمە ئاوامان دەکرد و بەم جۆرە شەڕمان دەکرد ، و ئینجا چاڵێکی بۆ خۆی هەڵکەند و چووە ناوی و ئاڵای کۆچبەرانی هەڵگرتبوو ، شەڕی دەکرد شەهید بوو .

احمەدی کوڕی عبدالله ، دەڵێت : سالم ( ﷺ ) ئاڵاکەی بە دەستی ڕاستی هەڵگرتبوو تا پەڕاندیان ئەو جا بە دەستی چەپی هەڵی گرت ئەویشیان پەڕاند .

ئەوجا ئاڵاکەی لە ئامێز گرت و ئەم ئایەتەی دەخوێند : ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِيْن مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ ... ﴾ [2] سورة آل عمران ، آية ( ١٤٤ ) . تا شەهید کرا .

---

[1] – هیثمی دەڵێت : احمد ریوایەتی کردووە و پیاوانی ( الصحیح )ن المجمع بە ژمارە ( ٤٢ / ١٥٦ ) .

[2] – واتە : ( ﷺ ) تاکە پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات ، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش وەفاتیان کردووە ، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو ، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟!

ئەبو حذیفە لە تەنیشت ( سالم )ەوە لەو شەڕەدا دەجەنگا ، ئەویش شەهید کرا !! بە یەکەوە وەفاتیان کرد !! ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو : ئەو دوانە بە جۆرێك کەوتبوون ، کە سەری یەکێکیان لەلای لاقەکانی ئەوی تریان بوو( ڕەزای خوایان لێ بێت).[1] و بەو جۆرە ئاواتەکەیان هاتەدی .

[1] – حاکم لە ( المستدرك ) ( ٣ / ٢٢٥ ) دا ریوایەتی‌کردووە .

## ٣٤ - ابو حذیفە ی کوڕی عوتبە ( رضي الله عنه )

## " دڵ و دەروونی پیاوچاکان "

پایەبەرزی گەورە و شەهید ( ابو حذیفە )ی کوڕی شێخی جاهلیەت ( عتبەی کوڕی ربیعە )ی [1] کوڕی عبدشمس ی کوڕی عبدمنافە ، یەکێکە لە پێشینەکان لە ئیسلامدا و پێش چوونە ماڵی ئەرقەم موسڵمان بووە ، و دوو جار کۆچی کردووە بۆ حەبەشە و ئامادەی بەدر و غەزاکانی دوای ئەویش بووە . ئەبو حذیفە ، کەسێکی باڵا بەرزی جوان وچاك بوو ددانەکانی ڕێك و هاوتەریب بوون ، وە ددانێکی زیادەی هەبوو [2] .

### " دڵ و دەروونی پیاوچاکان "

هاوەڵان ڕەزای خوایان لەسەر بێ رخاوەنی ئەوە زیکرێکی نموونەیی بوون لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا . پێغەمبەرەکەیدا ، و هیچ کەسێکیان هێندەی تۆزقاڵێك لە ڕاستەڕێ لایان نەئەدا .. وە مێژوو هەڵوێستێکی ئەبو حذیفە مان بۆ تۆمار دەکات کە تیایدا هەڵەیەکی بچوکی ( هفوة ) کردووە .. کە ساڵەها پێوەی دەتلایەوە لە پەشیمانیدا ، خەم لە چاوەکانی تۆرابوو ، هەرگیز دڵی ئۆقرەی نەگرت تا بە ئاواتەکەی گەیشت و لە پێناوی خوادا شەهید کرا ... داخۆ چی ڕووی دەبوت ؟

لە ابن عەباسەوە ( رضي الله عنه ) : - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی بەدر بە هاوەڵانی فەرموو : ( انی قد عرفت ان رجالا من بنی هاشم و غیرهم ، قد اخرجوا کرها ، لاحاجة لهم بقتالنا ، فمن لقی منکم احداً من بني هاشم فلا یقتله ، و من لقی ابا البحتری بن هاشم بن الحارث بن اسد فلا یقتله ، و من لقی العباس بن عبدالمطلب ، عم رسول الله ﷺ فلا یقتله ، فإنه انما اخرج مستکرها ) [3] .

فەرمووی : زانیومە کە پیاوانێك لە بەنی هاشم و غەیری ئەویش بە زۆر هێنراون بۆ جەنگ و خۆیان نایانەوێ لەگەڵمان بجەنگن ، لەبەر ئەوە هەر کەس لە ئێوە بەیەکێ لە بەنی هاشم گەیشت نەیکوژێت ، وە گەر بە ( ابا البحتري )ی کوڕی هاشم ی کوڕی حارث

---

[1] - بەبێ باوەڕی لە جەنگی بەدردا و لە مەیدانکاری یەکەمدا کوژرا .

[2] - البدایە / ٥ / ٤٧ .

[3] - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمەی پاش کوژرانی (عتبەی کوڕی ربیعە )ی باوکی ابي حذیفە ، فەرموو .

ی کـوڕی اسـد گەشـت بانـەیکوژێت ، وە گـەر بـە عباسـی کـوڕی عبـدالمطلب ، مـامی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت ، نەیکوژێ ، چونکە بە زۆر هێنراوە ..

دەڵێـت : ابـو حذیفـەش وتـی : لەبەرچـی ئـەبێ بـاوك و كـوڕ و بـرا و هۆزەكانمـان بكوژین ، بەلأم واز لە ( عباس ! ) بێنین سوێند بەخوا ئەگەر بینیم ئەبێ بیكوژم .

ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت ، ئەویش بە عومەری كوڕی خەتابی فەرمـوو : ( یا أبا حفص ) عومەر فەرمووی : سوێند بە خـوا یەكەم جار بوو پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) بـە ( ئـەبو حـفص ) بـانگم كـات : فـەرمووی ( ایـضرب وجـه عـم رسـول الله بالـسیف؟ ) ئایـا ئەیانـەوێ بەشمـشێر لـە ڕووی مـامی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـدەن ؟ عومـەریش فـەرمووی :ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ ) ، بێڵـە بـا بـە شمـشێر لـە ملی بـدەم ، سوێند بەخوا بووە بە دووڕووەكان ..

ئەبو حذیفە هەمیشە ئەیوت : ( من هـەرگیز دڵنیا نابم و ئۆقرە ناگرم لەسـەر ئەو قسەیەی ئەو ڕۆژە كردم ، لێی دەترسم مەگەر شەهادەت بێتە كەفارەت و گوناهەكەیم بۆ بسڕێتەوە ، ئەوە بوو ڕۆژی ( یمامە ) شەهید كرا .[1]

هەر چەندە پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) چەند جار دوعـای خێری بۆ كردووە ، دوای ئەو ڕووداوە ، بەلأم ئەوە دڵ و دەرون و ویژدانی خواناسان و ئازادبوانە ، بەڕێزانـ كەچی ئێمـەش لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا دەبیـنین و دەخوێنینـەوە كـە كەسـانێك نكـۆڵی لـە فەرموودەكان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەكەن و دەنگیان بەسەریدا بەرز دەكەنەوە ، بە بێ ترس و بەبێ شەرم ...

پاش تـەواو بوونی جەنگی بەدر ، لاشـەی ( عتبـەی كوڕی ڕەبیعـە ) كێش كـرا تـا بخرێتە بیرێكی وشكبووی ئەوكاتە ئەبو حذیفە لە باوكی دەڕوانـی پێغەمبـەری خوایش ( ﷺ ) سەیری ئەبوو حذیفەی كرد ، دەبینێ كزو پەرێشانە و ڕەنگی گۆڕاوە ! فـەرمووی : ( یا أبا حذیفه ... لعلك قد دخلك من شأن ئةبوك شيء ؟ ) فەرمووی : ئەی ئـەبا حذیفـەی دە لێی شتێك لە دڵتدا دروست بووە ، كەوا كوژراوە ؟

---

[1] – ئیبنو هشام ( ٢ / ٢٣٢ ) لە ڕێگەی ( عباس ی كوڕی عبدالله ی كوڕی معبر )ەوە لـە كەسـانێكەوە لـە ئەهلەكەی لە ( ئیبنو عباس ) ەوە ، توێژەری ( سیرە ئیبنو هشام ) دەڵێت : فەرموودەكە ئەگەرچـی نـاوی لێ نەنراوە لە دانەپاڵەكەیدا ، بەلأم عباسی كوڕی عبدالله ی كوڕی معبـد جێگـەی متمانەیـە وەك چـۆن لـە (التقریب ) ( ٢ / ٢٣٢ ) هاتووە . ( دار الحدیپ ) .

ئەویش فەرمووی : نا بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، گومانم لە باوکم و لە کوشتنیشی نەبووە ، بەڵام باوکم خاوەن دانایی و بۆچوون و چاکە بوو ، منیش بە هیوای ئەوە بووم کە ئەم خەسڵەتانەی وای لێ بکات ڕێنموونی وەرگرێت و ئیسلام بێت ، بەڵام کە بینیم چی بەسەر هات و بەبێ باوەڕی مرد ، پاش ئەوەی من تکام وابوو موسڵمان بێت ، خەفەتم خوارد و پێم ناخۆش بوو ! پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوعای خێری بۆ ئەبی حذیفة کردو و چەند قسەی خێری بۆ کرد .[1]

پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی کرد کە کوژراوانی بێ باوەڕان بخرێنە ناو ( القلیب )[2] . وەکاتێ لێیانی دەڕوانی فڕێ دەدرانە ناو بیرەکەوە دەیفەرموو : ( جزاکم الله شراً من قوم نبـي ، ماکان اسؤا الطرد ، وأشد التکذیب )[3] .

فەرمووی : خوا خۆی تۆڵەتان لێ بکاتەوە بۆ چ قەومێك بوون بۆ پێغەمبەرەکەتان ، بەخراپترین شێوە دەربەدەرتان کرد و بە خراپترین شێوە بە درۆتان دەخستەوە .

ئەبو حذیفە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مایەوە وەك سەربازێکی دڵسۆز بۆ ئاینەکەی و بەوەفاداری بۆ بیروباوەڕەکەی وە لەگەڵ ئەو هەموو قوربانیانەی پێشکەشی دەکرد ... بەڵام چەند وشەیەی لە زار دەرچوو بوو بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی ( بەدر )دا ... هێشتا لە گوێیدا دەزرنگایەوە و لاشەی ئەهێنایە لەرزە و دڵی دادەخورپاند ... و لە ئاکامەکەی زۆر دەترسا .. و باوەڕی وابوو کە تەنها شەهادەت ڕێگای ڕزگاری یە بۆ سڕینەوەی ئەم پێ خلیسکانەی ... پاك و بێگەردی بۆ خوا !!

پەروەردگاری بەخشندە و خاوەن کەرەم ئەو ڕێزە گەورەیەی پێداو شەهادەتی بەنسیب کرد تا بە ئاسودەیی لە دنیا خواحافیزی بکات . لە جەنگی (الیمامە) دا و لە کاتی گەرمەی شەڕکردندا .. ئەبو حذیفە وەك کێو ڕاوەستا و بە شمشێرە تیژەکەی سەربازانی مسیلیمەی لەت و پەت دەکرد .. و وەك مێروو ، لەژێر پێیدا دەرکەوتن و ئەویش بە دەنگێك کە چیاکانی دەهەژاند هاواری دەکرد :( ئەی ئەهلی قورئان ...

[1] – لاوازە : ئیبنو هشام ( ٢ / ٧٥ ) ریوایەتی کردوە وەك بەلاغ .

[2] – القلیب – بیرێکە دواتر پڕ دەکرێتەوە ( الصحاح ) – جوهری .

[3] – ئەحمەد ریوایەتی کردوە ( ٦ / ١٧٠ ) لە ڕێگەی ( ابراهیم النخعی ) وە لە عائشەوە ( ﷺ ) بەرز کراوەتەوە ، ئەلبانی دەڵێت : پیاوانی جێ باوەڕن ، بەڵام لە نێوان ابراهیم و عائشە دا ( قطع )ێك هەیە . لەسەرڕوانی ( فقه السیرە ) ( ٢٤٩ ) .

بەکردەوەکانتان قورئان برازێننەوە ) ... نیشانەکانی سەرکەوتن لەسەر مەیدانی جەنگەکە دەرکەوتن و ئەم پاڵەوانەش بە شەهادەت گەیشت تا بیکاتە داوای لێبوردنێکی ڕەسمی و پێشکەشی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات .. و بە جێگای سەلامەتی و کەناری دڵنیایی بکات .. ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت .

﴿ إِنَّ فِـي ذَٰلِـكَ لَـذِكْرَىٰ لِمَـن كَـانَ لَـهُ قَلْـبٌ أَوْ أَلْقَـى الـسَّمْعَ وَهُـوَ شَـهِيدٌ ﴾ سورة ق ، آيـة (٣٧) . واتە : بەڕاستی ئالەو بەسەرهاتانە دا یادەوەری هەیە بۆ کەسێك دڵێکی زیندووی هەبێت یاخود گوێ بگرێ بۆ قورئان ، لە کاتێکدا ئامادەبێت بۆ فەرمانبەرداری کردنی هەموو کارێکی دروست .

# ٣٥ - ابو سفیانی کوڕی حاریس ( ﷺ )

## " گەورەی لاوانی ئەهلی بەهەشت "

پێناس :

ئەبو سوفیانی کوڕی حارثی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕە مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و برای شیریەتی . خاتوو ( حلیمە ) چەند ڕۆژێك شیری پێ داوە .

هاوتەمەنی پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) و زۆر تێکەڵاویشی بوو ، بەڵام کاتێ پەروەردگار ئاینی ئیسلامی بە پێغەمبەری ئازیزدا نارد ابوسوفیان دژایەتی کرد و لە دژی خۆی و هاوەڵانیش هۆنراوەی دەچڕی ، ئەو کەسێکی شاعیر بوو .

دوژمنایەتی ابوسوفیان مایەوە و لە غەزوەکاندا لە دژی دەجەنگا و بە زمانیش لە کۆڕەکاندا بەد ویژی دەکرد دەرهەقی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ... تا ئەوکاتەی ڕووناکی ئیسلام چووە ناو دڵیەوە و سنگی بۆ ئاینی خوا فراوان بوو ...

### " چیرۆکی موسڵمانبوونی "

ڕووناکی باوەڕ لە دڵی ئەبو سوفیاندا درەوشایەوە ، ئەوکاتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئامادەکردنی موسڵماناندا بوو بۆ ڕزگار کردنی مەککە ... ئەبو سوفیان و جەعفەری کوڕی لە مەککە دەرچوون بۆ مەدینە تا تەسلیمی خوای پەروەردگار بێن .

ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاوی پێی کەوت ڕووی لێ وەرگێڕا ، لەبەر ئەوەی وەك وتمان پێشتر شتانێکی لێ وەشابووە لە ئازاردانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر ئەوە ئەبو سوفیانیش لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لا لایەوە تالێی ڕازی بێت ئەگەرنا ( دەستی کوڕەکەی ئەگرێت و سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەروا تالە برسا و لە تینوا دەمرن ) ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) سۆزی بۆی جولا ، پاشان بوو بە موسڵمانێکی باش ، و لە ڕۆژی ( حنین ) دا لەگەڵ عباس ( ﷺ ) خزمەت پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مانەوە لە کاتێکدا خەڵکانێك هەڵدەهاتن .

## " مانەوە و خۆگری لە ڕۆژی ( حنین ) دا "

لە جابری کوڕی عبدالله وە ، دەڵێت : کاتێ بەرەو ڕووی دۆڵی ( حنین ) ڕۆشتین ، لە یەکێ لە دۆڵەکانی ( تهامە ) دا لێژبووینەوە ، چۆن لێژبوونەوە یەکا دەڵێت :

سەرلە بەیانیدا ، هەوازن و سەقیف پێش ئێمەیان دابوویەوە بۆ ناو دۆڵەکەو لەوێ لەناو باریکەڕێ و کەژ و تەنگەبەرەکاندا بۆسەیان بۆمان دانابووین ، لەوپەڕی ئامادەیی دابوون تا بدەن بەسەرماندا ، سوێند بە خوا هێندەی نەبرد هەموو بەهێزی یەك پیاو بەجارێ دایان بەسەرماندا خەڵکەکە هەموو گەڕانەدواوە و کەس ئاوڕی لە کەس نەدایەوە.

پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) لای ڕاستی گرت و ، فەرمووی : ( أین الناس ؟ هلموا اليَّ ، انا رسول الله ، انا محمد بن عبدالله ) دەیفەرموو : خەڵکەکە چیان لێ هات ؟ بەرەو لای من وەرن ، من پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) من ( محمدی کوڕی عبدالله )م . دەڵێت : هیچ وەڵام نەبوو ، حوشتر بەسەریەکدا کەوتبوون و خەڵکەکەش هەڵهاتبوون ، بەڵام لەوکاتەدا چەند کەسێك لە کۆچکەران و پشتیوانان و ( ئەهل و بەیت ) لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مانەوە .

لە کۆچکەران ئەبوبەکر و عمر ، لە ( اهل بیتی پێغەمبەر ( ﷺ ) ) ی علی کوڕی ئەبو تالیب و عەباس و ئەبو سوفیانی حارث و کوڕەکەی و فضل ی کوڕی عەباس ، و ڕەبیعەی کوڕی حارث و اسامەی کوڕی زەید و ایمن ی کوڕی عبید کە ئەو ڕۆژە شەهید بوون و مابونەوە .[1]

ئەوە بوو ئەبو سوفیان لە دەوروبەری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مابوویەوە و لغاوی و لاخەکەی بۆ گرتبوو .. شەڕیشی دەکرد و نەیدەهێڵا کەس نزیکی بکەوێت ..

کاتێ تەپ و تۆزی شەڕەکە دامرکایەوە و موسڵمانان سەرکەوتن : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئاوڕی دایەوە بۆلای ئەبو سوفیان کە لەو ڕۆژەدا زۆر ئارامگر بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) و موسڵمانێکی زۆر باشی لێ پەیدا بوو بوو ، وە ئەو ڕۆژە پاڵوی هێسترەکەی گرتبوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی ؟ ( ئەمە کێ یە ؟ ) وتی : من ، کوڕی دایکتم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) [2] .

ئەبو سوفیان هەڵوێستی خۆیمان لەو ڕۆژەدا بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت :

---

[1] – احمد لە ( المسند ) ( ٣ / ٣٧٦ ) ریوایەتی کردوە .

[2] – صحیح : ئیبنو هشام ( ٢ / ٧٨ ) .

( ... کاتێ بە دوژمن گەیشتین ڕۆژی ( حنین ) خۆم هەڵدایە سەر ئەسپەکەم و شمشێرە کەشم بە دەستم گرت ، خوا خۆی دەزانێ کە ئامادە بووم و دەمویست لە پێناویدا بمرم واتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش لێمی دەڕوانی ، عباس فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەوە ئەبوسوفیانە ، هەم برات و هەم مامت ، دەڵێی ڕازی بە .

پێغەمبەری ئازیزیش ( ﷺ ) فەرمووی : ( قد فعلت ، فغفر الله له كل عداوة عاديتها ) .

واتە : لێی ڕازی بووم ، وە خوای گەورەش لە هەموو ئەو دوژمنایەتی یەی کە بە منی کرد بوو ، خۆش بوو .. پاشان ئاوڕی لێ دامەوە و فەرمووی : ( اخي لعمري ) [1]

وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زۆر ئەبو سوفیانی خۆش دەویست و شاهیدی چوونە بەهەشتی بۆدا و فەرمووی : ( ارجوان يكون خلفاً من حمزه ) [2] تکام وایە شوێن حەمزە بگرێتەوە .

## " کۆچی دوای و ماڵئاوایی "

ساڵی ( ٢٠ ) ئەبو سوفیان گەڕایەوە پەنای پەروەردگاری ، لە هشامی کوڕی عوروەوە ، لە باوکیەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( ابوسوفيان بن الحارث سيد فتيان اهل الجنة ) فەرمووی : ئەبو سوفیان گەورەی لاوانی ئەهلی بەهەشتە .

ئەوە بوو ئەبو سوفیان بۆ حەج ڕۆیشت و لەوێ سەرتاشەکە سەری بۆ تاشی لەسەریدا بالوکەیەك هەبوو بڕیی ، و وەفاتی کرد ، بۆیە بەشەهید دای ئەنێن . [3]

ئەبو اسحاقی سبیعی دەڵێت : کاتێ ئەبو سوفیانی کوڕی حارثی کوڕی عبدالمطلب لەسەرەمەرگدا بوو ، فەرمووی : مەگرین بەسەرمەوە ، لە ڕاستیدا لەوەتەی موسڵمان بووم هیچ خەتاو هەڵەیەکم نەکردووە . [4] پاش وەفاتی ( ﷺ ) پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب نوێژی لەسەر کرد .

---

[1] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٦٨ ) .

[2] - بڕوانە : ئیبنو سعد ( ٤ / ١ / ٣٦ ) . ئیبنو عبدالبر لە ( الاستجاب ) ١١ / ٢٩١ .

[3] - پیاوانی جێ ی باوەڕن ، بەڵام ( مرسل )ە هەروەك حافظ لە ( الاصابة ) ١١ / ١٩٦ . دەڵێت : حاکم تخریجی کردووە .

[4] - ئیبنو سەعد ریوایەتیکردووە ( ٤ / ١ / ٣٧ ) .

## ٣٦ - عەممارى كوڕى ياسر ( رضي الله عنه )

## " ئەوەى دژايەتى عەممار بكات ، خودا دژايەتى لەگەڵ دەكات "

**عەممار كێ يە ؟**

عەممارى كوڕى ياسرى كوڕى عامرە .. پێشەواى گەورە ( ابو اليقظان عنسى مەككى )يەو يەكێكە لە يەكەمينەكان و پێشينەكان لە ئيسلامدا و لەسەرانى ( بەدرى ) يە ( ئەوانەى لە جەنگى بەدر ئامادەبوون ڕێزێكى تايبەتيان هەيە لەلاى خوا و پێغەمبەرەكەى ( ﷺ ) .

دايكيشى خاتوو سومەيەى كچى خەيباتە و يەكەمين شەهيدە لە ئيسلامدا ... لە (مجاهد )ەوە ، دەڵێت : ( يەكەمين شەهيد لەسەرەتا و بەرايى هاتنى ئيسلامدا بوو ئەويش سومەييەى دايكى عەممار بوو ، ئەبو جەهل بە ڕمێك كە چەقاندى بەناو دڵيدا شەهيدى كرد ) زەهەبى دەڵێت : ئەم فەرموودەيە ( مرسل )ە ( سير اعلام النبلاء ١ / ٤٠٩ ) وە عەممار ( رضي الله عنه ) لە مەككە وەها ئەشكەنجەيان دەدا كە نەيدەزانى چى دەڵێت ، هەروەها ( صهيب )يش وە ئەم ئايەتە لەسەر ئەوان هاتە خوارەوە كە پەروەردگار دەفەرموێ : ( و الذين هاجروا في الله من بعد ما ظلموا ) سورة النحل ، آية ( ٤١ ) . واتە : وە ئەوكەسانەى لەبەر خوا و بۆ خوا كۆچيان كرد دواى ئەوەى كەستەميان لێ كرابوو .

### " فەزڵ و گەورەيى "

١ - لە ( انس )ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) فەرمووى : ( ثلاثة تشتاق اليهم الجنه : علي ، و سلمان و عمار )[1] .

- سێ كەس هەن بەهەشت تامەزرۆى : " علي و سەلمان و عەممار " .

٢ - لە ( علي )يەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : عەممار مۆڵەتى هاتنە ژوورەوەى لە پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) وەرگرت ، فەرمووى ( ﷺ ) : ( من هذا ؟ ) كێيە ؟ وتى : عەممار ، فەرمووى : ( مرحباً بالطيب المطيب ) [1]سڵاو و بە خێرهاتن لە بۆ نخۆشى بۆنخۆشكراو..

[1] - ( حسن )ە / تيرميزى ڕيوايەتى كردوە ، دەڵێت فەرموودەى ( حسن غريب )ە .

٣ – لە ( عەمری کوڕی شرحبیل )ەو ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی (عمار ملئ ایمانا الی مشاشه )[٢] واتە : عەممار هەتا بنج و بنەچەی لێوانە لە باوەڕ .

٤ – لە خالدی کوڕی وەلیدەوە ، دەڵێت : سووکە ناخۆشی یەك لە نێوان من و عەماردا دروست بوو ، بۆیە من کینەم بەرامبەری هەبوو ، ئەویش سکاڵای منی لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرمووی : ( من عادی عماراً عاداه الله ، و من ابغض عماراً ابغضة الله )[٣] . واتە : ئەوەی دوژمنایەتی عەممار بکات ، خوا دوژمنایەتی لەگەڵ دەکات ، ئەوەشی رقی لە عەممار بێت خوای پەروەردگار ڕقی لێی دەبێت .

٥ – لە ( بلالی کوڕی یحیی )وە ، هاتن بۆلای حذیفە لەکاتێکدا لەسەرە مەرگدا بوو پێیان وت : ئەوە ( عوسمان ) شەهید کرا ، چ فەرمانێکمان پێ دەکەیت ؟ ئەویش فەرمووی : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) دەیفەرموو :( أبو اليقظان على الفطرة ) ثلاث مرات ...فەرمووی : ( ابو الیقظان ) لەسەر فیترەت و سروشتی پاکی ئایینە ... سێ جار دووبارەی کردەوە . ( لن يدعها حتى يموت يلبسه الهرم ) وازی لێ ناهێنێت مەگەر بە مردن یان پیری سەری لێ تێك دات[٤] .

## " ئارامگرتنی عەممار لەسەر ئەشکەنجەدانی لە پێناو خوادا "

لە عەمری کوڕی مەیمونەوە ، دەڵێت : بێ باوەڕان بە ئاگر ئەشکەنجەی عەممار یان دەدا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەلایدا تێپەڕ بوو ، دەستی بەسەریدا هێنا و دەیفەرموو : ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلاماً﴾ سورة الانبياء ، آية ( ٦٩ ) ، على عمار كما كنت على ابراهيم ، تقتلك الفئة الباغية )[٥] .

---

[١] – سەنەدەکی بەهێزە ، تیرمیزی ریوایەتیکردووە ( ٣٧٩٩ ) . هەروەها ( حاکم )یش ، وە دەڵێت ( صحیح )ە و زەهەبیش هەمان رای هەیە .

[٢] – پیاوانی جێی متمانەن / نسائی ( ٨ / ١١١ ) شێخی عەدەوی ( تصحیح )ی کردووە .

[٣] – هیثمی دەڵێت :احمد و تەبەرانی ریوایەتیان کردووە ، پیاوانی فەرموودەکە پیاوانی ( الصحیح )ن : المجمع ( ٩ / ٢٩٣ ) .

[٤] – هیثمی لە ( المجمع ) ( ٩ / ٢٨٥ ) دەڵێت : تەبەرانی بە کورتی ریوایەتی کردووە ، پیاوانی فەرموودەکەش جێ باوەڕن .

[٥] – ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٣ / ١ / ١٧٧ ) .

فەرمووی : ئەی ئاگر سارد بەرەوە و سەلامەت بە لەسەر عەممار هەروەك چۆن بویت لەسەر ئیبراهیم ، و فەرمووی : کۆمەڵە تاوانبارەکە دەتکوژێت . وە لە ابن عبیدی کوڕی محمدی کوڕی عمماری کوڕی یاسرەوە ، دەڵێت : بێ باوەڕان عەممارىيان برد و وازیان لێ نەهێنا .

هەتا بە زمانی قسەی بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وت و خواکانی ئەوانی بە چاك ناوبرد ، ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات ، پرسی : ( ماوراءك ؟ ) چ هەواڵێکت لەلایە ؟

وتی : هەواڵی خراپ ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سوێند بەخوا وازیان لێ نەهێنام تا بە خراپ ناوم بردیت و بە چاك ناوی خواکانی ئەوانم برد ، فەرمووی : (کیف تجد قلبك ؟ ) واتە : ئەی دڵت چۆنە ؟ واتە دڵت ڕووی لە کامیانە .

وتی : دڵم بە ئیمانەوە دڵنیایە ، ئەو جا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : (فإن عادوا فعد ) [1] کەواتە ئەگەر گەڕانەوە تۆش بگەڕێرەوە

لە قەتادەوە ، ئایەتی ( الا من اکره ) لەسەر عەممار دابەزیوە [2] . وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەلای خێزانی ( ئەهلی ) عەممار دا تێپەڕ بوو ، لە کاتێکدا لە ژێر ئەشکەنجەدا بوون ، پێیانی فەرموو : ( ابشروا آل عمار فإن موعدکم الجنة ) . ئەی ئەهلی عەممار مو ژدەتان لێ بێت ، بەهەشت چاوەڕێتانە .

## " فیقهی عەممار ( رضي الله عنه ) "

لە طارقی کوڕی شەهابەوە ، دەڵێت : ئەهلی بەصرە غەزوی ( نەهاوەند )یان کرد، و ئەهلی کوفەیش کە عەممار– ئەمیریان بوو – هاوکاری یان کردن، و بەسەرکەوتن کۆتایی هات ، بەڵام ئەهلی بەصرە ویستیان هیچ شتێ لە غەنیمە نەدەن بە ئەهلی کوفە ، و پیاوێکی تەمیمی بە عەمماری وت : ئەی گوێ بڕاو ! ئەتەوێ ببیتە هاوبەش لە غەنیمەتەکانماندا ؟ عەممارىش ( رضي الله عنه ) فەرمووی : بەڕاستی جنێوت بە گوێچەکە باشەکەم دا ، ئەو گوێچکەیەم کە هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەجەنگام پێکرا . دەڵێت :

---

[1] – ئیبنو سعد و حاکم ریوایەتی کردووە ، دەڵێت : ( صحیح )ە زەهەبیش لەسەرهەمان ڕایە .

[2] حافظ لە ( الاصابة )دا و لە باسی ژیانی ( عەممار ) وا دەڵێت : ڕای کۆمەڵی زانایان وایە کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەو دابەزیوە .

ئەوجا سەبارەت بە بابەتەکە پەیامێکی نارد بۆ عمر ( ﷛ ) عومەریش ( ﷛ ) : نوسیی غەنیمە بۆ ئەوانەن کە بەشداری یان لە جەنگەکەدا کردووە.[1]

## " جیهادی عەممار ( ﷛ ) "

لە ( ابن عمر )ەوە ، عەممارم ڕۆژی یەمامە لەسەر بەردێك بینی ، هاواری ئەکرد : ئەی میللەتی ئیسلام ، مەگەر لە بەهەشت هەڵدێن ؟ من عەمماری کوڕی یاسرم ، بەرەو لای من بێن ! ابن عمر ، دەڵێت : منیش سەیری گوێچکەیم دەکرد کە قرتابوو ، دەلەریەوە ،لە کاتێکدا خۆیشی بەپەڕی توانایەوە شەڕی ئەکرد .

## " عەممار ( ﷛ ) لەگەڵ مرۆڤ و جنیشدا دەجەنگێت "

لە عەممارەوە ، دەڵێت : شانبەشانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ جنۆکە و مرۆڤیشدا شەڕم کردووە ، وتیان : چۆن ؟ فەرمووی : لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووین لە جێیەك دابەزین ، کوندە و سەتڵەکەمم هەڵگرت تا پڕیان بکەم لە ئاو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی وتم : ( اما انه سيأتيك على الماء آت يمنعك منه ) واتە : کەسێك دێتە سەر ئاوەکە و ڕێگریت دەکات لەوەی ئاوی لێ بەریت .

دەڵێت : کە گەیشتمە سەر بیرەکە ، دەبینم پیاوێکی ڕەش وەك ئەوەی خراپەی کردبێتە پیشە لەوێیە ، وتی : سوێند بەخوا ئەمبو ئەمرۆ ئاوی لێ بەریت ، و دەستی دا یە ئێخەم و منیش دەستم دایە یەخەی کەوتینە شەڕ کردن تا بەردێکم هەڵگرت و دام بە دەم و چاویدا و دەم و لوتیم شکاند و سەتڵەکەمم پڕ کرد لە ئاو و هاتمەوە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرمووی : ( هل اتاك على الماء احد ؟ ) کەس لەسەر ئاوەکە هاتە لات ؟ وتم : بەڵێ ، و چیرۆکەکەم بۆ باس کرد ، ئەویش فەرمووی : ( اتدري من هو ؟ ) قلت : لا ، قال : ( ذالك الشيطان )[2] فەرمووی : ئەزانی ئەوە کێ بوو ؟ وتم / نەخێر ، فەرمووی : ئەوە شەیتان بوو .

---

[1] – شێخ شوعەیب ئەرنۆوط دەفەرمێ اسنادەکەی ( صحيح )ە ، ( ١١ / ٩٧ / ١٠٠ ) .

[2] – ئیبنو سعد ڕیوایەتیکردووە ( ٣ / ١ / ١٧٩ ) پیاوانی فەرموودەکە جێ متمانەن ، تەنها ڕاڤەیەکی ( الحسن )ی تیایە بڕوانە ( الفتح ) ( ٧ / ٩٢ ) و پەراوێزی سير أعلام النبلاء ١ / ٤١٢ .

## " شەهید بوونی ( رضي الله عنه ) "

عەممار ( رضي الله عنه ) لە ( صفین ) دا بەشداری کرد شانبەشانی پێشەوا ( علی کوڕی ئەبو تالیب ) ( رضي الله عنه ) و شەهید کرا .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵی کوژرانی پێ دابوو .

لە عەممارەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی وت : ( وتقتلك الفئة الباغية ) [1] واتە : کۆمەلە و دەستە تاوانبارەکە دەتکوژن .

پێشەوا زەهەبی دەربارەی ئەوەی لە نێوان ( علی ) و ( معاویە ) دا لە حنین ڕووی دا ، دەڵێت : ( ... ئێمە ئەوەمان لەسەرە لێیان گەڕێین و داوای لێخۆشبوون بۆ هاوەڵان بکەین ، و حەزمان بەوە نەبێ کە لە نێوانیاندا ڕووی دا ، وە پەنابەخودا بگرین لێ ی ، و فەمانبەرداری ئەمیری ئیمارنداران ( علی ) بین .. [2] وە عەممار هەستی بە نزیك بوونەوەی ئەجەلی کرد بوو ڕەزای خوای لێ بێت .

لە ( ئەبو البختری )یەوە ، دەڵێت : ڕۆژی صفین عەممار وتی : چۆڕێ شیرم بۆ بێنن ، دەڵێت : ئەوجا لێ خواردەوە و فەرموی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێ ی وتم : ( إن آخر شر به تشربها من الدنیا شربة لبن ) [3] ، دوایەمین خواردنەوەیەك لە دنیا بیخۆیت بڕێك شیرە ، ئەوجا چوو بۆ شەڕ و شەهید کرا ..

کێ کوشتی ؟ وتراوە پیاوێك بەناوی ( ابو الغادیە ) کوشتویەتی ، شیرێکی لە ئەژنۆی داوە خستویەتی و کوشتویەتی ، وتراویشە غەیری ئەو کوشتویەتی ، خوایش باشتر دەزانێت . عەمری کوڕی عاص دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( ان قاتله و سالبه في النار ) [4] ، واتە : بکوژ و ڕوتکەرەوەکەشی ( ئەوەی کەل و پەلەکەی بردووە) لە ئاگردان .. دەسا ڕەزای خوا لەسەر عەممار بێت ( رضي الله عنه ) ..

---

[1] – ابو یعلی ریوایەتی کردوە هیثمی دەڵێت : اسنادەکەی ( حسن )ە المجمع ( ٩ / ٢٩٥ ) .

[2] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٣٩ ) .

[3] – احمد ریوایەتیکردووە ( ٤ / ٣١٩ ) هەروەها حاکم ( ٣ / ٣٨٩ ) .

[4] – اسنادەکەی ( حسن )ە ، احمد ریوایەتی کردووە ( ٤ / ١٩٨ ) .

## ٣٧ - سهلمانی فارسی ( رضي الله عنه )

## " ڕۆڵهی ئیسلام "

**کێ یه ؟**

الحافظ ئهبوالقاسم ابن عساکر ، دهڵێت : سهلمانی کوڕی ئیسلام ، ئهبو عبدالله ی فارسی یه ، پێشبڕکێی لهگهڵ سواردا دهکرد بۆ گهیشتن به ئیسلام ، هاوهڵایهتی پێغهمبهری خوای ( ﷺ ) کرد و خزمهتی کردوو فهرمایشتی لێ گێراوهتهوه . کهسێکی ژیر و هۆشیار بوو ، له پیاوه خاوهن هۆش و خواپهرست و خانهدانهکان بووه .

## " فهزڵو گهورهیی "

١ - له ئهبو هریرهوه ( رضي الله عنه ) ، دهڵێت : لهگهڵ پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) دانیشتبووین سوورهتی ( الجمعة ) ی بۆ دابهزی : ( و آخرين منهم لما يلحقوا بهم ) [١] ، دهڵێت : پرسیم کێن ئهوانه ئهی پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) ؟

سهلمانی فارسی دانیشتبوو، پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) دهستی خستهسهر سهلمان و فهرمووی : ( لو كان الايمان عند الثريا لناله رجال اورجل ، من هؤلاء ) [٢] واته : ئهگهر باوهڕهێنان لهلای گهلاوێژ بوایه ، پیاوانێك ، یان پیاوێك لهمانه به دهستی ئههێناو خۆی پێ ئهگهیاند .

٢ - له کثیری کوڕی عبدالله ی موزهننی یهوه ، له باوکیهوه ئهمیش له باپیریهوه دهگێڕێتهوه ، پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) هێڵی کهندنی ( خهندهق )ی کێشاو بۆ ههر ده پیاو چل باڵی دانا ههڵیبکهنن ، کۆچبهران و پشتیوانان بووه مشت و مڕیان لهسهر سهلمان که پیاوێکی بههێز بوو ، کۆچکهران ئهیان وت : سهلمان له ئێمه یه ، پشتیوانانیش ئهیانوت: نهخێر ، سهلمان له ئێمهیه ، پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) فهرمووی : ( سلمان منا اهل البيت ) [٣] ، بهڵکو سهلمان له ئێمهیه – له ( اهل البيت )ه ..

---

[١] – واته:له ئاییندهدا خهڵکی تریش دێن و ( موسڵمانان دهبن لهگهڵ و میللهتان )پهیوهست دهبن بهمانهوه.

[٢] – صحيح / بوخاری و مسلم ریوایهتیان کردووه .

[٣] – بڕوانه : صفة الصفوة ( ١ / ٢٧٥ ) .

## " چیرۆکی موسڵمان بوونی "

لە ئیبنو عباسەوە ، دەڵێت : سەلمانی فارسی قسەی بۆ کردم ، وتی : من کەسێکی فارسی بووم لە ئەهلی ( اصفهان ) ، خەڵکی گوندێك بووم بەناوی ( جَيّ ) [1] کە باوکم کوێخاکەی بوو ، وە من خۆشەویسترین کەسی باوکم بووم . ئەوەندە خۆشمی دەویست زۆرجار هەروەك کەنیزەك لەماڵەوە دەیبەستمەوە ، لە ئاینی ئاگر پەرەستیدا – مجوسیە – دا تەقەلام دا تا بوومە هاونشینی ئەو ئاگرەی ( قاطن النار ) کە باوکم هەلیدەگیرساند و نەیدەهێشت بۆ کاتژمێرێك بکوژێتەوە .

باوکم زەوی و زارێکی گەورەی هەبوو .. ڕۆژێکیان بە هۆی دروست کردنی خانوویەکەوە سەرقاڵ بوو ، پیێ ی وتم : کوڕم ! ئەوە من ئەمڕۆ بەهۆی سەرقاڵیەوە بەبیناکردنەوە لە زەوی یەکەم دابڕاوم تۆ بڕۆ چاوێکت لێی بێت و چەند فەرمانێکی تریشی دابەسەرمدا ...

منیش چوومە دەرەوە ، پاشان باوکم پێ وتم : خۆتم لێ ون نەکەی ، چونکە تۆ زۆر لە زەوی یەکە بۆ من گرنگ تریت ، ئەگەر خۆت ون کەیت ئەوا بەخۆتەوە سەرقاڵم ئەکەیت و هەموو شتێکم بیر دەچێت .

منیش چوومە دەرەوە بە نیازی ڕۆشتن بۆ سەر زەوی یەکەی لە ڕێگا بەلای یەکێ لە کەنیسە ( کڵێسا ) کانی گاورەکاندا تێپەڕ بووم گوێم لە دەنگی یان بوو ، دوعایان دەکرد ، منیش نەمدەزانی کاری ئەمانە چ پەیوەنیدەکی بە بەند کردنی منەوە هەیە لەلایەن باوکمەوە لەماڵەوە .

ئەوە بوو کە تێپەڕیم بەلایاندا و گوێم لە دەنگیان بوو ، چوومە ژورەوە بۆ لایان تا بزانم خەریکی چین ، کە بینیمن سەرم سوڕما لە نوێژەکەیان و موعجبی بووم و حەزم لە کارەکەیان کرد ، وتم : سوێند بەخوا : ئەمە باشترە لەو ئایینەی وا ئێمە لەسەری دەڕۆین ، سوێند بە خوا بە جێم نەهێشتن تا خۆرئاوا بوو ، وازم لە زەوی باوکم هێنا و نەچوومە سەری ، بەوانەی ناو کڵێسەکەم وت : بنچینەی ئەم ئاینە لە کوێ یە ؟

وتیان : لە شامە ..

دەڵێت : ئەو جا گەڕامەوە بۆ لای باوکم کە ناردبووی بەدوامدا و بە بۆنەی گەڕان بە دوای منا هەمو کارەکانی خۆی واز لێ هێنا بوو ،بەمنەوە سەرقاڵ بوو بوو .

---

[1] – شارۆچکەیە کە لە اسفهان ی کۆن ، معجم البلدان ( ٢ / ٢٠٢ ) .

کاتێ هاتم بۆ لای پێی وتم : ئەی کوڕم ! لە کوێ بوویت ؟ باشە من پێم نەوتی واو وا بکە ؟

وتم / بابەگیان ! ڕاستی یەکەی ئەوە بوو بەلای خەڵکانێکدا تێنەپەڕیم لە کڵێسا نوێژ و دوعایان دەخوێند ، منیش موعجیبی کار و ئاینەکەیان بووم و سوێند بە خوا لەلایان مامەوە تا خۆر ئاوا بوون .

باوکم وتی : کوڕم ئەو ئاینەی ئەوان خێری تیانی یە ، بەڵکو ئاینی خۆت و باوباپیرانت باشترە لەوە . وتم : نا بە خوا ! بەڵکو ئەوە لە ئاینەکەی ئێمە باشترە .

دەڵێت : ئەو جا باوکم ترسا و بەقەیدێك قاچی بەستمەوە و لە ماڵەوە بەندی کردم ، دەڵێت : پەیامێکم نارد بۆ گاورەکان و وتم ئەگەر قافڵەیەکی بازرگانی لە شامەوە هات بۆ لاتان لە بازرگانانی گاور ، هەواڵم پێ بدەن . ئەوە بوو قافڵیەك لە شامەوە هاتە لایان ، و ئەوانیش هەواڵیان پێ دام ..

وتی : ئەگەر کارەکانیان تەواو بوو ، ویستیان بگەڕێنەوە پێم بڵێن ، دەڵێت : ئەواینش وایان کرد . منیش قەیدە ئاسنەکەم هەرچۆنێك بوو لە قاچم کردەوە و لەگەڵیان چووم تا گەیشتمە شام .

کە گەیشتمە شام ، وتم : کێ باشترین کەسە لەناو ئەم ئاینەدا ؟ وتیان : وا عیز و ئەسقەف ناو کڵێسا باشترین پیاوی ئەم ئاینەیە منیش هاتم بۆلای : پێم وت : من ڕەغبەت و ویستی ئەم ئاینەم کرد و حەزم کرد لەگەڵ تۆدام بم و لەناو کلێسادا خزمەتت بکەم و شتیشت لێ فێربم ، و نوێژت لەگەڵ بکەم .

دەڵێت : هاتە ژوورەوە و منیش لەگەڵیدا هاتمە ژوورەوە و مامەوە ، بۆم دەرکەوت پیاو خراپێکە فەرمان بە خەڵکی ئەکات کە ماڵ و سامان ببەخشن و هانیان دەدات بە (صدقە ) و هەرکە خەڵکەکە پارەیان کۆکردەوە بۆ بەخشینی ، ئەم لەلای خۆی هەڵیدەگرێت و هیچی لێ نەدەدا بە هەژاران تاوای لێ هات حەوت دەخیلە ، زێڕ و پارەیەکی زۆری کۆ کردەوە ، منیش لەبەر ئەوە زۆر زۆر ڕقم لێ هەڵسا . پاشان مرد ، گاورەکان کۆ بوونەوە کە بە خاکی بسپێرن ، پێم وتن : ئەم پیاوە کەسێکی خراپە ، فەرمانی بە ئێوە ئەکرد کە ببەخشن و هانی ئەدان ، کە بۆتان ئەمێنا ، هەڵی ئەگرت بۆ خۆی و هیچی لێ نەئەدا بە هەژاران و ئەوجا شوێنی گەنجینەکانم نیشاندان کە حەوت گۆزەی پڕی تیا بوو ، ئەوانیش کە دیتیان ، وتیان : سوێند بە خوا نەبو هەرگیز بیسپێرین ، ئەوە بوو لە خاچیان دا و بەرد بارانیان کرد .

ئەوجا پیاوێکیان لە جێی دانا ، پیاوی وا باشم نەدیبوو کەسێکی زاهد بوو لە دنیا و ڕووی لە قیامەتی بوو ، هەر زۆر بەرێز بوو ، شەو و ڕۆژ خەریکی خواپەرستی بوو ، شتانێکی فێر کردم کە تا ئەو کاتە باشترین و خۆشەویسترین شت بوو لە دڵما لەلای مامەوە تا وەفاتی کرد ، لەسەرەمەرگدا پێم وت : ئەی فلان کەس ! وا دەبینی کە خوا حافیزی ئەکەیت دەزانی کە سوێند بە خوا کەسم هێندەی تۆ خۆشنەویستووە ، پێم بڵێ چی بکەم و بۆلای کێ بڕۆم دوای خۆت ؟

پێی وتم : کوڕم سوێند بەخوا ئەوەندە ئەزانم پیاوێك لە موصل هەیە ، بڕۆ بۆلای ، دەبینیت هەروەك من دەبێت .

دوای مردنی ، ڕۆشتم بۆ موصل : ی چوومە لای هاوەڵەکەی دەبینم هەروەك ئەوە لە کۆشش و دونیا نەویستیدا . پێم وت : فلان کەس منی بە تۆ سپاردووە کە بێمە لات و لەگەڵت بم ، پێی وت : دەهەڵسە ، کوڕم و لەلام بمێنەرەوە ، منیش لەلای مامەوە تا ئەویش مەرگی هاتەپێشەوە . پێم وت : فلان منی بە تۆ سپارد ، تۆش وا خەریکی کۆچ دەکەیت ، بەکێم دەسپێری ؟ و چی فەرمانێکم پێ دەکەیت ؟ وتی : سوێند بەخوا هەر ئەوەندە ئەزانم پیاوێك لەفلانە جێ هەیە بڕۆ بۆلای .

ئەوە بوو دوای سپاردنی ، چووم بۆ لای ئەو پیاوە و لەلای مامەوە کە هەروەك ئەوان بوو ، تا ئەویش کەوتە سەرەمەرگی و وەسیەتی بۆ کردم بچم بۆ لای پیاوێك لە ئەهلی ( عموریە ) لە ( ڕۆم ) منیش هاتم بۆ لای ، ئەویش هەروەك ئەوان بوو ، لەو نێوانەدا من بووم بە خاوەنی چەند سەر مانگا و ماڵات بەکاسبی کردن .

ئەویش کەوتە سەرەمەرگ ... و قسەم لەگەڵ کرد دەربارەی ئەوەی دوای ئەو بۆ کوێ بڕۆم و ڕوو لە کێ بکەم ؟

وتی : کوڕم ! سوێند بەخوا ئەوەندەی من دەزانم کەس نەماوەلەسەر ئەو ڕێ یە بڕوات کە ئێمەی لەسەر ڕۆیشتین تا فەرمانت پێ بکەم بچیتە لای ، بەڵام ڕۆژانێك نزیکن کە پێغەمبەرێك دێت لە ( حەرەم ) وە و دەربەدەر دەکرێ بۆزەوی یەکی شۆرەکاتی پڕ لە دارخورما ، و چەند نیشانەیەکی پێوەیە کە ناشار درێتەوە ، لە نێوان هەردووشانیشیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە ، دیاری وەردەگرێت و بەخشش ( صدقة ) ڕەت دەکاتەوە و وەری ناگرێت ، ئەگەر توانیت خۆت بگەیەنیتە ئە و وڵاتانە ئەوە ئەو کارە بکە ، چونکە زەمانی هاتنی نزیکی بۆتەوە .

ئەوە بوو پاش ئەوەی ئەمیشیان سپاردە کرد ، مامەوە تا پیاوانێك لە بازرگانە عەرەبەکان لە ( کلب ) بەلامدا تێپەڕین ، پێم وت : لەگەڵ خۆتان هەڵمگرن بۆ ولاتی عەرەبی بەرامبەر ئەو موڵك و چەندسەر مانگایە کە هەمە .

وتیان باشە ..

ماڵ و مانگاکانم پێدان ، ئەوانیش لەگەڵ خۆیان هەڵیانگرتم ، هەتا گەیاندمیانە (وادی القری ) لەوێدا ستەمیان لێ کردم و وەك کۆیلەیەك فرۆشتمیان بە پیاوێکی جولەکە، کە لە ( وادی القری ) بوو .

سوێند بەخوا ، چاوم بە دارخورما کەوت و تەماعم ئەوە بوو کە ئێرە ئەو جێگایە بێت کە هاوەڵەکەم بۆی وەسف کرد بووم . سوێند بەخوا بۆم یەکلا نەبوویەوە هەتا پیاوێك لە ( بني قريظة ) هات بۆ ( وادی القری ) و کابرای جولەکە منی پێ فرۆشتەوە ، ئەویش منی لەگەڵ خۆی برد تا هاتینە ( مەدینە ) .

سوێند بە گەورەیی خوا هەرکە دیتم و چاوم بە مەدینە کەوت ، زانیم کە ئەو جێگایەیە من بۆی دەگەڕێم .

ئیتر بە کۆیلەیەتی مامەوە ، لەو نێوانەدا خوای گەورە پەیامی خۆی نارد بە پێغەمبەرەکەیدا ﷺ لە مەککە و بەهۆی ئەو حاڵ و کۆیلەیەتی یەی منی تیا بوو ، کەس هیچی پێ نەوتبووم لەوبارەیەوە ، هەتا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتە ( قُباء ) ، کاتێ من خەریك بووم لە باخێکی دارخورما دا کارم دەکرد بۆ خاوەنەکەم . وەڵڵاهی من خەریکی کاری خۆم بووم تا کوڕەمامێکی هات و وتی : ئەی فلان کەس ! خوا ( بني قيلة )[1] لەنێو ببات، سوێند بە خوا ئەوان ئێستا لە ( قُباء ) کۆ بوونەتەوە لەگەڵ پیاوێك لە مەککە ، کە ئەڵێن گوایە پێغەمبەرە .

سەلمان وتی : سوێند بەخوا هەر ئەوەندەی گوێم لەم قسانە بوو ، هەموو گیانم کەوتە لەرزین بە جۆرێك وتم ئێستا ئەکەوم بەسەر خاوەنەکەمدا .

خێرا دابەزیم و وتم ئەم هەواڵە چی بوو ؟

گەورەکەیشم دەستی بەرز کردەوە زللەیەکی توندی لێ دام و وتی : تۆ چیتە بەم قسانەوە ، بڕۆ خەریکی کاری خۆت بە .

[1] هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج .

منیش وتم : هیچ .. تەنها هەواڵێکم بیست و حەزم کرد بزانم چی یە . کاتێ شەو داهات ، بڕێك خۆراکم پێ بوو ، هەڵمگرت و ڕۆشتم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ ( قُباء ) ، پێم وت / پێیان وتووم کە تۆ پیاوێکی چاکسازیت و چەند هاوەڵێکی غەریبت لەگەڵدایە ، وە منیش بڕێك ( بەخشش – صدقە ) م پێ بوو ، بە خۆمم وت کە ئێوە لە هەموو کەسێك ی ئەم وڵاتە زیاتر لەسەر هەقن ، وە شایستەن بەم ( صدقە ) یە ، فەرموو ، لێی بخۆ . دەڵێت پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پارێزی کرد و لێی نەخوارد و بەهاوەڵەکانی فەرموو : ( کلوا ) بیخۆن .

منیش بەخۆمم وت : ئەمە یەکێکە لەو سیفاتانەی کە هاوەڵەکەم پێی وتم .

پاشان گەڕامەوە ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) هاتبوو بۆ مەدینە ، بڕێك کەل و پەلم کۆ کردەوە لەلای خۆمەوە و هێنام بۆی و وتم : دەبینم لە ( صدقە ) ناخۆیت ، بەڵام ئەمە دیاری یە .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەری گرت و لێی خوارد و هاوەڵانیش لێیان خوارد ، وتم : ئەمەش سیفاتێکی ترە کە بۆم باسکرا ..

پاشان هاتمەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە بە شوێن جەنازەیەکەوە بو لەناو هاوەڵانیدا ، گەڕامە دواوە و چوومە پشتەوە سەیری بکەم بزانم ئەو مۆرەی کە بۆم وەسف کرا بوو بە پشتیەوە هەیە یان نا .

ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) منی بینی واچوومەتە دوایەوە ،زانی کە ئەمەوێ لە شتێك دڵنیابم کە پێشتر بۆم وەسف کراوە ، بۆیە عاباکەی لادا لەسەر پشتی ، کە مۆرەکەم بینی و ناسیمەوە خێرا باوەشم پیا کرد و بە دەم گریانەوە ماچم دەکرد .

پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) پێی وتم : ( تحول ) واتە : وەرە بەم لاوە منیش هاتمە ئەملاوە و چیرۆکەی خۆمم بۆ باس کرد هەروەك ئێستا بۆ تۆی باس ئەکەم ئەی (ابن عباس ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) حەزی کرد هاوەڵانیشی گوێیان لە چیرۆکەکەم بێت.

پاشان سەلمان بە کۆیلەیەتی مایەوە تا بەو هۆیەوە نەیتوانی لە بە درو ئوحود ئامادە بێت ، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) .

پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( کاتب یا سلمان ) واتە : خۆت بکڕەوە ، ئەی سەلمان .. منیش لەگەڵ خاوەنەکەم ڕێك کەوتین کەسێ سەدبن دارخورمای بۆ بڕوێنم ( بەنەمام ) لەگەڵ ( چل ) ئۆقیەدا ئەویش من ئازاد بکات ..

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە هاوەڵانی فەرموو : ( هاوکاریی براکەتان بکەن ) . ئەوانیش بەدارخورما هاوکاری یان کردم هەبوو بە سی نەمام و هەبووبە بیست ، هەبوو بە پازدە ، هەتا سیٚ سەد نەمامم کۆ کردەوە .

ئەو جا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( اذهب یا سلمان ففقر لها ، فاذا فرغت فائتنی اکون انا اضعها بیدی ) فەرمووی : برۆ زەویەکەیان بۆ هەڵکەنە و چاکی بکە ، کە لێی بویتەوە وە رەپێم بڵیٚ من بە دەستی خۆم نەمامەکانی تیٚ دەخەم . منیش جێگای نەمامەکانم هەڵکەند بەهاوکاری هاوەڵانم ، و کە لێبومەوە هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پێم وت کە تەواو بووین ، ئەویش لەگەڵم هات ، ئێمەش شەتل و نەمامەکانمان بۆ نزیك دەکردەوە و ئەویش دەیخستە ناو چاڵەکەوە ، سوێند بەو زاتەی نەفسی سەلمانی بەدەستە یەك دانە لەو شەتڵانە نەمرد و وشك نەبوو ، بەو جۆرە دارخورماکەم لە کۆڵ بوویەوە و ئەدام کردمایەوە پارەکە ئەدا بکەم .

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە قەبارەی هێلکەی مریشکێك زێری هێنا کە لە چەند غەزایەکدا دەستی موسڵمانان کەوتبوو ، فەرمووی : ( ما فعل لفارسي المكاتب ؟ ) برا فارسی یە ( مکاتب )ەکەمان چی کرد ؟و منیان بانگ کردە لای ، فەرمووی : ( خذها فادبها ما علیك ) .

ئەمە بەرەو بیدە بە گەورەکەت و ئەوەی لەسەر تەبیدە . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمە بەش دەکات ؟ فەرمووی : ( خذها فإن الله سيؤدي بها عنك ) بیبە ، بیٚ گومان خوای تەعالا بۆت ئەدا ئەکات .. منیش بردم و کێشی چل ئۆقیەم بۆ کێشانە کردن و هەقی خۆیانم داپێیان و ئازاد بووم ، ئەو جا بە ئازادی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا لە جەنگی ( خندق ) بەشداریم کرد و پاش ئەویش لە هیچ غەزایەکی تر دوانەکەوتم)[1] .

## " زانستی سلمان ( ﷺ ) "

لە چیرۆکی موسڵمان بونیەوە ، بە ئاشکرا زانستی بەرفراوانی سەلمانمان بۆ دەردەکەوێت .وە لە ( ئەبو البختری )یەوە ، دەڵێت : بە ( علی ) یان وت ( ﷺ ) باسی هاوەڵانی ﷺ مان بۆ بکە ، فەرمووی : پرسیار لە کامیان دەکەن ؟

[1] – پیاوانی جێی متمانەن : سەنەدەکی بەهێزە : احمد و غەیری ئەویش گێراویانەتەوە ( سیر ١ / ٥١١ )

وتیان : لە عبدالله کوڕی مسعود ، فەرموی : زانستی قورئان و سوننەتی وەرگرت و ئیتر ئەو دوانەی بە کفایەت زانی وەك زانست وەری بگرێت .

وتیان : عمار ؟ فەرمووی : ئیماندارێکە شتی لە یاد دەچێت ، خۆ ئەگەر بیرت خستەوە ، ئەوە بیری دەکەوێتەوە ، وتیان : ابوذر ؟ فەرمووی : زانستێکی وای پێ بوو ، پێی ڕانەئەگەشت . وتیان : ابوموسی ؟ فەرمووی : جێ دەستێکی لەناو زانستدا داناو دواتر لێی هاتە دەرەوە .

وتیان : حذیفة ؟ فەرمووی : لە هەموو هاوەڵانی ﷺ زیاتر شارەزا و ئاگاداری دووڕووەکانە . وتیان : سەلمان ؟ فەرمووی : زانستی یەکەم و زانستی کۆتایشی بە دەست هێنا ، دەریایەکی بێ نیە و لە ئێمەیشە لە ( ئەهل و بەیت ) [1]

وە لە ( عونی کوڕی ابی حجیفە ) وە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلمان و ئەبو الدرداءی کردە برا ، ئەوەبوو سەلمان سەردانی ئەبادەردئی کرد ، ئوم دەردائی بینی کە هیچ خۆی نەڕازاندبووە [2] . پێی وت : چیتە ؟

ئوم دەردەاء ، وتی : ئەبو دەردائی برات پشتی لەدنیا کردووە ، ئەوە بوو ئەبو دەرداء هات و خۆراکێکی بۆ ئامادە کرد ، پێی وت : بخۆ ، من : بەڕۆژووم .

ئەویش وتی : منیش ناخۆم هەتا تۆ نەخۆیت ، دەڵێت : ئەوجا ئەبو دەردا خواردی . پاشان کە شەوداهات ئەبو دەرداء هەر خەریکی خواپەرستی و شەو نوێژ بوو . سەلمان پێی وت : بنوو ، ئەوجا نوست ، پاشان هەڵسایەوە و دەستی کردەوە بە شەونوێژ پێی وتەوە بخەوە .

وە کاتێ کۆتایی شەوهات سەلمان فەرمووی : ئێستا هەڵسە ، و دەستیان کردبە نوێژ کردن ... سەلمان وتی : بەڕاستی خوای پەروەردگار مافێکی بەسەرتەوە هەیە ، هەروەك نەفسی خۆێشت مافی بەسەرتەوە هەیە و ئەهلەکەشت مافیان بەسەرتەوە هەیە ، لەبەر ئەوە هەرکەسەو مافی خۆی پێ بدە .

ئەو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆی گێڕایەوە کە چی پێ وتووە ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) فەرمووی : ( صدق سلمان ) [1] سەلمان ڕاست دەڵێت .

---

[1] – پیاوانی جێ باوەڕن : ( النسوی ) ریوایەتی کردووە بۆی لە ( المعرفە و التاریخ ) ( ٢ / ٥٤٠ ) هەروەها تەبەرانی و غەیری ئەوانیش .

[2] – واتە گوێی بە خۆی نەئەدا وەك ئافرەت .

## " پێشەوای لەخۆ بوردوو "

پیاوچاکان هەمیشە ئیمارەت و پێشەوایەتی یان بە ئەرکێکی گران داناوە نەوەك بە شەرەفمەندی و فەخر ، بۆیە جوانترین نموونەیان لە زوهدو لە خۆبوردەی و دادپەروەری و لە خواترسان نیشان دا .

لە ( عبیدەی سەلمانی )یەوە رەحمەتی خوای لێ بێت : سەلمان بۆ غەزا وەك پێشەوای سوپا بەرەو ( حجر المدائن )چووە دەرەوە لە دوای پیاوێکەوە بوو لە هۆزی ( کندة ) بەسەر پشتی هێسترێکەوە . هاولاتیان پێیان وت : لیواکەمان پێ بدە ئەی ئەمیر با ئێمە هەڵیگرین ، ڕازی نەبوو هەتا لە غەزا کەبوونەوە و هەر لە دوای کابراوە بوو . [2]

لە ( الحسن )ەوە : - بەشی سەلمان تەنها پێنج هەزار بوو لە کاتێکدا ئەمیر و پێشەوای سی هەزار کەس بوو وە بە عەبایەکەوە وتاری بۆدەدان کە نیوەی لەبەردا بو ، لەسەر نیوەکەی تریشی دادەنیشت . و هەرکات برە موچەکەی وەردەگرت تەواوی ئەکرد و بە ئارەقەی ناوچەوانی خۆی پارەی پەیدا دەکرد .

## " پەرستشی "

لە ( طارق ی کوڕی شهاب ) ەوە ، لە سەلمانەوە ، دەڵێت : کە شەو دادێت خەڵك لە سێ پلەو مەنزڵدان : هەیە شەو بۆ ئەوە ، هەیە شەو دژی ئەوە ، هەیشە نەبۆ ئەوە و نەدژی ئەویشە !!

وتم : جا ئەمە چۆنە ؟ فەرمووی : سەبارەت بەوەی کە شەوگار خێرو چاکەی بۆ ئەوە ، کەسێکەغەفڵەت و بێ ئاگایی خەڵك بەهەل دەزانێ لەگەڵ تاریکی شەودا و دەستنوێژ هەڵدەگرێ و نوێژدەکات ، ئەمە شەوگار لە بەرژەوەندی ئەودایە . ئەو پیاوەش کە غەفڵەت و بێ ئاگایی خەڵك وتاریکی شەو بەهەل دەزانێ و هەڵدەسێ سەرپێچی خوا دەکات ، ئەوە شەوگار لە دژی ئەوە نەك لەبەرژەوەندی ئەو . ئەو کەسەیش کە شەوتابەیانی دەخەوێت ، شەوگار نەبۆ ئەوە و نەدژی ئەوە .

---

[1] - صحیح : بوخاری ( ١٩٦٨ ٩ ) ترمذی ( ٢٤١٥ ) .

[2] - پیاوانی جێ متمانەن : ارنؤط ( سیر ١ / ٥٤٥ ، ٥٤٦ ) .

طارق وتی : شەرت بێ هاوەڵایەتی ئەم پیاوە بکەم ، ئەوە بوو شاندێك بەرێ خرا بۆ کارێك ، سەلمانیشیان لەناودا بوو ، منیش لەگەڵی چووم ، بە هیچ شێوەیەك بارم لەو قورس تر نەبوو ئەگەر من هەویرم بشێلایە ، ئەو نانەکەی دەکرد ، وە ئەگەر من نانم بکردایە ، ئەو چێشتی لێ دەنا ، لە جێیەك دابەزیین بۆ حەوانەوە ، ئەوە بوو طارق سەعاتێکی لەشەودا هەبوو کە تیایدا هەڵدەسا بۆ خواپەرستی ، دەڵێت: کەلەو سەعاتەدا هەڵدەسام دەبینم نوستووە، بەخۆم وت:- هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە من باشترە و نووستووە ، دەنووستم ، پاشان هەڵدەسامەوە دەبینم نوستوە ، دەخەوتمەوە ، بەلأم کاتێ شەو خۆی بۆ حەوانەوە ئامادە دەکرد ، لەسەر جێگاکەی دەیفەرموو : ﴿ سبحان الله ، و الحمد لله ، و لااله الا الله ، و الله اکبر ، لااله الا الله و حده لا شريك له ، له الملك و له الحمد ، و هو على كل شيء قدير ﴾و لە نزیك نوێژی بەیانی یەوە هەڵدەساو دەستنوێژی دەشت و چوار رکعات نوێژی دەکرد . ئەوە بوو دوای ئەوەی نوێژی بەیانیمان کرد ، وتم : ئەی (باوکی عبدالله ! ) سەعاتێکم بەشەودا هەبوو کە زیندووم دەکردەوە ، تیایدا هەڵدەسام ، بەلأم تۆم بە خەوتوویی بەدی ئەکرد ؟ فەرمووی : برازا !گوێت لێم بوو چیم دەوت ؟ منیش وتم بەڵێ گوێم لێبوو ، فەرمووی : برازاکەم ئەوە نوێژە ، بەراستی پێنج فەرزەی نوێژەکان ئەبنە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانی نێوانیان ، ئەگەر گوناهی گەورەی ئەنجام نەدا بێت . برازاکەم نیەتت حسنەبو بۆ دەکرێت نەك شتی تر [1] .

## " وەفاتی "

پاش گەشتێکی سەخت و دژوار کە سەلمان ( رضي الله عنه ) بەسەری برد لە پێناو گەڕان بەدوای هەقدا تا پێی خستە سەر ڕێگای ڕاست و لە سەری جێگیر بوو .. مەرگی هاتە پێش .

(( سەعدی کوڕی ئەبو وقاص و ئیبنو مسعود لەسەرەمەرگدا چوونەلای سەلمان . دەستی بەگریان کرد . پرسیاری لێ کرا : چی دەتگریەنێت ؟ فەرمووی : بۆ پەیمانێك دەگریم کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لێمانی وەرگرتووە و نەمانپاراستبێ .

[1] – عبدالرزاق ( ١٤٨ ) دەری هێناوە . وە طبراني ( ٦٠٥١ ) هەیثەمی دەڵێت : پیاوانی جێ باوەڕن .

فەرمووی : با سەروەت و سامانتان لە دنیادا هێندەی توێشووی ڕێبوارێك بێت .. وەتۆ ئەی سەعد لە حوکمداریتدا ئەگەر گرتە دەست ، لە خوابترسە وە لە سوێن خواردنتدا و ئەگەر بووت ، لە خوابترسە ) [1]

لە هاوسەری سەلمانەوە ، وتویەتی : سەلمان لەسەرە مەرگدا ، بانگی کردم ، ئەو لە ژوورێك دابوو چواردەرگای لەسەر بوو ، فەرمووی : دەرگاكان بکەرەوە ، چونکە ئەمڕۆ چەند میوانێکم هەیە نازانم لەکام لەم دەرگایانەوە دێنە ژوورەوە [2] ئەو جا داوای ( میسك )ی کرد ، فەرمووی : برێکی لێ بکەبە دەورو بەری جێگاکەمدا ، سەیرم کرد ، دەبینم گیانی دەرچووە، و وەك ئەوەی لەسەر جێگاکەی نووستبێ وەهادەر دەکەوت . [3]

## " تەمەنی سەلمان ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد "

وتراوە کە : سەلمان ( ٣٥٠ ) ساڵ ژیاوە ، سەبارەت بە ( ٢٥٠ ) ساڵی ئەو گومانیان لێ نیە !! نووسەر دەڵێت : بەڕاستی ئەمە جێی گومانو پرسیارە، ڕاستیش ئەوەیە کە زەهەبی ( ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ ) وتویەتی : ( لەوانەیە حەفتاو ئەوەندە ساڵ ژیا بێ .. وانازام گەشتبێتە سەد ساڵ هەر کەسیش شتێك لەم بارەیەوە دەزانێ .. با بە ئێمەشی بگەیەنێت .. وە لە کتێبێ (( تاریخ الکبیر ))دا نوسیومە کە ( ٢٥٠ ) ساڵ ژیاوە، وە من ئەم سەعاتە لەسەر ئەو ڕایە نیم و بەڕاستی دانانێم ) [4] . وە سەلمان ( رضي الله عنه ) لەسەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا (عوسمان ) دا وەفاتی کردووە .

---

[1] - صحیح : ئیبنو ماجە ( ٤١٠٤ ) ثابت دەڵێت : پێم گەیشتووە کە کاتێ مردووە تەنها بیت و ئەوەندە دەرهەمی هەبووە .

[2] - مەبەستی فریشتەکانە .

[3] - ابو نعیم دەری هێناوە لە ( الحلیە ) دا ( ١ / ٢٠٨ ) .

[4] - بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٥٥٦ ) .

## ٣٨ - عبدالله ذوالجبادين (رضي الله عنه)[١]

## "(نەخێر ئەو زۆر تەوبەکارە )!! "

لەم چەند لاپەڕەیەدا بە یەکێك لەوانە دەگەین کە فەرموودەکەی ( پێغەمبەری خوا ﷺ ) گرتونیتیەوە ، کە دەفەرموێت :

﴿ ان الله يحب الابرار الاتقياء الاخفياء الذين ان غابوا لم يفتقدوا ، و ان حضروا لم يعرفوا ، قلوبهم مصبابيح الهدى يخرجون من كل غبراء مظلمة ﴾[٢]

پێغەمبەری خوا دەربارەی چەند هاوەڵێك کە ( عبدالله ) یەکێك بوو لەناویاندا فەرمووی : خوای پەروەردگار کەسی چاکەکاری لە خواترسی شاراوە و نادیاری خۆشدەوێ ، ئەوانەی کە ئەگەر دیارنەمان وون بوون کەس بیریان ناکان ، و ئەگەر ئامادە بوون کەس نایانناسێت ، دڵەکانیان چرای ڕووناکی یەو لەسەر هەموو خاکێکی تار دەڕوێن و سەرهەڵدەدەن .

محمەدی کوڕی سعد دەڵێت : ذوالجبادين ، هەتیوێکی نەدار بوو باوکی مرد و هیچی بۆبەجێ نەهێشت ، مامی بووە کەفیلی بەخێوکردنی تاوەکو بڕێك حاڵی باش بوو ، کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتە مەدینە ، ذوالجبادين دەروونی تامەزۆری ئیسلام بوو ، لەبەر مامیشی نەیدەوێرا باسی بکات هەتا ساڵان و چەند غەزایەك تێپەڕین .

ئەوجا بە مامی وت : مامەگیان ، من دەمێکە چاوەڕێم بەڵکو موسڵمان بیت ، بەڵام وادیارە تۆ ( محمد )ت ناوێت ، دەی مۆڵەتی من بدە با موسڵمان بم ، مامی وتی : سوێند بەخوا ئەگەر شوێن ( محمد ) بکەویت هەرچییەك پێمداویت لێت ئەسەنمەوە ، هەتا جلەکانیشت . ئەویش وتی : دەی سوێند بە خوا من شوێنی (محمد ) کەوتووم و وازم لە بت پەرستی هێناوە ، ئەمەش لە دەستمدایە هانیٚ بیبە ، ئەویش هەموو شتەکانی لیٚ سەندەوە و جلەکانیشی لەبەریدا داماڵی ..

---

[١] – (بجاد) جل و بەرگێکی ئەستوری زبرە .

[٢] – ئیبنو ماجە و حاکم ڕیوایەتیان کردووە و حاکم دەڵێ: (صحیح)ە و هیچ شتێکی تێدا نیە. (الترغیب بە ژمارە(٤٧).

ئەویش هات بۆلای دایکی ، ( پارچە بجاد )ێکی بەدوو بەش بۆ بڕی یەکێکیانی کردە شەڕواڵ ( واتە نێوانی ناوك و ئەژنۆی پێ داپۆشی ) و ئەوی تریشیانی دا بەسەرشان و ملیدا ، و پاشان هات بۆ مەدینە ، لە ( بورقان ) [1] دەمەوبەیان لە مزگەوت ڕاکشا ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) بەیانیان لە خەڵکی ورد دەبوویەوە و تەماشای دەکرد ( ئەمەش تا بزانی غەریب و کەسی نەناسراو دەرنەکەوتووە ) ، دەبینیت ( عبداللە ) لەوێیە، پرسی : من انت ؟ تۆ کێیت ؟ ئەویش ناوی خۆی پێ وت و پێی وت : کە موسڵمانە ، وە ئەو ناوی ( عبدالعزی ) بوو [2] .

پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) پێ فەرموو :

(( تۆ عبداللە ی خاوەنی دوو بجاد )ی )) پاشان فەرمووی : (( انزل مني قريباً )) لە نزیك منەوە مەنزڵ بکە و بمێنەرەوە . ئەوە بوو زۆر لەگەڵیدا لە میوانیەکانیدا دەمایەوە ، هەتاوای لێ هات قورئانێکی زۆری دەخوێندو لەبەر کرد [3] .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە عقبەی کوڕی عامرەوە ( ﷺ ): پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە پیاوێك کە بە (ذوالجبادين ) ناودەبرا ، فەرموو : ( انه اواه ) لەبەر ئەوەی بەبەسەر کردنەوەی قورئان زۆریادی خوای دەکرد و لە دوعا کردندا دەنگی بەرزدەکردەوە [4] .

٢- لە ( الادرع )ەوە ، دەڵێت : پاسەوانیم بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەکرد ، شەوێك بۆ کارێکی خۆی چووە دەرەوە ، منی بینی و دەستی گرتم ، و ڕۆشتین لە ڕێگا بە پیاوێك گەیشتین نوێژی ئەکرد و بەدەنگی بەرز قورئانی ئەخوێند ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وت : ( عسى ان يكون مرائياً ) ئەشێ ڕیاباز بێت .

دەڵێت : منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، نوێژ دەکات و دەنگی بۆ قورئانخوێندن بەرز دەکاتەوە ؟ دەڵێت : پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) دەستی بەردام و پاشان فەرمووی : ( انكم لن تنالو هذا الامر بالمغالبة ) ئێوە ئەم ئاینە بە بەسەر یەکتر بوندا (زاڵ

---

[1] - کێوێکە لەلای ڕاستی ڕێگەی تێپەڕ بووە لە مەدینەوە بۆ مەککە .

[2] - ئیبنو الجوزی دەڵێت : ناوی عبداللە ی کوڕی عبدنهم ی کوڕی عفیفە . صفه الصفوه ( ١ / ٣٤٤ ) .

[3] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣٤٤ ) .

[4] - سەنەدەکی ( حسن )ە ، احمد و تەبەرانی المجمع بە ژمارە ( ١٥٩٨١ ) .

بوندا ) بە دەست ناهێنن . پاشان شەوێکی تر چووە دەرەوە و منیش پاسەوانیم دەکرد ، دەستی گرتم و بەلای پیاوێکدا تێپەڕین نوێژی ئەکرد و دەنگی بۆ قورئانخوێندن بەرز کردبووە ، وتم : دڵی ئەچێ کەسێکی ڕیاباز بێت ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) فەرمووی : ( کلا انە اواب ) . نەخێر بەڵکو ئەو کەسێکە زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری و داوای لێخۆش بونی لێ دەکات ز سەیرم کرد دەبینم ( عبداللە ی ذوالبجادین ) ە [1]

## " کۆتایی یەکی کامەران "

ذوالبجادین ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) بەرێ کەوت و بۆ غەزای (تبوك) و لەوێ وەفاتی کرد .. ابن مسعود چیرۆکی وەفاتیمان بۆ دەگێڕێتەوە بەم شێوەیە " (ناوەڕاستی شەو هەڵسام ، کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە (تەبوك) بووین ، لەلای سەربازگەکەوە مەشخەڵێکم چاو پێکەوت بەداگیرساوی، لە شوێنی چووم ، دەبینم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و ابوبكر و عمر(ﷺ) لەوێن و عبداللە ذوالبجادین وەفاتی کردووە ، و خەریکن گۆڕی بۆ هەڵدەکەنن و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەناو گۆڕەکەیدا یە و ئەبوبەکر و عومەریش ( ﷺ ) دەیدەنە دەستی ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەڵێت : ( أدنیا الی اخاکم ) براکەتانم لێ نزیك کەنەوە ئەوانیش نزیکیان کردەوە بۆی ، کاتێ ئامادەی کرد لە جێی خۆی داینا فەرمووی : ( اللهم اني قد امسیت راضیا عنه ، فارض عنه ) ئەی پەروەردگار ، من لێی ڕازیم ، دەسا تۆش لێی ڕازی بە ) . ابن مسعود ، دەڵێت : خۆزگە خاوەنی ئەو گۆڕە من بوومایە ) [2] تاوەکو دوعاکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بیگرتایەتەوە .

---

[1] - هیثمی دەڵێت : احمد گێڕاویەتیەوە . پیاوانی فەرموودەکە ئەوانەی الصحیح )ن المجمع بە ژمارە (١٥٩٨٢) .

[2] - الحافظ ئیبنو حجر لە ( الاصابە ) ( ٤ / ٩٩ ) باسی کردووە و دەڵێت ( النبوی ) بەدرێژی ڕیوایەتی کردووە ، پیاوانی فەرموودەکەش جێ متمانەن ، بەڵام ( لێکبڕان ) لە نێوانیاندا هەیە .

# ٣٩ - زەیدی كوڕی حارثە ( رضي الله عنه )

## " پێشەوای شەهید "

كێیە ؟ زەیـدی كـوڕی حارثـەی كـوڕی شـراحیل ... ئـەمیری شـەهیدی نەبـەوی ناوهێنراو لە سوورەتی ( الاحزاب )، ئەبو ئوسامەی محمدیی ، گەورەی خزمەتكاران (موالی ) و یەكەمینیانە لە ئیسلامدا ، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و باوكی خۆشەویستە كە شیەتی ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كە سێ چاك و باش نەبووبێ خۆشی نەویستووە ، وە خوای پەروەدگاریش لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هیچ كام لە هاوەڵانی نەهێناوە جگە لە زەیدی كوڕی حارثە .

ئەوەبوو حەكیمی كوڕی حزام لە شامەوە زەیدی كوڕی حارثە ی وەك خزمەتكار (كۆیلە ) هێنا ، خاتوو خدیجەی پوری داوای لێ كرد پێشكەشی بكات . ئەویش پێشكەشی كرد ، ئەوكاتە خاتوو خدیجە خێزانی پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) ، زەیدی كوڕی حارثە ی پێشكەشی پێغەمبەری خوا كرد( ﷺ ) ئەمیش ئازادی كرد و كردی بەكوڕی خۆی ، ئەمەش پێش ئەوەی سروشی بۆ دابەزێت ( ﷺ ) ...

ئەوجا باوكی زەید هات داوای زەیدی كرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەزەیدی فەرموو : ( إن شئت فأقم معی ، و إن شئت فانطلق مع ئەبوك ؟ ) فەرمووی : ئەگەر ئەتەوێ لەلام بمێنەرەوە ، ئەگەر ئەشتەوێ ، لەگەڵ باوكت برۆ ؟ زەید فەرمووی : نا ، نا ، بەڵكو لەلای تۆ ئەمێنمەوە ، ئەوە بو لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مایەوە تا پەیامی ئیسلامی بۆ هاتە خوارەوە پەروەردگار بە پەیامبەری خۆی هەڵبژارد ، زەیدیش باوەڕی پێ هێنا و ئیسلامی كردە ئاین و لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژی دەكرد ، كاتێكیش ئایەتی (ادعوهم لابائهم ) [١] " الاحزاب : ٥ " . هاتە خوارەوە . زەید فەرمووی : من ( زەیدی كوڕی حارثە ) م . [٢]

---

[١] – واتە : ئەو كوڕانە بەناو باوكی خۆیانەوە ناوبەرن و بانگیان بكەن .

[٢] – اسنادەكەی ( حسن )ە ، گبرانی ریوایەتی كردوە . المجمع بە ژمارە ( ١٥٥٠٧ ) ئەوە بوو زەیدیان بە ( زەیدی كوڕی محمد ) بانگ دەكرد .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١- لە ( سالم )ەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : هەمیشە ( زەید ) مان بە ( زەیدی کوڕی محمد ) بانگ دەکرد ، تا ئایەتی ( ادعوهم لابائهم هو اقسط عندالله ) " الاحزاب : ٥ ) دابەزی [١] .

٢- لە ( سلمەی کوڕی الاکوع )ەوە ، دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) و لەگەڵ زەیدی کوڕی حارثە دا چووم بۆ غەزا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیکردە ئەمیرمان [٢] .

٣- لە محمدی کوڕی اسامەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە زەیدی کوڕی حارثە ی فەرموو ( یا زید ! انت مولای ، ومنی و الی و احب القوم الی ) [٣] . ئەی زەیدی ، تۆ دۆستی منی ، لە منیت و بۆ منیت وە خۆشەویسترین کەسی لەلام .

## " سەرەتای ئیسلامەتی "

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت / لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژێکی گەرمی ڕۆژەکانی مەککەدا چوینە دەرەوە بۆ ناو کەعبەوە . مەڕێکمان بۆ سەربری و پێمان گەیاند ، لەوێ بە زەیدی عەمری کوڕی نفیل گەیشتین ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی / ( یا زید [٤] ! ما لی اری قومك قد شنفوا لك ؟ ) ئەی زەید ! چیە وا هۆزەکەت ڕقیان لێت هەڵگرتووە ؟

وتی : سوێند بەخوا ئەی محمد ، لەبەر هیچ شتێك نی یە تەنها لەبەر ئەوەیە کە من هاتووم بەدوای ئەم ئاینەدا وێڵم ( واتە : بەدوای ئاینی هەق دا ) هەتا هاتمە لای پیاوە ئاینی یەکانی ( فدك ) ئەبینم خوا پەرستی ئەکەن و هاوەلیشی بۆ دا ئەنێن ، هاتم بۆ لای پیاوانی ئایینی ( شام ) دیسان هەروا بوون . وتم : ئەمە ئەو ئایینە نیە کەمن بەدوا یا ئەگەڕێم .

شێخێك لەناویاندا پێی وتم : تۆ هەواڵی ئاینێك ئەپرسیت کە کەس خواپەرستی لەسەر ناکات شێخێك نەبێ لە ( الحیره ) . منیش هاتم بۆ لای ، کاتێ منی بینی ، وتی: لە کێیت ؟ وتم / لە ئەهلی مالی خوام ( واتە مەککە ) .

---

[١] - صحیح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

[٢] - صحیح / بوخاری مسلم ریوایەتیان کردوە .

[٣] - فەرموودەی ( حسن ) ە / حاتم گێڕایەوە تیەوە ( ٣ / ٢١٧ ) و دەبێت : ( صحیح ) ، زەهەبیش هەمان ڕای هەیە ، وە ( الحافظ ) لە ( الاصابە ) دا بە ( حسن ) دایناوە .

[٤] - زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نفیل ی مەبەستە .

وتی : ئەوەی تۆ داوای ئەکەیت ، لەو ولاتەکەی خۆتدا دەرکەوتووە ، لە ڕاستیدا پێغەمبەرێك نێرراوە کەوا ئەستێرەی دەرکەوتنی دەدرەوشێتەوە ، جگە لەو ، هەموو ئەوانەی تۆ بینیتن لەناو گومڕایی دا بوون . دەڵێت / ئەو کاتە هەستم بە هیچ نەکرد . دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خواردنەکەی لێ نزیك کردەوە ، وتی : ئەمە چی یە ئەی محمد ؟

فەرمووی : مەڕێکە و بۆ ( قوربانی ) سەرمان بڕیوە . وتی : من شتێك ناخۆم ناوی خوای لەسەر نەنرئەبوت . ئەو جا لە زەیدی کوڕی عەمری کوڕ نفیل جیابووینەوە و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆ ماڵی خوا و بەدەوریدا تەوافی کرد ، منیشی لەگەڵ بووم ، هەروەها بەلای ( صەفا و مروە ) دا سوراینەوە کە دووبتیان لە تەنیشتدا بوو لە مس دروست کرابوون ! ناویان ( إساف و نائلە ) بوو .

بێ باوەڕان کاتی تەواف ( مەسح ) یان لەسەر دەکردن . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( لا تمسحهما فانهما رجس ) مەسحیان نەکەیت ( دەستیان پێدانەهێنیت ) ، چونکە ئەوانە پیسن . بە خۆمم وت : دەستیان لێ دەدەم ، تا بزانم پێغەمبەری خوا (ﷺ) چیم پێ دەڵێت ، ئەوە بوو دەستم لێدان ، فەرمووی ( یا زید ! الم تنه ) ئەی زەید مەگەر ڕێگریت لێ نەکرا دەستیان لێ نەدەیت؟

دەڵێت ئەوجا زەیدی کوڕی عەمر وەفاتی کرد و دوای ئەوە پەیامی ئیسلام بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دابەزی .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( انه یبعث امة وحده ) [1] واتە : زەیدی کوڕی عەمر بە تەنها خۆی وەك ئوممەتێك زیندوو دەکرێتەوە لە قیامەتدا .

## " خۆشەویستی زەید ( ﷺ ) بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ( ئەبو عەمری شەیبانی ) یەوە ، دەڵێت : جلەی کوڕی حارثە هەواڵی پێدام وتی : هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێم وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! زەیدی برامم لەگەڵ بنێرە . فەرمووی ( هوذا ، فإن انطلق ، لم امنعه ) ئەوەتانێ ، ئەگەر لەگەڵت هات ، من ڕێگری لێ ناکەم . زەید فەرمووی : نابە خوا! کەسی کە بەسەر تۆدا هەڵنابژێرم . جبلە دەڵێت : بۆم دەرکەوت ڕای براکەم لە ڕای من باشترە [2] .

---

[1] – حاکم ریوایەتیکردووە ( ٣ / ١٦ ، ٢١٧ ) و دەڵێت : ( صحیح ) ە ، زەهەبیش هەمان ڕای هەیە و فەرموودەکە ( صحیح )ە .

[2] – حاکم دەری هێناوە ( ٣ / ٢١٤ ) و دەڵێت : ئسنادەکەی ( صحیح ) ە . زەهەبیش هەمان ڕای هەیە .

## " هاوسەرێتی لەگەڵ خاتوو زەینەب "

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زەینبی کچی جحش ( ﵁ ) ی هێنا بۆ زەید ، ئەوە بوو ناتەبایی یەکی زۆر لە نێوانیاندا ڕووی دا و ژیانیان سەقامگیر نەبوو ، .. وە زۆر جار زەید ( ﵁ ) سکاڵای زەینەبی دەبر دەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ...ئەوە بوو کاتێ ئیسلام نەریتی ( تبنی ) پوچەڵ کردەوە .. خوای پەروەدگار فەرمانی دابە سەر پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) کە مۆڵەتی زەید بدات ( زەینەب ) تەڵاق بدات ، بە پێچەوانەی خواستی پێغەمبەری ئازیز ( ﷺ ) خۆیەوە . پاشان بە فەرمانی خوای گەورە پێغەمبەری خوا ( ﷺ) زەینەبی مارەکرد .. خێرا دوڕووەکان دەستیان بە ورتە ورت کرد کە وا پێغەمبەر ( ﷺ ) خێزانی کوڕەکەی خۆی مارە کردووە . تا پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ ... ﴾ سورە الاحزاب ( ٤٠ ) . واتە : محمد هەرگیز باوکی هیچ پیاوێك نەبووە لە ئێوە . و فەرمووی : ( ادعوهم لابائهم ) الاحزاب : ٥) ئیتر دوای ئەوە بە ( زەیدی کوڕی حارثە ) بانگ دەکرا .[1]

## " خەباتی زەید ( ﵁ ) "

ئەهلی سیرە دەڵێت : زەید لە بەدر و ئوحود و خەندەق و حدیبیە و خەیبەریشدا ئامادە بوو ، وە کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆی چووە بۆ ( مریسیع ) زەیدی کردووە بە جێنشینی خۆی لە مەدینە هەروەها لە حەوت ( سریەدا ) وەك پێشەوا چووەتەوە دەرەوە ، هەروەها هیچ کام لە هاوەڵان لە قورئاندا ناوی نەهێنراوە جگە لە ( زەید ) . و لە جەنگی ( مؤتە ) دا شەهید بوو وەك لە ژیانی ( جعفری کوڕی ئەبو تالیب )دا باسمان کرد. دوای ئەوەی هەواڵی شەهید بوونی زەید و هاوەڵەکانی گەیشت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ) چوو بۆ ماڵیان لەوێ کچەکەی زەید کە چاوی بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەوت ، دایە پرمەی گریان .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دیتنی کچەکەی زەید ( ﵁) ئەوەندەگریا هەنسکی گریانی بەرزبووە وە ، پێیان وت : چیتە ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بۆچی وادەگرییت فەرمووی : (( شوق الحبیب الی الحبیب))[2] تاسەی خۆشەویستێکە بۆ خۆشەویستەکەی .

---

[1] – ئیبنو الحجر لە ( الاصابە ) باسی کردووە . لە باسی ژیانی ( زینب ) دا باسی چیرۆکی کە بە درێژی دەکەین و ڕونی وتەی دوڕوان دەدەنیەوە .

[2] – بڕوانە : ئیبنو سعد ( ٣ / ١ / ٣٢ ) پیاوانی جێ متمانەن ،بەڵام بچڕ بچڕ هاتووە (سیر١/٢٣٠).

## " دیدارێکی شایستە "

لە ( ابن بریە )وە ، لە باوکیەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( دخلت الجنة ، فاستقبلتي جارية شابة ، فقلت : لمن أنت ؟ قالت : انا لزيد بن حارثة )[1] . دەفەرمویّ : چوومە بەهەشت ، لەویّ کەنیزەکێکی گەنج پێشوازی لیّ کردم، پرسیم : تۆ هی کێیت . وتی : کەنیزەکی زەیدی کوڕی حارثەم . زەید ( ﷺ ) لە سالیّ ( ٨ ) ی کۆچی / مانگی جمادی یەکەم لە تەمەنی ( ٥٥ ) سالیدا شەهید کرا . ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لیّ بێت .

[1] – دانە پاڵەکەی ( حسن )ە : زەهەبی ، سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٢٣٠) .

# ٤٠ - عبدالله ی کوڕی رواحه ( رضي الله عنه )

## " شەهیدی بەختەوەر "

ناسنامەی :

عبدالله ی کوڕی ڕواحەی کوڕی ثعلبه ی کوڕی ( امرئ القيس )ی کوڕی ثعلبه یه .
پێشەوای شەهیدی بەختەوەر ، ابو عەمری ئەنصاری خەزرەجی بەدری و زانا و شاعیره ..
لەبەدر و عقبەدا بەشداری کردووه هەروەها خاڵی ( نعمانی کوڕی بشیر )ه و یەکێکه له نووسەرانی ئەنصار ...

## " گوێڕایەڵی باش "

لـه عبـدالرحمن ی کـوڕی ئـەبو لیلـی وه ، عبـدالله ی کـوڕی رواحـه هـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) لەکاتێکـدا وتـاری دەدا ، گـوێی لـه پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) بـوو فەرموی : ( دانیشن ) عبـدالله ڕاسـت لـه جێ ی خۆی لە دەرەوەی مزگەوت دانیشت تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) له وتارەکەی بووه وه ، ئەم هەواڵه گەیشت به پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش فەرمووی : ( زادك الله حرصاً على طواعية الله و رسوله ) [1] . خـوای پەروەردگار زیاتر پێدا گرت کات لەسەر گوێڕایه لیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەی .

نووسەر دەڵێت : ئیتر سەرلێشێواوان دەیانەوێ چی بڵێن کەوا ئەیانەوێ سوننەتی پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) پـەراوێز بخـەن و لـه پلـه و پایـەی کـەم بکەنـەوه بـەبیانووی پرووپووچ؟.

## "نموونەیەك له هۆنراوەکانی "

له ( انس )ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووه مەککه بۆ عەمره ، عبدالله له نێو دەستیدا دەیفەرموو :

خلوا بني الكفار عن سبيله   اليوم نضربكم على تنزيله

ضربا يزيل الهام عن مقيله   ويذهل الخليل عن خليله

---

[1] - سـەنەدەکی ( صـحیح )ه ، بـەڵام ( مرسـل )ه وه الحـافظ لـه ( الاصـابه ) ( ٦ / ٧٨ ) بـه ( صـحیح ) دایناوه و دەڵێت : بەیهەقی دەری هێناوه .

دەڵێت : ڕێی بۆ چۆڵ کەن ئەی بێ باوەڕان ، ئەمڕۆ بەسەرتاندا دەدەین لەسەر دەربەدەرکردنی ( یان لەسەر هێنانە خوارەوەی ) بەلێدانێك قسە لەبیر قسەکەر دەباتەوە و دۆست و برادەر لەیەك بێ ئاگا دەکات . عومەریش ( ﷺ ) فەرمووی : (ئەی کوڕی ڕواحە ! لەناو حەرەمی خوادا و لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شیعر دەڵێیت ؟ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( خل یا عمر ، فهوا اسرع فیهم من نضع النبل ) لێی گەڕێ ، عومەر ، بەڕاستی وتەکانی لەسەر بێ باوەڕان لە دەرچوونی تیر خێراترە .

وە لە بێژەیەکی دیکەدا هاتووە : ( فوالذي نفسي بیده ، لکلامه علیهم اشد من وقع النبل)[1]

واتە : سوێند بەوزاتەی گیانی منی بە دەستە ، قسەکانی لەسەر بێباوەڕان لە جێگای تیر ( ئەو جێگایەی تیرەکەی پێ دەکات ) توندتر و سەختترە .

## " ترسی عبدالله ( ﷺ ) "

لە ( قیس )ەوە ، دەڵێت : ابن رواحە گریا ، خێزانەکەشی گریا ، لە خێزانەکەی پرسی چیتە ؟ وتی : بۆ گریانی تۆ ، منیش گریام . فەرمووی : زانیومە کە بێ گومان بەسەر ئاگردا دەڕۆم ، بەڵام نازانم لێی ڕزگار ئەبم یان نا ، لەبەر ئەوە دەگریم [2] .

نووسەر دەڵێت : ئەمەی لەوەوە زانیوە کە پەروەردگار دەفەرموێت ( و ان منکم الاواردها ) ( مریم : ٧١ ) . واتە : بێ گومان هەمووتان دەبێ بەسەریدا بڕۆن – لەسەر پردی سیراط .

## " بەرتیل ڕەت دەکاتەوە "

لە ( سلێمانی کوڕی یسار ) ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ابن ڕواحەی نارد بۆ خەیبەر ، لەوێ لەگەڵ جوولەکەکاندا مامەڵەیەکی بۆ دەخەملاندن ، هەڵسان بڕێك خشڵ ی ئافرەتەکانیان بۆ کۆکردەوە و وتیان : ئەمە بۆ تۆ و کارەکەمان لەسەر سوك کە .

فەرمووی : ئەی جوولەکەینە ! سوێند بەخوا لەناو دروستکراوانی خوادا ، کەس نیە هێندەی ئێوە ڕقم لێیان بێت ، بەڵام ئەمەش وام لێ ناکات نادادی لەگەڵتاندا بکەم ، هەروەها بەرتیلیش حەرام و ناڕەوایە . وتیان : ئابەمە ئاسمان و زەوی ڕاگیراون . [1]

---

[1] – سەنەدەکی بەهێزە : تیرمیزی دەری هێناوە ( ١٥١ / ٢ ) هەروەها ( ابویعلی ) بەدانەپاڵێکی (حسن).

[2] – پیاوانی جێ متمانەن : بەڵام ( مرسل )ە ، بڕوانە الدر المنثورد ( ٤ / ٢٨٢ ) .

## " شەهید بوونی "

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەرسێ ئەمیرەکانی ( مؤتة ) ی ئامادە کرد فەرمووی : پێشەواتان زەیدە ، ئەگەر پێکرا ئەوە جەعفەر لە جێیەتی ، ئەگەر پێکرا ئەوا ابن رواحە . ئەوە بوو کە ئەو دووانە کوژران ، ابن رواحە تۆزێ لە دەروونیدا هەستی کرد کە واحەز ناکات بچێتە پێشەوە ، لەبەر ئەوە بەخۆی وت :

اقسمت یا نفس لتنزلنه طائعة اولا لتکرهنه

فطالما قد کنت مطمئنة مالي اراك تکرهین الجنة

واتە : سوێندم خواردووە ئەی ن‌ەفس دەبێ بچیتە مەیدان جا پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ ، مادەم لە خۆت دڵنیایت ئەی نەفس ئیتر بۆچی ئەبینم ڕقت لە بەهەشتە ... ئەوە بوو شەڕی کرد تا شەهید کرا ( ﷺ ) .[1]

## " ئازایەتی عبدالله "

وەلیدی کوڕی مسلم دەڵێت : گوێم لێ بوو کە سوپای مؤتە بەلای ناوچەی (معان )دا تێپەڕ بوون ، و هەواڵیان پێ دراوە کە ڕۆمەکان خەڵکێکی زۆریان بۆ کرکردنەوەتەوە . بۆیە زەید ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانیدا کرد . وتیان : تۆ پێت داناوە لە وڵاتەکەدا ئەملەکەیت ترساندووە ، ئێستا ئیتر ئەوەندە بەسەو بگەڕێرەوە .

ابن رواحە بێ دەنگ بوو ، تا زەید پرسیاری لێ کرد . ئەویش فەرمووی : ئێمە بۆ کۆکردنەوەی غەنیمەت نەهاتووین ، بەڵکو بۆ گەیشتن بە دوژمنەکانمان هاتووین ، وە ئێمە بە ژمارە شەڕیان لەگەڵدا ناکەین یان بە تفاق ، لەبەر ئەوە ڕای من وایە بەرەو ڕوویان بڕۆین .

وە لە عورووەی کوڕی زوبێرەوە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( فإن اصیب ابن رواحة فلیرتض المسلمون رجلا ) ئەگەر ابن رواحەش شەهید کرا ئەوا با موسڵمانان پیاوێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن بێتە پێشەوا .

---

[1] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٢٣٧ ) .

پاشان ڕۆشتین تا لە ( معان ) دا بەزین لەوێ پێیان گەشت کەوا (هرقل) بەخۆی و سەد هەزار سەربازی ڕۆمی یەوە لە ( ماب ) دابەزیوە لەگەڵ سەد هەزار (مستعربە ) [1] دا ... لەوێدا ابن رواحە خەڵکەکەی هاندا و فەرمووی : ( ئەی خەڵکینە ! ئەوەی ئێوە لێی ئەترسن ، هەر ئەوەیە کە بەنیەتی بەدەست هێنانی هاتونەتە ئێرە کە ئەویش شەهادەتە ) [2] موسڵمانان تەنها سێ هەزار کەس بوون .

---

[1] – مستعربە : کەسێکە بەبنەچە عەرەب نیە و بەڵام بۆتە عەرەب ( فەرهەنگی ئۆبەرە ) گیوموکریانی چاپی دووەم .

[2] – بڕوانە : سیرە ئیبنو هشام ( ٢ / ٢٧٩ ) الحلبە ( ١ / ١٢٠ )

## ٤١ - خالدی کوڕی سعید ( رضي الله عنه )

## " یەکەم کەس کە ( بسم الله الرحمن الرحیم )ی نووسی "

خالدی کوڕی سعیدی کوڕی عاص ی کوڕی ئومەییەی کوڕی عبدشمس ی کوڕی عبدمناف ی کوڕی قصی .. . پایە بەرز و گەورە ، ئەبو سەعیدی قورەیشی ئومەوەی یە ، یەکێکە لە پێشینەیەکەمینەکان .

لە ( ئوم خالدی کچی خالد ) ەوە دەگێڕنەوە ، دەڵێت : باوکم پێنجەم کەس بوو لە ئیسلامدا و هیجرەتی کرد بۆ حەبەشە و زیاد لە دەساڵ لەوێ مایەوە و لەوێ من لە دایك بووم . هەروەها وتویەتی : باوکم یەکەم کەس بووە (بسم الله الرحمن الرحیم ) ی نووسیوە

هەروەها دەگێڕنەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کردوویەتیە سەرپەرشتیار لە ( صنعاء ) هەروەها ابوبەکر ( رضي الله عنه ) کردوویەتیە پێشەوا بەسەر سوپاکەیەوە بۆ غەزای شام.

وە خالد ( رضي الله عنه ) کەسێکی جوان چاك و پێکەوتوو بوو .. ڕۆژی اجنادین شەهید بووە .. دەگێڕنەوە کە خالد ( رضي الله عنه ) شەهید بووە و بکوژەکەی دوای موسڵمان بوونی پرسیویەتی : ئەو پیاو کێ بوو ؟ بەڕاستی ڕوناکی یەکی درەوشاوەم لە ئاسمانەوە بۆی بەدی ئەکرد!! [1]

---

[1] – انظر : باسی ژیانی لە ( سیر اعلام المبلاء دا ) ١ / ٢٦٠ . اسن سعد ( ٤ / ١ / ٦٩ ، ٧٠ ، ٧١ ) .

# " ٤٢ - عەلائی کوڕی حضرمی ( رضي الله عنه ) "

## " ئەو سەرکردەیەی بەسەر ئاودا ڕۆیشت !! "

یەکێ بوو لە هاوپەیمانانی ( بنی امیە ) و لە گەورە پیاوانی کۆچبەران ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ویلایەتی بەحرەینی پێ سپارد ، پاشان دایە دەست ئەبو بەکر و عومەر(رضي الله عنه) .

### " جیهاد و تێکۆشانی "

محمدی کوڕی سعد ، دەڵێت : پێشەوا ابوبکر عەلائی کوڕی حضرمی نارد بۆ غەزایەك ، ئەویش لەگەڵ شانزە ئەسپسوار بەڕێ کەوت ، وە ئەبوبەکر ( رضي الله عنه ) بۆی نووسی کە بەهەرکەسێ لە موسڵمانان گەیشت ، لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن ، ئەوەبوو عەلاء بەخۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون ڕۆیشت تا گەیشت بە قەڵای ( جواثی )[1] و لەگەڵیان هاتەشەڕو سەرکەوتنی بەدەستهێنا .

پاشان هاتە ( قطیف ) کە لەوێش کۆمەڵێك دژی موسڵمانان کۆ بوبوونەوە و لەگەڵیان جەنگا ، ئەوە بوو شکستیان هێنا ، ئەوجا عەجەمەکان چوونە پاڵ گەڕیدەکانەوە ( الزارە ) و عەلاء هات بۆ لایان و لەسەر کەناری ڕووبار بۆیان دابەزی و لەگەڵیاندا شەڕی کرد و ئابلوقەی دان تا ئەو کاتەی ( صدیق ) وەفاتی کرد ، ئەوجا ئەهلی (الزارە ) داوایان کرد لەگەڵیان ڕێککەون ، ئەویش لەگەڵیان ڕێك کەوت و پاشان لەگەڵ ئەهلی ( دارین ) جەنگاو شەڕکەرەکانیانی کوشت و منداڵ و ڕشتەکانیانی گرتەخۆ.

ئەوجا ( عرفجە ) ی نارد بۆ کەناری فارس لەوێ ڕێگای کەشتی یەکانی دابڕی و دوورگەیەکی لە زەوی فارس فەتح کرد و مزگەوتێکی تێدا دروستکرد [2] .

---

[1] - جواثي : شارێك بوو لە بەحرەین هی( عبدالقیس ) بوو .

[2] - بڕوانە : ئیبنو سعد ( ٤ / ٢ / ٧٧ - ٧٨ ) .

## " کەرامەتی دۆستانی خوا "

کەرامەت و ڕێزی دۆستانی خوا شتێکی جێگیر و چەسپاوە و کەس نکوڵی لیّ نیە مەگەر ئەوانەی بیّ ئاگان و لە زانست و لە دین پشکێکی باشیان نەبووە . شێخی ئیسلام ( ابن تیمە ) دەڵێت : کەراماتی دۆستانی خوا بە بەرەکەتی شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەدەست هاتووە ، و لە ڕاستیدا لەبازنەی پەرچو (معجزە ) ەکانی پێغەمبەری خوادایە( ﷺ ) [1] .

لە ( سهامی کوڕی منجاب )ەوە ، دەڵێت : ( لەگەڵ عەلاء ی کوڕی حضرمیدا چووین بۆ غەزای ( دارین ) [2] لەویّ سیّ دوعای کرد ، پەروەردگار هەرسێکیانی وەڵامدایەوە : یەکەمیان ئەوە بوو لە جێیەك دابەزین داوای ئاوی کرد بۆ دەستنوێژ گرتن ، دەستی نەکەوت ، هەڵساو دوڕکعات نوێژی کرد و فەرمووی : ( ئەی خوای پەروەردگار ئێمەی بەندەی تۆت هاتوینەتە ئێرە تا لە پێناوی تۆدا دژی دوژمنەکەت بجەنگین ، پەروەردگارا بارانێکی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنە تا دەستنوێژی لیّ بگرین و لێی بخۆینەوە ، و دوای ئەوە غەیری ئێمەی تیا بەشدار مەکە .

ئەوە بوو تۆزیّ ڕێمان کرد ، هێندەی نەبرد ئەبینین لە ئاسمانەوە بارانی ڕەحمەت دەبارێت و ئێمەش دەستنوێژمان لیّ گرت و لێمان خواردەوە و مەتارەکەم لیّ پڕ کرد و لە جیّ خۆی دامنا تا بزانم دوعاکەی گیرا بوو یان نا ؟ شەو کەمێك ڕۆشتین پاشان بە هاوەڵانم وت : مەتارەکەمم بیر چووە ، چووم بۆ ئەو جێیەی لێی دامنا بوو دەبینم وەك ئەوەی هەرگیز ئاوی تیّ نەکرا بێت وا بوو .

پاشان ڕۆشتین تا گەشتینە (دارین ) و لە نێوان ئێمە و دوژمناندا ڕووبارەێك هەبوو ، عەلاء فەرمووی : ئەی زانای میهرەبان ، ئەی بەرزی گەورە .. ئێمە بەندەی تۆین و لە پێناوی تۆدا دەجەنگین لەگەڵ دوژمنانتدا ، دەسا خوایە ڕێگەیکمان بۆ بکەرەوە بۆ گەیشتن پێیان و ڕووبارەکە ببڕین . ئەوە بوو بەناو ڕووبارەکەدا ڕۆشتین و بەبیّ ئەوەی زینی وڵاخەکانمان تەربێت لیّ هاتینە دەرەوە و بەرەوڕوویان بووینەوە کاتیّ عەلاء (ﷺ) گەڕایەوە تووشی ژانە سکێك هات و بەوە وەفاتی کرد .. بەدوای ئاودا گەڕاین تا پێی بیشۆرین دەستمان نەکەوت لەبەر ئەوە بە جلەکانیەوە پێچامانەوە و سپاردەمان کرد .

---

[1] – بڕوانە : الفرقان بين اولياء الرحمن و اولياء الشيطان ص ١٥١ .

[2] – دارین : ئەکەوێتە وڵاتی فارس .

ئەوە بۆ تۆزێ ڕێمان کرد و زۆر دوور نەکەوتبووینەوە بە ئاو گەیشتین بە یەکتریمان وت : با بگەڕێینەوە دەریبێنینەوە و بیشۆین ، گەڕاینەوە دەری بهێنینەوە کەچی نەماندیەوە .یەکێ لەناویاندا وتی : گوێم لێ بوو دوعای دەکرد و فەرمووی :ئەی خوای بەرز و بڵند ، ئەی میهرەبان ، مردنی منیان لەسەر ئاسان کە ( یان وشەیەك لەو مانەیەدا ) و عەورەتم نیشانی کەس مەدە ، ئێمەش گەڕاینەوە و وازمان لێ هێنا [1] . پێشەوا زەهەبی لە ( سیر اعلام النبلاء ) دا لە ئەبی هریرەوە ( ﷺ ) بە کورتی باسی ئەم چیرۆکەی کردووە و تیایدا دەڵێت : کە شۆردوویانە ئەمەش نزیك ترە لە ڕاستی و مەنتیق . ئەوەتا لە ئەبو هریرەوە ( ﷺ ) دەڵێت : سێ شتم لە علاء بینیوە هێشتا خۆشم دەوێن و هەمیشەش خۆشم دەوێن : بەسەر ئەسپەکەیەوە ڕۆژێ ( دارین ) ڕووبارەکەی بڕی ، و بەرەو بەحرەین بەڕێ کەوت لەوێ لە (دهناء) لەخوا پاڕایەوە خوداش سەرچاوەیەکی ئاوی بۆ هێنانەبەر تا تێر ئاو بوون لێی . یەکێ لە پیاوانی شتێکی لەبیرچوو بوو ، گەڕایەوە بیهێنێتەوە ، کەچی سەرچاوە ئاوەکەی لێ نەمابوو .

علاء کاتێ وەفاتی کرد ئاومان لانەبوو ، خوای پەروەردگار هەور و بارانی ڕەحمەتی بۆ دەرخستین ، کە (علاء ) مان پێ شۆرد و بە شمشێرەکانمان گۆڕمان بۆ هەڵکەند و سپاردمان و گڵکۆمان ( حد )مان بۆ دانەنا [2]

---

[1] – بڕوانە / صفة الصفوة ( ١/ ٣٥٣ ) .

[2] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٢٦٥ ، ٢٦٦ ) و الفرقان بین اولیاء الرحمن و اولیاء الشیطان لاپەڕە ١٥٨ ، ١٥٩ .

## " ٤٣ - ئەبوهریرە ( رضي الله عنه ) "

## " لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زیاتر فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای لەبەر بوو "

پێشەوای زانا و ( مجتهدی ) بەتوانا و هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەبو هریرەی دوسیی یەمانی یە ، درەنگ موسڵمان بووە ، لە جەنگی ( خیبر ) دابەشدار بووە . لە جاهلیەتدا ناوی (عبدشمس ، ابو الاسود) بووە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناوی لێ ناوە (عبدالله ) و نازناوی (ئەبو هریرە )ی لێ ناوە .. لە ( عبدالله ی کوڕی رافع ) ەوە ، دەڵێت : لە ئەبو هریرەم پرسی بۆ چی پێت دەڵێت : ئەبو هریرە ؟ فەرمووی : شوانی مەڕان بووم بۆ ماڵەوە مان ( مەڕم ئەلەوەڕاند و شوانیم دەکرد ) و پشیلەیەکم هەبوو یاریم لەگەڵ ئەکرد ، بۆیە ئەو نازناوەم لێ نرا[1] .

لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زانستێکی زۆر و پاك و پیرۆزی وەرگرتووە – کەکەس پێی دا نەگەشتووەتەوە – و ژمارەیەکی وزۆر لە هاوەڵان و لە ( تئەبوعین ) فەرموودەیان لێ وەرگرتووە . چوارساڵ هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوای کرد ( ﷺ ). زەهەبی دەڵێت : ئەم ڕایە ڕاسترین ڕایە ، چونکە ماوەی نێوان ڕزگار کردنی خەیبەر و وەفاتی چوار ساڵ و چەند شەوێك بوو[2] .

### " بیر ( ذاكرة ) ی سەردەمی دابەزینی سروش "

بەدخوازان هەڵمەتێکی ناپەسەندیان کرد بوە سەر ئەبی هریرە بە هۆی زۆری ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گێڕاویتیەوە و هەیانە تانەی لە ڕاوی یەکانی داوە .. بەڵام زانایانی ئوممەتی ئیسلام ئەو سا و ئێستاش بەرامبەریان وەستاون و بەباشترین بەیان و ڕوونکردنەوە ڕەتیان داونەتەوە خوا پاداشتیان بداتەوە[3] .

---

[1] – سەنەدەکی ( حسن )ە ، تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە ( ٣٨٤٠ ) و دەڵێت : فەرمووی ( حسن )ە ((صحیح الترمیزی )) ٣٠١٦ .

[2] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٥٩٠ ).

[3] بڕوانە کتێبی : ( الاسرائیلیات و الموضوعات في کتب التفسیر )ی ابي شهبة .

## " بۆچی ئهبو هریره فهرموودهی زۆری گێڕاوهتهوه ؟ "

لهبهر چهند هۆیهك بووه لهوانه :

١ – له ئهبو هریرهوه ، دهڵێت : ئێوه ئهڵێن كه ئهبوهریره فهرموودهی زۆری له پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) گێڕاوهتهوه دهڵێن : ئهی بۆچی كۆچبهران و پشتیوانان وهك ئهم فهرموودهیان لێ نهگێڕاوهتهوه ! منیش دهڵێم : برا كۆچبهرهكانم و برا پشتیوانهكان خهریكی كاسبی و كڕین وفرۆشتن بوون ، بهلام من كهسێكی كهم دهست بووم و له بازرگانی و كڕین و فرۆشتنهوه دوور بووم و زۆر جاران لهگهڵ پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) دهمامهوه و كاتێ ئهوان دیارنهبوون من لهلای بووم وهكاتێ ئهوان فهرموودهیهكیان له بیر دهچوو لهبیرم نهدهچوو ، وه پێغهمبهری خوا (ﷺ) له فهرموودهیهكدا ، به ئهبو هریره دهڵێت : ( إنه لن يبسط احد ثوبه حتى اقضى جميع مقالتي ثم يجمع اليه ثوبه ، الا و عى ما أقوله ) .

واته : ههر كهسێك كراسهكهی ڕاخست تا من له ههموو قسهكانم دهبمهوه و ئهوجا كراسهكهی بهخۆیهوه كۆبكاتهوه ( له خۆی بگرێت ) ئهوه بێدار وشیار دهبێ لهوهی كه دهیڵێم . منیش عاباكهمم ڕاخست تا له فهرمایشتهكانی بوویهوه ، و ئهوجا له سینهم گرت، بهو جۆره لهو فهرمایشتانهی هیچم لهبیر نهچووه [1] .

له ڕیوایهتێكی دیكهدا هاتووه : دهڵێت : دهڵێن كه بۆچی ڕیوایهتی زۆرم له پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) ههیه – خوا شاهیده – كه من كابرا یهكی نهدار بووم ، ئهوهندهی تێری سكی خۆم ڕۆژانه ههبوو نهزیاتر و زۆرجاران لهگهڵ پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) بووم وه ڕۆژێ پێمانی فهرموو : ( من يبسط ثوبه حتى اقضى مقالتي ثم قبضه اليه ، لم ينس شيئا سمع مني ابـ ـدأ ) فهرمووی ههركهس جلهكانی بلاوكاتهوه و ڕاخات تا له قسهكانم دهبمهوه و ئهوجا جلهكانی كۆكاتهوه و له خۆی بگرێت ههرگیز ئهوهی له منهوه دهیبیستێ له بیری ناچێت. منیش وام كرد . دهی سوێند بهو كهسهی (محمد ) ( ﷺ ) ی بهههق ناردووه ههرگیز شتێكم لێیهوه گوێ لێ بو بێت له بیرم نهچووه [2] .

٢ – ئهبو هریره هات بۆ ماڵی عائشه ( ﵂ ) ، خاتوو عائشه پێی وت : بهڕاستی زۆرت له پێغهمبهری خوا ( ﷺ ) وهرگرت ! وتی : ئهرێ وهڵلاً دایه ، نه ئاوێنه و نهكلدان و نهخهزوبهز سهرقاڵی نهكردووم لێی. ئهویش فهرمووی : ئهڵبهت (یاخود دهشێ وئهبو)[3].

---

[1] – صحیح / بوخاری ڕیوایهتی كردوو ( ٤ / ٢٤٧ ) ، مسلم ( ٢٤٩٢ ) .

[2] – صحیح / بوخاری ( ١ / ١٩٠ ) و مسلم ( ٢٢٩٤ ) .

[3] – صحیح : حافظ له (( الاصابه ) دا باسی كردووه گهڕاندویهتیهوه بۆ ئیبنو سعد و دلنهپالهكهی به (جید – باش ) دلناوه.

## " پێ لێنانی هاوەڵان بە زانستی ئەبوهوریرە "

١ – لە ( ئیبنو عمر )ەوە ، بە ئەبو هریرە دەڵێت : بەڕاستی تۆ لە هەمووومان زیاتر پەیوەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوویت و لە هەموویشمان زاناتریت بە فەرمایشتەکانی[1] .

٢ – ابو هریرە لە دیوەکەی عائیشەدا دا ئەنیشت ، و قسەی دەکرد ، ئەوجا ئەیووت : ئەی خاوەنی ئەم دیوە ، ئایا هیچ نکوڵیت لە قسەکانم هەیە ؟ ئەویش کە لە نوێژەکەی دەبوەوە ، هیچ نکوڵی یەکی لە قسەکانی نەبوو ، بەڵام دەیووت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەك ئێوە قسەکانی نەدەهۆنیەوە [2] .

هەرچی ئەم فەرموودەیەشیەتی ( ﷺ ) کە دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ) دوو ئامان لە زانست و فەرمایشتەکانیم لەبەر کردووە یەکێکیانم بەناو خەڵکیدا بڵاو کردووەتەوە ، بەڵام ئەوی دیکەیان ، ئەگەر بڵاوم کردایەتەوە ئەم گەرووەم بەبڕین دەدا [3] ، زەهەبی دەڵێت : ئەمە بەڵگەیە لەسەر بە نهێنی هێشتنەوەی هەندێ لەو فەرموودانەی کە فیتنە ئەبزوێنێ لەناو بنچینە و لقەکاندا ، یان لە پیاهەڵدان و بەدوێژی یەکاندا ، بەڵام ئەو فەرموودانەی پەیوەندی یان بەحەلاڵ و حەرامەوە هەیە ، بە هیچ شێوەیەك نئەبو بشاردرێتەوە ، چونکە لە بازنەی بەڵگە و ڕوون کردنەوەی ڕێگەی ڕاستدایە .

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە ئیمامی عەلی دەفەرموێ : ( لەگەڵ خەڵکیدا قسە لەسەر شتانێك بکەن کە ئاشنایەتیان پێی هەیە و ئەوەشی کە نکوڵی لێ دەکەن و بێ بڕوان پێی واز لێ بێنن ، ئایا دەتانەوێ و حەز ئەکەن خودا و پێغەمبەرەکەی بە درۆ بخرێنەوە ؟! )

هەر بەو جۆرەش ئەگەر ئەبوهریرە ئەو بەشە زانستەی بلاوبکردایەتەوە ، ئازاردەدرا ، بەڵکو دەکوژرا [4] . وە مامۆستا ( شعب الارنئوط ) دەڵێت : زانایان ئەو ئامانەی کە ابوهریرە بلاوی نەکردەوە ئەخەنە بئەبو ئەو فەرموودانەی کە پێشەوایانی خراپە و خراپەکاری نیشان دەدات ، لەگەڵ حاڵ و سەردەمیاندا .

---

[1] – سەنەدەکی ( صحیح ) ە : تیرمیزی لە ( المناقب ) دا ریوایەتی کردووە و بڕوانە صحیح سنن الترمیزی ( ٣٠١٣ ) .

[2] – صحیح : مسلم ریوایەتی کردووە ( ٢٤٩٣ ) .

[3] – صحیح / بوخاری ریوایەتی کردووە ( ١ / ١٩٢ ، ١٩٣ ) لە بابی ( زانست ) دا .

[4] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٥٩٧ ، ٥٩٨ ) .

وە ئەبو هریرە بە ناڕاستەوخۆ هەندێکیانی ناودەبرد بەڵام بەڕاشکاوی نەیدەوت لە ترسی گیانی خۆی لێیان ، وەك ئەم فەرمایشتەی : ( پەنا ئەگرم بە خوا لەسەری شەست و ئیمارەتی هەرزەکان ) ئاماژەیە بە جێنشینایەتی یزیدی کوڕی معاویە ، چونکە لە ساڵی شەستی کۆچیدا بوو ، وە خوا گەورە دوعاکەی گیرا کرد و پێش ئەو ساڵە کۆچی دوایی کرد .

ابن المنير دەڵێت : هەندێ کەس ئەم فەرموودەیان کردووەتە بیانوو بۆ بەڕاست دانانی بیروڕا پوچەکانیان و بروایان وایە کە شەریعەت سەروژێری هەیە (شتی ئاشکرا و دیاری و شتی ناوەکی و نهێنیش هەیە ) ئەمەش بیروڕایەکی پوچەڵە ، و دەرئەنجامەکەی هەڵوەشانەوەیە لە ئاین . ئەبو هریرەش(ﷺ) مەبەستی لە فەرمایشتی کە دەڵێت : ( بڕینی لێ دەکەوتەوە ) ئەوەیە : گەر ئەهلی خراپە گوێیان لێی بێ کار و کردەوەکانیان عەیبدار ئەکات و هەوڵەکانیان بە گومڕای و ڕێ هەڵەکردن دائەنێ ، بەو هۆیەوە دەیکوژن .. وە ئەمە پشتگیریی ئەو ڕایە ئەکات کە دەڵێ ئەو فەرموودانەی پەیوەندی یان بە حوکمە شەرعی یەکانەوە هەیە نەبو بە نهێنی بمێننەوە [1] .

## " بەرەکەتی دوعای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ دایکی ابو هريرە ( ﷺ ) ".

لە ( ئەبو کثير السحمي )یەوە ، دەڵێت : ابو هریرە پێی وتم : سوێند بە پەروەردگاری هەق ، خوا کەسێکی ئیمانداری خەلق نەکردووە ناوی منی بیستبێ و خۆشی نەویستبم .

وتم : جا چۆن ئەزانیت ؟

فەرمووی : دایکم کەسێکی بێ باوەڕ بوو ، وە من بانگم ئەکرد بۆ ئیسلام ، بەڵام وەڵامی نەئەدامەوە و باوەڕی نەئەهێنا ، ڕۆژێکیان دووبارە بانگم کردەوە بۆ ئیسلام بەڵام شتانێکی وت دەربارەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێم ناخۆش بوو . بۆیە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەدەم گریانەوە و هەواڵەکەم پێ دا و داوام لێ کرد دوعای بۆ بکات . ئەویش فەرمووی : ( اللهم اهد ام ئەبو هريرە ) فەرمووی : ئەی پەروەردگار هیدایەتی دایکی ئەبو هریرە بدە ...

---

[1] – بڕوانە : پەراوێزی ( سير اعلام النبلاء ) ( ٢ / ٥٩٧ ) .

منیش خێرا بەرەولای دایکم ڕۆشتم تا موژدەی پێ بدەم ، هاتم دەبینم دەرگا کە داخراوە دەنگی شڵپەی ئاودێت ، شتێکم کرد بۆ ئەوەی هەست بکات بە گەڕانەوەم ئەوجا دەرگاکەی بۆم کردەوە دەبینم جل و بەرگەکەی لەبەر کردووە و سەری داپۆشیوە و دەڵێت: ((اشهد ان لااله الا الله ، و ان محمدا عبده و رسوله)) . دەڵێت : خێرا گەرامەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لە خۆشیدا ئەگریام وەك چۆن پێشتر لە خەفەتدا گریام ، و هەواڵەکەم پێدا و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، داوا لە پەروەردگار بکە با من و دایکم لە لای بەندە ئیماندارەکانی خۆشەویست بکات . ئەویش فەرمووی : ( اللهم ، حبب عبيدك هذا و امه الى عبادك المؤمنين ، و حببهم اليهما ) .[1] .

ئەی پەروەدگار ، ئەم بەندەیەی خۆت و دایکی خۆشەویست کە لای بەندە ئیماندارەکانت وە بەندە ئیماندارەکانیشت لە لای ئەوان خۆشەویست کە .

## " سوپاسگوزاری "

لە ( مضاری کوڕی حزن ) ەوە ، دەڵێت : شەوێك ڕێم دەکردە ، گوێم لە ( الله اكبر )ی پیاوێك بوو ، خێرا بە خۆم و ولاخەکەمەوە بەرە و لای ڕۆشتم . پرسیم : کێیت ؟ وتی : ئەبو هریرە . وتم : ئەم تەکبیرە یە چی بوو ؟ وتی : سوپاس کردنی خوا بوو . پرسیم لەسەر چی ؟

وتی : کرێکاری ( سیرە ی کچی غزوان ) بووم بە پێیان ڕێم دەکرد و ئەوەندەی تێری سکی خۆم نانم هەبوو . کاتێ ئەوان بەسەر ولاخەکانەوە بوون من بە پێی پێشڕەویم دەکردن وەکاتێ لە جێیەك دادەبەزین خزمەتم دەکردن ، دواتر خوای گەورە کردی بە خێزانم ! و ئێستا ژنی منە .[2]

وە جارێکیان ئەبو ( رضي الله عنه ) نوێژی دەکرد و کاتێ سەلامی دایەوە ، دەنگی بەرزکردەوە و فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم ئاینەی کردووەتە بناغەی شتەکان و ئەبو هریرەی کردووەتە ئیمام و پێشەوا ، دوای ئەوەی کرێکاری کچی غزوان بوو و هێندەی تێری سکی خۆی هەبوو ، بە پێیان ڕێم دەکرد لەبەر نەبوونی[3]

---

[1] – اسنادەکەی ( حسن ) ە: احمد ( ٢ / ٢١٩ ، ٢٢٠ ) زەهەبیی لە( السير ) دەڵێت:اسنادەکەی (حسن)ە .

[2] – پیاوانی جی متمانەن : ابونعیم ( ١ / ٣٨٠ ) و غەیری ئەویش . الارنؤوط ( سير ) ٦١٢ .

[3] – ابونعیم لە ( الحلیه ) ( ١ / ٣٧٩ ) ریوایەتیکردووە .

## " دادگەری "

چەسپاوە کە عمری کوڕی خەتاب ( ﷜ ) ئەبو هریرەی کردووە بە والی (بحرین ) ، ئەوە بوو بە بڕی دە هەزارەوە هاتەوە . عومەر ( ﷜ ) پێی وت: ئەمماڵەت هەڵگرتووە بۆ خۆت ئەی دوژمنی خوا و دوژمنی قورئانەکەی ؟

ئەبو هریرەیش پێی وت : من دوژمنی خوا و قورئانەکەی نیم ، بەڵکو دوژمنی ئەوەم کە دژایەتی خوا قورئانەکەی دەکات . ئەویش فەرمووی : ئەی ئەم پارەیەت لە کوێ بوو ؟ ئەویش وتی : بەرو بووم و قازانجی ماڵی خۆمە و نرخی دەغڵ و دانی بەندەیەکی ( کۆیلە ) خۆمە و لەگەڵ موچەی خۆمدا کە کۆبوەتەوە ..

بەدواداچوونی ئەمەی کرد ، دەبینن هەروایە کە ئەبوهریرە وتی : دوای ئەوە پێشەوا عمر بانگی کردەوە کە ویلایەتێکی بداتە دەست ، ڕازی نەبوو .. عومەریش (﷜) پێی وت : رقت لەکاربەدەستیە ؟ ، لە کاتێکدا لە تۆباشتر داوای کاری کردووە : ئەویش ( یوسف ) بوو سەلامی خوای لێ بێت ! ئەبوهریرەش ( ﷜ ) فەرمووی : یوسف پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەرە و من ( ابو هریرەی کوڕی امیمە ) م . و لە دوو سێ شت ئەترسم . فەرمووی بۆ نالێیت : لە پێنج شت ؟

ئەبو هریرە فەرمووی : ئەترسم بەبێ ئاگایی و بەبێ زانیاری شتێ بڵێم ، وە ئەترسم بە پەلە و بێ پشوو درێژی داوەری بکەم و ئەترسم لە دواوە لێم بدرێت وە لە ماڵ و موڵکم دابماڵرێم و جنێو بەناموسم بدرێت [1]

بەم جۆرە دەبینن کە عمر ( ﷜ ) لایەنگری کەس ناکات هەروەك موجامەلەی هیچ کەس ناکات با هاوەڵی پێغەمبەری خوایش بێت( ﷺ ) ، وە عمر ( ﷜ ) ئەگەر خۆی کەسێك بوایە دەستی بۆ ( بیت المال )ی موسڵمانان ببردایە ، بۆی نەبوو ئەوە بە ئەبو هریرە بڵێ .

وە ئێمە لە ئێستاو لە سەردەمانی دیکەشمان بیستوە کە یەکلاکردنەوەی کێشە و گەندەڵیەکانلە رزۆکی پێوەدیار بووە و زۆر جاریش نیشانەکانی هەق و ڕاستی لە دەست داوە . لەبەر ئەوەی بەرپرسی یەکەم لە دەسەڵاتدا دەستی هەبووە لە گەندەڵیەکاندا دواتریش هێزی ڕێگریکردنی لادانی نەبووە، چونکە خۆی پشکی هەبووە [2] .

---

[1] – پیاوانی جێ متمانەن : ئیبنو کثیر لە ( البدایە ) باسی کردووە ، ( ٨ / ١١٣ ) لە عبدالرزاقە وە .

[2] – ( من فقه عمر )ی د . محمود محمد عمارە ( ٥١ ) .

## " وەفات "

ژیانی ئەبو هریرە درێژەی کێشاو .. لەوە دەترسا توشی فیتنە و ستەم بێت .. بۆیە دوعای ئەکردو ئەیفەرموو : (( ئەی پەروەردگار ، نەمگەینیتە سالّی شەست )) [1] ئەوە بوو لەو ساڵەدا یاخود بە ساڵێك پێشتر وەفاتی کرد . کاتێ نەخۆش کەوت ( ﷺ ) ، مروان هاتە لای و پێی وت : خوا شفات بدات ئەبو هریرە . ئەویش فەرموی : ئەی خوای پەروەردگار ، بەڕاستی حەزم بە لیقای تۆیە ، دە تۆش حەز بە لیقای من بکە . ئەوە بوو هێشتا مەروان نەگەشبتووە ناوەڕاستی بازار لە گەڕانەوەیدا ، ئەبو هریرە ( ﷺ ) وەفاتی کرد . وە لە ( سلم ی کوڕی بشیر ) ەوە ، ئەبو هریرە ( ﷺ ) لە کاتی نەخۆشی یەکەیدا گریا پرسی یان دەگریت ؟ فەرمووی : بۆ ئەم دنیایەی ئێوە ناگریم ، بەڵکو بۆ دووری سەفەر و کەمی توێشوو دەگریم وە بۆ ئەوە دەگریم کە دڵنیام بەسەر ( سراط )دا دەڕۆم کە یان ئەکەومە ئاگرەوە یان بەهەشت و نازانم بۆ کامیان دەبرێم [2] .

پاش وەفاتی ئەبو هریرە ( ﷺ ) وەلیدی کوڕی عتبە دوای نوێژی (عەسر) نوێژی لەسەر کردوو ( ابن عمر ) و ( ابو سعید ) جەنازەکەیان بەڕێ کردووە و لە (بقیع) سپاردەکراوە .

---

[1] – پیاوانی جێی متمانەن: الحافظ لە ( الفتح ) دا ( ١٣ / ٨ ) باسی مردووە الارنؤوط ( سیر ٢ / ٦٢٦).

[2] – بڕوانە : الحلیە ( ١ / ٣٨٣ )

# " ٤٤ - خباب ی کوڕی الارت ( رضي الله عنه ) "

# " کێوێ لە ئارامی "

خەبابی کوڕی ئەرت ی کوڕی خوەیلیدی کوڕی سعدی کوڕی خزیمە یەوە بە ( ئەبو عبدالله ) ناو دەهێنرێت . بە دیل گیرا و فرۆشرا بە ( ام انمار ) لە مەککە ، وە (خباب ) پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بچێتە ماڵی ( ارقم ) ، موسڵمان بووە ، وتراوە کە (شەشەم کەس بووە موسڵمان بێت ، واتە شەش یەکی ئیسلام بووە هەروەك ( کردوس ) دەڵێت : [1] لە خانەدان و ڕەسەنەیەکە مینەکانە ، ئامادەی بە درونەوانی تریش بووە .

## " ئارامگری لەسەر ئەشکەنجەدان "

( طارق ی کوڕی شهاب ) دەڵێت : خباب لە کۆچبەرە یەکەمینەکان بوو وە یەکێ بوو لەوانەی لە پێناوی خوادا ئەشکەنجە دەدرا . ( رضي الله عنه ) مە ولای ( ام انمار )ی کچی سباعی خزاعی بوو ، بێ باوەڕان بە جۆرەها شێوە ئازاریان دەدا .. بە قژڕایاندەکێشا و وە ملیان زۆر بە توندی بادەدا و چەندین جار لەسەر سکڵی داگرساو پاڵیان دەخست و بەردیان لەسەری دائەنا بۆ ئەوەی نەتوانێ هەڵسێتەوە [2] .

خباب دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەسەر بوردەکەی لە سێبەری کەعبە دانیشتبوو ، سکاڵای حاڵی خۆمانمان برلای و پێمان وت : ئایا یارمەتیمان بۆ ناخوازیت ، ئایا دوعامان بۆ ناکەیت ؟؟ ئەویش فەرمووی : (( قد كان من قبلكم يؤخذ الرجل فيحفر له في الارض فيجعل فيها ثم يؤتي بالمنشار فيوضع على راسه فيجعل نصفين ، و يمشط بأمشاط الحديد ما دون لحمه و عظمه ما يصده ذلك عن دينه ، والله ليتمن الله تعالى هذا الامر حتى يسير الراكب من صنعاء الى حضرموت فلا يخاف الا الله ، والذئب على غنمه و لكنكم تستعجولن )) [3]

---

[1] - هیثهمی دەڵێت : تەبەرانی بە ( مرسل ) ی گێڕاویەیتیەوە وە پیاوانی هەتا ئەگاتە کردوس پیاوانی ( الصحيح )ن ( کردوس ) یش جێ متمانەیە . المجمع ( ١٥٦٢٩ ) .

[2] - ئەوانە : الرحيق المختوم ( ٧٩ ) .

[3] - صحيح / بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

فەرمووی : بەڕاستی لە نەتەوەکانی پێش ئێوەدا پیاویان دەهێنا و چاڵیان بۆ هەڵدەکەند و دەخرایە ناوی ، ئەو جا مشاریان ئەهێنا و لەسەریەوە ئەیانکرد بە دووبەشەوە ، هەشبوو بەشانەی ئاسنین گۆشتی لەشیان لە ئێسکەکانی دەکردەوە ، کەچی ئەو هەرگیز لە ئاینەکەی لایئەدا و پەشیمانی نەئەبوویەوە ، سوێند بەخوای گەورە ، پەروەردگار ئەم ئاینە سەر دەخات کە گەشتیار لە ( صنعاء ) ەوە بچێت بۆ (حضرموت ) تەنها لە خوا ئەترسێ لە گورگیش بۆ مەڕەکانی ، بەڵام ئێوە پەلەتانە .

(( ئەبێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) )) چی لە دەست بێ بیکات بۆ ئەو بێ چارانە ؟ لە ڕاستیدا ناتوانێ پارێزگاری لە هیچ کەسێکیان بکات ، چونکە توانای بەرگری کردنی نەفسی خۆیشی نی یە ، لە نوێژەکانیدا و لەکاتی کڕنوش بردندا ڕیخۆڵەو ناوسکی گیانەوەری سەربڕاویان فڕێ ئەدایە سەری و... پیسی لەبەردەمماڵەکەیدا ڕژئەکرا جگە لە ئارامگرتن هیچی تری لەدەست نەئەهات .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوەڵانی کۆنە کردوەتەوە لەسەر سوود و قازانجێکی ئانی یان دواخراو ، بەڵکو بەرچاو ڕوونی کردوون و ئەم هەقەی خستە ڕوو کە سەردەمانێکە پەردەی بەسەردا دراوە ، و لێڵی و بارگرانی بەسەر دڵەکانەوە سڕیوەتەوە تا ئاشنا بن بەو یەقینە سروشتی یەی کە لەسەری هاتۆتە بوون و بێ ئاگایی مەحروم و بێ بەشی کردووە لێی ، مرۆڤی گەیاند بە پەروەردگاری و بەوەش بەستیەوە بەڕیشە ڕەسنەکەیانەوە .. لە کاتێکدا کە ئەوان پێشتر ستەملێکراو و بەشخوراوبوون ، ئەو نەمری و فەنابوونی بۆ خەڵکەی بەراورد کرد ، ئەوانیش ئاخیرەتی هەمیشەی یان هەڵبژارد بەسەر دنیای کۆتایی هاتوودا ، هەروەها مافی هەڵبژاردنی پێدان لە نێوان چەند بتێکی بێ بایەخ و پەروەردگارێکی مەزندا ، ئەوانیش ڕقیان لەو بتە دروست کراوانە هەڵگرتو ڕویان کردە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی .

محمد ( ﷺ ) ئەوەندەی بەسە ئەم چاکە مەزنە پێشکەش کات ، هەروەها هاوەڵانیشی ئەوەیان بەسە لە ژێر چاودێری و خەمخۆری ئەودابن ، وە هەرکات ئازاردران با چاوەڕێی پاداشت بن ، و هەرکات دژایەتی کران لەلایەن بەندە و کۆیلەی بتە پیسەکانەوە با پەیوەست بن بەوە وە پێی ئاشنان ولێی ئاگادار کراون ، بێ گومان شەڕی نێوان کوفر و باوەڕ هەمیشە بەردەوامە ، و ڕۆژێك تەپ و تۆزی ئەو جەنگە دادەمرکێت و پەردە بەڕووی شەهیدان لەلایەك و تیاچوان لەلایەکی ترەوە هەڵدەدرێتەوە . هەروەك

پـەردە لەسـەر ڕوی باوەڕدارانێـك كـە لەسـەر فرمـانی خـوا هەڵسـاون و بـێ باوەڕانێك كـە بەفرمانی ئەو زاتە سەر شۆڕ كراو هەڵدەدرێتەوە [1]

## " مانەوەی لەسەر حەق "

لـە ( خبـاب ) ەوە ، دەڵێـت : مـن لـە مەككـە شمـشێرم دروسـت ئـەكرد ، ئـەوە بـوو شمشێرێكم بۆ ( عاس ی كوڕی وائل ) دروست كرد و هاتم داوای پارەكەی لێ بكەم ، پێی وتم : ناتدەمێ هەتا محمد(ﷺ) بە درۆنە خەریتەوە ، منیش پێم وت : من محمد ( ﷺ ) بە درۆناخەمەوە تاوەكو دەمریت و زیندوو ئەكرێیتەوە ( واتە : مەحاڵە شتی وابكەم ) .

وتـی : دەی ئەگـەر زیندوش كرامەوە ئەوە مـن خـاوەنی مـاڵ و سـامانم و داوەریت ئەكەم . منیش ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باس كرد . ئەوە بوو ئایـەتی : ﴿ أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا .. ﴾ سورە مریم ( ٧٧ ) . دابەزی [2] . واتە : ئایا ئـەو جۆرە كەسانەت بینیوە كە باوەڕی بە ئایەت و فەرمانەكانی ئێمە نی یە ؟

١

## " بەخشینی لە پێناوی خوادا "

لە ( ئـەبو وائل شـقیق ی كوڕی سلمە ) وە ، دەڵێـت : لـە كـاتی نەخۆشـی یەكـەیدا هاتین بۆلای خبئەبو كـوڕی الارت ، فـەرمووی : ئـەم تابوتـە هەشـتا هـەزار درهـەمی تیایـە ، سـوێند بـەخوا هـیچ قـەیتانێكم پـێ توونـد نەكردوەتـەوە ( واتـە : مـاڵی دنیـام پـێ نەڕازاندوەتەوە و سەرقاڵم كات ) و هیچ دەرۆزەكەرێكیشم ( سائل ) لێ بێ بەش نەكردووە ئەوجا دەستی بە گریان كرد . پرسیان : بۆچی دەگریت ؟ فەرموی : بۆ ئەوە ئەگریم كە كاتێ هاوەڵانم كۆچیان كردو ڕۆیشتن دینا هیچ شتێكی لێ كەم نـەكردن وە ئێمـەش دوای ئەوان ماینەوەو تاوامان لێ هاتووە هیچ جێیەك شك نابەین جگە لە خۆڵ و خاك [3] .

خەباب لە قیس ی كوڕی حازمەوە ، دەڵێت : سەردانی ( خباب ی كوڕی ارت ) مـان كرد لە نەخۆشی یەكەیدا ، حەوت جار لەسـەر سـكی داخ كرابوو ، فـەرمووی : لەبـەر ئـەوە

---

[1] – بڕوانە : ( فقە السیرە )ی غەزالی ( ١١٢ ، ١١٣ ) .

[2] – سەنەدەكی ( صحیح )ە بوخاری ڕیوایەتی كـردوە ، عاصـي كـوڕی وائـل لـە بـێ بـاوەڕانی قـورەیش و ئەوانە بوو گاڵتەی بە زیندوو بوونەوە ئەكرد .

[3] – بڕوانە : صفە الصفوە ( ١ / ٢٢٣ ) .

نەبوایە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەهی لێ کردووین دوعای مردن بکەین ئەوە داوام دەکرد ، بەڕاستی نەخۆشی یەکەم درێژەی کێشا )[1] .

وە ( ﷺ ) لە کوفە وەفاتی کرد و علی کوڕی ئەبو تالیب ( ﷺ ) نوێژی لەسەر کرد. بەو جۆرە جەستەی ماندووی لە دنیا ڕزگاری بوو تا لە سایەی ڕێز و کەرەمی خودای میهرەباندا بحەوێتەوە .

[1] – بڕوانە : صفوة الصفوة ( ١ / ٢٢٣ ) .

# " ٤٥ - عبدالله ی کوڕی عمر ( رضي الله عنه ) "

## " بەڕاستی عبدالله پیاوێکی باشە "

کێ یە ؟

عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه ) و پێشەوای ڕابەر و شێخی ئیسلام (ابو عبدالرحمن )ە ، هەر بە منداڵی موسڵمان بوو ، پاشان هێشتا باڵغ نەبوو بوو لەگەڵ باوکیدا هیجرەتی کرد .. ڕۆژی ئوحود بە بچوك دانرا و بەشداری پێ نەکرا بۆیە یەکەمین غەزا ، کە بەشدار بوو تیایدا ( خەندەق ) بوو . هەروەها یەکێکە لەو بەڕێزانەی لە ژێر دارەکەدا بەیعەتیان دایە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

بوخاری لە ( ئیبنو عمر )ەوە دەگێڕێتەوە ، وتویەتی : ڕۆژی ئوحود نیشانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) درام ئەو کاتە چوار دە ساڵ تەمەنم بوو ، لەبەر ئەوە مۆڵەتی نەدام، بەشداربم . مجاهید دەڵێت : ابن عمر لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا ئامادە بوو ، تەمەنیشی بیست ساڵ بوو ..

### " فەزڵ و گەورەیی "

١ - لە دایکی ئیمانداران ( عائشە ) وە ( رضي الله عنها ) ، دەڵێت : کەسم نەدیوە هێندەی (ابن عمر ) پەیوەست بێ بە قورئان و جێبەجێ کردنیەوە ...

٢ - لە جابری کوڕی عبدالله وە ، دەڵێت : ( کەس نی یە لە ئێمە بە دنیا گەیشتبێ و ئامانجی تێدا دروست نەکردبێ ، تەنها ( ابن عمر ) نەبێت ) .

٣ - ئەبو سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن دەڵێت : ( ابن عمر وەفاتی کرد ، لە پلەو پایە و چاکەکاریدا لە ئاستی باوکیدا بوو ).

### " خەونێکی ڕاست "

سالم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : هەر پیاوێك لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خەونێکی بدیبایە بۆی دەگێڕایەوە ، وە من کوڕێکی سەڵت و لاو بووم ، وە لە مزگەوت دەخەوتم ، جارێك لە خەونمدا دوو فریشتە هاتە لام و بردمیان بۆ لای جەهەننەم

دەبینم ئاگری جەهەننەم هەروەك گێژەڵوكە ( پێچراوەیە ) و ( شاخی ) * هەیە و خەڵكێكی تیا بوو ئەمناسینەوە ، و هەر لەبەر خۆمەوە دەموت : ( أعوذ بالله من النار ) پەنا دەگرم بە خوا لە ئاگر ، ئەوجا فریشتەیەك هاتە لامان و فەرمووی ئەوە چارەنووسی تۆ نیە ، منیش خەونەكەم گێڕایەوە بۆ حەفصە [1] ، ئەویش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( نعم الرجل عبدالله لوكان يصلي من الليل ) .

واتە : باشترین پیاو عبداللە یە ، ئەگەر شتێك لەشەودا بێدار كاتەوە و نوێژی تیا بكات .. ئەوە بوو عبدالله ( ﷺ ) دوای ئەوە زۆر بەكەمی شەو دەنووست و زۆربەی كاتەكانی شەوی زیندو دەكردەوە [2]. هەروەها ( نافع ) هاوشێوەی ئەمە گێڕاویەتیەوە و تیایدا هاتووە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( ان عبدالله رجل صالح ) بەڕاستی عبدالله پیاوی باشە ..

## " ڕێزگرتنی سوننەتی پاكی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

ابن عمر زۆر دەستگر و پێداگر بوو لەسەر سوننەت و هێندەی خەتی دەستی لێی لاینە دەدا . بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرە ، لەوانە :

١ - لە ( نافع ) ەوە ، ابن عمر شوێن پێی پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) هەڵدەگرت لە هەرچیەكدا نوێژی تیابكردایە ، هەتا جارێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژێر دارێكدا دابەزی دوای ئەوە ابن عمر زوو زوو دەچووە لای ئەو دارە و ئاوی دەدا تاوەكو وشك نەبێت [3].

٢ - هەر لە ( نافع )ەوە ، لە ابن عمر ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( لو تركنا هذا الباب للنساء ) ئەگەر ئەم دەرگایەمان بەجێ هێشتایە بۆ ئافرەتان باش بوو ... نافع دەڵێ : دوای ئەوە ابن عمر لەو دەرگایەوە هات و چووی نەكرد هەتا وەفاتی كرد [4] .

---

* - ( قرن یان شاخ ) ی بیر / دوو منارەیە لەسەر بیردا دروست ئەكرێن و تەختەیەكی لەسەر دائەنرێت بۆ بەستنەوەی گوریسەكە پێیەوە .

[1] - حەفصەی كچی عمر (ﷺ) و خوشكی عبدالله و دایكی ئیماندارانە .

[2] - صحیح بوخاری و مسلم ریوایەتیان كردوە .

[3] - بڕوانە : اسد الغابە ( ٣ / ٣٤١ ) .

[4] - پیاوانی جێی متمانەن : ئیبنو سعد ( ٤ / ١٦٢ ) مەبەستیش یەكێكە لە دەرگاكانی مزگەوت ( مسجد الحرام ) .

٣ – هەر لە ( نافع ) ەوە ، لە ابن عمر ەوە ، لە سەر ڕێگای مەککە سەری ولآخەکەی دەگرت ( لغاوەکەی ) و پێچی پێ ئەکردەو و ئەیووت : بەڵکو سمێك بکەوێتە سەر سم ، واتە بەڵکو ئەمە خوا یە پێی ولآخەکەی بکەوێتە سەر شوێن پێی ولآخەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) . وادیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ی بینیوە کە لەو شوێنەوە ولآخەکەی تێپەڕاندووە .

## " ترسی ابن عمر ( رضي الله عنه ) "

جارێك پیاوێ بە ( ابن عمر ) ی وت : ئەی باشترین کەس ، یاخود ئەی کوڕی باشترین کەس . ئەویش فەرمووی : نە باشترین کەسم و نەکوڕی باشترین کەسیشم ، بەڵکو بەندەیەکم لە بەندەکانی خوا ، و تکاکارم لە زاتی ( الله ) و لێی دەترسێم ، سوێند بە خوا واز لە پیاو ناهێنن تا بەهەلاکەتیا نەبەن [١] .

خوێنەری بەڕێز سەیر بکە ! چۆن ئەم پێشەوا مەزنە نەخۆشی لە خۆ ڕازی بوون لە خۆی دوور ئەخاتەوە ... کەچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کەسانێك ئەبینین خۆبەزلزانین و لە خۆبایی بوون خواردوویەتی و لە تەرازودا هیچ نرخێکی نیە ، بەڕاستی مرۆڤ زۆر سوك و بێ بایەخە کاتێ قەدری خۆی نازانێ . هەروەها کاتێ قورئانی دەخوێند دڵی خشوعی دەبرد و فرمێسك لەچاوەکانیەوە دادەباری – لە نافعەوە ، دەڵێ : کاتێ ابن عمر ئەم ئایەتەی دەخوێند : ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ ...﴾ سورة الحديد، آية ( ١٦ ) .

واتە : ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بە نووری ئیمان ملکەچ و ڕوناك بێتەوە ، ترسی خوای تێدا بڕوێنن بە هۆی یادی بەردەوامی خواوە ... دەگریا هەتا گریان بەسەریدا زاڵ ئەبوو [٢] .

## پەرستشی

مێژوو چەند دیمەنێکی جوانمان لە پەرستشی ( عبدالله )( رضي الله عنه ) بۆ تۆماردەکات ، لەوانە:

١ – بەردێکی گەورەی هەبوو کە بۆ ئاوتێکردن هەڵکۆڵرا بوو ، هەتا ئەیتوانی لە ناویدا نوێژی ئەکرد و ئەوجا ئەچووە سەر جێگاو سەرخەوێکی ئەشکاند و دووبارە

---

[١] – سەنەدەکی ( صحيح )ە : ابونعيم ( ١ / ٣٠٧ ) .

[٢] – پیاوانی جێ متمانەن : او نعيم لە ( الحليە ) دا ڕیوایەت کردووە ، الارنؤوط ( سی ٣ / ٢١٤ ) .

هەڵدەسایەوە دەستنوێژی دەگرت و نوێژی ئەکرد ، لە شەوێکدا چوار تا پێنج جار ئەمەی دووپات ئەکردەوە [1]!!

٢ – بە نافع یان وت : ابن عمر لە ماڵەکەیدا چی ئەکرد و خەریکی چی بوو ؟ وتی : ئێوە هەرگیز بەرگەی ناگرن ، دەستنوێژی تازە دەکردەوە بۆ هەموو نوێژێك و قورئان خوێندنیش و لە نێوان نوێژێك و یەکێکی تردا [2] .

٣ – هەر لە ( نافع ) ەوە ، دەڵێت : ئەگەر ابن عمر نوێژێکی جەماعەتی لە کیس چووایە ئەو شەوە هەمووی زیندوو ئەکردەوە بە نوێژ کردن [3] .

## خۆشەویستی ( ابن عمر ) ( رضي الله عنه ) بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ )

لە ( عاصم ی کوڕی محمدی العمری ) یەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : هەرجارێك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باس کرا بێت ، ( ابن عمر ) دەستی بەگریان کردووە .

یوسف ی کوڕی ماهك ، دەڵێت : ( ابن عمر )م لەلای ( عبیدی کوڕی عمیر ) بینی ، عەبید خەریك بوو باسی پێغەمبەری خوای( ﷺ ) دەکرد و( ابن عمر ) یش فرمێسك لە چاوەکانیەوە دەهاتە خوار .. عبیدی کوڕی عمر ئەم ئایەتەی خوێند : ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ ...﴾ سورة النساء ، آية ٤١ . واتە : دەبێت حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت کاتێ لە هەر میللەتێك شایەتێکمان هێنا ...

ابن عمر دەستی بەگریان کرد ، ئەوەندە گریان ڕیش و کۆشی تەڕ بوو ، پیاوێك ئەوەندە بە حاڵی ابن عمر ناڕەحەت بوو ، وەخت بوو بە باوکم بڵێ قسەکانت کورت کەرەوە ، بەڕاستی مامۆستات ئازاردا ( واتە ابن عمر ) [4] .

هەروەك ابن عمر ( رضي الله عنه ) کەسێکی زۆر دڵ ناسك و گرینۆك بووە کاتێ قورئان بخوێندایە گوێ لێ بوایە . نافع دەڵێت : هەرگیز نەمدیوە ابن عمر ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی بەقەرەی خوێندبێ و نەگریا بێت : ﴿ ... وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ ... ﴾ سورة البقرة ، آية ( ٢٨٤ ) .

---

[1] – پیاوانی جێ متمانەن : الارنؤوط ( سیر ٣ / ٢١٥ ) .

[2] – پیاوانی جێ متمانەن : ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٤ / ١٧٠ ) ، الارنؤوط ( سیر ٣ / ٢١٥ ) .

[3] – پیاوانی جێ متمانەن : حلیە الاولیاء ( ١ / ٣٠٣ ) ، الارنؤوط ( سیر ٣ / ٢١٥ )

[4] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٤ / ٦٢ ) .

واتە : ئەگەر ئەوەی لە دڵ و دەروونتانا جێگیر بووە ، دەری خەن یان بیشارنەوە خوا دەربارەی هەر لێتان دەپرسێتەوە ...

وە دەیفەرموو : بەڕاستی ئامارێکی سەخت و گرانە ( احمد گێڕاویەیتیەوە )

هەروەها جارێك ابن عمر ( رضي الله عنه ) ئەم ئایەتەی خوێند : ﴿ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ ... ﴾[1] تا گەیشتە ﴿ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ سورة المطففين ، آية ( ١ - ٦ ) . دەڵێت ئەوەندە گریا و هەنسکی دا بێ هێز و گیان بوو ، و نەیتوانی بەردەوام بێ لەسەر خوێندنەوە . ( احمد گێڕاویەتیەوە )

لە ( سمیری ریاحي )یەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : عبدالله ی کوڕی عمر بڕێك ئاوی ساردی خواردەوە ، دەستی بەگریان کرد و زۆر گریا ، پرسیاری لێ کرا : لەبەر چی دەگریت ؟ فەرمووی : یادی ئایەتێکی پیرۆزم کەوتەوە : ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ... ﴾ سورة سبأ ، آية ( ٥٤ ) . واتە : ئەوسا ئیتر لە نێوان ئەمان و هەرشتێك کە ئارەزووی دەکەن بەربەست دانرا ..

دەزانم ئەهلی ئاگر ئەوەندەی ئارەزووی ئاو دەکەن ئارەزووی هیچ شتێکی دیکە ناکەن ، وە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ ... أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ... ﴾ سورة الأعراف ، آية ( ٥٠ )[2] . واتە : ( دۆزەخیەکان بەدەم هاوار و ناڵەوە ) هاواریان لە بەهەشتیەکان دەکرد و لێیان دەپاڕانەوە : نەختێك ئاومان بەسەردا بڕێژن ، یان بە شمان بدەن لەو ڕۆزیەی خوا پێ ی بەخشیون .

## چەند مرواری یەك لە ئامۆژگاری یەکانی ( رضي الله عنه )

لە ( عبدالله ی کوڕی سبرە ) وە ، دەڵێت : کاتێ إبن عمر ڕۆژی لێ دەبوویەوە ، ئەیفەرموو : ئەی خوای پەروەردگار بمکە یەکێ لەو بەندانەت کە گەورەترین بەشیان هەیە

---

[1] - واتە : هاوار و ناڵە بۆ تەرازووبازەکان ، ئەوانەی کە لە کێشانە و پێوانەدا فێڵ دەکەن ( یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا ڕاست ناڵێن ، ئەوانەی کاتێك شت لە خەڵکی ئەکڕن بە زیادەوە یان بە تەواوی لێیان وەردەگرن ، کەچی کاتێ شتیان بۆ دەپێوەن یان دەکێشن لێی دەدزنەوە کەمیان دەدەنێ بە فێڵ ، ئایا ئەوانە گومان نابەن کە بە ڕاستی زیندوو ئەکرێنەوە ، بۆ ڕۆژێکی زۆر سامناك و ترسناك و گەورە ، ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی بە پێ دەوەستن لەبەردەم دەسەڵاتی پەروەردگاری جیهانیان .

[2] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٩٥ ) .

لەو خێر و چاكەیەدا كە بەیانیان دابەشی دەكەیت و دەیبەخشی ، و لە و ڕووناكی یەی ڕێگای پێ ڕوناك دەكەیتەوە و ڕێنومایی پێ دەكەیت و لەو بەزەیەی بلاوی دەكەیتەوە و لە و ڕۆزی یەی دەیرێژیت بۆ بەندەكانت و لە هەلگرتنی بەلاو لێ لادانی فیتنەدا [1]...

وە لە ( مجاهد ) ەوە ، لە ابن عمرەوە ، دەلێت : ( هەر بەندەیەك شتێك لە دونیا بێتە بەشی ، ئەوە لە پلەی كەم دەكاتەوە لەلای خوای گەورە ، با بەخشندەیش بێت بەسەریەوە [2].

پێی وترا : فلان كەسی ئەنصاری وەفاتی كرد ، فەرمووی : ڕەحمەتی خوای لێ بێ ، ئەوجا پێی وترا ، سەد هەزاری بە جێ هێشتووە ، ئەویش فەرمووی : بەلام پارەكە ئەوی بە جێ نەهێشتووە .

## وەسیەتەكانی ابن عمر ( رضي الله عنه )

لیث ی كوڕی سعد و غەیری ئەویش گێڕاویانەوە ، دەلێن : پیاوێك نامەیەكی نووسی بۆ ابن عمر تێیدا وتبوی كە داوا ئەكەم هەموو زانستم بۆ بنووسی .

ابن عمریش ( رضي الله عنه ) بۆی نووسی : ( لە ڕاستیدا زانست زۆر و هەمە چەشنەیە ، بەلام ئەگەر توانیت بە جۆرێك بەلیقای پەروەردگار بگەیت كە باری سەرپشتت سوك بێ لە خوێنی خەلك و ورگت خالی لە مال و سامانیان و زمانت بەستراو بێ لە ناموسیان و پەیوەست و مولتەزیم بی بە كاروباری كۆمەلی موسلمانان ، ئەوە ئەو كارە بكە [3]...

هەروەها ابن عمر ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت زۆر موحاسەبەی دەرونی خۆی دەكرد و بەردەوام و بەشێوەیەكی هەمیشەیی هەلدەسابە لە خۆپرسینەوە و پاكژكردنەوە و خاوێن كردنەوەی دل و دەروونی ..

ابن شهاب دەلێت : جارێك ابن عمر ویستی نەفرەت لە خزمەتكارێك بكات ، فەرمووی : ( یاخوا نەفر ... ) و تەواوی نەكرد و فەرمووی حەزناكەم ئەم وشەیە لە زارم بێتەدەر [4]. وە لە ( میمونی كوڕی مهران ) ەوە : پیاوێك لە كوڕانی ( عبدالله ی كوڕی عمر )

---

[1] – بڕوانە هەمان سەرچاوە .

[2] – هەمان سەرچاوە .

[3] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٣٢٢ ) .

[4] – هەمان سەرچاوە ( ٣ / ٢١٨ ) .

داوای پۆشاکی لێ کرد و وتی : جلەکانم دڕاون ، ئەویش فەرمووی : دەی پینەی‌کە و دواتر لەبەری کە ، کوڕەکەی ئەمەی پێ ناخۆش بوو ، ( عبدالله ) ش پێی فەرموو : چیتە ! لە خوا بترسە و لەو کەسانە مەبە ئەوەی خوا پێی بەخشیون لەناوسك و لەسەر پشتیان هەڵیدەگرن .

## بەخشینی لە پێناوی خوادا

ابن عمر ( ﷺ ) ئەگەر زۆر موعجبی شتێکی خۆی ببوایە دەیبەخشی ، نافع دەڵێت: بەندەکانی بەمەیان زانیبوو ، بۆیە یەکێکیان ئەم ئاکارەی ابن عمری قۆستەوە و بەردەوام لە مزگەوت دەمایەوە ، ابن عمریش ( ﷺ ) کە بەم حاڵەوە بینی خۆشیویست و ئازادی کرد !!هاوەڵانیشی پێیان وت : ئەی ئەبو عبدالرحمن سوێند بەخوا دەتخەڵەتێنن و ڕاست ناکەن . ئەویش فەرمووی : دەی هەرکەس بەخودا ( واتە بە خوا پەرستی و ڕوو لە خوا کردن ) بمانخەڵەتێنێ بۆی دەخەڵەتێین ...

## هەڵوێستی لە ئاست میرنشینی و فیتنەکاندا

عبدالله ی کوڕی عمر بێزار و وەڕس بوو لە میرایەتی ( ئیمارەت ) و .. هەروەها کەنارگیری کرد لە فیتنەکە و تیایدا بەشدار نەبوو .

لە ( عاصم ) ەوە ، دەڵێت : مروان بە ابن عمری وت ( دوای مردنی یزیدی کوڕی معاویە ) وەرە دەستت بێنە بابەیعەتت بدەینێ ، چونکە تۆ گەورەی عەرەب و کوڕی گەورەکەیشیتی ..

ئەویش فەرمووی : ئەی چی بە ئەهلی ڕۆژهەلات بکەم ؟

وتی : لێیان دەدەین تا بەیعەت دەدەن .

فەرمووی : دەی سوێند بەخوا حەزناکەم حەفتا ساڵ ملکەچم بن ، بەلام بە شمشێری من تەنها پیاوێك بکوژرێت .

هەروەها ( ﷺ ) سەلامی دەکرد لە (الخشبە ) و ( خوارج )یش لە کاتێکدا ئەوان خەریك بوون لەگەڵ یەك شەڕیان ئەکرد ، و دەیفەرموو : ئەوەی بڵێ ( حی علی الصلاە ) واتە ( هەڵسن وەرن بۆ نوێژ ) لەگەڵی دێم و وەلامی دەدەمەوە و هەرکەسیش بڵێ ( حی

علی قتل اخیك المسلم ) هەڵسەوە بۆ کوشتنی برا موسڵمانەکەت و خواردنی ماڵ و سامانی ، ئەوە بەدەم داواکەیەوە نایەم [1] .

## " فەرمانکردنی بە چاکە و نەهی کردنی لە خراپە "

ئەگەر چی ابن عمر ( رضي الله عنه ) کەنارگیر بوو لە فیتنە و خۆیشی لە میرنشینی و جێنشینایەتی بە دوور ئەگرت ، بەڵام هیچکات دوورەپەرێز لە سەردەم و چاخی خۆی نەئەژیا ... بەڵکو بەردەوام دەچووە ژێرباری وتنی قسەی هەق و لە پێناوی خوادا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترساوە .. دەیزانی کە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە تەوەری هەرە گەورەی ئەم ئاینەیە و دەستهارەیە کە ئیسلامی لەسەر دەسورێتەوە ، بەڵکو پێداگری و چوونە ژێر باری قسەی حەق هۆی وەفاتی ( ابن عمر ) بوو ( رضي الله عنه ) .

لە ( اسحاقی کوڕی سعیدی کوڕی عەمری ئومەوی )یەوە ، لەباوکیەوە ، لە ابن عمرەوە ، دەڵێت : ابن عمر هەڵساوە لە کاتێکدا ( حەجاج ) [2] وتاری ئەدا ، پێی فەرموو : ( ئەی دوژمنی خوا !! کە حەرەمی خوات شکاند و بێ شەرمیت تێدا کرد و ماڵی خوات ڕوخاند ..

( حجاج )یش وتی : ئەی ئەو شێخەی خەڵەفاوی ، ئەوجا کە خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد حەجاج یەکێ لە دەست و پێکانی نارد و حەربەیەکی ژەهراوی هەڵگرت و دای لە ( ابن عمر ) و نەخۆشی خست و پێیەوە وەفاتی کرد .

---

[1] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٤ / ١٦٩ ، ١٧٠ ) و الارنؤوط دەڵێت : دانەباڵەکەی ( سند )ەکەی (حسن)ە سیر ٣ / ٢٢٨ .

[2] – حجاج / حجاجی کوڕی یوسفی ثە قەفی یە ، کەسێکی ستەمکاری فریودروای ناپاك بوو ساڵی (٩٥) مردووە ، زەهەبی دەڵێت : کەسێکی ستەمکار و زەبر بەدەست و پیس و خوێنڕێژ بووە .. ئێمەش لەبەر ئەوە قسەی پێ دەڵێین و خۆشمان ناوێت ، بەڵکو لەبەر خوا ڕقمان لێیەتی ، چونکە ئەم کارەمان باشترین و توندترین بەندی باوەڕە .. و لەناو ئەو دەریای تاوانەیدا چاکەیشی هەبووە دەیدەینە دەست خوا .. سیر اعلام النبلاء ( ٤ / ٣٤٣ ) .

ئـەوجا حجـاج چـوو بـۆلای وەك بەسـەر كردنـەوەی ، سـەلامی كـرد ، وەڵامـی سەلامەكەی نەدایەوە ، و قسەشی لەگەڵ كرد ، بەلام وەلامـی نەدایەوە [1]. ئـەوەبوو حجاج فەرمانی كرد بوو بە هەڵگرتنی چەك لە حەرەمدا !

وە بوخاری ڕیوایەتی كردووە ، دەڵێت : حجاج هات بۆ لای ابن عمر كـاتێ لەسـەر جێگەی كەوتبوو پرسی : ئێستا چۆنی ؟ ابن عمر ( ﷺ ) فەرمووی : دەسازم ، وتـی : كـێ لێی دایت ؟ فەرمووی : ئەوە لێیدام كـە فـەرمانی كـرد بـوو لـە ڕۆژێكدا چەك هـەڵبگیرێ كـە حەرامە ( واتە حجاج ) .

بەوجۆرە موسڵمان دەبێ ئاوێتەی واقع بێت و جێ دەستی دیار بـێ لـە فـەرمانكردن بە چاكە و ڕێگری كردن لە خراپە .. و دوورەپەرێز نەبێ لە كۆمەڵگاكەی بۆ ئـەوەی باتڵ و ناهەق پـێ ڕانەكێشن و حەق و ڕاستەكان و نەبن .

## " وەفاتی ابن عمر ( ﷺ ) "

لـە ( سـعیدی كـوڕی جبیر )ەوە ، دەڵێـت : ابن عمـر لـە سـەرەمەرگدا ، فـەرمووی : خەفەت بۆ هـیچ شـتێكی دنیاناخۆم تـەنها سـێ شـت نـەبێ : تینـوێتی گـەرمای نێـوەڕوان كـاتی بـەڕۆژوو بـوون و هەڵسان و زینـدو كردنـەوەی شـەو ، هـەروەها ئـەوەش كـە دژی (كۆمەڵی تاونبارەكە – الفئة الباغیة ) شەڕم نەكرد ( واتە حجاج ) [2].

دەسا ڕەزای خوات لێ بێت ، دەبێ وێنـەی تـۆ لـە كـوێ بێنین لە بۆ ئاینەكـەی و لـە خواترسـان و زاسـت و ترسـی و ئـاهی لـە پـەروەردگاری ، كەسـێك جێنـشینایەتی پـێ بسپێردرێت ڕەتـی كاتـەوە ، و لـە لایـەن كەسـێكی وەك ( عوسمـان ) دادوەری پـێ بـدرێت ، ڕەتی كاتەوە و لەلایەن ( علی ) ویلایەتی شامی پێ بدرێت ، ڕەتـی كاتـەوە و لێـی هـەڵبێت .. بەڕاستی خوای گەورە هەركەس بیەوێ بۆ لای خۆی دەیبات و ڕێنمونی دەكات [3].

---

[1] – پیاوانی جێ متمانەن : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٢٣٠ ) .

[2] – سەنەدەكی ( صحیح ) : ئیبنو سەعد ڕیولیەتی كردووە ( ٤ / ١٨٥ ) .

[3] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٢٣٥ ) .

# ٤٦ - جُلیبیب ( رضي الله عنه )

## " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە بازووی خۆی هەڵیگرت !! "

هاوەڵێکی پایەبەرزە .. کەسێکە نەخاوەن دارایی و نەجوانی ، بەڵام خاوەنی باوەڕێکە جێگیرتر لە کێوەکان ..

بەڕاستی خودا سەیری وێنە و لاشەمان ناکات ، بەڵکو لە دڵکانما ، و لە کردەوکانمان دەڕوانێ .. وە دڵەکان جێگای سەرنجی پەروەردگارن .

( حسن ) بە پیاوێکی وت : ( دڵت تیمارکە ، چونکە ئەوەی خودا لەبەندەکانی خۆی دەوێت سەلامەتی دڵیانە ) .

خاوەنی ئەم چیرۆکە لە دنیادا جگە لە باوەڕەکەی هیچی شك نەئەبرد .. ابو برزەی ئەسلەمی چیرۆکی ژنهێنانی ( جُلیبیب )مان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : جلیبیب یەکێ بوو لە پشتیوانان ... وە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ) عادەتیان کرد بوو ئەگەر کچیان هەبوایە نەیاندەدا بە شوو هەتا پێغەمبەری خوایان ( ﷺ ) لێ ئاگادار ئەکردەوە تا بزانن ئەو دەیەوێ یان نا ...

ئەوەبوو جارێك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە پیاوێکی لە پشتیوانان فەرموو : یا فلان زوجنی ابنتك . ئەی فلان کچەکەتم بدەیە .. ئەویش وتی : بەڵێ ، جاکێ لە تۆ باشتر .. فەرمووی : ( انی لست لنفسی اریدها ) من بۆ خۆم داوای ناکەم .

وتی : ئەی بۆکێ ، فەرمووی : بۆ جولەیبیب )وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) با بزانم دایکی کچەکە چی دەڵێ..

هات بۆ لای دایکی کچە وتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داخوازی کچەکەتی کردووە ، وتی : بەسەر چاو .. جاچی لەوە باشترە ، کچەکەم ببێتە خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .. ئەویش وتی : نایەوێ بۆ خۆی ، بەڵکو بۆ جولەیبیب ، وتی : بەڕاستە ؟ سوێند بەخوا نایدەمە جلیبیب .

ئەوە بوو کاتێ باوکی کچەکە هەڵسا بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و وەڵامەکەی پێ بگەیەنێت .. کچەکەیان بەشەرمەوە وتی : کێ منی لە ئێوە خواستووە ؟ وتیان : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

وتی : دەی ئەتانەوێ فەرمانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕەت کەنەوە ؟ بمدەرە دەستی بەڕاستی دڵنیام کە ئەو فەرامۆشم ناکات .

ئەوەبوو باوکی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی وت : ئەوا دەیدەمە دەستی تۆ ، بفەرموو بیدەبە جلیبیب ( اسحاق کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەبو تەلحە ) بە ثابت ی گوت: ئەزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چ دوعایەکی بۆ ئەو کچە کرد ؟

پرسی : چ دوعایەکی بۆ کرد ؟

وتی : ( اللهم صب عليها الخير صبا ولا تجعل عيشها كدا كدا ) واتە : ئەی پەروەردگار خێر و بێری بەسەردابرێژە و مەهێڵە ژیانی مەینەتی و کوێرەوەری بێت .

ثابت دەڵێت : ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کچەکەی لە جلیبیب مارە کرد ، وە لەیەکێ لە غەزاکانیدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی ؟ ( هل تفقدون من احد ؟ ) کەس هەیە دیار نەبێ و بەدوایدا بگەڕێن ؟

وتیان : فلان و فلان دیارنین .

دیسان فەرمووی : ( هل تفقدون من احد ؟ )

وتیان : فلان و فلان .

ئەمجارەش فەرمووی : ( هل تفقدون من احد ؟ )

وتیان : نەخێر ... ئیتر هەر ئەوانەی کەوتمان .

فەرمووی : ( ولكني افقد جليبيا فاطلبوه في القتلى ) بەلام من بەدوای جلیبیب دا دەگەڕێم لە ناو کوژاوەکاندا بۆی بگەڕێن .

گەڕان تا دۆزیانەوە لە نێوان حەوت کەسدا کەوتبوو کە کوشتبوونی و دواتر خۆیشی شەهید بوو بوو .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( هذا منی و انا منه ، اقتل سبعة ثم قتلوه ؟ هذا مني و انا منه ، اقتل سبعة ثم قتلوه ؟ هذا مني و انا منه ) .

دەفەرموێ : جلیبیب لە منە و منیش لە ئەوم ، حەوت کەسی کوشتووە و ئەوجا شەهیدکراوە ؟ ئەو لە منە و منیش لە ئەوم حەوت کەسی کوشتووە و دواتر شەهیدیان کردووە ؟ ، ئەو لە منە و منیش لە ئەوم .

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەڵیگرت و هاوەڵانیش گۆڕیان بۆ هەڵکەند .. ئەو جێیەکی نەبوو لەسەری داینێن بێجگە لە باڵەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەتا خستیانە ناو گۆڕەکەی .

ثابت دەڵێت : ئەوەبوو لەناو ئەنصاردا هیچ بێوەژنێك نەبوو لە بێوەژنەكەی جلیبیب بژیوتر [1] .

بەڕاستی ئەمە پیرۆزی و بەرەكەتی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەبەرەكەتی دوعای سەروەرە . ئەم چیرۆكە چەندین ئامۆژگاری وپەندی لە خۆگرتووە كە ئاشاررێنەوە ، لەوانە : -

ئاینی ئیسلام ( دین )ی پێش ماڵ و جوانی خستووە .. هەروەك لەم فەرموودەدا ( لأمة سوداء ذات دين أفضل ) واتە : كەنیزەكێكی ئەسمەری دیندار باشترە ، بەڵام ئەمە ، ئەوە ناگەیەنێت كە ئیسلام ماڵ و جوانی ڕەت دەكاتەوە ، نەخێر ، بەڵكو پێشوازی لە جوانی یەك دەكات پەیوەست بێ بەشەرعی پاكەوە و پێشوازی لە ماڵ و سامانێك دەكات كە لە خۆ بوردویی لەگەڵدا بێت .. وە ئیسلام هەرگیز دژی فیطرەتی مرۆڤایەتی نیە ، بەڵكو ئامانجی پەروەردە كردن و بژاردن و ڕاستكردنەوەی خواستەكانە ، و ستایش بۆ پەروەردگار ..

[1] – هیثمی دەڵێت : : لە ( صحيح ) دا هاتووە بە بێ باس كردنی داخوازی و زەواج : احمد ریوایەتی كردوە و پیاوانیشی پیاوانی ( صحيح )ن . المجمع بە ژمارە ( ١٥٩٧٧ ) .

# " ٤٧ - طفیل ی کوڕی عەمری دوسی ( رضي الله عنه ) "

# " خاوەنی ڕووناکی "

هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ی کردووە . گەورە و بەگوێکراو بوو و لە پیاو ماقوڵانی عەرەب بووە لە هۆزی دوس (دوس نەوەیەکن لە ( الازد ) .

(طفیل ) نازناوی ( خاوەنی ڕوناکی )ی بوو ، لە مەککە پێش هیجرەت موسڵمان بووە .

هشامی کوڕی الکلبی ، دەڵێت :

بۆیە طفیل ی کوڕی عمروی کوڕی طریف بە ( خاوەنی نور ) ناونرا ، چونکە جارێك بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! دو سیەکان زینایان لەناو بڵاو بۆتەوە ، لەبەر ئەوە دوعایان لیٚ بکە .

ئەویش فەرمووی : ( اللهم اهد دوساً ) ئەی پەروەردگار ڕێنموی دوسەکان بکە .

پاشان طفیل وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! بمنێرە بۆلایان و بەڵگەیەکیشم پیٚ بدە ، فەرمووی : ( اللهم نور لە ) پەروەردگارا ڕوناکی پیٚ بدە . ئەوە بوو لە نێوان چاوەکانیدا ڕوناکی یەك دەدرەوشایەوە ، طفیل وتی : ئەی پەروەردگار ئەترسم پێم بڵێن کەسێکی شێت و شێواوە ئەوەبوو ڕوناکی یەکە گوازرایەوە بۆ سەرێکی قامچی یەکەی و لە شەوی تاریکدا پرشنگی دەداو دەدرەوشایەوە ، لەبەر ئەوە ناونراوە ( خاوەنی ڕوناکی)[1] .

بانگخواز دەبیٚ بەو جۆرە بێت .. دوعا لە هۆزەکەی نەکات ، بەڵکو دوعایان بۆ بکات ... وەك چاولێکردن و شوێن پێهەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پەلەی هاتنی سزای نەبێت ، بەڵکو ڕێنموی وەرگرن .

هەروەك وتراوە : ( الابالصبر تبلغ ما ترید و بالتقوی یلین لك الحدید ) واتە : ئاگاداربە کە بە ئارامگرتن دەگەیت بەهەر شتیٚ بتەویٚ و بە لە خوا ترسان ئاسنت بۆ نەرم دەبێت .

ئەوجا طفیل چوو بۆ بانگەواز کردن لەناو هۆزەکەیدا و لەسەر دەستی ئەو خوای پەروەردگار هدایەتی دان ، ئەوە بوو کاتیٚ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کۆچی کرد بۆ مەدینە

---

[1] – ئیبنو عبدالبر لە ( الاستیعاب ) دا ڕیوایەتی کردوە ( ٥ / ٢٢٣ ) .

طفیل بە خۆی و ( ٩٠ ) خێزان لە ماڵەکانی دوس کە موسڵمان بوو بوون هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

طفیل ( ﷺ ) لە جەنگی ( یەمامە ) دا لەگەڵ موسڵماناندا ئامادە بوو لەگەڵ ( عەمری ) کوڕیدا لە خەونیدا وەك ئەوەی سەری تاشراو بێت و ژنێك دەیخاتە ناو دامێنیەوە [1]، کوڕەکەشی هەوڵی دەدا پێیدا بگاتەوە ، بەڵام نەگەیشت ..

یەکەمینی ئەوەی گەیاند کە ئەکوژرێت و سپاردە ئەکرێت و کوڕەکەشی سورە لەسەر شەهادەت ، بەڵام لە جەنگی ( یمامە ) دا بە دەستی ناهێنێت . وە هەروایش بوو طفیل شەهید بوو ، کوڕەکەیشی مایەوە تا لە ڕۆژی ( یەرموك )[2] دا شەهید بوو ( ﷺ ).

[1] – ئەو ئافرەتەی لە خەوەکەیدا بینیبووی زەوی یە .. وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە (( تحفظوا من الارض فنها امکم )) طبرانی گێڕویەیتەوە . واتە : پارێزگاری لە زەوی بکەن ، چونکە دایکتانە .

[2] – بڕوانە : البدایە والنهایە ( ٥ / ٤٥ ) .

## "٤٨ - خبیب ی كوڕی عدی ( رضي الله عنه )

## " ڕێز و شكۆمەندیی دۆستانی خودا "

ئەنصاریی شەهید ، داستانی قوربانیدان و خۆبەخت كردن و نیشانەی خەبات و فیداكاری .. خبیب ی كوڕی عدی .. ئای چەندە ئوممەتی ئیسلام ئاتاجی نمونەی وەك ( خبیب )ە لە ڕۆژگارێكدا دڵسۆزی تیا كەمبۆتەوە و خەڵكی باوەشیان بە دنیادا كردووە ... و خەبات لە پێناوی ئەم ئاینە پایەبەرزەدا كەم بۆتەوە .

خبیب ( رضي الله عنه ) لە جەنگی بەدر و ئوحود وەك پاڵەوان بەشداری كردووە ، چیرۆكی ڕۆژی ( الرجیع )یشی هەرگیز لەبیر ناكرێت .

ئەم چیرۆكە كامەیە ؟ سەرچاوەی چیرۆكی ( رجیع )[1] لەوەوە بوو ، نوێنەرانێك لە هۆزەكانی ( عضل و قارة ) هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و باسی ئەوەیان كرد كە دەنگ و هەواڵی ئیسلامیان پێ گەیشتووە و ئێستا پێویستیان بە پیاوانێكە لەو ئاینە شارەزایان كات و قورئانیان بۆ فێر بكەن ..

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ژمارەیەك لە بانگخوازانی لەگەڵدا ناردن بەسەركردایەتی (عاسم ی كوڕی ثابت ) و هەمووان بەڕێ كەوتن تا گەیشتنە نێوان ( عسفان ) و ( مەككە ) و نزیك ئاوەكانی ( هذیل ) لەوێ هاوەڵان هەستیانكرد كە وەفدەكە ناپاكی یان لەگەڵ كردوون و درۆیان كردووە ... ئەوە بوو دەستەكە هاواریان كردە هۆزی ( هذیل ) بەسەر هاوەڵانەوە .

هاوەڵانیش پەنایان بردە چەكەكانیان تا بكەونە شەڕ لەگەڵ ئەو ناپاكانە و ئەوانەش كە هاوكاری یان بوون لە هۆزی ( هذیل ) ، بەڵام شەڕكردنی چەند كەسێك كە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن لەگەڵ نزیكەی سەد تیرهاوێژدا كە هۆزەكەیانیان لە پشتەو هاوكاریان دەكەن چی بە چی دەگات ؟

لەبەر ئەوە زۆری نەبرد عاصم و هاوەڵەكانی كوژران و سێ كەسیان ناچار بوون خۆیان بدەن بە دەستەوە ئەوانیش ، خبیب و زیدی كوڕی الدثنة و عبدالله ی كوڕی طارق بوون . ئەوە بوو ( هذلي )یەكان كردنیان بە كۆیلە و بردنیان بۆ مەككە تا لەوێ بیانفرۆشن .

---

[1] - ڕووداوەكانی ئەم چیرۆكە دوای غەزای ( ئوحود ) لە ساڵی ( ٣ )ی كۆچیدا ڕوویدا .

ئەمەش مانای ئەوە بوو کە بیانخەنە ژێر دەستی ئەو پیاو کوژانەی لە مەلآسدا بوون بۆیان و چاوەڕێی هەلێکی وابوون ، چونکە ئەو چەند کەسە لەو هاوەڵانە بوون کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) لە جەنگی بەدرو ئوحود جەنگا بوون ، بۆیە ئەهلی مەککە دەیانویست تۆڵەیان لێ بکەنەوە و شیفای دڵیان بێت .[1]

با باسەکە بۆ پێشەوا ( بوخاری ) بە جێ بێڵین بزانین چۆن باسی چیرۆکەکەیان دەکات لە ئەبی هریرەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دە کەس لە هاوەڵانی نارد بۆ هێنانی هەواڵ و عاصم ی کوڕی ثابت ی کردە فەرمانڕەوایان ئەوان بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ( الهدە ) لە نێوان ( عسفان ) و ( مەککە ) کە جێگایەك بوو دەگەڕایەوە بۆ هۆزێ لە ( هذیل ) پێیان دەوترا ( بنولحیان ) . لەوێ نزیکەی سەد کەس لە تیرهاوێژانی ئەو هۆزە شوێن پێی هاوەڵانیان گرت تا لە جێیەکدا کە لێی دابەزیبوون پاشماوەی ناوکە خورمایان دیتەوە کە خوارد بوویان وتیان : خورمای یەثربە و بەو جۆرەشوێنیان کەوتن.

کاتێ عاصم و هاوەڵەکانی هەستیان پێ کردن ، پەنایان بردە بەرزاییەك ، بەلآم ئەوان دەورەیان لێ دان و پێیان وتن : دابەزن و هەرچی یەکتان پێیە تەسلیمان بکەن ، پەیمان و بەڵێنتان پێ ئەدەین کە هیچ کەسێکتان لێ نەکوژین .

عاصم ، فەرمووی : سەبارەت بە خۆم ، ناچمە ژێر باری ( سایە ) ی بێ باوەڕان ئەی پەروەردگارا هەواڵی ئێمە بگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت ... ئەوانیش تیربارانیان کردن ، عاصم و شەش کەسی کەیان لێ سشەهیدکردن ، ژمارەیەکیان چوونە ژێر پەیمان و بەڵێنەکەیان ئەوانیش ، خبیب و زەیدی کوڕی الدثنة و پیاوێکی تربوون[2]... بەلآم هەر ئەوەندەی ئەو سێ هاوەڵە چەکەکانیان دانا و و خۆیان دا بەدەستەوە دەست و پێیان بەستنەوە .

ئەوە بوو پیاوی سێیەم وتی : ئەمە سەرەتای ناپاکی یە ، سوێند بەخوا شوێنیان ناکەوم و لەگەڵتان نایەم هەروەك هاوەلآنم ( مەبەستی کوژراوەکانە ) .

ئەوانیش ڕایانکێشا بەدوای خۆیاندا ، بەلآم کاتێ خۆگری کرد لەوەی لەگەڵیاندا بڕوات و ڕێگەی پێ نەدان بیبەن ، شەهیدیان کرد ، ( خبیب و زەید )یان برد و لە مەککە فرۆشتنیان ئەوەبوو کوڕانی ( حارث ی کوڕی عامری کوڕی نوفل ) ( خبیب ) یان کڕی ،

---

[1] - بڕوانە : فقه السیرە / ی غەزالی ( ٢٩٤ ) .

[2] - عبدالله ی کوڕی تاریق بوو هەروەك لە ریوایە ' هاتووە .

خبیب ڕۆژی بەدر ( حارث ی کوڕی عامر )ی کوشتبوو ، ئەوە بوو بە بەندکراوی لایان مایەوە تا بڕیاری کوشتنیان دا ، ئەویش پێش جێبەجێ کردنی بڕیارەکە داوای گوێزانێکی لە یەکێ لە کچانی ( حارث ) کردبوو بۆ مو تاشین ئەویش پێی دا بوو دواتر ئافرەتە دەبینێ کوڕێکی بچوکی بە بێ ئاگای ئەم چووەتە لای ( خبیب ) و ئەبینێ لەسەر ڕانی دانیشتووە و ( خبیب )یش گوێزانەکەی بە دەستەوەیە ئافرەتەکە تۆقی و ( خبیب) بەمەی زانی و فەرمووی : ئەترسی بیکوژم ؟ ئەوە من نیم شتی وا بکەم .

ئەو ئافرەتە دەڵێت : سوێند بەخوا هیچ بەند کراوێکم نەدیوە باشتر لە ( خبیب ) ، سوێند بەخوا ڕۆژێکیان بینیم بۆلە ترێیەکی بە دەستەوە بوو دەیخوارد ، لە کاتێکدا دەستیشی بە ئاسن بەسترا بوو ، لە مەککەش ترێیەکی لێ نەبوو ، دەڵێت : ئەوە ڕۆزی یەك بوو لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بە ( خبیب ) درابوو . ئەو جا کە لە حەرەم هێنایانە دەرەوە تێبوکوژن لە دەرەوەی حەرەمدا ، خبیب وتی : بێڵن با دوورکات نوێژ بکەم ، ئەوانیش وازیان لێ هێنا تا دوو ڕکاتە نوێژەکەی کرد و فەرمووی : سوێند بە خوا لە بەر ئەوە نەبوایە کە پێم بڵێن لە مردن ئەترسێت بەردەوام دەبووم لە نوێژ کردندا ، ئەی پەروەردگار هەموویان بە ژمارە ئامارکە و وە یەکەیەکە بە پەرتەوازەیی بیانکوژە و هیچ کەسیان لێ مەهێڵە ، فەرمووی :

و لست أبا لي حين اقتل مسلماً     على أي جنب كان في الله مصرعي

و ذلك في ذات الاله و ان يشأ     يبارك على أوصال شلو ممزق [1]

ئەوجا ( ابو سروعە عقبەی کوڕی حارث ) هەڵسا کوشتی .

بەو جۆرە ( خبیب ) ئەو کەسە بوو سوننەتی ئەنجامدانی دوورکات نوێژی بۆ موسڵمانان دامەزراند لە کاتێکدا بە بەستراوەیی بکوژرێت .

دواتر ( ابو سروعە ) موسڵمان بوو ، فەرمودەیشی لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) گێڕاوەتەوە . وە خودای پەروەردگار دوعاکەی ( عاصم )ی گیرا کردوو هەواڵی ئەوانی گەیاندە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

---

[1] - ماناکەی / گرنگ نیە بەلامەوە کاتێ بە موسڵمانی دەکوژرێم بە هەر بارێك و لە هەر لایەکەوە بێت لە پێناو خوادایە ، ئەمەش ئەگەر خوای پەروەردگار ویستی لەسەر بێ ئەو پارچە پارچە کراوانە ی لەشم پیرۆز دەکات .

سعیدی کوڕی عامر دەڵێت : ئاگاداری کوشتنی ( خبیب ) بووم ، قورەیش گۆشتی لەشی پارچە پارچە بریبوو ، ئەوجا لەسەر تەختەیەك هەڵیان گرت و وتیان : ئایا حەز ئەکەیت ( ﷺ ) لە جێی تۆدا بوایە ؟فەرمووی : سوێند بەخوا حەزناکەم من لەناو ماڵ و ئەهلی خۆمدا بم و دڕکی لەپێ پێغەمبەر ( ﷺ ) بچەقێ .[1]

لە ابراهیمی کوڕی اسماعیلەوە ، دەڵێت : جعفری کوڕی امیە لە باوکیەوە هەواڵی پێدام ، کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )بە تەنها ناردمی وەك هەواڵدەرێك بەسەر قورەیشەوە .

دەڵێت : منیش هاتم بۆلای ئەو تەختەیەی ( خبیب ) ی لەسەر دانرا بوو ، هەر ئەملاو لایشم دەکرد نەبا کەسێ بمبینێ ، ئەوجا هەلزنام پیایدا و ( خبیب )م لە قەیدەکانی کردەوە ، دەبینم کەوتە سەر زەوی ، بۆ ساتێك روم لێ وەرگێراو چومە ئەو لاتر تابزانم کەس دیار نیە ، ئاوڕم دایەوە دەبینم ( خبیب ) نەماوە وەك ئەوەی زەوی قوتی دئەبوت .. هەتا ئەم سەعاتەش کە بۆتی دەگێڕمەوە ( خبیب ) ( ڕەزای خوای لێ بێت) نەبینراوەتەوە و شوێنەواری دیار نیە .[2]

---

[1] – بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٣١٥ ) .

[2] – هەمان سەرچاوە .

# " ٤٩ - زیدی کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) "

## " تۆ چۆن شەهادەتت ئەوێ منیش هەروا ئەمەوێ "

ئەزانن کێ یە ؟ ناوەکە لەبەرکەن ، چونکە مرۆڤ لەگەڵ ئەوکەسدا حەشر ئەکرێ کە خۆشی ویستووە ..

### " زیدی کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) "

سەروەری شەهید و خەباتکاری لە خواترس ، ابو عبدالرحمن ی قورەیشی عەدوی یە ، برای پێشەوای موسڵمانان عمری کوڕی خەتابە .

وە لە عمر گەورەترە و پێش ئەویش موسڵمان بووە . کەسێکی ئەسمەری باڵابەرز بووە ، لەبەدر و غەزاکانی تریشدا ئامادە بووە .

پێشەوا ( عمر ) ڕۆژی بەدر پێی وت : سپەرەکەی من لەبەرکە . ئەویش وتی : منیش وەك تۆ شەهادەتم ئەوێ .

دەڵێت : ئەو جا کەسیان لەبەریان نەکرد و وازیان لێ هێنا .

زەیدی کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) ڕۆژی ( یمامە ) ئاڵای موسڵمانانی هەڵگرتبوو ئەوەبوو موسڵمانان کەوتنە دەستی کافرانەوە تا ( بنو حنیفە ) لە جەولەیەکی شەڕەکەدا دایان بەسەر چادرگەکە ...

زەیدیش بەو عەرەبە دەشتەکی یانەی ناو موسڵمانان کە هەڵاتبوون دەوت : بۆ کوێ هەڵدێن و پاشان بە هەموو دەنگی هاواری کرد : چادرگە بە جێ مەهێڵن و هەڵمەێن . ئەی خوای پەروەردگار من داوای لێ بووردنت لێ ئەکەم لە هەڵاتنی هاوەڵەکانم وە بێ بەریم لەوەی ( مسلیمە ) کردوویەتی و هێناویەتی ، ئەوجا بەوپەڕی توانای ڕوبەڕوی دوژمنانی خوا وەستا و شمشێرەکەی بۆ خستە کار شەهید بوو و ئاڵاکەی کەوت ، ئەوجا ( سالم ی مەولای ئەبو حذیفة )[1] هەڵیگرت ئەوجا موسڵمانان وتیان : ئەی سالم ئەترسین

---

[1] - پێشتر باسی ژیانی کراوە ( رضي الله عنه ) .

لەولایەی تۆوە بێن بۆمان ئەویش فەرمووی : ( ئەگەر وئەبو و لەو لایەی من پارێزگاری لیّ ئەکەم بێن بۆتان ، ئەوا خراپترین هەڵگری قورئان منم ) .[1]

عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) زۆر خەفەتی بە شەهید بوونی براکەی دەخوارد و لە یادی دەرنە ئەچوو .. سۆز و عەتفی بۆی زۆر بوو ... هەمیشە ئەیفەرموو : پێش من موسڵمان بوو ، وە پێش منیش شەهید بوو . هەروەها ئەیفەرموو : هەرکە شنەی با هەڵدەکات بۆنی زەیدی لیّ ئەکەم[2]...

( ڕەزای خوایان لیّ بێت )

[1] – بروانە : صفة الصفوة ( ١ / ٢٣٢ ) .

[2] – بروانە / سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٢٩٨ ) .

# " ٥٠ - ثابتی کوڕی قیس ( رضي الله عنه ) "

## " وتاربێژی پشتیوانان "

لەو پشتیوانانەیە کە دڵدە و پشتیوانی یان لە موسڵمانان کرد .. و شوێن ئەو ڕوناکی یە کەوتن کە بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دابەزی ..

وتاربێژی ئەنصارە ... و یەکێکە لە هاوەڵە نەجیبزادەکان ، لەبەدردا بەشدار نەبووە ، بەڵام لە ئوحود و بەیعەتی ( رضوان ) دا ئامادە بووە .

ثابت ( رضي الله عنه ) دەنگێکی بڵندی هەبوو ، وتاربێژێکی ڕەوانبێژ بوو ، کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتە مەدینە ثابت پێی وت : ئەگەر خۆمان و ماڵ و منداڵمان لە هەرچی بپارێزین ئێوەشی لێ بپارێزین ، لە بەرامبەردا پاداشتی ئێمە چی یە ؟ فەرمووی ( الجنه ) بەهەشتە ... ئەوانیش وتیان : ڕازی بووین .[1]

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز زۆر کاریگەر بوون لەسەر ثابت ... هەمیشە حاڵ و قسەکانی خۆی بە ترازوی پاکی شەرع دەپێوا .. حەزی دەکرد لە هەموو شتێکیدا ڕەببانی بێت . لە ( انس ی کوڕی مالك ) هوە ، دەڵێت : کاتێ ئایەتی ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ... ﴾ سورة الحجرات ، آية ٢[2] . دابەزی ، ثابت لە ماڵ دانیشت و دەیووت : من لە ئەهلی ئاگرم . وە خۆی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دوور ئەگرت تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە سەعدی کوڕی معاذ ( رضي الله عنه ) هەواڵی پرسی ، فەرمووی : ﴿ يا ابا عمرو ، ما شأن ثابت ؟ اشتكى ؟ ﴾ .

فەرمووی : ئەی ئەبا عەمر ، ثابت چیەتی ؟ نەخۆشە ؟

سعد فەرمووی : لەڕاستیدا دراوسێمە و نەمبیستووە نەخۆش بێت .

دەڵێت : ئەوەبوو سعد چوو بۆلای ثابت و پێی وت کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵی پرسیوە (ثابت )یش ( رضي الله عنه ) فەرمووی : ئەو ئایەتە دابەزیوە ... منیش ئەمزانی لە

---

[1] – حاکم ریوایەتی کردوە ( ٣ / ٢٣٤ ) و دەڵێت : اسنادەکەی ( صحیح )ە و زەهەبیش هاوڕایە .

[2] – مانای ئایەتەکە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەرزمەکەنەوە لە کاتی گفتوگودا ، قسە بێ پەردەمەکەن لە خزمەتیدا ، وەکو بۆ یەکتری دەکەن ، نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوە هەستیی پێ نەکەن .

هەمووتان زیاتر دەنگم بەسەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بڵندە ، بێ گومان من لە ئەهلی ئاگرم . ( سعد )یش ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گێڕایەوە ، فەرمووی : ( بل هو من اهل الجنه )[1] بەڵكو ئەو لە ئەهلی بەهەشتە ...

جارێكی تر و لە كاتی دابەزینی ئایەتی : ﴿لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا وَّيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾سورة آل عمران، آية (١٨٨).

واتە : واگومان مەبە بەوانەی دڵخۆشن بەوەی كە هەیانە و حەزدەكەن باس بكرێن و خەڵكی سوپاسیان بكات لەسەر كاروچاكەیەك كە نەیانكردووە ، هەرگیز وامەزانە ئەوانە لە دەست سزا ڕزگاریان دەبێت ، بەڵكو سزایەكی بە ئێش چاوەڕێیانە ... ثابت كەوتە خەفەتخواردن و باری دەرونی گران بوو ، لە حاڵی خۆی دەترسا كەبەرەو هەلاكەتی بەرێت .. بۆیە بەپەلە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پێی وت : زۆر ئەترسم لەوەی بەهەلاكەت بچم ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پەروەردگار ڕێگریمان لێ دەكات لەوەی حەزبكەین سوپاس بكرێن لەسەر شتێك كە نەمانكردووە ، بەلاَم من حەزم لە سوپاسكردنە .

هەروەها پەروەردگار ڕقی لە خۆبادان و خۆبە گەورە زانینە و ڕێگریمان لێ دەكات وەئەبون ، بەلاَم من كەسێكم حەزم لە جوانی یە ، هەروەك ڕێگریمان لێ ئەكات دەنگمان بەسەر دەنگتدا بەرز بكەینەوە ، بەلاَم من پیاوێكی دەنگ بەرزم ئەویش فەرمووی : ( یا ثابت ! اما ترضی ان تعیش حمیداً ، و تقتل شهیدا ، و تدخل الجنة )[2]

فەرمووی : ئەی ثابت ! ئایا ڕازی نیت بەوەی بە سوپاسكراوی بژیت و بە شەهیدی بكوژرێیت و بچیتە بەهەشتەوە .

بەڵێ ، بەرێزان ئەوان بەو جۆرە بوون لەگەڵ ئیسلامەكەیاندا ... هەر ئەو دڵسۆزی و خۆشەویستی یە یان بۆ ئاینەكەیان ئەو عیززەت و هێز و خێرەی پێدان كە بەهۆیانەوە بوونە گەورە و شكۆمەندی سەرزەوی و چەندین ئوممەتیان پێشڕەوی كرد .

بەلاَم كاتێ موسڵمانان لەم چاخانەی دواییدا لە ئاینەكەیان دواكەوتن .. ئەمە وای كرد تاوان و گوناه نەوەیەكی لاواز دەربدات كەلای ئاسایی یە ڕێز و كەرامەتی خۆی بەسەر سینی یەكی ئاڵتونینەوە پێشكەشی دوژمنەكەی بكات .

---

[1] – صحیح / مسلم ریوایەتی كردوە ( ١١٩ ) .

[2] – سەنەدەكی بەهێزە ، بەلاَم ( مرسل )ە هەروەك حافظ لە ( الفتح ) دا ( ٦ / ٦٢١ ) . باسی كردووە .

## " ثابت لەسەر مەیدانی جەنگ کفن دەپۆشێت !! "

کاتێ پێشەوا ئەبوبەکر ( ﷺ ) بانگی موسڵمانانی کرد بۆ شەڕ کردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان و ئەهلی یەمامە و موسەیلەمەدا ، (ثابت ) یش لەگەڵیاندا دەرچوو ، ئەوە بوو کاتێ بە ( مسیلمە و بنی حنیفە ) گەیشتن ، سێ جار شکستیان بە موسڵمانان هێنا ، ئەوجا (ثابت ) و ( سالمی مەولای ئەبو حوزیفە وتیان : ئەوسا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووین ، کەی وا شەڕمان دەکرد ، هەڵسان چاڵێکیان بۆ خۆیان هەڵکەند و چوونە ناوی و شەڕیان کرد شەهیدکران .

وە لە ( انس ) ەوە ، دەڵێت : ثابتی کوڕی قیس ی کوڕی شماس ڕۆژی یمامە هات کفنەکەی ڕاخست و خۆی بۆنخۆشی کردو و فەرمووی : ئەی خوای پەروەردگار بێ بەریم لەوەی ئەمانە هێناویانە ( واتە موسەیلەمە و هاوەڵانی ) و داوای لێبوردن و لێخۆش بوونیشت لێ ئەکەم لەوەی ئەمانە کردیان واتە هەڵاتن ، ئەوجا شەهید کرا . [1]

بەو جۆرە ئەو پاڵەوانە شەهادەتی بەدەست هێناو ڕۆحە پاکەکەی بەرەو جیهانی بەرزەخی باڵا کەوتەڕێ تا لەناو ڕووبارەکانی بەهەشتدا بحەوێتەوە و لە کەنار چرا هەڵواسراوەکانی عەرشی خوادا دا لانە دروست بکات .

هەروەها تاوەکو بکات بەو قافڵە موبارەکەی هەموو شتێکی خۆی پێشکەشی پەروەردگاری کرد و ئەو شەرەفمەندی یەی بەدەست هێناو ئەو نیشانەی لە سەینگدا : ﴿إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُمْ مَشْكُورًا ﴾ سورة الانسان ، آية (٢٢) .

واتە : بەڕاستی ئەم پاداشتە شایستەی ئێوەیە ، هەوڵ و کۆشش و کارو کردەوەی ئێوە شایانی سوپاس و ڕێزە ...

## " ویژدانێکی زیندوو تەنانەت دوای مردنیش !! "

بەڕاستی سەر سوڕهێنەرە .. ئایا گوێتان لێ بووە کەسێك دوای مردنی وەسیەت بەدانەوەی قەرزەکەی بکات ؟!! و پاشتر وەسیەتەکەشی جێبەجێ بکرێت ؟! هەروەها ئاماژە بەجێگای سپەرێکی دزراوی بکات ؟!!

---

[1] – هیثمی دەڵێت : طبرانی گێڕاویەتەوە ، پیاونیشی پیاوانی ( الصحیح ) ن . المجمع ( ١٥٧٦٤ ) .

بخوێنەرەوە : – دوای شەهید بوونی ( ثابت ) ( ﷛ ) ، پیاوێك لە خەویدا ثابتی بینـی پێـی وت : ( کـاتێ کـوژرام ، پیـاوێ لـە موسـڵمانان ( درع )ەکـەی لـێ کردمـەوە و شاردیەوە و برێك بەردی لەسەر دانا و کۆپانێکیشی بەسەردا دا ، برۆ بۆلای پێشەوای ئیمانداران و ئەم هەواڵەی پێ بدە نەکەی بڵێی : ئەمە خەونە و گوێی پێ نەدەی ، وە ئەگـەر هاتیتـە مەدینـە ، بـە جێنـشینی پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) بڵـێ کـەمن ئەوەنـدە و ئەوەندە قەرزم بەسەرەوەیە و فلان کەسی غولامیشم ئازادکە ، نەکەی بڵێی ئەمە خەونە و گـوێ پـێ نـەدەی ، پیاوەکـەش هـات بـۆلای خەلیفـە و هەواڵەکـەی پێـدا ، ئـەویش ڕاسپاردەکەی جێبەجێ کرد !!

عبدالرحمن ی کوڕی یەزیـدی کوڕی جابر کە ڕاوی سـەرگوشتەکەی پێشووە ، دەڵێـت : ( نەمانبینیوە و ئاگادار نین لـەوەی کەسێك پاش مردنی وەسیەتی کردبێت و بۆیشی جێبەجێ کرئەبوت ، جگە لە ( ثابتی کوڕی قیس ) ڕەزای خوای لەسەر بێت .[1]

وە لە ڕیوایـەتێکی دیکـەدا هـاتووە : گـەڕاون دەبینن ( درع )ەکـەی هـەر لـەو جێیە کەوتبووی و ئەوجا وەسیەتەکەیشی جێبەجێ کرا بوو .[2] ئەمەش بەڕاستی ڕێز و پلەیەکی گەورەیە بۆ ئەم هاوەڵە موبارەکە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) .

---

[1] – هیثمی دەڵێت : طبرانی گێراویەتەوە ، لەناویاندا کچەکەی ثابت کوڕی قیس هەیە کە نەمناسـیوە ، و باقی پیـاوانی فەرموودەکـە جـێ متمانـەن . المجمـع ( ٩ / ٣٢٢ ) . بوصـیری دەڵێـت : سەرچـاوەکەی لـە (صحیح ی بوخاری ) دا هەیە .

[2] – حاکم ڕیوایەتی کردوە و دەڵێت : صحیح و زەهەبیش هاوڕایە . ( ٣ / ٢٣٤ – ٢٣٥ ) .

# " ٥١ - عباسی کوڕی عبدالمطلب ( رضي الله عنه ) "

## " ئەوەی ئازاری عباس بدات ئەوە ئازاری منی کردووە "

مامی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) ، ... پێش هیجرەت موسڵمان بووە و ئیسلامبوونی خۆی شاردوەتەوە ، لە ڕۆژی بەدردا لەگەڵ هۆزەکەیدا چۆتە دەرەوە و لەلایەن موسڵمانانەوە دیل کراوە و وتویەتی کە موسڵمان بووە ، خوایش باشتر دەزانێ .

عباس ( رضي الله عنه ) یەکێ نەبووە لەوانەی کەپێیان دەوتن ( الطلقاء ) واتە : ئازاد کراوان ، چونکە پێش ڕزگار کردنی مەککە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمتا دالدەی ( ئەبو سفیانی کوڕی حرب )یشی داوە ..

زەهەبی دەڵێت : بالآی زۆر بەرزبووە ، جوان وچاك و مەزن و دەنگ بڵند بووە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هێمن و بەریقار بووە .. پاریزگاری لە دراوسێ کردووە و ماڵی بەخشیوە و لەکاتی سەختەتی و نەهاتەکاندا دەستی یارمەتی درێژ کردووە . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زۆر خۆشی ویستووە .

لە ابن عباسەوە : پیاوێك لە پشتیوانان کەوتە ناو لەوەرگایەکی عباس لە جاهلیەتدا ، عباسیش زللەیەکی لێ دا ، هۆز و عەشیرەتی ئەو پیاوە هاتن وتیان سوێند بەخوا دەبێ زللەکەی لێ بدەینەوە ، چەکیان هەڵگرت ، ئەمەش بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت ، چوە سەر بڵندگۆ و فەرمووی : ( أيها الناس ، أي اهلى الارض اكرم على الله ؟ )

( ئەی خەڵکینە ، کام کەسی سەر ئەم زەویە لەلای خوا لە هەمووان بەڕێزترە ؟ وتیان : تۆ ، فەرمووی : ( فإن العباس مني و أنا منه ، ولا تسبوا أمواتنا فتؤذوا أحياءنا ) واتە : دەی عباس لە منە و مینش لە ئەوم ، نەکەن جنێو بە مردوانمان بدەن ، چونکە ئەمە ئازاری زیندوەکانمان دەدات .

قەومەکە هاتن و وتیان : پەنا ئەگرین بەخودا لە توڕە بوونت ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .[1] وە ڕۆژێك عباس هات ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( هذا العباس عم

[1] - سەنەدەکی ( حسن )ە : حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٣٢٩ ) دەڵێ : ( صحيح الاسناد ) و زەهەبیش هاوڕایە .

نبيكم أجود قريش كفاً و أوصلها ) . [1] واته : ئەمە ( عباس ) ە مامی پێغەمبەرەکەتانە ، لەناو قورەیشدا لە هەمووان بەخشندە ترە و یارمەتیدەر ترە ..

## " هەڵوێستی لە ڕۆژی ( بەیعەتی عەقەبەدا ) "

لە ( اشجعی )یەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عباسی لەگەڵ خۆی برد ، عباس کەسێکی خاوەن بیر و بۆچونی باش بوو .. ئەوەبوو عباس بە حەفتا کەسەکەی بەیعەتی عەقەبەی فەرموو : بانوێنەرتان قسە بکات و درێژەی پێ نەدات ، چونکە چاو دێری ئەکرێن قورەیش سیخوڕی لەسەر داناون .

اسعدی کوڕی زرارە ش فەرموی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، هەرچیەکت لە ئێمە ئەوێ لەبۆ خوا ئەنجامی بدەین داوای بکە ، هەروەها هەرچیەکیشت ئەوێ بۆ خۆت و هاوەڵانت لە ئێمە ، داوای بکە ، پاشان لەبری ئەوە پێمان بڵێ کە چیمان بەسەر خوداو ئێوەوە هەیە .

پێغەمبەری خوا( ﷺ ) فەرمووی : ( أسألكم لربي ان تعبدوه ، و لا تشركوا به شـ ـيئاً ، و أسألكم لنفسي و أصحئابو أن تؤوونا ، وتنصرونا ، و تمنعونا ماتمعنون منه انفسكم )

واتە : ئەوەی ئەمەوێ بۆ خوا ئەنجامی بدەن ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن ، وە ئەوەشی بۆ خۆم و هاوەڵانم لە ئێوەم دەوێ ، ئەوەیە کە داڵدەمان بدەن و پشتگیریمان لێ بکەن و بمانپارێزن لە هەرشتێ خۆتانی لێ دەپارێزن .. وتیان : ئەی کەوامان کرد پاداشتمان چی یە ؟ فەرمووی : بەهەشتە . وتیان : ڕازین [2].

## " بەدیل گرتنی لە ڕۆژی بەدردا "

عباس ڕۆژی بەدر هاوڕێ لەگەڵ بێ باوەڕاندا بەناچاری هاتەدەر ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوەڵانی ڕاسپارد بوو کە نەیکوژن ( هەروەك لە باسی ژیانی ئەبو حذیفەی کوڕی عتبەدا باسمان کرد ) .

---

[1] – حاکم ریوایەتی کردووە ( ۳ / ۳۲۸ ) . دەڵێت : ( صحيح )ە و زەهەبیش هاوڕایە .

[2] – ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٤ / ٩ ) پیاوانی جێ متمانەن ، بەڵام بە بچڕبچڕی هاتووە .

ابو الليسر دەڵێت : ڕۆژی بەدر سەیری عباسم کرد ، ئەبینم وەك بت وەستاوە و فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارێ .. پێم وت : خوا خۆی بداتەوە بۆ چ خزمێکی خراپ بووی ! شەڕ لەدژی برازاکەت ئەکەیت لەگەڵ دوژمنەکەیدا ؟

وتی : چی ئەکات[1] ، کوژراوە ؟

وتم : خوا زۆر لەوە بالادەست تر و پارێزەرترە بۆی .

وتی : چیت لێم ئەوێ ؟

وتم : بەدیل بتگرم ، چونکە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێگری لێ کردوین کە بتکوژین .

وتی : ئەمە یەکەمین چاکەی نەبووە . منیش : بە دیلم گرت و پاشان هێنام بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) [2] . پێغەمبەر ( ﷺ ) بە ( ئەبو الليسر ) ی فەرموو : ( كيف اسرته ؟ ) چۆن دیلت کرد ؟وتی : پیاوێك بۆ دیل کردنی هاوکاری کردم کە هەرگیز چاوم پێ نەکەوتبوو ، شێوەی وەهاو وەها بوو .

فەرمووی : ( ئەوە فریشتەیەکی بەڕێز بووە هاوکاری کردوویت) [3].

کاتێ عباس دیل کرا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوەندە سۆز و عەتفی بۆی هەبوو ، خەوی لێ نەئەکەوت ؟

لە ( ابن عباس )ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەوی بەسەردا هات و بەندکراوەکان بە بەستراوەیی مابوونەوە ، ئەوەبوو سەرەتای شەو هەربەخەبەر بوو .. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، لەبەر چی ناخەویت ؟

فەرمووی : ( سمعت انين عمى فى وثاقه) گوێم لە ناڵەو نکەی مامم بوو بە بەستراوەیی .

هاوەڵان چوون دەست و پێی ( عباس ) یان کردەوە ، ئەویش بێ دەنگ بوو ، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خەوی لێ کەوت [4] .

هەروەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەرگەی نەئەگرت گوێی لە کەسێکەوە بێت ئازاری عباس بدات .

---

[1] – واتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چۆنە ، ماوە ؟

[2] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٤ / ١٢ ) .

[3] – فەرموودەکە : (لقد اعانك عليه ملك كريم ) هەمان سەرچاوە .

[4] – هەمان سەرچاوە .

ئەوەتە لە ( مطلب ی کوڕی ربیعه )وە ، دەڵێت پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( مابال رحال یؤذونني في العباس ، و إن عم الرجل صنو ئقبوه ، من أذی العباس فقـد أذاني )[1]. واتە : پیاوانێك چیانە بە ئازاردانی عباس ئازارم ئەدەن ، ئەی نازانن مامی مرۆڤ ، برای باوکیەتی ، ئەوەی ئازاری عباس بدات ئەوە ئازاری منی داوە .

## " ڕێز لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ( ئەبو رزین )ەوە ، دەڵێت : بە ( عباس )یان وت : تۆ گەورەیت یان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ فەرمووی : ئەو لە من گەورەترە و من پێش ئەو لە دایك بووم[2]. ئەمەش ( عباس ) ( ﷺ ) نەبوو بەتەنها ، بەڵکو هەموو هاوەڵان لەم ڕێزەدا بەشدارن ، بەڵکو پیاو چاکان بەگشتی ...

گوێ بگرە خوێنەری بەڕێز بۆ ئەم گفتوگۆیە : ( هاتووە کە عمر ( ﷺ ) هەڵساوە ئاوەڕۆیەکی عباسی هەڵکەندوە و لایبردووە کەلەسەر ڕێرەوی خەڵك بووە .

عباسیش پێی وتووە : شایەتم کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆی لەویدا ئەو ئاوەڕۆیەی دانا .. عمریش ( ﷺ ) سوێندی عباسی دا و وتی : ئەبێ لە جێی خۆی داینێیتەوە[3].

## " جێگیریی لە ڕۆژی ( حنین ) دا "

کاتێ موسڵمانان هەڵهاتن و رایان کرد لە ڕۆژی ( حنین ) دا .. و پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە ، فەرمانی کرد بە عباس کە هاواریان لێ بکات بڵێ ( یا اصحاب الشجره ) واتە : ئەی ئەوانەی بەیعەتتان دا لە ژێردارەکەدا .. وە ( ﷺ )لەکاتی شکستدا بە خۆگری مایەوە و ڕەشوەی هێسترەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی گرت هەتا سەرکەوتنی خوایی هاتە پێش[4].

---

[1] – تیرمیزی لە ( المناقب ) ( ٣٧٥٨ ) باسی کردووە ، دەڵێت : فەرموودەی ( حسن صحیح )ە .

[2] – هیثمی لە ( المجمع ) ( ٩ / ٢٧٠ ) دا دەڵێت : گبرانی ریوایەتی کردوە و پیاوانی فەرموودەکە ئەوانەی ( الصحیح )ن .

[3] – سەنەدەکی ( حسن )ە : احمد دەری هێناوە ( ١ / ٢١٠ ) .

[4] – صحیح : سەرچاوەکەی لە ( صحیح )ی مسلم ( ١٧٧٥ ) وەرگیراوە لە ( الجهاد ) بای ( غەزای حنین )

## " داوایەکی وەڵام دراو "

لە ( انس )ەوە ، عمری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) کاتێ بێ بارانی و نەبوونی هاتە پێش داوای بارانی لە پەروەردگار ئەکرد لەڕێی ( عباس )ی کوڕی عبدالطلب ) ەوە (رضي الله عنه) و دەیفەرموو : ئەی پەروەردگار ئێمە ئەوسا بە هۆی پێغەمبەرەکەتەوە ( ﷺ ) لێت ئەپاڕاینەوە ، تۆش بارانت بۆ ئەباراندین وە ئێستاش بەهۆی مامی پێغەمبەرەکەمانەوە، لێت دەپاڕێینەوە دەسا بارانی ڕەحمەتمان بۆ داببارێنە ، دەڵێت : خوای پەروەردگار داواکەی وەڵام دەدایەو و بارانی باراند [1].

خافظ لە ( الفتح )دا دەڵێت : زبێری کوڕی بکار لە ( الانساب ) دا ئەو سیفەتەی بەیان کردووە کە لەم ڕووداوەدا چۆن ( عباس ) داوای کردووە ، لەگەڵ ئەوکاتەشدا کە ڕووداوەکەی تیا ڕووداوە ، ئەوەتە بە ئیسنادێکی خۆی دەڵێت :

عباس ( رضي الله عنه ) کاتێ ( عمر ) ( رضي الله عنه ) داوای بارانی لە پەروەردگار کرد بە هۆیەوە ، عباس فەرموی : ( ئەی پەروەردگار .. بێ گومان کە بەڵایەك دانەبەزیوە بەهۆی تاوانێکەوە نەبوو بێت ، وە هەڵیشنەگیراوە بە گەڕانەوە بۆلای تۆنەبێت ، وە ئەم خەڵکە ڕوویان لە من کردووە تا داوات لێ بکەم بە هۆی ئەو پلەو پایەی هەمبوو لەلای پێغەمبەرەکەت ، وە ئەمە دەستەکانمانە لێوان لە تاوان بەرزی دەکەینەوە بۆت ، وە ئەمەش چارەنووس و نێو چەوانمانە کە لە دەستی زاتی تۆدایە و بە تەوبە و گەڕانەوە ڕووت تێ دەکەین ، دەسا بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنە ) .

ئەو جا ئاسمان چڕ بوو لە هەور و بارانی ڕەحمەت داباری بۆ خەڵکەکە ... ئەمەش ساڵی بێ بارانیەکە بوو لە ( ١٨ )ی کۆچیدا ..

## " بۆ ماڵی ئاخیرەت "

کاتێ ئەجەلی ( عباس ) نزیك بوویەوە و پێش ئەوەی وەفات بکات ( ٧٠ ) بەندەی ئازاد کرد . وە کاتی وەفاتی کرد ( رضي الله عنه ) .. عائشەی کچی سعد دەڵێت : پەیامنێری پێشەوا ( عوسمان ) هات بۆلامان لە کاتێکدا ئێمە لەماڵەکەماندا بووین کە نزیکەی دەمیل لە مەدینە دوور بوو ، پێی ڕاگەیاندین کە ( عباس ) وەفاتی کردووە .

---

[1] - صحیح : بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( ٢ / ٤١٣ ) لە ( الاستشهاد )دا .

ئینجا باوکم و سعیدی کوڕی زەید و ئەبو هریرة شەو بەڕێکەوتن . و پاش ڕۆژێك باوکم هاتەوە و وتی : نەمانتوانی لە تەرمەکەی نزیك بینەوە بە هۆی زۆری خەڵکەکەوە ، حەزم ئەکرد خۆم هەڵیگرم [1]... وە ابن سعد لە ( الطبقات ) دا ( ٤ / ٣٢ ) دەڵێت : کە عباس ( رضي الله عنه ) لە بقیع سپاردە کراوە .

[1] - ئیبنو سعد ڕیوایەتی کردووە ( ٤ / ٣٢ ) .

# " ٥٢ - حارثە ی کوڕی نعمان "

## " لەبەهەشتدا قورئان دەور دەکاتەوە !! "

ئەم ناوە باش لەبەرکەن : (حارثە ی کوڕی نعمان ) ، چونکە بەناوهێنانی بەزەیی خوایی دادەبەزێت .. ئەم بەرێزە هاوەڵێکی ئەنصاری خەزرەجی یە ...

لەبەدر و غەزاکانی تریشدا بەشدار بووە . دیندارێکی باش و کەسێکی زۆر چاکەکار بووە بۆ دایکی . وە ئەم هاوەڵە ( رضي الله عنه ) تا جێنشینایەتی معاویە ژیاوە . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گوێی لێ بووە کە لە بەهەشتدا دەوری قورئانی کردوەتەوە !! و بە دەنگی زوڵاڵ خوێندوویەتی ..

لە عائشەوە (رضي الله عنها ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( و دخلت الجنة سمعت فيها قرأة ، قلت : من هذا ؟ قالوا : حارثه بن النعمان كذاكم البر ، كذاكم البر ) . دەفەرمووێ: چوومە بەهەشت ، لەوێ گوێم لە خوێندنی قورئان بوو ، پرسیم : ئەمە کێ یە ؟ وتیان : حارثە ی کوڕی نعمانە ، ئائەوە چاکەیە .. ئائەوە چاکەیە .. ) وە ئەو لەگەڵ دایکی چاکەکار بوو [1] .

بەڕاستی ئەمە ڕێز و پلەیەکی زۆر گەورەیە .. خوای پەروەردگار بۆ هەر کەس ویستی لەسەر بێ منەت و چاکەی خۆی دادەبارێنێ ..

هەروەها ڕێز و پلەیەکی گەورەی دیکەش هەیە کە تەنها ( المقربون ) : ئەوانەی زۆر لە خودا نزیکن و خۆشی دەوێن بە دەستی دەهێنن .

حارثە (رضي الله عنه ) خۆی ئەم پلە و ڕێزە مان بۆ دەگێڕێتەوە ، دەفەرمووی : (جبریلم لە تەمەنمدا دووجار بینیوە : جارێ یەکەم لە ( الصورين ) [2] ، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ ) چوەدەرەوە بۆ غەزای بنی قريظة ، جبريل ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) لەسەر وێنەی (دحیە) [3] بەلاماندا ڕۆیشت و فەرمانی پێ کردین خۆمان ببەستینەوە و چەك هەڵگرین .

---

[1] – هیثمی دەڵێت : احمد و ابو يعلى ریوایەتیان کردوە ، پیاوانی فەرموودەکە ئەوانەی ( الصحيح )ن . المجمع ( ١٥٧٣٦ ) .

[2] – الصورين : جێگایەکە دەکەوێتە ( بقيع ) لەشاری مەدینە.

[3] – دەحیەی کلبی / هاوەڵێکی بەرێز و جوانچاکە . جبريل ( عليه السلام ) لە شێوەیدا خۆی دەرخست.

جاری دووەم ڕۆژی دانان و شوێنی جەنازەكان كە لە ( حنين ) گەڕاینەوە ، من تێپەڕیم دەبینم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قسە دەكات ، من سەلامم نەكرد . جبریل (سەلامی خوای لەسەر بێت ) فەرمووی : ئەمە كێ یە ئەی ﷺ ؟

فەرمووی : حارثە ی كوڕی نعمانە .

فەرمووی : ( أما انه من المائة الصابرة يوم حنين الذين تكفل الله بأرزاقهم في الجنة ، ولو سـ ـلم لرددنا عليه ) [1].

واتە : بێ گومان ئەو یەكێكە لەو سەد كەسەی لە ڕۆژی ( حنين ) دا خۆگربوون و كرد و لەگەڵتدا مانەوە ، ئەوانەی كە خوای پەروەردگار بووە كەفیلی ڕۆزی دانیان لە بەهەشتدا ... خۆ ئەگەر سەلامی بكردایە وەڵاممان دەدایەوە .

هەروەها بە ئیسنادێكی بچڕ بچڕ گێڕاویەتیەوە كە : حارثە چاوی ( بینایی ) لە دەست داوە ، بۆیە گوریسێكی لە نێوان جێگا نوێژەكەی و ژوورەكەیدا داناوە بۆ ئەوەی دەستی پێوە بگرێت لەو نێوانەدا و هەروەها بڕێك خورما و شتی تری لە ژوورەكەی داناوە ، هەر كە هەژارێك سەلامی بكردایە بەشی [illegible] ، و دەستی بە پەتەكەوە دەگرت هەتا دەگەیشتە لای دەرگای ژوورەكەی و دەیدایە دەستی هەژارەكە . ماڵ و خێزانەكەی پێیان دەوت : كە ئەو كارە بۆ ئەوان دانێت ، بەڵام ئەو نەیفەرموو : گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( مناولة المسكين تقي ميتة السوء ) [2] واتە : بەخشین بە نەداران بەدەستی خۆت ، دەتپارێزێ لە مردنی خراپ و عاقبەتی خراپ .

حارثە ( ﷺ ) لە سەردەمی جێنشینایەتی ( معاویە ) دا وەفاتی كردووە .

لە نەوەكانی (حارثە ) : محمدی كوڕی عبدالرحمن ی كوڕی عبدالله كوڕی حارثە ی كوڕی نعمانی ئەنصاری یەكە یەكێكە لە ( محدثون ) ئەوانەی زانا و شارەزان لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) كوڕی خاتوو ( عمرە ) ی زاناو فەقیهی مەدەنی یە. كە شەش فەرموودەكەی لێ گێڕاوەتەوە .

[1] – سەنەدەكی ( حسن )ە ئیبنو سعد بە بێ بەڵگە دەری هێناوە . لەلای طبرانی بە ژمارە ( ٣٢٢٥ ) هاتووە . هیثمی دەڵێت : سەنەدەكی ( حسن )ە . المجمع ( ٩ / ٣٠١٤ ) .

[2] – طبرانی ریوایەتی كردوە ( ٣ / ٢٥٨ ) .

## " ٥٣ - ابو موسای ئەشعەری ( رضي الله عنه ) "

## " ئیماندارێکی هەمیشە گەڕاوە و تەوبەکارە "

پێشەوای گەورە ، هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) : ئەبو موسای ئەشعەری تەمیمی و زانای قورئان خوێن : ( عبدالله ی کوڕی قیس )ی یەمەنی یە .. لە مەککە موسڵمان بووە ، پاشان لەگەڵ ئەهلی دووکەشتی یەکەدا پاش ڕزگار کردنی خەیبەر بەسێ ڕۆژ هاتنە خەیبەر و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەغەنیمەتەکان بەشی دان لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) غەزای کردووە و زانستێکی زۆری لێ وەرگرتووە .. لەسەردەمی جێنشینایەتی هەردوو پێشەوا عمر و عوسماندا والی بەصرە بووە ، دواتریش بووەتە والی کوفە ، و لەوێ وەفاتی کردووە .. وە یەکێکە لەو بەڕێزانەی هیجرەتیان کرد بۆ حەبەشە .

پێشەوا ( ذهبي ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : ئەبو موسا زۆر بەڕۆژوو بوو بە شەویشدا شەو نوێژی کردووە ، ڕەببانی و دونیا نەویست بووە . لەو کەسانە بووە زانست و کارو خەبات و پاکردی دڵ و دەرونی پێکەوە گرێ داوە ، هەرگیز ئیمارەت فریوی نەداوە و دنیا و خۆشی یەکانی نەیانگۆڕیوە [1].ابو موسا ( رضي الله عنه ) چیرۆکی کۆچکردنی خۆیمان بۆ باس دەکات و دەڵێت : (لە یەمەنەوە لەگەڵ پەنجاو شتێ لە قەومەکەمدا کەوتینە ڕێ ، ئێمە سێ برا بووین : من و ابو ڕەهم و ابو عامر . و کەشتیەکەمان بەرەو لای نجاشی بردینی کە لەوێ جعفر و هاوەڵانی لێ بوون ، ئەوجا پاش ڕزگار کردنی خەیبەر هاتین بۆ خەیبەر ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموین : (لكم الهجرة مرتين : هاجرتم الى النجاشي ، وهاجرتم الي ) [2]. واتە : ئێوە دوو جار هیجرەتان کردووە ، جارێك بۆلای نجاشی و جارێك بۆلای من ... وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەبو موسا و قەومەکەشی بێ سنور خۆشدەویست .

لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( يقدم عليكم غداً قوم هم ارق قلوباً للاسلام منكم ) واتە : سبەینێ خەڵکانێك دێن بۆ لاتان کە دڵیان لە بۆ ئیسلام

---

[1] - بڕوانە : سير اعلام النبلاء ( ٢ / ٣٩٦ ) .

[2] - صحيح : بوخاری و مسلم و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردوە .

لە دڵی ئێوە بە سۆزتر و نەرمترە .. ئەوە بوو ئەشعەری یەکان هاتن .. کە نزیک بوونەوە ئەمەیان دەوتەوە :

غداً نلقي الاحبة    محمداً و حزبه

واتە : سبەینێ بەخۆشەویستان دەگەین ، بە محمد و کۆمەڵەکەی .

کاتێ گەیشتن تەوقەیان کرد ، ئەوان یەکەم کەس بوون تەوقەکردنیان داهێنا [1]. وە لە عیاض ی ئەشعەری یەوە ، دەڵێت : کاتێ ئایەتی : ﴿ ... فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ ... ﴾ سورة المائدة ، آية ( ٥٤ ) . دابەزی ، واتە : لە ئایندەدا خوا کەسانێك دەهێنێتەکایەوە ، پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن ، ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ ... پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی ئەوکەسانە قەومەکەی تۆن ئەی ئەبو موسا و) [2]

## " دەنگ خۆشی ئەبو موسا بۆ قورئان خوێندن "

لە هاوەڵاندا لە ئەبو موسا ( ﷺ ) دەنگخۆشتریان تیانەبووە . ئەوەتە لە ( ئەبو موسا ) وە ( ﷺ ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : يا ابا موسى لقد اعطيت مزمارا من مزامير آل داود [3].

واتە : ئەی ئەبو موسا بەڕاستی لە ئاوازەکانی ئالی داود ئاوازێکت پێ دراوە .

وە لە ( انس ) ەوە ، دەڵێت : ئەبو موسی دەنگی خۆش بوو ، شەوێکیان هەڵساو نوێژی دەکرد ، خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گوێیان لێ بوو ، هەڵسان و گوێیان بۆ ڕاگرت . کاتێ ڕۆژبوویەوە ، پێی وترا کە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گوێیان بۆ ڕاگرتویت .

فەرموی : ئەگەر ئەمزانی گوێم ڕائەگرن ، وەها و وەها بۆم دەڕازاندنەوە و سەرنجیانم بۆ ڕادەکێشا [4] ! ..

---

[1] – سەنەدەکی ( صحيح )ە ، احمد دەری هێناوە ( ٣ / ١٥٥ ) غەیری ئەویش .

[2] – حاکم دەری هێناوە ( ٢ / ٣١٣ )و دەڵێت : ( صحيح الانساد )ە زەهەبیش هاوڕایە ( فەرموودەکە ) (يا ابا موسى لقد اعطين مزار امن مزامير آل داود )

[3] – صحيح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە ، بڕوانە / صحيح سنن الترمیزی ( ٣٠٢٩ ) .

[4] – سەنەدەکی ( صحيح )ە ، ئیبنو سعد لە ( الطبقات ) دا ( ٤ / ١٠٩ ) .

ئەبو عوسمان ی نهدی دەڵێت : هیچ مۆسیقایەکم لە سەنتور و ساز ( صنج ) گوێ لێ نەبووە خۆشتر لە دەنگی ئەبو موسی ، کاتێ نوێژی بۆ دابەستیانە هاواری لێ ئەکرا کە سورەتی ( بقرە ) بخوێنێ ئەوەندە دەنگی خۆش بوو [1].

لە ( ئەبو سلمە )وە : کاتێ عمر ( ﷺ ) دادەنیشت ئەگەر ( ابو موسی )ی لەگەڵدا بوایە ، زۆر جار دەیفەرموو : خوامان وەبیربێنەرەوە ئەی ئەبو موسی ، ئەویش قورئانی دەخوێند [2].

لە ئەبو نضرەوە : بە ئەبو ( موسی )ی فەرموو : تامەزرۆمان بکە بۆلای پەروەردگارمان ، ئەویش قورئانی دەخوێند ... خەڵکەکەش دەیانوت : کاتێ نوێژە .. دەیفەرموو : ئەی ئەمە نوێژ نیە [3]!

## " شەرم و عیففەتی "

ئەبو موسا دەڵێت : پێم خۆشە لوتم پڕ بێت لە بۆنی لاکی بۆنکردوو ، بەلأم بۆنی ئافرەتێك نەکەم [4] .

## " ئامۆژگاریکارێك لە ئاسمانەوە "

لە ئەبو موساوە ، دەڵێت : جارێك لە دەریادا غەزامان کرد ، ڕۆشتین ، تا گەشتینە ناوەڕاستی دەریا ، گوێمان لە دەنگێك بوو بانگی دەکرد ، ئەی ئەهلی کەشتیەکە ، ڕاوەستن پێتان بڵێم ، منیش هەڵسام ، سەیری راست و چەپم کرد هیچم نەدی ، تا حەوت جار بانگی کردەوە ، وتم : ئەی نازانی ئێمە ئێستا لە چ جێیەکداین ، ناتوانین بوەستین .

دەنگەکە وتی : ناتەوێ هەواڵێکت پێی بڵێم ، فەرمانێك کە خودا بەسەر خۆیدا چەسپاندوویەتی ، ئەویش ئەوەیە : هەر کەس لە پێناوی خوا لە ڕۆژێکی گەرمدا خۆی

---

[1] – ئیبنو عساکر ( ٥٢٧ ) لە ڕێی پێشەوا احمدەوە .

[2] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٤ / ١٠٩ ) و ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی جێی باوەڕن سیر ( ٢ / ٣٩١ ) .

[3] – دانە پاڵەکەی ( صحیح )ە : ئیبنو سعد ( ٤ / ١٠٩ ) .

[4] – پیاوانی جێی متمانەن : سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٣٩٩ ) .

تینوو کات ، ئەوە خودا لە ڕۆژی قیامەتدا تینوێتی دەشکێنێت . دەڵێت : لەوکاتەوە ئەبو موسا هەر ڕۆژێکی گەرمی بکردایە ٢ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو[1] .

بەهۆی زۆر دڵسۆزی یەوە ( ﷺ ) قسەکانی زۆرشیرین بوون وە کاریگەری یەکی سەر سوڕهێنەریان هەبوو . . لە ( ئەبو لبید ) ەوە ، دەڵێت : قسەکانی ئەبو موسامان بە قەصاب گۆشت فرۆش دەچواند کە هەرگیز لە جومگە لاینەئەدا و ڕاست دەیپێکا [2] .

## " چەند نموونەیەك لە خەباتی ئەبی موسا ( ﷺ ) "

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ( حنين ) بوویەوە ، ئەبو عامری بەسەر سوپای ( اوطاس )ەوە نارد ، ئەوە بوو بە ( دريدی کوڕی صمه ) گەیشت کوشتی و خوای پەروەردگار شکستی بەهاوڕێکانی ( درید ) هێنا ، بەڵام پیاوێك بە تیرێك دای لە ئەژنۆی ئەبو عامر و لە جێی خۆی خستی .

وتم : مامەگیان ، کێ بوو تیرەکەی لێ دایت ؟ ئەویش ئاماژەی بۆ کرد . ڕۆشتم بەدوایدا و پیایدا گەشتمەوە ، کە منی بینی ، پشتی هەڵکرد و ڕایکرد ، پێم وت : شەرم ناکەیت ؟ مەگەر عەرەب نیت ؟ بۆچی ناوەستی پیاوانە شەڕ بکەیت ؟

دەڵێت : ئەو جا وەستا و بەیەك گەیشتین ، یەك و دوولێدان لە نێوانماندا ڕووی دا و کوشتم ...

پاشان گەڕامەوە بۆلای ئەبو عامر ، پێم وت : خوای پەروەردگار ئەوەی دا بە کوشت کە تیرەکەی لێ دابوویت .

وتی : ئەم تیرە لە ئەژنۆم دەربێنە ، مینش دەرم هێنا ، دەبینم ئاوی لێ یەتەدەرەوە . وتی : برازاگیان ، بڕۆ بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ : داوای لێ خۆشبونم بۆ بکات . ئەوجا ئەبو عامر منی لە جێی خۆی دانا بەسەر خەڵکەکەوە و زۆری نەبرد وەفاتی کرد .

کە گەشتینەوە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، هەواڵەکەم پێدا ، ئەویش هەڵسا دەستنوێژی گرت و دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی : ( أللهم اغفر لعبيد ئـ ـةبو عـ ـامر )

[1] – ئیبنو عساکر دەری هێناوە ( ٥٣١ ، ٥٣٢ ) ارنۆوط دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن جگە لە – ابو الغيره
– بەراوێژی سر اعلام النبلاء ( ٢ / ٣٩٣ ) .

[2] – سەنەدەکی ( صحيح )ە / ئیبنو سعد ( ٤ / ١١١ ) .

ئەوەندە دەستی بەرزکردەوە سپیای ژێر باڵیم چاو پێ کەوت . پاشان فەرمووی : ( اللهم اجعله یوم القیامة فوق کثیر من خلقك ) ئەی پەروەردگار ، لە ڕۆژی قیامەتدا بیخەرە سەرووی زۆرێك لە دروستکراوانت . منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بۆ منیش داوا بکە ؟ فەرمووی : (اللهم اغفر لعبد الله بن قیس [1] ذنبه ، و أدخله یوم القیامة مدخلا کریماً ) [2]

واتە : پەروەردگارا لە گوناهی عبدالله ی کوڕی قیس خۆش بەوە لە ڕۆژی قیامەتدا جێگایەکی ڕێزداری بۆ ئامادە بکە ..

## " خۆ ئامادەکردن بۆ مەرگ "

لە نیشانەکانی خەیر و چاکە لە موسڵماندا ئەوەیە کە هەتا تەمەنی درێژ بێ و ئەجەلی نزیك بێتەوە زیاتر گوێدێری خوا دەکات و کاری چاکە دەکات . بۆ ئەوەی لە باشترین حاڵیدا وەفات بکات .

لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یان پرسی : کێ ژیرترین کەسە ؟ فەرمووی : (اکثرهم للموت ذکراً و أحسنهم لما بعده استعداداً اولئك الاکیاس ) [3]

واتە : ژیر ئەو کەسانەن کە لە هەمووان زیاتر یادی مردن دەکەنەوە و لە هەمووان باشتر خۆیان بۆ دوای مردن ئامادە ئەکەن .

هەروەها ( التیمی ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : ( دوو شت خۆشی و چێژی دنیایان لێ سەندمەوە ، یادی مەرگ و یادی ڕاوەستان لە نێو دەستی پەروەردگار دا )...

جا کێ هەیە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زیاتر بۆ مەرگ ئامادە بێت . صالح ی کوڕی موسای طلحی لە باوکیەوە ، دەڵێت : ( الاشعری ) پێش مردنی لە ڕادەبەدەر تێدەکۆشا و خۆی ماندوو دەکرد ، تا پێ ی وترا ، بۆ تۆ بەزەیت بە خۆتدا نایەتەوە و پشوویەك ناکەی ؟

---

[1] – لە سەرەتادا وتبومان کە ناوی ابو موسی : (عبدالله ی کوڕی قیس )ە ( رضي الله عنه ) .

[2] – صحیح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە . هەروەها غەیری ئەوانیش . ( اوطاس )یش / دۆڵێکە لای ( هوزان ) دا .

[3] – فەرموودەی ( حسن )ە : ئیبنو ماجە ریوایەتی کردوە ( ٤٢٥٩ ) هەروەها غەیری ئەویش .

فەرمووی : لە ڕاستیدا سوار کاتێ نزیك دەبێتەوە لە جێگای مەبەستی زیاتر تیژڕەوی دەکات و هەموو توانای ئەخاتە کار ، وە ئەوەی لە ژیانی من ماوە زۆر لەوە کەمترە [1] .

ئەبو موسا ( رضي الله عنه ) لە مانگی ( زول حجة ) ی ساڵی ( ٤٤ ) کۆچیدا دا وەفاتی کردووە ، هەروەك ( ذهبي ) دەڵێت .

[1] – ئیبنو عساکر باسی کردووە ( ٥٣٤ ) .

# " ٥٤ - ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ( رضي الله عنه ) "

## " خاوەنی ڕاسپارە سەر سوڕهێنەرەکە "

کێ یە ؟

پێشەوای مەزن ، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری خەزرەجی بەدری یە ، ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تایبەتمەندی کرد بەوەی لەناو مالانی ( بني النجار ) دا لە مالی ئەو دابەزێت ، هەتا ژوری ( سودە )ی دایکی ئیمانداران بنیاتنرا و دواتریش مزگەوتی پیرۆز دروست کرا ...

ئەبو ایوب لە جەنگی ( بەدر ) بەشدار بووە ، هەروەها لە هیچ غەزایەکی تردوا نەکەوتووە تەنها سالێك نەبێ کە لاوێك کرایە سەرکردەی سوپا ، ( ئەبو ایوب ) بێتاقەت بوو ئەیوت : قەیدی چی یە کەسێك کراوە بە فەرمانڕەوای من نەخۆش کەوت ( یزیدی کوڕی معاویە )ش وسەرکردەی سوپا بوو ، ئەو جا هات بەسەری دەکردەوە ، پێی وت: ئەگەر مردم بمخە سەر ولاخێك و بمگەیەنەسەر زەوی دوژمن ئەگەر توانیت ، ئەگەر نەتوانی ، بمسپێرە بە خاك وبگەڕێرەوە .

ئەوە بوو مرد ، بردی و دفنی کرد و ئەیفەرموو : پەروەردگار دەفەرموێت : گەر داواکران بۆ غەزا ، ئەوە بەچەکی سووك و سەنگین ، بە سوارە و پیادە تانەوە ڕاپەڕن وئامادەبن .

## " ڕێز گرتن لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ( ئەبو رهم )ەوە ، ئەبو ایوب بۆی باسکردووە کەوا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە مالی ئێمە دابەزی [1] لە قاتی خوارەوە مایەوە و خۆیشمان لە قاتی دووەمدا بووین ئەوە بوو لە سەرەوە بڕێك ئاو ڕژا خێرا من و ئومو ایوب هەرچی هات بەدەستمانەوە لە قوماش و پەڕۆ هەلمان گرت تا نەیەلین ئاوەکە بڕژێتە خوارەوە و سڕیمان ، دواتر دابەزیم و چووم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێم وت : ناگرێ ئێمە لە سەری تۆوە بین ، دەبێ تۆ بچیتە سەرەوە و ئێمە بێینە خوارەوە.

[1] – واتە لە مەککە کۆچی کردوو لە مەدینە دابەزی ، وەك میوانێکی بەڕێز لە مالی ابو ایوب مایەوە ، کە ئەمەش شانازی یەکی گەورەیە .

ئەوجا فەرمانی کرد و کەل و پەلەکانی - کە زۆر کەم بوون - برایە سەرەوە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە خواردنت بۆ دەناردین ، سەیرم دەکرد بزانم شوێن پەنجەی تۆ لە کوێدایە ، منیش لەوێوە لێم دەخوارد [1].

## " خۆشەویستی بێ سنوری هاوەڵان ( ﷺ ) بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

هاوەڵان ئەو ڕێزەی ئەبو ئەیوبیان لە یاد نەچوو بوو کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ) هەیبوو و ئەو ڕەفتارە جوانەی لە ئاستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا ئەنجامیدا بە میوانداریکردنی کاتێ چووە ماڵیان .. ئەمەش وای کرد ( ابن عباس ) زیاد لە سنور ڕێزی ئەبو ئەیوب بگرێت .

لە ( ئەبو حبیب ی کوڕی ئەبو ثابت ) ەوە : ئەبو ئەیوب هات بۆ بەصرە بۆ لای ئیبنو عەباس ، ئیبنو عەباس هەڵسا ماڵەکەی بۆ چۆل کرد و پێی وت ئەبێ تۆ چیت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) کرد منیش بەو شێوە مامەڵەت لەگەڵ بکەم .. ئینجا پرسی : چەند قەرزاریت ؟ فەرمووی : بیست هەزار ، ابن عباس چل هەزاری پێ دا لەگەڵ بیست بەندە و کەل و پەلی ماڵەکەیش [2].

## " شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ( محمدی کوڕی کعب ) ەوە ، دەڵێت : ئەبو ئەیوب سەرپێچی ( مروان )ی دەکرد ، وتی : بۆچی وادەکەی ؟ وتی : چاوم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو کە نوێژەکانی دەکرد، خۆ ئەگەر وەك ئەو ئەنجامت دا ، ئەوا ئێمەش دێینە سەر ڕای تۆ و سەرپێچیت ناکەین ئەگەر وەك ئەو نەبوو ، ئێمەش بەگوێت ناکەین [3].

[1] - سەنەدەکی ( صحیح )ە ، احمد لە ( المسند ) دا ڕیوایەتی کردووە ( ٥ / ٤٢٠ )
[2] - حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٤٦١ ، ٤٦٢ ) و: ( صحیح الاسنادە ) و زەهەبیش هاوڕایە
[3] - طبرانی دەری هێناوە ، پیاوانی جێ متمانەن ، المجمع ( ٢ / ٦٨ ) .

## " ڕاسپاردەیەکی سەیر لە کاتی مردندا "

لە ( ئەبو ظبیان )ەوە ، دەڵێت : ئەبو ئەیوب چو بۆ غەزا و لەوێ نەخۆش کەوت و فەرمووی : ئەگەر مردم ، هەڵمگرن ، و کاتێ کە بەرامبەر بوونەوە لەگەڵ دوژمناندا لە ژێر پێتاندا فرێم دەن ، بەڵام ئەمەوێ فەرمایشتێکتان پێ بڵێم کە لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) م بیستووە ، فەرموویەتی :

( من مات لایشرك بالله شیئاً دَخَلَ الجنة )

واتە : هەر کەس بمرێت و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدئەبو ، دەچێتە بەهەشت .

نووسەر دەڵێت : لەوانەیە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ویستوویەتی لە سەرزەوی دوژمن سپاردە بکرێ بۆ ئەوەی هیمەتی موسڵمانان بەرز بێتەوە کە ئەو زەوی یە لە دەستی دوژمنانی خودا ڕزگاری بووە ... وەك ئەوەی بیسەلمێنن کە موسڵمانان خاوەنی ئەو زەوی یەن .. خوایش باشتر دەزانێ .

# " ٥٥ - زەیدی کوڕی ثابت ( ﷺ ) "

# " شێخ و مامۆستای قورئان خوێنان "

پێشەوای مەزن و شێخی قورئان خوێنان و شارەزایانی زانیاری فەرز و ئەرکەکان، فەتوادەری مەدینە ابو سعید و ابو خارجە ی خەزرەجی ئەنصاریی ، نووسەری سروش ( رەزای خوای لیّ بێت ) ...

عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) کە ئەچوو بۆ حەجی ماڵی خوا ( زەید )ی دەکردە والی مەدینەوە لە جێی خۆی . وە ڕۆژی ( یەرموك ) هەڵسا بە دابەشکردنی غەنیمەتەکان.

باوکی ڕۆژی ( بعاث ) پێش هیجرەت وەفاتی کردووە ، بۆیە بە هەتیوی بەخێو کراوە .

زەید یەکیّ بوە لە زیرەك و بلیمەتەکان ، کاتیّ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ، موسڵمان بووە و تەمەنی ئەو کاتە تەنها ( ١١ ) ساڵ بوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پیّ کرد کە فێری زمانی جولەکە بێت تا پەیام و نووسراوەکانیان بۆ بخوێنێتەوە و دەیفەرموو : ( فإني لا أمنهم ) ، چونکە من باوەڕیان پیّ ناکەم – و متمانەم پێیان نیە .

لە ( خارجە )وە لە باوکیەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هێنامی بۆ ناو مەدینە ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمە غولامێکە لە ( بني النجار ) ، و لەو قورئانەی بۆت دابەزیوە حەڤدە سورەتی خوێندوەتەوە ، منیش بۆم خوێندەوە و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی سەرسام بوو ، و فەرمووی : ( ئەی زەید ! خۆت فێری نووسینی جولەکە بکە بۆم ، چونکە لە ڕاستیدا من لێیان بە گومانم پەیامەکانم بنووسن)[1].

دەڵێت : منیش خۆم فێر کردوو ، لە ماوەی پانزە ڕۆژدا بەتەواوەتی فێربووم ، ئەو جا دوای ئەوە ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پەیامی بۆیان بناردا یە من بۆم دەنووسی[2].

---

[1] – فەرموودەکە : (( يا زيد تعلم لي كتاب يهود ، فإني ما امنهم على كتابي ) .

[2] – سەنەدەکی ( حسن )ە / بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ( التاريخ الكبير ) ٣ / ٣٨٠ ) و هەروەها ابو داوود ( ٣٦٤٥ ) و غەیری ئەوانیش .

زەیـد ، دەڵێت : پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) پێمـی فـەرموو : ( اتحسن السريانيه ؟ ) زمانی سریانی دەزانی ؟ وتم : نەخێر : فەرمووی : دەی فێری ببـە ... ئـەوە بوو بـەماوەی حەڤدە ڕۆژ فێری بووم [1].

وەلە ڕیوایەتێکی تردا ! فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فـەرمانی پـێ کـردم زمانی جولەکە فێربم و فـەرمووی : ( اني و الله ما آمن يهود على كتاب ) واتـە : سوێند بـەخوا من لێیان دڵنیانیم شتم بۆ بنووسن . دەڵێت : ئەوە بوو نیو مانگم تێنەپەڕاند ، فێری بـووم بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

دەڵێت : دوای ئەوەی فێری زمانی یەهود بووم ، ئەگەر پەیامێکیان بناردایە من بۆم دەخوێندەوە ، ئەگەریش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پەیامی بۆ بناردنایە من بۆم دەنووسی [2].

نووسـەر دەڵێـت : بـەم جـۆرە پێغەمبـەری ئـازیز ( ﷺ ) لـە نەخـشە و پلانـی فەرمانڕەواکانی زایۆنی بە ئاگامان دێنێتەوە ، چونکە ئەوان هەر لە سەرەتای ئەم ئاینـەوە لە نەخشە دانان و تەڵەکە بازیدان بۆ ئەم ئوممەتە .. بەڵام خوا خۆی دەورەی داون و لێیان ئاگادارە .

" نووسەری سروش "

ئەم هاوەڵە بەرێزە شانازی نووسینی وەحی ئاسمانی پێ درا ، و پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) ئەك كارە گرنگەی پێ سپارد .

زەیـد دەڵێـت : کـاتێ سروش بـۆ پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) دادەبـەزی ، ئـەینارد بە دواماو بۆم دەنووسی [3].

وە بوخـاری لـە ( الـبراء ) ەوە ، گێڕاویەتیـەوە ، دەڵێـت : پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) پێی وتم : ( ادع لي زيداً ، و قل له يجيئ بالكتف و الدواة ) .

واتـە : زەیـدم بـۆ بانگ کـەو ، پـێ بڵـێ ئامرازی نووسـینش لەگـەڵ خۆیدا بێنێـت .

دەڵێت : ئەوجا فـەرمووی : ( اكتـب : ﴿ لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ... ﴾ سورة النساء آية ( ٩٥ ) .

---

[1] – سەنەدەکی ( صحيح )ە ، احمد ڕیوایەتی کردووە ( ٥ / ١٨٢ ) هەروەها غەیری ئەویش .

[2] – فەرموودەی ( حسن لغيره ) تیرمیزی ڕیوایەتی کـردوە ، بڕوانـە : فـضائل الـصحابە ( شـيخ العـدوي ) (٦٢)

[3] – طبرانی ڕیوایەتی کردوە هیثمی لە ( المجمع ) دا دەڵێت سەنەدەکی ( حسن )ە ( ٩ / ١٧ ) .

و ( ابن ام مكتوم ) لە دوای ( پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانیشتبوو - كە نەبونا بوو- وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، من كەسێكم نەبونا و كەم ئەندامم - واتە : بەدەستی خۆم نیە كە ناتوانم بێم بۆ جیهاد - ئەوجا لە جێی ئایەتەكەی پێشوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : ﴿ لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ ... ﴾ سورة النساء آية ( ٩٥ ) .

واتە : ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و ناجەنگن - مەگەر ئەوانەیان كە ناتەواون - ( كوێر ، شەل ، نەخۆشی ، ... هتد ) لەگەڵ ئەوانەدا كە جیهاد دەكەن لە پێناوی خوادا بەماڵ و سامان و گیانیان ، چوونیەك نین .

هەروەها پێشتریش لە باسی ژیانی پێشەوا ابوبەكری صدیق ) دا باسی ئەوەمان كرد كە زەید چۆن قورئانی كۆكردەوە ( رضي الله عنه ) .

## " هەڵوێستێكی نەمر پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وتاربێژانی ئەنصار هەڵسان و قسەی خۆیان كرد وتیان : با پیاوێك لە ئێمە و پیاوێكیش لە ئێوە - واتە كۆچبەران - بێتەجێنشین . لەوێدا زەیدی كوڕی ثابت هەڵسا و فەرمووی :

لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە كۆچبەران بوو ، ئێمەش پشتیوانی ئەوین ، وە پێشەواش دەبێ لە كۆچبەران بێت و دیسان ئێمە پشتیوانی دەبین .

ابوبكریش ( رضي الله عنه ) فەرمووی : خوای گەورە پاداشتی چاكەتان بداتەوە ئەی هۆزی پشتیوانان و بێژەرە كەشتان دامەزاوتر بكات ، ئەگەر غەیری ئەمەتان بووتایە ، ڕێك نەئەكەوتین [1] . بەو جۆرە دڵسۆزی و خۆشەویستی تەواو بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی دەردەكەوێت ... ئیدی هیچ بوارێك بۆ ئارەزو دەسەلاتی شەیتان نیە .

## " زانستی زەید ( رضي الله عنه ) "

لە ئیبنو عەباسەوە ، دەڵێت : بڕیاری زانایانی ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زانیویانە كە زەیدی كوڕی ثابت یەكێكە لەوانەی لە زانستدا ڕۆچووە و [2] جێ دەستی دیارە .

---

[1] - سەنەدەكی ( صحیح )ە ، احمد ( ٥ / ١٢٢ ) زەهەبی دەڵێت : سەنەدەكی ( صحیح ) ە . ( سیر ٢ / ٤٣٣ ) .

[2] - حافظ لە ( الاصابە ) و داویانەتەپاڵ ( البغوی ) و ارنؤوط دەڵێت دانە پاڵەكەی ( صحیح )ە .

ابن عباس لەگەڵ ئەوەشدا خۆی لە زانستدا پێگەیەکی باشی هەبوو وە یەکێ بووە لە زانایان ، بەڵام ڕێزی زەیدی زۆر دەگرت وەك زانایەك .

ئەوەتە لە ئەبی سەلەمەوە ، ئیبن عباس هەڵسایەوە لەبەر زەیدی کوڕی ثابت و ئاوزەنگی وڵاخەکەی بۆ گرت ، فەرمووی : خۆت لادە ئەی کوڕە مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ابن ( عباس )یش فەرمووی : ئێمە وەها دەجوڵێینەوە لەگەڵ زانا و پیاوە گەورەکانماندا [1] !!

ابن عباس ڕەشوەی وڵاخەکەی زەید بگرێت !!

دەی ئیتر پەلکێشان چۆن ئەتوانن لە ڕەمزە ئیسلامی یەکانمان دەدەن ؟!!وە مەسروق دەڵێت : ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە فەتوایان دەدا ئەمانە بوون : عمر ، علی ، ئیبنو مسعود ، زید ، ئوبەی ، ئەبو موسا ، ( ڕەزای خوایان لێ بێت) ...

## " بابەتێکی شەرعی ( مەسەلەیەکی شەرعی ) "

لە مەسروقەوە : لە عبدالله کوڕی مسعودە وە ئەڵێت : کە عبدالله ( رضي الله عنه ) دەربارەی (خوشك ی دایك و باوکی و خوشك و برای باوکی) دەیفەرموو : خوشکانی دایك و باوکی دوو لەسەر سێ یان دەکەوێت ، ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ کوڕەکانە و بەشی ئافرەتەکانی لێ نادرێ .

ئەوجا مەسروق هاتە مەدینە ، لەوێ دەربارەی ئەومەسەلەیە گوێی لە ( زەید ) بوو ، ئەوە بوو ڕای زەیدی بە دڵ بوو . بۆیە هەندێ لە هاوەڵانی پێیان وت : ئەڵێی واز لە ڕای عبدالله دەهێنیت ؟ ئەویش وتی : ئاخر زەید ئەوانەی کەمابوونەوەبە یەکسانی بەشداری دەکردن [2] .

خوێنەری بەڕێز وەبیر دێنینەوە کە ( مسروق ) قوتابی عبدالله کوڕی مسعود بو(رضي الله عنه) ، لەگەڵ ئەوەشدا دەمارگیری بۆ مامۆستاکەی نەبوو ، بەڵکو لەگەڵ بەڵگەدا دەڕۆیشت لەلای هەر کەسێ بوایە ئەمەش دادپەروەرانە وبەویژدانی یە .. وانەیەکی گەورەیە بۆ زانستخوازان .

---

[1] – سەنەدەکی ( حسن )ە / حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٤٢٣ ) دەڵێت ( صحیح )ە و زەهەبیشت هاوڕایە.

[2] – سەنەدەکی ( صحیح )ە : تهذیب ئیبنو عساکر ( ٥ / ٤٥١ ) .

## " حاڵی زەید لەگەڵ خێزانەکەیدا "

خۆشحاڵترین و بەختەوەرترین کەسێك بە کەسی بانگخواز و موسڵمانی ڕاستەقینە خێزانەکەیەتی هەروەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە : ( خَيْرُكُم خَيرُكم لأهله وَ أنا خَيْرُكُم لأهلي ) واتە : باشترینتان ئەوەیە کە باشترین کەس بێت بۆ خێزانەکەی ، وە من باشترینتانم بۆ خێزانەکەم .. زەیدیش هەر بەو جۆرە بوو .

لە ( ثابت ی کوڕی عبید )ەوە ، دەڵێت : زەیدی کوڕی ثابت یەکێ بوو لە ڕوو خۆشترین و دەم بە پێکەنینترین کەسان بۆ ماڵ و منداڵەکەی .

## " وەفاتی زەید ( ﷺ ) "

پاش ژیانێکی پڕ لە بەخشش ... کە پێشەوا ذهبي لەمەدا کۆی کردوەتەوە . (لە گەورەیی و پایە بەرزی زەید ، پێشەوا ( صديق ) پشتی پێ بەستووە لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆزدا ، و لە پاش کۆکردنەوەی لە سنگی خەڵك و لەسەر پارچە تەختە و پێستەکانەوە ، وە ماوەیەك ئەو پەڕاوەیان هەڵگرت ، و یەکەمجار لەلای (صديق) مایەوە ، پاشان عمری ( الفاروق ) دواتر لەلای ( حفصة )ی دایکی ئیمانداران مایەوە ، تاوەکو پێشەوا عوسمان ، زەیدی کوڕی ثابت و ژمارەیەك لە قوریشیەکانی یەکانی هەڵبژارد بۆ نوسینەوەی ئەم پەڕاوە (عوسمانی)یەی کە ئێستا زیاد لە هەزار هەزار وێنەی لە سەر زەویدا هەیە[1] و جگە لەو پەڕاوە سوپاس بۆ خودا هیچ جۆرە وێنەیەکی تر بەدەستی ئوممەتی ئیسلامەوە نیە . ) [2] پاش ئەو تەمەنە پیرۆزە و ئەو خەباتە زیندووە ...زەیدگەڕایەوە لای پەروەردگاری بە ئاسودەیی و ئارامیەوە . و مەروان نوێژی لەسەر کرد .

کاتێ وەفاتی کرد ، ئەبو هریرە فەرمووی : باشترینی ئوممەت وەفاتی کرد ! بەڵکو خودا ئیبنو عەباس بکاتە جێنشینی و شوێنی بگرێتەوە . وە لە عەمماری کوڕی ئەبو

---

[1] – ئەم ژمارەیە لەسەردەمی ( زەهەبی ) دا بووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، بەڵام ئێستا لەبەر زۆری ، ژمارە ناکرێت ، بڕوانە : سير اعلام النبلاء ( ٢ / ٤٤١ ) .

[2] – ئیبنو سعد و غەیری ئەوی ڕیوایەتی کردووە ( ٢ / ٣٦٢ ) وە ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن . (سير / ٢ / ٤٣٩ ) .

عمارەوە ، دەڵێت : کاتێ زەید وەفاتی کرد ، لەگەڵ ( ئیبنو عەباس ) دا لە سێبەرێکدا دانیشتین ، وتی : ڕۆشتنی زانایان بەم جۆرەیە ، ئەمڕۆ زانستێکی زۆر لە گۆڕنرا ..

ڕەزای خوای پەروەردگار لەسەر زەید ... و خودا بمانکاتە شوێنکەوتەی ئەو و لەگەڵ زەید و هاوەڵانیدا حەشرمان بکات . " آمین "

## " ٥٦ - ئەبو قەتادەی ئەنصاری ( رضي الله عنه ) "
## " سوار چاکی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

ناوی ئەبو قەتادەی ئەنصاری سەلەمی یە . و سوارچاکی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ە و لە ئوحود و حودەیبیەدا بەشداری بووە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی:( خير فرساننا ابو قتادة ،و خير رجالتنا سلمة بن الاكوع)[1]

واتە : باشترین سوارمان ئەبو قەتادەیە ، و باشترین پیادەشمان سەلەمەی کوڕی (الاكوع )ە .

### " نمونەیەك لە جیهاد و دلێری !! "

لە ژیانی ئەم هاوەڵە بەرێزە خەباتکارە ڕەببانی یە ، چەند وێنەیەك نیشان دەدەین کە بەڵگەن لەسەر ئازایەتی و لێهاتووی .

**وێنەی یەکەم :**

ئەبو قەتادە خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : خەریك بووم سەرم دەشۆرد ، نیوەی سەرم تەواو کردبوو ، کە گوێم لە حیلەی ئەسپەکەم بوو ، وە سمەکانیشی بەزەویدا دەهێنا .

وتم : بێ گومان شەڕە و هەڵساوە ، دەبێ هەڵسم ، بە بێ ئەوەی لایەکەی تری سەرم بشۆرم ، خێرا سواری ئەسپەکەم بووم و بوردەیەکم بەسەر شانەوە بوو ، دەبینم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوار دەکات و دەفەرموێ : ( الفزع ! الفزع ! ) واتە : خۆ ئامادەکەن بۆ هاوکاری ... دەڵێت ئەوجا بە ( مقداد )[2] گەیشتم و ماوەی کاتژمێرێك لەگەڵی ڕێم کردو پاشان ئەسپەکەم پێشی کەوت ، ئەوە بوو ئەسپەکەی من لەوەی (مقداد) باشتر بوو .

مقداد پێ ی وتم کە ( مسعدە ) ، ( محرزی کوڕی نضلە )ی کوشتووە ، منیش وتم، یان ئەبێ بمرم یان بکوژی ( محرز ) بکوژمەوە . ئەوە بوو ( مسعدە ) دای لە ئەسپەکەی و

---

[1] - سەنەدەکی : طبرانی و غەیری ئەیوش ریوایەتیان کردوە ( ٣٢٧٠ ) .

[2] - هاوەڵی بەرێز ( مقدادی کوڕی عەمر )ە ( رضي الله عنه ) .

ڕۆشت ، ابو قتادەش شوێنی کەوت ، تا ( مسعدە ) وەستا و ئەبو قەتادە دابەزی و کوشتی ، و ئەسپەکەیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا .

دەڵێت : ئەوجا کە خەڵکی تێپەڕ دەبوون و بەدوای یەکدا دەڕۆیشتن ، سەیری بوردەکەی منیان دەکرد ( دابوم بەسەر مەیتەکەی مەسعەدەوە ) ، ناسیانەوە و وتیان : ابو قتادە کوژراوە ! پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( لا ، و لكنه قتيل ئةبو قتادة عليه بـ ـرده، فخلوا بينه و بين سلبه و فرسه ) .

واتە : نەخێر ، بەڵکو ئەوەی وا کوژراوە بە دەستی ابو قتادە کوژراوە و بوردەکەی ئەوی بەسەرەوەیە .. دەی ڕێگەی بۆ چۆڵ کەن بۆ خۆی و ئەسپەکەی و غەنیمەتەکەی .

دەڵێت : کەگەیشتم بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( اللهم بارك له في شعره و بشره ، افلح و وجهك ! قتلت مسعدة ؟ )

واتە : ئەی پەروەردگار مووی سەری و پێستی موبارەك کە ، خودا ڕووت سپی كات و سەر بەرز بیت ، دەڵێی مەسعدەت کوشت ؟ وتم : بەڵێ . فەرمووی : ( فما هـ ـذا الذي بوجهك ؟ ) ئەی ئەوە چی یە بەدەم و چاوتەوە ؟ وتم : تیرێك بوو لێ دام و وەهای لێ کرد.

فەرمووی : ( فادن مني ) دەی لێم نزیك بەرەوە . لێ نزیك بوومەوە و تفی موبارەکی لێ دا ، لە دوای ئەوە نە هیچ زیپکەیەك نە هیچ خەوش و پەڵەیەك بەدەم و چاومەوە نەبینراوە . وە كاتێ ابوقتادە وەفاتی کرد تەمەنی حەفتا ساڵ بوو ، ڕوخساری وەك کوڕێکی پانزە ساڵ وابوو ... وتی : ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چەك و ئەسپەکەی ( مسعدە )ی پێدام [1] .

**وێنەی دووەم :**

ئەمەش وێنەیەکی زیندووی ناو مەیدانی خەبات و تێکۆشانی ( ڕۆژی حنین ) ، و ابوقتادە ( ﷺ ) خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە ، دەڵێت :

( لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە غەزای ( حنین ) دا بووم ، كاتێ بە دوژمنان گەیشتین ، پیاوێکم بینی چوو بووە سەروی موسڵمانان ، لە دواوە بۆی چووم و شمشێرێکم دا لەگەردنی و سپەر و قەڵغانەکەیم بڕی ، ڕوی تێ کردم و وەك ئەوەی خۆی

[1] - طبرانی ریوایەتی کردوە لە ( المعجم الصغیر ) دا ( ٢ / ١٥٢ ) و ( المستدرك ) ( ٣ / ٤٨٠ ) .

فڕێ دایە باوەشم ، دەمزانی بۆنی مردنی لێ دێت ، ئەوجا بەری دام و کەوت و مرد ، وە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو ڕۆژە فەرمووی : ( من قتل قتيلاً له بينه ، فله سلبه ) هەر کەس یەکێ بکوژێ و بەڵگەی هەبێت ، ئەوە غەنیمەتەکەی بۆ خۆی دەبێت ..

منیش هەڵسام وتم : کێ شایەتیم بۆ دەدات ؟ و چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە ، پیاوێك هەڵساو وتی : ڕاست ئەڵێت ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، وە غەنیمەی ئەو پیاوەش لەلای منە .

ابوبەکر ، فەرمووی : نابەخوا ، هەرگیز شێرێك لە شێرەکانی خوا ناجەنگێ لە پێناو خواو پێغەمبەرەکەیدا و غەنیمەتەکەی خۆی بەتۆ بدات ! پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( ابو قتادە ڕاست دەڵێت ) و ئەوجا غەنیمەکەی پێدام ، قەڵغان و سپەرەکەیم فرۆشت و دام بە باخێك لە ( بنی سلمە ) ، ئەمە یەکەمین شتێك بوو لە ئیسلامدا دەستم کەوت[1] .

**وێنەی سێیەم :**

عبدالله ی کوڕی عبیدی کوڕی عومەیر دەڵێت : عمر ( ﷺ ) ابو قەتادەی نارد بۆ جەنگێك ، بەدەستی خۆی سەرکردەی گەورەی فارسی کوشت کە کەمەربەندێکی پێوە بوو نرخەکەی پانزە هەزار بوو ، پێشەوا عومەر دای بە ( ابو قتادە )[2] .

## " پاسەوانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ئەبو قتادەوە ، دەڵێت : لەیەکێ لە گەشتەکانیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ)بووین ، لە حەوانەوە و سرەوتی دوا کەوتبوو ، بۆیە من دەستم کردە سەرینی تا وەخەبەر هات و فەرمووی : ( اللهم احفظ ابا قتادة كما حفظني هذه الليلة ، ما ارانا الا قد شققنا عليك )[3]

ئەی پەروەردگار هەر لەم شەوەوە ئەبو قتادە بپارێزە هەروەك چۆن پاریزگاری لە من کرد ، دەبینم کەوتیتە نارەحەتیەوە بەهۆی منەوە..

---

[1] – صحیح : الموطأ ( ٢ / ١٠ ، ١٢٠ ) بوخاری و مسلم و غەیری ئەوانیش .

[2] – ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی فەرموودەکە جێ متمانەن ( سیر ٢ / ٤٥٢ ) .

[3] – سەنەدەکی ( صحيح )ە / طبرانی ریوایەتی کردوە ( ٣٢٧١ ) و لەلای ( مسلم )یش هەیە .

" وەفاتی ( رضي الله عنه ) "

ئـەبو قتـادە ( رضي الله عنه ) لـە سـەردەمی جێنـشینایەتی علـی کـوڕی ئـەبو طالـب ( رضي الله عنه ) وەفاتی کرد . ( و علی نوێژی لەسەر کرد و حەوت جار ( الله اکبر ) ی بەسـەردا کـرد ) ابن ئەبو شیبە لە ( المصنف ) دا گێڕایەویتـەوە ( ٣ / ٣٠٤ ) پیـاوانی فەرموودەکەش جێ ی متانەن .

## " ٥٧ - عمرانی کوڕی حصین ( رضي الله عنه ) "

## " ئەو هاوەڵەی فریشتەکان سەردانیان دەکرد !! "

ئەم هاوەڵە کێیە کە ئەو شانازی یەی بە دەست هێناوە .. پیاوێك فریشتەکان بەسەری بکەنەوە .. و سەلامی لێ بکەن ؟!! بەڵێ ، ئەم هاوەڵە بەڕێز و پێشەوا ڕابەرە ، عمرانی کوڕی حصین ( ابو نوجەیدی خوزاعی یە ) ، لەگەڵ باوکی و ابوهریرە دا لەیەك کاتدا ساڵی حەوتی کۆچی موسڵمان بوون .

بووەتە دادەوەری بەصرە ، و عومەر ( رضي الله عنه ) ناردبوونی بۆ بەصرە تا خەڵکەکە لە ئاین تێبگەیەنێن ، حەسەنی بەصری سوێندی دەخوارد و دەیوت : کەس نەهاتووەتە بەصرە بۆ تێگەیاندنی خەڵکەکەی باشتر لە عمرانی کوڕێ حصین. وە لە محمدی کوڕی سیرینەوە ، دەڵێت : لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوانەیان کە هاتوونەتە بەصرە کەسیان لە عمرانی کوڕی حصین باشتر نەبوون ... لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە چەندین غەزادا بەشداری کردووە ، و هەر لە ناو قەومەکەی خۆیدا ماوەتەوە تا دواتر چووەتە بەصرە ، لەوێ مایەوە و نەخۆش کەوت .[1] ابن سیرین دەڵێت : عمران تووشی نەخۆشی یەك بوو کە ئەویش بریتی بوو لەوەی زەرداوێك لەناو سکیدا کۆ دەبوویەوە ، سی ساڵ پێوەی دەتلایەوە و پێیان دەوت کە داخی کات ، بەڵام ئەو ڕازی نە ئەبوو داخ بکرێت تا پێش دوو ساڵ بەر لە وەفاتی . ئەو جا ڕازی بوو داخ بکرێ .[2]

### " فریشتەکان بەسەری دەکەنەوە !! "

مطرف کوڕی عبدالله دەڵێت : عمرانی کوڕی حصین وتی : شتێکت بۆ باس دەکەم، بەڵکو خوا بیکاتە مایەی سوود و قازانج بۆت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) حەج و عمرەی پێکەوە گرێ دەدا ، ڕێگریشی لێ نەکردووە هەتا وەفاتی کردووە ، وە قورئانیشی لەو

---

[1] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣٤٦ ) .

[2] - ئیبنو سەعدە هێناویەتی ( ٤ / ٢٨٨ ) وتراوە کۆتا دەرمان ( داخ کردنە ) ... ( صحاح ) ٩٢٦ (وەرگێڕ) .

بارەیەوە بۆ دانە بەزیوە کە حەرامی بکات ، هەروەها ئەمەوێ پێت بڵێم کە من هەتا داخ کرام فریشتەکان دەهاتن و سەلامیان لێ دەکرم ، بەڵام دوای ئەوەی داخ کرام نەهاتنەوە ، هەتا وازم لە داخ کردن هێنایەوە دووبارە گەڕانەوە و سەلامیان لێ دەکردم ) [1].

## " ڕێز گرتنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە ( عمران ی کوڕی حصین )ەوە ( ﷺ ) دەڵێت : ( لەو کاتەوەی بەیعەتم بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داوە دەستی ڕاستم بەر عەورەتم نەکەوتووە ) [2]

## " خۆم دوورگرتن لە فیتنەکە "

( عمران ( ﷺ ) یەکێ بوو لەوانەی خۆی بە دوور گرت لە فیتنە و ئاژاوەکە و لەگەڵ ( علی ) دا شەڕی نەکرد ) . وە لە ئەبوو قتادەوە : عمران ی کوڕی حصین پێی وتم : لە مزگەوت بمێنەرەوە و لێ مەیەرە دەرەوە . وتم : ئەی ئەگەر هاتن بۆم لە مزگەوت ؟ وتی : لە ماڵەکەت بمێنەرەوە . مەڕۆرە دەرەوە وتم ئەی ئەگەر هاتنە ماڵەوەش بۆم ؟ فەرمووی: ئەگەر کەسێك هاتە سەرم بۆ کوشتنم یان بۆ بردنی ماڵم ، ئەوە ئیتر کاتی ئەوەیە کە بیکوژم [3].

## " دان بە خۆدا گرتن لە ئاست نەخۆشیدا "

عمران ( ﷺ ) ماوەی سی ساڵ نەخۆش بوو . نەیدەهێشت چارەسەری بکرێ (کە چارەسەرەکەی بە داخ کردن بوو ) ، تا زۆری بۆ هات ، و لە بەر ئازار هاواری دەکرد ، وە لە ( مطرف )ەوە ، دەڵێت : بە عمرانم وت : لەبەر ئەم حاڵە خراپەت حەزناکەم سەردانت بکەم .

---

[1] - صحیح / مسلم ریوایەتی کردووە ( ٦٢٢٦ ) ( ١٦٧ ) لە بابی ( الحج ) دا .

[2] - پیاوانە جێ متمانەن حاکم ریوایەتی کردوە ( ٣ / ٤٧٢ ) و دەڵێت : ( صحیح )ە ، زەهەبی هاوڕایە .

[3] - پیاوانی جێ متمانەن : و لە ( الطبقات ) دا هاتووە ( ٤ / ٢٨٨ ) .

فەرمووی : ئەو کارە مەکە ، چونکە خۆشەویسترین شتی ئەم نەخۆشی یە لەلام ئەوەیە لە خودام نزیك دەکاتەوە و خۆشەویستم دەکات [1] .

دەیفەرموو : خۆمان داخ کرد ، بەلاّم نەسەرکەوتوو بوون و نەچاکیان کرد (واتە : ئەوانەی هەڵسان بە چارەسەرکردنی ) [2] ، لە ساڵی ( ٥٢ )ی کۆچی وەفاتی کرد ... ( رەزای خوای لیّ بیّت ) .

[1] – پیاوانی جێ متمانەن : ئیبنو سعد ( ٤ / ٢٩٠ ).

[2] – سەنەدەکی ( صحیح )ە : ابوداود ( ٣٨٦٥ ) و غەیری ئەویش .

# " ٥٨ – جریری کوڕی عبدالله ( ﷺ ) "

## " یوسف ی ئەم ئوممەتە !! "

پێناسی : جریری کوڕی عبدالله ی بجلیە یە ، پێشەوای خانەدان و جوانچاك و لە ( قحطان )ەکانە و لە هاوەڵە هەڵکەوتووەکانە . بەیعەتی دابە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە دڵسۆز و ئامۆژگاریکەر بێت بۆ هەموو موسڵمانێك .

حافظی ذهبي دەڵێت : زۆر جوان بووە ، لە جوانیدا کامڵ بووە . جریر ، دەڵێت : کاتێ لە مەدینە نزیك بوومەوە ، چۆکم بە وڵاخەکەم دا و تورەکەکەمم کردەوە و جل و بەرگی پاك و رێك و پێکم لێ دەرهێناو لەبەرم کرد ، پاشان چوومە مزگەوت ، دەبینم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وتاردەدات ، خەڵکەکە هەموو بەجارێ لە منیان ڕوانی . لەوەی لە تەنیشتمدا دانیشتبوو پرسیم : باشە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باسی من کردووە وا سەیرم ئەکەن ؟ وتی : بەڵێ ، بە باشترین شێوە باسی تۆی کرد لە کاتێکدا وتاری دەدا ، لە نیوەی وتارەکەیدا فەرمووی :(انه سيدخل عليكم من هذا الفج من خير ذى يمن ، الا و ان على وجه مسحة ملك)[1]

واتە : لەم ڕێیەوە کەسێك دێتە لاتان کە لە باشترینی خەڵکی یەمەنە و ، لەسەر دەم و چاوی ئاسەواری فریشتەیی هەیە . ( واتە دەڵێ فریشتەیە )ئەوجا سوپاسی خوام کرد

### " ئەدەب و ڕێزی پێغەمبەرایەتی "

کاتێ جریر هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕاخەرەکەی بۆ دانا ، تا لەسەری دابنیشێت ، بەڵام جریر لە سەر زەوی یەکە دانیشت . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموو :

( أشهدُ أنك لا تبغي علواً في الارض ولا فساداً ) واتە : شایەتی دەدەم بۆت کە تۆ ناتەوێ لە سەر زەوی خراپەکاری بڵاو بکەیتەوە و لە خۆت بایی ببیت .

---

[1] – سەنەدەکی بەهێزە : احمد لە (( المسند )) ( ٤ / ٣٦٤ ) ، ارنؤوط ( سير ٢ / ٥٣١ ) .

ئەویش موسڵمان بوو ...

پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەهاوەڵانی فەرموو : ( اذا أتاكم كريم قوم ، فأكرموه)[1] ئەگەر پیاوێکی بەڕێز هاتە لاتان ، ڕێزی بگرن .

نووسەر دەڵێت : جرير ( ﷺ ) ساڵی (١٠)ی کۆچی موسڵمان بووە ، کەسێك بووە خۆی بەسەر ئەسپەوە ڕانەگرتووە ، تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوعای بۆ کرد.

لە ( جرير )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی وتم : ( الا تريحني من ذي الخلصة ، بيت خثعم ) بۆ ڕزگارمان ناکەیت لە بتی ( بيت خثعم ) لە زول خلصە ؟( بە کەعبەی یەمەنی ناسراو بوو ) .

دەڵێت : ئێمەش ڕووخاندمان ، یان سوتاندمان و وەك حوشتری گەڕ وازمان لێ هێنا و هاتین تا موژدە بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بدەین ، پێنج جار بەسەر ئەسپەکەمەوە دابەزیم .

دەڵێت : ئەوجا وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ناتوانم بەسەر ئەسپەوە خۆم ڕاگرم . ئەویش دەستی موبارەکی لەسەر دەم و چاوم دانا ، لە ڕایوایەتێکی تردا ( لەسەر سنگم داناو ) و فەرمووی : ( اللهم اجعله هادياً مهـ ـدياً )[2] ئەی پەروەردگار بیکەرە کەسێکی هیدایەتدار و ڕێنمو نیکار ..

هەروەها لە جريرەوە ، دەڵێت : لەو کاتەوە موسڵمان بووم هەرگیز پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆی لێم لانەداوە وهەر کات منی بینیبێت لەڕومدا پێکەنیوە [3] .

## " پاهەڵدانی هاوەڵان بۆی "

لە جريرەوە ، دەڵێت : عمر ( ﷺ ) منی بە نیوەروتی بینی ، بانگی کردم فەرمووی: جلەکانت لەبەرکە ، جلەکانت لەبەرکە . منیش جلەکانم لەبەر کرد ، پاشان هاتم بۆلای خەڵکەکە و پرسیم : چیەتی ؟

[1] – فەرموودەکە بەڵگەی لاوازی هەیە و لەلای ئیبنو ماجە و بزار و غیری ئەوانیش کە بەرزی دەکاتەوە بۆ ( حسن ) . الارنؤوط ( سير ٢ / ٥٣٢ ) .

[2] – صحيح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە ، هەروەها ( احمد )یش .

[3] – وەرگێڕ : لە صحیحی بوخاری فەرموودەی ( ٣٨٢٢ ) لاپەڕە ( ٩٦٢ ) وەرگێڕاوە .

وتیان : کاتێ بەو جۆرە تۆی بینی ، فەرمووی : ( کەسم نەدیوە وەك ئەم جوان بێت ، مەگەر ( یوسف ) سەلامی خوای لەسەر بێت [1]. وەلە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە جریرەوە ( ﷺ ) ، عمر ( ﷺ ) فەرموویەتی : جریر یوسفی ئومەتی ئیسلامە [2] . وە لە علی کوڕی ئەبو تالیبەوە(ﷺ ) سێ جار فەرموویەتی : (جریرلە ئێمەیە لە ئەهل و بەیت)[3] . وە لە ( الشعبی ) یەوە : عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) لە ماڵێکدا بوو ، (جریری کوڕی عبدالله ) شی لەگەڵدا بوو ، لە ماڵە کە بۆنێکی هەست پێ کرد ، فەرمووی : باخاوەنی ئەو بۆ نەهەڵسێت دەستنوێژ بگرێت . جریریش وتی : ئەی ئەمیری ئیمانداران ئایا هەمووی دەستنوێژ بگرێت ؟ عومەریش ( ﷺ ) فەرمووی : ڕەحمەتی خوات لێ بێت ، جریر ، بەڕاستی لە جاهلیەتدا باشترین پیاو بوویت ، ئێستاش کە لەناو ئیسلامدایت باشترین پیاویت[4].

## " خەباتی جریر ( ﷺ ) "

جریر ( ﷺ ) لە زۆر غەزادا دژی دوژمنانی ئیسلام شەڕی کردووە و تیایدا پاڵەوانێتی و . لێهاتووی تۆمارکردوە ، الشعبی دەڵێت : ڕۆژی (قادسیە) جریری کوڕی عبدالله بەسەر دەستە ڕاستی سوپاکەی سعدی کوڕی ئەبو وەقاوە بوو .

ابن سعد دەڵێت : یەزیدی کوڕی جریر لە باوکیەوە ، دەڵێت : پێشەوا ( عمر ) لە کاتێکدا خەڵکی خۆیان بەدوور ئەگرت لە عێراق و شەڕکردن لەگەڵ ( عەجەمەکاندا ) ، پێی وتم : خۆت و هۆزەکەت بگەیەنەرە ئەوێ و دەستت بەسەر هەر چیەکدا گرت چواریەکی بۆ خۆت . ئەوە بو دوای ئەوەی غەنیمەکانی ( جلولا ) کۆکرایەوە، جریر وتی کە چواریەکی هەموو غەنیمەکە هی ئەوە . ( سعد )یش پەیامێکی نارد بۆ عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) ، لەوەڵامدا ( عمر ) فەرمووی : جریر ڕاست دەڵێت ، ئەوەم پێی وتبوو .

---

[1] – پیاوانی جێی متمانەن : حافظ لە ( الاصابە ) ( ٢ / ٧٧ ) باسی کردووە و ریوایەتی کردوە بۆ (النجوی ) .

[2] – پیاوانی جێ متمانەن الارنؤوط ( سیر اعلام النبلاء ٢ / ٥٣٥ ) .

[3] – بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٥٣٤ ) ، بەڵام ناگونجێ .

[4] – بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٣٧٦ ) .

وتی : ئەگەر لەسەر بەڵێنێك كە پێی دراوە ، ویستی با ئەو چواریەكە بەرێت بۆخۆی و هۆزەكەی ، و پێی بدەن ، وە ئەگەر لە پێناوی خواو ئاینەكەی و بەهەشتەكەیدا شەڕی كردووە ، ئەوا ئەویش پیاوێكە لە موسڵمانان و هەروەك ئەوان ماف و ئەركی هەیە.

ئەوجا كە پەیامەكەی عمر ( ﷺ ) گەیشتە دەستی ( سعد ) ، هەواڵەكەی بە (جریر) دا ، جریریش فەرمووی : پێشەوای ئیمانداران ڕاست دەڵێت ، من پێویستم بەو غەنیمەیە نیە ، و یەكێكم لە موسڵمانان [1].

بەم جۆرە هاوەڵان خۆیان بۆ خوای خۆیان یەكلایی كردوەتەوە .. وەكاتێكیش فیتنە و ئاژاوە كە سەری كێشا ، ( جریر ) ( ﷺ ) خۆی كە نارگیر كرد لە ( علی و معاویە) خۆی دور گرت ، تاوەكو لەسەردەمی ویلایەتی ( ضحاك ی كوڕی قیس ) بەسەر كوفەوە لە ( الشراة ) وەفاتی كرد [2]. ( ڕەزای خوای لیّ بێت ) .

---

[1] - بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣٧٦ ) .

[2] - ئیبنو سعد ( ٢ / ٢٢ ) .

## " ٥٩ - ابو ثەعلبەی خشنی ( رضي الله عنه ) "

## " لە کاتی سوجدە بردندا وەفاتی کرد !! "

( ئەبو ثە علەبەی خشنی ) ی هاوەڵی پێغەمبەری خوا یە ( ﷺ ) ..

دار قطنی و غەیری ئەویش ، دەڵێت : یەکێکە لەوانەی لە بەیعەتی ( رضوان ) دا بەشدار بوون ، و ڕۆژی خەیبەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە غنیمە بەشی ئەویشی جیاکردەوە ، هەروەها ناردویەتی بۆلای هۆزەکەی وە عەمری کوری جرهم ی برای، هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) موسڵمان بووە [1].

کاتێ لە ڕاستی ئەم ئاینە گەیشتوو ، موسڵمان بوو ، دڵنیا بوو لەوەی ئەم ئاینە بۆ هەمیشەیی بەنەمری دەمێنێتەوە و خوای پەروەردگار ئەهلەکەی باڵا دەست دەکات و منەت و چاکەی خۆی بەسەر چەوساوەکانی سەر زەویدا دەبارێنێ و دەیانکاتە پێشەوا و میراتگر لەسەر زەویدا .

ئەبو ثە علەبە دەڵێت :

هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێم وت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بمنێرە بۆ فلاَن و فلاَن جێگا لە شام ( تا ئەم ئاینەیان پێ ڕاگەیەنم ) ئەو کاتە هێشتا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەستی نەگەیشتبووە ئەو جێگایانە – فەرمووی : ( الا تسمعون ما يقول هذا ؟ ) گوێتان لێ یە ئەم پیاوە چی دەڵێت ؟

ئەبو ثە علەبە وتی : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، دڵنیام کە دەگەینە ئەوێ و تیایدا باڵا دەست دەبین . پێغەمبەری خوا ( ﷺ )پەیامێکی نووسی و پیایدا ناردی [2]!

بەڕێزان ، سەیری دڵنیایی و باوەڕی بکەن بەو پەیمانەی خوا بە بەندە ئیماندارەکانی خۆی داوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە خبابی ئەوت – وەك پێشتر باسمان کرد ، و الله ليمكن الله هذا الامر حتى يسير الركب من صنعاء الى حضرموت .. ) واتە . سوێند بە خوا خوا فەرمانی خۆی جێ بەجێ دەکات بەو جۆرەی سوار لە ( صنعاء )ەوە بەرەو ( حضرموت ) بەڕێ دەکەوێت و لە هیچ شتێ ناترسێ ... تا کۆتایی فەرموودەکە .

---

[1] – الاصابە ( ٧ / ٢٧٦ ) ، ژیانی عەمری کوری ثعلبی خشنی .

[2] – سەنەدەکی ( صحیح )ە : احمد لە ( المسند ) دا ڕیوایەتی کردوە ( ٤ / ١٩٣ ، ١٩٤ ) .

## " لە وتەکانی "

لە اسماعیل ی کوڕی عبیداللە وە ، دەڵێت : ابو ثە علەبە و کعب دانیشتبوون ، ابو ثـە علەبـە وتـی : ئـەی ئـەبو اسماعیـل ، هـەر بەندەیـەکی خـوا خـۆی بـۆ خواپەرسـتی یەکلاکاتـەوە ، ئەوا لـە پێویستی دنیا بیّ نیازی ئەکات . کعب وتـی : لـە پـەڕاوی خـوای پەروەردگاریـشدا هـاتووە [1] : هەرکـەس خەمـەکانی لەیـەك خەمـدا کۆکاتـەوە ، ئـەویش گوێـدێری خـوا بێـت ، ئـەوە خـوای گـەورە بـیّ نیـازی ئـەکات لـە هـەموو خەمـەکانی و ئاسمانەکان و زەوی زامن دەکات بۆی و ڕۆزی دەکەوێتە لای خوا و کارو کردەوەشـی بۆ خۆیەتی . هەر کەسیش خەمەکانی جیا بکاتەوە و بیانژمێرێت و لە هەر دۆڵێك خـەمێك دا نێـت لای خـوای گـەورە گـرنگ نیـە لـەکام دۆڵەیانـدا تیادەچێت . پێشەوا ( زەهـەبی ) ، دەربـارەی ئەمـە دەڵێـت : ( گـەڕان بـەدوای هۆکارەکـانی ژیانیـشدا جۆرێکـە لـە خۆیـەکلا کردنەوە بۆ خواپەرستی ، بەتایبەتی ئەوەی خاوەنی ماڵ و منداڵ بێت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( إن أفضل ماأكل الرجل من كسب يمينه ) [2]باشترین شتێك پیاو بیخوات ، ئەوەیە لە کەسابەتی دەستی خۆی پەیدای کردبێت .

هـەر کەسـیش بـەهۆی لاوازی یـەوەیان فەراهـەم نـەبوونی بـوارەوە نـەتوانێت هۆکارەکان بگرێتەبەر ، ئەوە خوای گەورە لە ڕێی ( زەکاتەوە ) بەشی دیاری کردووە [3].

## " مردنێکی بەڕێز "

تەمـەن درێـژەی کێـشا لەگـەڵ ئـەبو ثـە علەبـە دا ( رضي الله عنه ) و تامـەزۆری لیقـای پەروەردگاری دەکرد و لەژیانیدا ئاواتێکی هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە بەکڕنوش بردنـەوە بە لیقای پەروەردگاری بگات . دەیفەرموو : ( تکام وایە خودا (نـەمخنکێنیّ) وەك خەڵکی دەخنکێنێت ) – مرۆڤ لە کاتی گیانکێشاندا هەناسەی نەمێنیّ و دەخنکێت.

---

[1] – ئەمە لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە ، و بەماناکەی باسکراوە .

[2] – سـەنەدەکی لـەڕێی شـاهیدەکانەوە ( حسن )ە طبرانـی لـە ( الکبر ) و ( الاوسـط ) دا گێڕاوایەتـەوە پیاوانیشی جیّ متمانەن وەك هیثەمی دەڵێت لە المجمع دا ( ٤ / ٦١ ) .

[3] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٥٧٠ ) .

ئەوەبوو لە کاتێکدا خەریکی شەو نوێژ بوو لە نیوەشەودا ، و لە کاتی کڕنوشدا ، وەفاتی کرد . کچەکەی لە خەونیدا بینیبووی کە باوکی مردووە ، پەشۆکایی خەبەری بوویەوە ، و دایکی بانگ کرد : پرسی : باوکم لە کوێیە ؟

وتی : لە جێگای نوێژەکەیەتی : بانگی کرد ، وەڵام نەبوو ، دەویست بە ئاگای بێنێت – ڕایوەشاند – دەبینێ وەفاتی کردووە[1] .

ابو حسانی زیادی و ابو عبید ، دەڵێن : ساڵی ( ٧٥ )ی کۆچی وەفاتی کردووە (ڕەزای خوای لێ بێت ) .

[1] – بڕوانە / الاصابە ( ١١ / ٥٦ ) .

## ٦٠ - " معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ( رضي الله عنه ) "

## " خاڵی موسڵمانان و نوسەری سروشی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

کێ یە ؟ معاویەی کوڕی ابوسفیانی کوڕی امیەی کوڕی عبدشمس ی عبدمنافە .. ، ئەمیری ئیسلام ، ابو عبدالرحمن ی قورەیشی ئومەوی مەککی یە [1]... خاڵی ئیمانداران و نووسەری سروشی پێغەمبەری خوابە ( ﷺ ) [2].

هندی کچی عتبەی کوڕی ربیعە دایکیەتی ، وتراوە : لە کاتی ( عمره القضاء )دا و پێش باوکی موسڵمان بووە ، و لە ترسی باوکی نەیوێراوە شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەوێت ، و لە ڕۆژی فەتحی مەککە دا ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا کرد.

( ابن ئەبو الدنیا ) و غەیری ئەویش دەڵێن کە : معاویە کەسێکی باڵا بەرزی پێست سپیی جوان وچاك بووە .

### " فەزڵ و گەورەیی "

١ - لە عبدالرحمن ی کوڕی ئەبو عمیرە وە ، کەیەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) دەگێڕێتەوە بە معاویەی فەرموو : ( اللهم إجعلهُ هادياً مهدياً و أهدبه )[3] ئەی پەروەردگار ڕێنمونی معاویە بکەو با ببێتە کەسێکی ڕێنمونیکراو و ، خەڵکیش لەسەر دەستی هیدایەت بدە .

٢ - وە لە ئەبو ادریسی خولانی یەوە ، دەڵێت : کاتێ عمری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) ، عمیری کوڕی سعدی لە ( حمص ) لەکار لابرد ، معاویەی کردە والی ئەوێ . خەڵکیش دەیانوت : عمیری لابرد و معاویەی لە جێی دانا !؟

[1] - بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ١٢٠ ) .

[2] - بڕوانە : البدایە والنهایە ، ئیبنو کثیر ( ٥ / ٦١٩ ) .

[3] - صحیح / بڕوانە صحیح سنن الترمیزی ( ٣٠١٨ ) ، فەرمودەی ( ١٩٦٩ ) .

عومەریش وتی : کەس باسی معاویە نەکات بە چاکە نەبێت ، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووە دوعای بۆ معاویە دەکرد و دەیفەرموو : ( اللهم اهدبه )[1] ئەی خوای پەروەرمگار لەسەر دەستی خەڵکی ڕێنمونی بکە ...

٣ – وە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ، دەڵێت : معاویە ( سروش ) ی بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەنوسیەوە[2].

٤ – لە ( عرباض ی کوڕی سارية ) وە ( ﷺ ) ، گوێی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە فەرموویەتی : ( اللهم علم معاوية الكتاب ، و الحساب ، و قه العذاب )[3] واتە : خوایەگیان معاویە فێری نووسین و ژماردن بکە و لە ئازار و دەردە سەری بیپارێزە.

وە عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) کردوویەتی بە والی بەسەر شامەوە و دواتریش (عوسمان ) ( ﷺ ) هەر بە والی شام هێشتویەتیەوە .

پێشەوا ( زەهەبی ) دەڵێت : ئەوەندە بەسە بۆ کەسێك عومەر بیکاتە پێشەوای هەرێمێك و دواتریش ( عوسمان ) ، لە کاتێکدا ئەو هەرێمە پڕیەتی لە ئاژاوەو تەنگەژە ، و هەڵسێت بە بیناکردن و سازدانەوەی بەوپەڕی ڕێك و پێکی و خەڵکی بە بەخشندەیی و لەسەر خۆیی خۆی ڕەزامەندکات ، ئەگەر چی هەندێکیان بۆ جارێك دڵیان ئێشا ، قەیدی نیە با ئەمیر وەها بێت ...

– ئەگەر چی هاوەڵانی تری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زۆر لەم باشتر و چاکترە بوون ، بەڵام بەوپەڕی لەسەر خۆیی و سنگفراوانی و بەهێزی زیرەکی و بیروڕای خۆی سەرکردایەتی جیهانێکی کردووە . هەندێکیش کەلێن و ناتەواوی هەیە ( واتە خەسڵەتی ناباشیشی کەمێك هەبووە ) ، خوا خۆی حوکم دەکات لە قیامەتدا ..

بەگشتی کەسێکی خۆشەویست بووە لەلای ڕەعیەتەکەی ، بیست ساڵ نوێنەرایەتی ( شام ) و بیست ساڵیش پاشایەتی کردووە ، و کەسیش لە بەڕێوەبردنی قسەی نەبووە ، بەڵکو نەتەوەکان ملیان بۆ کەچ کردووە و فەرمانڕەوای عەرەب و عەجەمی

---

[1] – ( صحیح )ە بەوەی پێش خۆیەوە : ( صحیح )ی ( ٣٠١٩ ) .

[2] – پیاوانی جێی متمانەن : الارنؤوط (( سیر اعلام النبلاء ٣ / ١٢٣ ) .

[3] – احمد لە ( المسند ) ( ٤ / ١٢٧ ) دا ڕیوایەتی کردوە . و لە اسنادەکەیدا ( حارثی کوڕی زیادی شامی) هەیە ، حافظ لە ( التقریب ) دا دەڵێت : کەسێکی ( لین الحدیث ) و باقی پیاوانی فەرموودەکە جێ متمانەن . زەهەبی دەڵێت : فەرموودەکە شاهیدێکی بەهێزی هەیە .

کردووە ، سنووری فەرمانڕەوایی لە هەردوو حەرەم و مصر و شام و عێراق و خوراسان و فارس و جزیرە و یەمەن و مەغریب و غەیری ئەوانیشدا بووە[1] .

## " ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆی "

لە ( المسند ) ی پێشەوا ( احمد ) داهاتووە : ( معاویە ، تونێشووی سەفەری هەڵگرتووبە ڕێ کەوت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەری بۆی بەرزکردەوە و فەرمووی : (یا معاوية ، ان و ليت امراً ، فاتق الله و اعـ ـدل ) . واتە : ( ئەی معاویە ئەگەر کاروبارێکت گرتە دەست ، ئەوا لە خوا بترسە و دادپەروەربە .

معاویە ، دەڵێت : بەردەوام گومانم وابوو لەو قسەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە ، کە لە کارێکدا تووشی تاقیکرنەوە دەبم ، هەتاوەکو لە کۆتاییدا تووشی بووم)[2]

## " پیاهەڵدانی هاوەڵان ( ﷺ ) بۆی "

لە ( کورەیب مەولای ابن عباس )ەوە ، دەڵێت : معاویە ی بینی نوێژی شێوانی دەکرد ، پاشان تەنها یەك ڕکات نوێژی ( وتر )ی کرد ئەویش بۆ ( ابن عباس ) ی گێڕایەوە ، ابن عباس فەرمووی : پێکاویەتی ( واتە تەواوە ) ، کوڕم ! کەسمان لە معاویە شارەزا ترنیین ، نوێژی ( وتر )یش یان یەك ڕکاتە یان پێنج یان حەوت یان زیاتر [3] .

وە ( مجالد ) لە ( الشعبي ) وە لە ( الحارث ) ەوە ، لە علی کوڕی ئەبو تالیبەوە ( ﷺ ) دەگێڕێتەوە ، فەرمووی : ڕقتان لە پێشەوایەتی معاویە نەبێت ، چونکە ئەگەر لە دەستتان بچێ دەبینن کە چۆن سەرەکان لەلاشەدەبنەوە ( واتە کوشتار دروست دەبێ)[4].

---

[1] – سير اعلام النبلاء ( ٣ / ١٣٣ ) .

[2] – پیاوانی جێ متمانەن : احمد ( المسند ) ( ٤ / ١٠١ ) .

[3] – ارنؤوط دەڵێت: پیاوانی جێ متمانەن و لە ( مسندی شافعی ) داهاتووە ( ١ / ١٠٨ ) سير (٣/١٥٢).

[4] – بڕوانە / تاريخ الاسلام ( ٢ / ٢٨٧ ) .

## " هێرشێکی گوماناوی !! "

هەلپەرستان ، ئەوانەی هەمیشە دەیانەوێ تانە لە ئاینی خوای پەروەردگار بدەن ، ئەو ناکۆکی یەی لە نێوان علی و معاویە دا ( رەزای خوایان لێ بێت ) ڕووی دا کردوەتە پاڵپشتێك بۆ تانەدان لە ئاین و گومان دروست کردن لە نیەتی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ ) و شتەکانیان ئاوەژوو کردەوە و بەو جۆرە واتاکان شێوان و گۆڕان و ... زۆرێك لە خەڵکی لەڕێ لایاندا کە تێنەگەیشتوی یان لەم ئاینە هۆیەك بوو بۆ لادانیان ، پاشان ئەو ڕیوایەتە دروست کراو و پوچانەی کە لە مێژوودا بەمەبەستی دەستکاری کردن و گۆڕینی واتاکان هەڵبەسترا بوو هۆی سەرەکی ئەم لادانە بوو ، لەبەر ئەوە بۆ دەرخستنی هەق و ڕاستی رای زانایانی ئیسلام نیشان دەدەین . بابزانین زانایانی ئیسلام و فەقیە و شارەزایانی نەتەوەی ئیسلام دەربارەی ئەم ناکۆکی یە چی دەڵێن ؟

الحافظ ابن کثیر ، دەڵێت :

( ... پاشان ئەوەی لە نێوان معاویە و علی دا هەبوو پاش شەهید بوونی عوسمان، لە ڕێی کۆشش ( اجتهاد ) و بیروڕاوە بوو ، و کوشتارێکی گەورە لە نێوانیاندا ڕووی دا .... وە هەق و ڕاستی لەلای ( علی ) یەوە بوو ، بەڵام ( معاویە )ش لەلای کۆمەڵی زانایان لە کۆن و ئێستا دا عوزری هەیە ، وە زۆر فەرموودەی ( صحیح ) هەیە کە شایەتی ئیسلامیەتی هەردوو کۆمەڵەکەیە ، هەروەك لەم فەرموودە ( صحیح )ەدا هاتووە : ( تمـرق مارقة علی خیر فرقة المسلمین ، فیقتلها ادنی الطائفتین الی الحق ) .

واتە : کۆمەڵێك کە ( خوارج )ن دزە دەکەنە ناو باشترین کۆمەڵ لە موسڵمانان ، و ئەوەیان کە لە هەقەوە نزیکترینیانە ، دەیانکوژێت .

وە ( المارقة ) مەبەست لە ( خوارج )ەکانە و علی و هاوەڵانی دەیانکوژن ، پاشان ( علی ) دەکوژرێت و کار لە دەستی ( معاویە ) دا دەمێنێتەوە ئەمەش ساڵی ( ٤١ ) ، وە معاویە لە هەر ساڵێکدا دوو جار غەزای ڕۆمی دەکرد ، جارێك لە هاویندا و جارێك لە زستاندا و فەرمانی دەکرد بە پیاوێك لە هۆزەکەی تا ( حەج ) بەو خەڵکە بکات ، و خۆیشی ساڵی(٥٠ ) حەجی ئەنجامدا و ( یزید ) ی کوڕیشی ساڵی (٥١) ... وە لەو ساڵە یان ساڵی دواتر بوو غەزوی . وڵاتی ڕۆمیان کرد ... ئەوە بوو خەڵکێکی زۆر لە هاوەڵە بەڕێزەکان

لەگەڵی چوون تا گەمارۆی (قسطنطینة)ی دا ، و لە ( صحیح ) یشدا هاتووە : ( اول جیش یغز و القسطنطینة مغفور لهم)[1] .

واتە : یەکەمین سوپا غەزوی قسطنطینة دەکات خودا لێیان خۆش بووە . هەروەها ( الحافظ الذهبي ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : ( معاویە لە باشترین ئەو میرانەیە کە دادپەروەری یان بە سەر ستەمیاندا زاڵ بوو ، وە لە خراپەش (هنات ) بەری نەبوو ، وە خودا لێی خۆش بێت )[2] . بڕوانە : خوێنەری بەڕێز .. لە ئەدەب و ویژدانی ( زەهەبی ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت .

وە پرسیار لە مامۆستای ئیسلام ( ابن تیمیە ) کرا ، دەربارەی ئەوکەسەی نەفرەت لە معاویە بکات ، سزای چی یە ؟

فەرمووی : ( سوپاس وستایش بۆ خوا ، ئەوەی نەفرەت لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکات وەك معاویەی کوڕی ابوسفیان و عەمری کوڕی عاص و وێنەی ئەوان .... ئەوە شایستەی سزایەکی گەورەیە . بە ڕای هەموو پێشەوایان و زانایانی ئەم دینە ، بەڵام لەسەر جۆری سزاکەی جیاوازی ڕا هەیە ، ئایا سزاکەی کوشتنە ؟ یان کەمتر و خوارترە لە کوشتن[3]؟

وە ( المیمونی ) دەڵێت : احمدی کوڕی حنبل پێی ، وتم : ئەی (ئەبا حەسەن) ئەگەر پیاوێکت بینی یەکێ لە هاوەڵانی بەخراپە باس کرد ئەوا دەربارەی ئینتمای بۆ ئیسلام تۆمەتباری بکە[4] .

وە ( الفضل بن زیاد ) ، دەڵێت : گوێم لە ئەبو عبدالله بو ، واتە : احمدی کوڕی حنبل ، دەربارەی پیاوێك کە لە پلەو پایەی معاویە و عەمری کوڕی عاسی کەم کردبووە وە ، پرسیاری لێ کرا ئایا پێی دەوترێت ( رافضی ) ؟

فەرمووی : ئەوەی کەوای لێ کردووە بوێری قسە لە ئاستا بکات نیشانەی بوونی خراپە یە لە ناخیدا ، هەرکەسێ یەکێ لە هاوەڵان بەکەم سەیر بکات ئەوە خراپە لە ناخیدا هەیە[5].

---

[1] - بڕوانە / البدایە و النهایە ( ٥ / ٦٢٩ ، ٦٣٠ ) لە باسی ژیانی ( معاویە ) دا .

[2] - بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ١٥٩ ) .

[3] - بڕوانە / مجموع الفتاوی ( ١٨ / ٣٧ ، ٣٨ ) طبع ( دار الوفاء )

[4] - بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٦٤٤ ) .

[5] - بڕوانە / البدایە و النهایە ( ٥ / ٦٤٤ ) .

لە پاشان : ئەمە ڕای زانایانی ئوممەتە دەربارەی پێشینە پاك و چاكەكانمان .. ئیتر پەلكێشان لەم چاخەماندا چی دەڵێن ؟! وە لە قازانجی كێ ئەم هێرشە گوماناوی یە دەكەنە سەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و تۆمەتی دەبەنگی و ناپاكی لێ دەدەن ؟

بانگخوازی گەورە ( مامۆستا محمد غزالی ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت : ( لە واقیعدا زۆر خەفەتبار بووم بەوەی كە خەڵكانێكی هیچ و پوچ بەو شێوازە بەدكارانەیە دەبارەی هاوەڵانی پێشنەیە كەمینەكان دەدوێن ، جا ئەگەر ئەو سەركردانەی كە ڕزگاری یان هێناوەتە بوون بەم شێوازە خراپە هێرشیان بكرێتە سەر و سووك بكرێن ، چی لە مێژووی ئومەتمان دەمێنێتەوە ؟

لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوكەسەی كە بێ ئەدەبی دەكات لەگەڵ گەورە پیاوانی ئیسلامدا و هەوڵی ڕوشاندنی كەسایەتی یان دەدات لە بازنەی كۆمەڵی موسڵمانان دووری خستووەتەوە ، دەفەرموێت :

( ليس منا من لم يوقر كبيرنا ، ويرحم صغيرنا ، و يعرف لعالمنا حقه ) . واتە : لە ئێمە نی یە هەر كەسێ ڕێز لە گەورەكانمان نەگرێ و بەزەیی بە بچوكەكانماندا نەیەتەوە و مافی زاناكانمان نەدات .

وە من بۆیە ئەمە دەڵێم ، چونكە تێبینیم كردووە لەناو پیاوانماندا جۆرە ژاوەژاوێكی سەری هەڵداوە هەر لە چاخی یەكەمەوە تا ئەم چاخەی ئیستامان ، دەبینی تەنها هەڵەیەك بدۆزنەوە هەزاران ئەوەندە گەورەی دەكەن !

باشە لە بەرژەوەندی كێ ئەم جەور و ستەمە ؟ لە قازانجی كێ ئەم ئوممەتەمان لاواز دەركەوێت لە جیهانێكدا كە نەزان و خۆپەرستان لە هەوڵی گۆشەو نەشونومادان[1].

## " وەفاتی معاویە ( ﷺ ) "

كاتی سەرەمەرگ وەسیەتی كرد نیوەی دارایی یەكەی بخرێتە ( بيت المال ). پاشان حاڵی خراپ بوو ، فەرمووی : ( نەفرەتت لێ بێت بۆ چ ماڵێك بوویت ، چل ساڵ خاوەنت بووم ، بیستی ئەمیری و بیستی پاشایەتی ، ئێستاش ئەمە حاڵی منە و چارەنووسی منە لەگەڵتدا ، نەفرەت لە دنیا و ئەوەشی حەزی لە دنیایە.

---

[1] – الحق المر / محمد غزالی لاپەڕە ( ١١٦ ، ١١٧ ) بە دەستكاری یەوە .

محمدی ابن سیرین دەڵێت : کاتێ معاویە کەوتە سەرە مەرگ بەردەوام ڕوومەتی دەخستە سەر زەوی و ڕووی وەردەگێڕاو لایەکەی تری ڕومەتی لەسەر زەوی دادەناو دەگریا و دەیوت : ئەی خوای پەروەردگار خۆت فەرمووتە : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا ﴾ سورة النساء ، آية (٤٨) .

واتە : بەڕاستی خوا خۆش نئەبوت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت ، بێجگە لەوە لەهەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت لەهەر کەسێك کە دەیەوێت .

دەسا پەروەردگار بەویستی خۆت بمکەیەکێ لە لێخۆشبوان [1]. وە لە کتێبی (الاحیاء ) داهاتووە : ( کاتێ معاویە کەوتە گیانەدان فەرمووی : دامنیشێنن ، دایاننیشاند، بەردەوام تەسبیحاتی خوای دەکرد پاشان دەستی بەگریان کرد ، فەرمووی : ئەی معاویە دوای پیری و پەککەوتەی یادیی پەروردگارت ئەکەیت ! و ئەوەندە گریا دەنگی گریانی بەرز بووەوە و فەرمووی :

ئەی خوای پەروەردگار لەم شێخە سەر پێچیکارە دڵرەقەی خۆت خۆش بەو ڕەحمی پێ بکە ، پەروەدگارا پەشێویم کەم کەرەوە و لە تاوانم خۆش بەو میهرەبانی خۆت بگێڕەوە بەسەر ئەم بەندەیەتدا کە لە غەیری تۆ تکاو ڕەجای نیە و جگە لەزاتی تۆ لە کەس دڵنیا نەبووە [2].

وە لە ( عبدالا علی کوڕی میمونی کوڕی مهران )ەوە ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : معاویە وەسیەتی کرد ، فەرمووی : ( کاتێ خەریك بووم ئاوم دەکرد بە دەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ دەستنوێژ ، کراسەکەی داکەند و منی پێ داپۆشی منیش دوایی لامبرد و هەڵمگرت و سەرە نینۆکەکانیم – ئەوەی کە فڕێ ئەدرێ پاش نینۆك کردن – کۆکردەوە و شاردمەوە ، ئەگەر مردم ، ئەو کراسە بکەنەبەرم و نینۆکەکانی چاوم ، بەڵکو بە بەرەکەتی ئەوانە خوا ڕەحمم پێ بکات )[3] ، ( ڕەزا و ڕەحمەتی خوات لێ بێت ) .

---

[1] – بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٦٤٦ ، ٦٤٧ ) .

[2] – بڕوانە : الاحیاء ( غەزالی ) ( ٤ / ٤٨ ) .

[3] – بڕوانە : تاریخ الاسلامی ( ٢ / ٣٢٣ ) ، تاریخ الطبری ( ٥ / ٣٢٦ ، ٣٢٧ ) .

## " ٦١ - سەعدی کوڕی عبید ( رضي الله عنه ) "

## " شەهیدێک سەرەخۆشی لە خۆی دەکات !! "

ناوی ( سەعدی کوڕی عبید ) باش لەبەرکەن ، چونکە هەواڵێکی سەیر و سەرسوڕهێنەری هەیە . هاوەڵان بە ( سەعدی قورئانخوێن ) ناویان دەبرد .

خاوەنی دەنگێکی خۆش و ئاوازێکی نەرم و ناسك بوو کە ئایەتەکانی خوای گەورەی دەخوێندەوە دەرونی پڕ دەکرد لە ترس و هەیبەت و گەورەیی . و دڵەکانی دەهەژاند و فرمێسکی لە چاوان دەباراند .. و قورئان تەواو کاریگەری لەسەر دڵی (سعدی کوڕی عبید) دانا بوو ، پڕی کرد بوو لە ترس و سام و سۆز و تامەزرۆیی بۆ لای پەروەردگار ..

بەوجۆرە کاتێ لەگەڵ دوژمنانی خوا دا ڕووبەڕوو دەبوویەوە ، دەروونی بە هیوا و ئامانجی بە دەست هێنانی شەهادەت بوو تاوەکو خۆی بخاتە ڕیزەکانی ئەو بەڕێزانەی خوای پەروەدگار دەربارەیان دەفەرموێ : ﴿ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴾ سورة النساء ، آية (٦٩) .

- سەعد یەکێکە لەوانەی لەسەر دەمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قورئانیان کۆکردەوە . وە لە هیچ غەزایەکدا کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئامادەی بوبێت ، دوانە کەوتووە و بەشدار بووە .

( کاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، و دووڕوەکان ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان ئاشکرا کردوو بە ڕاشکاوی لە ئاین هەڵگەڕانەوە ، سەعدی کوڕی عبید لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کەتیبە ئیماندارەوە بوو کە هەڵگەڕاوانی لە (یەمامە) بەسزای خۆیان گەیاند.

سەعد لەسەر مەیدانی جەنگ هەمیشە خۆی دەهاویشتە ناو دەرگاکانی مەرگەوە بە ئومێدی ئەوەی ڕەزامەندی خوا بە دەست بێنێ و شەهید بێت ، بەڵام بەویستی خوای پەروەردگار لە هەموو جەنگەکاندا بە ساغ و سەلامەتی دەمایەوە ئەوجا هەڵمەتی ڕزگار کردنی عێراق هاتە پێش کە پێشەوای دادپەروەر ( عمری کوڕی خەتاب ) بەڕێی دەکرد ،

سەعد دیسان لە پێشەوەی خەباتکارانەوە ئەبوو ، بە ڕۆژ لەگەڵ بێ باوەڕان شەڕی ئەکرد و بە شەویش باوەشی بە قورئانخوێندندا دەکرد .

هەڵمەتەکەش لەسەر کەوتنێکەوە دەچوو بۆ سەرکەوتنێکی تر ، تا ڕۆژی (الجسر)[1] هاتە پێش ، ئەو کاتەی شمشێرەکانی ( فارس) و فیلەکانیان لە دەوری موسڵمانان زیاد یان کرد و هەڵگری لیوا ( ئالأی ) موسڵمانانیان کوشت کە ناوی ( ابو عبیدی ثقفی ) بوو فیلێك ی زۆر گەورە لەسەری چۆکی داواو پاشان براکەشیان کوشت و دواتر ( جبر )ی کوریشی کوژرا ، و یەك لە دوای یەك ئالاکەیان دەدایە دەستی ئەوی تریان ، تالە کۆتایی دا ( مثنــی کــوڕێ حارثــە ) ئالأکــەی وەرگــرت و موســڵمانانی بــەرەو جێگایــەکی دڵنیــا کێشایەوە کە لەوە پاراستنی بە تەواوی تیا بچن .

سەعدی کوڕی عبید یش ئەو کاتە یەکێ بوو لەوانەی خۆیان ڕزگار کرد لە دەستی فارسەکان ، ئەوە بوو کاتێ جەنگەکە هێور بوویەوە ، و سەعد بەخۆیدا چوویەوە ، زۆر سەرزەنشتی خۆی کرد کە بۆچی هەوڵی خۆ ڕزگار کردنی داوە ، لە کاتێکدا کە ئەو لە هەموو جەنگێکدا خۆی فڕێ داوەتە لێواری مەرگەوە بە ئومێدی شەهید بوون .

ئەم هەڵویستەی بەردەوام دەروونی ئازار دەدا و خەونی لە چاوانی ئەتۆراند تا ئەوکاتەی بانگبێژی پێشەوا ( عمر ) بانگی لە موسڵمانان کرد خۆیان بگەیەننە قافڵەی ( سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ) کە بۆ کوشتاری فارسەکان بەرێ کەوتبوو ، سەعد ئەمەی بەهەل زانی بۆ قەرە بوو کردنەوەی ئەو هەڵەیەی لە ڕۆژی (الجسر ) دا کردی ... سەعدی پاڵەوان شمشێرەکەی هەڵگرت و سواری و لأخەکەی بوو بەرەو لای سەعدی کوڕی ئەبو وقاص کەوتەڕێ تا بچێتە پاڵ ڕیزی خەباتکارانەوە و ... لە ژێر ئالأی یەکتاپەرستیدا خۆی بگەیەنێتە قافڵەکەی سەعدی کوڕی ئەبو وقاص .

ئەوجا سەعدی کوڕی ئەبو وقاص ، سەعدی کوڕی عبیدی ناردە لای نعمانی کوڕی منذر ی پادشای نەصرانی ( حیرة ) کە بەفەرمانی ( کسری ) دەیویست لەگەڵ موسڵماناندا وتوێژ بکات ... سەعد دێتە ناو کۆشك و تەلاری بەرز و سەر بڵندی ( نعمان)، دەست و پێیەکەی ( نعمان ) هاواری لێ دەکەن کە کڕنووش بۆ نعمان بەرێت ، بەڵام ئەو گاڵتەی لێ دێت و بەردەوام دەڕوات تا دەگاتە لای تەختی پاشایەتی یەکەی ( نعمان ، و بەعیززەتەوە پەیامی موسڵمانانی پێ دەگەیەنێت کە ئەویش ئەوەیە : یان دەبێ موسڵمان بن یان سەرانە بدەن بە ملکەچی ، یان شەڕ .

[1] – ناو نراوە پردی ابی عبید .

پاشان سەعدی کوڕی عبید گەڕایەوە لای سەر کردەکەی و وەڵامی ( نعمانی ) لە خۆبایی پێ یەکە نەفسی خراپەکار و شەیتان بەسەریدا هیچ ڕێگەیەکی دیکەی پێ قبوڵ نەکرد ... جەنگ نەبێت .

وە لە ڕۆژی دواییدا سەعدی کوڕی ئەبو وقاس سوپاکەی ئامادە کرد و سەعدی کوڕی عبیدی بەسەر دەستە ڕاستی سوپاکەوە دانا شەڕ بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو، کوژراوان لەوناوەدا کەوتبوون ، پاشان شەڕەکە لە ئێوارەی ڕۆژی دووەمدا بڕێك هێور بوویەوە ، ئەوجا سەعدی کوڕی عبید هەستا و وتاری بۆ سەربازەکانی دەستە ڕاست داو فەرمووی :

( ئەی ئەوانەی خۆتان بە پەروەردگار فرۆشتووە ، سبەینێ بە دوژمنانمان دەگەین و شەهید دەبین و کەس ئامانشوات و بەجلەکانمانە وەسپاردە ئەکرێین !!! و لە ناو سەربازاندا چپەیەکی نزم دەستی پێ کرد : وەك ئەوەی سەعد بۆ ئێمە خۆی دەلاوێنێتەوە و سەر خۆشی دەکات .

هەرواش بوو ، ئەوەبوو لە ڕۆژی سێیەمی شەڕەکەدا ڕۆژی ( الهریر ) سەعدی کوڕی عبید وەها بەرەو ڕووی شەر بووە وە وەك ئەوەی لە دەرگاکانی بەهەشت بدات ، و ئەوەی ویستی بە دەستی هێنا و شەهید بوو ... موسڵمانانیش ئەو ڕۆژە سەرکەوتنێکی ناوازەیان بە دەست هێنا ... و مـوژدەی سەرکەوتن گەیشتە پێشەوا ( عمری کوڕی خەتاب)، ئەویش دەستی بەستایش ی پەروەردگاری کرد ، بەڵام هەواڵی شەهید بوونی سەعدی کوڕی عبید وەك هەورە بروسکەدا دەبەزیە سەر دڵی عومەر ( ﷛ ) و بۆ ئەو و بۆ هاوەڵانی تری شەهید بووی زۆر نارەحەت دەبێ ، دەفەرمووێ : سوێند بەخوا شەهید بوونی سەعد ئەم خۆشی یەی لێ زەوت کردم [1]. (ڕەزای خوا لەسەر سەعد و هاوەڵانی ) .

---

[1] – بڕوانە : ( مواقف بطولية من صنع الاسلام . زيادة ابو غنيمة ) ( ٧٧ – ٨٠ ) .

# " ٦٢ - عەمری كوڕی عاص ( رضي الله عنه ) "

## " خەڵكی موسڵمانان بوون و عەمری كوڕی عاص ئیمانی هێنا "

**فەرموودە**

كێ یە ؟ پێشەوای ئەمیر ، عەمری كوڕی عاصی كوڕی وائلە . بلیمەتی ناو قوڕەیش ، و پیاوی زانا و كەسێكە لە زیرەكی و قایمكاری و لە هۆشیاریدا بە نموونە دەهێنرێتەوە.

لەسەرەتاكانی ساڵی هەشتدا بە هاوەڵی خالدی كوڕی وەلید و عوسمان كوڕی تەڵحە بە موسڵمانی كۆچیان كرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەویش بە هاتن و موسڵمان بوونیان خۆشحاڵ بوو ، عەمری كردە سەركردەی بەشێك لە سوپا و بۆ غەزا ئامادەی كرد .. بوخاری دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كردیە سەركردەی سوپای (ذات السلاسل) . لە مەدینە دابەزی و دواتر لە میصر و لەوێ وەفاتی كرد .

### فەزڵ و گەورەیی

١ - لە ئەبو هریرەوە ( رضي الله عنه ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( إبنا العاص مؤمنان ، عمر و هشام )[1] واتە : هەردوو كوڕی ( عاص ) ، كە ( عەمر و هشام )ن ئیماندارن .

٢ - لە ( عقبە ) وە دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو دەیفەرموو : (اسلم الناس و آمن عمر و بن العاص )[2] واتە : خەڵكی موسڵمان بوون ، بەڵام عەمری كوڕی عاص باوەڕی هێنا .

٣ - زەهەبی ، دەڵێت : لە ( ئەبو عوسمان نهدی ) یەوە بە ( صحیح ) ی هاتووە ، لە عەمری كوڕی عاصەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عەمری كردوەتە سەركردەی سوپای ( ذات السلاسل ) لە كاتێكدا كەسانی وەك ابوبەكر و عومەر لەناو سوپاكەدا بوون[3] .

هەروەها زەهەبی ، دەڵێت :

---

[1] - سەنەدەكی ( حسن )ە : احمد دەری هێناوە ( ٢ / ٣٠٤ ) غەیری ئەیوش .

[2] - سەنەدەكی ( حسن )ە : احمد ( ٤ / ١٥٥ ) ، تیرمیزی ( ٣٨٤٤ ) .

[3] - صحیح : بوخاری دەریهێناوە ( ٧ / ١٨ ، ١٩ ) مسلم ( ٢٣٨٤ ) .

( عەمر لە شەڕ و جەنگدا لە هەموو پیاوانی قورەیش زیاتر ڕای دروست و بەتەگبیر بووە و قایمکار تر و لێهاتوو تر بووە و بەرچاو ڕونتر بووە . هەروەها لە میرە خانەدانەکانی عەرەب و گەورە پیاوانی کۆچبەران بووە ، خوداش لێی خۆش دەبێت و ببورێت .. خۆشەویستی بۆ دنیا و خۆگلاندنە چەند شتێك نەبوایە ، عەمر بۆ کاری جێنشینایەتی زۆر شیاو بوو ، لەڕاستیدا ئەو پێشینەیەکی هەبوو کە معاویە پێشینەی وای نەبوو ، ئەوە بوو بە هۆی بەرچاو ڕوونی و بلیمەتی یەوە کراوەتە ئەمیر بەسەر پیاوانی وەك ابوبەکر و عومەر ( ڕەزای خوایان لێ بێت )[1] .

## " موسڵمان بوونی "

لە ( قەیسی کوڕی سمعی ) یەوە ، عەمری کوڕی عاص وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! بەیعەتت دەدەمێ لەسەر ئەوەی کە خوا لە تاوانەکانی پێشوم خۆش بێت ؟ فەرمووی : ( ان الاسلام و الهجرة يجبان ماكان قبلهما ) واتە : ئیسلام و هیجرەت هەموو پێشینەکان دەسڕنەوە لە گوناه و تاوان .

دەڵێت : سوێند بە خوا لە هەمووان زیاتر لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەرمم دەکرد ، هەرگیز چاوم لە بینینی تێر نەبووە و نەمتوانیوە چاوم لە ئاستیدا هەڵبڕم[2].

– هەروەها لەگەڵ کۆچبەرانی (حبشە ) دا چیرۆکێکی هەیە و پێشتر لە ژیانی ( جعفری کوڕی ئەبو تالیب ) دا باسمان کرد ( ﷺ ) .

## " دڵسۆزیی عەمر ( ﷺ ) "

لە ( موسای کوڕی علی ) یەوە لە باوکیەوە ، گوێی لە عەمر بووە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناردی بەدوامدا و فەرمووی :

( خذ عليك ثيابك و سلاحك ، ثم ائتني ) واتە : جل و بەرگەکانت ( جلی شەڕ ) بپۆشە و چەکەکەت هەڵگر و وەرە بۆ لام . منیش چووم بۆ لای دەبینم دەستنوێژ دەگرێت ، چاوی لێم هەڵبڕی و لێمی ڕووانی و فەرمووی : ( اني اريد ان ابعثك على جيش ، فيسلمك الله و

---

[1] – بڕوانە : سير اعلام النبلاء ( ٣ / ٥٩ ) .

[2] – احمد لە ( المسند ) دەریهێناوە ( ٤ / ٢٠٤ ) .

يغنمك ، و أرغب لك رغبة صالحة من المال ) . واتە : من ئەمەوێت بەسەر سوپایەکەوە ڕەوانەت کەم ، تکام وایە خودا سەلامەتت کاو غەنیمەتێکی باشیش بەنسیبت بکات ، وەمن ئارەزوویەکی باشت بۆ دەکەم ماڵ و دەستکەوتێکت چنگ بکەوێ منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! من لەبەر ماڵ و سامان موسڵمان نەبووم ، بەڵکو ڕەغبەتم لە ئیسلام خۆی بوو بۆیە موسڵمان بووم ، هەروەها لەبەئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا بم . فەرمووی : (يا عمرو ، نعمّا بالمال الصالح للرجل الصالح )[1] واتە : ئەی عەمر ، باشترین شت ماڵی چاکە بۆ پیاوی چاک .

## " فیقهی عەمر ( ﷺ ) "

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زانست و کاریان پێکەوە گرێ دەدا .. هەیانبوو لە نوێژدا ئیمام و پێشەوا بوو ... لە خەباتیشدا وا بوو ، سەرێکیش بوو لە زانست و کارکردن دا و بەو جۆرە بوونە پێشەنگی میللەتان ، و ولآتان ملیان بۆ کەچ کردن . لە ڕاستیدا هۆی دواکەوتنی میللەتان دەگەڕێتەوە بۆ تەمەڵی و کار دواخستن و نەبوونی بڕوا .. و بواریان بۆ دوژمنان کردەوە سەرکردایەتی یان بکەن ، بەڵام ئەوەی لە عەمری کوڕی عاص بڕوانێ ، دەبینی لە جەنگەکاندا سەرکردایەتی دەکات و لە ئایینەکەشیدا شارەزا و فەقیهێکە . دەفەرموێ : لە شەوێکی ساردی شەوەکانی غەزای (ذات السلاسل ) دا تووشی ( احتلام ) بووم ، لەبەرزۆری سەرما ترسام لەوەی ئەگەر خۆم بشۆرم تیابچم ، بۆیە ( تەیەموم ) م کرد و پاشان نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵەکانم دابەست ، ئەوانیش ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گێڕایەوە ، فەرمووی : ( يا عمر و صليت باصحابك و انت جنب ؟ ) واتە : ئەی عەمر ئەڵێی بەلەش گرانی یەوە نوێژت بۆ هاوەڵانت دابەستووە ؟ دەڵێت : منیش هۆی خۆ نەشۆردنەکەم بۆ باس کرد و وتم : گوێم لێ بووە لە ئایەتێکدا پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ ... وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ سورة النساء ، آية (٢٩) . واتە : خۆتان مەکوژن ، بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێکەنی و هیچی نەوت[2] .

---

[1] – سەنەدەکی ( صحیح )ە ، احمد وە بوخاری لە ( الادب المفرد ) دا ( ٢٩٩ ) .

[2] – ( حسن ) ، ابو داود و بیهقی ریوایەتیان کردوە ، بوخاری لە صحیحەکەیدا بە هەڵپەسێردراوی هێشتویەتیەوە ( ١ / ٣٨٥ ) .

## " خەباتی عەمر ( رضي الله عنه ) "

عمری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) سەیری عەمری کوڕی عاصی کرد و فەرمووی : ناکرێ ( ئەبو عبدالله ) بەسەر زەویدا بڕوات ، ئیلا دەبێ پێشەوا بێت .وە ئەگەر بەدوای هەڵوێستە خەباتکارەکانیدا بگەڕێنین ... ئەوا بوار نیەبو باسی بکەین و بیژمێرین ... تەنها ئەوەندە بەسە بزانین کە :

١ – لە یەرموك پاڵەوانێتی خۆی سەلماندووە .

٢ – ابو عبیدە ، ناردوویەتی بۆ حەلەب و انتاکیە و لەگەڵ ئەهلی ئەو دوو جێگایەدا ئاشتەوایی کردووە ، هەموو ( قنسرین )ی بە زۆر ئازاد کردووە .

٣ – بەرەو میصر ڕۆشتووە و ئازادی کردووە .

٤ – ئەسکەندەری یەی ڕزگار کردووە .

٥ – ساڵی ( ٢٤ ) تەرابلوسی ڕۆژئاوای ڕزگار کردووە ، وتراویشە کە ساڵی ( ٢٣) بووە ، ئیدی دوژمنانی عەمر و ئەوانەی ڕقیان لێەتی ، خۆیان چی یان بۆ ئیسلام کردووە ؟ لە ڕاستیدا دوژمنانی ئیسلام چەند شتێکیان بە درۆ و بوختان بۆ هەڵبەستووە کە لێی بەری یە ، ئاگادار بن . ئەوەیشی لە ڕۆژی ( حنین ) دا ڕووی دا ... لە باسی ژیانی (معاویە)دا ( رضي الله عنه ) شتێکمان باس کرد . و لەو ئاستەدا بووەستین و لەسەری نەڕۆین باشترە .

## " کۆتایی ئەمیر و دواوتەکانی "

١ – لە ( عوانەی کوڕی حکم )ەوە ، دەڵێت : عەمری کوڕی عاص فەرمووی :سەیرە ئەو کەسەی مردن بەرەو ڕووی دێت و هۆشی بە خۆیەوەیەتی (عەقڵی لەگەڵدایە)، چۆن وەصفی مردن ناکات ئەوە بوو کە مردن لە عەمر نزیك بوویەوە ، کوڕەکەی ئەم قسەی خۆی وەبیر هێنایەوە ، و پێی وت : وەصفی بکە ، فەرمووی : کوڕم ! مردن زۆر لەوە گەورەترە وەصف بکرێت ، بەڵام بۆت وەسف دەکەم ، ئەزانی هەست بە چی ئەکەم ؟ وەك ئەوەی کێوی ( رضوی ) بەسەر گەردنمەوە بێت و ناوسکم پڕبێت لە دڕك و گیانم لە کونە دەرزی یەکەوە وا دێتەدەر[1] .

[1] – ئیبنو سعد دەری هێناوە ( ٤ / ٢٦٠ ) .

٢ – لـە عبـدالله ی کـوڕی عـەمرەوە ، دەڵێـت : بـاوکی لـە کـاتی سـەرەمەرگدا فەرموویەتی : ئەی خوای پەروەردگار ، تۆ فەرمانت بە چەند کارێك کرد و ڕێگریت لە چەند کارێك کرد ، ئێمەش زۆرێك لە فەرمانەکانی تۆمان واز لێ هێنا و لەناو زۆرێکیش لە قەدەغە کراوەکانتدا ڕۆچووین . پەروەردگارا هیچ خودایە نیە جگە لە زاتی تۆ پاشان پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوە و بەردەوام ( لااله الا الله )ی دەوت، هەتا گیانی دەرچوو (ﷺ)[1] وە لە ( ئەبو نوفل ی کوڕی ئەبو عقرب ) ەوە ، دەڵێت: عەمر لە سەرەمەرگیدا زۆر بێ هیوا بوو لە خۆی . ( عبدالله )ی کوڕی پێی وت : بۆ ئەوەندە بێ هیوایت ، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تـۆ ی لـەخۆی نزیـك کردۆتـەوە وەك کاربەدەسـت کـاری پـێ سپاردووی ! فەرمووی : بەڵێ کوڕم ، وایە ، بەڵام با پێت بڵێم ، سوێند بەخوا ، نازانم لەبەر خۆشەویستی بوو بۆ من یان لەبەر دڵنەوایی کردنم بوو ( تا زیاتر ئیسلامم خۆش بوێت – وەرگێڕ ) ، بەڵام شایەتی ئەدەم بۆ دوو کەس کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دنیای بە جێ هێشت خۆشی ئەویستن ، ئەوانیش ( عەمماری کوڕی یاسر و عبدالله ی کوڕی مەسعود)ن. ئەو جا کە مەرگ زۆری بۆ هێنا ، دەستی خستە لای چەناگەی و فەرمووی : (ئەی پەروەدگار فەرمانت پێ کردین ، وازمان هێنا ، و ڕێگریت لێ کردین ، ئەنجاممان دا، و هـیچ ڕێگایـەکمان نـی یـە جگـە لـە لـێ خـۆش بـوونی تـۆ نـەبێت ... بـەردەوام داوای لێخۆشبوونی ئەکرد هەتا گیانی سپارد [2] .

وە لە عبدالله کوڕی عەمرەوە ، دەڵێت : باوکی وەسیەتی بۆ کردووە : – ئەگەر مردم ، جارێك بە ئاو بمشۆرە و لە جلێکدا وشکم بکەرەوە ، پاشان بۆ جاری دووەم بە ئاوی پاك بمشۆرە و وشکم کەرەوە و بۆ جاری سێ یەم بە ئاوێك بمشۆ کافوری تێدا بێت ، ئەوجا وشکم کەرەوە و پاشان جلەکانم لەبەر کەو پاشان ئەگەر لەسەر جێگاکەم هەڵتگرتم ئەو هەنگاو بڕۆ کەمێك بوەستە ، و لە دوای جەنازەکەمەوە بە ، چونکە پێشەوە بۆ فریشتەکانە [3] و دواوە بۆ ئەوەی ئادەمە ، وە ئەگەر بەگۆڕت سپاردم خۆڵم بەسەردا ڕۆبکە ، پاشان وتی : ئەی پەروەردگار فەرمانت پـێ کـردین ، بـەڵام گوێمـان پێنـەداو ، ڕێگریت لێ کردین ، بەڵام ئەنجاممان دا ، وە ئێستا کەسێکی بێ تاوان نیم تا بەهانەت بۆ

---

[1] – ئیبنو عساکر ( ١٣ / ٢٦٨ ) باسی کردووە .

[2] – سەنەدەکی ( صحیح ) ە / احمد لە ( المسند ) ڕیوایەتی کردووە ( ٤ / ١٩٩ ، ٢٠٠ ) .

[3] – ئەلبانی دەڵێت : بە فیعلی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جێگیر بوو / احکام الجنائز ( ٧٣ ) .

بێنمەوە ، و هەروەك دەسەلاتم نیە خۆم ڕزگار کەم ، بەڵام هیچ خودایە نیە جگە لە زاتی ﴿اللَّهُ﴾ ، بەردەوام دەیوتەوە تاگیانی سپارد[1] . ( یحی کوڕی بکیر ) ، دەڵێت : عەمری کوڕی عاص شەوی جەژنی ڕەمەزان ساڵی ( ٤٣ ) کۆچی لە میصر وەفاتی کرد ، و جەژن سپاردەکرا ، عبدالله ی کوڕی نوێژی لەسەر کرد ، تەمەنی عەمر ئەوکاتە نزیك دەبووە وە لە ( سەد ) ساڵ[2] وە ماڵ و سامان و موڵك و بەندەیەکی زۆری لە دوای خۆی بەجێ هێشت[3].

[1] – سەنەدەکی بەهێزە / طبقات ، ئیبنو سعد ( ٤ / ٢٦٠ ) .

[2] – هیثمی دەڵێت : گێرانی ریوایەتی کردوە ، پیاوانی جێی متمانەن تا بێژەرەکەی المجمع ( ١٥٩٠١ ) .

[3] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٧٧ ) .

# " ٦٣ - محمدی کوڕی مەسلەمە ( رضي الله عنه ) "

## " ئاژاوەکە زیانی پێ ناگەیەنێت "

محمدی کوڕی مەسلەمەی کوڕی سەلەمەی کوڕی حریش ی ئەنصار ی ئەوسی یە.
لەبەدر و غەزاکانی دوای بەدریش بەشدار بووە . ابن سعد ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ( ئەبو عبیدە ) دا کردنی بەبرا ، و لە جەنگی ( تبوك ) دا بەسەر مەدینەوە دایناِ[1] .

زەهەبی ، دەڵێت :

" محمد ( رضي الله عنه ) لەوانە بوو خۆیان لە ئاژاوە کە کەنارگیری کرد . نەلە ( الجمل ) و نەلە ( صفین ) بەشداری نەکردووە ، بەڵکو لە تەختە شمشێرێکی بۆ خۆی دروست کرد و بەرەو ( ڕەبزە ) ڕۆشت و ماوەیەك لەوێ مایەوە [2] "

وە پێشەوا عمر ( رضي الله عنه ) ناردی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ( جهینە ) ، وە ئەگەر یەکێ لە کرێکارەکانی سکالأیەکی ببردایەتەلای ( عمر ) ( رضي الله عنه ) ، محمدی بۆ دەناردن تا بزانێت کێشەکەیان چی یە .

ئەم بوو کە ( کعب ی کوڕی ئەشرەف جولەکە )ی کوشت ، هەروەك لە هەردوو (صحیح )ەکەدا هاتووە .

کوشتنی ( کعب ی کوڕی ئەشرف ) :

کەعبی کوڕی ئەشرەف تا غوتێکی زۆرداری جولەکە بوو کە پەیمانشکێنی لەگەڵ موسڵمانانداا کردوو ، یارمەتی و هانی ( قریش ) ی دەدا بۆ سەر عەرەبەکان ، دەربارەی کوژراوانی بێ باوەڕانی ڕۆژی بەدر ئەیوت : ئەوانە پیاو ماقوڵانی عەرەب و پاشای خەڵکن ، سوێند بەخوا ئەگەر ( محمد ) دا بێتی لەوانە ، دەی ئەوە ناوجەرگەی زەوی باشترە لە سەرپشتی زەوی .

لە ( جابری کوڕی عبداللە )وە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( مَن لكعب بن الاشرف ؟ فإنه قد آذى الله و رسوله ) . واتە : کێ ئامادەیە بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی

---

[1] - بڕوانە / تاریخ الاسلام ( ٢ / ٣٠٥ ) ی پێشەوا زەهەبی ط . دارلعذ العربي .

[2] - بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٣٩٦ ) . الاصابە ( ٩ / ١٣٢ ) .

ئەشرەف ، بەڕاستی ئەو ئازاری خودا و پێغەمبەرەی داوە ( واتە بێ شەرمی کردوە لە ئاستیاندا ) محمدی کوڕی مسلمە هەڵساو فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، حەز ئەکەی بیکوژم ؟ فەرمووی : بەڵێ ، وتی : دەی مۆڵەتم بدە باشتێ بڵێم . ( واتە باپلانێکی بۆ دانێم )

فەرمووی : بیڵێ ..

ئەوجا محمدی کوڕی مسلمە هات بۆ لای ( کعب ) و پێی وت : ئەم پیاوە ( واتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داوای ( صدقە ) مان لێ ئەکات ، بەڕاستی ماندوی کردوین ، ئێستا من هاتووم داوای قەرزت لێ بکەم ) .

وتی : بەڕاستی تاکەی وازی لێ ناهێنن و بەگوێی ئەکەن ؟ وتی : بڵێین چی ، تازە شوێنی کەوتوین و نامانەوێ وازی لێ بێنین تا بزانین کۆتایی یەکەی بە چی ئەگات ، ئێستا هاتووین باری وشترێ یا دوو حوشترمان بەقەرز بدەیتێ . ئەویش وتی ، باشە ، بەڵام شتێکم بە بارمتە لەلا دانێن . وتیان ، چی دانێین ؟ وتی : ئافرەتەکانتان . وتیان : چۆن ئافرەتەکانمانت لەلا دائەنێین لەکاتێکدا تۆ جوانترین کەسی عەرەبیت ؟!

وتی : دەی کوڕەکانتان ..

وتیان : چۆن کوڕەکانمانت بە بارمتە پێ بدەین ، دوایی ئەگەر شەڕیان بوو ، بەیەکتر بڵێن ، تۆ لەبری یەك دووبارە حوشتر کراویت بەبارمەتە ؟ ئەوە دەبێتە ئەنگی وعەیبە بۆمان ، بەڵکو چەکت بۆ دێنین بە بارمتە ، و وادەیەکیان دانا کە تیایدا چەکەکەی بۆ بێنێت ، ئەوە بوو شەو هاتەوە بۆ لای کەعب و ( نائلە ) شی لەگەڵدا بوو – نائلە برای شیریی کەعب بوو– وبانگیانی کردبۆ لای قەڵاکەوە و خۆیشی چوو بۆ لایان ، ژنەکەی پێ وت : بەم سەعاتە بۆ کوێ ئەچیتە دەرەوە ؟

وتی : مەترسە ئەوە محمەدی کوڕی مسلمەی برامە (وەك برامە) و لەگەڵ ابو نائلەی برامدا . وتی : بەڕاستی بۆنی خوێن دەکەم .وتی : بۆچی وا ئەترسی ، وتی: خۆ محمەدی برام و برای شیریم أبو نائلە یە ، وکەسی بە خشندە وبەڕێز ئەگەریش بۆلێدانی بە خەنجەریك بە شەودا بانگ بکرێت هە ردە چێتەوە بانگەکەیەوە[1] .

ئەوەبومحمەدی کوڕی مەسلەمە خۆ ی و چەندپیاویك کە (أبو عبس ی کوڕی جبر و حارث ی کوڕی أ وس وعبادی کوڕی بشربوون ) چونە ژورەوە ، محەمەد وتی :

[1] – ئەبێ چ ڕێز و بەخشندەیی یەك لای ئەم نەفرەت لێ کراوە هەبێ ؟!

ئەگەر هات بۆلام شتێك لە سەرسەروقژی ئە لیم وبۆنی ئەکەم ، وەئێوەش هەرکە زانیتان توانام بە سەریدا شکایەوە لێیدەن . ئەوە بوخۆی ڕێك وپێك کردبووبۆنیکی خۆشیشی لەخۆی دابوو ، محمد وتی: بەراستی تائێستابۆنی واخۆشم نەکردبوو.

وتی : من لە بۆنخۆشترین ئافرەتانی عەرەب و کاملترنیانم لەلایە .

وتی : مۆلەتم ئەدەی بۆنی سەرت بکەم ؟

وتی : بۆنا ، ئەویش بۆنی کرد و پاشان ئاماژەی بۆ هاوەڵانی کردو وتی : مۆلەتم ئەدەی ؟ وتی : بەڵێ : ئەوە بوو لەوکاتەدا وتی : وەرن بیکوژن ، کوشتیان و پاشان هەواڵەکەیان دا بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )[1] .

فەرمانکردنی بە چاکەو ڕێگریکردنی لە خراپە:- لە موسای کوڕی ئەبو عیساوە ، دەڵێت :

عومەر ( ﷺ ) هاتە لای شەربەی (بنی حارثة) وە ، محمدی کوری مەسلەمەی بینی ، فەرموی : ئەی محمد ، چۆن لە من دەروانی ؟ وتی : چۆن حەزئەکەم ، وەها دەتبینم ، یان ئەوەی خەیروچاکەی تۆی دەوێت ،چۆن حەز دەکاتوەهایت ، لەسەر کۆ کرنەوەمان بەهێزیت و لێی پاکیزەیت و لە دابەشکردنیدا دادپەروەریت ، وە ئەگەریش لاتدا ڕاستت دەکەینەوە هەروەك چۆن تیر لە ناو ( ثقاف ) • دا ، ڕاست دەکرێتەوە ، ئەویش فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی خستووەتە ناو خەڵکانێك ئەگەر لامدا ، ڕاستم دەکەنەوە[2] .

## " کەنارگیر کردنی لە فیتنەکە "

کاتێ ئاژاوەکەی ( جمل و صفین ) هەڵگیرسا .. محمدی کوڕی مەسلەمە خۆی لێ دوور خستەوە و نیشتەجێی ( ڕەبزە ) بوو .

لە ئەبو ( بوردە )وە ، دەڵێت :

بەلای ( ڕەبزە )دا تێپەڕین ، چاومانکەوت بە دەوارەی محمدی کوڕی مەسلەمە ، پێم وت : بۆ ناچیتە لای ئەو خەڵکە و قسەیەکی چاکیان بۆ بکەیت ؟

---

[1] - بوخاری و مسلم گێراویانەوە .

• ئامرازێکە بۆ تیژکردن .

[2] - پیاوانی جێی متمانەن / بەڵکو بە بچر بچری هاتووە . الارنؤوط پەراوی / ( سیر ۲ / ۳۷۲ ) .

وتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرمووم : ( یا محمد ، ستكون فرقة ، وفتنة و اختلاف فاكسر سيفك ، واقطع و ترك ، و اجلس في بيتك )[1]

واتە : ئەی محمد ڕۆژێ دێ فیتنە و دووبەرەکی ڕوودەدات ئەو ڕۆژە تۆ شمشێرەکەت بشکێنە و کەوانە کەیشت لەت بکە و لە ماڵەکەی خۆتدا دانیشە .

منیش هەر ئەوکارە دەکەم کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کردووم.

لە حذیفەوە ، دەڵێت :

لە هەموو کەسێك ترساوم تووشی ئاژاوەکە بێت ، بێجگە لە محمدی کوڕی مەسلەمە ، چونکە بە ڕاستی گوێم لە پێغەمبەری خوا وە بووە ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( لاتضره الفتنة)[2]

واتە : ئاژاوە و فیتنە کە زیانی پێ ناگەیەنێت . وە لە ( حسن )ەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شمشێرێکی دا بە محمدی کوڕی مسلمە و پێی فەرموو : (قاتل المشركين ، فإذا رايت المسلمين قد اقبل بعضهم على بعض ، فاضرب به احدا حتى تقطعه ، ثم اجلس في بيتك حتى تأتيك يد خاطئة ، او منية قاضية)[3] واتە : لەگەڵ موشریکاندا بجەنگە ، و هەرکە بینیت موسڵمان ڕووبەڕووی یەکتر وەستان ، شمشێرەکەت بدە بە کێوی ئوحوددا تا لەتی ئەکات ، و پاشان لە ماڵەکەتدا دابنیشە تا دەستێکی تاوانکار یان مردنێکی نەگەڕاوە بە سەرتدا دێت .

وەلە ڕیوایەتێکی تردا لە ( زەیدی کوڕی اسلم )ەوە ، ( کاتێ پێشەوا عوسمان (ﷺ) شەهید کرا ، محمدی کوڕی مەسلەمە چووە لای بەردێك و بە شمشێرەکە لەبەردەکەیدا تا شمشێرەکەی لەت بوو [4] . وە اسحاقی کوڕی ئەبو فروة ، دەڵێت : بە (محمد ) یان دەوت پاسەوانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وە کاتێ شمشێرەکەی لەت کرد ، لە تەختە شمشێرێکی بۆ خۆی دروست کرد و لە پەنایەکی ماڵەکەیدا دایدەنا ، وە دەڵێت: بە دیوارەکەوە هەڵمدەواسی تا پیاو خراپی پێ بترسێنم .

---

[1] – احمد ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ٤٩٣ ) تیایدا ( علی کوڕی زەید ) لاوازە ، و باقی پیاوانی جێ متمانەن .

[2] – پیاوانی جێ ی متمانەن : بغوی ، ڕیوایەتی کردووە الاصابە ( ٩ / ١٣٢ ) .

[3] – پیاوانی جێ متمانەن ، بەلأم بچڕ بچڕە ، ( حسن ) لە محمدی کوڕی مسلمەوە گوێی لێ نەبووە ، احمد ڕیوایەتی کردوە ( ٤ / ٢٢٥ ) .

[4] – بڕوانە : تاریخ الاسلام ( ٢ / ٣٠٦ ) .

## " چۆنیەتی وەفاتی ( ﷺ ) "

لە جابری کوڕی عبدالله وە ، دەڵێت :

معاویە لەگەڵ ئەهلی شام دا هاتنە مەدینە ، ئەوە بوو بەیەکێ لە ئاژاوە گێڕانی خەڵکی ئوردون گەیشت کەوا محمدی کوڕی مسلەمە بە بێ لایەنی دانیشتووە و نەلە پاڵ (علی) دا بووە و نە ( معاویە ) ، ئەوە بوو هێرشی بردەسەر ماڵەکەی و کوشتی [1]. ئەمەش لە ساڵی ( ٤٣ )ی مانگی ( صفر ) دا بوو ، هەروەك ( ذهبي ) لە ( تاریخ الاسلام ) دا دایدەنێ .

[1] – بڕوانە : تاریخ الاسلام ( ٢ / ٣٠٦ ) .

# " ٦٤ – خالدی كوڕی وەلید ( رضي الله عنه ) "

## " شمشێری خودا "

ناسنامەی :

خالدی كوڕی وەلیدی كوڕی مغیرة ... شمشێری خودا و سوار چاكی ئیسلام و شێری جەنگەكان ، پێشەوای مەزن و ئەمیری پایەبەرز و سەركردەی كۆچبەران ، ابو سلیمانی قورەیشی مەخزومیی مەككی و خوشكەزای دایكی ئیماندارن ، میمونەی كچی حارثە .

لە مانگی ( صفر )ی ساڵی هەشتی كۆچیدا بە موسڵمانی هیجرەتی كرد ، پاشان بۆ غەزا كەوتەڕێ و لە جەنگی ( مؤتە ) دا بەشداریی كرد كە هەرسێ ئەمیرەكەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داینا بوون زەید و جعفری ئامۆزای و ابن رواحە ، شەهید بوون و سوپاكە بە بێ ئەمیر مایەوە ، تا خالد بە پەلە بۆیە ئەمیریان ئاڵاكەی هەڵگرت و دای بەسەر دوژمندا و بووەمایەی سەركەوتنی موسڵمانان و پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) ناوی لێ نا ( شمشێری خودا ) . هەروەها ئامادەی ( فەتحی مەككە ) و ( حنین ) بووە ، لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) ئەمیرایەتی كردووە ... دژی هەڵگەڕاوان و موسەیلەمە و غەزوی عیراقی بەشداری كردووە و خۆی و چەند سەربازێك بە ماوەی ( ٥ ) شەو لە سنووری عێراقەوە تا ( شام ) یان بڕیوە ، و لە جەنگەكانی شام دا بەشدار بوە ، و هیچ بستێك لە جەستەیدا نەماوە برینـدار نەكرا بێت . فەزڵو گەورەیی زۆرن ، ( صدیق ) كردوویەتیە ئەمیری هەموو ئەمیرەكانی (الاجناد) و دیمەشق ی گەمارۆ دا و لەگەڵ ( ئەبو عبیدە )دا ڕزگاریان كرد . شەست ساڵ ژیاوە ، كۆمەڵێ پاڵەوانی كوشتووە و دواتر لە سەر جێ وەفاتی كردووە[1] ، لە ( حمص ) ، ئەمەش بە ڕای كۆمەڵێ زانایان لە ساڵی ( ٢١ ) كۆچیدا بووە .

### " چەند هەڵوێستێكی مێژوویی لە ژیانیدا "

یەكەم : دوای فەتحی مەككە :

كاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ساڵی ( الفتح ) دا مەككەی ڕزگار كرد ، خالدی نارد بۆ شكاندنی هەردوو بتی ( لات و عوززا ) ، ئەویش گەیشتە سەریان و وتی :

[1] – بڕوانە: سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٣٦٦ ، ٣٦٧ ) .

یا عز کفرانك لاسبحانك    انی رایت الله قد أهانك

" واتە : ئەی بتی عوززا بێ باوەڕم بێت نەك ئەوەی پاك و بێگەردیت پێ بڵێم بە ڕاستی ئەبینم کە خودا سەر شۆڕی کردیت "

وە لە ( قەتادە ) وە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خالدی نارد بۆ (عوززا) کە لە ( هوازن ) دا بوو ، فەرمووی : بڕۆ ، لەوێ ئافرەتێك بۆت دێتە دەرەوە ، زۆر ڕەش پێستە و قژی درێژە سنگی گەورە و بالآی کورتە ، ئەوە بوو خالد لێیداو کوشتی و فەرمووی : ئیدی عوززا ڕۆیشت و لە ئێستا بە دواوە ( عوززا ) یەك نی یە بپەرسترێ [1].

دووەم : گەیشتنی بە ( هرمز ) : - حمیدی کوڕی منیب دەڵێت : ( اوس ) ی باپیرم دەیوت ، کەس هێندەی ( هرمز ) دوژمنی عەرەب نەبوو ، لەبەر ئەوە کە لە کوشتنی ( مسیلمە ) بوینەوە هاتینە ناوچەی بەصرە و لە ( کاظمة ) بە ( هرمز ) گەیشتین ، خالد چووە مەیدانیەوە و کوشتی ، ( صدیق )یش غەنیمەتەکەی ( هرمز ) ی پێ دا کە تەنها کلآوەکەی بایی سەد هەزار درهەم بوو !!

سێیەم : ڕۆژی مؤتە : وتمان کە پاش شەهید بوونی سێ ئەمیرەکەی سوپای (مؤتە) خالد بویە ئەمیریان ، دەڵێت : ڕۆژی مؤتە نۆ دانە شمشێر بەدەستمەوە لەت بوو تا لە کۆتاییدا شمشێرێکی یەمانیم بەدەستەوە ما [2].

وە ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەربارەی خالد فەرمووی :

( ... ثم اخذ الراية سيف من سيوف الله حتى فتح الله عليكم )[3] وە پاشان شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا ئالآکەی هەڵگرت و خوا سەری خستن و سوپاکەی هێنایەوە بۆ مەدینە و پاراستنی.

چوارەم : کاتێ ئەبوبەکری صدیق ( ﷺ ) بەڕێ کەوت بۆ سەر هەڵگەڕاوەکان ، خالدی کوڕی وەلید ئالآکەی هەڵگرتبوو ، ئەو جا کە خەڵکەکە بەدوای یەکدا هاتن خالدی کردە سەرکردە و خۆی گەڕایەوە مەدینە ، خالد ئەو ڕۆژە دەیوت : نازانم لە کام ڕۆژم هەڵبێم ؟ لەو ڕۆژەی کە پەروەردگارم شەهادەتم پێشکەش بکات یان لەو ڕۆژەی کە خوای گەورە تیایدا ڕێز و کەرامەتم پێ ببەخشێ [4]؟

---

[1] - بڕوانە / ئیبنو هشام ( ٢ / ٤٣٦ - ٤٣٧ ) ،ئەو ئافرەتانەش وەك پاسەوان ئیشیان کردووە.

[2] - صحیح بوخاری دەریهێناوە ( ٤٢٦٥ ) .

[3] - صحیح / بوخاری دەری هێناوی ( ٧ / ٤١٣ ) هەروەها غەیری ئەویش .

[4] - بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٣٣٢ ) .

پێنجەم : ڕۆژی ( یەمامە ) : –

دوای ئەوەی عکرمەی کوڕی ابو جەهل و ( شرحبیل )ی کوڕی حسنە ( ﷺ ) سەرنەکەوتن لە دژی هەڵگەڕاوەکان لە ( یەمامە ) ، خالد بەرێ کەوت بۆ ئەوێ و لە دووری شەوێك ڕێ لە سەربازگەی مسلیمەوە ، هێرشی بردەسەر مەفرەزەیەك لە ( بەنی حەنیفە ) کە ( مجاعەی کوڕی مرارەی حنفی ) سەرکردەیان بوو نزیکەی سی تا چل سوارچاکی لەگەڵدا بوو بە دیل گرتنی و هاوەڵانی ( مجاعە )ی کوشت و ئەوی هێشتەوە وەك بارمتە بەهۆی ئەوە وە مجاعە لای بنی حنیفە ڕێزێکی هەبوو ، ئەوجا هەردوو سوپا لە ( عقرباء ) بەیەك گەیشت و شەڕ و کوشتارێکی زۆر لە نێوانیاندا ڕووی دا و موسڵمانان شکان تا ئەو کاتەی بنو حنیفە هاتنە خێوەتگاکەی خالد ، بەلاّم موسڵمانان دووبارە گەڕانەوە و شەڕ دەستی پێ کردەوە ، خالدیش فەرمووی :

( ئەی خەڵکینە ، جیا ببنەوە تا بزانین لە کوێوە بۆمان دێن ) و ئەوجا دوای کۆششێکی زۆری پشتیوانانی ئاینی خودا سەرکەوتن بەدەست هات ، سیانزە هەزار موسڵمان سەرکەوتن بەسەر سوپاکەی مسیلمەدا کە نزیکەی " چل هەزار شەرکەر زیاتر دەبوون " .

ئەو ڕۆژە لە پیاوانی ( بنی حنیفە ) چواردە هەزار کەس کوژران و هەروەها دوژمنی خوا ( مسلیمە ) و حەوت هەزاری تریش لە گەڵیدا کوژران هەرچی موسڵمانانە لە ناو کۆچبەران و پشتیواناندا ( ٣٦٠ ) کەس شەهید بوو بوو و لە کۆچبەرانی غەیری ئەهلی مەدینە ( ٣٠٠ ) کەس و لە شوێنکەوتوان ( تابعین ) سێ سەد کەس و لەناو قورئانخوێناندا پێنج سەد کەسیان شەهید بوون ، بە گشتی تێکڕای ئەو موسڵمانانەی شەهید بوون (هەزار و دوو سەد ) کەس بوون . واتە : بەرێژەی سەدا شەشی کوژراوانی بێ باوەڕان ، ئەمەش لە هەرە باشترین سەرکەوتنەکان ئەژمار دەکرێت .

## " جەنگەکانی خالد ( ﷺ ) لەگەڵ فارسەکاندا "

خالد ( ﷺ ) شەڕ گەلێکی لەگەڵ فارسەکاندا ئەنجامداوە ، لەناویاندا هەندێکیان باس دەکەین :

شەڕی ( کاظمة ) : –

تیایدا هاتووە کە ( خالد ) بە پیاوێکدا کە ناوی ( ازاذبة ) بووە پەیامێکی ناردووە بۆ ( هرمز )ی سەرکردەی فارسەکان . تیایدا نووسیبووی : ( لە پاشان ، موسڵمان بە

سەلامەت دەبیت ، یان بۆ خۆت و قەومەکەت ( سەرانە) بدەن ، ئەگەر نا ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بکە ، چونکە خەڵکێکم لە گەڵ خۆم بۆت هێناوە ، تۆ چەندە حەزت لە ژیانە ، ئەوان ئەوەندە حەزیان لە مردنە ) . هرمز ، موسڵمان بوونی ڕەت کردەوەو خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد .

خالد لە سیاسەتی شەڕدا لە لوتکەدا بوو ، هەروەها توانایەکی نموونەیی هەبوو لە سیاسەتی جەنگ و سەر لێ شێواندنی دوژمندا ، بۆ ئەوەی کەمترین زیان لە سوپای موسڵمانان بکەوێت ... هرمز وای بۆ چوو کە ( خالد ) سەرەتا سوپاکەی بەرەو ( کاظمة ) بەڕێ دەکات ، بۆیە سەرجەم هێزەکانی خۆی بە ئاراستەی ( کاظمة ) بەڕێ کرد و لەوێ خۆیان ئامادەباشی شەڕ کرد و چاڵ و خەندەقیان لێدا ، بەڵام خالد سوپاکەی کرد بوو بە سێ بەشەوە ، هەروەها بە هیچ ڕێیەکدا نەیبردن تاوەکو لە چاوی دوژمنەکەیدا دیار نەبن و هەتا دواسات لە گومان و سەرگەردانیدا بێت ، ئەوە بوو ( خالد ) سەرکردەی سوپای فارسی هەڵخەڵەتاند و سەری لێ شێواند و بە تێپەڕ بوونی بە ( کاظمة ) دا و ڕۆیشتن بەرەو ( الحفير ) کە لە سەرووی ( کاظمة )وە بوو دەکەوتە ڕۆژئاوی ( الابلە ) ...

ئەوجا ( هرمز ) هیچ شوێنەوارێکی ( خالد )ی لە ( کاظمة ) بە دی نەکردوو زانی کە ئەوێی تێپەڕاندووە بەرەو ( الحفير ) ، تووڕە بوو ، فەرمانی دەکرد بۆ کەتیبەکانی سوپاکەی کە هەموویان بەرەو ( الحفير ) بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی سوپای ( خالد ) بکەونەڕێ ، فەرمانی دا کە زۆر خۆیان ماندوو بکەن و پەلە بکەن تاوەکو پێش خالد بگەنە ( الحفير ) ... ئەمەیش هەر ئەوە بوو ( خالد ) دەیویست ئەویش ماندوو شەکەت کردنی جەستەیی و دەرونی دوژمنەکەی بو پێش دەستپێکردنی شەڕ ، وە هەر بە قەستی ( خالد ) خاوە خاوی بە سوپاکەی دەکرد بۆ گەیشتن بەرەو ( الحفير ) تاوەکو ( هرمز ) پێش ئەوان بگات ، وە هەروا بوو ( هرمز ) پێش خالد کەوت و گەیشتە ( الحفير ) و فەرمانی دەرکرد بۆ سوپاکەی کە لە ( الحفير ) خەندەق لێ بدەن بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ ڕووبەڕو بوونەوەی سوپاکەی خالد ، ئەوجا کە هەواڵدەران هەواڵی ئەوەیان گەیاندە ( خالد ) کەوا هرمز سەربازەکانی خۆی شەکەت کردووە بە خەندەق لێدان و خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ ، پێچی کردەوە و سوپاکەی بەرەو ( کاظمة ) گەڕاندەوە ..

ئەوە بوو پاڵەوانانی فارس دوای چاڵ و کەندرەکان ، خۆیان بە زنجیر بەستەوە بە یەکەوە ، تاوەکو ڕووبەڕووی مردن ببنەوە و لێی ڕانەکەن یان سەرکەوتن بە دەست بێنن..

ئەوجا کە هەواڵدەرانی هرمز ئەوەیان پێ گەیاند کە ( خالد ) و سوپاکەی گەڕاونەتەوە بۆ ( کاظمة ) ، هەڵچوو ، تووشی شڵەژانێکی دەروونی هات ، و فەرمانی بەسەر سوپاکەیدا دەرکرد کە بگەڕێنەوە بۆ ( کاظمة ) و لەوێ دەبینێ خالد سوپاکەی ئامادە کردووە و چاوەڕێیەتی ، هێزەکانی فارس چەندان ئەوەندەی موسڵمانان دەبوون و ( هرمز ) ڕێگەی نێوان موسڵمانان و ڕووباری ( فرات ) ی گرت تا لە ئاو دا بیبڕین ، (خالد)یش ( ﷺ ) وتە هەمیشە زیندووەکەی ئاراستەی موسڵمانان کرد و فەرمووی : (وەرنە مەیدان و بارخانەتان دانێن ، سوێند بەخوا ئاوەکە بۆ پشوو درێژترین و ڕێزدارترین سوپا دەبێت) [1].

ئەوجا ( هرمز ) خالدی بانگ کرد بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەویش بێ سێ و دوو وەڵامی دایەوە ، بەڵام ( هرمز )ی پیس کە بە نموونەی پیسی دەهێنرێتەوە و زۆرجار دەوترێت ( فلان لە هرمز پیسترە ) بە هەندێ لە سوارفەرلو گەورەیی خۆی وتبوو کە ناپاکی لەگەڵ ( خالد ) بکەن واتە : بێ ئاگا لێی بدەن ئەوەبوو کە خالد دابەزی هرمزیش دابەزی ، و خالد بەرەوڕووی ڕۆیشت و بەیەك گەیشتن و چەند لێدانێك لە نێوانیاندا ڕووی داو خالد باوەشی پیاکرد ( کەبیکوژێ ) لەوێدا پاسەوانانی هرمز هاتنە پێش بۆ خالد بە ناپاکی و غەدر و شوێن خالد کەوتن ، بەڵام ئەوە سەر قاڵی نەکرد واز لە ( هرمن بێنێت ، هەروەها ( قعقاعی کوڕی عەمر ) ی پاڵەوان هاتە پێش لە پاسەوانانی ( هرمز ) و تەفروتونای کردن ، هەرچی ( خالد )یشە هەرزوو لە ( هرمز ) ی دا و وەك مەڕ سەری بڕی ، فارسەکان بە کوژرانی سەرکردەکەیان کشانەوە و هەڵاتن ، موسڵمانانیش بە دوایاندا خۆیان توند کردەوە و لێیان دەکوشتن و لێیان بەدیل دەکردن و لە فارسەکان کەس نەیتوانی خۆی ڕزگارکات ئەوانە نەبێت کە توانی یان خۆیان بگەیننە کەشتیەکان ، ئەوجا ( خالد )یش غەنیمە و کەل و پەلەکانیانی کۆ کردەوە لە ناویشیاندا ( زنجیرەکان ) و قورسایی هەر زنجیرێکیان هەزار ئۆقیە دەبوو بۆیە ئەو جەنگە ناونرا ( ذات السلاسل ) ئەبوبەکری صدیق ( ﷺ ) کلاوەکەی ( هرمز )ی دا بە ( خالد ) کە نرخەکەی سەد هەزار بوو [2].

---

[1] - تاريخ الطبري ( ٣ / ٣٤٩ ) .

[2] - صلاح الامه ( ٢ / ٥٥٢ — ٥٥٣ ) .

شەشەم : جەنگی ( الابلّة ) : -

خالد سوپاکەی بەرە و ( الابلة ) بەرێ کرد کە لەوێ ژمارەیەکی زۆری سەربازانی فارسی لێ بوو ، ( سویدی کوڕی قطبە ی ذهلي ) کە لە سوپاکەی خالد دا بوو ، پێش (خالد ) کەوت بەرەو (الابلّة ) و لەوێ بۆسەی لەو دەوروبەرە دانا ، ئەوجا کە خالد هێزەکەی خۆی گەیاندە بەصرەی ئێستا ، دەبینێ ( سوید ) چاوەڕێی ئەهلی (الابلّة )یە کە هێرشیی بۆ بێنن و لە دەرەوەی شارەکەیان لە گەڵیاندا بەشەڕ بێت ، بەلاّم ( سوید ) بە ( خالد ) ی ڕاگەیاند کەوا ئەهلی (الابلّة ) لە ( خالد ) دەترسن و ناوێرن لە قەلاّکانیاندا بێنە دەرەوە مادەم ( خالد ) لەناو سەربازگەکەدا بێت ، بۆیە ( سوید ) بە ( خالد ) ی وت : ئەهلی (الابلّة ) بۆ من کۆ بوونەتەوە و وایش گومان ئەبەم کە تەنها تۆ بویتەتە ڕێگر لەوەی هێرشم بۆ بێنن و لە تۆ ئەترسن .

لەوێدا خالد لەگەڵ ( سوید ) پلانێکیان دانا کە فارسەکانی پێ بخەڵەتێنن و ترسیان نەمێنێ لە هێرش هێنان بۆ ( سوید ) ئەویش بەوەی کەوا بزانن ئەو ( خالد )ەی ئەوان لێی تۆقیون ( لە پاش کوشتنی هرمز ) سەربازگەی ( سوێد )ی بەجێ هێشتووە و جگە لە ( سوێد ) خۆی هیچ سەرکردەیەکی دیکەی موسڵمانانی لەگەڵدانی یە ، ( خالد ) بە ( سوێد )ی وت : ڕام وایە بەڕۆژ لە سەربازەگەکە بچمە دەرەوە و شەو بگەڕێمەوە ناوی، خۆم و هاوەڵانم ، ئەوجا کە ڕۆژ بوویەوە لەگەڵیان بەشەڕ بێ ، ئەوجا خالد پلانەکەی جێ بەجێ کرد بۆ فریودان و سەرلێشێواندنی چاودێران و پاسەوانانی (الابلّة) ی فارسی و ڕایانکێشێ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ( سوێد ) ، ئەوە بوو زۆرینەی سوپاکەی بەڕۆژی ڕووناك بەرەو ( حیرە ) بەڕێ کرد ، فارسەکانی دڵنیا کرد کە ( خالد ) ئەو جێگایەی بە جێ هێشتووە ، کە شەو داهات خالد ( ﷺ ) هێزەکەی گەڕاندەوە بۆ سەربازگەکە ، ئەوە بوو کە سوپای فارسەکان لە (الابلّة ) هاتنە دەرەوە بە ئاراستەی (سوێد ) بۆ هێرش کردنە سەری ، هێشتا نەگەشتبوونە سەربازگەکەی ( سوێد ) دەبینن سەربازانێکی زۆر خۆیان ئامادە کردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی و هەر کە زانی یان (خالد) لە ناویاندایە و ئەوێی بە جێ نەهێشتووە ، دەستیان وشك بوو نەیانتوانی شمشێرێك بوەشێنن بەڕووی (خالد) دا و هەموو ئامانجێکیان ڕاکردن و هەلاّتن بوو بۆ ناو قەلاّکانی (الابلّة ) و خێرا ڕایانکرد بەرەو دەرگاکانی شار ، بەلاّم خالد ڕێگەی لێ گرتن و بەو جۆرە سوپای فارس لێك ترازا و پەرتەوازە بوو ، زۆرێکیان لێ کوژران و هەندێکیان لەتاوا خۆیان فڕێ دایە ناو ڕووباری دیجلە و فوراتەوە و خنکان ، پاشان ( خالد ) " معقل ی کوڕی مقرن ی موزنی " نارد بۆ

(الابلة ) کە هیچ شەڕکەرێکی تیانەمابوو ، بەبێ شەڕ دەستی بەسەردا گرت و هەرچی تیا بوو لە چەك و تفاق کردیانە غنیمە [1].

حەوتەم : جەنگی ( المذار ) :

( شیرەوەی ) پادشای فارس سوپایەکی مەزنی ئامادەکرد و گەورەترین سەرکردەی لەناو سەرکردەکانیدا کە ( قارن ی کوڕی قرباس ) بوو کردە سەرکردەی سوپاکە و بەهاوکاری و پاڵپشتی دوو سەرکردەی بەهێزی تر ئەوانیش : ( الانو شجان ) و ( قباذ ) بوون ، هەروەها ئەم سوپایە پاشماوەکانی ( المذار ) و ( کاظمة ) و ئەهلی (ئەهواز و فارس و یرادول جەبەل)یشی لە خۆ گرتبوو ، پەیمانیان دابوو کە هەڵنەیەن . ژمارەی هێزەکەی فارس نزیکەی ( ٨٠ ) هەشتا هەزار دەبوو ، بەڵام سوپاکەی خالد لە هەژدە هەزار سەباز تێنەپەڕی ، جەنگەکە بە بانگی قارن بۆ ڕووبەڕووبونەوە دەستی پێ کرد ، خێرا دوان لە موسڵمانان بەرەوڕووی چوون ئەوانیش ( خالدی کوڕی وەلید و معقل ی کوڕی الاعیش النباشی ) پاڵەوان بوون . ( معقل ) بەسەر ئەسپەکەیەوە پێش ( خالد ) کەوت و لەگەڵ ( قارن ) دا کەوتە جەنگ و خێرا کوشتی .

لەولاشەوە ( عاصم ی کوڕی عەمر ) هێرشی هێنایە سەر ( الانو شجان ) و خێرا کوشتی ، پاڵەوانی بە فەڕیش ( عدی کوڕی حاتم ) خۆی گەیاندە ( قباذ ) ی سەرکردە و کوشتی ، بۆیە فارسەکان پەرتەوازە بوون بە کوژرانی ( قارن ) و سەریان لێ شێوا و هەر لەمەیداندا سی هەزار یان لێ کوژرا جگە لەوانەی لە دیجلە دا نقوم بوون [2].

## " دڵسۆزی خالد ( ﷺ ) "

دوای ئەوەی ( عمری کوڕی خەتاب ) ( ﷺ ) بەسەر سەرکردایەتی سوپاوە لایبرد ... ( خالد ) هەروەك جەنگاوەرێك لە ( حمص ) مایەوە تا نەخۆش کەوت و ( ابو الدرداء ) هاتە سەردانی ، خالد پێی وت : ئەسپەکەم و چەکەکەم لە پێناوی خوادا بێت و ماڵەکەشم لە مەدینە ( صدقە و بەخشش ) بێت ، وە من داومەتە دەست ( عمر ) بەڕاستی ئەو باشترین پشتگیری یە بۆ ئیسلام وە ڕاسپاردەکەو جێبەجێ کردنی پەیمانەکەمم داوەتە دەست ( عمر ) ، ئەوە بوو کە وەسیەتەکەی بە دەست عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ)

[1] - صلاح الامە ( ٣ / ٥٥٤ ، ٥٥٥ ) .

[2] - تاريخ الطبري ( ٣ / ٣٥٢ ) صلاح الامە ( ٣ / ٥٥٥ ، ٥٥٦ ) .

گەیشت ، قبوڵی کرد و داوای ڕەحمەتی بۆ کرد ... بڕوانە خوێنەری بەڕێز ئەو دڵسۆزی یە و ئەو خۆیەکلایی کردنەوە تەواوە بۆ پەروەردگار و بۆ ئاینەکەی .. عومەری کوڕی خەتاب لەسەر کار لایبردووە ، کەچی هیچ نەگۆڕاوە لە ئاستیدا ، چونکە ئەو بە دوای پێشەوایەتیدا ناگەڕێ ، بەڵکو تەنها بەدوای ڕەزامەندی خوای گەورەدا دەگەڕێ .

## " باشتر لە شەوی بووك گواستنەوە "

خۆشەویستی جیهاد دڵی ( خالد )ی پڕکردبوو ... وە ئەو تەنها لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەحەوایەوە .. هەموو ڕۆژێك وڵات و شارێکی بۆ ئیسلام زیاد ئەکرد !! جا چ خۆشی یەك لەمە خۆشتر هەیە ؟!گوێ ڕاگرە بزانە ( خالد ) چی دەڵێت : شەوێکی زۆر سارد و بەستەڵکە بە ( سریە یەك ) ڕۆژ بەسەر دوژمنەکەمدا بکەمەوە )[1] خۆشەویسترە لەلام لەشەوێ تیایدا بووکەکەمم پێشکەش بکرێ .

## " وەفاتی ( خالد ) ( رضي الله عنه ) "

پاش ژیانێکی پڕ لە بەخشندەیی .. کە لە میانەیدا چەندین وانەی پێشکەش کرد لەسەر عیززەت و سەربڵندی و باوەڕ و متمانە بوون بە خودای پەروەردگار و هەروەها وانەیەکی وای نیشانی دوژمنانی خوادا کە هەرگیز لە یادی نەکەن ...خالد ، ئاواتی ئەوە بوو کە شانازی شەهادەت لە پێناوی خوادا بە دەست بێنێت لە سەر مەیدانی جەنگدا ، بەلاّم ویستی پەروەردگار وابور کەلەسەر جێ وەفات بکات . ﴿ ... كَانَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا ﴾ سورة الاحزاب ، آية ( ٦ ) . واتە: ئەوەتان لە نامەی کردەوەکانتاندا بۆ تۆمار کراوە . ئەوە بوو لە سەرەمەرگدا فەرمووی : ( هەمیشە دەمویست لە مەیدانی جەنگدا بکوژرێم ، بەلاّم چارەنووسم وابوو لەسەر جێ بمرم .. وە پاش باوەڕ و ئیمانم بە یەکتایی خوای پەروەردگار هیچ کارێکم لەلام خۆشەویستر نەبووە لە بەڕێ کردنی شەوێکدا بە خۆ بەستوونی و ئامادەباشی بە چەك و تفاق لە ژێر چەتری ئاسماندا و لە چاوەڕێی هاتنی بەیانی دا تاوەکو بدەین بەسەر بێ باوەڕاندا ، پاشان فەرمووی : ئەگەر مردم ، چەك و ئەسپەکەم بکەنە خێر لە پێناوی خوادا ) . ئەوجا گریا و وتی : ئەوەندە و ئەوەندە جەنگ

---

[1] – هیثمی لە ( المجمع ) دا ( ٩ / ٣٥٠ ) دەڵێت: ابویعلی ریوایەتی کردوە ، پیاوانیش پیاوانی (الصحیح)ن.

بەشدار بووم و بستێك لە جەستەمدا نەماوە شمشێرێك یان لێدانێك بە ڕم یان تیر لیٚ ی نەدرا بێت ، کەچی ئێستا وەك چۆن حوشتر بەسەر لوتیدا دەکەوێت منیش بەو شێوەیە لەسەر جێگا دەمرم [١].

" ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی پاڵەوان ... "

[١] - بڕوانە / صفة الصفوة ( ١ / ٣٣٢ ) .

# " ٦٥ – طلیحە ی کوڕی خویلید ( رضي الله عنه ) "

# " هەڵگەڕاوەی تەوبەکار ، و پاڵەوانی شەهید !! "

ئێمە ئێستا لە بەردەم پرسێکی گرنگداین لە پرسەکانی مرۆڤایەتی ، ئەویش زیادەڕۆیی کردنی مرۆڤە بەسەر خۆیدا بەستەم لە خۆ کردن و بوختان و بێ باوەڕ بوون ، کە هەر کاتێ هەڵسایەوە و بە ئاگاهاتەوە دەچێتە لوتکەی ئازایەتی و باوەڕ...

ئێمەش لەبەر ئەوەی نە لە پێغەمبەران نین ، هەڵە دەکەین و دەکەوینە گوناهەوە .. لە (طلیحە ی کوڕی خویلیدا ( رضي الله عنه ) ) نموونەیەك بەدی ئەکەین بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگرین و بیکەینە پێشرەومان لە هیدایەتوەر گرتندا...

طلیحە ( رضي الله عنه ) کێ یە ؟

ناوی طلیحە ی کوڕی خویلیدی کوڕی نوفل ی ئەسەدی یە ...

پاڵەوانی بە هەڵمەت و هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) و کەسێکە لە ئازایەتیدا بە نموونە دەهێنرێتەوە ، لە ( بنی اسد ) ە کە یەکێکە لەو تیرانەی لە نێوان ( نجد ) و (فرات ) دا نیشتەجێن .

ساڵی ( ٩ )ی کۆچی شاندی بەنی ئەسەد کە (طلیحە ) شیان لە ناودا بوو هاتنە مەدینە تا لە بەردەم پێغەمبەری خوا دا ( ﷺ ) ئیسلام بوونی خۆیان ڕابگەیەنن ، طلیحە موسڵمان بوو ، بەلاَم دواتر لە ئایین هەڵگەڕایەوە و بەمەش ستەمی لە خۆی کرد ، و لە ( نجد ) ئیدیعا و بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد ، چەند ڕووبەڕ و بوونەویەکی لەگەڵ موسڵمانانندا هەبوو ، کەتیایدا ، شکستی هێناو سەر شۆڕ بوو . ئەوە بوو پێش وەفاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئاژاوە سەری هەڵدا بوو کە (طلیحە ) یەکێ بوو لەوانەی دەستیان تیایدا بوو .. ئەوە بوو ( خیال ) ی برای ناردە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تا هەواڵی ئەوەی پێ بدات ئەمیش وەك ئەوبووەتە پێغەمبەر ، و بانگی بکات بۆ وازهێنانی لە دوژمنایەتی کردنی و ئاشت ببنەوە و ئەم جۆرە پەخشانانەی ئەو تەوە : ( و الحمام و اليمام ، و الصرد و الصرام ، قد صمن قبلكم بأعوام ، ليبلغن ملكنا العراق و الشام !!! ) .

واتە : باڵندە و کۆتر .. بازو ڕی ( جۆرە باڵدارێکە ) ئازا و پاڵەوان ، چەندین ساڵ پێش ئێوە بە ڕۆژوو بوون ، تا بگاتە عێراق و شام ی مولکمان !!!

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ضراری کوری الازوری ئەسەدی ، نارد تارپوبەرپووی (طلیحە) بێتەوە ، ئەوە بوو ( ضرار ) ، تووشی ترس کرد ، موسڵمانان لە زیاد بووندا بوون ، و هەرچی کۆمەڵەکەی ( طلیحە)ش بوو کەمیان دەکرد تاوەکو ضرار شمشێرەکەی بۆ هێنایەوە بەرودا بەڵام ( طلیحە) خۆی لێ لادا ، ئەوەبوو ( طلیحە ) شەر کەرێکی ناوازە بوو لە هێز و لێهاتن و بزاوتنیدا ، ئەمەی قۆستەوە و وتی کە چەك كاری تێ ناكات !! .. و لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد و خەڵکی لای ( ضرار) یان چۆڵ کرد و لە دەوری ( طلیحە ) کۆبوونەوە .

هەرچی ( ضرار ) و ئەوانەی لەگەڵیدا مابوونەوە لە دەستی ( طلیحە ) خۆیان دەرباز کرد ... ئەوجا مەترسی ( طلیحە ) بۆسەر موسڵمانان زیادی کرد ، لەبەر ئەوە پێشەوا ( ابوبکر ) چەند لیوایەکی ئامادە کرد بۆ شەرکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەكاندا! و خالدی کوری وەلیدی لەگەڵ پێنج هەزار جەنگاوەردا نارد بۆ (طلیحە) و لەگەڵ ( طلیحە ) بەیەك گەیشتن کە سوپاکەی زیاتر بوو لەوەی (خالد)...

( طلیحە) لەماڵ دانیشتبوو شەریش لە حەوشەی ماڵەکەیدا گەرم بوو : ئەوەبوو ( عیینە کوری حصن ) زوو زوو لە نێوان ( طلیحە) و سوپاکەیدا دەهات و دەچوو ، لێی دەپرسی : جبریل نەهاتە لات ؟ ئەویش ئەیوت : نەخێر .. شەریش بەردەوام بوو خەریك بوو شکستیان دەهێنا .. و لە کۆتاییدا ئیدیعای کرد کەوا سروشی بۆ دابەزیوە و پێی ئەڵێ : ( ان لك رحا كرحاة ، و حديثاً لاتنساه ! ) واتە : تۆیش دەستهارێکت هەیە هاوشێوەی ئەو ، وە فەرمایشتێکت هەیە کە لە بیری ناکەیت ! .. ( عیینە )ش خێرا هاواری کرد لە خەڵکەکە وتی : ئەمە سوێند بە خوا درۆزنە لەبەر ئەوە برۆن و هەڵبێن ، ( طلیحە ) ش پاش شکستهێنانی دانی نابە درۆکەیدا و خێزانەکەی هەڵگرت و بەسواری ئەسپەکەی رایان کرد و وتی : هەرکامتان توانی وەك من با ماڵ و خێزانەکەی رزگار بکات و رابکات ، شەڕ لەسەر ماڵومناڵتان بکەن ، هەرچی ئایینیشە ئەوە شەری لەسەر نەکەن – واتە : ئەو ئاینەی من پێم راگەیاند بوون – چونکە وجودی نیە ! بەو جۆرە رایکرد بۆ ( شام ) و جەنگەکە کۆتایی هات .

## " لە ئاین دەرچووی تەوبەکار "

( طلیحە ) لە شام خۆی گەیاندە ( آل جفنە ) ی غەسانی [1]، لەوێ بە خۆیدا چووەوە، گەڕایەوە بۆ ناو ئیسلام ... و چووە دەرەوە بۆ ( عەمرە ) ، ئەوە بوو کە بەلای مەدینەدا تێپەڕ بوو لەرێی ( مەککە ) دا .. بە ئەبو بەکری ( صدیق ) ( ﷺ ) یان وت : ئەوە ( طلیحە ) یە !! فەرمووی : چی لێ بکەم ، وازی لێ بێنن ، ئەو خوا ڕێنمونی کردووە بۆ ئیسلام ) . ( طلیحە ) لە ( شام ) مایەوە تا ابوبەکر ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، ئەوە بوو ابوبەکر ( ﷺ ) ڕێگری کرد بوو لەوانەی پێشتر لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوە ، لەناو سوپادا بن و بەشداری ( فتوحات ) بکەن ، بۆیە ( طلیحە ) لە ماڵی خۆیدا مایەوە پاشان پێشەوا ( عمر ﷺ ) ڕێگەی پێ دان بە مەرجێ سەرکردایەتی یان پێ نەسپێردرێت . (طلیحە ) هات بەیعەت بە ( عمر ﷺ ) بدات ، ئەم وتوێژە لە نێوانیاندا ڕووی دا : -

عمر فەرمووی : تۆ بکوژی ( عکاشەی کوڕی محصن )ی پیاو چاکیت [2] لەگەڵ (ثابت ی اقرم )دا ، سوێند بەخوا هەرگیز خۆشم ناوێیت .

ئەوە بوو ( طلیحە ) کەسێکی قسە ئامادە بوو ، وتی : ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوان دوو پیاون ، خوا لەسەر دەستی من ڕێزی لێ نان و منی سەر شۆڕ نەکرد بە دەستی ئەوان . وە خەڵکیش لەگەڵ بوونی پێشینەی خراپیش ئەکرێ ڕێك بکەون .

- واتە دەکرێ لەگەڵ کەسێکی وەك منیشدا ڕێك بکەویت - پێشەوا (عمر)یش قسەکانی بە دڵ بوو ، و لێی ڕازی بوو [3] .

---

[1] - بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٣١٧ ) البدایە والنهایە ( ٥ / ١٩٦ ) .

[2] - باسی ژیانی ئەمیش دێتەپێش ( ﷺ ) ، لەگەڵ ثابتی کوڕی اقرم دا ( خالد ) ڕۆژی ( بزاخە ) ناردبوونی ، طلیحە و براکەی شەهید کردن .

[3] - تکامان وایە عکاشە و طلیحە لەوان بن کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی دەربارەیان : ( یضحك الله الی رجلین قتل احدهما الاخر ، یدخلان الجنة ، یقاتل هذا في سبیل الله فیقتل ، ثم یتوب الله علی القاتل فیسلم، فیقاتل في سبیل الله فیستشهد ) بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە . مانای فەرموودەکەی : (خوای پەروەردگار بەدەم دوو پیاوە وە پێ دەکەنی کە یەکێکیان ئەوی دیکەی کوشتووە ، دەچنە بەهەشتەوە ، یەکەمیان کە لە پێناوی خوادا جەنگاوە و کوژراوە پاشان لە بکوژەکەی تەوبە دەکات و خوای گەورەش لێی خۆش دەبێ و موسڵمان دەبێ و ئەویش لە پێناوی خوادا دەجەنگێت و شەهید دەبێ .

ئەوە بوو ( طلیحە) چووە ژێر ئالآی ئیسلام وەك خەباتكارێك لە پێناوی خوادا ...
ساڵی ( ١٤ كۆچی ) لەگەڵ سوپای ( سعدی كوڕی ئەبو وقاص ) دا بۆ ڕزگار كردنی عێراق كەوتە ڕێ ... سوپای موسڵمانان زیاد لە ( ٣٠ ) سی هەزار جەنگاوەر بوون ، كە سێ هەزاریان لە ( بنی اسد ) بوون و طلیحە یەكێكیان بوو – سەركردایەتی ئەدە كردن – هەرچی سوپای فارسەكانە خۆی لە سەد و بیست هەزار كەسی دەدا ، سەعد حەزی كرد سەرەتا قەرەوڵێكی پشكنین بنێرێت و یەكێ لە سوپاكەی فارس دیل بكات تاوەكو هەواڵی لێ وەرگرێت ئەوە بوو بۆ ئەم جۆرەكارانەش كە سانی شیاو و زۆر بە جەرگ و لێهاتوو بوایە هەڵیان دەبژارد ئەوە بوو ( عمری كوڕی معد)ی لەگەڵ چوار كەسدا بە جیا نارد (طلیحە)شی بە تەنها نارد ... هەرچی (عەمر ) و هاوەڵەكانیەتی هەر كە بینی یان سوپای فارسەكان لە قادسیە نزیك دەبنەوە ، گەڕانەوە ، بەلآم ( طلیحە ) بە تەنها ڕۆیشت تا بە شەودا بە دزیەوە چووە ناو سەربازگەكەی ( روستم ) و مایەوە و چاودێری سوپاكەی ئەكرد !! لە كۆتایی شەودا ئەسپێكی بە دڵ بوو بە شمشێرەكەی كەمندەكەی بڕی و بۆی دەرچوو ، ئەوە بو ئاگر پرستان هەستیان پێ كرد و بە دوایدا ڕۆشتن ، بەلآم پێی نەگەیشتن ، پیاوێكیان ئەبێت كە لە ( طلیحە ) نزیك بووەیەوە و ڕمەكەی بۆ هەڵدا لەدواوە ، بەلآم ( طلیحە) خۆی لێ لادا و نەیپێكا ، هەرچی سوارەكەیە بەردەم ( طلیحە )ی گرت ، بەلآم طلیحە دەستپێشخەری كرد و ڕمەكەی زووتر بۆ هاویشت و كوشتی ئەمجارە یەكێكی تر شوێنی كەوت ئەویش هەروەك یەكەم بە دەستی ( طلیحە ) كوژرا و سێیەم كەس كە شوێنی كەوت ( طلیحە ) دیلی كرد و لەگەڵ خۆی ڕاپێچی كرد و دایە دەست ( سەعدی كوڕی ئەبو وقاص ) ( رضي الله عنه ) !!

## " پاڵەوانی شەهید "

( ڕۆستەم ) بە خۆی و فیلەكانیەوە هات و ... شەڕ هەڵگیرسا ... ( طلیحە ) یەكێ بوو لە وانەی وتاری بۆ سوپای موسڵمانان ددا و بەوپەڕی هیمەتەوە كۆششی دەكرد بە گرنگترین كار هەڵدەسا ئەویش هێرش كردنە سەر فیلەكان بوو ... جێ دەستی خۆی وەك پاڵەوان دیاری كرد ... ئەوە بوو پێشەوا عمر كوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) چوار شمشێر و چوار ئەسپی نارد بۆ سعدی كوڕی ئەبو وەقاص وەك خەلآت بۆ پاڵەوانانی سوپا ، ( طلیحە ) ش شمشێرێكی لەوانە بەركەوت .

لە جەنگێکی تردا کە لە ( جەلەولا ) ڕووی دا ، دیسان ( طلیحە ) پاڵەوانی جەنگە کە بوو . لە جەنگی ( نهاوەند )یشدا فارسەکان نزیکەی سەد و پەنجا سەربازیان کۆ کردبووە وە بۆ پەرچ دانەوەی موسڵمانەکان ، ئەوە بوو پێشەوا عمری کوڕی خەتاب (نعمانی کوڕی مقرن )ی بەسەر ( سی ) هەزار جەنگاوەرەوە بۆ ناردن و فەرمانی پێکرد کە لەگەڵ هەریەکە ( طلیحە ) و ( عمری کوڕی معدی ) یکرب و عەمری کوڕی سەلەمی ) دا ڕاوێژ بکات ئەوەبوو ( نعمان )یش وەك پێش قەرەوڵێکی پشکنین ناردنی ، و هەریەکەیان لە ڕێگەیەکەوە ڕۆیشتن ، ئەو دوانە (عەمری کوڕی معد و عەمری کوڕی ابی سلمی ) هەروا گەڕانەوە هیچیان پێ نەکرا ، ( طلیحە ) ش بە تەنها ( ۱۲۰ ) کم ڕێی کرد تا گەیشتە ( نەهاوەند ) و لەوێ ئەوەی ویستی بۆی دەرکەوت و پاشان گەڕایەوە !!

ئەوە بوو کە ماوەیەکی زۆر دیارنەما موسڵمانان وایان گومان برد کە دیسان هەڵگەڕاوەتەوە لە ئایین .. بەڵام هەر کە بینییان وا گەڕایەوە دەستیان بە ( الله اکبر ) وتن کرد ... ئەویش هەرچی بینیبوو گێڕایەوە بۆ ( نعمان ) .

هەردوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن ... ئەو ڕۆژە ( طلیحە ) گەورەترین شەڕی کرد و بە هەزار سوار چاك ئەژمار دەکرا .. هەروەك خاوەنی ( الطبقات )[1] باسی دەکات ، ئەو ڕۆژە ( نعمان ) ( رضي الله عنه ) شەهید کرا و هەروەك ( طلیحە ) ش ( رضي الله عنه ) پاش ئەوەی کارگەلێکی بە سوپای فارس کرد ، شەهید کرا . پێشەوا زەهەبی دەڵێت : ( طلیحە ) (رضي الله عنه) ڕۆژی ( نەهاوەند ) ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد بە زیادەوە و پاشان شەهید بوو ، خوا لێی خۆش بێت ، بەم ئایەتەی پەروەردگار کۆتایی بە باسی ژیانی دێنین کە دەفەرموێ : ﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ سورة الزمر ، آية (٥٣) . واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێیان بڵێ ، خوا دەفەرموێت : ( ئەی بەندەکانم ، ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە ، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا ، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن ، خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێ ، چونکە ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو ، بە سۆز و میهرەبانیشە . هەروەها دەفەرموێ : ﴿ ... كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ سورة الأنعام ، آية (٥٤) .

[1] – محمدی کوڕی سعد لە ( طبقات )دا و لە ( الطبقة الرابعە من الصحابە ) دا باسی طلیحەی کوڕی خویلدی کردووە ، دەڵێن : لە ئازایەتی و بەرچاوڕوونیدا، ڕوویدا لە جێی هەزار پیاو بوو لە جەنگدا ( البدایە / (٥ / ١٩٦ ) .

واتە : پەروەردگارتان فەرزی کردووە لەسەر خۆی کە لەگەڵتاندا بەرەحم و میهرەبان و دلۆڤان بێت ، ئەگەر کەسێکتان بەنەفامی ، بە نەزانی گوناهێکی کرد و لەوەدوا تەوبەی کردو پەشیمان بووە وە پاش ئەنجامدانی خراپە کە چاکسازی کرد ، ئەوە بادڵنیا بێت کە پەروەرگار زۆر لێخۆش بوو ، و میهرەبانە ...

## " ٦٦ - عکاشەی کوڕی محصن ( رضي الله عنه ) "

## " بە بێ لێپرسینەوە دەچێتە بەهەشت !! "

شەهیدی بەختەوەر ، عکاشەی کوڕی محصن ی کوڕی حرثان ی کوڕی قیس کوڕی مرەی ئەسەدی هاوپەیمانی قورەیشە .. لە پێشینە یەکەمینەکان و ( بەدری)یەکانە لە ئەهلی بەهەشت .. نازناوی ( ئەبو محصن ) بوو ، لە گەورە پیاوان بوو لە ناو هاوەڵاندا و یەکێ بوو لە خاوەن فەزڵەکان و هەروەها لە هەموان جوانتر بوو . کۆچی کردووە و لەبەدردا وەك پاڵەوانێك ئامادەیی خۆی نیشانداوە و هەروەها لە ئوحود و خەندەق و جەنگەکانی دوای ئەوانیشدا بەشدار بووە ( رضي الله عنه ) [1].

### " پەرجوویەك ( معجزەیەك ) "

ابن اسحاق ، دەڵێت : عکاشەی کوڕی محصن ، ی هاوپەیمانی ابن عبد شمس بن عبدمناف ڕۆژی بەدر شەڕی کرد تا شمشێرەکەی لە دەستیدا لەت بوو ، هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە پارچە تەختەیەکی پێدا – لە ڕیوایەتێکی دیکەدا لاسکی دارخورمایەکی پێدا – و فەرمووی : ( قاتل بهذا يا عكاشه ) !! ئەی ( عکاشە ) بە مە شەڕ بکە ، ئەوە بوو کە لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی وەرگرت و ڕایوەشاند ، بووە شمشێرێکی درێژ بە دەستیەوە ، تۆکمە و نوك سپی ، شەڕی پێ کرد تا سەرکەوتن بۆ موسڵمانان هاتە دی [2]، ئەو شمشێرەیان بە ( العون ) ناو دەبرد بەردەوام لە هەموو جەنگەکاندا شەڕی پێ دەکرد هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، تا لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا شەهید بوو و شمشێرەکەی بە دەستەوە بوو .

---

[1] – بڕوانە / البدايه و النهايه ( ٥ / ٤٦ ) و سير اعلام النبلاء ( ١ / ٣٠٧ ) .

[2] – بيهقي لە ( دلائل النبوة ) دا باسی کردووە ( ٣ / ٩٨ ، ٩٩ ) لە ڕێ ئیبنو اسحاقەوە بەبێ ئیسناد ، هەروەها ئیبنو حجر لە ( الفتح ) ( ٧ / ٤١٩ ) بە بێ ئیسناد باسی کردووە و لێی بێ دەنگ بووە ، هەروەها (ئیبنو کثیر لە البدايه و النهايه ) ( ٥ / ٤٦ ) باسی کردووە و لێی بێ دەنگ بووە و سير اعلام النبلاء ( ١ / ٣٠٨ ) و زەهەبیش لێی بێ دەنگ بووە . سەنەدەکەی لاوازە .

وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەسەر سریەی ( الغمر )[١] ەوە ناردوویەتی بەبێ شەڕ بەدەستی پڕ گەڕاوەتەوە .

## " سەرکەوتنی گەورە "

ئەم پیاوە مەزن و بەختەوەرە ، شکۆمەندی دنیا و قیامەتیشی بە دەست هێنا ، ئەوەتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) موژدەی پێ داوە کە یەکێکە لەو حەفتا هەزار کەسەی بە بێ لێپرسینەوە دەچنە بە هەشت !!! موژدەت لێ بێت ئەی بەختەوەر .

لە ( ابن عباس )ەوە ( ﷺ ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی: عُرِضَت عليَّ الأمم ، فجعل النبيُّ والنَّبيَّانِ يَمُرُّون معهم الرهط ، والنبيُّ ليس معه احد ، حتى رُفِع لي سواد عظيم ، فقلت : ما هذا ؟ امتي هذه ؟ قيل : بل هذا موسى وقومُه ، قيل : انْظُر إلى الأفق ، فإذا سواد عظيم قد ملأ الأفق ، ثم قيل لي : انظر ها هنا وها هنا في آفاق السماء ، فإذا سواد قد ملأ الأفق، قيل : هذه امتك ، ويدخل الجنة من هؤلاء سبعون الفا بغير حساب ، ثم دخل ولم يُبَيِّنْ لهم ، فأفاض القومُ ، وقالوا : نحن الذين آمنا بالله، واتَّبَعْنَا رسولَه ، فنحن هم ، ام اولادُنا الذين وُلِدُوا في الإسلام ، فإنَّا وُلِدْنا في الجاهلية ، فبلغ النبيَّ –صلى الله عليه وسلم– ، فخرج فقال : هم الذين لا يَستَرْقُون ، ولا يتطيَّرُون ، ولا يَكْتَوون ، وعلى ربهم يتوكلون. فقال عُكَّاشة بن مِحْصَن : امِنْهم انا يا رسول الله ؟ فقال : نعم ، فقام آخر فقال : امنهم انا ؟ فقال : سبقك بها عكاشة )واتە : نەتەوەکانم پیشاندرا تێپەڕ دەبوون ، دەمبینی پێغەمبەری وا هەبوو چەند کەسێکی لەگەڵ بوو ، هەبوو هیچ کەسی لەگەڵدا نەبوو ، تاوەکو رەشایی یەکی گەورەم بەسەردا هەڵدرایەوە ، واتە : کەسانێکی زۆرم بەر چاوکەوت (بەهۆی زۆری یانەوە وەك پارچەیەك رەشی دەردەکەوتن ) وتم : ئەمانە کێن ؟

---

[١] – لە سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٣٠٧ ) داهاتووە لە ( معجم البلدان ) ٤ / ٢١٢ : بە ( الغمرە ) هاتووە ، هەروەها لە ( السیر ) ( ٢ / ٦١٢ ) دا .. یاقوت دەڵێت : کانی یەکە لە سەر رێگەی مەککە ، و نیشتەنگایەکە و ئەکەوێتە نێوان ( تهامە ) و ( نجد ) .

ئیبنو القیم دەڵێت : ( غمرە ) ئەکەوێتە سەر رێگای ( نجد ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ( عکاشەی کوڕی محصن ) ی نارد بۆ غەزای لەگەڵ ( ٤٠ ) پیاودا ، کە چوونە لای ( الغمر ) خەڵك لە هاتنیان ئاگادار بوون و رایان کرد ، لەسەر ئاوەکانیان مایەوە ( مەنزڵی کرد ) و چەند هەواڵدەرێکی نارد تا جێگای ولاخ و مەڕو ماڵاتەکانیان بدۆزنەوە ، ئەوە بوو دوو سەد حوشتریان بینیەوە دوای ئەوەی غەزویان کرد ، حوشترەکانیان بردەوە بۆ مەدینە .

ئوممەتەکەی منن ؟ پێم وترا نەخێر ، بەڵکو ئەوانە( موسی ) و ئوممەتەکەی ئەون . پێم وترا سەیری ئەو لایە بکە دیم ڕەشایی یەك هەموو ئاسۆی داگیر کردووە ، پێم وترا سەیری ئەملا و ئەولا بکە ئاسۆی پڕ کردبوو لە بەر زۆری خەڵکەکە ، پێم وترا ئەمە ئوممەتی تۆیە و لەوانە حەفتا هەزاریان بە بیٚ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت . پاشان چووە ژوورەو هیچی بۆ بەیان نەکردین ، خەڵکەکەش دوای ئەوەی بلاوەیان لیٚ کرد وتیان : ئێمە لەوانەین ، چونکە باوەڕمان بە خوا هێناوە و شوێن پێغەمبەرەکەی کەوتوین ، یان منداڵەکانمان لەوانەن کە لە ناو ئیسلامدا هاتوونەتە دنیاوە ، ئێمە لە جاهیلەتدا هاتووینەتە دنیا ، ئەمە بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت ، چووە دەرەوە و فەرمووی :، بەڵکو ئەوانەن کە نوشتە ناکەن و ڕەشبین نابن و هەڵناسن بە . داخ کردن . بۆ چارەسەر و پشت بە خوای خۆیان دەبەستن . ( عکاشەی کوڕی نعمان )یش فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) من لە ناو ئەوانەدا هەم ؟

فەرمووی : بەڵیٚ .. ئەوجا یەکێکی تر لە ناویاندا هەڵسایەوە ئەویش پرسی : ئەی من چی ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ فەرمووی : ( سبقك بها عكاشه )[1]

واتە : عکاشە پێش تۆی دایەوە ... ڕوونکردنەوەیەك : - خۆ تیمار کردن لە چەندین فەرموودەی ( صحیح ) دا هاتووە بۆ نموونە :

١ - لە ئەبو هریرەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( ما أنزل الله من داء الا و انزل له شفاءً )[2]

واتە : خوای گەورە هەر نەخۆشی و دەردێکی دابەزاندبێت ، چارەسەرێکیشی بۆ دابەزاندووە.

٢ - لە ( اسامەی کوڕی شریك )ەوە ، دەڵێت : لەلای پێغەمبەری خوا دا بووم (ﷺ) کە دەشتەکیی یەك هات بۆ لای وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تیماری خۆمان بکەین ؟ فەرمووی : ( نعم یا عباد الله تدا و وا ، فإن الله عزوجل لم یصنع داءاً الا و ضع لـه شـفاء غیرداء واحد ) واتە : بەڵیٚ ، ئەی بەندەکانی خوا ، تیماری خۆتان بکەن ، چونکە خودای پەروەردگار هەر دەردێکی قەرار دئەبوت ، دەرمانێکیشی بۆ بڕیارداوە جگە لە یەك دەرد .

وتیان : کامەیە ؟ فەرمووی : (الهرم)[3] واتە : پیری .

---

[1] - صحیح / بوخاری لە کتابی ( الطب ) ( ٥٧٠٥ ) دەری هێناوە ، وە مسلم و تیرمیزی و غەیری ئەوانیش.

[2] - صحیح / زانایان کۆ دەنگن .

[3] - صحیح / احمد ( ٤ / ٢٧٨ ) ڕیوایەتی کردووە ، تیرمیزی ( ٢٠٣٩ ) و دەڵێت: فەرمووی ( حسن صحیح)ە.

٣ – لە ئەبو خزامەوە ، دەڵێت : وتم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، چی دەڵێیت دەربارەی نوشتەو دۆعا و دەرمان بۆ خۆتیمار کردن و ( تقاە ) ، ئایا ئەمانە هیچ لە قەدەر و بڕیاری خوای گەورە دەگێڕنەوە ؟فەرمووی : ( هي من قدر الله ) ئەوانە لە بڕیار و فەرمانی خودان [١] ...

٤ – هەروەها لە ( صحیح ) دا لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) جێگیر بووە کە مۆڵەتی ( داغ کردنی داوە ) !! ئەوەتە لە ( جابری کوڕی عبدالله )وە ( ﷺ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پزیشکێکی ناردە لای ( ئەبو کوڕی کعب ) هەڵسا بە بڕینی دەمارێکی و دوایش داخ کردنی شوێنەکەی [٢] .

ئێستا چۆن ئەو فەرموودانەی ڕێگری دەکەن بسازێنین لەگەڵ ئەو فەرموودانەدا کە ڕێگە دەدەن بەو جۆرە چارەسەر کردنانە ؟

ابن القیم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : ( لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە کە فەرمان بە تیمار کردن دەکات ، ئەمەش وەلانانی پشت بەخوا بەستن ناگەیەنێت هەروەك چۆن نەهێشتنی برسێتی و تینوێتی و گەرما و سەرما بە دژەکانیان ئەوە ناگەیەنێت تۆ ئیتر پشت بەستنت .بەخوا نەماوە ، یان کەم بۆتەوە ، بەڵکو هەقیقەتی یەکتا پەرستی تەواو نابێت مەگەر بە گرتنەبەری ئەو هۆکارانەی خوای گەورە داینـاون بۆ گەشتن بە داواکراوە شەرعی و بڕیار لەسەر دراوەکان .

هەروەها دەڵێت : ( ئەو فەرموودانەی باسی ( داغ کردن – الکي ) دەکەن چوار جۆرن ، یەکێکیان / بەکردار ئەنجامی داوە ، دوومیان / حەزی لێ نەبووە ، سێیەم / ستایش کردنی واز لێ هێنانی ، چوارەم / ڕێگری لێ کردنی ، و سوپاس بۆ خوا هیچیان پێچەوانەی یەکتر نین ، چونکە ئەنجامدانی بەکردار مانای ڕێ پێدانیەتی و حەز لێ نەبوونیشی بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی قەدەغەی کردبێت . هەروەها ستایش نەکردنیشی ، مانای ئەوەیەکە نەکردنی باشتر و چاکترە . هەرچی ڕێگری کردنیشە لێی ، لەڕێی هەڵبژاردن و ( کەراهەت )ەوەیە یان بۆیە کەسێکە کە پێویستی پێ نیە و لە ترسی

---

[١] – احمد ڕیوایەتی کردووە ، ( ٣ / ٤٢١ ) غەیری ئەویش وە لە لای ( حاکم )یش هەیە دەڵێت : ( صحیح ) ە و پێشەوا ( زەهبی )ش هاوڕایە .

[٢] – صحیح / مسلم ( ٢٢٠٧ ) لە ( السلام ) بابی / لکل داء دواء .

دەردێك ئەنجامی ئەدا كە هێشتا تووشی نەبووە ، خوداش باشتر دەزانێت )[1] نووسەر ، دەڵێت : لەوەی ڕابورد دەردەكەوێت كە ئەوەی وازی لیٚ دێنێت و ئەنجامی نادات لە قایمكاری یەوە یەو ئەوەشی ئەنجامی دەدات و وەك دەرمانێك ئەوە كاری بە مۆڵەت ( رخصة ) كردووە ، بەگشتی شتەكە لەسەر توانا و وزەی كەسەكە وەستاوە . ( وە بەرژەوەندی لە كویٚ بێت شەرعی خوای پەروەردگاریش لەوێدایە ) .

## " شەهید بوونی ( رضي الله عنه ) "

پێشەوا ( ابن كثير ) دەڵێت : ( احمد لە ڕێی ( وحشی كوڕی حرب )ەوە گێراوەیەتیەوە ، كە ابوبەكری صدیق ( رضي الله عنه ) كاتیٚ لیوای پێكەوە نا بۆ ( خالدی كوڕی وەلید ) بۆ كوشتاری هەڵگەڕاوەكان ، وتی : گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ەوە بوو فەرمووی : ( نعم عبدالله و اخو العشيرة ، خالد بن الوليد ، سيف من سيوف الله سله الله على الكفار و المنافقين ) .

واتە : باشترین بەندەی خوا و برای عەشرەت ( خالدی كوڕی وەلیدە ) شمشێرێكە لە شمشێرەكانی خوا ، و پەروەردگار بۆ سەر بیٚ باوەڕان و دووڕووان لە كێلان دەریهێنا). فەرمانی پیٚ كرد یەكەمجار بچێتە لای ( طلحة الاسدی ) و پاشان بۆلای ( بنی تمیم ) ، ئەوە بوو ( طلیحە ) لەناو ( بنی اسد ) و ( غطفان ) دا بوو ... وە ( بنو عبس و ذبیان)یش هاتنە پاڵیان .. ئەوجا خالد بە خۆی و سەربازەكانیەوە و ( ثابتی كوڕی قیس)[2] لە پێشەوەی پشتیواناندا بوو ئەوجا (ثابت ی كوڕی ارقم و عكاشەی كوڕی محصن )ی نارد بۆ چاودێری و لەویٚ طلحة و سلیمەی برای و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون بەیەك گەیشتن و لەگەڵ ثابت و عكاشەدا كەوتنە مەیدان كاری ئەوە بوو عكاشە جوبالی كوڕی طلیحەی كوشت ( طلیحە) ش هەڵمەتێكی بۆ هێناو عكاشەی شەهید كرد هەروەها لەگەڵ سەلەمەی برایدا ثابت ی كوڕی ارقم یان شەهید كرد ئینجا كە خالید و هاوەڵەكانی

---

[1] – زاد المعاد ( ٤ / ١٥ ) ، ( ٤ / ٦٥ ، ٦٦ ) .

[2] – هاوەڵی پایە بەرز ثابت لەبەدر و دوای ئەویشدا ئامادە بوو هەروەها یەكێك بووە لە وانەی لە مۆتەدا بەشداری كرد و كاتێك عبدالله ی كوڕی رواحە كوژرا ئاڵای موسڵمانانای پێدرا ، بەلاّم ئەوەدایە خالیدی كوڕی وەلید و پیٚ ی وت تۆباشتری لە من و شارەزایی لەشەڕدا ، وە هەروەك باسمان – كرد لەگەڵ عكاشەدا شەهید بوون : البدايه ( ٥ / ٤١ ) .

گەیشتن و بە کوژراوی هەردوو هاوەڵەکەیان بینی [1] . ئەمە زۆر بۆ موسڵمانان نا ڕەحەت بوو پاشان خالید فەرمانی کرد بە جلەکانی بەری خۆیانەوە وە بە خوێنەکە یانە وە بسپێردرێن (ﷺ) [2] .

[1] – ئەم بەیەکگەیشتنە لەلای سەرچاوە ئاوێکی بنی اسد دا بوو کە بە ( بزاخە ) ناو دەبرا .

[2] – بڕوانە : البدایە و النهایە ( ٥ / ٢١ ) بە دەستکاری یەوە .

## " ٦٧ - ئەبو لبابەی کوڕی عبدالمنذر ( رضي الله عنه ) "

## " خاوەنی دەروونێکی سەرزەنشتکار "

**کێ یە ؟**

خواناس و لە خواترس ، ( ئەو لبابەی کوڕی عبدالمنذر ) ە ... کەسێکی داناو بەڕێزە و لە ( عەقەبە ) دا بەشدار بووە . لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ ( بەدر ) بەڕێ کەوتووە ، بەلاّم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەڕاندیەوە بۆ مەدینە تاچاودێری ئەوێ بکات و لە غەنیمەکانیش بەشێکی بۆ دانا[1] .

وە ئەم میوانەمان ، چیرۆکێکی لەگەڵ ( بنی قریظة ) دا هەیە تووشی هەڵەیەك بووە .. پاشان گەڕاوەتەوە بۆلای پەروەردگاری و تەوبەی کردووە و ڕێی ڕاستی گرتووەتەبەر..

چیرۆکەکەشی ئەمەیە : -

لە غەزای ( احزاب ) دا ... پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێکەوتنێکی لەگەڵ ( بنی قریظة ) دا گرێ دابوو ... یەکێ لە بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنامەیە ئەوەبوو کە هەردوو لابە هاوبەشی پارێزگاری لە مەدینە بکەن ئەگەر تووشی دوژمنکاری یەکی دەرەکی هات ، کاتێ ( احزاب ) کۆبوونەوە بە مەبەستی ڕیشەکێش کردنی ڕەچەڵەکی موسڵمانان ، لە دەورویەری مەدینە قەرەولیان دانا ، هەواڵی پەیمانشکێنی جولەکەکانی ( بنی قریظة ) گەیشت و وتیان : کە هیچ گرێبەست [2] و پەیمانێك لە نێوان ئێمە و ( محمد ) دا نیە [3] !! خەریك بوو ئەم پلانە ستەمکارانە یە هەموو موسڵمانان لەناوبەرێت ئەگەر بەزەیی و لوتفی خودای بالاّ دەست نەبوایە .. لە ( ابی سعیدی خدری ) یەوە ، ( رضي الله عنه ) دەڵێت : ڕۆژی ( خندق ) پرسیمان : ئەی پێغەمبەری خوا( ﷺ ) لە ڕاستیدا دڵەکان گەیشتوونەتە گەروو لە تۆقێندا چیمان پێ دەڵێیت کە ئەنجامی بدەین یان بیڵێین ؟ ئەویش فەرمووی : (اللهم استر عورتنا و آمن روعاتنا ) .

---

[1] - بڕوانە : اسد الغابە ( ٦ / ٢٦٥ ) .

[2] - سەیری ژیانی ( سعدی کوڕی معاذ ) بکە ( رضي الله عنه ) .

[3] - شێخ محمدی غەزالی دەڵێت : ڕەفتار و ڕەوشتی ( بنی اسرائیل ) لە ئاستی پەیمانەکانیاندا لە کۆن و نوێدا وامان لێ دەکات دڵنیابین لەوەی کە ئەمانە واز لە سوکێتی و نزمی ناهێنن ، هەرکاتێ گوێدرێژ وازی لە زەڕین هێنا و ماروازی لە گەستن هێنا .. ئەوا جولەکەش واز لە پەیمانشکاندن دێنن ) فقە السیرە .

واتە فەرمووی ، بڵێن : ئەی پەروەردگار عەورەت و دامێنمان بپۆشە و لە ترس و تۆقین دڵنیا و ئەمینمان کە ...

دەڵێت : ئەوە بوو ، پەروەردگار بەباهۆز دای لە دەم و چاوی دوژمنان و بە باهۆز شکستی پێ هێنان [1] . خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ سورة الأحزاب ، آية (٩) [2] .

ئەوجا کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە جەنگی ( ئەحزاب )ەکان بوویەوە ، بەرەو ( بني قريظة ) موسڵمانەکانی برد تا ئابڵوقەیان بدەن پاش ئەوەی لە کاتی نەهات و ناڕەحەتیدا ئەو پەیمانەی دابوویان شکاندیان و نەیانبردەسەر .

ابن اسحاق دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ( علی کوڕی ئەبو تالیب ) ی بە خۆی و ئاڵاکەیەوەپێشخست بۆلای ( بني قريظة ) ، و هەر کە نزیك قەڵاکانیان بوویەوە ، گوێی لە قسەیەکی ناشیرین و نەشیا و بوو کە بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یان دەوت ، ئەوە بوو گەڕایەوە تا لە ڕێگا بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت ، پێی فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەگەر نزیك نەبیتەوە لەو پیس و دەغەڵانە باشترە .

فەرمووی: ( لم ؟ اظنك سمعت منهم لي اذى ؟ )

واتە : لەبەر چی ؟ وادیارە شتێکی ئازار دەرت لێیان بیستووە دەربارەی من ؟

فەرمووی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ... ئەویش ( ﷺ ) فەرمووی : ( لو رأوني لم يقولوا من ذلك شيئاً ) ئەگەر منیان بدیایە شتی وا لە زاریان دەرنەدەچوو .

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە قەڵاکانیان نزیك بوویەوە ، فەرمووی : ( يا إخوان القردة ، هل اخزاكم الله و انزل بكم نقمته ؟ ) واتە : ئەی براو خوشکی مەیموونەکان ، دەڵێی خوا ڕیسوای کردوون و ڕقی خۆی بەسەرتاندا دابەزاندووە ؟

---

[1] – احمد ریوایەتی کردوە لە ( المسند ) دا ( ٣ / ٣ ) .

[2] – واتە : ئەی ئیمانداران یادی نیعمەتی خوابکەنەوە لە سەرتان ( لە جەنگی خەندەقدا ) کاتێ سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان ، ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێز و سەربازێکمان نارده سەریان کە نەتاندەبینین ، خوای گەورە بینا بوو بە هەوڵ و کۆششتان ...

وتیان : ( ئەی ئەبو قاسم ، هەرگیز نەزان نەبوویت )[1] .

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەمارۆی دان بۆ ماوەی ( ٢٥ ) شەو ، هەتا ئەو گەمارۆدانە جولەکەکانی شەکەت کرد ، و ترس و تۆقینی هاویشتە دڵەکانیان ! و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بانگی کردن کە بێن بەدەم فەرمان و بڕیاری یەوە و ملکەچی بن .

ئەوجا ( بني قريظة ) کەسێکیان ناردەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە ( ئەبو لبابەی کوڕی منذر ) ی برای ( عەمری کوڕی عەوف ) یان بۆ بنێرێت (ئەوان هاوپەیمانی ئەوس بوون ) ، تاوەکو ڕاوێژی پێ بکەین دەربارەی حاڵی خۆمان ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) ناردی بۆیان هەرکەبینیان ، پیاو و ئافرەتیان دەستە و دامێنی بوون و دەستیان بە گریان کرد ، ئەویش بەزەیی پیایاندا هاتەوە[2] ، پێیان وت : ئەی ئەبو لبابە ! بەڕای تۆ بەدەم فەرمانی ( محمد )ەوە بچین ؟

فەرمووی : بەڵێ ، بەدەستی ئاماژەی بۆ گەروی کرد ، کە مەبەستی کوشتن بوو ، ابولبابە دەڵێت : سوێند بەخوا هێشتا لە جێی خۆم نەجوڵا بووم زانیم کە نا پاکیم لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کردووە ، پاشان ( ابو لبابە ) بۆی دەرچوو ، نەهاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، و لە مزگەوت خۆی بەستەوە بە یەکێ لە پایەکانەوە و وتی : لەم جێیەی خۆم ناجوڵێم تا خوا لێم خۆش دەبێ لەسەر ئەمەی کە کردم ، و پەیمان بە پەروەردگار دەدەم کە هەرگیز پێ نەخەمە لای ( بني قريظة ) وە و ئەو جێگایە نەبینم کە تیایدا ناپاکیم لە خوا و پێغەمبەر کرد و نهێنی یەکەم درکاند .

ابن هشام دەڵێت : سفیانی کوڕی عیینە لە اسماعیل ی کوڕی ئەبو خالدەوە لە عبدالله ی کوڕی ئەبو قتادەوە دەڵێت ، خوای گەورە دەربارەی ( ابو لبابە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ سورة الأنفال ، آية (٢٧) . واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە : خیانەت مەکەن لە خوا و لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و سپاردەکانتان کە

---

[1] – حاکم لە ( المستدرك ) ( ٣ / ٣٤ ، ٣٥ ) لە عائیشەوە ( ﵂ ) ریوایەتی کردووە . بە لەفزێکی هاوشێوە دەڵێت : لەسەر مەرجی هەردوو شەیخ ( صحیح ) ە و ئەوان ریوایەتیان نەکردووە ، زەهەبیش هاوڕایە .. و ئیبنو کثیر دەڵێت : لە التاریخ ) ( ٤ ، ١١٨ ) : ئەم فەرموودە چەند ڕێگەیەکی باشی هەیە لە (عائیشە) و غەیری ئەویشەوە .

[2] – ابو لبابە ئەیزانی بڕیاری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چی یە بۆیان . وە مۆڵەتی ئەوەشی نەبوو کە ئەو نهێنیە بدرکێنێ .

پێتان دەسپێردرێت ، لە کاتێکدا ئێوە دەزانن ( کە ئەوە خیانەتە ) . ابن اسحاق دەڵێت : کاتێ هەواڵی ( ابو لبابە ) بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت ئەوە بوو هەر دیار نەمابوو کە بێتەوە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، فەرمووی : ( اما انه لوكان جاءني لأستغفرت له ، فأما اذ قد فعل ما فعل فما انا بالذي اطلقة من مكانه حتى يتوب الله عليه )[1] . واتە : ئەگەر بهاتایە بۆ لای من ئەوا داوای لێ خۆشبوونم بۆ دەکرد ، بەڵام مادەم ئەوەی کردووە کە کردویەتی – لە مزگەوت ماوەتەوە – ئەوە منیش لە جێی خۆی دەیهێڵمەوە تا خوا لێی خۆش دەبێ.

ابن اسحاق دەڵێت : یزیدی کوڕی عبداللە کوڕی قسیط بۆی باس کردم کە قبوڵ کردنی تەوبەکەی ( ابالبابە ) لە کاتی سەر لەبەیانیدا ( سحر ) دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە لە ماڵی ( ام سلمە ) دا بوو ( ﵂ ) ... ام سلمە ، فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو بەیانی زوو پێکەنی ، پرسیم بەچی پێ دەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ یاخوا هەمیشە دەم بە پێکەنین بیت ؟ فەرمووی : ( خودا لە ئەبو لبابە خۆش بووە و تەوبەکەی وەرگرتووە ) ، وتم : نەچم موژدەی پێ بدەم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ فەرمووی : ( بلى ، ان شئت ) برۆ ، ئەگەر دەتەوێ .. دەڵێت : ام سلمە ( ﵂ ) لە دەرگای ژوورەکەیەوە – لەوکاتەدا هێشتا ئایەتەکانی بالآپۆشی نەهاتبووە خوارەوە – فەرمووی : ئەی ابالبابە موژدە بێ .. خوا گەڕانەوەکەی قبوڵ کردویت . ام سلمە ، دەڵێت : خەڵك هەموو بەرەو ڕووی ڕۆشتن تا بیکەنەوە ( وتمان خۆی بە پایەکەوە بەستبووەوە ) ، فەرمووی : نا بەخوا ، هەروا دەمێنم تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆی دەست و بەندەکانم بکاتەوە بە دەستی موبارەکی ئەوجا کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ نوێژی بەیانی چوو بۆ مزگەوت دەست و بەندەکەی کردەوە[2] . ابن هشام ، دەڵێت : ابو لبابە بە بەستراوەیی بۆماوەی شەش ڕۆژ خۆی هێشتەوە و لەکاتی نوێژەکاندا خێزانەکەی دەهات دەستی دەکردەوە تا نوێژەکەی بکات ، و پاشان خۆی دەبەستەوە بە پایەکەوە ، هەروەك هەندێ لە زانستخوازان بۆیان باس کردووم . ئەو ئایەتەش کە لە تەوبەکەیدا[3] دابەزی ئەمە بوو کە پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا

---

[1] – ئیبنو جریری طبری لە ( تفسیر )ەکەیدا ( ٢١ / ٩٧ ) و الواحدی لە ( اسباب النزول ) ( ١٩٣ ) .

[2] – سەنەدەکی ( مرسل )ە : بیهقی لە ( الدلائل ) ( ٤ / ١٧ ) دا دەری هێناوە .

[3] – الواحدی النیشابوری لە ( اسباب النزل ) ( ٢١٤ ) و ریوایەتی کردوە بۆ ( ئیبنو جریر ( ١ / ١٠ ) لە ڕێ ( الوالی )یەوە بە بچڕبچڕی .

وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ سورة التوبة ، آية (١٠٢) . **واتە : (بێجگە لەوانە) کەسانێکی تریش هەن کە دان بە گوناه و هەڵەکانیاندا دەنێنن و کرداری چاك و کرداری خراپیشیان تێکەڵ کردووە ، ئەمانە نزیکە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێت ، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو ، و میهرەبانە) ابولبابە پاش دابەزینی ئەم ئایەتە بە وەرگرتنی تەوبەکەی ، بەوە فاداری بۆ ئاینەکەی مایەوە و بەخوا پەرستی یەوە خەریك بوو ، تا ئەو کاتەی وەفاتی بۆ هاتە پێش و ، گەیشت بە قافڵەی سەرفرازان . (رەزای خوای لێ بێت).**

## " ٦٨ - كعب ی كوڕی مالك ( رضي الله عنه ) "

## " دڵخۆشبە بە چاكترین ڕۆژی لە تەمەنتدا "

**كێ یە ؟**

كعب ی كوڕی مالك ی كوڕی ئەبو كعب ی ئەنصاری خەزرەجی عەقەبی ئوحودی و هاوەڵ و هۆنەری پێغەمبەری خوا یە ( ﷺ ) و یەكێكە لەو سێ كەسەی كە لە جەنگی (تبوك ) دواكەتن و خودا لێیان خۆش بوو.

لەو حەفتا كەسەیە كە ئامادەی ( عقبە ) بوون . ابن سیرین ، دەڵێت : شاعیرانی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمانە بوون ، حسان ی كوڕی ثابت و عبدالله ی كوڕی رواحە و كعب كوڕی مالك .

عبدالرحمن ی كوڕی كعب ، لە باوكیەوە دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی پرسیوە : ئەی پێغەمبەری خوا ، خودا دەربارەی شاعیران فەرمایشتێكی دابەزاندووە[1] . ئەویش فەرمووی : ( ان المجاهد ، مجاهد بسیفه و لسانه ، والذي نفسي بیده لكأنما ترمونهم به نضح النبل )[2] .

واتە : تێكۆشەر ئەوەیە بە شمشێرەكەشی و بەزمانیشی تێكۆشێت ، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە وتەكانتان وەك تیر دەیانپێكێ ). ابن ئەبو حاتم ، دەڵێت : لەسەردەمی پاشایەتی ( معاویە )دا ( رضي الله عنه ) بینایی لە دەست داوە .

### " خەباتی ( كعب رضي الله عنه ) لە پێناوی خوادا ( جل جلاله ) "

كعب ، باشترین خەباتی كرد لە پێناوی خوادا و لە ( ئوحود ) دا پاڵەوانێتی خۆی نیشاندا .

---

[1] - مەبەستی ئەم ئایەتەیە : ﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ(٢٢٤)أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ(٢٢٥)وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ(٢٢٦) ﴾ الشعراء ( ٢٢٤ — ٢٢٦ ) .

لەسەر مانای ؟( يَتَّبِعُهُمْ ) ئیبنو عباس دەڵێت : گومڕای جنۆكە و مرۆڤ — وتراویشە ( الغوون ) ئەوانەن لە هەق لائەدەن ، ( شعر )یش : باشەكەی باشە و خراپەكەشی خراپە ، بڕوانە تفسیری ( القرطبي ) بۆ ئەم چەند ئایەتە .

[2] - سەنەدەكی ( صحیح ) ە / عبدالرزاق لە ( المصنف ) ( ٢٠٥٠٠ ) دەریهێناوەی . ارنؤوط ئەمە دەڵێت لە ( سیر ٢ / ٥٢٥ ) .

هشامی کوردی عروە ، لەباوکیەوە ، دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زبێری کوڕی عوام و ( کعب ی کوڕی مالك )ی کردەبرا . ئەوەبوو کعب ڕۆژی ئوحود پەڕپوت بوو بوو ئەوەندە پێکرا بوو ، و زبێر هێنای بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پەروەردگاریش ئەم ئایەتی دابەزاند :﴿ ...وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ ... ﴾[1] سورة ألأنفال ، آية ( ٧٥ ) .

واتە : ئەوانەش کە پەیوەندی خزمایەتیشتان هەیە ، هەندێکیان شایستە ترن بە هەندێکی تریان لە بەرنامەی خوادا ، بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانا و بەئاگایە ). وە لە ( کعب ) ەوە ڕیوایەتی کردووە ، کاتێ ڕۆژی ئوحود کەوتینە بەردەست بێ باوەڕان ، من یەکەم کەس بووم پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) ناسیەوە موژدەی زیندوویەتیم بە موسڵمانان گەیاند ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کعب ی بانگ کردوو ، قەڵغان و سپەرەکەی خۆی پێدا کە زەردێك بوو ،ئەویش لەبەری کردوو ، ئەو ڕۆژە شەڕێکی زۆری کرد ، تا لە حەڤدە لاوە بریندار بوو.

## " دواکەوتنی لە جەنگی تبوك "

ساڵی ( ٩ ) ی کۆچی ڕۆمیەکان بیریان لەوە کردەوە کە دەبێ دووبارە بدەنەوە بەسەر ئیسلامدا هەواڵی ئەم خۆ ئامادەکردنەی ڕۆم بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەشت ، بۆیە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێگەیەکی باشتر لەوەی بەدی نەکرد کە موسڵمانان ئامادەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوژمنانە ... ئەو کاتانەش ڕۆژگاری نەبوونی و کەم بارانی بوو .

گەیشتن بە ڕۆمەکان پێویستی بە کۆشش و بزێویەکی گەورە هەبوو . وە کوشتاری ڕۆم بیریتی نەبوو لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تیرەیەکی ژمارە دیاری کراو و چەك و تفاق سنوردار کراو ، بەڵکو کۆششێکی تاڵ بوو لەگەڵ دەوڵەتێکدا کە دەسەلاتێکی بەسەر چەند کیشوەرێك دەڕوات ، بەڵام کەسانی خاوەن بیر و باوەڕ لەبەردەم نەهامەتەکاندا چۆك دانادەن و پشت هەڵناکەن ، بەهۆی ئەو بارودۆخە سەختەوە کە تیایدا ئامادەکاری بۆ

[1] — پیاوانی جێ متمانەن : لای ئیبنو الکثیریش هاتووە ( ٣ / ٤٦٨ ) ... هەروەها ( السیوطی ) لە ( الدر المنثور ) ( ٣ / ٢٠٧ ) باسی کردووە .. الارنؤوط ( سیر : ٢ / ٥٢٤ ) .

سوپای موسڵمانان کرا سوپاکە ناوی لیّ نرا ( جیش العسره – سوپای نەبوونی و سەختی ) .

موسڵمانان بەتفاقێکەوە بەڕیّ کەوتن کە هەرگیز پێشتر بە وێنەی ئەوەوە بەڕیّ نەکەوتبون ، بەرەو باکوور بۆ ئەو جێگایە بەڕێکەوتن کە سوپای ڕۆم قەرەوڵیان دانابوو .

ئامادەکاری سوپاکە ناوکرۆکی دەروونی موسڵمانانی ئاشکرا کرد دەوڵەمەندەکانیان هەموو سامانیان خستەکار بۆ ساز کردن و کۆمەکی کردنی سوپا ... هەژارەکانیشیان کە ئامادەبوون بکەونە ڕیّ لەگەڵ سوپادا .. لە پێناوی خوادا گیانیان ببەخشن ، بەلاّم بەهۆی نەبوونی تفاق و چەك و هۆکاری شەڕ کردنەوە ، نەیانتوانی بگەنە مەیدانی جەنگ و ئەوەش فرمێسکی بیّ دەسەلاّتی لە چاوانیاندا وەك باران دائەباراندا کە چۆن بیّ بەش بوون لەو شانازیە گەورەیە ...

هەروەها دڵە لەرزۆکەکانیش ئاشکرا بوون ئەوانەی بە ڕووکەش لە ئیسلامدا بوون و دڵیان پڕی بوو لە ڕق و کینە بۆ ئیسلام و ئەهلەکەی و بەدوای بچوکترین بیانوو دادەگەڕان کەلە شەڕ هەڵ بێن و بە هیچ شێوازێك یارمەتی پێشکەش نەکەن ، لە هیچ و پوچترین ئەو بیانوانەی کە ئەو دووڕوانە بۆ پێغەمبەری خوایان ( ﷺ ) دەخستە ڕوو بەمەبەستی ئەوەی نەیان باتە بەرەی شەڕ ئەوە بوو ( الجدی کوڕی قیس ) بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی وت : مۆڵەتم بدە با نەیەم و تووشی فیتنە و گوناه نەبم سوێند بەخوا هۆزەکەم لێم ئاگادارن کە من چەند موعجیبی ئافرەتانم و ئەترسم ئەگەر ئافرەتانی ( بنی الاصفر ) – واتە ڕۆم – ببینم خۆمم پیّ ڕاناگیریّ لە ئاستیاندا ! پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕووی لیّ وەرگێڕا و ، دەربارەی ئەم دوو ڕووە ، ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی : ﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلاَ تَفْتِنِّي أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴾ آية (٤٩) سورة التوبة.

واتە : ( لەو دووڕووە بیّ چاوو ڕوانە ) کەسانێکن کە دەڵێن : مۆڵەتم بدە و توشی گوناه و سەرپێچیم مەکە !! لە حاڵێکدا ئەو جۆرە کەسانە باچاك بزانن کە لە گوناه و تاواندا ڕۆچوون ، بێگومان دۆزەخیش گەمارۆی بێباوەڕانی داوە ( ڕزگار بوونیان ئەستەمە ) .

هەروەها لەناو ئەهلی حەق و ڕاستیشدا کەسانێك بە بیّ بەهانە لەم جەنگە دواکەوتن کە ئەوانیش سیّ کەس بوون " کعبی کوڕی مالك و هیلالی کوڕی ئومەیە و مەرارەی کوڕی بیع ) .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سوپاکەی پێشڕەوی کرد تا گەیشتە ( تبوك ) لەوێدا زیاد لە دە ڕۆژ مانەوە چاودێری بیابانەکانی کرد ، کە بینی ڕۆم دیار نەماون ، بۆیە بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە ... لە گەڕانەوەیدا سوپای ( العسرة ) زۆر بەڕێزەوە پێشوازی لێکرا، لە ڕاسیشدا گەورەترین سوپابوو ، بەڕێ بخرێن ، ژمارەیان نزیکەی ۳۰,۰۰۰ سی هەزار کەس دەبوو .

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە هاتە مەدینە ، چووە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی ئەنجامدا و دانیشت بۆ ئەوەی وتار بۆ خەڵکەکە بدات ، لەوێدا دواکەوتوان (المخلفون ) هاتن بۆلای دەستیان بە بیانوو هێنانەوە و سوێند خواردن بۆی ، ژمارەیان هەشتا کەس دەبوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕوکاری دەرەوەی لێ قبوڵ کردن واتە بە ڕووکەش موسڵمان بوون – بەیعەیتی لێوەرگرتن و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن و دڵ و دەروونی دانە دەست خوا کە ئەو پێ ی زانایە .

## " کەعب بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەگات"

ئەوجا ( كعب کوڕی مالك ) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەلامی کرد پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بزە گرتی ، بزەی کەسێکی توڕە ، پاشان فەرمووی : ( تعال ) وەرە ، کعب دەڵێت : هاتم تا لە نێو دەستی دا دانیشتم .. فەرمووی : ( ما خلّفك ؟ ألم تكون قد ابتعت ظهرك ؟ )

واتە : بۆچی لە سوپاکە دواکەوتی مەگەر وڵاخت نەکڕی بوو بۆ شەڕ ؟ وتم : بەڵێ وایە ، بەخودا ئەگەر لەگەڵ یەکێکی دونیا ویستدا دانیشتمایە هەوڵم دەدا بیانوویەك بۆ خۆم دروست بکەم تاڕازیی بکەم ، وە من توانای ئەوەشم هەیە – واتە لە قسە کردندا پەکم ناکەوێت – بەڵام دەزانم کە ئەگەر ئەمڕۆ درۆت لەگەڵدا بکەم تۆی پێ ی ڕازیکەم ، ئەوا دوور نیە خودا ڕقی من لە دڵی تۆدا جێگیر بکات ، لەبەر ئەوە ڕاستیەکەی من هیچ بیانویەکم بۆ دواکەوتنم لەشەڕ نەبوو ، سوێند بەخوا هەرگیز وەك ئێستا دارا و بەتوانا نەبووم و بۆ شەڕ شیاو بم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵتدا دەرنەچووم بۆ جەنگ اپێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( أما هذا فقد صدق ، فقم حتى يقضي الله فيك ) .

واتە : ئەمەیان ڕاستی وت ، هەڵسە تابزانین خوای گەورە چی بڕیارێکت لەسەر دەدات ..

ئەوجا پیاوانێك لە ( بەنی سەلەمە ) دوام کەوتن و سەرزەنیشیان دەکردم ، دەیانوت : سوێند بەخوا پێشتر نەماندیبوو تۆ گوناه ئەنجام بدەیت ... ئەی بۆچی هەر نەیشتتوانی وەك ئەوانی تر بیانو یەك بهێنیتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بەڕاستی داوای لێخۆش بوونی ئەو بۆت بەس بوو .

فەرمووی : سوێند بەخوا بەردەوام سەرزەنشتیان دەکردم ، تاوام لێهات خەریك بوو بگەڕێمە و خۆم بەدرۆ بخەمەوە - پاشان وتم : ئایا کەسی تریش هەیە وەك منی بەسەر هاتبێ ؟ وتیان : بەڵێ دوو پیاوی تریش هەن ، وەك ئەوەی تۆیان بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) عەرز کرد ، ئەویش چی بە تۆ فەرموو بە وانیش هەروای فەرموو ، پرسیم : کێن ؟

وتیان : ( مرارەی کوڕی ربیع ی عامری ) و ( هلالی کوڕی امیەی واقفی ) و وتیان کە ئەمانە بەڕاستی دوو پیاو چاکن و لە ( بەدر )یشدا بەشدار بوون ، و نموونەیین . منیش دوای ئەوەی باسی ئەو دوانەیان بۆ کردم بەڕێی خۆمدا چووم.

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەهی لە موسڵمانان کردبوو کە قسەمان لەگەڵدا بکەن - هەرسێکمان - و لەناو هەموو دواکەوتوانی ( تبوك ) دا تەنها ئێم سیانەمان ئەو بڕیارەمان لەسەر درابوو ، ئیتر خەڵکی خۆیان لێ دوور ئەخستینەوە و لە ئاستماندا گۆڕابوون ، هەتا سەرزەویش لەلامان گۆڕا بوو ، ئەو زەوی یەی ئەوسا نەبوو کە بەسەریدا ڕێم ئەکرد بەو شێوەیە پەنجا شەومامەوە ، بەڵام دوو هاوڕێکەی ترم لەماڵەکانیاندا مانەوە و دەگریان ، بەڵام من لەوان لاوتر و بەتواناتر بووم ، دەچووم لەگەڵ موسڵماناندا نوێژم دەکرد و لەبازاڕەکاندا هات و چۆم دەکرد ، لە کاتێکدا یەك کەس لەگەڵم نەدەدوا و وە دەهاتم بۆ مزگەوت و دوای نوێژ دەچووم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و سەلامم لێ دەکرد ، و بەخۆم دەوت : ئاخۆ لێوی جوڵاند بۆ وەڵام دانەوەی سەلامەکەم یان نا ؟ ئەوجا لە نزیکیەوە نوێژم ئەکرد و زوو زوو چاوم تێ ئەبڕی ، کاتێ نوێژەکەم دائەبەست لێمی دەڕوانی و کاتێ ڕووم تێ ئەکرد ڕووی لێم وەردەگێڕا .

سارد و سڕی موسڵمانان لەگەڵما درێژەی کێشا و چووم تا بەسەر دیوارێکی - دیواری باخی ئەبی قەتادەدا سەرکەوتم - کە کوڕە مامم بوو ، خۆشەوسترینی قەومەکەم بوو لەلام ، سەلامم لێ کرد ، سوێند بەخوا وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە !

وتم : ئەی ابو قتادە ... سوێندت ئەدەم بەخوا ، ئازانی من چەندە خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێ ؟ بێ دەنگ بوو ، هیچی نەوت ، دووبارە پێم وتەوە ، هەر بێ

دەنگ بوو ، بۆ سێ هەم جار وتم سوێندت ئەدەم بە خودا وەڵامم بدەرەوە وتی : خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن !

منیش فرمێسك لە چاوەکانم هاتە خوار بەناڕەحەت توانیم بچمە سەر دیوارەکەوە ، جارێکیان لە بازاڕادا دەسوڕامەوە لە ( مەدینە ) کابرایەکی ( نبطی ) لە ( نبطی ) یەکانی شام ، ئەوانەی خواردنیان ئەهێنا و لە مەدینە ئەیانفرۆشت ، گوێم لێ بوو ، هەواڵی منی ئەپرسی و ئەیوت : ( کێ کعب ی کوڕێ مالك م نیشان ئەدات ؟ ئەوانیش ئاماژەیان بۆ من دەکرد ، کابرا هاتە لام و نووسراوێکی لەلایەن پادشای غسان ەوە پێدام، تیایدا هاتبوو :

( لە پاشان ... پێم ڕاگەیەنرا وەکە هاوەڵەکەت پشتی لێ کردویت و ساردی بەرامبەرت ئەنوێنێ ، وە تۆیش خوادایئە ناوی تا لەم وڵاتە دا بەسوك سەیرت کەن و تیاچیت ، ئێمەش ماڤ ئەوەت بەسەرمانەوەیە کە دڵنەواییت بکەین .. ) منیش دوای ئەوەی لە خوێندنەوە بوومەوە وتم : ئەمەیش بەڵایەکی ترە ، فڕێم دایە ناو تەنوور و سوتاندم .

ئەو جا کە چل ڕۆژ لە ( ٥٠ ) ڕۆژەکە تێپەڕی ، پەیامنێری پێغەمبەری خوا(ﷺ ) هات بۆلام وتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کردوویت لە خێزانەکەت جیئەبوتەوە ، پرسیم : تەڵاقی بدەم یان چی ؟

وتی : نەخێر ، بەڵام خۆتی لێ بە دووربگرە و لێی نزیك مەبەوە ، و هەمان شتیشی بە دوو هاوەڵەکەم گەیاند بوو کە پێ ی هەڵسن .

منیش بە خێزانەکەمم وت : بچۆرەوە ماڵی باوانت و لەوێ بمێنەرەوە تا خوا فەرمانی خۆی لەم بارەیەوە نیشانئەدات .

ئەوجا خێزانەکەی هلال کوڕی امیە هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .. هلال پیاوێکی بە ساڵاچووە و خزمەتکاریشی نیە ، ئایا ڕازیت خزمەتێکی بکەم ؟

فەرمووی : ( لا ، ولکن لایقربك ) نەخێر ، بەڵام لێت نزیك نەبێتەوە . وتی : سوێند بەخوا هلال هیچ شتێکی بەلاوە بە گرنگ نەماوە و لەو کاتەوە بەردەوام دەگری تا ئەمڕۆ .

کعب ، دەڵێت : هەندێ لە خزمەکانم پێیان وتم بۆچی تۆش ناچیت مۆڵەتی ئەوە لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەرگریت کە خێزانەکەت لەلات بمێنێتەوە وەك چۆن مۆڵەتی خێزانەکەی ( هلال )ی دا خزمەتی بکات ؟ وتم : سوێند بەخوا داوای شتی وا لە

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناکەم ، من چوزانم ئەگەر داوای لیٚ بکەم چیم وەلام ئەداتەوە ؟ لە کاتێکدا من پیاوێکی گەنجم ؟

ئەوجا دوای ئەوە دەشەوی ترم بەڕیٚ کرد ، هەتا پەنجا شەوی تەواومان تێپەڕاند لەوکاتەوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێگری کرد بوو لە دوواندنمان .

ئەوە بوو لە بەیانی شەوی پەنجا هەمین دا نوێژی بەیانیم لەسەر سەکۆی ماڵێك لە ماڵەکانمان ئەنجام دا ، و بەو حاڵەی خۆم کە خوای پەروەردگار باسی کرد لە قورئانەکەیدا دانیشتبووم ، خۆم لە خۆم بێزار بووم . زەوی بەو فراوانی یە لەلام بەرتەسك بوو بوویەوە ، گوێم لە دەنگێکی بەرز بوو هاواری کرد ( یان بەسەر کێوێکەوە هاواری کرد ) وتی : ئەی کعبی کوڕی مالك ، موژدەت لیٚ بێت !

منیش لە جێی خۆم کڕنوشی سوپاسم بۆ پەروەردگارم برد و زانیم کە ڕزگاریم لەلایەن خوداوە هاتووە .

ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتیٚ نوێژی بەیانی بۆ موسڵمانان کرد ، ڕایگەیاند بەخەڵکەکە ، کەوا پەروەردگار تەوبەکەی لیٚ قبولٚ کردوین و لێمان خۆش بووە، خەڵکیش دەستیان کرد بە موژدە پێدانی من و دوو هاوەڵەکەم .. ئەوجا پیاوێك بەسەر ئەسپەکەیەوە وەك تیر بۆی دەرچوو خۆی گەیاندە سەر کێوەکە و بە هەموو دەنگی هاواری کرد و موژدەی پیٚ دەداین ..

ئەوجا کە ئەو پیاوەی گوێم لە دەنگی بوو موژدەی پیٚ دەدام ، هاتەلام ، جلەکانی بەری خۆم بە دیاری پیٚ دا ، وە سوێند بەخوا بێجگە لەو جلانەشم نەبوو ، بۆیە پۆشاکێکم خواستوە لەبەرم کرد و بۆی دەرچووم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) !

خەڵکی دەستە دەستە دەهاتە لام و پیرۆز باییان لیٚ ئەکردم ، ئەیانوت : پیرۆز بێت لێخۆش بوونی خودا ..

کعب دەڵێت : ئەوجا گەیشتمە مزگەت ، دەبینم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانیشتووە و خەڵکیش لە دەوروبەریدا ، لەناویاندا ( طلحةی کوڕی عبدالله ) هەڵسایەوە و باوەشی بۆ کردمەوە و پیرۆزبایی لیٚ کردم ، سوێند بەخوا هیچ کام لە کۆچبەران بێجگە لە ( طلحة ) هەڵنەسایەوە بۆلام ، وە من هەرگیز ئەوەی لەبیرناکەم ، ئەوجا کە سەلامم کرد لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی: – ڕووی لە خۆشیدا دەدرەوشایەوە– (أبشر بخير يوم مـ ـر عليك منذ ولدتك امك ) .

واتە : موژدەی باشترین ڕۆژت لێ بێت ( کە ئەمڕۆیە ) و بەسەرتا تێپەڕ دەبێ لەوکاتەوەی لە دایك بووی .

وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەم لێخۆش بوونە لەلایەن تۆوەیە یاخود لەلایەن پەروەردگارەوە ؟

فەرمووی : ( لا .. بل من عندالله ) نەخێر ، بەڵکو لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەگەر دڵخۆش بوایە دەم و چاوی دەگەشایەوە وەك مانگ ڕووناك دەبوو ، ئێمەش دەمانزانی کە خۆشحاڵە.

ئەوجا کە لە پاڵیدا دانیشتم وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەمەوێ ئەوەش بخەمە پاڵ تەوبەکەم کە ماڵ و سامانم هەمووی بکەمە بەخشش لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەکەیدا ، فەرمووی :

( امسك علیك بعض مالك ، فهو خیر لك ) واتە : بەڵکو هەندێ لە ماڵەکەت بهێڵەرەوە بۆ خۆیشت باشترە . وتم : دەی ئەوا من ئەو بەشەم کەلە ( خەیبەر ) وەرم گرت دەهێڵمەوە ، پاشان وتم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، خوای گەورە بە هۆی ڕاستبێژیمەوە ڕزگاری کردم .

لەبەر ئەوە ئەوەش دەخەمە پاڵ تەوبەکەم کە هەتا بمێنم ڕاست بڵێم ، سوێند بەخوا لەوکاتەوە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باس کردووە ، نەمبیستووە هیچ کام لە موسڵمانان بەڕاستبێژی تاقی کرنەبوتەوە – هەتا ئەمڕۆ وێنەی من ، و سوێند بەخوا هەتا ئەمڕۆ درۆم لە زارنەهاتۆتە دەرەوە ، و تکاشم وایە کە پەروەردگار تا کۆتایی تەمەنم بمپارێزێت لە درۆ ، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند بۆ پێغەمبەرەکەی : ﴿لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ(١١٧) وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لاَ مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ(١١٨)يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ(١١٩) ﴾ سورة التوبة .

واتە : سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کۆچبەران و پشتیوانان ، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لەکاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا ، دوای ئەوەی کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت ، لەوەو دوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد ، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا ، هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە لە ( غەزای تبوك

دا ) دواخران دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بووەوە ، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە ، جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە ، پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن ، تا تەوبەبکەن ، بەڕاستی هەر خوا تەوبە وەرگر و میهرەبانە ، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزگاربن ، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن .

سوێند بەخوا لە دوای ئەوەی خوا ڕێنمایی کردووم بۆ ئیسلام هیچ بەخششێکی بەسەردا نەداوم گەورەتر بێ لەلام لەوەی کە ئەو ڕۆژە ڕاستم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وت و درۆم نەکرد تا دواتر منیش تیابچم وەك چۆن ئەوانەی درۆیان کرد تیاچوون ، ئەوەتا خوای گەورە بە خراپترین شێوە باسیان دەکات و دەفەرموێ : ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ(٩٥)يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَرْضَى عَنْ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ (٩٦) ﴾ سورة التوبة .

واتە : کە ئێوە گەڕانەوە ( لە غەزا ) بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا بۆ ئەوەی وازیان لێ بهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن ، جا ئێوەش وازیان لێ بێنن و پشتیان تێ بکەن ، چونکە بەڕاستی ئەوانە ( دڵ و دەروون ) پیسن و جێگەیان دۆزەخە لە پاداشتی ئەو کارە و کردەوانەی دەیانکرد ، هەر سوێندتان بۆ دەخۆن تا لێیان ڕازی بن و چاوپۆشیان لێ بکەن ، خۆ ئەگەر ئێوە ڕازی بن لێیان ، ئەوە خوا لە کەسانی لە دین دەرچوو خۆش نەبوت .

کعب دەڵێت :

کاری ئێمە دواخرا – ئەو سیانەمان – لەوانەی کە دوای ئەوەی سوێندیان خواردو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لێی وەرگرتن و بەیعەتی دانێ و داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن و، پرسی ئێمەی دواخست تا ئەوکاتەی خوای گەورە خۆی دەربارەمان پرسەکەی یەکلا کردەوە و فەرمووی :

﴿ وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا .... ﴾ سورة التوبة ، آية (١١٨) .

واتە: هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە دواخران ...

ئەوەی خوای پەروەردگار باسی دەکات کە دەفەرموێ : ( خلفوا ) واتە : دواخران، باسی ئەوە نیە کە ئێمە لە غەزا دوا کەوتین ، بەڵکو باسی ئەوەیە کە پرسەکەی ئێمەی

دواخست و لەوانە جیای کردینەوە کە سوێندیان خوارد و لێیان وەرگیرا [1]. ( لە دنیادا لێیان وەرگیرا – وەرگێڕ )

کعب ( رضي الله عنه ) سالّی ( ٤٠ )کۆچی وەفاتی کرد ، وتراویشە سالّی ( ٥١ )کۆچی وەفاتی کردووە ڕەزای خوای لەسەر بێت .

[1] – فەرموودەی صحیح : بوخاری ( ٨ / ٩٢ – ١٠٠ ) و مسلم ( ٨ / ١٠٦ – ١١٢ ) ..

## " ٦٩ – نعمانی کوڕی مُقرن ( رضي الله عنه ) "

## " بەڕاستی ماڵەکەی بنی مقرن لە ماڵەکانی ئیمانە "

کیّ یە ؟ ناوی نعمانی کوڕی عەمری کوڕی مقرن ی کوڕی عائذ .. ئەبو عەمری (المزني) پێشەوا ، یەکەمین غوزا بەشداری کردبێت ( احزاب ) بوو ، هەروەها لە بەیعەتی (الرضوان) دا ئامادە بووە ، لە ( کوفە ) نیشتەجیّ بوو و پێشەوا عمر(رضي الله عنه) کردویەتی بەو الی ( کسکر ) پاشان لایبردووە و بەسەر سوپای موسڵمانانەوە ناردوویەتی بۆ جەنگی (نەهاوەند) و لەویّ بووەتە یەکەمین شەهیدی جەنگەکە ..ئەمە و ( نعمان ) خۆی و براکانی و هۆزەکەشی[1] راستگۆی و دڵسۆزی خۆیان نیشانداوە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ( ﷺ) لە چەند هەڵوێستێکیدا کە جێگای سەرنجن و ئەو هەڵوێستانە وای لیّ کرد لەناو هاوەڵاندا پێگەیەکی بەرز و پلەوپایەیەکی مەزن و بەڕێزی هەبێت .

( نعمان ) و براکانی و هۆزەکەیشی لە ( مەدینە ) مانەوە و ئەوەیان بە باشتر زانی کە لە تەنیشتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بمێننەوە ، هەروەها نەبووبوونە باربەسەر کەسەوە ، بەڵکو دیدەوانێك بوون لە دیدەوانەکانی سوپای ئیسلام لە تەنیشت کۆچبەران و پشتیواناندا و چەند کەسێك بوون هەزار حسنەبوان بۆ دەکرا ، خۆ ئەگەر بانگبێژ بانگی جەنگی بکردایە ئەوان لە ریزی پێشەوەدا بوون.

### " چەند لاپەڕەیەکی پرشنگ لە جیهادی ( رضي الله عنه ) "

نعمان و ڕۆژی ( ذي القصة ) : – (ذي القصة ) جێگایە کە لە دووری ( ٢٤ ) میل لە مەدینەوە ، و لەسەر رێگای ( نجد )ە ، لەوێدا هۆزەکانی ( اسد ) و (غطفان) و غەیری ئەوانیش – وەك باسمان کرد – بەسەرکردایەتی ( جبال[2] بن سلمه بن خویلد ) ی برازای ( طلحة ) کۆبوونەوە بە مەبەستی دان بەسەر مەدینەدا .

---

[1] – هۆزی ( مزنیە ) ، هۆزەکەی نعمان بەخۆشییەوە لەسەرەتاکانی ساڵی حەوتی کۆچیدا هاتن بۆ مەدینە وە ئیسلام بوونی خۆیان ئاشکرا کرد . ئەوکاتەی موسڵمانان سەرقاڵی ئابڵوقەی ( خیبر ) بوون .

[2] – هەروەها بە ( حبال )یش هاتووە .

پێش ئەوەی بەوکارە هەڵسن ، شاندێکیان ناردە مەدینە و چوونە لای گەورە پیاوانی مەدینە بۆ ئەوەی داوایان لێبکەن بچنە لای پێشەوا ( ئەبو بکری صدیق ) ( ﷺ ) و داوای ئەوەی لێ بکەن کە ڕازی بێت لەسەر ئەوەی ئەمان نوێژەکانیان ئەنجام بدەن ، بەڵام زەکات نەدەن . وەڵامی ( ئەبو بکر )یش ( ﷺ ) ئەمە بوو : ( سوێند بەخوا ئەگەر ڕێشوی وڵاخێکیان دئەبوتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ) و ئێستا بەمنی نەدەن – کۆی کەمەوە وەك زەکات – ئەوا لەسەری خەباتیان لە دژ ئەنجام ئەدەم و ئەگەر تەنها خۆیشم بم ) .

ئەو جا شاندەکە گەڕانەوە لای هۆزەکانیان کە لە (ذي القصة ) گیرسا بوونەوە و وەڵامەکەیان پێ ڕاگەیاندن ، هەروەها ئەوەشیان پێ وت کە موسڵمانان ژمارەیان کەمە لە مەدینە وتەماعیان خستە بەردەمیان .

پێشەوا ابوبەکر ( ﷺ ) شەڕ و خراپەی لە ناوچاوی شاندەکەدا بەدی کرد بۆیە خۆی بۆ ناپاکی یان ئامادەکرد ، خەڵکی لە مزگەوت کۆکردەوە و پاش ستایشی پەروەردگار وتارێکی بۆدان تیایدا فەرمووی : ( لە ڕاستیدا ئەوانە ئێوەیان بەکەم بینیوە ، و ئێوەش نازان بەشەودا دەدەن بەسەرتاندا یان بە ڕۆژدا ، ئەوان ئامانجی ئەوەیان هەبوو کە ئەوەی ئەوان داوای ئەکەن قبوڵی بکەین و لەگەڵیان پێك بێین ، ئێمەش بەوەڕازی نەبووین و ئەو پەیمانەمان لەگەڵیاندا نەویست لەبەر ئەوە خۆتانیان بۆ ئامادە بکەن ) .هەروەهایش بوو ، تەنها سێ شەو تێپەڕی بوو هەڵگەڕاوان هێرشیان هێنا و ...

چاودێران خێرا خۆیان گەیاندە ( ئەبو بەکر ) و ئاگاداریان کردەوە ، ئەویش فەرمووی کە لە جێگای خۆیاندا بمێنن ، خۆیشی لەگەڵ چەند کەسێکدا بەسەر چەند حوشترێکی بەساڵاچووەوە بەرەو ڕووی دوژمن ڕۆیشتن تا ڕووبەڕوویان بوونەوە ئەوجا بەرەو ( ذی حسا ) پاشەو پاش گەڕانەوە بۆلای سەربازگەی سوپاکە.

هەڵگەڕاوەکان فێڵێکیان بەکار هێنا ، ئەوە بوو چەند پارچە پێستەیەکیان بەستەوە بە چەند پەتێکەوە و فڕێیان دا بەسەر دەم و چاوی حوشترەکاندا ، ئەوانیش لێی هەڵهاتن و بەخۆیان و هەرکەس بەسەرپشتیانەوە بو پێچیان کردەوە و هەرچی موسڵمانانیشە نەیانتوانی بیانهێننەوە سەرخۆ و هێوریان کەنەوە تا گەیشتنەوە مەدینە، بەڵام توشی هیچ زیانێك نەهاتن .. هەرچی هەڵگەڕاوەکانیشە وایانزانی موسڵمانان لاوازی ڕووی تێ کردون ، بۆیە خۆیان ئامادە کردەوە بۆ هێرشێکی گشتی ، بەڵام (ابوبەکر ) ( ﷺ ) ئەوشەوە لە خۆئامادە کردندا بوو ، بەخەریك بوون بە خۆچەك کردن و ئامادەباشی مایەوە .. پاشان بەڕێ کەوت و ( نعمان ی کوڕی مقرن ) ی بەسەر دەستە ڕاستی سوپا و

( عبدالله ی کوڕی مقرن ) یش بەسەر دەستە چەپی سوپاوە داناو هەرچی پاشینەی سوپایشە ( مؤخرة ) ئەوە ( سویدی کوڕی مقرن ) ی بەسەرەوە دانا .. !

لەگەڵ هەڵاتنی ڕۆژدا موسڵمانان و دوژمنان لەمەیدانێکدا بوون ، ئەوە بوو شەڕێکی گەرم ڕوویدا لە نێوانیاندا و تیایدا کوڕانی ماڵێ ( مقرن ) وێنەی کێو بە جێگیری مانەوە ، و چەندین هونەریان بەکار هێنا لە ئازایەتی و شەڕ کردندا و لە پێشەنگدا بون ، هێشتا خۆر گەرم نەبوو بوو دوژمنان کشانەوە و رایان کرد و ( جبال ی کوڕێ سلمە )ی سەر کردەیان کوژرا و ئەبو بەکر ( ﷺ ) و موسڵمانان شوێنیان کەوتن تا (ذي القصة ) ... پاشان ئەبوبەکر ( ﷺ ) گەڕایەوە بۆ مەدینە [1]، ئەمەش یەکەمین جەنگی ڕزگاری بوو لە دژی هەڵگەڕاوەکان بەگشتی لە هەرجێیەك بوون[2] .

## " نعمان لە ڕۆژی ( تستر ) دا "

( یەزدەجرد )[3] بەردەوام ئەهلی فارسی هان دەدا ، تا پارێزەران و پاڵەوانانی ئەهلی فارس و ئەهلی ئەهوازی خستە بزوتن و پەیمانیان بەیەکتر دا و ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی پشتی یەکتر بەر نەدەن ، بڕیاریاندا کە بەردەوام بن لەبەدوادا چوونی شەڕ — پاش ئەوەی لە چەند جەنگێکدا لەسەر دەستی موسڵمانان شکستیان هێنا — و بۆ ئەمە هەموو چوونە ژێریەك ئالا ..

ئەوە بوو کە پێشەوا ( عمری کوڕی خەتاب ) ( ﷺ ) بەوەی زانی ، پەیامێکی نارد بۆ ( سعدی کوڕی ئەبو وەقاص )ی ئەمیری کوفە کە سوپایەکی بەتوانا بە سەرکردایەتی (نعمانی کوڕی مقرن ) بەرەو ئەهواز بنێرێت ..

ئەوجا ( نعمان ) لەگەڵ ئەهلی کوفەدا بەناو گوندەکاندا ڕێگەی کرد تا ( دجلە )ی بڕی و بەو وشکانیدا ڕۆیشت بەرەو ( ئەهواز ) ... و پاشان بەرەو ( هرمزان ) ڕۆیشت کە لە ( رامهرمز ) نیشتەجێ بوو بوو .

---

[1] — دوای ئەوە ( ابوبکر ) ( ﷺ ) خالدی کوڕی وەلیدی نارد تا لەگەڵ موسڵماناندا بەردەوام بن لەسەر ڕێ .

[2] — النعمان بن مقرن . مامۆستا / محمد علی قطب ( ٩ — ١٢ ) بە دەستکارییەوە .

[3] — پادشای فارس .

هرمــزان بــەوە ئاگــادار کــراوە کــە (نعمــان ) بــەرەوە ڕووی دێــت و ویــستی دەستپێشخەری بکات بە ئومێدی ئەوەی بەسەریدا زاڵ بێ بەتەمای سەرکەوتن بۆ ئەهلی فارس کە لە هەموو جێیەکەوە هاتوون و کۆبوونەتەوە لە ( تستر ) .

ئەوجا لە ( ئەربك ) کە شارێکە لە ئەهواز بە یەك گەیشتن و شەڕێکی توند لە نێوانیانـدا ڕووی داو پاشـان خـوای گـەورە ( هرمـزان )ی سـەر شـۆڕ کـرد و خـۆی و سەربازانی پاشەکشە پێ کردو بەرەو (تستر ) هەڵهاتن . ( نعمـان )یش دەستی بەسەر (رامهرمـز ) داگرت و لـەوێ مایـەوە و خـەریکی ڕێکخـستنەوەی ڕێزەکـانی سـوپا بـوو ، چاوەڕێی فەرمانی دەکرد .

ئـەوجا ئـەهلی بەصـرە بەسـەرکردایەتی ( ئـەبو رهـم ی کـوڕێ سـبرە ) هـەواڵی سەرکەوتنەکانی ( نعمان ) یان پێ گەیشت لەگەڵ هەڵاتنی ( هرمزان ) بۆ ( تستر ) ، بۆیە بەرەو ( تستر ) کەوتنـەڕێ و بۆ ئەوەش پەیامێکیان نارد بۆ پێشەوا ( عمـر ) ی ئەمیری موسڵمان ، ئەویش بەسەر چەند هێزێکی تازەوە ( ئـەبو موسای ئەشعەری ) بۆ ناردن بـۆ هاوکاری کردنیان .

لەوێ لە ( تستر ) سوپاکانی موسڵمانان بەیەك گەیشتن و گەمارۆی ( تستر ) یان دا کە (هرمزان )ی لـێ بوو ، و گەمارۆ کە چەند مانگێك درێژەی کێشا و هەردوو لە کۆتاییدا هێرشیان بۆ یەکتر هێنا و دوای شەڕێکی توند[1] ، سەرکەوتن بۆ موسڵمانان بوو ، (هرمـزان )یشیان دیل کرد ، سوپاس بۆ خودا[2]..

## " نعمان ، ڕۆژی نهاوەند "

عومەری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) پەیامێکی بۆ ( نعمانی کوڕی مقرن ) نارد : –

" بـەناوی خـوای بەخـشندەی میهرەبـان ، لەبەنـدەی خـودا ( عمـر ) ی ئـەمیری ئیماندارانەوە بۆ ، ( نعمان )ی کوڕی مقرن ، سەلامی خوات لـێ بێـت ، سوپاسـی خودای پەروەردگارت لەسەر دەکەم کە هیچ خودایەك نیە جگە لە زاتی ئەو ، لە پاشان : –

پێم گەیشتووە کە خەڵکێکی زۆر لە عەجەم لە شاری (نهاوند) بۆتان کۆبوونەتـەوە، لەبەر ئەوە هەر کە ئەم پەیامەی منت بە دەست گەیشت ، بە فەرمانی خودا و بەپشت

---

[1] – نعمان ئیبنو مقرن : مامۆستا / محمد علی قطب ( ٢٦ – ٢٩ ) بە دەستکاری یەوە .

[2] – پاشان هێنایانەوە بۆ مەدینە و موسڵمان بوو .

بەستن بە هاوکاری و سەرکەوتنی خودا ، لەگەڵ موسڵمانان‌دا بەڕێ کەوە ، بەڵام لە جێگای بەردەڵان و سەختدا مەیانبەنە با ئازاریان نەدەی و هەروەها مافی خۆیان لێ زەوت مەکە نەبا کافرو بێ باوەڕ یان بکەیت و مەیانبەرە ناو نسارەوە ، چونکە بەڕاستی پیاوێك لە موسڵمانان لەلام خۆشەویسترە لە سەد هەزار دینار ، والسلام) .

پاشان پەیامێکی نارد بۆ خەڵکی کوفە کە خۆیان بگەیەننە ( نعمان ) بە سەرکردایەتی ( حزەیفەی کوڕی یمان ) و هەروەها بۆ ( ئەبو موسای ئەشعەری )یش پەیامی نارد کە ئەهلی بەصرە لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆلای نعمان ، وە خۆشی خەڵکانێکی لە ئەهلی مەدینەوە نارد لەناویاندا ( عبدالله ی کوڕی عمر ) بوو ؟

پاشان نووسی بۆ ( نعمان ) : - ئەگەر شتێکیشت بەسەر هات ئەوا ( حذیفة ی کوڕی یمان ) دەبێتە سەرکردەی سوپا و ئەگەر ئەویش شتێکی بەسەر هات ئەوە ( نعیم ی کوڕی مقرن ) جێگەی دەگرێتەوە .

## " شەهادەت لە پێناوی خودا "

سوپای موسڵمانان بەرەو ( نهاوند ) کەوتەڕێ ، خوادا فارسەکان لە چەندین قەڵای سەخت و قایم دا خۆیان هێشتەوە ، بۆیە لە دوورەوە چەند پێکدادانێك لە نێوانیاندا ڕووی دا ، موسڵمانان وای بۆ چوون کە درێژە کێشانی ماوەی گەمارۆدان زەرەرو زیانی خۆی هەیە ، بۆیە لە خێوەتەکەی ( نعمان ) دا کۆبوونەوە ، طلیحە کوڕی خویلید فەرمووی : من وای بۆ دەچم چەند ئەسپسوارێك بنێرێت بۆ شەڕ و دواتر بکێشنەوە و لە دوژمن هەڵبێن بۆ لە خشتە بردنیان[1] . بە درێژایی شەڕکردنمان لە گەڵیاندا ئەو نەخشەیەمان بە کار نەهێناوە ، لەبەر ئەوە ئەگەر شتێکی وامان لێ ببینن تەماع ئەیانگرێت و دێنەدەرەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵماندا و ئێمەش بە ویستی خوا سەرکەوتن بە دەست دێنین . ئەوەبوو ( نعمان ) و باقی سەرکردەکانی تری سوپارای (طلیحە) یان بە باش زانی و لەسەر وردەکاریەکانی نەخشەکە ڕێك کەوتن ، و کات لە بەرەبەیان نزیك بوو بوویەوە . ( نعمان ) یەکێ لەسەرکردە سوار فەزڵو گەورەیی بەناوی ( قعقاع ی کوڕی عمری تمیمی )[2] بەسەر دەستە سوارەکانەوە نارد تاوەکو لە دەرگاکانی قەڵاکانیان دا ، و

---

[1] - ئەم نەخشەی شەرکردن بوو لەلای عەرەبان .

[2] - پێشەوا عمری کوڕی خطاب ( ﷺ ) دەربارەی فەرموویەتی : هەر سوپایەك ( قعقاع )ی تێ بێت شکست ناهێنێ .

سوارچاکەکانیان بۆیان هاتنە دەرەوە و شەڕ لە نێوانیاندا ڕووی دا . پاشان ( قعقاع ) لە پێش چاویاندا بە خۆی و ئەوانەش کە لە گەڵیدا بوون پاشەکشەی کرد ، بۆیە (عەجەمەکان ) گومانی ئەوەیان برد کە عەرەبەکان بە هۆی لاوازی یانەوە پاشەکشە یان کردووە . لەبەر ئەوە شوێنیان کەوتن و بەدوایاندا ڕۆیشتن ئەمەش باقی ئەو شەڕ کەر و سوارچاکانەی هاندا کە هێشتا لەناو چاڵ و قەڵاکانیاندا مابوونەوە و هاتنە دەرەوە و شوێن ( قعقاع ) و هاوڕێکانی کەوتن هەرچی موسڵمانانیشە لە ئامادە باشی تەواوەتیدا بوون و نعمان فەرمانی پێ کرد بوون کە لە جێگای خۆیاندا بمێننەوە و خۆیان نەگلێنە شەڕەوە تا مۆڵەتیان دەدات . ئەوە بوو سوارچاکەکان بەرەو ڕوویان هاتن و تیربارانیان دەکردن ، نعمانیش چاوەڕێ بوو تا هەموو سوارچاکەکانیان لەناو قەڵاکاندا هاتنە دەرەوە ، پاشان سواری ئەسپەکەی بوو ، بە نێوان ڕیزەکانی سوپادا ڕۆیشت و ڕێ و شوێنی بۆ دا ئەنان و هانی دەدان لەسەر ئارامگرتن و خەبات کردن ، پاشان فەرمووی : " سێ جار تەکبیر دەکەم ( الله اكبر ) ، لە تەکبیری یەکەمدا ئەوەی خۆی ئامادە نەکردووە با خۆی ئامادەکات ، لە تەکبیری دووەمدا با چەکەکەی توندکات و ئامادە بێت بۆ هەڵسان ، و لەتەکبیری سێهەمدا من دەڕۆم ( بە ویستی خوا ) و ئێوەش بە دوامدا هێرش بەرن ... " پاشان ( نعمان ) دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و پاڕایەوە و فەرمووی :

" ئەی پەروەردگار شەهادەت بکە بەبەشی ( نعمان ) و ڕزگاری بەڕووی موسڵماناندا بکەرەوە " ئەوانیش )( آمین ) یان وتو سێ جار ئاڵاکەی ڕاوەشاند و پاشان بەسوپاکەیەوە هێرشی بۆ هێنان .

بەو جۆرە ( نعمان ) دوژمنیانی ڕاپێچ ی دەرەوەی قەڵاکانیان کرد و شەڕێکی توند لە نێوانیاندا ڕووی دا و خودای پەروەردگار دوعاکەی نعمانی قبوڵ کرد و بووە یەکەمین شەهیدی جەنگەکە ، ئەوە بوو ئەسپەکەی ( نعمان ) لەناو خوێندا هەڵخلیسکا و نعمانیش لەسەری کەوت بە مردوویی .

خێرا ( نعیم )ی برای بەجلەکانی داپۆشی و ئاڵاکەی هەڵگرت و دایە دەست (حذیفة ی کوڕی یمان ) . ( نعیم ) هەواڵی شەهید بوونی براکەی لەسەر بازەکان شاردەوە لەبەر ئەوەی مەعنەویاتیان دانەبەزێت ، و پاشان موسڵمانان بەردەوام بوون لەسەر شەڕ کردن بە پێی پلانەکە . کە شەو داهات هێزەکانی فارس تووشی شکست هاتبوون ، و موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە دەریان پەڕاندن[1] .

---

[1] – زۆربەی بابەتی ئەم باسە لە کتێبی ( نعمانی کوڕ مقرن ) ی مامۆستا محمد علی قطب وەرگرتووە .

معقل ی کوڕی یسار دەڵێت : ( هاتم بۆلای ( نعمان ) هێشتا گیانی تیامابوو ، برینێك ئاوم هێنا و دەم و چاویم پێ شۆرد لە تەپ و تۆز .. پرسی : کێیت ؟ وتم : معقل . پرسی: چی ڕووی دا ( خەڵکەکە بە چی گەیشتن ؟ ) وتم : سەرکەوتنی خوایی . ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ خوا . ئەو موژدەیە بنووسن و بینێرن بۆ پێشەوا ( عمر رضي الله عنه ) و پاشان گیانی سپارد ( رضي الله عنه )[1] .

## " عمری کوڕی خطئةبوش بۆی دەگری "

لە ( ئەبو عوسمان )ەوە ، دەڵێت : هاتم بۆلای عمر و هەواڵی شەهادەتی ( نعمانی کوڕی مقرن )م پێ گەیاند ، دەستی خستە سەردەم و چاوی و دەستی بەگریان کرد[2] . حافظ ابن کثیر ، دەڵێت : نعمان ( رضي الله عنه ) یەکێکە لەوانەی خوای گەورە لە هەقیاندا دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ ...﴾ سورة التوبة ، آية (١١١)[3] . واتە : بەڕاستی خواگیان وماڵی لە ئیمانداران کڕیوە کە بەهەشت بۆ ئەوانە و بەشیانە ...

---

[1] - سەنەدەکی ( صحیح )ە / حاکم ریوایەتی کردوە ( ٣ / ٢٩٣ ) .
[2] - بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ١ / ٤٠٤ ) .
[3] - البدایە ( ٥ / ١٩٨ ) .

# " ٧٠ – سەعدی کوڕی ربیع ( رضي الله عنه ) "

## " سەرکردەی شەهید "

پێناسی :

سەعدی کوڕی ربیع ی کوڕی عەمری کوڕی ئەبو زهیر ، ی ئەنصاری خەزرەجی بەدری، ( نقیب )ی شەهیدە ، یەکێکە لە بەرێزانی شەوی ( عەقەبە ) و ڕۆژی ئوحود شەهید بووە .

## " فەزڵو گەورەیی "

لە ( ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی ربیع ) ەوە ، هات بۆلای ئەبو بکری صدیق (رضي الله عنه) ئەویش پارچە قوماشێکی بۆ داخست تا لەسەری دانیشێت ، ئەوجا عمری کوڕی خەتتابوش ( رضي الله عنه ) هات و پرسی : ئەم ئافرەتە کێ یە ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟

فەرمووی : ئەمە کچی ئەوکەسەیە کە لە من و تۆیش باشترە و تەنها لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باشتر نیە ، پیاوێك کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شەهید بووە و پێگەی لەبەهەشت بۆ ئامادە کراوە و من و تۆ ماوینەتەوە [١].

## " هەڵوێستێکی ( بەرێز ) "

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلاَ يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ ﴾ سورة الحشر ، آية (٩) .

واتە : ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان ، ئەوانەشیان خۆشدەوێ کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسودی و بەخیلیەك

---

[١] – طبرانی ریوایەتی کردوە ، و لەناویدا : اسماعیلی کوڕی قیس ی کوڕی سەعدی زەید ، هەیە کە هیثمی دەڵێت / لاوازە المجمع بە ژمارە ( ١٥٧٠٤ ) .

ئەبوتەوە و حەز بەبەخشینی دەستکەوتەکان دەکەن بۆ کۆچبەران ، فەزڵی ئەوانە دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار و نەداریشن ، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا ، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن ...

( وە جیاوازی ڕالەوە دا نیە کە ئەوانەی ( تبؤالدار ) وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە ، ئەو پشتیوانانەن کە لە مەدینە نیشتەجێ بوون پێش ئەوەی کۆچبەران هیجرەت بکەن بۆلایان )[1] .

لە ( انس ی کوڕی مالك )ەوە ( ﷺ ) ، دەڵێت :

عبدالرحمن کوڕی عوف - لە زەمانی هیجرەتدا - هات بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ سەعدی کوڕی ربیع ی ئەنصاریدا کردنی بەبرا ، سعد مال و ئەهلەکەی خستە بەردەم ( عبدالرحمن ) تا نیوەی بۆ خۆی بەرێت ، (عبدالرحمن )یش ( ﷺ ) وتی : خوا ماڵ و خێزانت لە خۆت پیرۆز کات ، بازارم نیشاندە ، ئەوە بوو لە فرۆشتنی پەنیر و ڕۆن بڕێك قازانجی کرد[2] .

لە ڕیوایەتێکی تردا ، عبدالرحمن کوڕی عوف هاتە مەدینە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ سەعدی کوڕی ربیع ی ئەنصاریدا کردی بەبرا ، سەعد پێی وت : براکەم من لە ناو خەڵکی مەدینە دا لە هەموان دەوڵەمەندترم ، جابڕوانە سامانە کەم کە کردوومە بەدو بەشەوە کام بەشەیانت ویست هەڵیگرە بۆ خۆت !! وە من دوو خێزانم هەیە ، لێیان بڕوانە، کامیانت بە دڵ بوو با بۆتی تەلاق بدەم !! (عبدالرحمن)یش فەرمووی :

خواماڵ و خێزانەکەت لە خۆت پیرۆزکات ، تۆ بازارم نیشاندە تاکۆتایی فەرموودەکە[3]... بڕوانە خوێنەری بەڕێز ، چۆن خۆشەویستی خوای پەروەردگار لە دڵیاندا جێگیر بووە وەهای لێ کردوون ژیانی هەمیشەیی هەڵبژێرن بەسەر ژیانی لەناوچوودا ... ئەمەش تەنها لە سەعددا نەبوو ، بەڵکو هەموو هاوەڵان ئەوە هەڵوێستیان هەبوو ... چەندین نمونەیان لە ڕوناکی باوەڕ و شیرینی ئیخلاص ( دڵسۆزی ) نیشانداوە کە لاپەڕەکانی مێژوی پێ بۆنخۆش کردووە ... تا خەڵکی بزانن کە ئەوە پەروەردەیەکی

---

[1] - بڕوانە / الجامع الاحکام القران ( ١٨ / ٢١ ) .

[2] - تەواوی فەرموودەکەی لەلای بوخاری هەیە لە ( ٦٣ ) کتاب : مناقب الانصار ( ٥٠ ) باب کیف اخی النبی بین اصحابە ( ٣٩٣٧ ) .

[3] - پێشەوا احمد ڕیوایەتی کردووە لە ( المسند ) دا بە ژمارە ( ١٣٨٦٤ ) .

ڕەببانی یە نەک مرۆیی ، هەروەک خوای پەروەردگار بە ( موسا ) ( علیهم السلام ) دەفەرموێ : ( ولتصنع على عيني ) .

١ – لە ئەبو هریرەوە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : –

پیاوێك لە پشتیوانان شەو میوانێکی هات ، ئەویش جگە لە خۆراکی بەشی خۆی و منداڵەکانی ئەو ئێوارەی هیچی تری لانەبوو ، بۆیە بە خێزانەکەی وت : منداڵەکان هەرچۆن بووە بخەوێنە و چراکە بکوژێنەوە و هەرچی هەیە لە میوانەکەمان نزیکی کەرەوە ، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ ... وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ... ﴾[1] سورة الحشر آية ( ٩ ) .

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا ، لە ئەبو هریرەوە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و وتی : کەماندووی برسی یە ، ئەویش ( ﷺ ) وەڵامی نارد بۆ یەکێ لە خێزانەکانی ، ئەویش لە وەڵامدا وتی : سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردووە تەنها ئاوم لەلایە .

پاشان وەڵامی بۆ یەکێکی دیکەیان نارد ، هەمان شتی وت ، هەتا هەموویان هەمان شتیان وت کە تەنها ئاویان لەلایە ، ئەویش ( ﷺ ) فەرمووی : ( کێ ئەم پیاوە ئەمشەو دەکاتە میوانی خۆی ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت ؟ ) پیاوێك لە پشتیوانان هەڵساو وتی : من ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو جا لەگەڵ خۆی بردی و بەخێزانەکەی وت : هیچمان هەیە ؟

وتی : هیچمان نیە جگە لە خۆراکی بەشی منداڵەکان . ئەویش وتی : دەی بەشتێ سەرقاڵیان کە و هەرکە میوانەکەمان هات چراکە بکوژێنەرەوە و وای نیشاندە کە ئێمەش نان دەخۆین ، و هەرکە دەستی برد بۆ خواردنەکە چراکە بکوژێنەرەوە ( تانە مانبینێ کەنان ناخۆین و با ئەو نانی خۆی بخوات ) .

دەڵێت : دانیشتن و میوانەکەنانی خۆی خوارد کە ڕۆژ بوویەوە چووەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پێی فەرموو : ( قد عجب الله – عزوجل – من صنيعكما الليله)[2].

واتە : خوای پەروەردگار زۆر معجبی ئەم کارەی ئەمشەوتان بوو .

---

[1] – صحیح : صحیحی سونەنەکانی تیرمیزی ( ٢٦٣٢ ) مانای ئایەکە :

[2] – صحیح / زانایان هاودەنگن لەسەری خەتابی دەڵێت : ( عجب الله ) لە فەرموودەکە واتە : زۆر لێی ڕازی بوو . فتح ( ٨ / ٦٣٢ ) .

٢ – ابن عمر ، دەڵێت :

مەڕێك پێشكەشی پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كرا ، وتی : فلأن كەسی برام و منداڵەكانی زیاتر لە من پێویستیان بەم مەڕە هەیە و ناردی بۆیان ئەویش هەروانادری بۆ یەكێكی تر هەتا حەوت ماڵی بەڕێ كرد و هاتەوە ماڵی یەكەمجار !!

وەلە ڕیوایەتێكدا كە ( الثعلبي ) لە ( انس )ەوە باسی كردووە ، دەڵێت :

مەڕێك درابەیەكێ لە هاوەڵان كە زۆر برسی بوو ، بەڵام ئەو ناردی بۆ دراوسێكە و دوای ئەویش حەوت دەستی كرد و گەڕایەوە ماڵی خۆی ئەوجا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ ﴾[1] .

٣ – حذیفەی عدوی ، دەڵێت :

ڕۆژی ( یرموك ) لەناو شەهیدەكاندا دەگەڕام بۆ كوڕە مامێكم و برێك ئاوم پێ بوو ، بەخۆم دەوت : ئەگەر هێشتا گیانی تیامئەبوت با تۆزێ ئاوی بدەمێ ، ئەوە بوو بینیمەوە و پێم وت : با تۆزێ ئاوت پێ بدەم بەسەری ئاماژەی كرد : ( بەڵێ ) لەو كاتەدا گوێمان بە دەنگی پیاوێك بوو دەیوت : ئاه ، ئاه و كوڕەمامەكەم ئاماژەی بۆ كردم كە ئاوەكە بدەم بەو ، كە گەیشتمە سەری ، دەبینم ( هشامی كوڕی عاص ) ە وتم : ئاوت پێ بدەم ؟ ئاماژەی كرد كە بەڵێ ، لەو كاتەدا گوێی لە یەكێ تر بوو ، دەیناڵاند ! هشام ئاماژەی كرد كە بچم بۆلای ئەوكەسە ، كە گەیشتمە سەری دەبینم گیانی دەرچووە ، گەڕامەوە لای (هشام ) بینیم ئەویش گیانی سپاردووە ، پاشان گەڕامەوە لای كوڕەمامەكەم سەیر ئەكەم ئەویش وەفاتی كردووە[2] .

## " بۆنی بەهەشت و شەهادەت لە پێناوی خوادا "

ابن اسحاق ، دەڵێت :

لە ( محمدی كوڕی عبدالرحمن ی كوڕی صعصعە )وە ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود فەرمووی : ( من رجل ينظرلي ما فعل سعد بن الربيع ؟ )

واتە : كێ هەڵئەسێ بزانێ سعدی كوڕی ربیع چی لێ بەسەر هاتووە ؟

پیاوێك لە پشتیوانان وتی : من ، چووەدەر و بەناو شەهیدەكاندا گەڕا ، تا (سعد)ی بە بریندار بینیەوە و ئاخرین هەناسەكانی ژیانی دەدا ، وتی : ئەی سەعد !

---

[1] – بڕوانە : تفسیر قرطبی ( ١٨ / ٢٤ ، ٢٥ ) .

[2] – بڕوانە : تفسیر قرطبی ( ١٨ / ٢٧ ) .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کردم بزانم تۆ لە ناو زیندواندا ماویت یان لە ریزی مردواندایت ؟

وتی : لە ریزی مردواندام ، لەبەر ئەوە سەلامم بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بگەیەنە و پێی بڵێ ، سەعد وتی : خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بە باشترین شێوە کە پێغەمبەرانی خۆی پێ پاداشت دەداتەوە ، و هەروەها سەلامی من بگەیەنە بە قەومەکەت و پێیان بڵێ : سەعد دەڵێت : بەڕاستی هیچ بیانوو بە هانەیەکتان لەلای خوا نەبێ ئەگەر بێت و دەستی دوژمنان بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بگات ، هەتا چاوێکتان نەبوت بۆ تروکان (واتە : هەتا کەسێکیان بە زیندوویی مەبوت )[1] .

لە ( خارجەی کوڕێ زەیدی کوڕێ ثابت ) ەوە ، لە باوکیەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی ئوحود ناردمی هەواڵی سەعدی کوڕی ربیع بزانم و پێی فەرمووم : ان رایته ، فأقراه منى السلام ، وقل له : ( يقول لك رسـ ـول الله كيـ ـف تجـ ـدك ؟ ) ... ئەگەر بینیت ، سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵت دەپرسێت ؟ ..

منیش بەناو شەهیدەکاندا گەڕام ، تا دۆزیمەوە هێشتا گیانی تیامابوو ، نزیکەی حەفتا برینی پێوە بوو ، پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) م پێ گەیاند ئەویش فەرمووی : سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لەسەر تۆش ، پێی بڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) من بۆنی بەهەشت دەبیستم ، بە هۆزەکەم ( انصار ) بڵێ : لەلای خوا هیچ عوزر و بەهانە یەکیان نامێنێ ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکەوێتە دەست بێ باوەڕان مادەم کەسێکی زیندووتان تیامەبوت،دەڵێت : پاشان گیانی پاکی سپارد(ﷺ)[2] .

## " ئایەتەکانی میرات "

لە ( جابری کوڕێ عبدالله ) وە ، دەڵێت : خێزانەکەی سعدی کوڕی ربیع هەردوو کچەکەی هێنا و هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! ئەمانە کچی سەعدن و باوکیان لەگەڵ تۆدا بوو لە ئوحود شەهید کرا ، ئێستا مامەیان هەموو ماڵەکەمانی بردووە و هیچی بۆ دوو کچەکەم

---

[1] – بڕوانە : ئیبنو هشام ( ٢ / ٩٤ ، ٩٥ ) .

[2] – بیهقی لە دلائل النبوه دا ریوایەتی کردوە .

نەهێشتوەتەوە و بە بێ پارەش نادرێن بە شوو ، ئەویش فەرموی : ( يقضي الله في ذلك ) خوای پەروەدگار ئەوە یەکلایی دەکاتەوە .

ئەوە بوو ئایەتی میراتگری هاتە خوارەوە ، ئەویش ناردی بەدوای مامی منداڵەکاندا و پێی فەرموو : ( إعط بنتي سعد الثلثين ، و اعط امهما الثمن ، و ما بقي فهو لك ) [1]. دوو لە سەر سێی ماڵەکە بدە بە کچەکانی سەعد و هەشت یەکی لێ بدە بە دایکیان و هەرچی مایەوە هەڵیگرە بۆ خۆت .

ڕەزای خـوای گـەورە لەسـەر سـەعدی کـوڕی ربیـع ( ﷺ ) و هـەموو هـاوەڵان و شوێنەکەوتوانیان تا ڕۆژی قیامەت .

[1] – فەرموودەی ( حسن ) : ئیبنو ماجە ریوایـەتی کـردوە ( ٢٧٢٠ ) و بڕوانـە / صـحيح سـنن الترميـذی (١٧٠١).

## " ٧١ - عبدالله ی کوڕی حزافە ( ﷺ ) "

## " خۆ بەرز ڕاگرتن بە باوەڕ "

ناوی ( عبدالله ی کوڕی حزافە ی کوڕی قیس ی کوڕی عدی ) یە و یەکێکە لە پێشینە بەرێزەکان .

کۆچی کردووە بۆ حەبەشە و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەك پەیامنێرێك ناردوویەتی بۆلای ( کسری ) . ابن مندە ، دەڵێت ( لە بەدر دابەشدار بوو ، وە ( ابن شهاب ) دەڵێت : عبیدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عتبە هەواڵی پێ دام ، ابن عباس هەواڵی پێداوە کە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پەیامێکی نارد بۆ ( کسری ) لەگەڵ ( عبدالله ی کوڕی حزافە ی سهمی ) دا و فەرمانی پێ کرد بیداتە دەست گەورەی بەحرەین ، ئەویش ( واتە گەورەی بحرین ) دایە دەست کسری ، هەرکە خوێندیەوە پارچە پارچەی کرد ، زهری دەڵێت : لەبەر ئە وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوعای لێ کردن کە خودا پارچە پارچەیان بکات[1] خوای گەورەیش دوعاکەی گیرا کرد و مولکی ( کیسری ) ی تێك و پێك داو پارچە پارچەی کرد .

### " ئادئەبو قورئان خوێندن "

لە ئەبی سەلەمەوە ( ﷺ ) ، عبدالله ی کوڕی حزافە هەڵسا و نوێژی دابەست ، لە نوێژەکەیدا دەنگی بەرزکردەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموو : یا ابن حذیفة ، لاتسمعنی و سمع الله [2] .

واتە : ئەی حذیفة .. مەیدە بە گوێی مندا ، بەڵکو با خوا گوێی لێت بێت .

نووسەر دەڵێت : فەرموودەی زۆریش لە ( صحیح ) و غەیری ئەویش هاتوون کە بەڵگەن لەسەر خۆشویستنی دەنگ هەڵبڕین بۆ قورئان خوێندن ، وەك ئەم فەرموودەیە : (ما أذن الله لشئ ما اذن لنبي حسن الصوت يتغنى بالقران يجهربه )[3]

---

[1] - صحیح بوخاری ریوایەتی کردوە ( ٨ / ٩٦ ) لە ( المغازی ) دا .

[2] - پیاوانی جێ متمانەن : ئیبنو سعد دەریهێناوە لە ( الطبقات ) دا ( ٤ / ١٩٠ )

[3] - صحیح : زانایان لەسەری هاودەنگن .

واتە : خوای پەروەردگار بۆ هیچ شتێك مۆڵەتی نەداوە ، زیاتر لە مۆڵەتدان بۆ دەنگی پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازەوە قورئان بخوێنێ و دەنگی بەرزکاتەوە) ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ قبوڵ کردن و ڕازی بوون لەسەری[1] .

پێشەوا ابو حامدی غەزالی ( ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ ) ، دەڵێت :

( بۆ ئەوەی فەرموودە جیاوازەکان کە لەمبارەوە هاتون پێکەوە کۆبکەینەوە ، دەڵێین : نزم کردنەوەی دەنگ لە ( ڕیاو ڕوپاماییی دورترە وەك لەبەرز کردنەوەی دەنگ لەبەر ئەوە هەر کەس لە ( ڕیاو ) پێش چاوی دەترسێت وا باشترە دەنگی نزم کاتەوە ، و بۆ کەسێکیش لە خۆی نەترسێت پێش چاوی بکات بە دەنگ بەرزکردنەوەی ئەوا باشتروایە دەنگ هەڵبڕێ ، چونکە زیاتر کار بەمە کراوە وسودەکەشی بۆ کەسانی دیکەش دەگەڕێتەوە ، دڵی خوێنەر خۆیشی زیندوو ڕادەگرێ و بیری لەلای قورئانەکە کۆ دەکاتەوە و گوێی لێ دەبێت و خەون لە چاوی لائەدا و چالاکی دەکات ، هەروەها خەوتوو و بێ ئاگایانی دەوربەریشی بە ئاگا دێنێتەوە و چالاکیان دەکات ، وتویانە : ئەگەر ئەم نیەتانەی هەبوو یان یەکێ لەم نیەتانەی هەبوو ، ئەوە دەنگهەڵبڕین بۆی باشترە)[2]

- لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق : -( بۆ هەرشتێ سەرپێچی خوای بەدیهێنەری تیا بوو گوێدێری هیچ دروستکراوێك مەکەن )

لە ( ئەبو سعید ) ەوە ، دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سریەیەکی نارد بە ( علقە کوڕی مجزز )ی کردە ئەمیر منیش یەکێك بووم لەناویاندا ، لە نیوەی ڕێدا هەندێکیان مۆڵەتیان لێ وەرگرت ، ئەویش مۆڵەتی دان و ( عبداللە ی کوڕی حزافە )ی کردە سەرکردەیان ، عبداللە لە ئەهلی ( بەدر ) بوو ، کەسێکی سوعبەتچیش بوو .

لە کاتێکدا کە بەڕێوە بووین و لە جێیەك ئاگرێکمان کردەوە تا لەبەری برێك خۆمان گەرم کەینەوە عبداللە هەڵساو وتی : باشە من مافی ئەوەم لەسەرتان نیە گوێڕایە ڵیم بکەن؟ وتیان : بەڵێ :

وتی : دەی بەومافەی من هەمە بەسەرتانەوە فەرمانتان پێ ئەکەم خۆتان بخەنە ناو ئەو ئاگرەوە ، ئەوانیش هەڵسان و خۆیان توند کردەوە بۆ خۆ فڕێ دانە ناو ئاگرەکەوە ،

---

[1] - البيان في آداب القرآن ى نووى ( ١٠٤ ) .

[2] - احياء علوم الدين غزالى ( ١ / ٢٧٨ ، ٢٧٩ ) .

تا ئەوکاتەی ( عبداللە ) زانی کە ئەوان ئەو کارە ئەکەن و وا خەریکە خۆیان فڕێ دەنە ناوی پێی وتن : وازبێنن وشتی وا مەکەن ، تەنها ویستم سوعبەتتان لەگەڵدا بکەم .

ئەوجا کە هاتنەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆیان باس کرد ، فەرمووی : ( من امركم بمعصية فلا تطيعوه )[1] هەرکەس فەرمانی پێ کردن بە سەرپێچی یەك ، بە گوێی مەکەن .

جێگیر بوونی لە سەرهەق : عبداللە ی کوڕی حزافە ، نموونەیەکی پێشکەش کردووە لەسەر ئارامی و مانەوە لەسەر هەق ، وانەیەکی نیشانداوین لەسەر سەر بڵندی و مل نەدان و بەرز ڕاگرتنی ئیمان و باوەڕ کە هەرگیز لەبیری نەکەین .

لە ( ئەبو رافع ) ەوە دەڵێت :

عمری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) سوپایەکی نارد بۆ ڕۆمەکان ، لەوێ ( عبداللە ی کوڕی حزافە ) یان دیل کرد و لەگەڵ خۆیان بردیان .

وتیان : ئەمە لە هاوەڵانی ( محمد )ە . پادشا وتی : وەرە ببە گاور ، نیوەی موڵکەکە مت پێ ئەدەم ؟ وتی : ئەگەر هەرچیت هەیە پێم بدەی لەگەڵ هەموو موڵکی عەرەبیشدا ، ئەوا بۆ چاوتروکانێك لە ئاینی ( محمد ) پاشگەزنابمەوە .

ئەویش وتی : دەی ئەتکوژین ، وتی : دەی کەیفی خۆتە ... پاشان بەستیانەوە و فەرمانکرا تیر بارانی دەورو بەری بکەن بە بێ ئەوەی بەر ئەو بکەوێ و بەردەوام داوای لێ ئەکرا ببێتە گاور ، بەڵام ئەو لەسەر باوەڕی خۆی مایەوە تا وازیان هێنا ئەوجا ئاوی کوڵاوی هێنا و دوو کەس لە دیلەکانی موسڵمانانی هێنا ، و فەرمانی کردو یەکێکیان تێ فرێدا ، و بەردەوام پێیان دەوت کە ببێتە گاور ، بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو ، پاشان عبداللە دەستی بەگریان کرد .

وتیان بە پاشا : دەگری ئەویش وای زانی ئیتر لاواز بووە و چارەی نەماوە ، وتی : بەرەڵای کەن و بۆم بێنن .. پێی وت : بۆچی گریایت ؟

وتی : بە خۆمم وت : گیانێکم هەیە ، ببەخشم ، حەزم ئەکرد هێندەی تا لە مووەکانی سەرم گیان و ڕۆحم تیابوایە و بخرایەتە ناو ئاگر لە پێناوی خوادا ، ئەو تاغووتەش پێ وت : دەی وەرە سەرم ماچ کە ، بەرەڵات دەکەم .

وتی : دیلەکانی دیکەش ئازار دەکەیت ؟

---

[1] – سەنەدەکی ( صحيح )ە ، احمد و ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردوە ، و زانایانی هاودەنگن لەسەری .

وتی : بەڵێ . ئەویش سەری ماچ کرد . و پاشان لەگەڵ دیلەکاندا گەڕایەوە بۆ لای عمر ( ﷺ ) و هەواڵەکەی پێدا ؟ عمریش (ﷺ) ، فەرمووی : هەر موسڵمانێك مافی ئەوەی بەسەرەوەیە سەری کوڕی حذافة ( ﷺ ) ماچ بکات ، وە بەخۆیشم دەست پێدەکەم و سەری ماچ کرد[1] .

لە ( مالك ی کوڕی انس )ەوە :

ئەهلی ( قیساریە ) کوڕی حذافة ( ﷺ ) یان بە دیل گرت ، پادشا کەیان فەرمانی پێ کردن بە چەندەها شێواز تاقی بکەنەوە ، بەڵام ئەو ئارامی لەسەر هەموویان گرت. پاشان هێنایانە ژوورێك و شەراب و گۆشتی بەرازیان سێ ڕۆژ لەسەر یەك بۆ دەبرد لە باتی خۆراك ،بەڵام ئەو نەیدەخوارد ، ئەو جا بە پاشایان وت بەڕاستی هێزی لەبەر بڕاوە ، ئەگەر دەری نەکەیت لەو ژوورەدا ، دەمرێت ، ئەویش هێنایە دەرەوە و لێی پرسی : بۆچی هیچ ناخۆیت ؟

وتی : ئەگەر چی لە ناچاریدا بۆمان حەڵاڵ کراوە ، بەڵام حەزم نەکرد وات لێ بکەم کەیفت خۆش بێت لە ئیسلام . ئەوجا وتی : دەی سەرم ماچ کە ، سەد دیلت لەگەڵدا ئازاد دەکەم . وتی ئەمەیانم قبوڵە ، و سەری ماچ کرد و لەگەڵ سەد کەس لە دیلەکاندا ئازادی کردن .

هەروەها ابن عائز چیرۆکی ابن حذافەی گێڕاوەتەوە ، دەڵێت : - وەلیدی کوڕی محمد بۆی باس کردین وتی : ابن حذافة ( ﷺ ) بە دیل گیراو ... پاشان بەدرێژی باسی چیرۆکەکەی کرد کەتیایدا هاتووە ، لەگەڵ عبداللە ی کوڕی حزافەدا سێ سەد بەندکراوی دیکەشی ئازاد کردووە و سی هەزار دینار وسی خزمەتکاری ئافرەت و سی خزمەتکاری پیاویشی پێ بەخشیوە .

پێشەوا ( ذهبي ) دەڵێت : ( لەوانەیە ئەم پادشایە بە نهێنی موسڵمان بووبێت ، و بەڵگەش بۆ ئەوە ڕێزگرتنی عبداللە ی کوڕ حذافة(ﷺ)یە ، و ئەوانەی لەناخی خۆیاندا موسڵمان بوون بەو جۆرە هەڵس و کەوتیان کردووە ، و تکای ئەوەی بۆ دەکرێ کە بۆ هەمیشەیی لە ئاگردا نەمێنێتەوە ، چونکە جۆرێك باوەڕ لە دڵیدا گیرساوەتەوە و بۆ ئەوە شاردویەتیەوە نەکا ملکەچی ئیسلام و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بێت و باوەڕی بە هەقێتی

[1] - ارنۆوط دەڵێت : ئیبنو عساکر لە تاریخ دا لەڕێی بەیهەقی یەوە ریوایەتیکردووە و هەروەها (حافظ )یش لە ( الاصابە ) دا و لە فەرمودەی ئیبنو عباسەوە ، لەلای ئیبنو عساکر .

ئیسلام هەبووە لەگەڵ باوەڕی بەوەی کە ئەو لەسەر ئاینی ڕاستە ، دەبینین کە ئاینی یەکانی لەلاگەورە بووە ، هەروەك زۆرێکی تر لە ( المسلمانیة الدواوین )ەکان ئەیانکرد ، بەڵام ئەمە لە ئیسلامدا سوودی بۆ ی نیە تا لە هاوەڵدانان بۆ خودا خۆی ڕزگار نەکات )[1] .

" وەفاتی "

عبدالله ی کوڕ حذافة ( رضي الله عنه ) لەسەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عوسماندا (رضي الله عنه) وەفاتی کردووە .

[1] - بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ١٥ ، ١٦ )

# " ٧٢ - خزیمەی كوڕی ثابت ( ﷺ ) "

## " شایەتی دانی بە شایەتی دوو پیاوە "

ناوی : -

خزیمەی كوڕی ثابتي كوڕی فاكهیی كوڕی ثعلبة ی كوڕی ساعدەیە ، زانا و فەقیە ئەبو عمارەی ئەنصاری خەطمی مەدەنی یە و بە " ذوالشهادتین " ناسراوە .

وتراوە : یەكێكە لە ئەهلی ( بەدر ) بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە كە لە ئوحود و دوای ئوحوددا بەشدار بووە . یەكێ بووە لە كەسانی بەرچاوی سوپای ( علی كوڕی ئەبو تالیب) (ﷺ) و لە ڕۆژی ( صفین ) دا لەگەڵ علی ( ﷺ ) دا شەهید بووە . لە جەنگی ( مؤتە ) شدا بەشداری كردووە و ساڵی ( ٣٧ )ی كۆچی شەهید بووە ( ﷺ ) و هەڵگری ئاڵای (بني خطمە) بووە .

### " ذوالشهادتین ( خاوەنی دوو شەهادەت ) "

لە عەماری كوڕی خزیمەوە ، دەڵێت : مامی كە یەكێ بوو لە هاوەڵان بۆی باس كرد وتی : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەسپێكی لە كابرایەكی دەشتەكی كڕی و فەرمووی دوایی وەرە تا پارەی ئەسپەكەت پێ بدەم ، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە خێرایی دەرۆشت ، بەڵام دەشتەكی یەكە خاوەخاوی دەكرد و لە ڕێدا چەند كەسێك داوایان لە دەشتەكی یەكە كرد كە ئەسپەكەیان پێ بفرۆشێت بەبێ ئەوەی بزانن كە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لێی كڕیوە ، كابرای دەشتەكی بانگی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كرد وتی : ئەم ئەسپەم هێشتا نەفرۆشتووە ئێستا دەیفرۆشم بەمانە ، پێغەمبەری خوا ش ( ﷺ ) كە گوێی لە دەشتەكی یەكە بوو ، فەرمووی : ( أوليس قد ابتعته منك ؟ ) ئەی من لێم نەكڕیت ؟

دەشتەكی یەكە وتی : نا بەخوا پێم نەفرۆشتووی . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( بلى قد ابتعته منك ) ، بەڵكو من لێم نەكڕیویت ..

دەشتەكیەكە وتی : دەی شاهیدت هەیە ؟

خزیمەی كوڕی ثابت وتی : من شایەتی ئەوەم كە پێت فرۆشتووە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە خزیمەی فەرمووی : ( بم تشهد ) شایەتی بە چی دەدەیت . وتی : بە

چەسپاندنی ڕاستی قسەکانت ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) لەوە بە دواوە شایەتی خزیمەی لە جێی شایەتی دوو پیاو دانا[1] .

خارجەی کوڕی زەید ، لە باوکیەوە ، دەڵێت : کاتێ کە خەریك بووین قورئانمان لە دوو توێی پەڕاودا دەنووسیەوە ئایەتێکم لە بیر چوو بوو کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) م بیستووە ، لەلای خزیمەی کوڕی ثابت بینیمەوە ئەویش ئەمە بوو :﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ... ﴾ سورة ألأحزاب ، آية ( ٢٣ ) .

دەڵێت : خزیمە بە (ذوالشهادتین ) بانگ دەکرا و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شایەتی ئەوی بە شایەتی دوو پیاو ڕێ پێ دەدا[2]..

زەیدی کوڕی ثابت ( ﷺ ) هیچ ئایەتێکی نەئەنووسیەوە بە بوونی دوو شایەتی دادپەروەر نەبێت ، کەچی ئەم ئایەتەی تەنها لەلای ( خزیمەی کوڕی ثابت ( ﷺ ) ) بینیەوە و جێگیریشی کرد لەبەر ئەوەی شایەتی ئەو بەشایەتی دوو پیاو بوو . وە خزیمە لە تیرەی ( ئەوس ) بوو .. ئەو سی یەکان شانازی یان پێوە دەکرد. هەردوو تیرەکەی ئەنصاری شانازی یان بە خۆیانەوە دەکرد ، ئەوسیەکان ئەیانوت ئێمە کەسانێکمان هەیە فریشتەکان شۆردویانە ئەویش ( حنظله ی کوڕی راهب )ە و کەسانێکی وەك ( سعد ) مان هەیە کە عەرشی خودا بە مردنی لەرزیوە و کەسانێکمان هەیە کە شایەتی بەشایەتی دوو پیاو دەخوات ئەویش ( خزیمەی کوڕی ثابت ( ﷺ ) )ە . (ڕەزای خوا لەسەر هەموویان ).

---

[1] – سەنەدەکی ( صحیح )ە : ابوداوود لە ( الاقضیه) دا ڕیوایەتی کردوە .

[2] – سەنەدەکی ( صحیح )ە : عبدالرزاق لە ( المنصف ) ( ٢٠٤١٦ ) دا ڕیوایەتی کردووە ، هەروەها بوخاری ( ٨ / ٣٩٨ ) .

## " ٧٣ - عبدالله ی کوڕی سلام ( رضي الله عنه ) "

## " ئەو زانایەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شایەتی بە هەشتی بۆدا !! "

کێ یە ؟ عبدالله ی کوڕی سەلامی کوڕی حارثە ... پێشەوای زانا و شایەتی بۆدراو بۆ چوونە بەهەشت ، ئەبو حارثي ئیسرائیلی هاوپەیمانی پشتیوانانە و لە هاوەڵە هەڵبژاردەکانی ( تایبەتەکانی ) پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) .

کاتی کۆچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هاتنی بۆ مەدینە ، عبدالله موسڵمان بووە.

ابن سعد ، ئەڵێت : لەنەوەی یوسفی کوڕی یعقوبە ( سەلامی خوایان لەسەر بێت ) ، یەکێك بوو لە زانا ئاینی یەکانی جولەکە .

لە عبدالله ی کوڕی سەلامەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا( ﷺ) هاتە مەدینە ، خەڵکی بە خێرایی بەرەو ڕووی دەهاتن منیش یەکێك بووم لەو خەڵکە و بەرەو ڕووی چووم ، و هەرکە بینیم زانیم کە دەم و چاوی هی کەسێکی درۆزن نیە و یەکەم شتێك لێیەوە بیستم ئەمە بوو کە فەرمووی :

" یاایها الناس ، أفشوا السلام ، و اطعموا الطعام ، و صلوا الارحام ، و صلو بالليل و الناس نيام ، تدخلوا الجنة بسلام " [1] .واتە : ئەی خەڵکینە ، ئاشتەوایی و سەلام لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە و خواردن بە یەکتری بدەن و سیلەی ڕەحم بکەیەنن و کاتێ خەڵکی نووستون بەشەودا نوێژ بکەن ، دەچنە بەهەشتەوە بە سەلامەتی ...

ئەو ئاخاوتنەی لە نێوان عبدالله و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرا : - لە ( انس ی کوڕی مالك )ەوە ( رضي الله عنه ) دەڵێت : عبدالله ی کوڕی سلام ، ئەو کاتەی تازە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتبووە مەدینە هات بۆلای و وتی : سێ پرسیارت لێ ئەکەم کە تەنها پێغەمبەران وەڵامەکەی ئەزانن :

یەکەمین نیشانەی قیامەت چی یە ؟

یەکەمین شت کە ئەهلی بەهەشت دەیخۆن چی یە ؟

---

[1] - فەرموودەی صحیح / ئەحمەد و تیرمیزی و حاکم ( ٣ / ١٣ ) دەریان هێناوە دەڵێت ( صحیح الاسناد)ە و زەهەبیش هاوڕایە ( سیر ٢ / ٤١٤ ) بەڕاوێز .

لە کوێوە کوڕیە لە شێوەیدا دەچێتە سەر باوکی یان دایکی ؟

فەرمووی : ( اخبرني بهن جبريل آنفا )

جبریل کەمێك لەمەوبەر هەواڵی ئەوانەی پێدام .

وتی : لەناو فریشتەکاندا ئەو دوژمنی جوولەکەیە [1].

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

" یەکەمین نیشانەی هەڵسانی قیامەت ئاگرێکە ، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت و خەڵکی بەرەو ڕۆژئاوا ڕاپێچ دەکات و کۆ دەکاتەوە "

" یەکەمین شتێکیش ئەهلی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری نەهەنگە "

سەبارەت بەلێك چوونیش ئەوە ئەگەر ئاوی پیاو پێشکەوت ؟ منداڵەکە لە دەچێت و ئەگەر هی ژنەکە پێشکەوت ئەوا منداڵەکە لە دایکی دەچێت . وتی : شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوا یت ( ﷺ ) .

پاشان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جولەکە قەومێکی بوختانچین[2] ئەگەر بزانن کە دەست ئەکەن بە بوختان بۆ کردنم ، لەبەر ئەوە کەسێك بنێرە لایان و هەواڵی منیان لێ بپرسە . ئەویش کەسێکی نارد بۆ لایان ، وتیان : زانای کوڕی زانا و پیاوی ئاینی و کوڕی پیاوی ئاینی و تێگەیشتومانە ، وتی : ئەگەر بزانن مسوڵمان بووە ، ئێوەش موسڵمان دەبن ؟ وتیان خوا پەنای بدات لە شتی وا . وتی : ئەوجا عبدالله چووە دەرەوە و وتی : ( شایەتی ئەدەم کە هیچ خودایەك نیە جگە لە ( ﷲ ) و ( ﷴ )یش پێغەمبەری خوایە( ﷺ ).

ئەوانیش وتیان : بەڵکو ابن سلام خراپترینمانە و کوڕی خراپترینمانە و بێ ئاگاترین و کوڕی بێ ئاگاترینمانە . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، نەموت ئەوانە قەومێکی بوختانچین[3] ؟

---

[1] – خوای گەورە بەم ئایەتە پیرۆزە ڕەدی داونەتەوە : ﴿ قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ(٩٧)مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ(٩٨) ﴾ سورة البقرة .

[2] – واتە بەو درۆ و دەلەسانەی کە هەڵیدەبەستن گوێگر سەرسام ئەکەن .

[3] – فەرموودەی ( صحيح )ە بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( ٦ / ٢٦١ ) .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١ – پێشەوا احمد له ( المسند ) دا ڕیوایەتی کردووە ، ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قاپێ ( ترید ) ی هێنا و بڕێکی لێ خوارد و هەندێکی لێ هێشتەوە و فەرمووی : ( يدخل من هذا الفج رجل من اهل الجنة ، يأكل هذه الفضلة ) واتە : لەم دەرگایەوە پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت دێتە ژوورەوە ئەم پاشماوەی تریتە ئەخوات .

سەعد دەڵێت : کاتێ من هاتمَ ( عمیری کوڕی ئەبو وقاص )ی برام خۆی ئامادە ئەکرد بێتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وتم بە شکوم ئەوەی کە دێتە ژوورەوە (عمیر) بێت ، بەڵام دەبینم ( عبدالله ی کوڕی سەلام ) هاتە ژوورەوە و تریتەکەی خوارد [١].

٢ – لە قیس ی کوڕی عبادەوە ، دەڵێت : لە مزگەوتی مەدینە بووم پیاوێك هات کە شوێنەواری کڕنوش لەسەر ڕووی دیار بوو ، خەڵکەکە وتیان : ئەم پیاوە لە ئەهلی بەهەشتە ، ئەوجا دووڕکات نوێژی کرد کە ، درێژی نەکردەوە و بە کورتی ئەنجامی دا و کاتێ چووە دەرەوە شوێنی کەوتم تا ماڵەکەیان و لەگەڵیا چوومە ژوورەوە و دەستم بە گفتوگۆ کردن کرد لە گەڵیدا و ئەوە بوو کە پێم ئاشنا بوو ، وتم : خەڵکەکە لە مزگەوت ئەیانوت کە تۆ وەها و وەهایت ( واتە لە خەڵکی بەهەشتی ) . وتی : سبحان الله ! ( پاك و بێ گەردی بۆ خوا ) بۆ کەس نیە هەر لە خۆیەوە شتێ بڵێ بە بێ ئەوەی بیزانێ ، من بۆت باس ئەکەم : خەوێکم بینی و بۆ پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) گێڕایەوە :

لە خەومدا وەك ئەوەی لەناو گوڵستانێکی سەوزدابم و لەناوەڕاستیدا پایەیەکی ئاسنین هەبوو ، بنەکەی لە زەویدا و سەرەکەی لە ئاسماندا بوو ، وە لە سەرووییەوە دەستە بەندێك ( عروەیەك ) هەبوو ، پێم وترا ، سەرکەوە بەسەریدا منیش سەرکەوتم تا گەیشتمە دەستەبەندە کە ( قولفەکە ) .

پێم وترا : دەستی پێوە بگرە ...

خەبەرم بوویەوە و ئەبینم لەناو دەستم دایە و کە ڕۆژ بوویەوە ، هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆم باس کرد ، ئەویش فەرمووی :

( اما الروضة فروضة الاسلام ، و اما العمود ، فعمود الاسلام ، و اما العروة فهى العروة الوثقى ، انت على الاسلام حتى تموت ) .

---

[١] – سەنەدەکی ( حسن )ە / احمد ڕیوایەتی کردوە ( ١ / ١٩٦ ) ، هەروەها حکم ( ٣ / ٤١٦ ) و دەڵێت : صحيح الاسناده و زەهەبیش هاوڕایە .

فـەرمووی : گوڵـستانەکە ، گوڵـستانی ئیـسلام و پایەکـەش پایـەی ئیـسلام بـووە ، وە دەسـتەبەندەکەش ( عـروه الـوثقی ) یـە واتـە : بـە هێزتـرین هۆکـار بـووە وە تـۆ لـە نـاو ئیسلامدایت هەتا ئەمریت . قیس دەڵێت : پیاوەکە عبدالله ی کوڕی سلام بوو[1] .

## " خۆ بەکەم زانینی "

لە عبدالله ی کوڕی حنظله وە ، دەڵێت :

عبدالله ی کوڕی سەلام بە ناو بازاڕدا ڕۆیشت و کۆڵی تەختە و دار بەسەر پشتیەوە بوو ، پێی وترا ئەمە چی یە ئەی تۆ خزا دەوڵەمەندی نەکردویت ؟

وتی : بۆنا ، بەڵام ویستم خۆبەزلزانین و لە خۆبایی بوون لە خۆمدا بمرێنم، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو ، فەرمویـەتی : ( لا یدخل الجنة من كان في قلبه مثقال حبة خردل من كبر )[2] .

واتە : ئەوەی هێندەی مسقالە تۆوێك لـە خۆبـەزلزانین لـە نـاو دڵیـدا هـەبێ ناچێتە بەهەشتەوە .

## " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) منداڵەکانی خۆشدەوێ "

لە ( یوسفی کوڕی عبدالله ی کوڕی سلام )ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کۆشیدا داینیشاندم و دەستی بەسەرمدا هێناو ناوی لێ نام ( یوسف )[3].

## " خەباتی لە پێناوی خوادا "

بشری کوڕی شغاف ، لە ( عبدالله ی کوڕی سـلام ) ەوە دەگێڕێتـەوە : کـە ئامـادەی ڕزگـار کردنـی ( نهاوەنـد ) بـووە . وە لـە ( ابـن سـیرین ) ەوە ، دەڵێـت : هـەواڵم پـێ درا کـە عبدالله ی کوڕی سلام فەرموویەتی : ئەگەر پێیدا گەشتم ( واتە مام تا کاتی جەنگەکە ) و

---

[1] – فەرموودەی صحیح : بوخاری دەریهێناوە ( ٧ / ٩٨ ) ، و ( مسلم ) ( ٢٤٨٤ ) .

[2] – حاکم لە ( المستدرك ) ( ٣ / ٤١٦ ) دەری هێناوە و دەڵێت : ( صحیح ) ە .

[3] – هیثمی دەڵێت : احمد بە چەند ئیسنادێك ریوایەتی کردوە و هەروەها لە پیاوانێکەوە و ئیسنادیان بێ باوەڕن . المجمع بە ژمارە ( ١٥٨٠٧ ) .

ولاَخم نەبوو ، هەڵمگرن هەتا لە نێوان هەردوو ڕیزەکەدا دامئەنێن ( واتە لەناو جەرگەی شەڕەکەدا )[1]

## " خۆپارێزی ( ﷺ ) "

لە ئەبو بردەی کوڕی ئەبو موسای ئەشعەری یەوە ، دەڵێت : هاتم بۆ مەدینە ، دەبینم عبداللە ی کوڕی سلام لە کۆڕێکی زیکردا دانیشتووە بە ملکەچی یەوە بۆ خوا و سیمای چاکەی لێ دەباری ... وتی : براکەم تۆ ئێستا دێیت کە ئێمە وا هەڵئەسین . منیش وتم : قەیناکا هەڵسن .. ئەویش هەڵسا و شوێنی کەوتم ، وتی : تۆ کێیت ؟ وتم : کوڕی براکەتم ، من ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسام .

ئەویش سلاَوی لێ کردم و هەواڵپرسی لێ کردم و بڕێك گەنمە خوساوی پێیدام ، پاشان وتی : ئێوە گوندنشینن و قەرز دەدەنە بازرگانەکان ئەوانیش ، بارە ولاَخ لە زەمبیلەی پڕ لە خورما و ئالفتان پێ ئەدەن ، نەکەن لێی نزیك ببنەوە و وەری گرن ، چونکە ئەوە ئاگرە[2] . لە ڕیوایەتێکی تردا ئەوە سووە .

حافظ ابن حجر ، دەڵێت : بۆی هەیە ئەمە ڕای عبداللە ی کوڕی سلام بێت ، ئەگینا زانایان لەسەر ئەوە هاودەنگن کە لە کاتێکدا ئەوە ئەبێتە سوو ئەگەر بە مەرج دابنرێت ، بەلاَم باشترین خۆپارێزیش ئەوەیە کە وازی لێ بهێنرێت [3].

وەفاتی :- ذهبي ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : زانایان هاو دەنگن لەسەر ئەوەی کە عبداللە ی کوڕی سلام ڕەزای خوای لەسەر بێت لە ساڵی ( ٤٣ )کۆچیدا وەفاتی کردووە .

---

[1] - بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٤٢٢ ، ٤٢٣ ) .

[2] - پیاوانی جێی متمانەن ، الاصابە ( ٦ / ١١٠ ) پەراوێز ( سیر ٢ ، ٤٢٤ ) .

[3] - پەراوێزی سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٤٢٤ ) .

# " ٧٤ - حەکیم ی کوڕِ حزام ( رضي الله عنه ) "

# " شاهیدبن کەوا من بەخشیم بەخودا "

ناوی : حکیم ی کوڕی حزام ی کوڕی خویلیدی کوڕی اسد ... ئەبو خالدی قورەیشی ئەسەدی یە .

ابن منده ، دەڵێت :

" حکیم لە ناو جەرگەی کەعبە لە دایك بووە و سەد و بیست ساڵ ژیاوە " ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە موسڵمان بووە ، لە هەر دووغەزای ( حنین و طائف ) بەشدار بووە . لە ماقوڵانی قورەیش و هۆشمەندان و خانەدانەکانیان بووە خاتوو خەدیجەی کچی خویلید ( رضي الله عنها ) پوری بووە ، هەروەها زبێری کوڕی عوام کوڕە مامی بووە .

ذهبي دەڵێت :

" حەکیم لە گەورە پیاوانی قورەیش بووە ، نیشانەیەك بووە بۆ پشت و نەسەب ، وە خۆپارێز و پایەبەرز بووە " ئەگەر زۆر پێدا گری لە سوێند خواردندا بکردایە ، ئەیفەرموو : " نا بەو کەسەی کە ڕۆژی بەدر منی لە کوژران پاراست " ئەو ڕۆژە هێشتا باوەڕی نەهێنا بوو ، وە ئەگەر بکوژرایە بە کافری ئەمرد ، بەڵام ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە خودا پێی گەیشت .

## " خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە پێش ئیسلامدا "

لە ( عراك ی کوڕی مالك )ەوە ، حکیم کوڕی حزام وتی :

محمد ( ﷺ ) لە جاهیلیدا خۆشەویسترین کەسم بوو ، بەڵام لە پاش ئەوەی پەیامی ئیسلامی بۆ هات و کۆچی کرد بۆ مەدینە ، حکیم ئەو وەرزە بە بێ باوەڕی مایەوە ، پاشان دەبینێ ( جل و بەرگێکی ) " ذی یەزن[١] " دەفرۆشن ، چوو کڕی بە ( ٥٠ ) دینار تا

[١] - یەکێکە لە پاشاکانی یەمەن .

بە دیاری بیداتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەوە بوو هێنای بۆ مەدینە و دای بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دیاری ، بەڵام وەری نەگرت .

عبدالله دەڵێت : وەك ئەوەی گوێم لیٰ بوو فەرمووی : ( انا لانقبل من المشركين شـ ـيئا ، ولكن ان شئت بالثمن ) واتە : ئێمە هیچ شتیٰ لە هاوەڵگەڕان قبوڵ ناکەین ، بەڵام ئەگەر ڕازیت ئەوە بە نرخەکەی لێت وەرئەگرم . دەڵێت : منیش کە زانیم بە دیاری وەری ناگریٰ بە نرخەکەی پێم دا [1].

هەروەها ( طبرانی ) لە ڕیوایەتێکدا ئەمەی زیاد کردووە : —

ئەوجا لە بەری کردوو لەسەر بڵنگۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) م بینی پێوەی بوو ، هیچ شتێکی لەو جوانتر نەبوو ئەو ڕۆژە ، پاشان دای بە ( اسامە ) و حکیم بە ( اسامە ) وە بینی وتی : ئەی ئوسامە ! ئەڵێی کراسەکەی ( زی یەزن ) ت لەبەرکردووە ؟

وتی : بەڵیٰ ، سوێند بەخوا من لە ئەو باشترم و باوکیشم لە باوکی ئەو باشترە منیش چووم بۆ مەککە و بەقسەکانی ئوسامە سەرسامم کردن .

## " چاو تێری ( قناعە ) هۆکاری دەوڵەمەندبوونە "

حکیم ی کوڕی حزام نموونەی عیففەت و قەناعەت و ڕەزامەند بوون بووە بە بەشی خودا . ئەمەش ئاکامەکەی بووە هۆی کرانەوەی دەرگای ڕۆزی و ماڵ و سامان بەڕویدا .

لە زەهری یەوە ، لە سعید و عروە وە :

" پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژی حنین بەشێکی لە غەنیمەدا بە حکیم ، ئەوە بووبە کەمی زانی بۆیە بۆی زیاد کرد ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ! کام بەشیان کە پێت دام چاکتر بوو ؟

فەرمووی : " الاولى " ئەوەی یەکەمجار و پاشان فەرمووی :

( يا حكيم ان هذا المال خضرة حلوة ، فمن اخذه بسخاوة نفس و حسن أُكله بورك له فيـ ـه ، و من اخذ باستشراف نفس و سوء اكلة ، لم يبارك له فيه و كان كالذي يأكل و لا يشبع )

واتە : ئەی حکیم ، ئەم ماڵە جوان و شیرینە ، و هەرکەس بە دەروونێکی گوشادە وە وەریگرێت و بەباشی و لە شتی چاکدا بەکاری بێنیٰ ئەوە لێی پیرۆز دەبێت ، وە هەرکەس

---

[1] — پیاوانی جیٰ متمانەن : احمد ( ٣ / ٤٠٢ ، ٤٠٣ ) ، حاکم ( ٣ / ٤٨٣ ، ٤٨٥ ) و دەڵێت صحیح الاسناد و زەهەبیش هاوڕایە پەراوێز ( سیر ٣ / ٤٦ ) .

بە دەرونێکی تەنگ ( بە چاو لێ تێر نەبوون و بەرچاو تەنگی ) وەری بگرێت و بەخراپی بە کاری بێنێت ، ئەوە لێی موبارەك نەبو ، وە وەك ئەو کەسە وایە کە هەر دەخوات و تێر نەبوت .

حکیم وتی : ئەگەر لە تۆیش وەری گرێت ؟

فەرمووی : ( و مني ) ئەگەر لە منیش وەری گرن .

وتی : دەی بەوکەسەی تۆی بە هەق ناردووە شەرت بێ لە دوای تۆ خێر لەکەس وەر نەگرم .

دەڵێت : لە دوای ئەوە هیچ بە خشش ( عطاء ) و دەعوەتێکی نان خواردنی وەرنەگرت هەتا مرد . وە عمر ( ﷺ ) ئەیفەرموو : ئەی خوای گەورە شایەت بە بەسەر ( حکیم ) ەوە کە من بانگی ئەکەم هەقی خۆی پێ بدەم کەچی نایەوێ . وە ( حکیم ) کە وەفاتی کرد یەکێ بوو لە زۆر دەوڵەمەندەکانی قوریش[1] .

## "بەرچاوتێری و سەخاوەتی "

لە هشامی کوڕی عروەوە لە باوکیەوە :

حکیم ی کوڕ حزام لە جاهیلیدا سەد بەندەی ئازاد کردووە و باری سەد حوشتری بەخشیوە ، کاتێکیش موسڵمان بووە ، ئەوەندەی تری بەخشیوە و سەدبەندەی تریشی ئازاد کردووە ، دەڵێت : پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئایا ئەو کارە باشانەی لە جاهلیەتمدا ئەنجامم داون ئەبن بە چی ؟ ( یان هیچ سودێکیان لە قیامەتدا بۆم هەیە ؟ ) ئەویش فەرمووی :

( اسلمت على ماسلف لك من خير )[2] واتە : تۆ بە هەموو فەزڵو گەورەیی پێشووتەوە موسڵمان بوویت – واتە بۆت حساب ئەکرێ .

وە لە ( مصعب ی کوڕی ثابت ) ەوە ، دەڵێت : سوێند بەخوا پێم گەیشت کە حکیم ی کوڕی حزام ڕۆژی عەرەفە هاتووە و سەد بەندە و سەد سەر حوشتر و سەد مانگا و سەد سەر مەڕیشی لەگەڵدا بوو فەرمووی : هەموویان لە پێناوی خوا دەبەخشم[3] ...

---

[1] – عبدالرزاق ریوایەتی کردوە ، هەروەها طبراني ( ٣٠٧٨ ) .

[2] – صحيح / زانایان هاودەنگن لەسەری .

[3] – طبراني ریوایەتی کردوە ( ٣٠٧٥ ) و فەرموودەی ( مرسل )ە .

هەروەها هاتووە کە ( دارالندوە )ی بە سەد هەزار فرۆشتووە . (ابن الزبیر) یش پێی وتووە : گەورەی قورەیش جێگای پایەدار و بەنرخی قورەیش دەفرۆشێ ؟

وتی : مەزنانەیەتی و گەورەیی هەمووی رۆیی برازا و تەنها لە خواترسان گەورەیی یە وە من داومە بە خانوویەك لە بەهەشت ، ئێوە شاهیدبن کەوا نرخەکەیم بەخشیوە لە پێناوی خوادا [1] ..

## " کۆتایی یەکی کامەران "

حکیم ( رضي الله عنه ) سالی ( ٥٤ )کۆچیدا وەفاتی کرد . لەسەرە مەرگدا هاتنە سەری دەیفەرموو : ( لااله الا الله قد کنت اخشاك ، و انا الیوم ارجوك ) واتە هیچ خودایەك نیە جگە لە (زاتی الله ) ئەی پەروەردگار من ئەوسا لێت دەترسام ، بەلأم ئێستا ئومێدەوارم بە رەحم و بەزەییت ، پاشان گیانی سپارد ... رەزای خوای لەسەر بێ .

[1] –( حسن )، طبرانی بە دوو ئیسناد دەری هێناوی یەکێکیان ( حسن )ە المجمع بە ژمارە ( ٩ / ٣٨٤ ).

# " ٧٥ - عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص ( رضي الله عنه ) "

## " پێشەوای عەبود "

کێیە ؟

پێشەوای زانای خواپەرست ، عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص ... هاوەڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و کوڕی هاوەڵی .. پێش باوکی موسڵمان بووە و چەندین کردەوەی چاکە و باش و پێگەی پایەداری لە زانست و ڕەفتار دا هەیە ، زانستێکی زۆری لە پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) کۆ کردوەتەوە ، پاش ساڵی حەوتی کۆچی هیجرەتی کردووە و لە هەندێ لە غەزاکاندا بەشداری کردووە .

بە مۆڵەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموودەی نووسیوەتەوە ، وە ئەم ڕێپێدانەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە عبدالله کە فەرموودەکان بنووسێتەوە پاش ئەوە دێت کە پێشتر ئەوەی بۆ هاوەڵان پەسەند نە ئەکرد کە غەیری قورئانی لێ وەرگرن و بنووسنەوە . پاشان دوای جیاوازی هاوەڵان ( رضي الله عنهم ) هەموو هاودەنگ بوون لەسەر ڕەوا بوون و خۆشویستنی نووسینەوە ، لەبەر ئەوەی نووسینەوە هۆکارێکی گرنگی مانەوەی زانستە . پێشەوا ( ذهبي ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : ( دیارە ڕێگری کردنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە نووسینی غەیری قورئان لەسەرەتادا ، بۆ ئەوە بوو هەموو کۆششێك لەسەر قورئان کۆ بکرێتەوە و بە تەنها قورئان لە باقی سوونەتەکان جیا بکرێتەوە و تێکەڵ بوون ڕوونەدات ، ئەوە بوو پاش نەمانی ئەوەی خۆپارێزی یان لێ دەکرد لە ناڕونی و تێکەڵ بوون ڕوون بوویەوە کە قورئان جیاوازە لە قسەی مرۆڤ و لێك ناچن ، مۆڵەتی ئەوەدرا کە ئەو زانستە بنوسرێتەوە ، خوایش زاناترە )[١] پێشەوا ( ابن القیم ) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ، دەڵێت :

( بە صحیحی هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) کە نەهی لە نووسین کردووە و لە دواییدا ڕێگەی پێدراوە و ( نسخ )ی فەرموودەی نەهیکردنەکەی کردووەتەوە ، ئەوەتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە غەزای ( فەتح ) دا فەرموویەتی : (اكتبو لئەبو شاە ) وە پاشان مۆڵەتی عبدالله ی کوڕی عەمری داوە فەرموودەکانی بنووسێتەوە ، و کاتێ وەفاتی کردووە نوسراوەکانی لەلا بووە ، و ناوی لێنابوو ( الصادقە ) و ئەگەر نەهی کردنەکە لە

---

[١] - بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٨١ ) .

دواتر بوایە ، نووسراوەکانی دەفەوتاند و پێغەمبەری خوا ش ( ﷺ ) فەرمانی بە فەوتاندنی هەموو ئەو نووسراوانە ئەکرد کە لە غەیری قورئان لێیەوە وەرگیراون ، کەواتە جێگیر کردن و نەفەوتاندنیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیجازەی نووسینی لە دوای ڕێگری لێ کردنیەوە بووە )[1]

## " فەزڵ و گەورەیی "

١ – لە عقبەی کوڕی عامرەوە ( ﷺ ) : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : " نعم أهل البیت ابو عبدالله و ام عبدالله و عبدالله "[2]

واتە : باشترین خانەوادە – باوکی عبدالله و دایکی عبدالله و عبدالله یە .

٢ – و لە ( عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص )ەوە ، دەڵێت : ڕۆژێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ماڵیان بووم فەرمووی : " هلی تدری من معنا في البیت ؟ " واتە : ئەزانی ئێستا کێمان لەگەڵدایە ؟

پرسیم : کێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟

فەرمووی : جبریل ، سەلامی خوای لەسەر بێت .

وتم : سەلام و ڕەحمەتی خوات لەسەر بێ ئەی جبریل .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : " انه قدرد علیـ لـك الـ سـلام "[3] جبریل ، وەڵامی سەلامەکەتی دایەوە ...

## " پەرستشی "

لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ، دەڵێت :

باوکم ئافرەتێکی قورەیشی بۆ مارە کردم ، ئەوە بوو کاتێ هاتە ژوورەوە بۆلام ، دەبینم تاقەتیم نیە بچم بەدەوریدا ، بەهۆی ئەو کۆشش و وزە زۆرەی کە لە پەرستشی وەك نوێژ و ڕۆژوو بە کاری دێنم .

پاشان عەمری کوڕی عاص ی باوکی هات بۆلای بووکەکەی و پرسی : هاوسەرەکەت چۆن دەبینی ؟

---

[1] – تهذیب السنن ( ٥ / ٢٤٥ )ی ئیبنو القیم .

[2] – پیاوانی جێ متمانەن / احمد ریوایەتی کردوە ، بڕوانە / المجمع بە ژمارە ( ١٥٩٠٢ ، ١٥٩٠٣ )

[3] – سەنەدەکی ( حسن ) ە / طبرانی ریوایەتی کردوە ، بڕوانە المجمع ( ١٥٩٠٤ ) .

وتی : باشترین پیاوە ، یان باشترین هاوسەرە ، لەناو ئەو پیاوانەدا کە بە هیچ جۆری نەهاتوون بە دەوری ئافرەتانیاندا و لێیان نزیك نەبوونەتەوە .

دەڵێت : باوکیشم هات بۆم و لێم تووڕە بوو وتی : ئافرەتێکی خاوەن پلەو پایەی قورەیشم بۆ مارە کردووی تا پشتی لێ بکەیت و سارد و سڕبی لەگەڵیدا ؟

دەڵێت : پاشان بەرەو لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەرچوو بۆ سکالآ کردن لێم .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناردی بەدوامدا و فەرمووی :

" اتصوم النهار ؟ " بەڕۆژدا بەڕۆژوو دەبی ؟

وتم : بەڵێ ...

فەرمووی : بەشەویشدا شەونوێژ ئەکەیت ؟ " وتقوم الليل ؟ "

وتم : بەڵێ ..

فەرمووی : " و لكني اصوم و افطر ، و أُصلي و انام ، و امس النساء فمن رغب ع ن س نتي فليس مني "

واتە : بەلاّم من هەندێ جار بە ڕۆژو دەبم و هەندێ جاریش بە ڕۆژو نابم ، وە شەونوێژیش دەکەم و دەشخەوم ، وە مافی خێزانەکانیشم دەدەم بەوەی خۆمیان لێ دوورنەخەمەوە ، هەر کەسیش لە سوننەتی من لابدات ئەوە لە من نیە .

فەرمووی : " أقرأ القرآن في كل شهر " واتە : قورئان لە هەموو مانگێکدا خەتم بکە...

وتم : توانای لە وەزیاترم هەیە .

فەرمووی : " فاقرأ في كل عشرة ايام " دەی لە دە ڕۆژ جارێکدا خەتمی کە .

وتم : توانای زیاتر لەوەشم هەیە . فەرمووی : " فأقرأه في كل ثلاث " دەی لەماوەی سێ ڕۆژدا خەتمی کە . و پاشان فەرمووی : " صم في كل شهر ثلاثه ايام " لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە .

وتم : لەوە زیاتریش ئەتوانم .

دەڵێت : بەردەوام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵمدا هات ، تا فەرمووی : " صم يوماً و افطر يوماً افضل الصيام ، و هو صيام اخي داوود " [1]

ڕۆژی نا ڕۆژێ بەڕۆژوو بە ، و ئەوە باشترین بەڕۆژوو بوونە و ( داود )ی برایشم هەربەو جۆرە بەڕۆژوو دەبوو .

---

[1] – پیاوانی جێ متمانەن : احمد ( المسند ) دا ( ٢ / ١٥٨ ) .

**پاشان فەرمووی :**

" فإن لكل عابد شرة ، و لكل شرة فترة ، فأما الى سنة و اما الى بدعة فمن كانت فترته الى سنة فقد اهتدى ، و من كانت فترته الى غير ذلك فقد هلك " [1]

**هەر عئەبودێك گورجوگۆڵی و سەرگەرمی یەکی تیایە ، و هەر سەرگەرمیەکیش یان خواستێك کاتێکی تیایە مرۆڤ لەشی خاوە ، جا ئەو ماوەیە یان بەرەو سوننەتی دەبات یان بەرەو بیدعە ، لەبەر ئەوە هەر کەسێ ماوەی وچان و سستی یەکەی بەرەو سوننەتی بەرێت ئەوە رێنمونی کراوە ، و ئەوەشی بەرەو بیدعەی بەرێت ئەوە تیاچووە .**

**پێشەوا زەهەبی رەحمەتی خوای لەسەر بێت ، دەڵێت :**

**کەمترین پلەکانی رێگری کردن ئەوەیەکە قورئان لە کەمتر لە سێ رۆژدا خەتم بکرێت ، هەرکەس ئەوە بکات نەتێگەیشتووە و نە کاری پێ کردووە .**

**خۆ ئەگەر لە ماوەی حەفتەیکدا دەوری قورئان بکاتەوە و بەسەری بکاتەوە و لەسەری بەردەوام بێت ئەوە کارێکی باشە ، چونکە لە راستیدا ئاین ئاسانە و گران نیە .**

**سوێند بەخوا حەوت یەکی قورئان بەسەر بکرێتەوە لە شەو نوێژێکیشدا لەگەڵ پارێزگاری کردن لە سوننەتەکانی رۆژانە و نوێژی چێشتنگا و ( تحیە المسجد ) لەکاتی چوون بۆ مزگەوتدا سەرباری زیکرەکانی ( مأثورات ) و زیکرەکانی رۆژانە و شەوانە و لەگەڵ بەدوادا چوونی زانستێکی بە سوود و خۆسەرگەرمکردن پێیەوە بە دڵسۆزی لەبەر خوا ، هەروەها فەرمان کردن بە چاکە و رێنمونی کردنی نە شارەزا و بێ ئاگایان و تێگەیاندنیان و رق لێ بوونەوە و سەرزەنشت کردنی ( فاسق )ان و ئەو جۆرەشتانە ، لەگەڵ بە جێ هێنانی فەرزەکاندا ( ئەرکەکاندا ) بە ملکەچی و دڵنیایی و بڕوای پتەوەوە و خۆپاراستن لەگوناهە گەورەکان و زۆر دوعا کردن و داوای لێخۆشبوون لەخوا و راست بێژی و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و خۆ بەکەم زانین و دڵسۆزی لە هەموو کارەکاندا ، ئەمانە کارگەلێکی هەرە گەورە و مەزنن و لە پلەی راستڕەوان و ئەولیاکانی خوایە و هەموو ئەمانەش داوا کراون .**

**هەر بەندەیەکی خوا هەموو رۆژێکی بە خەتمی قورئان تەواو کات ئەوە لە ئاینی راست و ( حەنیف ) لایداوە ، لەو قورئانە نەگەیشتووە و کاری پێ نەکردووە کە دەیخوێنێتەوە ، وە ئەم پیاوە مەزن و عئەبودە بەرێزە – عبداللە کوری عەمر ( رضي الله عنه ) کاتێ**

---

[1] – صحیح / ابی عاصم ریوایەتی کردوە ، وە ئیبنو جبان صحیح کەیدا بڕیانە : ظلال الجنە .

چوو بە ساڵدا دەیفەرموو : – خۆزگە ئەو دەرفەت و مۆڵەتانەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی دابووم و بۆی خستمە ڕوو قبوڵم بکردایە[١] .

## " زانستی ( ﷺ ) "

لە ئەبو هریرەوە ( ﷺ ) دەڵێت : " هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە من شارەزاتر نەبوون لە فەرمودەدا و هێندەی منیان لەلنەبوت ، بێجگە لە (عبداللە ی کوڕی عەمر) ، چونکە ئەو دەینووسیەوە و من نەمدەنووسیەوە[٢] " وە لە ( عەمری کوڕی شیبە )ەوە ، لە باوکیەوە ، لە باپیریەوە – عبداللە ی کوڕی عمر – ( ﷺ ) ، دەڵێت : " پرسیم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەی پێغەمبەری خوا( ﷺ) ! هەر شتێکم لە تۆوە بیست و گوێم لێت بوو بینووسم ؟

فەرمووی : ( نعم ) بەڵێ ..

وتم : لەکاتی ڕەزامەندی و تووڕەییشدا ؟

فەرمووی : " نعم ، فإني لا اقول الا حقاً "[٣]

واتە :بەڵێ ، چونکە هیچ کات لەهەق زیاتر ناڵێم – لە هەق لانادەم – .

## " گریانی عبداللە و شتێك لە ئامۆژگاری "

لە عبداللە ی کوڕی عەمری عاصەوە ، دەڵێت : یەك دلۆپ فرمسێك بڕێژم لە ترسی خوا ، لەلام خۆشەویسترە لەوەی هەزار دینار ببەخشم[٤] .

لە عبداللە ی کوڕی ئەبو مەلیکەوە لە عبداللە کوڕی عەمرەوە ، دەڵێت : " ئەگەر تەواو شارەزا بوونایە ئەوا ئەوەندە کڕنووشتان ئەبرد تا پشتتان دەشکا ، ئەوەندە هاوارتان ئەکرد تا دەنگتان دەبچڕا ، کەواتە بگرین ، ئەگەریش گریانتان نەهات هەوڵ بدەن خۆتان بگریەنن[٥] .

---

[١] – صحیح : بوخاری ( ٤ / ١٨٩ ، ١٩١ ) ، وە بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٨٤ ) .

[٢] – صحیح : بوخاری ( ١ / ١٨٤ ) ، لە ( العلم دا بابی ( کتابە العلم ) .

[٣] – صحیح : احمد ( ٢ / ٢٠٧ ) و ئیبنو عبدالبر لە ( جامع بیان العلم ) ( ٨٩ ) .

[٤] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣٢٤ ) .

[٥] – بڕوانە صفة الصفوة ( ١ / ٣٢٤ ) .

## " عبدالله ( رضي الله عنه ) پەشیمانە "

لە یەکێ لە بۆنەکاندا ... عەمری کوڕی عاص سکاڵای عبدالله ی کوڕی لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد .. ئەویش بە عبدالله ی فەرموو : " أطع اب اك م ادام حي اً " گوێڕایەڵی باوکت بە تا زیندووە .

پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کردوو ڕەوڕەوەی ژیان تێپەڕی و لەکاتی شەڕی ( صفین ) دا عبدالله ی کوڕی عەمر لەگەڵ باوکیدا بوو لە سوپای ( معاویە دا (رضي الله عنه)و ئامادەی شەڕ بوو بە بێ ئەوەی شمشێرێ بوەشێنێ یان تیرێ بهاوێژێت معاویەش پێی وت : جا بۆ چی هاتووی لەگەڵماندا ؟

وتی : " لەبەر ئەوەی باوکم جارێك سکاڵای منی کرد لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش فەرمووی : گوێڕایەڵی باوکت بە هەتا ماوە " ئێستاش من لەگەڵتاندام ، بەڵام شەڕ ناکەم [1].

لەگەڵ ئەوەشدا .. ئەیفەرموو " ئاخر من چیمە بە ( صفین )ەوە ، چیمە بە کوشتاری موسڵمانان ، خۆزگا پێش بیست ساڵ – یان دەساڵ – بەر لەم شەڕە من بمردمایە ، بەڵام سوێند بەخوا نەشمشێرم وەشاندووە و نەتیرم هاویشتووە [2].

## " عبدالله ( رضي الله عنه ) دەگری ! "

لە عبیدی کوڕی سعیدەوە ، لەگەڵ عبدالله کوڕی عەمر دا هاتە (مسجد الحرام) و کەعبەش سوتا بوو پاش کشانەوەی سوپای ( حصینی کوڕی نمیر ) و بەردەکانی کەعبە هەڵوەریبوون . ئەوە بوو عبدالله هەستا و دەستی بەگریان کرد و فرمێسك بەڕوومەتیدا ئەباری و پاشان وتی :

" ئەی خەڵکینە ! سوێند بە خوا ئەگەر ئەبو هریرە هەواڵی ئەوەی پێ بدانایە کە ئێوە دەبنە بکوژی پێغەمبەرەکەتان و سوتێنەری ماڵی خوا ، ئەتانوت : کەس لە ئەبو هریرە درۆزنتر نیە ! ئەوا ئەو کارەتان کرد ، دە پۆل پۆل چاوەڕێی تورەیی خوا بن بەسەرتاندا و دەبینن چۆن بە یەکتاندا ئەدات "

---

[1] – سەنەدەکی( صحیح )ە/ احمد لە ( المسند ) ٢ / ١٦٤،و ارنؤوط بە( صحیح ) دایناوە سیر(٣/٩٢).

[2] – بڕوانە : سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٩٢ ) .

## " دەوڵەمەندی ( رضي الله عنه ) "

قەیدی نیە بۆ کەسی لە خوا ترس ئەگەر دەوڵەمەندیش بێت ، وە هەندیّ لە پێشینانمان دەیانفەرموو : ( ئەگەر هەژاران نەبوونایە بازرگانیمان نە ئەکرد یان – کاسبیم نەئەکرد – " پێشەوا ( ذهبي ) ڕەحمەتی خوای لەسەر بیّ ، دەڵێت : " " عبدالله کێشێکی زۆر لە زێری میصری لە باوکیەوە بە میرات بۆ مایەوە . و لە هاوەڵە زۆر دەوڵەمەندەکان بوو[1] . نووسەر دەڵێت : وە ئەم دەوڵەمەندی یە بەرهەمی خەباتە لە پێناوی خوادا و بەرهەمی ئەو زەوی یە ئازاد کراوانەیە کە ئیسلام ئازادکردبوون .

## " ئەمەکداری بۆ پەیمانەکانی لە کاتی وەفاتیدا "

لە ( هارونی کوڕی رئاب ) ەوە ، دەڵێت : " کاتیّ عبدالله ی کوڕی عومەر کەوتە سەرە مەرگ ، فەرمووی : لە ڕاستیدا پیاوێك هاتبووە خوازبێنی کچەکەم و منیش شێوە پەیمانێکم پیّ دابوو کە پێی بدەم ، سوێند بەخوا نامەویّ بە سیّ یەکی دوڕوویی یەوە بە خوای خۆم بگەم ، شایەت بن کە من کچەکەمم پیّ دا "[2]

## " وەفاتی "

یحیی کوڕی بکیر ، دەڵێت : عبدالله ( رضي الله عنه ) لە میصر وەفاتی کردووە و لە ماڵە بچوکەکەیدا سپاردە کراوە ساڵی ( ٦٥ )ی کۆچی .

مامۆستا شعیب ی ئەرنەئووط دەڵێت : " ئەمە ڕاستە ، چونکە کندی لە کتێبی (الولاة ) ( ٦٤٥ ) چیرۆکی کوشتنی ( الاكدر بن حمام )ی گێڕاوەتەوە کە مروانی کوڕی حەکەم کوشتی ، کاتیّ هاتە میصر ساڵی ( ٦٥ ) ئەوەتە لە (موسای کوڕی علی کوڕی رباح )ەوە لە باوکیەوە ، دەڵێت :

لەبەردەم دەرگای ( مرواندا ) وەستا بووم کاتیّ ( ئەکدەر ) یان هێنا و کوشتنی (ئەکدەر) لە نیوەی دووەمی ( جمادی دووەمی ) ساڵی ٦٥ ی کۆچیدا بوو ، هەر ئەو

[1] – بڕوانە / سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٩٠ ) .

[2] – بڕوانە : صفة الصفوة ( ١ / ٣٢٥ ) .

ڕۆژەش بوو عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص وەفاتی کرد ، بە هۆی هەڵگیرسانی ئاژاوەوە لەلایەن سەربازەکانەوە دژی مەروان نەتوانرا جەنازەکەی بریتە دەرەوە بۆ گۆڕستان ، لەبەر ئەوە لە ماڵەکەیدا سپێردرا "[1] ڕەزای خوای لەسەر بێت ...

بە ژیانی ئەم هاوەڵە بەڕێزە بەشی یەکەمی کتێبەکەمان تەواو دەبێ کە تایبەت بوو بە " کەڵە پیاوانێك لە دەوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

[1] - پەراوێزی ( سير اعلام النبلاء ) ( ٣ / ٩٤ ) .

## بەشی دووەم

## " ژیانی شاژنانی دەوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

پێشەکی :

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان ( ﷻ ) و درووود و سەلام لەسەر ئەو کەسەی وەك ڕەحمەت نێرراوە بۆ هەموو جیهان ، سەروەرمان ( ﷺ ) و بنەماڵە و یارە پاك و فەزڵو گەورەیی و لەسەر دیاری شوێنکەوتوانی بە چاکە هەتا ڕۆژی قیامەت ...

لە پاشان.. ڕاست نیە کە دەوترێت ئافرەت لەسەرەتای ئیسلامدا لە سێ جار زیاتر نەچووەتە دەرەوە ، لە ناوسکی دایکیەوە بۆ دنیا و ، لە ماڵی باوکیەوە بۆ ماڵی هاوسەرەکەی و لە ماڵی هاوسەرەکەیەوە بۆ ناو گۆڕەکەی !!! بەراستی ئەمە وتەیەکی هەڵبەستراوە .

هەروەها ئەمەش ڕاست نیە کەلەسەر زاری خاتوو عائیشە ( ﵂ ) گوایە دەربارەی ئافرەتان فەرموویەتی : " مەهێڵن لە ژووره بەرزەکاندا نیشتەجێ ببن ، و فێری نووسیان مەکەن !!!! " بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە ئافرەت لە ژێر سێبەری ئەم ئایینە نەمرەدا هەموو مافەکانی خۆی وەرگرتووە و هاوبەشی ئەم نەتەوەی بوون لە هیواو خەمەکانیدا ...

هەر لە ژێر سێبەری ئەم ئاینە مەزنەدا ئافرەتانی تێکۆشەر و خواپەرست و زانامان بینیوە .. ئیسلام مافەکانی و ناموسی پاراستووە ، ئەوانەش بابە کوشت چن کە ئیدیعای ئەوە ئەکەن بە درۆ کە ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا باڵی بڕاوە و مافی خوراوە !!! لە ڕووپەڕی ئەم لاپەڕانەی داهاتوودا لەگەڵ ئافرەتانێکی نەمر و باوەڕدار و چاکە خواز و زانا و خەباتکار دا دەژین ..هەر ئەمانەش خۆیان ڕاستترین بەڵگە و ڕوونترین بورهانن لەسەر گەورەیی ئەم ئایینە و نەمری بنەماکانی.. بەڕاستی خودا هەمیشە فەرمانی خۆی سەر دەخات .

سعد یوسف ابو عزیز

دانەر

## " ١ - خدیجەی کچی خوەیلید ( رضي الله عنها ) "

## " باشترین ئافرەتی جیهان "

دایکی ئیمانداران و سەرداری ئافرەتانی جیهان لەسەردەمی خۆیدا ، دایکی قاسم، کچی خوەیلیدی کوڕە ئەسەدە ، خانمی قورەیشی ئەسەدی و دایکی منداڵەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و یەکەمین کەسە کە باوەڕی پێی هێناو بەڕاستی زانی .

پێشەوا زەهەبی دەڵێت :

فەزڵو گەورەیی زۆرن ، یەکێکە لە ئافرەتە کامڵەکان .. ئافرەتێکی ژیر و پایەبەرز و پارێزگاری ڕێزدارە .. و لە ئەهلی بەهەشتە .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەمیشە باسی چاکەی خدیجەی دەکرد و چاکەی ئەمی دەدابەسەر هەموو خێزانەکانی دیکەیدا ... هەر لەو ڕێزداری یەی کە هەیبوو لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوە بوو کە پێش ئەو هیچ ئافرەتێکی نەخواستبوو ، و چەند مناڵێکی لێی بوو ، هەرگیزیش ژنی بەسەردا نەهێنا ... بەڕاستی خاتوو خدیجە باشترین هاوڕێ و هاودەم بوو بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .. و لە ماڵی خۆی پێ دەبەخشی و پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) بازرگانی بۆ دەکرد .

### " فەزڵ و گەورەیی "

١ - لە علی کوڕی ابو تالیبەوە ( رضي الله عنه ) دەفەرموێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو : " خير نسائها خديجة بنت خويلد ، و خير نسائها مريم بنت عمران[١] " واتە : باشترین ئافرەتانی دنیا خدیجەی کچی خوەیلیدە و باشترین ئافرەتانی دنیا مریەمی کچی عمران ە .

٢ - لە ئەنەسەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، دەفەرموێ : " حسبك من نساء العالمين مريم بنت عمران ، و خديجة بت خويلد ، و فاطمة بنت محمد و آسية امـ ـرأة فرعـ ـون[٢] " واتە : لە ئافرەتانی جیهان ، مریەمی کچی عمران و خدیجەی کچی خویلید و فاتیمەی کچی محمد و اسیای خێزانی فیرعەونت.

---

[١] - صحیح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

[٢] - صحیح : صحیحی سوننەتەکانی تیرمیزی ( ٣٠٥٢ ) .

٣ – لە ئەبو هریرەوە ( ﵁ ) فەرموویەتی :

جبریل ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و فەرمووی: ئەوە خدیجەیە وادێت بۆلات و جامێکی بەدەستەوەیە کە بڕێك پێخۆر و یان خواردنەوەی پێیە ، ئەگەر هاتە لات سەلامی پەروەرگار و سەلامی منی پێ بگەیەنە و مژدەی ماڵێکی لە بەهەشت پێ بدە کە بە قامیش دروست کراوە و نە ئازاری تێدا دەبینێ و نەماندوویی[1] .

## " هاوسەرگیری پیرۆز "

گەورە پیاوان و سەرۆکەکانی مەککە هەمیشە لە هەوڵدا بوون خاتوو خەدیجە بخوازن ، بەڵام ئەو ڕەتی دەکردنەوە و بە هیچ کامیان ڕازی نەبوو ، بەڵام ئەوەی ئەو دەیویست و دەیخواست لە گەورەماندا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیبینێتەوە ، لێرەدا ئەوەی لە ناخ و دەرونیدا هەبوو دەربارەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئاشکرای کرد بۆ هاوڕێکەی ( نفیسەی کچی منیە ) . ( نفیسە )ش چوو بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە ئەو ئافرەتە پاکە بخوازێت ( واتە خاتوو خدیجە )[2] و پێی وت : ئەی ( محمد ﷺ ) ٧ڕێگری یەکت هەیە بۆ هاوسەرگیری ؟ فەرمووی : " مابيدي ما أتزوج به " واتە : هیچ لە دەستمدا نیە ژنی پێ بێنم : ( واتە ماڵ و دارایم نیە مافی ژنەکەی پێ بدەم ). وتی : ئەی ئەگەر داوای ئەوەت لێ نەکرێ و بانگیش بکرێیت بۆلای جوانی و ماڵ و شەرەف و هاوشانی (کفاءة ) ، ئایا وەڵام نادەیتەوە ؟

فەرمووی : " فمن هي ؟ " دەی ئەوە کێ یە ؟

وتی : خدیجە .

فەرمووی : " وكيف لي بذلك ؟ " دەی چۆن ئەم کارە بکەم .

وتی : ئەمەیان دانێ بۆ خۆم .

ئەویش فەرمووی : " فأنا أفعل " دەی باشە ئامادەم . نەفیسە گەڕایەوە بۆ لای خدیجەی پاك و هەواڵی سەرکەوتنی لە کارەکەیدا پێداو خێرا هەواڵی ڕازی بوونی (محمد ﷺ)ی

---

[1] – صحیح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

[2] – خاتوو خدیجە نازناوی ( الطاهرە )ی لەناو ئافرەتەکانی مەککەدا بێ بەخشراوە ( سير اعلام النبلاء) ( ٢ / ١١١ ) ئەوە بوو خاتووە خەدیجە ( ﵂ ) پانزە ساڵ لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەورەتر بوو ئەو کاتە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تەمەنی بیست و پێنج ساڵ

پێ گەیاند سەبارەت بە هاوسەرگیری یەکە . خاتوو خەدیجەش ناردی بە دوای ( عەمری کوڕی ئەسەد ) ی مامیدا تاوەکو لە ( ﷺ ) مارەی کات .. ئەوە بوو هات و پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) لەگەڵ مالی عبدالمطلب هاتن بۆ داخوازی خاتوو خدیجە ، ئەبو طالب وتارێکی لە دانیشتنەکاندا دا ئەم چەند برگەیەی لێ وەردەگرین : -

لەپاشدا ، ئەم برازایەم ( محمدی کوڕی عبدالله ) لە شەرەف و چاکی و ڕێزداریدا هیچ پیاوێکی قورەیشی ناگاتێ .. ( ﷺ ) کەسێکە پێی ئاشنان و کەسەکانی دەناسن .. لە ڕاستیدا ئەو ڕەغبەتی لە خەدیجەی کچی خوەیلید هەیە و ئەویش بە هەمان شێوە ، وە هەرچەندە مارەیی پێتان خۆشە ئەوە لەسەر من . پاشان مامی خدیجە ( عمری کوڕی ئەسەد ) کە شێخێکی بەتەمەن بوو ، بە خۆشحالی یەوە ڕازی بوو ، وتی : " لە ڕاستیدا (ﷺ) کەسێکی ئەوەندە ڕێزدارە ڕەت ناکرێتەوە و هەمووان بە ئاواتیەوەن[1] .

## " هەڵوێستێك جێی ڕێزە"

لە عائیشەوە ( ﷺ ) دەفەرموێت :

یەکەمجار سروش ( وحی ) لە ڕێی خەونی ڕاستەقینەوە دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، هەر خەونێکی بدیایە هەروەك ڕۆژی ڕوناك دەهاتەدی پاشان چۆڵەوانیی لە لاخۆشەویست کرا و ئەوە بوو بە تەنها لە ئەشکەوتی ( حەرا ) دەمایەوە و پەرستشی تیادا دەکرد و چەندین شەو یەك لە دوای یەك توێشووی بۆ ئامادە دەکرا و لەوێ دەمایەوە بۆ پەرستش ، تا لە پڕ سروشتی بۆ هاتە خوارەوە لە کاتێکدا لە ئەشکەوتی (حەڕا) دا بوو ، فریشتەی بەڕێز ( جبریل ) هاتە لای و پێی فەرموو: " بخوێنەوە " فەرمووی :" خوێندەوار نیم " ، فەرمووی : " فأخذني فغطني حتى بلغ مني الجهد ثم ارسلني ، فقال : اقرأ ، قلت : ما أنا بقاريء فأخذني فغطني الثانية حتى بلغ مني الجهد ثم ارسلني فقال : اقرأ ، قلت : ما انا بقاريء ، فاخذني فغطني الثالثة حتى بلغ مني الجهد ثم ارسلني فقال : ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ(١)خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ(٢) ﴾ سورة العلق .

واتە : دەفەرموێ : گرتمی و گوشیمی تا ماندووی کردم و دوایی بەری دام و فەرمووی : بخوێنە ، گوتم : من خوێندەوارنیم : دیسان گوشیمیەوە تا ماندووی کردم و

---

[1] - نساء مبشرات بالجنه ( ١ / ٢١ ، ٢٢ ) مامۆستا / احمد خليل جمعه .

بەری دامەوە و فەرمووی : بخوێنە ، وتم : خوێندەواریم نیە ، بۆ سێیەم جاریش گوشیمیەوە تاوەکو ماندووی کردم و بەری دام و فەرمووی : ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ(١)خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ(٢) ﴾[1] سورة العلق .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەڕایەوە و هەمووگیانی هەڵدەلەرزی ، تاگەیشتە لای خدیجە ی کچی خوەیلید و فەرمووی : " زملونی ، زملونی " دامپۆشن ئەوانیش دایان پۆشی تا ترسەکەی نەما پاشان بە خاتوو خدیجەی فەرموو : ای خدیجە مالی ؟ " چیمە ، خدیجە ؟ " و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە پاشان فەرمووی : " لقد خشیت علی نفسي " ( بەراستی ترسام شتێکم بەسەر بێت ) .

خاتوو خدیجە فەرمووی : نەخێر ، مژدەت لێ بێت ، سوێند بەخوا هەرگیز خوا تووشی بەڵاو نا ئومێدت ناکات ، چونکە تۆ کەسێکیت پەیوەندیی خزمایەتی بە جێ دەهێنیت و سەر راست و ڕاستگۆیت و تەحەمولی هەموان دەکەیت و هاوکاری نەبووان ئەکەیت و ڕێزی میوان ئەگریت و هەمیشە لایەنگری هەق دەکەیت ( واتە ئەو کارەی چاک و باش نەبووبێت ئەنجامت نەداوە ) .

ئینجا خاتوو خدیجە دەست بەجێ بردی بۆ لای ( وەرەقەی کوڕی نەوفەل ) ی کوڕە مامی خدیجە ) ( ﷺ ) کە پیاوێك بوو لەسەردەمی جاهلیدا بوو بووە مەسیحی ( گاور ) و پەڕاوی عیبرانی دەنووسیەوە ؟ و لە ئینجیل شتگەلێکی نووسیبوەوە و شێخێکی بە تەمەن و نا بینا بوو .

خاتوو خەدیجە وتی : دەی کوڕە مام ، گوێ لە برازاکەت بگرە ! مەبەستی پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) وتی : دەی برازا چیت بینیوە ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی بینیبوی بۆی باس کرد ، ( وەرەقە )ش پێی وت : بەڕاستی ئەمە هەر ئەو خاوەنی ڕاز و نهێنیە یە کە خودا بۆ سەر موسا ناردیە خوارەوە ...
خۆزگە منیش پشکێکم لەو ئاینە بەردەکەوت ( ئەمام تا ئەوکاتەی ئەو ئاینە دادەبەزێت ) خۆزگە تائەوکاتە نە ئەمردم کە هۆزەکەت دەربەدەرت دەکەن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پرسی : "اومخرجي هم ؟ " مەگەر هۆزەکەم کاری وائەکەن؟

---

[1] – مانای ئایەتەکە / ئەی محمد ( ﷺ ) : بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە ، ئادەمیزانی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو

وتی : بەڵێ ! هەر پیاوێك ئەم پەیامەی تۆی هێنـەبو دوژمنایـەتی کراوە ... ئەگەر تا ئەوکاتە بە زیندوویی بمێنم هەتا بتوانم سەرت دەخەم پاشان زۆری نەخایاند ( وەرەقە) وەفاتی کرد و ( سروش )یش بۆ ماوەیەك نەهاتە خوارەوە[1] .

ئای چەند گەورەیە ئەم بەخششە چاوەڕوانکراوە و چەند مەزنە ئـەو نارەحـەتی و خەمانەی لە پێناویدا تووشی پێغەمبەری ئازیز ( ﷺ ) دەبێت !

هەڵوێستی خـاتوو خەدیجـەی خێزانـی ( ﷵ ) جـوانترین هەڵوێستە لـە ئافرەتێك چاوەڕوان بکرێت . بەڕاستی کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تووشی دڵـە ڕاوکێ بوو ئـەم ئـارامی دەکـردەوە و کـاتێ مانـدوو دەبـوو ، دەیحەوانـدەوە و فـەزڵو گـەورەیی وەبـیر دەهێنایەوە و دڵنیایی دەکردەوە کە کەسانی چاکەکاری وەك ئەو هەرگیز نائومێد نـاکرێن و کاتێ خوای پەروەردگار ئاکار گەلێکی باش و خوازراوی لە کەسێکدا بـەدی هێنـا دیارە کە دەیەوێت شایستەی ڕێزدار کردن و چاکە کردن بێت لەگەڵیدا . بەم (بۆچونە ) دروستە و بەم دڵە پاکەیەوە خاتوو خەدیجە بووە شایستەی ئەوەی پەروەردگاری جیهان بە ڕۆحی ئەمین ( جبریل )دا سەلامی بۆ بنێرێت[2] .

## " ئارامگریی خدیجە "

بەڕاستی خاتو خەدیجە نموونەیەکی جوانی ئـارامگریی نیشانداوە و سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـاوە لـە ئـەنجامی ئـەو ئـارامگری یـەی کـە هـەیبوو لـە یەکـەمین هـەنگاوەکانی گەیاندنی پەیامی خوایەتیدا ( ﷺ ) .

ئەوەبوو پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) هـەر دڵگرانـی و خەفـەتێکی ببوایـە لـە ئـەنجامی بیستنی وشەی ناشیرین و بەدرۆ زانینی و ڕەت کردنـەوەی لەلایـەن بێ باوەڕانـەوە ، ئـەوا بوونی خـاتوو خەدیجە ئـەو خەمـەی لادەبرد . حـاڵی خـاتوو خەدیجە لەگـەڵ پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) بەم شێوەیە بوو کە شاعیر دەڵێ :

و هي لاتنثني عن الحق صبراً        ودفاعاً عن خاتم الانبياء

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بانگی ئیسلامی ئاشـکرا کـرد ، قورەیش پەیوەنـدی لەگەڵ بەنی هاشم دابڕی و بەو جۆرە قەیرانـەکان سـەریان هەڵدا و گـەورە بـوون لـە نێـوان

[1] – صحيح : بوخاری و مسلم .

[2] – السيره / الغزالي ( ٩٣ – ٩٤ ) .

پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و سەرکێشی بت پەرەستیدا کە لە سەرکردەکانی قورەیشدا خۆی دەبینیەوە عەقڵ لەو کەللە خاڵی و پوچەیاندا تێك چوو ، و شڵەژا و هۆشیان نەما و تەنها لەبیری دەستدرێژی و ستەم و چەوساندنەوەی بێ دەسەلاتاندا بوون و دڵە بەتاڵەکانیان لە هەموو شتێك لەرزۆك بو بوو ، تەنها لە خراپەکاری و بت پەرەستیدا نەبێت ، بەلام موسڵمانان لە ئاست ئەمانەدا وێنەی چیا خۆڕاگری یان کرد .

دایکمان خەدیجە بەردەوام بەدوای پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) بوو ، وورەی پێ دەدا و هاوبەشی هەڵگرتنی ئەو ئازار و ئەشکەنجانەی بوو کە لە هۆزەکەیەوە تووشی دەبوو ، بە دەرونێکی ئارام و خۆگرەوە ، بە چاوەڕێی پاداشتی خوداوە .

تا خوای گەورە بڕیاری لەسەر لابردنی ئەم دابڕانە و ستەمکارانەیەی داو کۆتایی پێهێنا ، کە بووە شمشێرێك لە گەردنی موسڵمانە گەمارۆدراوەکاندا .

بەڵێ ئابلوقە کۆتایی هات ، ئەم ئافرەتە پاکەش بە ئەو پەڕی سەرکەوتوویی بەرهەمی ئارامی چنیەوە تا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەك خێزانێکی ئەمین و بەوەفا ژیانی خۆی بەسەر بەرێت[1] .

## " چاکخوازی ڕەسەن "

خاتوو خەدیجە نزیکەی چارەکە سەدەیەك لە پەنای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا مایەوە ، و لەو ماوەیە دا بەوەفاترین و چاکترین خێزان بوو بۆ هاوسەرەکەی وەك وتمان هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی بوو ، هەمیشە هەوڵی ڕەزامەندی و خۆشگوزەرانی ئەوی دەدا ، ڕێزی لە هەموو ئەوانە ئەگرت کە هاوسەرەکەی خۆشی دەویستن . هەر لەو بەخشندەی یانەی لێی دەگێڕنەوە ئەمە بوو .

کاتێ خەڵکی تووشی وشکە ساڵی یەکە هاتن و دوای ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد ... خاتوو ( حەلیمە سەعدیە )ی بەخێوکەری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و شیردەری ، بەسەردان هات بۆ ماڵیان ، کاتێ گەڕایەوە بەخۆی و حوشترێك بۆ ئاو بارکردن لەگەڵ چل سەرمالاتدا لە ماڵی خدیجە ( رضي الله عنها ) خواحافیزی لێ کرا کە لە ماڵ و سامانەکەی خاتوو خەدیجە پێی بەخشرا بوو[2] .

[1] – نساء مبشرات بالجنه ( ١ / ٣٥ ، ٣٦ ) بەدەستکاری یەوە .

[2] – هەمان سەرچاوە ( ١ / ٣٢ ) بە دەستکاری یەوە .

## " خواحافیزی "

دوای لابردنی گەمارۆ ستەمکارانە کە خاتوو خەدیجە ( رضي الله عنها ) زۆری نەخایاند فەرمانی بە جێهێنا و ڕۆحە پاکەکەی بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە بۆلای پەروەردگاری ... عروە دەڵێت : خاتوو خەدیجە ( رضي الله عنها ) سێ ساڵی پێش هیجرەت وەفاتی کرد و لە ( حەجون ) بە خاك سپێردرا .

## " ئەمەك و پیاهەڵدان "

وەفاتی خاتوو خەدیجە ، شوێنەواری لەسەر دەرونی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانا هەمیشە لە بیریدا بوو ، وە ناوی لەسەر زاری بوو ، هەموو ئەوانەی خۆشدەویست کە خەدیجەیان خۆشدەویست وەرێزی لەوانە ئەگرت کە ڕێزیان لە خەدیجە دەگرت .

خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران ( رضي الله عنها ) دەڵێت : جارێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی خەدیجەی کرد ، منیش تورە بوومو وتم : پیرە ! و ئەوە و ئەوە ... هەرباسی ئەکەیت ، ئەوا خوا لەو باشتری پێ داویت ...

ئەویش فەرمووی : " ما ابدلني الله خيرا منها ، لقد امنت بي حين كفر الناس ، و أشركتني في مالها حين حرمني الناس ، و رزقني الله و لدها ، و حرمني و لدغيرها "

فەرمووی : نەخێر ، خودا لە خەدیجە باشتری پێ نەبەخشیوم ، ئەو کاتێ باوەڕێ بە من هێنا ، خەڵکی بێ باوەڕ بوون و بەدرۆیان ئەخستمەوە ، ئەو لە کاتێکدا بەشداری پێ کردم لەماڵ و سامانیدا کە خەڵکی بێ بەشیان کرد بووم ، خودا لە ئەو منداڵی پێ بەخشیم و لە غەیری ئەو منداڵی پێ نەدام " عائیشە دەڵێت : منیش وتم سوێند بەخوا لەمەودوا هیچ گلەییت لێ ناکەم هەرچەندە باسی بکەیت [1] .

جارێك پاش وەفاتی خەدیجە ، ئافرەتێکی بەساڵا چوو کەیەکێ بوو لە هاوڕێکانی خەدیجە هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زۆر بەباشی پێشوازی لێ کرد و ڕێزی لێ ناو عاباکەی بۆ ڕاخست تا لەسەری دانیشێت و بەردەوام هەواڵ پرسی لێ دەکرد ، خەبەری چی یە و چی دەکات و.. ...هتد. دوایی پاش ئەوەی

[1] – احمد ڕیوایەتی کردووە ( ٦ / ١١٧ ، ١١٨ ) ( مجالد )ی تیایە کە لاواز و باقی پیاوانی فەرمودەکە پیاوانی جێ متمانەن .

ئافرەتەکە چووە دەرەوە عائیشە وتی : ئەم هەموو پێشوازی یە لەم پیرەژنە دەکەیت ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( انها کانت تأتینا أیام زمان خدیجة ، و ان حسن العهد من الایمان )[1] .

واتە : ئەمە کەسێکە لە کاتێکدا خەدیجە لە ژیاندا بوو ، سەردانی ئەکردین ، بەڕاستی پارێزگاری کردن لە پەیمان و هێشتنەوەی پەیوەندی باش ، لە باوەڕەوەیە. وە لە صحیحی موسلیم دا هاتووە ، لە عائیشەوە ( ﷺ ) ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەگەر مەڕێکی سەر ببڕیایە دەیفەرموو : ( أرسلوها الی اصدقاء خدیجة ) بینێرن بۆ هاوڕێکانی خەدیجە .

منیش جارێك ئەوەم لێ پرسی فەرمووی : ( اني لأحب حبیبها ) بەراستی خۆشەویستانی خەدیجەم خۆشدەوێ . ئایا چ وەفایەك هەیە بگاتە ئەم وەفایە ... ژیان چەند جوانە لە سایەی ئیسلامدا ، بەڵام زۆر کەس ئەمە نازانن .

[1] – حاکم ریوایەتی کردووە ، بەیهەقیش ( الشعب ) دا .

## " ٢ - فاتیمەی کچی اسد ( رضي الله عنها ) "

## " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە گۆڕەکەیدا ڕاکشاوە ، و بەچاکە باسی کردووە !! "

هاوەڵی بەڕێز فاتیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هشام ی کوڕی عبدمناف ی هاشمی دایکی علی کوڕی ئەبو تالب ( رضي الله عنه ) و خەسووی خاتوو ( فاتیمە )ی کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە مەککە . موسڵمان بووە و یەکێ بووە لە کۆچبەرە پێشینەکان و یەکەمین هاشمیە کە هاشمی یەکی بوو بێت .

### " پارێزگاری کردنی لە پێغمبەری خوا ( ﷺ ) "

کاتێ عبدالمطلبی باپیری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەستی بەوە کرد کە ئەجەلی نزیك بووەتەوە ، ئەبوتالیبی کوڕی ڕاسپارد کە ( محمدی کوڕی عبدالله )ی برازای بگرێتە خۆی ، لەوانەیە عبدالمطلب مەبەستی لەوە بووبێت کە دەستی سۆز و ئەمین لە ماڵی ئەبوتالیب دایە و بەتایبەت لەلای ( فاتیمەی ) خێزانی ، بۆ باش سەرپەرشتی کردنی (ﷺ) . ئەوە بوو فاتیمە ( رضي الله عنها ) ئەوپەڕی پارێزگاری لێ کرد و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا (ابو تالیب ) چاودێری یان لێ کرد و هەمیشە دەیبینی کە ئەو خواردنەی ( ﷺ ) لەگەڵ منداڵەکانیدا بەشداری لە خواردنیدا دەکرد بەبەرەکەت بوو[1] .

لە ڕاستیدا ئەم خاتوونە چاودێری یەکی تایبەتی ( ﷺ ) ی دەکرد و جیاواز لە هەموو منداڵەکانی !! ئەوەتا لە سیرەی ( الحلبیە ١ / ١٨٩ ) دا نووسەرەکەی باسی حاڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەکات لە ماڵی مامیدا و دەڵێت : (منداڵەکانی مامی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەلە خەو هەڵدەسان ڕوهەڵبزرکاو و سەر و پرچ هەڵپرسکاو و چاویان ڕیپوقاوی بوو ، بەلام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتێ لە خەو هەڵدەسا دەم و چاوی ڕەونەقی دەدا و چاوی پڕ لە کل بوو .

---

[1] - نساء مبشرات بالجنة ( ١ / ٥٩ ) .

## " وەفای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەکاتی مردنی ( فاتیمە ) دا ( ﷺ ) "

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ، دەڵێت : کاتێ فاتیمەی کچی ئەسەدی دایکی عەلی ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە ژوورەوە بۆلای و لەلای سەریەوە دانیشت و فەرمووی :**

" رحمك الله يا امي ، كنت بعد امي تجوعين و تشبعيني ، و تعرين و تكسيني و تمنعين نفسك طيبا و تطعميني ، تريدين بذلك و جه الله و الدار الاخرة "

**واتە : ڕەحمەتی خوات لێ بێت دایە ، لە پاش دایکم تۆ خۆت برسی دەکردو منت تێر دەکرد ، خۆت بێ بەرگ بووی ، بەڵام هەمیشە من پۆشراو بووم ، هەموو خواردنێکی باشت لە خۆت حەرام دەکرد و دەرخواردی منت دەدا ، هەموو ئەمانەش لەبەر خاتر خوا و ڕۆژی دوایی بوون .**

**پاشان فەرمانی کرد کەسێ جار بشۆردرێت ، ئەوجا ئەو ئاوەی کافوری تیابوو گەیشت، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە دەستی خۆی کردی بەسەریدا و کراسەکەی خۆی داکەند وکردەیەبەری فاتیمە ( ﷺ ) و بەو ( بوردە )[1] یەش بەسەر شانیەوە بوو کفنی کرد ، پاشان ئوسامەی کوڕی زەید و ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و عومەری کوڕی خەتاب و غوڵامێکی بانگ کرد بۆ گۆڕ هەڵکەندن ، ئەوانیش گۆڕەکەیان هەڵکەند ، تا گەیشتە گۆڕیچەکە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆی هەڵیکەندو بە دەستی خۆی خۆڵەکەی لابرد و کاتێ لێبووەوە لەناویدا ڕاکشاو فەرمووی :** " الله الذي يحي و يميت ، وهو حي لايموت ، اغفر لامي فاطمة بنت اسد ، ولقنها حجتها ، و وسع عليها مدخلها ، بحق نبيك و الانبياء الذين قبلي فإنك ارحم الراحمين " .

**واتە : " ئەی ئەو خودایەی کە دروستکراوەکان دەژێنیت و دەیانمرێنیت وە خۆی هەرگیز نامرێت ، لە دایکم فاتیمەی کچی ئەسد خۆشبەو زمانی پاراو کە بۆ پرسیارەکانی گۆڕ ، و گۆڕەکەی بۆ فراوانکە بە هەقی پێغەمبەرەکەت و ئەو پێغەمبەرانەی پێش من هاتوون ، چونکە بەڕاستی تۆ بەبەزەییترین کەسی " .**

**پاشان چوار جار تکبیری لەسەر کرد و دواتر لەگەڵ عەباس و ئەبوبەکری صەدیق دا ( ﷺ ) خستیانە ناو گۆڕەکەوە[2] .**

---

[1] – بوردە : جلوبەرگێکی خەتدارە – یان پۆشاکێکی خوری یە دەپێچرێت لە خۆوە بۆ سەرما .

[2] – هیثمی دەڵێت : طبرانی لە ( الكبيردو الاوسط ) ریوایەتی کردوە و لەناو یاندا ڕوحی و کوڕی صەلاح و ثقە ی کوڕی حبان و حاکم هەیە ، لاوازی یەکی تیایە باقیەکەیان جێ متمانەن و پیاوانی ( الصحيح )ن المجمع بە ژمارە ( ١٥٣٩٩ ) .

وە لە ئیبنو عەباسەوە ، دەڵێت :

کـاتێ فاتیمـەی دایکـی علـی ( رضي الله عنه ) وەفـاتی کـرد ، پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) کراسەکەی خۆی لەبەرکرد و لەگەڵیدا لەناو گۆڕەکەیدا ڕاکشا ، وتیان : ئەی پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) پێشتر ئەمەمان لە تۆ نەدیوە ! فەرمووی : " انه لم يكن احد بعد ئەبو طالب أبر بي منها ، انما البستها قميصي لتكسى من حلل الجنة و اضطجعت معها ليهوّن عليها[1] " .

واتە : لە ڕاستیدا لە پاش ئەبو تالب هیچ کەس هێندەی ئەم چاکەی بۆم نەبووە وە بۆیە کراسەکەی خۆمم لەبەر کرد تاوەکو لە جل و بەرگی بەهەشت بپۆشێ و بۆیە لەگەڵیدا لە گۆڕەکەیدا ڕاکشام تاوەکو ناڕەحەتی گـۆڕ لەسـەری سـووک بـێ . ڕەزای خـوا لەسـەر فاتیمەی کچی ئەسەد بێت ..

---

[1] – هیثمی دەڵێت : لە ( المجمع ) ( ٩ / ٢٥٧ ) دا طبرانی لە ( الاوسط ) دا ریوایەتی کردوە و تیایدا سەعدانی کوڕی وەلیدی السابری هەیە کە نەم ناسیوە ، جگە لەو هەموو پیاوانی تری فەرمودە کە جێ متمانەن .

## " ٣ - ( فاطمه )ی کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

## " ئەوەی ئازاری بدات ، ئازاری من دەدات "

خانمی ئافرەتانی جیهان لەسەردەمی خۆیدا و خانمێکی ناوخێزانی پێغەمبەرایەتی و لایەنی هەڵبژێرراو و لەلایەن خوداوە ، ( دایکی باوکی )[1] و کچی گەورەی دراوستکراوان ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و دایکی هەردوو ( حسنین ) . ماوەیەکی کەم پێش دابەزینی سروش ( وحی ) و پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە .

علی کوڕی ئەبو تالیب ( ﷺ ) لە مانگی ( ذي الحجة ) یان پێش ئەو مانگە و لە ساڵی ( ٢ ) ی کۆچیدا و دوای جەنگی بەدر مارەی کردووە .

ئیبن عبدالبر ، دەڵێت :

پاش جەنگی ئوحود گواستیەوە ، نووسەر دەڵێت : بەڵام ئەمە ناگونجێ ، چونکە علی هەروەك لە ( صحیحین ) دا هاتووە ، پێش جەنگی بەدر و ویستویەتی فاتیمە بگوازێتەوە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خۆشی دەویست و ڕێزی دەگرت و بەبینینی دڵخۆش دەبوو . فەزڵو گەورەیی خاتوو فاتیمە زۆر زۆرن ، خانمێکی بە ئارام و دیندار و چاکە خواز و پارێزکار و کەسێکی چاوتێر بوو( قانع ) ، و سوپاسگوزاری پەروەردگاری بوو .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتێ بیستی کە ئەبول حەسەن دەیەوێ کچی ئەبی جەهلی بەسەردا بێنێت ، تووڕە بوو . فەرمووی : " و الله لاتجتمع بنت نبي الله و بنت عـ ـدو الله ، و انمـ ـا فاطمة بصغة مني ، يريبني مارابها ، و يؤذيني ما اذاها [2]"

واتە : سوێند بەخوا نئەبو کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و کچی دوژمنی خوا پێکەوە کۆ بکرێنەوە ، فاتیمە پارچەیەکە لە من و هەرشتێ نیگەرانی بکات منیش نیگەران دەکات ، وە هەرشتێ ئازاری بدات ، منیش ئازار دەدات .

( علی )ش ( ﷺ ) وازی لە داخوازی یەکە هێنا لەبەر دڵی ( فاتیمە ) و هەرگیز ژنی بەسەردا نەهێنا و هەروەها لەو ئافرەتانەش لە غەزاکاندا بە دیل گیران و دابەش دەکران

---

[1] - لە ( اصابە ) لاپەڕە ( ١٣ ، ٧١ ) هاتووە خاتو فاتیمە نازناوی ( ام ابیها )ی لێ نرا بوو .

[2] - صحیح : بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( ٧ / ٦٧ ، ٦٨ ) و مسلم ( ٢٤٤٩ ) .

بەسەر جەنگاوەراندا ، لەوانەشی نەهێنایە لای خۆی ، بەڵام پاش وەفاتی (فاتیمە) ژنیشی هێنا و کەنیزەکیشی هەبوو ( ﷺ ) .

## " فەزڵ و گەورەیی "

١ – عائیشە ( ﵂ ) دەفەرموێت : –

جارێك فاتیمە هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تەواو هاوشێوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێی دەکرد ، ئەویش هەڵسایەوە و فەرمووی : " مرحبا بإبنتي "[1] واتە : سڵاو لە کچەکەم ...

٢ – لە ئوم سەلەمەوە ( ﵂ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەرگێکی دابەسەر هەریەکە لە حەسەن و حسین و علی و فاتیمەدا و فەرموی : " اللهم هؤلاء ، أهل بيتي و خاصتي ، اذهب عنهم الرجس و طهرهم تطهيرا[2] "

واتە : ئەی خوای پەروەردگار ... ئەمانە خانەوادەی منن و خۆشەویستانی منن دەسا بە پاکی بیانهێڵەرەوە و ڕێگە مەدە پیسی توخنیان بکەوێت .

ئوم سەلەمەش فەرمووی : منیشیان لەگەڵە ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ فەرمووی " إنك على خير[3] " تۆیش لەسەر ڕێی چاکەیت . .

٣ - لە ئەبی سەعیدەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمویەتی : " لايبغضنا اهل البيت احد ، الا ادخله الله النار[4] " واتە : هەرکەس ئێمە ( واتە : خانەوادەی پێغەمبەرایەتی ) تووڕە بکات و ڕقابەرییان لە گەڵدا بکات ، ئەوە بێ گومان خوا دەیخاتە ئاگرەوە .

٤ - لە عائیشەوە ( ﵂ ) دەفەرموێ : هیچ کەسێکم نەدیوە هێندەی فاتیمە شێوەی قسەکردن و ئاخاوتنی لە قسە کردن و ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکات . وە هەر کاتێ فاتیمە بهاتایە بەژووردا ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەبەری هەڵدەسایەوە و ماچی دەکرد و بەخێر هاتنی لێ دەکرد فاتیمەش بەهەمان شێوەی دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ )[5] .

---

[1] – صحيح : ابوداود لە ( ٥٢١٧ ) تیرمیزی ( ٥٢١٧ ) ڕیوایەتیان کردوە بنچینەکەشی لە ( صحيحن ) دا هەیە .

[2] – صحيح بە شاهدەکانیەوە : صحیحەکانی تیرمیزی ( ٣٠٢٨ ) .

[3] – صحيح بە شاهیدەکانیەوە ، صحیحی ( ٣٠٢٨ ) .

[4] – حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ١٥٠ ) دەڵێت ئیسنادەکەی صحيح زەهەبیش هاوڕایەتی .

[5] – ئیسنادەکەی ( حسن )ە / ابو داوود و حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٣ / ١٥٤ ) زەهەبیش ڕای لەسەریەتی و دەڵێت صحيحە .

## " پێشڕەوی ئافرەتانی خەباتکار "

خەباتی فاتیمە ( ﵂ ) هەر لەگەڵ سەرەتای بانگەوازی ئیسلامیەوە دەستی پێ کرد ، لەوکاتەوە کە باوکی بەڕێزی ( ﷺ ) ئازار و ئەشکەنجەیەکی وەهای دەچەشت کە شاخەکان توانای هەڵگرتنی ئەو ئازار و ناڕەحەتیان نەبوو .

" لە یەکێ لە دانیشتنە بتپەرستی یە بەدڕەوشتی یەکانی بێ باوەڕاندا (عەقەبەی کوڕی معیط) گوێی لە چەند کەسێ لە گەوج و بێ مێشکەکانی قورەیش بوو ، وتیان ، کێ ئەم ( سلا )[1] یە دەبات و دەیخاتە سەر پشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتی کڕنووش بردنیدا .. ؟!

ئەوەبوو عەقەبە ، خوا سەر شۆڕی کات خۆبەخشانە هەستا بە ئەنجامدانی ئەو کارە نزم و ئەو ئارەزووە سووکەیان ، وتی : من ئەوە ئەکەم ، خێرا چوو هەڵیگرت و خستیە سەر پشتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە کاتی سوجدەدا ... سەروەرمان لە کڕنوشدا مایەوە تا هەواڵەکە گەیشتە ( فاتیمە ) و خێرا هات پیسیەکانی لەسەر پشتی پیرۆزی لابرد و جێگاکەی شۆرد .

هەروەها لە غەزای ئوحودا کاتێ بینی وا دەم و چاوی پێغەمبەری خوا( ﷺ) خوێنی لێ دەتکی .. خێرا چوو بۆلای و باوەشی پیاکرد و دەستی کرد بە سڕینی خوێنەکە بەدەم و چاوی پێغەمبەری خواوە ( ﷺ ) ، ئەویش ( ﷺ ) دەیفەرموو : " أشتد غضب الله على قوم دموا و جه رسول الله[2] "

واتە : تووڕەی و خەشمی خودا توندە لەسەر کەسانێك دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خوێناوی بکەن .. هەروەها ( فاتیمە ) ( ﵂ ) لە جەنگەکانی خەندەق و خەیبەر و ئازاد کردنی مەککەدا بەشداری کردووە .

---

[1] – سلا / ئەو پیسی یە یە کە لەگەڵ بێچوووی حوشتردا دێتە دەرەوە وەك ئەوەڵ مندالی ئافرەت ، و پیسی و خوێنێکی زۆری پێوەیە .

[2] – بیهقی گێڕایەوە لە ( دلائل النبوە ) دا ( ٣ / ٢٨٣ ) .

## " کاتێ باوکی بەرێزی وەفات دەکات "

لە عائیشەوە ( رضي الله عنها ) دەفەرموێ : -

ئێمە وەك خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای مابوینەوە و هیچ کاممان بە جێمان نەدەهێشت ، فاتیمە هات و بەجۆرێك رێی دەکرد دەقا و دەق وەك رێکردنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەوەبوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بینیی ... سڵاوی لێ کرد و فەرمووی : " سڵاو لە کچەکەم "

پاشان لە لای ڕاستی خۆی یان لای چەپی خۆی داینیشاند ، دواتر چرپاندن بە گوێی ( فاتیمە ) دا ، ئەویش دەستی بە گریان کرد ، دوایی شتێکی دیکەی دا بە گوێیدا ئەمجارە پێکەنی . ئەوە بوو کاتێ فاتیمە ( رضي الله عنها ) هەڵسا ، پرسیم : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تۆی جیاکردەوە و نهێنی خۆی لا درکاندی ، لە کاتێکدا دەگریایت ، سوێندت دەدەم پێم بڵێ بۆچی پێکەنیت و بۆچی گریایت ؟ فاتیمە وتی : ئەوە من نیم نهێنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بدرکێنم پاش ئەوەی وەفاتی کرد ، دووبارە لێم پرسی، وتم : سوێندت دەدەم ئەگەر پێم نەڵێیت ئەو ڕۆژە بۆچی گریایت و بۆچی پێکەنیت ؟

ئەوجا وتی : بەڵام ئێستا باشە پێت دەڵێم ، لە جاری یەکەمدا پێمی فەرموو : " ان جبريل كان يعارضه بالقرآن كل سنة مرة ، و انه عارضني العام في هذه السنة مرتين ، و اني لا أحسب ذلك الاعند اقتراب أجلي فاتقي الله و اصبري ، فنعم السلف لك انا "

واتە : جاران جوبریل ساڵی جارێك دەوری قورئانی پێ دەکردمەوە ، بەڵام ئەمساڵ دووجار ئەوکارەی کرد ، ئەمە بەوە تێدەگەم کەوا ئەجەلم نزیك بووەتەوە .. تۆیش لە خوا ترس بەو ئارامگربە ، چونکە من باشترین پێشینەم ( سلف ) بۆ تۆ ..

دەڵێ : منیش گریام ، ئەویش کاتێ منی بینی نارەحەت بووم فەرمووی : " أما ترضين ان تكوني سيدة نساء العالمين ، او سيدة نساء هذه الامة ؟ "

واتە : ئایا ڕازی دەبی کە ببیت بە خانمی هەموو ئافرەتانی جیهان یان ببیت بە گەورەی هەموو ئافرەتانی ئەم ئوممەتە ؟ دەڵێت : منیش پێکەنیم [1] .

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، فاتیمە ( رضي الله عنها ) زۆر نارەحەت بوو .. دەگریا و ئەیفەرمو : ئای بابەگیان ! ( سەرە خۆشی لە جبریل دەکەین ).. ئای بابەگیان ! وەڵامی بانگی پەروەردگارت دایەوە ! ئای بابەگیان ! بەهەشتی فیردەوس جێگاتە .

[1] - صحيح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

وە پاش بە خاك سپاردنی پێغەمبەری ئازیز ( ﷺ ) ، فاتیمە ( رضي الله عنها ) فەرمووی : ئەی ئەوانەی هاودەمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوون چۆن دڵتان دێ خۆڵی بەسەردا بکەن[1] .

فاتیمە ( رضي الله عنها ) پاش پێنج مانگ یان نزیك پێنج مانگ لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد لە تەمەنی ( ٢٥ ) ساڵیدا و زۆر کەسیش دەڵێن کە ( ٢٩ ) ساڵ زیادە ، بەڵام یەکەمیان ڕاستترە[2] .

ئەدەبی فاتیمە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا :

لە ( الشعبی )یەوە ، دەڵێت : کاتێ ( فاطمة ) نەخۆش کەوت ، ئەبوبەکر( رضي الله عنه ) هات و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگرت ، علی فەرمووی : ئەی فاتیمە ئەمە (ئەبوبەکرە ) دەیەوێ بتبینێت ، فاتیمەش ( رضي الله عنها ) فەرمووی : پێت خۆشە بێتە ژوورەوە ؟

( علی ) ش فەرمووی : بەڵێ ..

ذهبي ، دەڵێت :

فاتیمە ( رضي الله عنها ) بە پێی سووننەت هەڵس و کەوتی دەکرد و بەڕەزامەندی هاوسەرەکەی نەبوایە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کەسی نەدەدا بۆ ماڵی مێردەکەی . با خەلیفەی پێغەمبەری خوایش بێت ( ﷺ ) .

نووسەر دەڵێت : داخۆ ئەم ئەدەب و ڕەوشتە ئیسلامی یە بەرزە لەم سەردەمەماندا لە کوێ یە .. کە ماڵی زۆرێك لە موسڵمانان بووەتە پشێوی ئەخلاقی و ڕێز و کەرامەتی تیادا نەماوە و ناموس پێشێل کراوە . " ڕەزای خوا لەسەر فاتیمە "

---

[1] – صحیح / بوخاری لە صحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە ( ٨ / ١١٣ )

[2] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ١٢٢ ) .

# " ٤ – ئوم عمارە ( رضي الله عنها ) "

## " لە خەباتدا دەستی پەڕی !!! "

**ئوم عەمارە کێ یە ؟**

ئەم خاتوونە بەڕێز و تێکۆشەرە ( نسیبەی کچی کعب )ی ئەنصاریی خەزرەجی یە ( رضي الله عنها ) براکەی ( عبدالله ی کوڕی کەعب مازنی یە ) یەکێکە لەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە . هەروەها ( عبدالرحمن )ی برای لەوانە بوو هەمیشە چاو بە فرمێسك بوو لە ترسی پەروەردگاری . ئوم عەمارە لە شەوی عەقەبەدا بەشدار بووە ، هەروەها لە ئوحود و حودەیبیە و ( حنین ) و ( یمامە ) دا بەشدار بووە ، ئافرەتێکی تێکۆشەر بووە و لەشەڕدا کار گەلێکی ئەنجامداوە و لە جیهاددا دەستی بڕاوە[1] .

دکتۆر محمود عمارە ، دەڵێت :

" ئەوسا ئافرەتانی موسڵمان بەو شێوەیە بوون .. ئەو کاتەی دنیای موسڵمانان بەرەو پێش دەچوو .. ئافرەت ژیری دروست و جەستەی سەلامەت و ڕای پەسەندی هەبوو ، بەڵام پاش ئەوانە ، ئەوەیەك شوێنی گرتوونەتەوە لە ئافرەتان کە جوانکاری یەکان دەم و چاویانی تێك داوە و ناو سك و گەدەی پڕ کردوون لە دەرمانی هاوردەکرا و جەستە ومێشکی خۆی بەشتی بێ بایەخ لاواز کردوە دەرئەنجامەکەشی .

جەستەیەکی بێ هێز ... ژیری یەکی نەماو کە جگە لە پاشماوەی دەمارگەلێکی شڵەژاو نەبێ کە هەرگیز بەرگەی دڵەڕاوکێ ناگرێ هیچی بۆنەماوە ... دواتریش نە ئەتوانێ هەڵسێ بە پەروەردە کردنێکی دروستی بۆ نەوەکانی ، نە ئەتوانێ هاوسەرێکی باش بێت[2] .

ئەفسانەی خەبات : خاتوو نسیبە لەگەڵ هاوسەرەکەی ( غەزییەی کوڕی عەمر ) و هەردوو کوڕەکەیدا بەشداری ئوحود یان کردووە ، لەو شەڕە دا بۆ ئاودان بە جەنگاوەرەکان چوو بوو ، کوندەیەکی پێ بوو دەیگێڕا و لەگەڵ ئەوەشدا شەڕیشی دەکرد و لە دوانزە لاوە بریندار کرا .

---

[1] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٧٨ ) .

[2] – تاملات فی السیرە النبویە ( ١٨٠ ) .

**پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیفەرموو :** ( لمقام نسيبة بنت كعب اليوم ، أي يوم أحد ، خير من مقام فلان و فلان ) .

**واتە : جێگای نوسەیبەی کچی کعب لەم ڕۆژەدا ، واتە لە ڕۆژی ئوحودا ، لە جێگای فلان و فلان باشترە . .**

**لەو ڕۆژەدا نوسیبە ( ﵂ ) پاڵەوانانە دەجەنگاو ، جلەکانی بەکەمەریەوە توند کردبوو تا سیازدە جار بریندار کرا .**

**خەمرەی کوڕی سەعیدی مازنی ، باسی نەنکی دەکرد کە لە ئوحوددا بەشداری کرد بوو ، بۆی گێڕابووە وە کە ( چاوی بە ئبنو قومیئە کەوت کە بەشمشێر دەیدا لە دەماری ملی نووسیبە ( ﵂ ) کە ئەمە گەورەترین برینی بوو ، یەك ساڵی تەواو تیماری دەکرد ، پاشان جارچی پێغەمبەری خوا(ﷺ)هاواری کرد بچن بۆ لای( حمراء الاسد)ەوە .**

**نوسەیبەش جلەکانی توند کردەوە و هەرچەندی دەکرد خوێنی برینەکەی نەدەگیرسایەوە ، ڕەزای خوای لێ بێت [1] .**

**ئوم عمارە دەڵێت :**

**ڕۆژی ئوحود بینیم پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە تەنها ماوە و چەند کەسێکی کەم نەبێ لە دەوری بوون کە ژمارەیان لە دەکەس تێپەڕی نەئەکرد . من و کوڕەکانم و هاوسەرەکەم لە دەروبەری ماینەوە و پارێزگاریمان لێ دەکرد لە کاتێکدا خەڵکی بە شکاوی هەڵدەهاتن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) منی بینی کە قەڵغانم پێ نەبوو ، کابرایەکیش لەولاوە خەریك بوو هەڵدەهات و قەڵغانێکی بەدەستەوە بوو پێی فەرموو :** ( ألق ترسك الى من يقاتل ) .

**قەڵغانەکەت بدە بە کەسێك شەڕ بکات . ئەویش قەڵغانەکەی دانا و منیش هەڵمگرت و بەردەوام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) م پێ دەپاراست .**

**ئای لەو ڕۆژە ئەسپ سوارەکان ( مەبەست پێی ئەسپ سوارەکانی قورەیش بو کە بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید دایان بەسەریاندا )چیان پێ کردین ، خۆ ئەگەر وەك ئێمە بە پیادەشەڕیان بکردایە ئەوا بەیارمەتی خوا تێکمان دەشکاندن ... ئەوە بو کابرایەك بەسەر ئەسپەکەیەوە بەرەو ڕووم هات و ویستی لێم دا منیش بە قلغانەکەم ڕێگریم کرد و نەیتوانی هیچ بکات و پشتی هەڵکرد ، عورقوب دای لە ئەسپەکەی ...**

[1] – ئیبنو سعد ( ٨ / ٤١٣ ) .

ئەویش لەسەری کەوتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوای کرد : ( یا ابن ام عمارة ، املك ، املك ! ) ئەی کوڕی ئوم عمارە ، دایکت ! دایکت )

دەڵێت : کوڕەکەم یارمەتی دام تا کابرام کوشت .

عبدالله ی کوڕی زەیدی کوڕی ئوم عمارە ، دەڵێت : -

ئەو ڕۆژە بریندار کرام و خوێنی برینەکەم نە ئەوەستایەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی برینەکەت ببەستە .

دایکم هات بۆ لام و برینەکەی بۆ بەستم و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕاوەستا بوو فەرموی : ( انهض بني ، فضارب القوم ) هەڵسە کوڕم ، لێیان دە ، بەردەوام دەیفەرموو ئەوەی تۆ بەرگەی دەگریت کێ هەیە بەرگەی بگرێت ، ئەی ئوم عەممارە!!

ئوم عمارە ، دەڵێت :

ئەوە بوو ئەو کابرایەی کە لە کوڕەکەمی دا بوو هات بەرەو ڕوومان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( هذا ضارب ابنك ) ئەمە بوو لە کوڕەکەتی دا ..

دەڵێت : منیش ڕێم پێ گرت و لە لاقیم دا و بەسەر ولأخەکەیەوە کەوتە خوارەوە .

پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) زەردەخەنەیەکی کرد ، تا کاکیلەیم بینی و فەرمووی : (أستقدت یا ام عمارة) ! واتە : ( بەڕاستی تۆڵەت کردەوە ) ئێمەش دەستمان بە لێدانی کرد هەتا گیانمان لێ بڕی و پێغەمبەر خوایش ( ﷺ ) فەرمووی : ( الحمدلله الذي ظفرك )[1] .

واتە: ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەری خستیت )وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەیری برینەکەی ئوم عمارەی دەکرد و بە کوڕەکەی دەفەرموو : ( املك املك ! أعصب جرحها ! اللهم اجعلهم رفقائي في الجنة ) .

واتە : دایکت ... دایکت ! برینەکەی بۆ ببەستە ! ئەی پەروەردگار بیانکە بە هاوەڵم لە بەهەشتدا .

ئوم عمارە دەڵێت : وتم ئیتر هیچ باکم نیە لە دنیا هەرچیم بەسەربێ [2] . پاش ئەوەیش کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد و بەرەو ڕەحمەتی پەروەردگاری ڕۆیشت، ئوم عمارە بەردەوام بوو لە تێکۆشان لە پێناوی ئاینەکەیدا و بەوەفا بوو بۆی تا دوایەمین هەناسەی .

---

[1] - ئیبنو سعد ( ٨ / ٤١٤ ) .

[2] - ئیبنو سعد ( ٨ / ٤١٤ ) .

لە ( محمد ی کوڕی یەحیای کوڕی حەببان )ەوە ، دەڵێت :

ئوم عمارە لە ئوحوددا لە دوانزە لاوە بریندار کراو لە ڕۆژی ( یەمامە ) دا دەستی پەری وهەر لەو ڕۆژەدا جگە لە دەستی ، لە پانزە لاوە بریندار کرا ، ئەوە بوو بەبرینداری هاتە مەدینە ، بینرا کە ئەبوبەکر ( ﷺ ) لەوکاتەدا کە پێشەوای موسڵمانان بوو ، سەردانی دەکرد و هەواڵپرسی لێ دەکرد [1] .

حبیبی کوڕی زەید ، کە موسەیلەمەی درۆزن شەهید کرد ، کوڕی ئوم عمارە بوو .

ڕ اش گەشتێکی موبارەکی پڕ لە بەرەکەت کاتی ئەوە هاتبوو ئەم جەستە ماندووە خەباتکارە بگاتەوە ئەو مەنزڵەی کە پەروەردگار پەیمانی پێدا بوون .

ئەوە بوو فەرمانی خوای پەروەردگاری بە جێ هێناو ڕۆحی پاکی بۆ ئەو جێیە فڕی کە پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ ﴾ سورة القمر ، آية (٥٥).

دەسا خۆشی لە خۆت ئەی ئوم عمارە .. خوداش لە لاوازی و کەم و کورتی ئێمە خۆش بێت ..

[1] – ئیبنو سعد ( ٨ / ٤١٦ ) .

## " ٥ - ئەسمائی کچی یەزید ( رضي الله عنها ) "

## " ڕۆژی یەرموک نۆ ڕۆمی کوشت !! "

کێ یە ؟

ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەنە ، دایکی عامر و دایکی سەلەمەی ئەنصاری ئەشهەلی یە . پورزای مەعازی کوڕی جەبەلە و یەکێکە لەوانەی بە یعەتیان داو یەکێکە لە تێکۆشەرەکان[1].

خاتوو ئەسماء بەڵگەنامەی ڕەوانبێژی لەلایەن هاوەڵە بەڕێزەکانەوە بەدەست هێناوە ئەوە بوو ئەم خاتوونە بەڕەوانبێژی و بە هێزیی دەربڕین و جوانیی ووشە ناسرا بوو ، هەروەها ئەوەش وای لێکرد بوو ئەم ئاکارانەی تێدا بەدی بێت و پێ ی بناسرێت ئەوە بوو کە ئەم بەڕێزە تێر ئاو بوو لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەتا ئەو پەڕی توانای لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا ژیاوە تاوای لێهات بە (خطیبة النساء ) ناو دەبرا ، ئەمەش جێگاو پلەوپایەیەکی تایبەتی لەلایەن ئافرەتانی ئەنصارەوە پێ بەخشی بوو[2] .

### " شاندی ئافرەتان "

ئەسماو ( رضي الله عنها ) هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە لەگەڵ هاوەڵانیدا بوو پێ ی وت : دایك و باوکم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) من نێردراوی کۆمەڵێك لە موسڵمانانم کە هەموویان هەمان قسەی من دەکەن و لەسەر رای منن ، بێگومانین کە خودا بۆ پیاوان و ئافرەتانی ناردوویت ، ئێمەش باوەڕمان پێهێنایت و شوێنت کەوتین ، ئێمەی ئافرەتانیش کە پەیوەست و پەردەنشینین و لە ماڵە کانماندا ماوینەتەوە و جێگای ئارەزووی پیاوانین و منداڵەکانیان بۆ هەڵدەگرین .

وە پیاوان بۆ جومعە و نوێژە جەماعەتەکان دێن و لە جەنازە و خەباتی ڕێ خوادا بەشدارن و بەمەش پلەیەکی زیاتریان هەیە ، کاتێ ئەوان دەچن بۆ جیهاد ، ئێمەی ئافرەتان ماڵ و ناموسیانمان پاراستووە و منداڵەکانیانمان بۆ پەروەردە کردوون ... داخۆ

---

[1] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٩٦ ) .

[2] – نساء مبشرات فی الجنه ( ٢ / ٢١٠ ، ٢١١ ) .

**ئێمەش بەشداری پاداشتی ئەوانین ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی :** ( هل سمعتم مقالة امراة أحسن سؤالاً عن دينها من هذه؟)

**واتە : تا ئێستا وتەی هیچ ئافرەتێکتان گوێ لێ بووە کە لەمە جوانتر پرسیار لەسەر دینەکەی بکات ؟**

**وتیان : بەڕاستی وایە ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، گومانمان نەدەبرد کە ئافرەتێك بەم شێوە دەربڕینە داوای مافی خۆی بکات .**

**پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕووی کردە ئەسماء و فەرمووی : -**

" انصر في يا اسماء و اعلمي من وارءك من النساء ان حسن تبعل احدا كن لزوجهـا و طلبـها لمرضاته و اتبا عها لموافقته ، يعدل كل ما ذكرت للرجال "

**واتە : بڕۆ ئەی ئەسماء و بەوانەش ڕابگەیەنە کە تۆیان ناردووە ، پێیان بڵێ کە باشی یان بۆ هاوسەرەکەیان و هەوڵدانیان بۆ ڕازی کردنی و شوێن کەوتنی ویست و فەرمانەکانی هاوسەرەکەی ، هاوتای هەموو ئەوانەیە کە بۆ پیاوان باست کرد . ئەسمائیش بەدەم وتنی : ( لا الـه الا الله ) و ( الله اكـبر ) ەوە بە خۆشی ئەو موژدەیەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی دان ، گەڕایەوە بۆلای ئافرەتان** [1] .

**وانەیەك لە گوێڕایەڵی هاوسەردا :**

**لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە ، دەڵێت :**

**لەگەڵ چەند کەنیزەکێکی هاوتەمەنمدا بووم ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دای بەلاماندا و فەرمووی :** ( اياكن و كفر المتعمين ) .

**واتە : نەکەن لە بەخشەکان و نیعمەتەکان ناسوپاس گوزار بن و بەکەم سەیری کەن .**

**من لە هەموویان ئازاتر بووم بۆ پرسیار کردن لێی ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت ناڕازی بوون و ناشوکری لە بەخششەکان چی یە ؟**

**فەرمووی :** لعل احداكن تطول ايمتها بين ابويها ، ثم يرزقها الله زوجاً ، و يرزقها منه و لـداً ، فتغضب فتكفر فتقول : ما رأيت منك خيراً قط [2].

---

[1] – نساء مبشرات بالجنه ( ٢ / ٢١١ ، ٢١٢ ) فەرموودەکە شاهیدی زۆرە و هەیە لەلای طبرانی بزار ، و بڕوانە الترغيب ژمارە ( ٢٩١٠ ) .

[2] – صحيح: بوخاری لە الادب المفرد ( ١٠٤٧ ) ڕیوایەتی کردووە و احمد لە ( المسند ) ( ٤ / ٣٥٧).

واتە : لەوانەیە یەکێکتان ماوەیەکی زۆر بە ڕەبەنی یا کچێتی ڕەبەن لە ماڵی باوکیدا بمێنێتەوە ، پاشتر خوا هاوسەرێکی پێ ببەخشێ و لەو هاوسەرە منداڵی پێ ببەخشێ ، کەچی تووڕە بێت و کوفر بکات و بڵێ : هەرگیز خێر و چاکەم لێ نەدیویت .

## " ئەسماء و خەبات لە پێناوی خوادا "

ئەسماء ( ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ) لە جەنگی ( یرموك ) دا بەشداری کردووە و دەوری باڵای هەبووە .

ئیبنو کثیر ، دەڵێت : -

" ئەوە بوو لەم ڕۆژەدا ئافرەتانی موسڵمان هەڵسان بەشەڕکردن و ژمارەیەکی زۆریان لە ڕۆمی یەکان کوشت و هانی مسوڵمانانیان دەدا و ورەیان بەرزدەکردنەوەو نەیاندەهێشت ببەزێن ، پێیان دەوتن : بۆ کوێ ئەڕۆن و ئێمە بۆ ئەو بێ باوەڕانە بەجێ دێڵن ... خۆ ئەوانیش هەر ئەوەندەیان بەس بوو کە ئەو ئافرەتانە سەرکۆنەیان ئەکردن ، خێرا دەگەڕانەوە بۆ ناو شەڕەکە [1] "سەبارەت بە ڕۆڵی ئەسماء وپشکی لەو شەڕەدا ، ئیبنو حەجەر لە (الاصابە ( ٤ / ٢٢٩ ) دا دەڵێت :

" ئەسماء ی کچی یەزیدی کوڕی سەکەن ، ئامادەی یەرموك بوو ، نۆ کەسی لە ڕۆمەکان بە دەسکی چەترەکەی کوشت .

هەروەها ئیمامی زەهەبی ، دەڵێت : بە پایە ( ستون )ی خێوەتەکەی کەس لە ڕۆمەکانی کوشت [2] .

خاتوو ئەسماء تا سەردەمی دەوڵەتی یەزیدی کوڕی موعاویە ژیاو دواتر گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری و وەفاتی کرد .

بەمەش لاپەڕەیەکی سپی لە مێژووی سەر بڵندی ئەم خانمە پێچرایەوە ، بەڵام کارەکانی بۆ هەمیشە وەك چرا و ڕووناکی دەردرەوشێتەوە بۆ هەر کەسێ ڕێنوونی وەرگرێت .

---

[1] - البدایە و النهایە ( ٧ / ١٣ ) .

[2] - سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٩٧ )

# " ٦ - ئوم سولەیم ( رضي الله عنه ) "

## " مارەی یەکەی ( ئیسلام ) بوو !! "

ناوی : الرمیصاء یان ( غمیصاء )ی کچی ملحان ... ی ئەنصاری خەزرەجی یە . دایکی ئەنەسی کوڕی مالکە ( رضي الله عنه ) .

مالك ی کوڕی نضری مێردی مرد ، پاشان ( ابوطلحة زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری بوو بە هاوسەری و هەریەکە لە : ابا عمیر و عبدالله ی لێ بوو .. ئوم سولەیم لە جەنگەکانی ( حنین و ئوحود ) بەشدار بووە و یەکێکە لە باشترینی ئافرەتان .

### " مارەیی یەکەی ئیسلامە !! "

لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : ئەبو تەڵحە داخوازی ئوم سولەیم ی کرد ، ئەویش وتی : ئەبو و ناکرێ شوو بە کەسێکی بێ باوەڕ ( مشرك ) بکەم ! مەگەر نازانی ئەی ئەبو تەڵحە کە خواکەتان کۆیلەکەی فلان کەس دروستی ئەکات ؟ ئەگەر ئاگری تێ بەردەن ئەسووتێ ؟ ئەنەس دەڵێت : ئەبو تەڵحە ڕۆیشت و ئەو قسانە لە دڵیدا مایەوە ، پاشتر هاتەوە بۆلای ئوم سولەیم و پێی وت : ئەوەی دوێنێ خستە بەردەستم قبوڵم کرد ( واتە : ئامادەم موسڵمان بم ) . ئەنەس دەڵێت : جگە لە موسڵمانبوونی ئەبا تەڵحە ئوم سولەیم هیچ مارەییەکی تری نەبوو [1] .

لە ڕیوایەتێکی نەسائی دا ، لە ئەنەسەوە ، دەڵێت :

ئەبو تەڵحە داوای ئوم سولەیمی کرد ، ئەویش پێی وت : بەخوا کەسی وەك تۆ ڕەت ناکرێتەوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە تۆ پیاوێکی بێ باوەڕیت ، منیش ئافرەتێکی موسڵمانم و بۆم حەڵاڵ نیە شووت پێ بکەم ، مەگەر موسڵمان بیت ، خۆ ئەگەر موسڵمان بوویت ، ئەوە مارەیی من بێت و هیچی ترم لێت ناوێت ، ئەویش موسڵمان بوو ، موسڵمان بوونەکەشی بووە مارەیی ئوم سولەیم .

---

[1] - بە ئیسنادێکی ( صحیح ) ئەویش لە ( طبقات ) دا بە ژمارە ( ٨ / ٤٢٦ ) سوچێکیشی لەلای احمد و نەسائی هەیە .

ثابت ، دەڵێت : هەرگیز گوێم لێ نەبووە ئافرەتێك مارەیی یەكەی وەك مارەیی ئوم سولەیم ڕێزدار بێت ، كە ئەویش ( ئیسلام )ە ، ئەوە بوو شووی پێ كرد و منداڵیشی لێ بوو.

## " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یاری لەگەڵ منداڵەكەیدا دەكات !! "

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە : –

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەردانی ئوم سولەیمی دەكرد ئەویش بڕێك خواردنی پێشكەش كرد كە بە دەستی خۆی دروستی دەكرد بۆی ...

برایەكی لە خۆم منداڵترم هەبوو كە نازناوی ( ئەبو عمیر ) ی لێ نرابوو ، ئەوە بوو ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەردانی كرد ین ، فەرمووی : ( مالي ارى ابا عمير خاثر النفس ؟ ) چیە وا ئەبا عمیر بێ تاقەت ئەبینم ...

ئوم سولەیم وتی : لە ڕاستیدا ئەبو عمیر ( چۆلەكەیەكی بچووكی ) هەبوو كە یاری لە گەڵدا ئەكرد ئێستا مردووە ، لەبەر ئەوە بێ تاقەتە ، پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) دەستی هێنا بەسەریدا و فەرمووی : ( يا ابا عمير ما فعل النغير )[1] واتە : ئەی ئەبو عومەیر ، بولبولەكەت چی لێ بەسەر هاتووە ؟

وە هەر لە ئەنەسەوە ، دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەئەچووە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵی ئوم سولەیم تا هۆی ئەمە یان لێ پرسی ، فەرمووی : ( إني أرحمها ، قتل أخوها معي )[2] واتە : ڕەحمم بۆی هەیە ، براكەی لەگەڵ مندا بوو شەهیدكرا ..

براكەشی ( حەرامی كوڕی میلحانە ) ، ئەو شەهیدەی كە ڕۆژی ( بئر معونە ) وتی : ( سوێند بە خوای كەعبە سەركەوتم ) ، كاتێ لە دواوە لێی دراو حەربەكە لە سنگیەوە هاتە دەرەوە ( ﷺ ) .

---

[1] – نغیر : بولبول .

[2] – ئیسنادەكەی ( صحیح ) ە / بوخاری و مسلم ریوایەتیان كردوە .

## " فەزڵ و گەورەیی ئوم سولەیم "

**لە جابری کوڕی عبدالله وە ( ﷺ ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :**
(رأيتني دخلت الجنة ، فإذا أنا بالرميصاء امرأة ئةبو طلمه ، وسمعت خشفة ، فقلت : من هذا ؟ فقال : هذا بلال ) [1].

**واتە : لەخەونـدا بینـیم برامـە نـاو بەهەشـت لـەوێ ( رومیـصا ) خێزانەکـەی ئـەبو تەلحەم بینی ، ، وە گوێم لە خشپە و جوڵەیەك بوو ، وتم : ئەوە کێ یە ؟ وتی : بیلال .**

## " خەباتی ئوم سولەیم "

**لە ئەنەسەوە ، دەڵێت :**

**ڕۆژی ( حنین ) ئوم سـولەیم خەنجەرێکی هـەڵگرت ، ئـەبو تەڵحـەش وتـی : بڕوانـە ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئوم سولەیم بەو خەنجەرەوە ، ( ئوم سـولەیم )یش وتـی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەگەر بێ باوەڕێك لێم نزیك بێتەوە ورگی پێ هەڵئەدڕم[2].**

## " ئارامگری یەکی جوان "

**ئارامگرتن چە ؟**

**ئیبنولقەیم دەڵێت : ڕەوشتێکی باشە لە ڕەوشـتەکانی دەروون و ڕێگری ئـەکات بـە هەڵسان بەکار گەلێکی نـەخوازراوو نەشیاو ، هـەروەك هێزێکـە لـە دەرونـدا کـە بـە هۆیـەوە یاخود بەبوونی کاروبارەکانی دەروون چاك و دروست دەبن .**

**هـەروەها ( ذوالنـون ) دەڵێـت : بریتیـە لـە دورکەوتنـەوە لـە سەرپێـچی یـەکان و سرەوتن و هێمنی لە کاتێکدا کە بەڵاو ناڕەحـەتی یـەکان دەگەنـە لوتکـە و خۆپیـشاندان بـە دەوڵەمەندی و بێ نیازی ، لە کاتێکدا هەژاری باڵی بەسـەر ژیانتـا کێشاوە[3] . ئـوم سـولەیم لە باش پێشوازیکردنی بەڵاو فەرمانی خوادا نموونەیەکی زۆر جوانی نیشانداوین .**

---

[1] – ئیسنادەکەی ( صحیح ) ە / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

[2] – ئیسنادەکەی ( صحیح ) ە / الطبقات ( ٨ / ٤٢٥ ) .

[3] – عدة الصابرين و ذخيرة الشاكرين ، ئیبنو القیم ( ١٤ ) .

ئەنەس دەڵێت :

کوڕێکی ئوم سولەیم کەوتبوو سەرە مەرگ ، و ئەبو تەڵحەش چوو بوو بۆ مزگەوت و هەتا هاتەوە کوڕەکەی وەفاتی کرد بوو ، بەڵام ئوم سولەیم وەك ئافرەتێکی باش وتی : هەواڵی پێ نەدەن کە کوڕەکەی وەفاتی کردووە .

پاشان ئەبو تەڵحە گەڕایەوە و ئوم سولەیم نانی ئێوارەی بۆ ئامادەکرد و خواردی وپاشان چووە لای خێزانەکەی . دواتر لە کۆتایی شەودا خێزانەکەی پێی وت : ئەی ئەبو تەڵحە لە بیرتە ماڵی فلاَن کەس فلاَنە شتیان بە خواستن ( استعارە ) وەرگرت و لای خۆیان هێشتیانەوە ، کاتێکیش خاوەنەکەی داوای شتەکەی لێ کردنەوە پێیان ناخۆش بوو ؟ ئەبو تەڵحەش وتی : بەڕاستی ئەوە بێ ویژدانی یە . ئەویش وتی : دەی کوڕەکەت سپاردەیەك بوو ( عاریە ) لەلایەن خواوە ، ئێستا بردویەتیەوە ، ئەبو تەڵحەش بەبیستنی هەواڵی مەرگی کوڕەکەی ، وتی : ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ و ستایشی خوای کرد . کە ڕۆژ بوویەوە و چوو بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : بارك الله لكما في ليلتكما.

" خوا شەوەکەتان لێ پیرۆزکات "

ئەوە بوو ئوم سولەیم سکی بوو بە ( عبداللە ی کوڕی ئەبی تەڵحە )وە ، بەشەودا منداڵەکەی بوو ، بە مندا ناردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ جامێ خورمای (عجوەدا) کە باشترین جۆری خورمایە ، کە گەیشتم خەریك بوو پیرۆزبایی لە ( ابا عرلە ) ئەکرد و ناوی لێ ئەنا ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا( ﷺ) ، ئوم سولەیم ئەمشە و منداڵی بوو .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە تەڕایی دەمی خۆی خورمایەکی جوی و خستیە ناو دەمی منداڵەکەوە و ئەویش نۆشی کرد و خواردی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : (حب الانصار التمر ) واتە : بەڕاستی ئەم ئەنصاریانە زۆریان حەز لە خورمایە .. وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ناوی لێ بنێ ، فەرمووی : ( ناوی عبداللە ) یە [1] .

---

[1] – ئیسنادەکەی ( صحیح )ە / الطبقات ( ٨ / ٤٣١ ) و بوخاری ( ٩ / ٥٠٩ ) و مسلم ( ٢١٤٤ ) .

## " ئارامگرێکی نمونەیی "

عبایە ، دەڵێت : هەر لەو منداڵە واتە ( عبدالله ) حەوت کوڕم هەبوون هەر هەموویان قورئانیان خەتم کرد بوو ( لەبەر بوو ) [1] .

خوا لە ئوم سولەیم ڕازی بێت و پاداشتی ئارامگرتنی بە بەهەشت و ناز و نعمەتەکانی بەهەشت بداتەوە .

[1] – ئیبنو سەعد ریوایەتیکردووە ( ٨ / ٤١٤ ) ارنؤوط دەڵێت : پیاوانی جێ متمانەن ( سیر ٢ / ٣١١ ) .

# " ٧ – ئوم حەرامی کچی ملحان(رضي الله عنها) "

# " ئەنصاریی شەهید "

خوشکی ئوم سولەیم و پوری ئەنەسی کوڕی مالیك و خێزانی ( عەبادەی کوڕی صامت )ە . لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆلامان ، من و دایکم و ئوم حەرامی پورم لە ماڵ بووین ، فەرمووی : ( قوموا فلأصل بکم ) هەڵسن با نوێژتان بۆ دابەستم . ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژی بۆ دابەستین لە غەیری کاتەکانی نوێژدا [١] .

## " شەهیدی بەڕێز "

ئوم حەرام ( رضي الله عنها ) لە سەردەمی خەلافەتی پێشەوا عوسماندا ( رضي الله عنه ) لە جەنگی (قبرص ) دا شەهید بووە ، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان سەرکردەی سوپاکە بووە ، ئەو ساڵەش ڕێکەوتی ( ٢٧ ) ی کۆچی بوو . لە ( ئەنەسی کوڕی مالیك ) ەوە ، دەڵێت : ئوم حەرامی کچی میلحان بۆی باسکردم کە : ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێش نیوەڕۆیەك لە ماڵیان سەرخەوێکی شکاند و کە لە خەوهەڵسا ، پێدەکەنی ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەبینم پێ دەکەنیت .. ؟ فەرمووی : عرض علي ناس من امتي يركبون ظهر هذا البحر ، كالملوك علي الاسرة . واتە : خەڵکانێکم لە ئوممەتەکەم نیشاندرا ، بەسەر دەریاوە دەڕۆیشتن ( یان بەسەرپشتی دەریاوە بوون ) هەروەك چۆن پادشایان لەسەر تەخت و عەرشن . ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، داوا لە پەروەردگار بکە منیش بکاتە یەکێ لەوانە . فەرمووی : أنت من الاولين ) تۆ لە پێشینەکانیت .

ئەوە بوو عەبادەی کوڕی صامت ئوم حەرامی هێنا ، و لەگەڵ خۆی دا بەدەریا بردی بۆ غەزا و لە گەڕانەوەیاندا هێسترێکیان لێ نزیك کردەوە تا سەرکەوێتەسەر پشتی ، هێسترەکە خستی بەزەویدا و ملی شکاند ( پێی بەگەردنیدانا ) و شەهیدی کرد . ڕەزای خوای لێ بێت [٢] .

---

[١] – صحیح / مسلم لە صحیحەکەیدا ( ٦٦٠ ) ڕیوایەتی کردووە .

[٢] – صحیح / بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردوە .

## " ٨ - ( زەینەب )"رضي الله عنها" ... دایکی ئیمانداران "

## "خوای پەروەردگار لەسەر و عەرشی خۆیەوە مارەی کردووە لە پێغەمبەری خوا( ﷺ )"

ئەم خانمە ، دایکی ئیمانداران ، زەینەبی کچی جەحشی کوڕی ڕیابە و کچە پوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و یەکێکە لە کۆچبەرانی پێشینە . ئومەیەی کچی عبدالمطلب ی کوڕی هاشم ، دایکیەتی ، یەکێکە لە ئافرەتە سەلارەکان لە ڕووی ئایین و لە خواترسی و بەخشندەیی و چاکە کردنەوەیە ( رضي الله عنها ) .

### " هاوسەرگیری زەینەب لەگەڵ زەیدی کوڕی حارثە دا "

کاتێ ئایینی ئیسلام هات ، یەکێ لە ئامانجەکانی نەهێشتنی جیاوازی بوو لە نێوان خەڵکیدا چونکە کەس چاکتر نیە لەکەس بە لە خواترسان ( تقوى ) و نەبێ.

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ویستی بە کردەوە ئەمە بە جێ بێنێت ئەویش بە دانی زەینەبی کچی جەحش کە کەسی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو بە خزمەتکارەکەی خۆی زەیدی کوڕی حارثە ، تاوەکو ئەو جیاوازی بە چینایەتی یە بێ بنەمایانەی کە هەبوون دارمێنێت و نەیهێڵێت ، ئەوە بوو ئەوە هات بە زەینیدا کە زەینەب لە زەیدمارە بکات . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داوای زەینەبی کرد بۆ زەید ، بەلام زەینەب چەند بۆچون و پرسیارێکی پێکدراو جیاوازی لەلا دروست بوو ، چۆن بتوانێ پێشوازی لەم هاوسەر گیری یە بکات لەگەڵ خزمەتکارێکدا ، لە کاتێکدا ئەم ئافرەتێکی خانەدانە ؟! بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی وت : ناتوانم پێی ڕازی بم ببێتە هاوسەرم ، لە کاتێکدا من کیژێکی خانم و خاتوونی قورەیشم [١] .

پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) فەرموی : ( فإني قد رضيته لـ لك ) لە ڕاستیدا من پێی ڕازیم بۆ تۆ ... ئەوە بوو هاوکات ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە :﴿ وَمَا كَانَ لِمُـ ؤمِنٍ وَلاَ

[١] – بڕوانە / نساء مبشرات بالجنه / بەشی یەکەم .

مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا(٣٦) ﴾ سورة الاحزاب .

**واتە : بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە ، کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا ، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە بەڕاستی بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە .**

**– ئیتر زەینەب لێرەدا نەیتوانی سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات . ئەوە بوو ڕازی بوو ، بویە خێزانی زەیدی کوڕی حارثە [1] .**

**پاشان جیاوازی و ناکۆکی دەستی پێ کرد لە نێوان ئەم دوو هاوسەرەدا .. و ژیان لە نێوانیاندا سەخت و گران بوو ... زەید دەهاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و سکاڵای لەسەر زەینەب دەکرد ، ئەویش ( ﷺ ) فەرمووی : ( إمسك عليك زوجك و اتق الله ) واتە : دەست بە خێزانەکەتەوە بگرە و لە خوا بترسە ، بەڵام ژیان لە نێوان ئەم دوانەدا بووە ئەستەم . دواتر ئەو ئایەتە دابەزی کە نەریتی ( تبني ) [2] یان پوچەڵ ئەکردەوە . ئەوە بوو ( جبريل ) سەلامی خوای لەسەر بێت ، هەواڵی دابووە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە زەینەب ئەبێتە خێزانی ، بەڵام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی خۆش نەبوو فەرمان بە زەید بکات ، زەینەب تەلاق بدات ، تا ئەم دواتر بیخوازێت ، و بەمەش لەناو خەڵکیدا وتی وتی ئەوە بلاَ دەبێتەوە کە ( محمد ) ژنی کوڕەکەی خۆی هێناوەتەوە [3] ..... ئەو ترسەی لە قسەی خەڵك وای کرد ئەوەی خوای پەروەردگار هەواڵی پێ دابوو بیشارێتەوە – کە ئەویش مارەکردنی زەینەبە لە پێغەمبەری خوا( ﷺ ) [4] ئەمە بووە هۆی ئەوەی پەروەردگار**

---

[1] – پێشەوای شەهید ( زەیدی کوڕ حارثە) کە پێشتر باسی ژیانیمان کردوو لە مۆتە . شەهید کرا .

[2] – تبنی / واتە بە کوڕی خۆ کردن .. بەو پێیەش هەرشتێکی لە نێوان باوك و کوڕدا هەیە بەسەر ئەم دوانەشدا جێ بەجێ بکرێت وەك ئەوەی کە باوك بۆی نی یە ژنی کوڕەکەی خۆی مارەکاتەوە پاش تەلاقدانی . ( وەرگێڕ ) .

[3] – ئەوەبوو خێزانی بەکوڕکراو حەلال نەبوو لەلایان .

[4] – بەڵام ئەوەی کە باس ئەکرێ ، گوایە زەید لەماڵ نەبووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە بۆ ماڵیان و لەوێ زەینەبی بە جوانی بینیوە و خۆشەویستی چووەتە دڵیەوە و لەکاتی گەڕانەوەدا ئەمەی فەرمووە ( سبحان الله العظيم ، سبحان مقلب القلوب ) هتد . ئەوە لە ڕاستیدا پوچەڵ و هەڵبەستراوێکی پیلانێگڕانەیە کە دوژمنانی دین پێی هەڵساون .. هەر دوژمنانی دین لەم جۆرە ڕیوایەتە درۆزنانەیان داڕشتوە و بەرگی

سەرزەنشتی بکات بەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ ...وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ ... ﴾ سورة الاحزاب ، آية ( ٣٧ ).

واتە : ئەی ( ﷺ ) شتێك لە دڵ و دەروونی خۆتدا دەشاریتەوە ، کە خوا دەیەوێ ئاشکرای) بکات ، لە خەڵکی دەترسیت ، بەڵام خوا پێشترە حسێبو بۆ بکەیت و لێی بترسیت . وە خوای گەورە بە فەرموودەکانی ، هۆی ئەوەی ئاشکرا کرد کە زەینەب لە ( ﷺ ) مارە بکات ، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ... لِكَيْ لاَ يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً ﴾ سورة الاحزاب ، آية ( ٣٧ ) .

واتە : بۆ ئەوەی هیچ شەرمەزاری و دڵتەنگی یەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێت بە هێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان ، کاتێ بێزار دەبن و پێویستیان بە یەکتر نامێنێ ، هەمیشە فەرمانی خوا جێبەجێ کراوە .. دوای ئەم ئایەتە ، زەید دووبارە هاتەوە بۆ ئەوەی سکاڵای زەینەب لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکات .. مۆڵەتی دابە جیابوونەوە لێی و تەلاق دانی .

### " زەواجی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ زەینەب دا ( ﵂ ) "

پاش ئەوەی زەید ، زەینەبی تەڵاقدا ( ﵂ ) .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە فەرمانی پەروەردگاری زەینەبی هێنا ...

خوای پەروەردگار ، دەرمووێ : ﴿ ... فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا ... ﴾ سورة الاحزاب ، آية ( ٣٧ ) واتە : جا کاتێك زەید ، بێزار بوو لە زەینەب و پێویستی پێ نەماو جیا بوونەوە ، ئێمە زەینەبمان لە تۆ مارە کرد ...

ئەوە بوو بە دەقی قورئانی پیرۆز ، خوای پەروەدگار زەینەبی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مارە کرد ، بەبێ سەرپەرشتیار ( ولی ) و بەبێ شایەت .. زەینەبیش هەمیشە شانازی بەمەوە دەکرد ، بەسەر دایکانی ئیماندارانەوە و دەیفەرموو : ئێوە ئەهل و بنەماڵەکەتان مارەیان بریون ، بەڵام من خوای پەروەردگار لەسەر و عەرشی خۆیەوە مارەی بریم .

---

خەیاڵ یان بەبەردا کردووە ، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێشتر بیویستایە بیخوازێت هیچ شتێك ڕێگری نەبوو ، چونکە کچە مامی بوو ، دەربارەی زەینەب هیچ شتێك لەلای شاراوە نەبووە .. بگەڕێرەوە سەر ئەم بابەتانە لە پەراوەکانی تەفسیر ی ( امام محمد ابو شهبە ) ( ٣٢٣ / ٨ ، ٣ ).

لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : زەید هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ سکاڵا ، ئەویش هەر دەیفەرموو : ( اتق الله و امسك عليك زوجك )[1] ئەنەس ، دەڵێت : ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شتێکی شاردبایەتەوە ، ئەوە ئەمەی ئەشاردەوە ، دەڵێت : زەینەب هەمیشە شانازی بە سەر خێزانەکانی تری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وە دەکرد ، ئەیوت : ئێوە ماڵە باوانتان مارەی کردوون ، من خوای پەروەردگار لەسەر و حەوت ئاسمانەوە مارەی کردووم[2]

بەو هاوسەرگیری یە پیرۆزە ، خاتوو زەینەبیش چووە لیستی دایکانی ئیمانداران ، لەوانەیشە ئەمە بەرەکەتی خوای گەورە بێت بۆ زەینەب بە هۆی فەرمانبەرداری کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی لە شوو کردنی بە زەید .

## " حیجاب ( بالاپۆشی ) "

یەکێ لەبەرەکاتی زەینەب ئەوە بوو بە هۆی ئەمەوە ئایەتی حیجاب دابەزی !!

لە ئەنەسەوە ، دەڵێت :

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زەینەبیی گواستەوە و نان و گۆشت حازر کرا و منیش نێرام بۆ داوەت کردنی خەڵك بۆ نانخواردن ، ئەوە بوو کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵك ئەهاتن نانیان ئەخوارد و ئەرۆشتن و پاشان کۆمەڵێکی تر ئەهاتن نانیان ئەخوارد و ئەرۆشتن ، بەردەوام خەڵکم داوەت دەکرد تاوای لێ هات کەس نەما بانگی بکەم .

وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، کەسێ نەبونەمەوە بانگی کەم ، فەرمووی : ( فأرفعوا طعامكم ) واتە : کەواتە نانەکەتان هەڵگرن و کۆی کەنەوە . سێ کۆمەڵ لە خەڵکەکە لە ماڵەوە مانەوە و گفتوگۆیان ئەکرد ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چوو بۆ لای خاتوو عائشە سەلامی کرد و فەرمووی : ( السلام عليكم أهل البيت و رحمة الله ) .

عائشە ( ﵂ ) فەرمووی : سەلام و رەحمەتی خوا لە تۆش بێت ، خێزانەکەت چۆن هەڵدەسنگێنیت ( یان چۆنە ) خوا لێتی موبارەك کات ؟

بەوجۆرە و بەرێزەوە سەری لە هەریەکە لە خێزانەکانی دەدا و سلاوی لێ دەکردن و ئەوانیش هەروەك عائشە ( ﵂ ) هەواڵپرسی یان دەکرد .. پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە ، بینی سێ کۆمەڵەکە هەر لە ماڵەکەیدان و خەریکی قسە کردنن ،

---

[1] – لە خوابترسە و دەست بە خێزانەکەتەوە بگرە .

[2] – صحیح / بوخاری ریوایەتیکردووە ( ١٣ / ٣٤٧ ، ٣٤٨ ) لە ( التوحید ) دا .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ش زۆر بە شەرم بوو ، هیچی نەوت و چووە دەرەوە و ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی عائیشە ،ئیتر نازانم عائیشە بوو هەواڵی پێ دا یان کێ کە خەڵکەکە چوونەتە دەرەوە ئیتر گەڕایەوە و قاچێکی خستە ئەو دیو دەرگا کە و قاچەکەی تری لە دەرەوە بوو هەر پەردەکەی هەڵدایەوە ، ئایەتی ( باڵاپۆش )ی بۆ هاتە خوارەوە [1] .

**خوای گەورە دەفەرموێت** : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ وَاللَّهُ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ سورة الاحزاب ، آية (٥٣) .

**واتە** : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ، مەچن بۆ سەردانی ماڵەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) مەگەر مۆڵەتتان بدرێت و مۆڵەت بخوازن ، ئەگەر مۆڵەت دران بۆ نانخواردنێك چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێنەگەیشتبوو ، بەڵام کاتێ بانگکران ، ئەوە بچنە ژوورەوە ، جا کاتێ نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و خۆتان بە گفتوگۆوە سەرگەرم مەکەن ، چونکە بەڕاستی ئەو کارەتان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئازار دەدات ئەویش شەرمتان لێ دەکات ( داوای چوونە دەرەوەتان لێ بکات ) ، خوایش شەرم لە ڕاگەیاندنی هەق و ڕەوا ناکات ، کاتێکیش داوای کەل و پەلێکتان لە خێزانەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) کرد ، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن ، ئاوا چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش بێگومان هیچکات بۆتان نیە ئازار و دڵتەنگی بۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) پێش بێنن ، هەرگیز بۆتان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێ مارە بکەن ، چونکە بێ گومان ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیە ( زۆر نابەجێیە ) ...

ئایەتەکە چەند ئادئەبوك سەبارەت بە چوونە ناو ماڵی خەڵك لە خۆ دەگرێت ، کە پێشتر جاهیلیەت ئەمەی نەدەزانی ، خەڵکی بە بێ مۆڵەت ئەچونە ماڵی خەڵکی ، هەندێکیان کاتێ خاوەنماڵ خواردنی بەسەر ئاگرەوە بوو ، دائەنیشتن تا ئەو خوانەی پێ ئەگەیشت و دواتر بە بێ خوڵك دائەنیشتن بۆ نانخواردن ، هەندێکیشیان دوای نان خواردنیش ئەمانەوە ، جا بانگ کرا بان یان بە زۆر خۆیان سەپاند بێ و دەستیان ئەکرد بە قسە کردن و حیکایەتکردن بە بێ ئەوەی هەست بەوە بکات بووەتە هۆی هەراسان کردنی بەرامبەرەکەی .

---

[1] – صحیح / بوخاری تەفسیری سوورەتی ( الاحزاب ) دا ریوایەتی کردوە ( ٦ / ١٤٩ ) .

ئەوە بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە تا خەڵکی فێری ئەوە بکات بە بێ مۆڵەت نەچنە ماڵەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وە . ئەگەر بانگهێشت کران بۆ خواردن با بچنە ژوورەوە، خۆ ئەگەر بانگنەکران ، نەچنە ژوورەوە بۆ چاوەڕێ کردنی پێگەیشتنی خواردنەکە ، دواتریش دوای نان خواردن خواحافیزی بکەن و نەمێننەوە قسەکردن و شەو بردنە سەر .

لە ڕاستیدا موسڵمانان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر پێویستمان بەم ئادابە هەیە کە زۆربەی خەڵکی پشتگوێیان خستووە ، زۆر لەوانەی بانگهێشت ئەکرێن ( داوەت ئەکرێن) دوای نانخواردن ئەمێننەوە ، بەڵکو لەسەر نانخواردنەکە دەست ئەکەن بە قسەکردن و درێژەی پێ ئەدەن ، خاوەنماڵیش کە شتێکی لە ئادابی ئیسلامی تێدایە و پارێزگاری لێ ئەکات ، شەرم دەکات ، و لەڕاستیشدا نارەحەت دەبن و کات دەژمێرن ، میوانەکانیش بەبێ هەست و شعور لە ناو قسەکردنی خۆیاندا ڕۆچوون .. لە ئادەبو ئیسلامیدا هەمیشە بۆ هەموو حاڵەتێك ڕێگاو چارەسەرێك هەیە ، ئەگەر دەستبگرین بەو پەروەردە خواییە ڕاستەوە .پاشان ئایەتی بالأپۆشی لە نێوان خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پیاواندا بڕیاردرا : ﴿ ... وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ... ﴾ سورة الأحزاب ، آية ( ٥٣ ).

وە پەروەردگار دەریخست کە ئەم بالأپۆشی یە خاوێنترە بۆ دڵی هەموان ﴿ ... ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ... ﴾ سورة الأحزاب ، آية ( ٥٣ ) .

ئیدی کەس غەیری ئەمە نەڵێت کەس نەڵێت تێکەڵاوی و لابردنی بەربەستەکان و ڕێگەدان و ئاسانکاری لە قسەکردن و یەکبینین و دانیشتن و بەشداری کردنی هەردوو ڕەگەز پێکەوە پاکترە بۆ دڵەکان و پاکیزەترە بۆ ویژدان و یارمەتیدەرترە بۆ نەهێشتنی ئارەزووە شاراوەکانیان ، لەوەی کە هەردوو ڕەگەز پەروەردە بکرێت و هەست و ڕەفتاریان ناسك بکرێتەوە ... تاکۆتایی هەموو ئەو قسە و قسەڵۆکانەی تر کە مرۆڤە لاواز و نەفامەکان دەیکەن .

ئیتر کەس لەم جۆرە قسانە نەکات ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ... وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ... ﴾ سورة الأحزاب ، آية(٥٣ ) .

وە ئەم واقیعەی ئەمڕۆ کە دەیبینی ، ڕاستی فەرموودەی خوا و درۆی ئەوانە نیشان ئەدات کە بانگەشەی غەیری ئەوە دەکەن کە خوا فەرمانی پێ کردووە ، هەروەك ئەزموونە نیشاندراوەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەسەرانسەری جیهاندا ڕاستی ئەمە دەسلمێنن کە دەیڵێین ، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە ڕادەی تێکەڵاوی ئازاد لەناویاندا

گەیشتووەتە ئەوپەڕی ، دیارترین بەڵگەیە کە ئیتر قسەی تیاناکرێ ( وە ئەمریکا یەکەمینی ئەو وڵاتانەیە کە تێکەڵاوی تیایدا ناشیرنترین دەرئەنجامی لێ کەوتوەتەوە ) [1] .

## " لێبوردەیی و بەخشندەیی خاتوو زەینەب ( ﷺ ) "

لە عائیشەوە ، دەفەرموێ:

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە ئێمەی ( خێزانەکانی ) فەرموو : یتبعني اطو لكن يداً )

واتە : ئەوەتان کە درێژترین دەستی هەیە ، شوێن من دەکەوێت ..

ئێمەش کاتێ کۆ ئەبووینەوە دەستمان درێژ ئەکرد لە پاڵ دیوارەکەوە تا بزانین کاممان دەستی لەوی تر درێژترە !! هەموو جارێ ئەمەمان دووبارە ئەکردەوە ، تاوەکو زەینەب ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، ئەو ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئافرەتێکی کورت بوو ، و لە ئێمە بەرزتر نەبوو ، ئەوسا زانیمان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مەبەستی بەخشین و درێژکردنی دەستی یارمەتی یە زەینەب دەسترەنگین بوو ، پێستەی خۆشە ئەکرد و موروچنی ئەکرد و خێری ئەکرد [2] .

زەینەب ( ﷺ ) لە مەبەستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تێگەیشت کە چاکە کردن و بەخشینە نەك درێژی و کورتی دەست .. ئەوە بوو هەمیشە کاری ئەکرد و ئەیبەخشی .. ئەوە بوو لە هەموو خێزانەکانی تر زوتر گەیشت بە لیقای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) . پێی ئەوترا ( ام المساكين ) [3].

## " بۆ لای پەروەردگاری بەبەزەیی "

لە ( بورزەی کچی رافع ) ەوە ، دەڵێت : ( عومەری کوڕی خەتاب ( ﷺ ) ماف و موچەکەی زینەبی ئامادەکردوو بۆی نارد ، ئەویش فەرمووی : خوا لە ( عمر ) خۆش بێت .. غەیری من بە تواناتر بو بۆ دابەشکردنی ئەمە ، وتیان : هەمووی بۆ تۆیە . فەرمووی : پاك و بێ گەردی بۆ خوا ! بەبەرگێك خۆی داپۆشی و فەرموی : داینێن و شتێکی بەن

---

[1] – في ظلال القرآن ( ٥ — ٢٨٧٧ ، ٢٨٧٨ ) بەدەستكاریەوە .

[2] – حاكم ریولیەتی كردووە و دەڵێت : صحیحه ( ٤ / ٢٥ ) زەهەبیش هاورایە .

[3] – دایكی نەداران

بەسەردا ، و دەستی کرد بە جیا کردنەوەی و دابەشی کرد بەسەر خزم و کەس و هەتیواندا و ئەوەشی مایەوە دای بە من .

سەیرمان کرد ( ٨٥ ) درهەمە ، پاشان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و فەرمووی : خوایە ، دوای ئەم ساڵە ئیتر بەخششی عومەرم پێ نەگات [١] .

هەروەها لە قاسمەوە ، دەڵێت : زینەب ، کاتی سەرەمەرگ فەرمووی : من کفنم بۆ خۆم ئامادە کردووە ، ئەگەر عومەر کفنی بۆ ناردم بیکەن بەخێر بۆ یەکێکی تر ، وە ئەگەر توانیتان ، کاتێ شۆڕتانکردمەوە بۆ ناوگۆڕ ، پشتوێنەکەم ببەخشن ، ئەوا ئەو کارە بکەن[٢] .

لە ساڵی ( ٢٠ )کۆچیدا گەڕایەوە بۆ پەنای پەروەردگاری .. و عومەر ( ﷺ ) نوێژ ی لەسەر کرد .

پێش ئەوەی کۆتایی بە نووسین بێنین لەسەر ژیانی ئەم خانمە بەڕێزە ، ئەو وتەیەی خاتوو عائیشە دەنووسین کە فەرموویەتی ( هیچ ئافرەتێکم نەدیبوو هێندەی زەینەب بە دین بێت ، لە هەمووان زیاتر تەقوای خوای ئەکرد و لە هەمووان ڕاستگۆتر و زیاتر سیلەی خزمایەتی بە جێ ئەهێنا و لە هەمووان بەخشندە تر و خێر و مەندتر بوو)[٣] .

ڕەزای خوای لەسەر بێت .

---

[١] – ( طبقات )ی ئیبنو سعد ( ٨ / ١٠٩ ) .

[٢] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢١٧ ) .

[٣] – صحیح مسلم ریوایەتیکردووە ( ٢٤٢٢ ) .

## " ٩ – ئوم حەبیبە ... دایکی ئیمانداران ( رضي الله عنها ) "

## " کۆچبەری خۆراگر "

کێ یە ؟

ڕەملەی کچی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە ... وە یەکێکە لە کچە مامەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، هیچ کام لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە خزمایەتیدا لەم نزیکتر نەبوو بۆی و لە هەموویشیان مارەیی زیاتر بوو ...

لە حەبەشە مارەکرا بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لە جیاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەجاشی ( ٤٠٠ ) دیناری بە مارەیی پێدا و چەند شتێکی دیکەشی وەك ( جیهازی) پێدا. هەروەك ئیبنو عەباس ( رضي الله عنه ) دەڵێت [١] : لەسەر ئوم حەبیبە و خێزانەکانی تری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەم ئایەتە بە تایبەتی هاتە خوارەوە : ﴿ ... إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ ... ﴾ سورة الحزاب ، آية ( ٣٣ ) .

واتە : بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێ هەموو ناپاکی و ناسازی و نادروستی یەك لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی خاو خێزانی ماڵی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بە تەواوی پاکتان بکاتەوە ... هەروەها پێشەوا زەهەبی ، دەڵێت : ( ئوم حەبیبە ڕێز و پلەوپایەیەکی مەزنی هەبوو ، بەتایبەت لەلای ( معاویە )ی برای و هەر بە هۆی ئەو جێگا و پێگەیەی لە ئوم حەبیبەوە بە معاویەیان دەوت ( خالی ئیمانداران ) [٢] .

### " زەواجی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ ئومو حەبیبە ( رضي الله عنها ) "

کاتێ ئومو حەبیبە موسڵمان بوو ( رضي الله عنها ) لەگەڵ مێردەکەی کە ( عبداللە ی کوڕی جەحش ) بوو کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ، لەوێ مێردەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بوو بە گاور ، ئیتر لەوێوە دەردەداریی ئوم حەبیبە گەورەتر بوو ، لەیەك کاتدا بەڵای ئاوارەیی لەلایەك و هەڵگەڕانەوەی مێردەکەی و جێ هێشتنی شار و نیشتمانەکەی لەلایەکی ترەوە بەسەردا کۆبووەوە ، ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە حاڵی ئاگادار بوو ، کەسێکی ناردەلای نەجاشی تا بۆی مارەکات و هەر لەوێ مارەیی پێ درا وەکە دڵنەوایی

---

[١] – سەنەدەکی ( حسن )ە / زەهەبی دەڵێت : سەنەدەکی ( صالح )ە ، سیر ( ٢ / ٢٢١ ) .

[٢] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٢٢ ) .

یەك بۆی و وەك وەفایەك بۆی بە هۆی ئەوەی لەو هەموو ناڕەحەتی یەدا خۆگربووە و كۆششی كردووە ... با ئەو درۆزنانەش بڵێن ( ﷺ ) هەر كەسێكی بویستایە لە ئافرەتان دەیهێنا ، بەهۆی پاڵنەری هەوا و تێركردنی ئارەزوو !! مەگەر ئەوە لەبەر ئارەزوو بووە ، بەڕێزان ؟! نەخێر ، بەڵكو بەڕاستی ئەمە هەڵوێستی پێغەمبەرانەكەوا دەكات لە خاوەن ویژدانەكان سەری كڕنووش لەبەردەم گەورەیی ئەم ئایینەدا نەوی كەن .. ئەوەشی كە سەیر و چاوەڕوان نەكراو بوو لێرەدا ئەوەیە ، كاتێ ئەبوسوفیان[1] هەواڵی ئەم هاوسەرگیری یەی بیست ، سەرەڕای ئەودژایەتی كردنەی كە هەیبوو بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و موسڵمانان ، بە شانازی یەوە وتی : ( بەڕاستی ( ﷺ ) كەسێكی ئەوەندە شیاوە ، هەرگیز (نا )ی پێ ناوترێت )[2] . هەروەها لە عومەرەوە ، لە ئوم حەبیبەوە دەگێڕنەوە ، دەڵێت : ئوم حەبیبە پێشتر خێزانی عبدالله بوو ، وە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە حەبەشە مارەی كرد و نەجاشی چوار هەزار دەرهەمی وەك مارەیی پێ دا و لەگەڵ ( شرحبیل ) ی كوڕی حەسەنەدا ناردی ، وە هەموو پێداویستی بوكو ناوماڵ لەلایەن نەجاشی یەوە بوو[3] .

## " هەڵوێستی زیندوو "

لە ( الزهری )یەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ویستی فەتحی مەككە بكات، ئەوە بوو كاتێ ئەبوسوفیان هات بۆ مەدینە بۆ گفتوگۆ كردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) تاوەكو ئاگر بەستەكەیان درێژ بكاتەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قبوڵی نەكرد ، ئەویش هەڵسا چوو بۆلای ئوم حبیبەی كچی ، كاتێ ویستی لەسەر جێگاكەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دانیشێت ، ئوم حەبیبە پێچایەوە و هەڵیگرت ، ئەویش پێی وت : كچم ، ئایا ئەو جێگایە شیاوی من نیە یان من شیاوی ئەو جێگایە نیم ، هەڵی ئەگریت ؟

فەرمووی : بەڵكو ئەمە جێگای پێغەمبەری خوا یە ( ﷺ ) و تۆش كەسێكی پیسی بێ باوەڕیت و شیاوی ئەو جێگایە نیت ، ئەبوسوفیانیش وتی : بەڕاستی كچم دوای من تووشی شەڕ بوویت[4] .

---

[1] – لەو كاتەدا هێشتا موسڵمان نەبوو بوو .

[2] – الحاكم ( ٤ / ٢٢ ) .

[3] – سەنەدەكی ( صحیح )ە ، ابوداوود لە ( النكاح ) دا ریوایەتیكردووە ( ٢٠٠٧ ) .

[4] – طبقات / ئیبنو سعد ( ٨ : ٩٩ ، ١٠٠ ) صفة الصفوة ( ٢ / ٣٣ ) .

## " پێش ئەوەی بە لیقای خوا بگات "

لە ( عەوفی کوڕی حارث )ەوە ، دەڵێت : گوێم لە عائیشە بوو ( ﵂ ) دەیوت : لەسەرەمەرگدا ئوم حەبیبە بانگی کردم و پێی وتم : بێ گومان شتێك لەوەی لە نێوان دوو هەوێدا هەیە لە نێوان من و تۆشدا هەبووە ( واتە : ئەوبەرابەرکێ و هەستیاری یەی لە نێوان دوو هەوێدا هەیە ) خوا لە هەردووکمان خۆش بێت .

منیش وتم : خوا لە سەر هەمووی لێت خۆش بێت و گەردنت ئازاد بێت . ئەویش فەرمووی : دڵت خۆشکردم ، خوا دڵت خۆش کات ، ئینجا ناردی بەدوای ئوم سەلەمە دا و هەمان شتی بە ئەویش وت .

نووسەر دەڵێت :

بەڕاستی ئەمە سونەتێکی پێغەمبەرایەتی زیندووە . ئەوەتا بەیهەقی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە کاتی نەخۆشی وەفاتیدا وتاری دا بۆ خەڵك و فەرمووی :

" أما بعد أيها الناس .. فإني أحمد إليكم الله الذي لا اله الا هو ، فمن كنت جلدت له ظهراً ، فهذا ظهري فليستقد منه ! و من كنت شتمت له عرضاً ، فهذا عرضي فليستقد منه ! و إن الشحناء ليست من طبعي و لا من شأني ، ألا و إن أحبكن الي من أخذ مني حقاً ! إن كان له ، أو أحلني منه فلقيت الله و أنا طيب النفس ..."

واتە : " لە پاشان .. ئەی خەڵکینە .. من سوپاسی پەروەردگاری تاك و تەنها ئەکەم ، ئێستا ئەگەر یەکێك هەیە لێم دئەبو ئەوە پشتم با لێم بداتەوە ! وە هەر کەس ڕۆژێ لە ڕۆژان قسەم بەناموسی وتووە ، بامافی خۆیم لێ وەرگرێتەوە ! ئاگاداربن کینە و دوژمنایەتی لە سروشتی من نیە و کاری من نیە ، بێ گومان خۆشەویسترینتان لەلام ئەو کەسەیە کە مافی خۆیم لێ وەرئەگرێتەوە ئەگەر مافی لەلام هەیە ، یان گەردنم ئازاد ئەکات تاوەکو بە دەروونێکی پاکەوە بەلیقای خوای گەورە بگەم ... "خاتوو ئوم حەبیبە ساڵی ( ٤٤ )کۆچیدا لە سەردەمی جێنشینایەتی موعاویەدا ( ﵂ ) وەفاتی کردووە .

## " ١٠ - ئوم ئەیمەن ( ﵂ ) "

## " بەدابڕانی سرووش دەگری "

حەبەشی یەو خزمەتکار ( مولاه )ی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و دایەنی بوو .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە باوکیەوە بۆی بەجێماوە و پاشان دوای ئەوەی خاتوو خەدیجەی هێنا ، ئازادی کرد .

یەکێ بووە لەوانەی لەسەرەتاوە هیجرەتیان کرد .. ناوی ( بەرەکە )یە .. عوبەیدی کوڕی حارثي خەزرەجی هاوسەری بووە و ( ئەیمەن )ی لێ بووە .. ئەیمەنیش باس و خواستی خۆی هەیە لە کۆچ و خەباتکردندا ... ڕۆژی ( حنین ) شەهید دەکرێ و دواتر (زەیدی کوڕی حارثە ) لە شەوانی دابەزینی پەیامی پێغەمبەرایەتیدا هێناویەتی و ئوسامەی کوڕی زەیدی ، خۆشەویستی پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) لێ بووە .

### " پلەوپایەی لەلای خوای پەروەردگار "

کاتێ ئوم ئەیمەن هیجرەتی کردو ، لە ( منصرف ) و پێش ئەوەی بگاتە (روحاء ) شەومایەوە ، لەوێ زۆر تینووی بوو بە ڕۆژویش بوو ، ئاویشی پێ نەبوو ، ئەوە بوو زۆر شەکەت بوو ، خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە سەتڵێك ئاوی بە گوریسێکی سپیدا دابەزاندە خوارەوە بۆی ، ئەویش لێی خواردەوە ، ئوم ئەیمەن دەڵێت : " دوای ئەوە هەرگیز تینووم نەبووە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاوارەیی دا بە هۆی بەڕۆژوو بوونمەوە ئەبوایە تووشی تینوێتی بهاتمایە ، کەچی تینووم نەئەبوو [1] !!

بەهۆی دابڕانی وەحی ئوم ئەیمەن دەگری :

لەئەنەسەوە ، دەڵێت :

---

[1] - ئیبنو سەعد ڕیوایەتی کردووە ( ٨ / ٢٢٤ ) و لەویشەوە حافظ لە ( الصابه ) ( ١٣ / ١٧٨ ) دا، پیاوانی فەرموودەکە بێ متمانەن ، بەلام بجرانی تێ ئەکەوێت .

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەفاتی کرد ، ئوم ئەیمەن گریا ، وتیان .. ئەوە دەگرییت ؟ وتی : سوێند بەخوا ، دەمزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەردەبێ وەفات بکات، بەڵام لەبەرئەوە دەگریم کە ئیتر سروش لە ئاسمانەوە دانابەزێت بۆمان و لێمان دائەبڕێت[1].

– ئەو ڕۆژەش عومەری کوڕی خەتاب ( رضي الله عنه ) شەهید کرا ئوم ئەیمەن زۆر گریا . لە تاریقەوە ، دەڵێت : کاتێ عمر ( رضي الله عنه ) شەهید کرا ، ئوم ئەیمەن دەستی بەگریان کرد و وتی : ئەمڕۆ ئیتر ئیسلام کز و لاواز بوو [2] .

ئوم ئەیمەن ( رضي الله عنها ) لەسەردەمی جێنشینایەتی عوسماندا ( رضي الله عنه ) وەفاتی کرد . ( حرملە )ی ( مەولا )ی ئوسامەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە .. لەگەڵ ئیبنو عومەردا دانیشتبوو ، حەجاجی کوڕی ئەیمەن هاتە ژوورەوە و نوێژی کرد نە ڕکوع بردنی و نە کڕنووشبردنی هیچیان تەواو نەبوون ، ئیبنو عومەریش ( رضي الله عنه ) بانگی کرد و پێی وت : ( وائەزانی نوێژت کردووە ؟ نەخێر ، بەڵکو ئابێ دووبارەی کەیتەوە ، ئەوە بوو کاتێ ڕۆیشت ! ئیبنو عومەر پرسی : ئەمە کێ بوو ؟ وتم : حەجاجی کوڕی ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن ..

فەرمووی : ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بیبینیایە ، خۆشی ئەویست [3]. سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خواتان لێ بێت ..

---

[1] – بە ئیسنادێکی صحیح / ئیبنو سەعد ( ٢٢٧٨ ) موسلیم و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە .

[2] – ئیسنادەکەی ڕاستە / ئیبنو سعد ( ٨ / ٢٢٦ ) .

[3] – پیاوانی جێی متمانەن / ئیبنو سعد ( ٨ / ٢٢٥ ) .

## " ١١ – حەفصەی دایکی ئیمانداران ( رضي الله عنها ) "

## " خێزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە بەهەشتدا "

داخۆ ئەم خانمە کێ یە کە ئەم چەند لاپەڕە بە یادکردنی پرگوڵاو ئەکەین ؟ بەڕێزان ، کچی پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتابە ڕەزای خوایان لەسەر بێت .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ساڵی سێی کۆچی ( هاوسەرگیری لەگەڵ کرد ) پاش تەواو بوونی ( عیدە )کەی لە خونەیسی کوڕی حزافەی سەهمی [1] ، کە یەکێ بوو لە کۆچبەران .

" عائیشە ( رضي الله عنها ) دەفەرموێ : –

لەناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوادا لەگەڵ حەفصە دا زۆر کۆك بووین ، ڕیوایەتکراوە کە بە پێنج ساڵ پێش هاتنە خوارەوە سروش ( پەیامی ئیسلام ) لە دایك بووە .. بەو پێیە ، کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گواستویەتیەوە تەمەنی ( ٢٠ ) ساڵ بووە [2] .

کاتێ هاوسەرەکەی وەفاتی کرد ، باوکی پێشنیاری کرد بۆ ئەبوبەکر ، وەڵامی نەدایەوە ، پێشنیاری کرد بۆ ( عوسمان ) یش ، ئەویش فەرمووی : بەنیازنیم ئێستا ژن بێنم ، ئەمیش دڵی لێیان ئێشا ، و سکاڵای خۆی بردە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش فەرمووی : ( تتزوج حفصة من هو خير من عثمان ، و يتزوج عثمان من هي خير حفـصة ) واتە : حەفصە شوو بەکەسێکی باشتر لە عوسمان ئەکات و عوسمانیش کەسێك دێنێت باشتر لە حەفصە .. پاشان داخوازی حەفصەی لە ( عمر ) کرد ( رضي الله عنه ) ئەویش پێیدا [3] .

هەروەها پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خاتوو ( رقیە )ی کچی خۆی دابە ( عوسمان ) پاش وەفاتی خۆشکەکەی .

پاش ئەوەی ( عمر ) حەفصەی دا بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەبوبەکر (رضي الله عنه)ی پێگەیشت ، داوای لێ بوردنی لێ کرد و فەرمووی : دڵگران نەبی لێم کە وەڵامم

---

[1] – یەکێکە لەوانەی زوو ئیسلام بوون ، و کۆچی کرد بۆ حەبەشە و گەڕایەوە مەدینە و ئامادەی بەدر و ئوحود بوو ، لە جەنگی ئوحود دا بریندار کرا و بەو برینەی وەفاتی کرد ( رضي الله عنه ) .

[2] – سير اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٢٧ ) .

[3] – صحيح / بوخاری ڕیوایەتی کردوە ( ٩ / ١٥٢ ، ١٥٣ ) .

نەدایتەوە، ئەویش لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێشتر باسی حفصەی کردبوو ( نیازی بوو بیخوازێت ) ، منیش حەزم نەکرد نهێنی پێغەمبەر ( ﷺ ) بدرکێنم ، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وازی لێ بهێنایە ئەوا من ئەمهێنا [1] .

چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جارێك تەلاقی داوە و دواتر بەفەرمانی (جبریل ) سەلامی خوای لێ بێت هێناویەتیەوە .. وە جبریل ( علیه السلام ) پێی فەرموو : ئەو ئافرەتێکە زۆر بە ڕۆژوو دەبێت و شەو بێدارە لە بەهەشتدا خێزانتە [2] .

## " ئادئەبو بەرزی ئیسلام "

پەروەردەی ئیسلامی گرنگی خۆی هەیە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەی باش و خانەوادەی خواناسدا ، کە جەخت لەسەر هاوڕێزی لە نێوان هەردوو هاوسەردا دەکاتەوە ، و لەگەڵ فێرکردنی کچان هەر لەماڵی باوکیاندا کە چۆن ڕێز لە مێردەکانیان بگرن ، لە گرنگترین هۆکارەکانی ئاوەدانکردنەوەی ماڵی ئیسلامی یە ، تا بەسەر بڵندی بمێننەوە لە بەرامبەر ناڕەحەتی و بەربەستەکانی زەمانەدا .

هەروەها ڕۆشنبیر کردنی لاوان بەگرنگیی پاراستنی مافەکانی خێزان ، لە گرنگترین بنچینەکانی بنیادنانی ماڵی موسڵمانە ، وە ڕۆڵی دایك و باوك بە زەواجی کچەکەیان تەواو نابێت ، بەڵکو دەبێ پەیتاپەیتا مافی هاوسەرەکەی وەبیر بێنێتەوە ، لەگەڵ ئارامگرتن لەگەڵیدا لە خۆشی و ناخۆشیدا ... وە هەر ماڵێك لەسەر غەیری ئەم بنچینانە بنیاتنرێت ئاکامەکەی خەسارە و مەندی و پەشیمانی یە .

## " فەرموون ئەم ڕێوایەتە "

لە ( عمری کوڕی خەتاب ) ەوە ( ﷺ ) دەفەرموێت :

ئێمە هۆزی قورەیش کەسانێکی زاڵ بووین بەسەر ئافرەتاندا ، کاتێ هاتینە مەدینە بینیمان لەوێ ئافرەتان بەسەر پیاواندا زاڵن ، وای لێ هات ئافرەتانمان چاویان لەوان دەکرد .. ئەوەبوو جارێ لە خێزانەکەم توڕە بووم .. دوایی هات لۆمەی ئەکردم و ئەیوتەوە، منیش ئەوەم پێ ناخۆش بوو ، نکۆڵیم لێ دەکرد .

---

[1] – صحیح / بوخاری ریوایەتی کردوە ( ٩ / ١٥٢ ، ١٥٣ ) .

[2] – فەرموودەی ( صحیح ) ە / ئەبو داوود ( ٢٢٨٣ ) و ئیبنو ماجە ( ٢٠١٦ ) .

ئەویش وتی : بۆچی نکوڵی دەکەیت ؟ سوێند بەخوا خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مۆن ئەکەن و هەیانە ڕۆژێ تا ئێوارە قسەی لەگەڵدا ناکات و بە جێی دیلێت ... دەفەرموێت : منیش ڕۆیشتم بۆلای حەفصە و پێم وت : لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) قین ئەکەیت ؟ فەرمووی : بەڵێ ... منیش وتم : ئەو ڕۆژە تا ئێوارە قسەی لەگەڵ ناکەیت و پشتی لێ ئەکەی ؟ فەرمووی : بەڵێ ...

وتم : هەر کەس لە ئێوە ئەمەی کرد بێت بە خەسارەوەمەندی ئەچێت و کارێکی خراپی کردووە ، مەگەر زامنی ئەوە ئەکەن کە بە تووڕە کردنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، خوای خۆتان تووڕە نەکەن و بە هەلاکەتاندا نەبات ؟

هەرگیز نەکەی هەڵوێستی وا بنوێنی بەرامبەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یان داوای شتێکی لێ بکەیت ، هەرچیەکت ویست لە من داوا بکە ، ئەوە فریوت نەدات کە دراوسێکەت جوانتر و خۆشەویستتر بێت لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە تۆ ( مەبەستی عائیشەیە (ﷺ) ) .بەم جۆرە پێشەوا ( عمر ) ( ﷺ ) وەك باشترین باوك ئامۆژگاری کچەکەی دەکرد[1] . ئەمە لە کوێ و پەروەردەی ئەم سەردەم و زەمانە لە کوێ ؟!!

## " سەربڵندی لە کاتی نەهامەتیدا "

کاتێ کە لە ( عمری کوڕی خەتاب ) ( ﷺ ) درا بەو خەنجەرەی کە پێیەوە وەفاتی کرد ، خاتوو حەفصە ( ﷺ ) لە باوکی نزیك بوویەوە و بە زمانێکی پڕ لە یەقینەوە فەرمووی : بابەگیان .. ڕۆیشتن بۆ بەردەم پەروەدگار خەمی ناوێت ، لە کاتێکدا مافی هیچ کەسێك بەلاتەوە نیە ، مژدەیەکیشم بۆت پێیە و دووجار نهێنی نادرکێنم ، باشترین شەفاعەتکار بۆت دادپەروەری یە .. سەختی یەکانی ژیانت و داوێن پاکیت لە حەزەکاندا و هەڵسان بە بێدەنگ کردن و نەفەسبڕینی بێ باوەڕان و خراپەکاران ئەمانە هیچ کامیان لای خوای پەروەردگار ون نابن[2] .

خاتوو حەفصە ( ﷺ ) لە ساڵی ( ٤١ )کۆچیدا کە بە ( عام الجماعە ) ناسراوە لە سەردەمی پاشایەتی ( معاویە ) دا بە دەم بانگی پەروەردگاریەوە چوو ، و وەفاتی کرد . وە (مروان )ی والیی ( مەدینە ) نوێژی لەسەر کرد و لە (بقیع ) سپاردە کرا و جەستە

[1] – نساء مبشرات بالجنە ( ٢ / ٢٢٦ ) و دواتریش .

[2] – نساء مبشرات بالجنە ( ٢ / ٢٢٦ ) و دواتریش .

پاکەکەی بە هێمنی خەوی لێ کەوت لەو جێگا پیرۆزەدا .. دەی موژدەت لێ بێت ، ئەی دایکی ئیمانداران لەو ڕۆژەدا کە موسڵمان بویت و لە ڕۆژەدا کە هیجرەتت کرد و لەو ڕۆژەشدا وەفاتت کرد ، لە ڕۆژێکیشیدا کە خەڵکی لە بەردەم خوای جیهانیاندا بە پێوە ڕائەوەستن ..

# " ١٢ - خاتوو صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

## " بکوژی جوولەکە کە"

ئەم خاتوونە : ( صەفیەی کچی عبدالمطلب ) ی ، هاشمی یەو خوشکی حەمزە و دایکی هاودەم ( حواری )ی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ( زوبێری کوڕی عوام )ە . حارثي برای ابوسوفیانی کوڕی حەرب هێناویەتی و دواتر وەفاتی کردووە .

پاشان ( عوام )ی برای خانمی خانمان ( خەدیجەی کچی خویلید ) هێناویەتی و (زوبێر و سائب و عبدالکعبة )ی لێ بوو .. زەهەبی دەڵێت : ڕاست ئەوەیە کە لە پورەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ ) جگە لە ( صەفیە ) هیچ کامیان موسڵمان نەبوون .بەسەر لاشەی براکەیەوە ( حەمزە ) بینراوە بە ئارامگری و ڕازی بوون بە قەدەری خوا .. وە یەکێکە لە کۆچبەرە پێشینیەکان [1] .

لە عائیشەوە ( ﷺ ) ، دەفەرموێت : کاتێ ئایەتی : ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ ﴾ سورة الشعراء ، آية (٢١٤) ، هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەڵسایەوە و فەرمووی : ( يا فاطمة بنت محمد يا صفية بنت عبدالمطلب ، يا بني عبدالمطلب ، لا املك لكم من الله شيئاً ، سلوني من مالي ما شئتم ) [2]

واتە : ئەی فاتیمە کچی محمد ، ئەی صەفیەی کچی عبدالمطلب ، ئەی کوڕانی عبدالمطلب ، من هیچ شتێکم لەلای پەروەردگارەوە پێ نیە بۆتان ( یان من لەلای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆتان ) هەرچیەکتان لە ماڵی من دەوێت لێم داواکەن .

### " ئازایەتی صفیە ( ﷺ ) "

" ڕۆژی خەندەق لە قەڵاکەی حەسانی کوڕی ثابتدا بوو ، دەڵێت : وە حسانیش لەگەڵمانـدا بوو لە لوتکەکەیدا ، جولەکەیەك لە دەوری قەڵاکە دادەهات و دەچوو ، موسڵمانانیش لە بەرامبەر دوژمنانیاندا بوون ، پاشان لە پەراوێزی فەرموودەکە دا هاتووە کە صەفیە دابەزیوە و بە پایەیەك جوولەکەکەی کوشتووە [3] .

---

[1] - سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ٢٧٠ )

[2] - صحیح / مسلم ریوایەتیکردووە ( ٢٠٥ ) وە غەیری ئەویش .

[3] - سیرە ئیبنو هشام ( ٢ / ٢٢٨ ) .

موسڵمانانیش لە بەرامبەر دوژمنانیاندا بوون ، پاشان لە پەراوێزی فەرموودەکە دا هاتووە کە صەفیە دابەزیوە و بە پایەیەك جوولەکەکەی کوشتووە [1] .

ابن عساکر دەڵێت : ئەوەی لە نێوان صەفیە و حسان و جولەکەکەدا ڕوویدا ، بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشت و بۆیان باسکرد ، صفیە ( ﵂ ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەها پێکەنی کە ددانەکانی ئەو سەریمان بینی ، لە ڕاستیدا نەمدیبوو هیچکات وەها پێ بکەنێت ) [2]

بڕوانە ، خوێنەری ئازیز ، بڕوانە ئەم عەزیمەتە گەورانە کە تەنها ئەم ئیسلامە دروستی یان دەکات و تەنها لە باوەڕێکی قوڵ و پەیوەندی یەکی بەتین دروست ئەبێ و هێزەکانی کوفر لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەخاتە ژێر پێی سەربازەکانی خودا...

مامۆستا ( غەزالی ) ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت ، دەڵێت : ( پەلامارەکانی خاچپەرستان و دروشمەکانیان تەنها بەم پێکهاتە پتە وانە لە باوەڕی بە ئاگای ناو دڵەکانی پیاوان و ئافرەتان تێك شکان ، بەڵام ئافرەتانی بێ ئاگا ئەوانەن کە بە بەدینە هاتنی حەزێکیان هاوار دەکەن و بە لەدەستدانی شتێك پرمەی گریان لێ دەدەن و نەلە کاروباری دین وە نە لە کاروباری دنیا هیچ نازانن [3] .

## " وەفاتی "

خاتوو صفیە ( ﵂ ) ساڵی ( ٢٠ )کۆچی لە تەمەنی سەرو حەفتا ساڵیدا وەفاتی کردووە لە ( بقیع ) سپاردەکرا ..

---

[1] – سیرە ئیبنو هشام ( ٢ / ٢٢٨ ) .

[2] – در السحابە / شوکانی ( ٥٣٨ ) .

[3] – الدعوة الاسلامیە تسقبل قربها الخامس عشر / مامۆستا غەزالی / لاپەڕە ٧٥ .

# " ١٣ – ئەسمائی کچی عمیس ( رضي الله عنها ) "

## " خەڵکی یەک هیجرەتیان کردووە ، ئێوە دوان "

یەکێکە لە کۆچبەرە پێشینەکان ...

وتراوە / پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بێتە ماڵی ( ئەرقەم ) موسڵمان بووە[١] . پاشان لەگەڵ ( جعفر الطيار )ی هاوسەریدا کۆچیان کردووە بۆ حەبەشەو لەوێ عبدالله و محمد و عون ی لێ بووە ..

• پاشان دوای ئەوەی لەگەڵیدا کۆچیان کرد بۆ مەدینە لە ساڵی ( ٧ )کۆچیدا ، و لەشەڕی ( مؤتة )دا هاوسەرەکەی شەهید بوو ، ئەبوبەکری صدیق ( رضي الله عنه ) هێنای و محمدی لێ بوو ، پاشان ( صديق ) وەفاتی کردوو و ئەسماو بە دەستی خۆی شۆردی[٢]

دواتر ( علی کوڕی ئەبو تالیب ) ( رضي الله عنه ) هێناویەتی ..

لە ( الشعبی )یەوە ، دەڵێت :

کە ( اسماء ) لە حەبەشەوە هات بۆ مەدینە ، عمر ( رضي الله عنه ) پێی وت : ئەی حەبەشی پێشماندانەوە لە هیجرەتدا ... ئەویش وتی : بەڵێ ڕاست ئەڵێیت ... ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوون ... برسیەکانتانی تێر ئەکرد ، و نەشارەزاو نەزانەکانتانی تێئەگەیاند ، بەڵام ئێمە چی ؟ کۆمەڵێکی دەرکرا و دووخراوە بووین ، سوێند بە خوا ئەبێ ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باس کەم .. ئەوە بوو هاتە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و بۆی گێڕایەوە .. ئەویش فەرمووی : ( للناس هجرة واحدة ، و لكم هجرتان )[٣]

---

[١] – ناوی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمە و ماڵەکەی بەسەر ( صفا ) وە بووە و ئەو ماڵە بوو کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تیادا ئیسلامی دەسازاند تیایدا خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ ناو ئیسلام و کەسانێکی زۆر تیایدا موسڵمان بوون . ئەمەش لەسەرەتای بانگی ئیسلامیدا بو لە مەککە .

[٢] – شێخی ئەلبانی دەڵێت : – هەردوو هاوسەر بۆیان هەیە یەکتری بشۆن ( ئەگەر یەکێکیان مرد ) و هیچ بەڵگەیەك نی یە ڕێگری لەمە بکات و بنچینە ئەوەیە کە ڕێگەی پێ درابێ بەتایبەت کە بە دوو فەرموودە پشتگیری لێ کراوە : ١ ) لە عائشەوە ( رضي الله عنها ) دەفەرموێ : ( لوكنت استقلبت من امري ما استدبرت ماغسل النبي ( ﷺ ) غير نساء ) ئیبنو ماجە دەری هێناوە و فەرموودەی دووەمیش لە ( احكام الجنائز ) یدا لە لاپەڕە ( ٥٠٠ ) دا هەیە .

[٣] – ئیبنو سعد ( ٨ / ٢٨١ ) هەروەها بخاریش بە درێژتر لە هێناویەتی ( ٧ / ٣٧١ ) ( مسلم ) یش .

واتە : خەڵکی یەك جار کۆچیان کرد .. ئێوە دووجار .. ( جارێ بۆ حەبەشە و جارێکیش بۆ مەدینە ) ..

گوێڕایەڵی بۆ هاوسەرەکەی پاش مردنیشی :-

سەعدی کوڕی ئیبراهیم ، دادوەری مەدینە ، دەڵێت : ئەبوبەکر ڕایسپارد بوو کە ئەسماو بیشۆرێت . قتادە ، دەڵێت : خێزانەکەی کە ( کچی عمیس ) بوو ، شۆردی [1] .

وتراوە : سوێندی لێ خواردوو ڕۆژووەکەی بشکێنێت ( ئەڵبەتە ڕۆژووی سوننەت نەك فەرز ) ، فەرموویەتی : ئەمە باشترە بۆت و بەهێزترە بۆت .

ئەویش لە کۆتایی ڕۆژدا سوێندەکەی وە بیرکەوتەوە ، داوای چۆڕێ ئاوی کرد وە خواردیەتیەوە و ڕۆژووەکەی شکاندووە ، وتی : سوێند بەخوا ئیتر سوێندی ناشکێنم [2] ..

زەهەبی دەڵێت : ئەسماو ( ﵂ ) پاش ( علی ) ( ﵁ ) ژیاوە و .. باسکراوە کە ساڵی ( ٦٠ )ی کۆچی وەفاتی کردووە [3] .

---

[1] - مالك لە ( الموطأ ) دا ( ١ / ٢٢٣ ) دەریهێنانی بۆ کردووە .

[2] - ئیبنو سعد ( ٨ / ٢٨٤ ) .

[3] - تاریخ الاسلام ( ٤ / ١٧٨ ) .

# " ١٤ - ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ( رضي الله عنها ) "

## " خاوەنی دوو پشتێن "

ئەسمائی کچی ئەبی بەکری صدیقە .. و دایکی عبداللە ی کوڕی زوبێری قورەیشی یە و مەککی و هەم مەدینەیی یە .. دایکی پێشەوا ( عبداللە ی کوڕی زبێر ) و خوشکی عائیشەی دایکی ئیماندارانە و لە دوای هەموو ئافرەتانی کۆچبەرەوە وەفاتی کردووە . زیاد لە دە ساڵ لە عائیشە گەورەتر بووە لەتەمەندا ... کاتێ هیجرەتی کرد ، عبداللە ی لە سکدا بوو ... وتراوە هیچ ددانێکی نەکەوتووە هەتا مردووە ... وە لە جەنگی ( یەرموك ) دا لەگەڵ زوبێری هاوسەریدا بەشدار بووە خۆی و باوکی و باپیری و کوڕەکەیشی کە ( ابن زبێر )ە هەرچواریان لە هاوەڵانن ..

### " ڕۆژی کۆچ "

یەکێ لەو ڕۆژە لەبیر نەکراوانەی ئەسماو ( رضي الله عنها ) ڕۆژی هیجرەتە کە بەم جۆرە بۆمان باس دەکات . . ( کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ویستی کۆچ بکات خواردنم لە ماڵی باوکم بۆ دروست کرد،بەڵام نەبۆ خواردنەکەی و نەبۆ ئاوەکە شتێکم نەدیەوە بیانپێچمەوە پێی ، وتم بە باوکم هیچم دەستناکەوێ پشتوێنەکەم نەبێ ... فەرمووی بیکە بە دوو بەشەوە و نان و ئاوەکەی پێ ببەستەوە و بیپێچەوە ، لەبەر ئەوە ناو نراوە (ذات الناطقین ) واتە: خاوەنی دوو پشتوێن[1] .

هەروەها ئەسماء ( رضي الله عنها ) دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەرەو مەدینە لە مەککەوە بەڕێ کەوت ، ئەبوبەکر ( رضي الله عنه ) لەگەڵ خۆیدا هەموومالەکەی کە ( ٥ - ٦ ) هەزار بوو هەڵگیرت و بردی ، باپیرم ( ئەبو قوحافە ) کە پیاوێکی نئەبونا بوو هات بۆلام و وتی : بەڕاستی ئەم کوڕەم ڕۆشتوو ئێوەی بە برسێتی بەجێ هێشت ... وتم : نەخێر .. خێر و بێرێکی زۆری بۆمان بە جێ هێشتووە ئەوە بوو بڕێك بەردم کۆکردەوە و لە سوچێکی ماڵەکەدا دامناو پارچە قوماشێکم دا بەسەریدا ، پاشان دەستی باپیرم گرت و خستمە سەر قوماشەکە و وتم : ئا ئەمەی بۆ بەجێ هێشتووین وتی : دەی مادەم ئەمەی بۆ بەجێ هێشتون ، شتێکی باشە [2] .

---

[1] - سەنەدەکی ( صحیح ) ە / بوخاری ریوایەتی کردوە ( ٧ / ١٩٣ ، ١٩٤ ) . وە غەیری ئەویش .

[2] - سەنەدەکی ( صحیح )ە ئیبنو هشام لە ( السیرە ) ( ١ / ٤٨٨ ) باسی کردووە .

## " هاوکاری کردنی هاوسەر لە کاروباری ژیاندا "

خاتوو ئەسماو وانەیەکی جوانمان پێشکەش ئەکات لە باشیی مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەردا هاوکاریکردن : دەڵێت : کاتێ ( زوبێر ) منی هێنا تەنها ئەسپێکی هەبوو ، هەڵئەسام بە پاك کردنەوەی و ئاوو ئالیکدانی .. هەروەها ئاوم دەهێناو هەویرم دەشێلا و تۆو و دانەوێڵەم لەو زەویەی زوبێردا دەگواستەوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆی جیاکردبووینەوە و نزیکەی (٣ ) فەرسەخ [1] بوو . ڕۆژێك هاتمە سەر زەوی یەکە و دانەوێڵەکان بەسەر سەرمەوە بوون .. بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیشتم کە چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو .. بانگی کردم تا لە دوایەوە سەرکەوم ، منیش شەرمم کرد و زوبێر و غیرەتی زوبێرم یاد کەوتەوە ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆیشت ، کاتێ گەیشتمە جێ هەواڵەکەم دابە ( زوبێر ) وتی : سوێند بەخوا ، ئەوەم پێناخۆشتر بوو کە دانەوێڵەکەت بەسەر سەرتەوە هەڵگرتبوو ، تا ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ) سەرکەوتیتایە .

ئەسماء دەڵێت : دوای ئەوە باوکم ابوبکر ( ﷺ ) خزمەتکارێکی بۆ ناردم و لە بەخێوکردنی ئەسپ و خزمەتکردنی ڕزگارم بو ، وەك ئەوەی لە کۆیلەیەتی ڕزگارم بووبێ وابوو [2] .

خوێنەری بەڕێز لەم دەقە ورد بەرەوە و سەرنج بدە ، ئەسپ لەگەنە و ئەسپێ پاك دەکاتەوە و دانەوێڵە بەسەر سەریەوە دەگوازێتەوە و کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەیبینێ : بەزەیی پێدادێتەوە ، بەڵام نکۆڵی لەکارەکانی ناکات ... سەرەڕای ئەم هەموو ماندوو بوونەش ، ئەسماء کاری ماڵەوەشی لەبیر ناکات و دەڵێت : ئاو دێنم و هەویر دەشێلم !! ، بەڵام لەو چاخەماندا چیان لە ئافرەتانمان دەوێت ؟ ... دەیانەوێ چی بێ وچۆن بێت ؟

مامۆستا غەزالی ( ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ) دەڵێت : ( ... لە بیرمەکە چەند کەسێ لەوانەی پارێزگاری لە تەریقەکانی نەفامی و جاهیلیەت دەکەن ، چەن و چوونیان لەگەڵ ئەکردم و دەیانوت : مێردیان باوك لەماڵەوە ئافرەتان فێردەکەن و لەسەر ئەوەش ڕایاندەهێنن کە لە ماڵەوە نوێژ بکەن، ئیتر چوونە دەرەوەیان و خۆ خستنە بەردەم فیتنە هیچ مانایەکی نیە!

---

[1] – هەر ( فەرسەخ ) نزیکەی ( ٥ – ٦ ) کیلۆمەتر (تۆنم) ( فەرمەنگی دەریا ) ڕزگار کردیم .

[2] – صحیح / بخارە و مسلم ڕیوایەتیان کردوە وە کردووە . ( ٦ / ٢٤٧ ) .

وتم : خاوەنی پەیامەکە ( ﷺ ) ئەم نەخشەیەی نەکێشاوە کە تۆ پێشنیاری ئەکەیت .. لەبەر ئەوە جارێ لەم ڕووەوە ڕایەکەت ڕەت کرایەوە . لە ڕوویەکی ترەوە ، ئەمەی کە تۆ تکات وا یە لێ ی وا نەزانی ئەبێتە مامۆستا بۆ خێزانەکەی ، جارێ خۆی پێویستی بە کەسێکی وەك ئەوانە فێری بکەن و دەرسیان لێ وەرگرێت ..

ئافرەتی ڕووسی وا غەزووی بۆشایی ئاسمانی کرد ، کەچی ئەیانەوێ ئافرەتی موسڵمان ڕێگای مزگەوت نەزانێت ، هەر ئاینێك ئەبینی لەم چاخەماندا هەر چەندە پوچەڵ و بێ ماناش بێت ، ئافرەت ئەبەستێتەوە بەپەرستگاکانیانەوە ، بەلاّم تەنها ئەیانەوێ ئیسلام ئافرەتان نەفی بکات لە ماڵە کانی خوا !

ئەو دروشم و مەشخەلاّنەی کە ئیسلام لە ڕێیەوە ناموسی خەڵکی پێ دەپارێزێت، ئەوە بێگومان دەبێ نیشان بدرێن ، بە دڵنیاییەوە نئەبو ڕووتی و خۆڕازاندنەوە هەبێ و نئەبو خەڵوەت دروست بێ لەگەڵ پیاوی بێگانەدا و هەروەك نئەبو هیچ کارێ بکرێ کە بەرەو ئەوانە سەر دەکێشێ .

ئەو کارە هونەری و ئیداری یانەی کە ئافرەتان پێی هەڵدەستن وە سەرجەم ئەو چالاکی یە ڕۆشنبیری یانەی کە پێویستی یان پێی هەیە یاخود ئارەزوویان لێیەتی ، دەکرێ ئەو ڕێکخەر و ( ضوابط )ە ئیسلامی یانەیان بۆ دابنرێ کە سنوورەکانی خوا دەپارێزن [1] ...

## " گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی "

لە ئیبنو زبێرەوە ، دەڵێت : ئەم ئایەتە لەسەر ئەسماء هاتە خوارەوە ، کاتێ دایکی ئەسماء کە بە ( قوتەیلە ) ناو ئەبرا ، چەند دیاری یەکی بۆ ئەسماء هێنا ، وەری نەگرت هەتا پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کرد ... ئەوە بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : ﴿ لاَ يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ ... ﴾ سورة الممتحنة ، آية ( ٨ ) .

واتە : دڵنیا بن کە خوا ئەوەتان لێ قەدەغە ناکات کە چاك ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردوون و ... ( تا کۆتایی ئایەتەکە ) . وە لە (صحيح) دا هاتووە ، ئەسماء بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ی فەرمووی : دایکم هاتووە بۆلام ..

[1] – الدعوه الاسلاميه : غەزالی ( لاپەڕە ٧٦ ) .

خۆیشت دەزانی کە دایکم کەسێکی موشریکە ئایا هات و چۆی بکەم . فەرمووی: ( نعم ، صلی امك )[1] بەڵێ : سەردانی دایکت بکە ...

## " هیمەتێکی نەرووخاو "

کاتێ شەڕ لە نێوان سەربازەکانی ( عبدالله ی کوڕی زبیر ) و سەربازەکانی (حجاجی ثە قەفی دا ) ڕووی دا [2] ، بووە هۆی شەهید بوونی عبدالله ی کوڕی زوبێر .. حەجاج لاشەی ابن زوبێری هەڵگرت و لە ( مسجد الحرام ) لە خاچی دا و شەرمیشی نەکرد لەو کارەی و ، هەڵسا چوو بۆلای خاتوو ئەسماء و پێی وت : ( دایە ... ئەوە ئەمیری موسڵمانان ڕایسپاردووم بۆ لات ... هیچ پێویستی یەکت نیە بۆت جێبەجێی کەم ؟ ئەویش فەرمووی : ( من دایکی تۆ نیم ، بەڵکو دایکی ئەو کوڕەم وا بەسەر ( رأس الثنیة)وە لە خاچتان داوە ، هیچ پێویستیەکم لێتان ناوێ ، بەلاَم گوێ بگرە . گوێم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو فەرمووی : ( یخرج من ثقیف کذاب ، و مبیر ) واتە : لە (ثقیف )ەوە درۆزنێك و ( پیاو کوژێك و تەفروتوناکارێك ) سەر هەڵئەدەن ..

جا هەرچی درۆزنەکەیە ئەوە بینیمان ، ( مەبەستی المختار )ە[3] ، و پیاو کوژەکەو فەوتێنەرەکە ئەوە تۆیت ، حجاجیش وتی : بەڵکو لەنێوبەری دووڕووەکانم [4] .

وەلە ( منصوری کوڕی صفیە ) وە ، لە دایکیەوە ، وتویەتی : وتیان بە ئیبنو عومەر کەوا ئەسماو لە سوچێکی مزگەوتدا دانیشتووە ، لەو جێگایەی کە ئیبنو زبێریان لە خاچدا ، ئەویش چوو بەرەو لای ئەسماو و فەرمووی : ئەم لاشانە هیچ نین ، بەڵکو ڕۆحەکان گرنگن کە لە لای پەروەردگارن .. لەبەر ئەوە لە خوابترسە و ئارامگربە ، ئەسمائیش ( ﷺ ) فەرمووی :

جا بۆچی ئارام ناگرم ، لە کاتێکدا کارەساتی من لە چاو ئەوەی زەکەریا ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) کەمترە ، کاتێ سەری ( یحیی )ی کوڕی پێشکەش بە یەکێ لە زۆردار و خراپەکارانی بەنی ئیسرائیل کرا [1] .

---

[1] – صحیح / بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

[2] – ئەم ڕوداوە لە سەردەمی جێنیشینایەتی عبدالملك ی کوڕی مرواندا بوو .

[3] – مختاری کوڕی عبیدی سەقەفی یە ، یەکێ بوو لە زمانی پاراو و بوێر و بێ دینەکان ( یاخود لاواز دینەکان ) سیر اعلام النبلاء ( ٣ / ٥٣٨ ) و دوای ئەویش .

[4] – تیرمیزی و نسائی ریوایەتیان کردوە .

وە لە ( ئیبنو ئەبی ملیکە )وە ، دەڵێت :

دوای ئەوەی کە بەسـەر ئیبنـو زوبێردا هـات ، چووم بۆلای ئەسما و فـەرمووی : پێیان ڕاگەیاندووم کە ئەمە ( عبداللە )ی لە خاچ داوە ، ئەی خوای پـەروەردگار نـەممرێنی هەتا بەدەستی خۆم بۆنی خۆشی لیٚ دەم و کفنی بکەم ... ئەوە بوو دوای ماوەیەك بۆیان هێنا و ئەویش بـە دەسـتی خـۆی کـافور و بـۆنی خۆشـی لێداو کفنـی کـرد ، دوای ئـەوەی چاوەکانی کوێر بوو بوون ..

وە لەلایەکی ترەوە ، لە ئیبنو ئەبی مەلیکەوە ، دەڵێت : ئینجا نوێژی لەسەر کرد .. وە یەك هەینی بەسەردا نەڕۆشت دوای ئەوە ، وەفاتی کرد ..

ئیبنـو سـەعد ، دەڵێـت : ئـەسما و چـەند شـەوێك پـاش کوڕەکـەی وەفـاتی کـرد ، شەهید کردنی ( عبداللە )ش لە ( ١٧ ) ی جەمادی یەکەمی ساڵی ( ٧٣ ) ی کۆچیدا بوو.

زەهەبی دەڵێت : ئسماء دواین کۆچکەربوو وەفاتی کرد ڕەزای خوای لەسەر بێت .

---

[١] – پیاوانی جێی متمانەن : ارنۆوط ( سیر ٢ / ٢٩٥ ) فەرموودەی ئەسماش کە دەڵێت : (( وقد اهدی رأس یحی ) ئامـاژە بـە ( هـیر و دیـان )ی بـرازای ( حـیر دوسـی ) ی فـەرمانڕەوای فەلەسـتینەکان کـاتیٚ مـامی دەیویست برازاکەی خۆی بێنێن ، ئەمەش حەرام بوو ، یەحیا پێی ڕازی نەبوو . بـەڵام کـچەکە و دایکیـشی ڕازی بوون و داوایان کرد سەری ( یحی ) یان بەسەر سینی یەکەوە بۆ بێنینت مامەکەش ئەوکارەی کردبوو.

## " ١٥ - عائیشەی دایکی ئیمانداران ( رضي الله عنها ) "

## " ئەو کەسەی لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە پاکانە کرا "

کچی پێشەوای مەزن ( صدیق )ی جێنشینی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەبو بەکر ، عبدالله ی کوڕی ئەبی قوحافەی قورەیشی .. و دایکی ئیمانداران و خێزانی سەروەری مرۆڤایەتی ( ﷺ ) و زاناترینی ئافرەتانی ئوممەتی ئیسلامە بە گشتی...

ئوم ڕۆمانی کچی عامری کوڕی عومەیر ، دایکیەتی .. لەگەڵ دایک و باوکیدا هیجرەتی کرد و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پاش وەفاتی خاتوو خەدیجەی ( الصدیقه ) بە چەند مانگێك هێناویەتی وە وتراویشە پاش دوو ساڵ .. ئەمەش پێش ئەوەی هیجرەت بکات .. و لە مانگی ( شەوال ) ی ساڵی ( ٢ ) ی کۆچیدا و پاش کۆتایی هاتنی جەنگی بەدری گەورە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا گواستویەتیەوە .

خاتوو عائیشە زانستێکی زۆر و پاك و پیرۆزی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ەوە ڕیوایەت کردووە .

### " وێنەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێت "

لە عائیشە وە ( رضي الله عنها ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( أريتك في المنام ثلاث ليال ، جاء بك الملك في سرقة من حرير ، فيقول : هذه امرأتك ، فأكشف عن وجهك فإذا أنـ ـت فيه، فأقول : إن يك هذا من عندالله يمضه ) [١] .

واتە : لە خەونمدا سێ شەو تۆم نیشاندراوە ، ( جبریل ) بەسەر قوماشێك لە باشترین جۆری ئاوریشم دروست کرا بوو تۆی هێناو ، فەرمووی : ئەمە خێزانتە ، و دەم و چاوی نیشاندام دەبینم تۆیت ، و منیش ئەموت : ئەگەر ئەمە لەلایەن خواوە بێت ئەوا فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکات ..

---

[١] - صحیح / احمد ڕیوایەتی‌کردووە هەروەها بوخاری ( ٧ / ١٧٥ ) و مسلم ( ٢٤٣٨ ) .

لە ڕیوایەتێکی تردا ، لە عائیشەوە ( ﷺ ) جبریل ( سەلامی خوای لەسەر بێت ، وێنەی عائیشەی لەناو قوماشێکی ئاوریشمی سەوزدا هێنا و نیشانی پێغەمبەری خوا (ﷺ ) ی داوە و فەرموویەتی : ( هذه زوجتك في الدنيا و الاخرة ) [1] . واتە : ئەمە هاوسەرت دەبێت لە دونیا و ئاخیرەتدا ..

## " فەزڵو گەورەیی "

١ – لە ئەبی موسای ئەشعەری یەوە ( ﷺ ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی : ( كمل من الرجال كثير و لم يكمل من النساء الامريم بنت عمران ، و آسية امراة فرعون ، و فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام )[2] .

واتە : لەناو پیاواندا کەسانێکی زۆر کامڵ بوون ، بەڵام لەناو ئافرەتاندا تەنها مریەمی کچی عمران و ئاسیای ژنی فیرعەون کامڵ بوون ( بێ کەم و کورتی بوون ) هەروەها چاکیی عائیشە بەسەر ئافرەتاندا بە گشتی وەك چاکیی( تێکوشیو – تریت ) وایە بەسەر هەموو خواردنەکانی تردا ..

٢ – لە عبداللە ی کوڕی زیادی ئەسەدی یەوە ، دەڵێت : کاتێ تەڵحە و زوبێر و عائیشە بەرەو بەصرە بەڕێ کەوتن، علی ( ﷺ ) عماری کوڕی یاسر و حسن ی کوڕی علی نارد کاتێ گەیشتنە لامان لە ( کوفە ) چوونە سەر بڵندگۆ و ( حسن ) لەسەرووی بڵند گۆکەوە بوو ، عەممماریش لە خوار تری ئەو دابوو ئێمەش لێیان کۆبووینەوە ، گوێم لە عەممار بوو فەرمووی : سوێند بەخوا عائیشە هاوسەری دنیا و قیامەتی پێغەمبەرەکەتانە ، بەڵام خوای پەروەردگار تاقیتان دەکاتەوە تا بزانێ گوێڕایەڵی ئەو دەبن یان عائشە ؟ [3]

٣ – لە عەمری کوڕی عاصەوە ، ( ﷺ ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەسەر سوپای ( ذات السلاسل )ەوە ناردمی ، دەڵێت : چووم بۆلای و پرسیم : کێ لە هەموو

---

[1] – تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە ( ٣٨٨٠ ) فەرموودەکەش ( صحیح )ە : لە صحیح ی سوننەتەکانی ترمزیدا هاتووە ( ٣٠٤١ ) .

[2] – بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردوە .

[3] – صحیح : بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، مامۆستا ( عەدوی ) دەڵێت : ( صحیح )ە فضائل صحابه النبی ل ٧ .

کەس لەلات خۆشەویسترە ؟ فەرمووی : ( عائیشە ) وتم ئەی لە پیاواندا ؟ فەرمووی : ابوها ) باوکی عائیشە ، وتم : ئەی دوای ئەو ؟ ئەویش ( ﷺ ) چەند پیاوێکی ناوبرد و پاشان من بێدەنگ بووم لە ترسی ئەوەی نەوەکو لە کۆتایی هەموویاندا بم [١] ..

٤ – لە عائیشەوە ، ( رضي الله عنها ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەخۆش کەوت ( لە نەخۆشی وەفاتیدا بوو ) پرسی : ( این اناغدا این انا غدا ؟ ) سبەی دەبێ لە ماڵی کێ بم ؟ مەبەستی ماڵی (عائیشە) بوو ... خێزانەکانیش پێیان وت ئارەزووی خۆتە کوێت پێ خۆشە لەوێ بمێنەرەوە ، ئەوە بوو لە ماڵی ( عائیشە ) مایەوە تا وەفاتی کرد .

( عائیشە )ش ( رضي الله عنها ) فەرمووی : هەر لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد کە سەرە ڕۆژی من بوو لەلام بمێنێتەوە و سەری بەسەر سنگمەوە بوو لیکی تێکەڵی لیکم بوو کاتێ بەدەمی خۆی سیواکەکەی بۆتەڕ کرد خستیە دەمی پێغەمبەری خوا وە(ﷺ)[٢] .

ئەگەر بەدوای (فەزڵ و گەورەیی) ( عائیشە ) دا ( رضي الله عنها ) بگەڕێین .. بوارنا بێ هەمووی بنووسین .. بۆیە ئەوەندەی کە نووسیمان بەسە ...

عائیشە کۆمەڵێ تایبەتمەدی تیا کۆ بوو بووەیەوە کە لە ئافرەتان جیا دەکرایەوە دەڵێت : من نۆ خەسڵەتم پێ دراوە کە لە دوای مەریەمی کچی عیمران بە هیچ ئافرەتێك نەدراوە : جبریل وێنەی منی بەسەر دەستی یەوە دابەزاندوە فەرمانی بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کردوە مارەم بکات . منی بە کچێتی هێنا و غەیری من هەموو خێزانەکانی بێوەژن بوون ، کاتێ وەفاتی کرد سەری لە کۆشمدا بوو ، لە ماڵەکەی مندا سپاردەکرا ، و فریشتە دەوری ماڵەکەیان دام ، من کچی جێنشین و هاودەم و (صدیق)ی ئەو بووم ، پەروەردگار بێ تاوانی منی لە ئاسمانەوە دابەزاندوز ڕایگەیاند ، وە من بە پاکی ( طیبة ) و لە لای کەسێکی ( پاك ) خەڵق کراوم ، وە پەیمانی لێخۆش بوون و ڕۆزی یەکی پڕ لە ڕێزم پێ دراوە [٣].

## " هاوسەرگیری لەگەڵ سەروەردا ( رضي الله عنها ) "

لە عائیشەوە ، ( رضي الله عنها ) دەڵێت : پاش وەفاتی خەدیجە ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) منی مارەکرد کە تەمەنم ( شەش ) ساڵ بوو ، وە کاتێ گواستمیەوە تەمەنم ( ٩ ) ساڵ بوو ،

---

[١] – صحیح : بوخاری و مسلم گێڕاوایانەتەوە .

[٢] – صحیح : بوخاری و مسلم گێڕاوایانەتەوە .

[٣] – ئەبوبەکری ئاجری ریوایەتی کردوە، زەهەبی دەڵێت: سەنەدەکی باشە سیر اعلام النبلاء (٢٤١/٢).

ژنان هاتن بۆلام خەریکی یاری کردن بووم هاتن ئامادەیان کردم و بەرێیان خستم و منیان بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەیاند [1] . عروە ، دەڵێت : عائیشە ( ﵂ ) نۆساڵ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مایەوە .

## " هاوسەری میهرەبان "

ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بروانێ لە ماڵەکەیدا و لەگەڵ خێزانەکانیدا .. لە ڕەحمەت وبەزەیی ئیسلام و ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام تێدەگات ..

بخوێنە : لە ئەبی ( سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن )ەوە ، لە عائیشەوە ( ﵂ ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە غەزوەی (تەبووك) یان (خەیبەر) گەڕایەوە ، بایەك هەڵیکرد و پەردەی لادا لە سوچێکی چەند بوو کەلەیەکەوە کە هی یاری کردنی عائیشە بوون .. پرسی : ( ماهذا يا عائشه ؟ ) ئەمانە چین .. عائیشە ؟ وتی : کچەکانمن .. پاشان لە نێوانیاندا ئەسپێکی بینی بە پێستە دوو باڵی بۆ کرابوو فەرمووی : ( ماهذا الذي أرى وسطهن ؟ ) ئەی ئەمە چی یە لە ناویاندا ؟ وتی : ئەسپە .. فەرمووی : ( و ماهذا الذي عليه ؟ ) ئەی ئەمە چیە پێیەوە ؟

وتی : دوو باڵە ...

فەرمووی : فرس لە جناحان ؟ ئەسپ و باڵی هەبێت ؟! وتی : ئەی گوێت لێ نەبووە کە سلیمان ئەسپێکی باڵداری هەبووە ؟ دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێکەنی هەتا ددانە پیرۆزەکانی دەرکەوتن [2] .

لە عائیشەوە ( ﵂ ) ، دەڵێت : پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) چاوپێکەوت لەبەردەم دەرگای ژوورەکەما وەستا بوو ، حەبەشی یەکانیش لە مزگەوت خەریك بوون بە رم یاری یان دەکرد ، پێغەمبەری خوا بە عاباکەی دایدەپۆشیم تا لەوان بڕوانم ، و بەدیارمەوە وەستا تا بێتاقەت ئەبووم و ئەڕۆشتم ، لەبەر ئەوە ڕێز لە حاڵی ئەو کیژە کەم تەمەنانە بگرن کە حەزیان لەیاری کردنە [3] . ڕەوشتی پێغەمبەرایەتی ئابەم جۆرە هەلس و کەوتی لەگەڵ هاوسەردا دەکرد . ( ان في ذلك لعبرة لمن يخشى ) .

---

[1] – سەنەدەکی ( صحیح )ە / ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە ( ٩٤٣٥ ) لە ( الادب ) دا .

[2] – صحیح / ئەبو داود ( ٤٩٣٢ ڕیوایەتی کردووە لە ( الادب ) دا

[3] – صحیح / لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە .

ئـەم سـۆز و خۆشەویـستیەی پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) تـەنها خـاتوو عائیـشەی نەگرتبووە وە ، بەڵکو هەموو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوبەشی بوون .. خۆ ئەگـەر لـە شتێکیـشدا تـاك بـوو بێتـەوە ، ئـەوە لەبـەر تەمەنەکـەی بـوە ، وەك خـۆی ( رضي الله عنها ) ڕوونی کردەوە .

## " بوختانەکە "

لـە جـەنگی دەرونیدا بەرامبـەر هەرچی لەدەست بێـت ئـەنجامی دەدات ، ئەگەرچی هەندێك لەو هۆکارانە پیاوی شەرەفمەند شەرم دەکات بەکاری بێنێت . دووڕووەکانیش لـە شاری مەدینە پەنایان بردووەتە بەر دوژمنایـەتی کردنـی پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) و بـانگ کردنـی بـە ئوسـلوبێك کـە سـووکی دەرونیـان نیـشان ئـەدات لـە کاتێکـدا ڕق و قینـە دڵ و دەرونیان داگیر ئەکات ، ئەویش جارێك بە بەکارهێنانی ڕێگای تانەوتەشەر و جارێك بە درۆ هەڵبەستن و بوختان .

هەرچەند دەسەلاتی موسڵمانان زیاتر بێت و پێگەیان چەسپاوتربێت ئەوان زیاتر ڕق و قینی خۆیان ئاشکرائەکەن و زیاتر لە بۆسەدان بۆیان . ئەمەش بەڕوونی لـە غـەزوەی ( بني المصطلق ) دا دەرکەوت ، هەواڵ گەیشتە پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) کـەوا ئـەم هـۆزە خۆیان کۆکردووەتەوە و خۆیان ئامادە کردووە بۆ بەگژا چوونی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و حـارث ی کـوڕی ئـەبی ضـرار )ی سـەرکردەیان لەوپـەڕی ئامادەباشـیدایە بـۆ ئـەم شـەڕە و بەگژداچوونەوەیە ، بۆیە پێغەمبـەری خوا ( ﷺ ) بە خێرایی موسڵمانانی بەڕێ خست بۆ دامرکاندنەوەی ئەو ئاژاوە یە پێش ئەوەی بێتە پێشی.

ئەم جارە کۆمەڵێك لە دووڕوەکان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) بـەڕێ کـەوتن کـە پێشتر لەگەڵی بەڕێ نەکەوتبوون . لەوانەیە متمانە بوونیان بە سـەرکەوتنی پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) هـانی دابـن کـە لەگەڵیـدا بکەونـەڕێ لـە پێنـاوی بەدەسـت هێنـانی شـتێکی دنیاییدا نەك بۆسـەر خستنی ئاین . ئـەوە بـوو موسڵمانان گەیشتنەلای سەرچاوە ئاوێك بەناوی ( المریسیع ) کەلەوێدا ( بني المصطلق ) کۆ بووبونـەوە ، پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) فەرمانی کرد بەسەر پێشەوا ( عمر ) دا کە پێشنیاری ئیسلام بوون بخاتەبەردەمیان.

( عمر )یش ( رضي الله عنه ) بانگی کرد ، بڵێن ( لا اله الا الله ) سەرو ماڵتان پارێزار و ئەبێ ! ئەوە بوو ڕازی نەبوون و هەردوولا بـەتیر بەربوونـە یـەکتری ، پاشـان پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فـەرمانی

کرد بە یەکجار بدەن بەسەریاندا و ئەوەبوو کەسیان دەرنەچوون و پاش کوژرانی دە کەسیان هەموویان بە دیل گیران و لە موسڵمانانیش تەنها یەکێکیان بە هەڵە شەهید کرا ... بەو جۆرە هەموو ئەو هۆزە با قەڵاو شتومەکەکانیانەوە ، کەوتنە دەست موسڵمانان[1] ، بەڵام هەندێ کار و کردەوەی نەشیاو کە دووڕووەکان پێی هەڵسان پاکی و بێ گەردی ئەم سەرکەوتنەی تێکدا و خۆشیی سەرکەوتنی لەبیر موسڵمانان بردەوە[2].

لەو کردەوە ناشیرینانە یان ، ئەو قسەلۆکانە بوون کە دەربارەی خاتوو ( عائیشە ) (رضي الله عنها) و هاوەڵی بەڕێز ( صفوانی کوڕی معطل ) بڵاویان کردەوە ، ئەوە بوو لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە غەزای ( بني المصطلق ) بۆ مەدینە بوختانەکە بڵاو بوویەوە و نەیاران ئەوپەڕی کۆششیان کرد بۆ گواستنەوەی ئەم بوختانانە لە هەموو جێگایەکدا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەماڵەکەیدا بڕوخێنن و پلەوپایەی نزیکترین پیاو لەلای نەهێڵن .

بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیان ، ( ابن ئەبو ) ڕێگەی بەخۆیدا تاوانی خراپەکاری بداتە پاڵ خانمێك کە هێشتا قۆناغی پاکی منداڵی تێنەپەڕاند بوو ، و هیچی لە خراپە نە ئەزانی و ئەوەی بە بیریدا نەهاتبێ خراپە بووە ، و لە ماڵی پاك و بەرزی پێغەمبەرایەتیدا نەبێت ناتوانێ بژی ..

( ابن ابی ) وەك دووپشکی ژەهراوی خۆی حەشاردا ، پاشان دەستی بە گەستنی بێ ئاگایان کرد .. ئەم دوو ڕووە لە ژێر باڵی تاریکیدا مایەوە و دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئەم هەڵبەستراوە ترسناکە[3] کرد . فەرموون بە درێژی ، لەسەرزاری خاتوو عائیشە چیرۆکەکە ببیستن : -

---

[1] - ئیبنو جیری لە ( تاریخ ) دا ریوایەتی کردوە ( ٢ / ٢٦٠ - ٢٦٢ ) لە ڕێی ئیبنو اسحاقەوە بە (مرسل)ی ئەلبانی دەڵێت / ئەم ئیسنادە لەگەڵ لاوازی دا فەرمانی ( عمر )ی تێدا نیە بۆ پێشنیار کردنی ئیسلام ((تعليت فضيلته على فقه السيرة ) غزالي ٣٠٥ .

[2] - فقه السيرة / غزالي بە دەستکارییەوە ( ٣٠٤ - ٣٠٨ ) .

[3] - فقه السيرة / غزالي بە دەستکارییەوە ( ٣٠٦ - ٣٠٨ ) .

## " گێژەڵووکەی دووڕووەکان "

خاتوو عائیشە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەفەرێکی بکردایە تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانیدا ئەکرد و هەرکەس ناوی دەرچوایە لەگەڵ خۆیدا ئەیبرد ، ئەوە بوو لە غەزای ( بني المصطلق ) دا بۆ من دەرچوو ، و لەگەڵ خۆیدا بردمی .

دەڵێت : ئەوسا ئافرەت ئەوەندەیان ئەخوارد بەری دڵیان بگرێت لەبەر ئەوە گۆشتن نەبوون و کێشیان سووك بوو ، وە منیش کاتێ حوشترەکەم ئامادە دەکرا دەچوومە ناو کەژاوەکەمەوە دەهاتن بەشی خوارەوەی کەژاوە کە یان هەڵئەگرت و ئەیانخستە سەرپشتی وشترەکە و بە گوریس توند دەیانبەستەوە و پاشان بەرێ ئەکەوتن .

دەڵێت : دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە سەفەرەکەی بوویەوە و قافڵەی بەرێ خست بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینە و لەڕێدا لە جێیەك دابەزین و بەشێك لە شەو تیایدا راینەوە و ئینجا بانگیان کرد ، کە رێکەون با بڕۆین ئەوە بوو خەڵك خۆیان ئامادە کرد بۆ ڕۆشتن و منیش کەمێك دوورکەوتبوومەوە بۆ هەندێ کاری تایبەتی خۆم .. ملوانکەیەکم لەملدا بوو ، کە لە ئیشەکەم بوومەوە ئەبینم لە ملدانەماوە ، خێرا گەڕامەوە لای قافڵەکە گەڕام نەم دۆزیەوە ، بۆیە چوومەوە بۆ ئەو جێگایەی بۆی ڕۆشتبووم لەوێ دۆزیمەوە ، کاتێ ئەو کەسانەی کە کەژاوەکەیان بۆ من هەڵئەگرت ، هەڵیانگرتبوو لەسەر حوشترەکە بەستبوویانەوە و وایان زانیبوو من لە ناویدام بۆیە حوشترەکەیان گرت و بەرێ کەوتن !

... منیش کە گەڕامەوە لای سەربازگەکە هیچ کەسی لێ نەمابوو هەموو ڕۆشتبوون ! ..

دەڵێت : عاباکەم لە خۆم پێچاو لە جێی خۆم مامەوە و بە خۆمم وت ، کاتێ ئەزانن منیان لەگەڵدا نەماوە ئەگەرێنەوە بەدوامدا و دەمبەن ... سوێند بە خوا لە جێی خۆم پاڵم دابووە کە ( صفوان ی کوڕی معطل ی سلمی ) کە ئەویش بۆ کارێکی خۆی مابووە و دواکەوتبوو ، بەلامدا تێپەڕی و سێبەرەکەی منی بینی و وەستا ، ئەوە بوو ئەوسا پێش ئەوەی ئایەتەکانی بالأپۆشی بەسەرماندا فەرز بکرێت منی بینیبوو ، لەبەر ئەوە کە بینیمی وتی : ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ خێزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) منیش بە جلەکانم خۆم پێچابوویەوە وتی : بۆچی جێماوی " ڕەحمەتی خوات لێ بێت"، دەڵێت : منیش هیچ قسەم لەگەڵ نەکرد ، پاشان وشترەکەی لێم نزیك کردەوە، وتی سەرکەوە ، و پشتی تێ کردم .

دەڵێت : کە سەرکەوتم ڕەشوەی حوشترەکەی گرت و بەرەولای خەڵکەکە بەرێ کەوتین ، سوێند بەخوا خەڵکەکە نەیانزانی ئێمە جێماوین هەتا ڕۆژ بوویەوە و دابەزین ...

ئەوەبوو کە دڵنیابوون لەون بوونم ، ( صفوان ) بە خۆی و حوشترەکەیەوە کەمێکی لەسەر بوو دەرکەوت ، و بوختان چییەکانیش ئەوەی وتیان ، وتیان : سەربازەکانیش بەرێکەوتنەوە ، سوێند بەخوا هیچم لەباسەکە نەئەزانی ، پاشان گەیشتنە مەدینە ، و زۆری نەخایاند نەخۆش کەوتم ، کەسێك ئەو هەواڵەی بە من نەدابوو ، بوختانەکە گەیشتبووە لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و باوك و دایکم ، بەڵام ئەوان هیچیان بە من نە ئەوت .. بەڵام هەستم کرد پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو سۆزەی ئەوسای کەم بوو بووە کە لە کاتی نەخۆشیمدا هەیبوو بۆم ، بۆیە ئەمە لە دڵمدامایەوە ، و هەرکاتێ ئەهاتە ماڵەوە و دایکم لە دەوربەرمدا چاودێری ئەکردم ئەیپرسی : ( کیف تیکم ؟ ) کچەکەتان چۆنە .. هیچی تری نە ئەوت . دەڵێت : منیش ئارامم نەماو تووڕە بووم کاتێ ئەو ساردی یەی پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) بەدی کرد وتم : مۆڵەتم بدە ئەچمەوە لای دایکم ؟ فەرمووی : ( لا علیك ) کەیفی خۆتە . دەڵێت : لە ماڵی دایکم مامەوە ، بەبێ ئەوەی هیچ هەواڵ و خەبەرم لەمەسەلەکە بێت ، تاوەکو پاش بیست و ئەوەندە شەو نەخۆشی یەکە لەسەرم سووك بوو ، ئەوە بوو ئێمەی عەرەب لە ماڵەکانماندا تەوالێتمان نەبوو وەك عەجەمەکان ، لەبەر ئەوە ئەچووینە ئەو دەشتە بۆ دەست بە ئاوگەیاندن و ئافرەتانمان هەموو شەوێك ئەچوونە دەرەوە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن . منیش جارێك چوومە دەرەوە لە گەڵ ( ام مسطح ) دا ، دەڵێت : سوێند بەخوا لەگەڵمدا ڕێی ئەکرد قاچی لەبەرەکەیان هەڵکەوت ، وتی : مسطح چارەڕەش بێ ؟

وتم : سوێند بەخوا شتێکی خراپت وت بە پیاوێك کە ئامادەی بەدر بووە و لە کۆچبەرانیشە !! وتی : بۆچی ، هەواڵت نیە ئەی کچی ئەبوبەکر ؟ وتم : هەواڵی چی ؟ ئەوجا باسەکەی بۆ گێڕامەوە کە بوختانچیان بڵاویان کردبوویەوە ، وتم : بەڕاستی شتی وا بڵاو بووەتەوە ؟ وتی : بەڵێ .. سوێند بەخوا ئەوەیە کە پێت دەڵێم ..

عائیشە دەڵێت : سوێند بێ نەمتوانی دەست بە ئاو بگەیەنم لە خەفەتدا و گەڕامەوە ، سوێند بە خوا هەر دەگریام ، ئەوەندە گریام وامزانی جەرگ و هەم لە گریانا لەت و پەت بوون و بەدایکم وت : خوا لێت خۆش بێت ، خەڵك هەرچی پێیان خۆشە ئەیڵێن دەربارەی من و تۆیش لێم دەشاریتەوە ؟ وتی : کچم ، ئارەحەت مەبە ، هەر ئافرەتێکی جوان هەبوبێت و لە پەنای پیاوێکدا بوبێت کە خۆشیویستبێ و کەم و کورتی نەبووبێت ، ئەوە گومانی تیانیە کە خەڵکی لە نیرەییدا تەسەرتەحەرکی بە هەواڵ هەڵێن و بوختانی بۆ هەڵئەبەستن .

دەڵێت : ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەڵسابوو وتاری بۆ خەڵکەکەدا بوو لەسەر ئەو بابەتە بە بێ ئەوەی ئاگاو خەبەر م هەبێت ، ئەوە بوو پاش ستایشی پەروەردگار فەرمووی : ( أيها الناس ، مابال رجال يؤذونني في أهلي و يقولون عليهم غير الحق ؟ والله ما علمت عليهم الاخيرا ، و يقولون ذلك لرجل [1] والله ما علمت منه الاخيرا ولا يدخل بيتا من بيوتي الا وهو معي ! )

واتە : ئەی خەڵکینە ، لەبەر چی پیاوانێك هەن ئازارم ئەدەن بە تانەدان لە ئەهلەکەم و شتی ناهەقیان لەسەر دەڵێن ؟ سوێند بەخوا لە چاکە زیاتر هیچم لێ نەدیون، وە بۆچی دەربارەی پیاوێك قسە گەلێك ئەکەن کە سوێند بەخوا لە چاکە زیاتر هیچم لێ نەدیوە و لەگەڵ خۆمدا نەبووبێت نەهاتۆتە هیچ ماڵێك لە ماڵەکانم !

عائیشە ( ﵂ ) ، دەڵێت :

ئەوانەی هەڵسان بە بڵاو کردنەوەی بوختانەکە عبداللە ی کوڕی ئوبەی و چەند پیاوێك لە خەزرەج و ( مسطح ) و ( حمنەی کچی جحش ) بوون ئەمیش لەبەر ئەوە بوو کە تەنها ( زەینەبی کچی جحش ) ی خوشکی لە پلەو پایەدا لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاوتای من بوو لە ناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، بەڵام زەینەب خوا پاراستی و لە چاکە زیاتر هیچی دەربارەم نەوتبوو ، کەچی ( حمنە ) کە خوشکی بوو هەڵسا بوو بە بڵاو کردنەوەی ئەو بوختانە . . ئەو جا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو وتارەی دا ، اسیدی کوڕی حضیر وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەگەر ئەو کەسانەی ئاماژەیان بۆ دەکەیت لە ( ئەوس )ن ئەوا ئێمە بۆت چارەیان دەکەین و ئەگەریش لە برایانمان لە ( خەزرەج ) فەرمانی خۆت بڵێ با جێبەجێی کەین ، چونکە سوێند بە خوا ئەوانەی شتی وایان وتووە شایستە ی ئەوەن لە ملیان بدرێت ، ئەوجا (سعدی کوڕی عبادە ) کە وەك پیاو چاکێ دەبینرا ، هەڵسا و وتی : سوێند بێ درۆت کرد .. لە ملیان نادرێ وە تۆ بۆیە ئەم قسەت کرد ، چونکە ئەتزانی ئەو کەسانە (لە خەزرەج ) ن خۆ ئەگەر لە تیرەکەی خۆت بوونایە شتی وات نەئەوت .

( اسید )یش وتی : سوێند بێ تۆ درۆئەکەیت .. بەڵکو تۆ دووڕوویت و بەرگری لە دووڕوان ئەکەیت ... ئەوجا وای لێ هات خەریك بوو شەڕ لە نێوان هەردوو تیرەدا بەرپا بێت ، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆلام و بانگی لە ( علی کوڕی ئەبو تالیب ) و

[1] - مەبەستی ( صفوانی کوڕی معطل )ە ( ﵁ )

(اسامەی کوڕی زید ) کرد و ڕاوێژی پێ کردن .. هەرچی ئوسامە یە ئەوە قسەی چاکی کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو خێزانتە ، خێزانەکانی تۆیش لە چاکە زیاترمان لێ نەدیون ، ئەمەش کە ئەیڵێن درۆ و هەڵبەستراوە !

بەڵام ( علی ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئافرەت زۆرن ، تۆش لە دوای ئەو ئەتوانی جێگەی پڕکەیتەوە ، لە کەنیزەکەشی بپرسە . ( پێشەوا عەلی بۆیە ئەم ڕایەی وت تا لە ئازاری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەم بکاتەوە نەك ئەوەی شتێکی لە گومان لە دڵدا بو بێ بۆ عائیشە ( ﵂ ) و یاخود مەبەستی ناشیرین کردنی خاتوو ( عائیشە ) بو بێت لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و حاشا کە هاوەڵان لە ( اهل بیت ) کاری وایان لێ وەشا بێتەوە ) " وەرگێڕ "

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بانگی لە ( بریرە ) کرد و پرسیاری لێ کرد ، علی (﵁) هەڵسایەوە بۆی و وتی : ڕاست بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بڵێ ... ئەویش دەیوت : سوێند بەخوا خراپەم لێ نەدیوە و ( عائیشە ) هیچ عەیبێکی تیا نەبووە ، بەڵام تەنها یەك شتم لەسەری هەیە ئەویش کاتێ هەویرم دەشێلا ، پێم ئەوت کە هەڵیگرێت و بیپارێزێت ، کەچی ئەو دەخەوت و مەرومالآت ئەهاتن ئەیانخوارد ! دەڵێت : پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و دایك و باوکیشم لەلام بوون ، هەروەها ئافرەتێکی ئەنصاریشم لەلا بوو هەردووکمان دەگریاین ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت و ستایشی پەروەردگاری کردو پاشان فەرمووی : ( يا عائشة ، انه قدكان ما بلغك من قول الناس ، فاتقى الله ، و ان كنت قد قارفت سوءا مما يقول الناس ، فتوبي الى الله فإن الله يقبل التوبة عن عبادة ) .

فەرمووی : ئەی عائشە ، بێ گومان ئەوەی خەڵکی لەسەری ئەدوێن پێت گەیشتووە ، لەبەر ئەوە لە خوا بترسەو ئەگەر خراپەیەك لەوەی ئەو خەڵکە باسی ئەکەن ئەنجامت داوە ، بگەڕێرەوە بۆلای خوا و تەوبەی لەسەر بکە ، چونکە خودا تەوبە و پەشیمانی لە بەندەکانی خۆی قبوڵ ئەکات . دەڵێت : سوێند بەخوا ، هەر ئەو قسانەم لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بیست ئیتر فرمێسکەکانیشم وشك بوون و توانای گریانم نەما و چاوەڕێی دایك و باوکم بووم لە جیاتی من قسە بکەم و وەڵام بدەنەوە کەچی هیچیان نەوت !

عائشە ، دەڵێت : بە گەورەیی خوا ، من چاوەڕێ نەبووم قورئان بێتە خوارەوە و پاکێتی من ڕابگەیەنێ خۆم لەوە زیاتر بەکەم دەزانی ، بەڵام تکام وابوو کە خودا بیخاتە

خەوی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کە من بێتاوانم و ئەوەش کەوتراوە درۆیە ، بەلاّم ئەوەی کە قورئان دابەزێت لەسەر من سوێند بەخوا ئەمەیان بەبیرمدا نە ئەهات و خۆم بە بچوکتر لەوە ئەزانی . دەڵێت : ئەوجا کە بینیم باوکم و دایکم هیچ ناڵێن !! پێم وتن : بۆچی وەلاّمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نایەنەوە ، وتیان : بەخودا نازانین چی پێ بڵێین ، وتی : سوێند بەخوا ئەوەی بەسەر خانەوادەی ( ئەبو بەکر )دا هات نەمدیوە بەسەر هیچ خانەوادەیەکی تردا هاتبێ لەوکاتەدا ..

پاشان وتی : کە ئەوان خۆیان لێم تێ نەگەیاند منیش لەسەری پۆشتم و دەستم بەگریان کرد و پێم وت : سوێند بەخوا هەرگیز تەوبە لەسەر ئەوەناکەم کە باست کرد ، سوێند بەخوا ئەگەر نکوڵیش بکەم هەر بڕوام پێ ناکەن . پاشان فەرمایشتی ( یعقوب علیه السلام )م وەبیر کەوتەوە و وتم منیش هەر ئەوە ئەڵێم کە باوکی یوسف فەرمووی و خوای گەورە لە قورئاندا تۆماری کردووە : ﴿ ... فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ سورة يوسف ، آية (١٨) .

واتە : جا چارم تەنها خۆگری و ئارامگرتنە بە جوانترین شێوە ، هەر خواش داوای کۆمەکی لێ دەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن .

سوێند بەخوا هێشتا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە جێی خۆی هەڵنەسا بوو ، ئەوەی بەسەردا هات کەلە کاتی دابەزینی سروشدا بەسەریدا دەهات ، و بە جلەکانی دایانپۆشی و سەرینێکیان لە ژێر سەریدا دانا ، وە منیش سوێند بەخوا کە ئەوەم بینی نەترسام و نەگوێم لێ بوو ، چونکە ئەمزانی من بێ تاوانم و خوای پەروەردگار ستەمم لێ ناکات ، کەچی دایك و باوکم ، سوێند بەو کەسەی گیانی عائیشەی بەدەستە هەرکە زانیان وا سروش بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دادەبەزێ وەخت بوو گیانیان دەرچێ لە ترسی ئەوەی نەبا خودا قسەی خەڵکی بسەلمێنێت ، پاشان پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هاتەوە سەر خۆ و دانیشت دەبینم رووی وەك گەوهەر دەدرەوشێتەوە و عارەق بە دەم و چاویەوە دەسڕێ و دەفەرموێ : ( أبشري يا عائشة ، قد انزل الله عزوجل براءة لك ) . موژدەت لێ بێت ، عائشە .. پەروەردگار بێ تاوانیی تۆی دەرخست .

دەڵێت : منیش ستایشی پەروەردگارم کرد ، و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە دەرەوە وتاری بۆ خەڵکەکە دا و ئەم ئایەتانەی کە بۆی هاتبووە خوارەوە و خوێندیەوە بۆیان : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لاَ تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنْ الإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ(١١) ﴾ سورة النور . واتە : بێگومان

ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان ( واتە واخۆیان نیشان دەدا لە خۆتانن ) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕ و خراپ بوو بۆتان ، بەڵکو خێر بوو بۆتان (بۆجیا کردنەوەی دووڕووەکان لە ئیمانداراني دڵپاك و ڕاستەقینە ) بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لەگەردنی خۆیدایەتی ، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورە و هەڵبەستی بوختانە کەیە سزایەکی سەخت و گەورەی بۆ ئامادەیە . سەیر ئەوە بوو کە حەد و سزای تۆمەتی ( بوختان – قذف ) جێبەجێ کرا بەسەر هەرکەسێکدا کە تۆمەتەکەی بەسەر ساغ بوویەوە .. عبدالله ی کوڕی کە سەری مارەکە بوو ، هەڵگیرسێنەری ئاگری فیتنەو بوختانە کە بوو ، زۆر لەوە بە ئاگاتر بوو خۆی بخاتە ژێر سزاوە و خەڵکی تووش کردوو خۆی بۆی دەرچوو ..

## " زانستی عائشە ( رضي الله عنها ) "

لە عروەی کوڕی زوبێرەوە ( رضي الله عنه ) ، دەڵێت : هاوەڵی عائشەم کردووە (عائشە پوری بوو ) نەمدیوە کەس زانا تر بێت لەو سەبارەت بە هەر ئایەتێك دابەزیبێت یان یان سوننەتێك یان هۆنراوەیەك یان لە گێڕانەوەی فەرموودەدا ، یان لە بنەچەی عەرەبدا ، یان لە دادگەری یان پزیشکیدا یان لەوەو لەوەدا ... پێم وت : پوریێ .. ئەی زانستی پزیشکی لە کوێوە فێر بوویت ؟ فەرمووی : کاتێ نەخۆش ئەکەوتم و دەرمانێکم بۆ بەکاردەهێنرا ، یان کەسێك نەخۆش ئەکەوت و دەرمانێکی بۆ وەسف ئەکرا ، منیش ناوی ئەو دەرمانەم لەبەر ئەکرد [1] .

## " بەخشندەیی عائشە ( رضي الله عنها ) "

لە ( ئوم زەرەوە )وە ، دەڵێت : ئەبو زبێر بری سەد هەزاری نارد بۆ عائیشە ، ئەویش داوای سینی یەکی کرد ، هەڵیرشتە سەر سینی یەکە و بەردەوام دابەشی ئەکرد بەسەر خەڵکیدا ، کە ئێوارە هات ، داوای نانی ئێوارەی لە کەنیزەکەکەی کرد ، ئەویش وتی : ئەی دایکی ئیمانداران ، بە تاکە دەرهەمێك نەتتوانی تۆزێ گۆشت بکڕی ؟ فەرمووی : خۆت مۆن مەکە ... ئەگەر بیرت بخستمایەتەوە ئەو کارەم ئەکرد [2] . لە عروەوە،

---

[1] – پیاوانی جێی متمانەن : ابو نەعیم لە ( الحلیە ) ڕیوایەتی کردووە ( ٢ / ٤٩ ) .

[2] – پیاوانی جێی متمانەن : ئیبنو سعد ( ٨ / ٦٧ ) الارنؤوط ( سیر ٢ / ١٨٧ ) .

لە عائشەوە ( رضي الله عنها ) دەگێڕنەوە : حەفتا هەزاری بەخشیوە بە نەدار و هەژاران لە کاتێکدا خۆی جلەکانی پینە ئەکرد ( رضي الله عنها ) .

## " وەفاتی ( رضي الله عنها ) "

کاتێ دایکی ئیمانداران عائشە ( رضي الله عنها ) کەوتە سەرەمەرگ فەرمووی : ( ئەو پێشتر وتبوی کە لە ماڵەکەیدا بنێژرێت ) لە پاش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) من کارێکم کردووە [1] ( شایستەی ئەوە نیم لە تەنشتی ئەودا بنێژرێم ) لەبەر ئەوە لە تەنیشت خێزانەکانی دیکەیدا سپاردەم بکەن ئەوە بوو لە ( بقیع ) سپاردەیان کرد (رضي الله عنها) . پێشەوا زەهەبی دەڵێت : مەبەستی لەو وەسیەتەکە ڕووداوی . ڕۆژی (جمل) بو کە تەواو پەشیمان بوو لە و کارەی وە تەوبەی لەسەر کرد ، ئەگەر چی بەنیەتی خەیر و چاکە ئەوەی کرد بوو وە بەڕای خۆی بە باشی زانیبوو بۆ موسڵمانان هەروەك چۆن طلحە ی کوڕی عبیداللە و زبێری کوڕی عوام و کۆمەڵێکی تر لە گەورەها وەلأن ڕەزای خوایان لەسەر بێت (اجتهاد) ی خۆیان کرد بوو [2] .. ئەبوهریرە ( رضي الله عنه ) نوێژی لەسەر کرد .

---

[1] – حاکم ریوایەتیکردووە ( ٤ / ٦ ) دەڵێت : ( صحیح الاسناد ) ، و زەهەبش هاوڕایە .

[2] – سیر اعلام النبلاء ( ٢ / ١٩٣ ) .

## " ١٦ – ئوم شریک ( رضي الله عنها ) "
## " لە ئاسمانەوە ئاو دەدرێت "

ئوم شریك ، خاتوو ( غوزەییەی کچی جابری کوڕی حکیمی دۆسی )یە . زۆربەی زانایان دەڵێن : ئەو ئافرەتە بوو کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد ، بەڵام ئەو قبوڵی نەکرد .. و ئوم شریك شوی نەکرد هەتا وەفاتی کرد ..

ابن عباس ، دەڵێت : ( ئیسلام کەوتە دڵی ئوم شریك و هەر لە مەککە موسڵمان بوو لەو کاتەدا هاوسەری ( ئەبو عەسکەری دوسی ) بوو .

پاشان بە نهێنی دەچووە لای ئافرەتانی قورەیش و هەڵی دەنان بۆ مسوڵمان بوون، تاوەکو لای ئەهلی مەککە ئاشکرا بوو بردیان و پێیان وت : ئەگەر لە بەرخاتری هۆزەکەت نە بووایە وەها و وەهامان لێ ئەکردی ، بەڵام ئەتگێڕینەوە بۆلای هۆزەکەت . دەڵێت : پاشان خستمیانە سەر پشتی وشترێك بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەسەر پشتی حوشترەکەوە هەبێت پاشان سێ ڕۆژ بەو جۆرە بەجێیان هێشتم بەبێ ئەوەی نان و ئاوم پێ بدەن ، وە کاتێ لە جێیەك دائەبەزین منیان لەبەر خۆردا ئەبەستەوە و خۆیشیان ئەچوونە سێبەرێك و نان و ئاویان لێ بڕیبووم. ئەوە بوو لە کاتێکدا کە لە جێیەك دابەزیبوون و منیان لەبەر خۆرەکەدا بەستبووەوە ، هەستم بە ساردی یەك کرد کەوتە سەر سنگم ، دەبینم سەتڵێك ئاوە گرتم و بڕێکم لێ خواردەوە پاشان لە دەستم وەرگیرایەوە و بەرزکرایەوە ..

پاشان گەڕایەوە و گرتم و دیسان لێم خواردەوە و بەرزکرایەوە .. چەند جارێك ئەمە دووبارە بوویەوە ، تا تێر ئاوم بووم و ئەوەی تیایدا مایەوە کردم بەسەر لەش و جلەکانمدا . ئەوە بوو کە بەخەبەر هاتن و شوێنەواری ئاویان پێوەم بینی و حاڵم باش بوو ، پێیان وتم : خۆت بەرداوە و لە ئاوەکەی ئێمەت خواردۆتەوە ؟ وتم : نابەخوا .. شتەکە بەو جۆرە بوو کە بۆتان باس ئەکەم ..

وتیان : ئەگەر ڕاست بڵێیت ئەوا ئایینەکەی تۆ باشترە لە ئاینەکەی ئێمە ، ئەوە بوو کە سەیری ئاوەکەی خۆیانیان کرد هیچی لێ کەم نەبوو بوو ، هەر لە وێدا موسڵمان بون[1].

---

[1] – صفة الصفوة ( ٢ / ٣٧ ، ٣٨ ) .

## " ١٧ - صفیەی دایکی ئیمانداران ( رضي الله عنها ) "

## " سوێند بەخوا ئەو ڕاستبێژە "

کچی ( حیيی کوڕی ئەخطب )ە .. لەنەوەی پێغەمبەری خوا ( هارون )ە سەلامی خوای لەسەر بێت . پێش موسڵمان بوونی ، سلامی کوڕی ئەبی حەقیق هێنای ، و پاش ئەویش کنانەی کوڕی ئەبی لحەقیق کە هەردووکیان لە شاعیرانی جولەکە بوون ، ئەوە بوو ( کنانە) ڕۆژی خەیبەر کوژراو ، خاتوو صفیە دیل کرا ، و لە تیروپشکدا درابە (دحیەی الکلبی)[1] ، ئەویش دای بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و لەبری حەوت سەر مالآتی پێدا[2].

پاشان دوای ئەوەی پاك بووە وە ، مارەی کرد و ئازاد کردنی لە دیلایەتی کردە مارەیی . لە ئەنەسەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) صفیەی کچی حیيی لە ( دحیە) وەرگرت بە حەوت سەر ، و پاشان دایە دەست ( ام سلیم ) تالەلای ئەو عیددەکەی تەواو بکات و ئامادەی بکات .. لەوە لیمەکەشیدا لە شاییەکەیدا چەوری و پەنیر و خورما دابەش کران[3] .

صفیە ( رضي الله عنها ) ئافرەتێکی شەرمەمەند و ژیر و خاوەن ڕەچەڵەك و جوانی و دین بوو، کەسێکی هێمن و بەوقار بوو ...

### " خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئازاری ئەو نەخۆشی یەی دەچەشت کە پێی وەفاتی کرد ، صفیەی کچی حیيی پێی وت : سوێند بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) حەز ئەکەم ئەو ئازارەی تۆ بێت بۆ من . خێزانەکانی پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) لەو لاوە چاوێکیان لە یەکتر داگرت .. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاوی لێیان بوو فەرمووی : ( مضمضن ) واتە بڕۆن ئاو لە دەمتان وەردەن .. وتیان لە چی ئاو لە دەممان وەردەین ؟ .

[1] - هاوەڵێکی پایەبەرزە ، و کەسێکی جوانچاکە و جبریل لەوێنەی ئەودا دەبەزی .

[2] - صحیح / مسلم و احمد ریوایەتیان کردوە .

[3] - صحیح / مسلم ریوایەتیکردووە ( ١٣٦٥ ) ( ٧٨ )

فەرمووی : ( من تغامز كن بها ، و الله انها لصادقة )[1] . واتە : لەو چاو داگرتنەتان لە صفیە .. سوێند بەخوا ئەو ڕاست ئەكات .

## " پێداگری پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەسەر صەفیە "

ئەنەس دەڵێت : من و ئەبو طلحة لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕێمان ئەكرد و صفیەش لە دواوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەسەر پشتی وشترێك بوون ئەوە بوو وشترەكە پێی هەڵخلیسكاو كەوت و ئەوانیشی لەسەر كەوتن ، طلحة خێرا لەسەر وڵاخەكەی دابەزی و بەرەو لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە پەلە ڕۆشت وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تۆ سەلامەتیت هیچ ئازارێكت پێ نەگەشتووە ؟

فەرمووی : ( لا ، علیك بالمرأة ) نەخێر ، بزانە صفیە چۆنە ..

ئەبو طلحةش كراسەكەی دابەدەم و چاویدا و بەرەو لای صفیە ڕۆیشت ، و كراسەكەی پیادا ، ئەویش هەڵسایەوە ، طلحة وڵاخەكەی بۆ توند كردنەوە و صفیە و پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) سەركەوتن[2] .

خوێنەری بەڕێز : بڕوانە ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەی طلحة ، دەم و چاوی خۆی دادەپۆشی و پاشان جلەكان ئەدابەسەر ( صفیە )دا ( ﵂ ) بۆ ئەوەی دەستی بەری نەكەوێت !! بەڕاستی لەم چاخەی ئێستاماندا ئەدەبی وەها زۆر كەمە و .. بەد ڕەوشتی لە ئەوپەڕی ناشیرینیدا خۆی نیشان ئەدات ..

## "وەفاتی "

خاتوو ( صفیە ) ( ﵂ ) ساڵی (٥٠)ی كۆچی وەفاتی كردووە ، وتراویشە ساڵی (٥٢) لە بقیع بەخاك سپێردراوە ..

---

[1] – ئیبنو سعد ڕیوایەتی كردوە ( ٨ / ١٢٨ ) پیاوانی جێی متمانەن ، بەلام ( مرسل )ە .

[2] – سەنەدەكی ( صحیح )ە / بوخاری ( ٦ / ١٢٤ ) و مسلم ( ١٣٦٥ ) هەردووكیان گێراویانەتەوە

# " ١٨ - رقیە (رضي الله عنها)ی کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

کچی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) و خاتوو ( خدیجە ) ( رضي الله عنها ) دایکیەتی .. پێش کۆچ ( عتبەی کوڕی ئەبو لهب ) مارەی کرد .

پاش ئەوەی ئایەتی : ﴿تَبَّتْ يَدَا ئەبو لَهَبٍ وَتَبَّ(١)﴾ سورة المسد [١] . دابەزی باوکی بە ( عتبەی )ی وت : سەرم لەسەرت حەرام بێ ( واتە : حاشات لێ ئەکەم ) ئەگەر کچی (ﷺ) تەلاق نەدەی ، ئەویش پێش گواستنەوە لێی جیابوویەوە .

خاتوو ( رقیە ) لەگەڵ دایك و خوشکەکانیدا موسڵمان بوو پاشان پێشەوا (عوسمان) خواستی .. ابن سعد دەڵێت : لەگەڵ ( عوسمان )دا کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( انهما لاول من ها جر الى الله بعد لوط )[٢] .

واتە : ئەو دوانە یەکەمین کەسن کە بۆلای پەروەردگاریان کۆچیان کردبێت ، لە دوای لوط پێغەمبەرەوە ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) .

لە پێشەوا ( عوسمان ) ، ( عبداللە )ی بووە و بە ( باوکی عبداللە ) ناویان دەهێنا و کە تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ کەڵەشێرێك دەنووکی لە دەم و چاوکی داو دەم و چاوی تلۆقی دەرکردو بەوە وەفاتی کرد .

پاشان لە دوای پێشەوا ( عوسمان ) کۆچی کرد بۆ مەدینە و لە پێش جەنگی (بەدر ) نەخۆش کەوت و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ( عوسمان ) ( رضي الله عنه ) ی لەلا هێشتەوە و لە کاتێکدا موسڵمانان لە ( بەدر ) بوون وەفاتی کرد [٣]. ڕەزای خوای لەسەر بێت .

---

[١] - مانای ئایەتەکە : - دەستەکانی ئەبو لەهەب بشکێن و ریسوابێت ، بێگومان هەر ریسوا دەبێ .

[٢] - حافظ لە ( الصحابە ) ( ١٢ / ٢٥٨ ) بە لە فزێکی تر هێناویەتی و ریوایەتی کردوە بۆ ( ئیبنو مندە ) و دەڵێت : سەندەکەی بێ بەڵگەیە .

[٣] - ئیبنو سعد ( ٨ / ٣٦ ) .

# " ١٩ - ئوم کلثوم ( رضي الله عنها ) ، کچی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) "

منداڵی چوارەمی پێغەمبەری ئازیزە ( ﷺ ) .. وتراوە کە ( عتیبە )ی کوڕی ئەبو لەهب مارەی کردووە و دواتر لێی جیا بووەتەوە .. ئوم کلثوم موسڵمان بووە و هیجرەتی کردووە پاش پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

کاتێ خاتوو ( رقیە ) ی خوشکی وەفاتی کرد ، پێشەوا ( عوسمان ) هێنای بە کچێتی لە مانگی ( ربیع الاول ) ی ساڵی ( ٣ )ی کۆچیدا و هیچ منداڵی لێی نەبووە . وە لە شەعبانی ساڵی ( ٩ ) کۆچیدا وەفاتی کردووە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( لوکن عشرا لزوجهن عثمان ) ئەگەر دە کچم بوایە یەك لە دوای یەك ( عوسمان )م مارە دەکردن .. ( ابن سعد گێڕاوەتیەوە).

لە ( انس )ەوە ، دەڵێت : چاوم بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کەوت لەناو گۆڕەکەی (ئوم کلثوم )دا دانیشتبوو فرمێسك لە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە[1] .

ڕوون کردنەوەیەك : ئەم ڕیوایەتە دژی ئەو فەرموودە نیە کە دەفەرموێت : ( ان المیت یعذب ببکاء اهله علیه )[2] ، واتە : مردووەکان بە گریانی کەسو دکاریان بەسەریانەوە ، ئازار ئەدرێن .

مامۆستای ئەلبانی دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت : مەبەست گریان بەرەهایی نیە ، بەڵکو گریانێکی تایبەتی مەبەستە ئەویش ڕۆ ڕۆ کردنە[3] خۆ کوشتن و واوەیلاکردن و لاوانەوەیە.

نووسەر ، دەڵێت : فەرموودەی زۆریش هاتووە کە باسی لە گریانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و گریانی هاوەڵان ئەکات [4].

---

[1] - صحیح / بوخاری ڕیوایەتیکردووە ( ٣ / ١٢٦ ، ١٢٧ ) و غەیری ئەویش .

[2] - صحیح / زانایان هاودەنگن لەسەری .

[3] - احکام الجنائز ( ٢٨ )

[4] - بڕوانە کتێبی ( الرسول یبکی ) چاپی ( دارالفجر للتراث ) ی نووسەر .

# " ٢٠ - سمیه کچی خباط ( رضي الله عنها ) "

خانمی بەڕێز ( سمیەی کچی خباط )ی ( مولاة )ی ئەبو حذیفەی کوڕی مغیرەیە و دایکی عەمماری کوڕی یاسرە [١]، هەر زوو لە مەککە موسڵمان بوو ، یەکێ بوو لەوانەی ئازار ئەدرا لە پێناوی بیروباوەڕەکەیدا و بەڵام لەسەر ئاینەکەی جێگیر و دامەزراو بوو، تا جارێ ئەبو جەهل ڕمێکی چەقاند ورگی و شەهیدی کرد . ئەو ئافرەتێکی بە تەمەن بوو وە یەکەمین شەهید بوو لە ئیسلامدا ( رضي الله عنها )[٢] ، ( یاسری کوڕی عامر)یش مێردی بوو .[٣]

د . محمود عمارە دەڵێ ئەبێ هەست بە قووڵی ئەو نەهامەتیە بکەین لە چاوی (عمار ) دا کاتێ دەبینێ لەبەردەمیدا دایکی شەهید ئەکرێ بێ ئەوەی هیچی لە دەست بێ بۆی بکات . خۆ ئەگەر یاسری باوکی لە ژێر ئازاردا گیانی سپاردبێ ئەوا چارە نووسی دایکی زیاتر بۆی بە ئازار بوو وەك موسڵمانێك و وەك عەرەبێك ، بەڵام ئەوە تەنها بیروباوەڕ و ( مبدا ) ەکە خاوەنەکەی وا لێدەکات لە پێناویدا گیانیان ببەخشن . خوێنەری بەڕێز ئێستا ئەم بەڵاو نارەحەتی یە گەورەیە بهێنەرە پێش چاوی خۆت ..

ئێستا هەر کەسێ تاکە وشەیەك ببیستێت کە شەرم و ناموسی بریندار بکات ، بۆ داکۆکی کردن لە کەرامەتی ئامادەیە گیانی ببەخشێ ڕای گشتیش پاڵپشتی دەکەن .. هەر هیچ نەبوو یاسا تۆڵەی بۆ دەکاتەوە .

بەڵام ( عمار ) بە چاوی خۆی دەستی غەدر و ناپاکی دەبینێت کە ئەدا لە دایکی و گوێی لە ناڵە و هاواری دایکیەتی ، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی نیە و هیچی پێ ناکرێت.

تەنانەت پێغەمبەری خوایش ( ﷺ ) لە دوعا زیاتر هیچی لە دەست نایەت بۆیان بکات .. بەڕاستی بەڵاو نەهاتە لەوکاتەدا ئیدی گەورەترە لەوەی مرۆڤ بتوانێ خۆی لەبەردەمیدا ڕاگرێ .. بەڵام ( عەممار ) بەسەر ئەو نەهامەتی یەدا زاڵ بوو ، بە بیروباوەڕی پتەو سەرکەوتوانە ئەو قۆناغەی بڕی، ئەگەر چی ماڵئاوایی لە باوکی و لە دایکی کرد ، بەڵام مانەوەی بیروباوەڕ و عەقیدەکەی بونە هۆی دڵدانەوەی [٤] .

---

[١] – لە بەشی ( پیاوانێك لە دەورەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ) باسی ژیانیمان کرد .

[٢] – البدایە و النهایە ( ٣ / ٥٩ ) .

[٣] – ئەمیش لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو .

[٤] – تأملات في السیرە النبویە . لاپەڕە ( ٧٦ ) .

## " ٢١ - جوەیریەی کچی حارث ( ﵁ ) "
## " گەورەترین بەرەکەت بوو بۆ هۆزەکەی "

دایکی ئیمانداران ، جوەیریەی کچی حارثی ضراری ( المصطلقي )یە .. ساڵی (٥) و لە غەزوەی ( المریسع ) دا بە دیل گیرا .. وناوی ( برّە ) بوو .. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی گۆڕی بۆ ( جویریە ) . وە یەکێ بوو لە ئافرەتە پایە بەرزەکان .

لە عائیشەوە ( ﵂ ) ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دیلە ئافرەتەکانی (بني المصطلق ) ی دابەش کرد ، جویریەی کچی حارث بە تیروپشك بۆ ثابتي کوڕی قەیسی کوڕی الشماس یان بۆ کوڕەمامێکی دەرچوو ئەوە بوو جوەیرەیە خۆی کڕیەوە لێی و هات بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، من جویرەیەی کچی حارثی کوڕی ئەبی ضراري سەرۆك و گەورەی هۆزەکەم .. خۆت ئەزانی ئێستا چیم بەسەردا هاتووە ، و کەوتمە تیروپشکی ثابتی کوڕی قیس ی کوڕی شماس یان کوڕەمامێکی ، و خۆم کڕیەوە ، ئێستا هاتووم داوات لێ ئەکەم یارمەتیم بدەی لە دانی بری ( موکاتەبەکەدا ) . فەرمووی : ( فهل لك خير من ذلك ؟ ) لەوە باشترت ناوێت ؟ وتی : چی یە ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ؟ فەرمووی : ( اقضي عنك كتابتك و اتزوجك) واتە : بری ( مکاتبە ) کەت بۆ دەدەم و مارەت دەکەم . وتی : ڕازیم ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

دەڵێت : ئەم هەواڵە گەیشتە لای خەڵك کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جویریەی کچی حارثی کوڕی ئەبی ضراری کردووە تە خێزانی ، خەڵك هەموو وتیان : بووینە خزمی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

دەڵێت : هاوسەرگیری جویرەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووە هۆی ئازاد کردنی سەد ماڵ لە بنی المصطلق ، ئاگادارنیم هیچ ئافرەتێك ئەوەندە بەرەکەتی بۆ هۆزەکەی بوبێت[١] .

هەر کە ( بەنو المصطلق ) ئەم و گەورەیی یەیان لە ئیسلام و موسڵمانان بینی هەموویان موسڵمان بوون و ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێنا . هەر ئەمەش بوو

---

[١] - صحیح : بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە .

ئاوات و ئامانجی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆسەر خستنی بانگەوازەکەی لەناو خەڵکیدا .. جا چ خاوەن ڕایەکی دانا باڵاترە لەم ڕاوبۆچوونەی سەرەرمان ( ﷺ ) [1]. وە ( ابن حجر ) لە ( الاصحابە ) دا ( ٢ / ١٦٠ ) دەڵێت : کە ( الحارث )ی باوکیشی هاتووە بۆ مەدینە و موسڵمان بووە .

## " پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چەند وشەیەکی گشتگیری فێر دەکات "

لە جویریەوە ، دەڵێت : سەر لەبەیانی یەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هات بۆلام ( تەسبیحات )م دەکرد ، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە و نزیك نیوەڕۆ هاتەوە فەرمووی : (اما زلت قاعدە ؟ ) ئەڵێی هێشتا دانیشتویت ، وتم : بەڵێ فەرمووی : (الا اعلمك كلمات لوعدلن بهن عدلتهن ، أو وزن بهن و زنتهن ، يعنى جميع ماسبحت ، سبحان الله عدد خلقه ، ثلاث مرات، سبحان الله زنة عرشه ، ثلاث مرات ، سبحان الله رضا نفسه ، ثلاث مرات ،سبحان الله مداد كلماته، ثلاث مرات).

فەرمووی : ناتەوێ چەند وشەیەکت فێرکەم کە ئەگەر لەگەڵ ئەو وشانەی تۆ دا کێشانە بکرێت کە لەو کاتەوە وتووتە ، هاوسەنگ و یەکتا دەردەچن وشەکانیش ئەمانەن : " هێندەی ژمارەی دروستکراوانی خوا هێندەی خوا خۆی پیێ ی خۆشە و ئەندازەی سەنگینی عەرشی خوا و هێندەی مەرەکەبی وشەکانی زاتی خۆی پاك و پێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار سێ جار ئەمانە بڵێ ..

## " وەفاتی "

پاش گەشتێکی پاك و ژیانێکی ڕێزدارانە لە ژێر سایەی ئاڵای ئیسلامدا .. خاتوو جویریە ساڵی ( ٥٠ )کۆچیدا وەفاتی کرد ( رضي الله عنها ) .

[1] – زوجات النبي الطاهرات و حكمة تعدد هن / مامۆستا / محمد محمود الصواف ( ٧٤ ، ٧٥ ) .

## " ٢٢ - سودەی کچی زمعە ( رضي الله عنها ) "

## "بەڵام من حەز ئەکەم لەڕیزی خێزانەکانی تۆدا زیندوو بکرێمەوە"

کێ یە ؟

دایکی ئیمانداران ( سودەی کچی زمعەی کوڕی قیس ی قورەیشی عامری )یە و یەکەمین ئافرەت بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە دوای خاتوو خەدیجە ( رضي الله عنها ) هێنای .

خانمێکی پایەبەرز و خانەدان بوو ... یەکەمجار خێزانی ( سکرانی کوڕێ عەمر ) بوو لەگەڵیدا کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ، بەم کۆچەشی بنەماڵەکەی تووڕەکرد . ئەوە بو کە لە هیجرەت گەڕایەوە ، هاوسەرەکەی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) وەفاتی کرد ، کەیەکێ بوو لە پشتیوانە چاکەکان بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بە مردنی ( سوودە )ی بە بێ پشت و هاودەم بە جێ هێشت .. تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هێنای وتەمەنی ( سودە ) ئەو کاتە ( ٥٥ ) ساڵ بوو ..

### " چیت دەوێت "

ڕۆژان تێپەڕین و ( سوودە ) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) مایەوە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەبەر چەند هۆکارێك وای بینی کە تەڵاقی بدات .

ئیتر چی ڕووی دا ؟

قاسم ی کوڕی ئەبی بەززە ، دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هەواڵی تەڵاقدانی ( سوودة )ی پێ گەیاند سوودە لەسەر ڕێگەکەی دانیشت و وتی : سوێندت ئەدەم بەو کەسەی وەحی بۆ ناردویت ، بۆچی تەڵاقت دام ؟ ئایا خوا فەرمانی پێ کردویت ؟

فەرمووی : نەخێر .

وتی : دەی سوێندت دەدەم بە خوا بمگەڕێنەرەوە ( راجعني ) ، خۆ من هیچ پێویستم بە پیاونی یە ، بەڵام حەز ئەکەم لە ڕیزی خێزانەکانتدا زیندوو بکرێمەوە . پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گێڕایەوە . دەڵێت : منیش ئەو ڕۆژانەی کە سەرەی من بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلام بمێنێتەوە ئەمدایە ( عائشە )[١] .

---

[١] - سەنەدەکی ( صحيح )ە ، بەڵام ( مرسل )ە . ئیبنو سعد ( ٨ / ٥٤ ) .

بەڵێ : دایکی ئیمانداران .. جا چ شانازی یەك خۆی دەدا لەم شانازی یە .. کە لە ڕۆژی هەڵسانەوە دا وەك هاوسەری کۆتا پێغەمبەری مرۆڤایەتی ( ﷺ ) حەشر بکرێت .. خۆشیت لێ بێت .

خاتوو عائشەش ( رضي الله عنها ) ئەم چاکەیەی ( خاتوو سودە )ی لە بیر نەئەکرد لە عائیشەوە ، دەڵێت هیچ ئافرەتێك نەبوو ئەوەندەی ( سوودە ) حەز بکات من لە جێگەی ئەوا بم ( في مسلاخها ) ئافرەتێك بو جۆرە توندی یەکی بوو ( حدە ) وە کاتێك چوو بە تەمەندا سەرەکەی خۆی لەلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەخشی بە من [1] . خاتوو سودە ( رضي الله عنها ) لە سەردەمی پێشەوا عمری کوڕی خەتابدا وەفاتی کرد [2] .

---

[1] – صحیح / مسلم ڕیوایەتی کردووە ( ١٤٦٣ ) .

[2] – بوخاری لە ( تاریخ ) ( ١ / ٤٩ ، ٥٠ )

## " ٢٣ - میمونەی کچی حارث ( رضي الله عنها )

## " لە هەموومان لەخواترسترە و لە هەمووما زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بەجیّ دیّنیّت "

فەرمایشتێکی عائشە ( رضي الله عنها )

پێناسی : مەیمونەی کچی حارث ی کوری حەزن ی .. هیلالی یە . خێزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و خوشکی ( ام فەزلّ ) ی خێزانی ( عباس ) و پوری ( خالدی کوری وەلید ، و پوری ( ابن عباس )ە ، رەزای خوایان لەسەر بێت .

لە ئافرەتە ناودارو پایەدارەکان بوو..

مجاهد دەلّێت : ناوی ( بەررە ) بوو ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گۆری بۆ (میمونە)[1] .

لە پێشدا و پێش ئیسلام مەسعودی کوری عەمری ثەقەفی هێنابوی و پاشان لیّ ی جیابوویەوە .

دواتر ( ابو روهم ی کوری عبدالعزی ) هێنای و ئەمیش مرد .. ئەوجا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە دوای لێبوونەوە لە ئەنجامدانی ( عمرە القضاء ) لە سالّی ( ٧ ) دا و لە مانگی ( ذي القعدة ) دا هێنای .

لە ( علی کوری عبدالله ی کوری عباس )ەوە ، دەلّێت : کاتیّ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی بچێت بۆ مەککە لە سالّی ( القضیة )[2] دا ، ( ئەوسی کوری خولی ) و ( ئەبو رافع )ی ناردەلای ( عەباس ) ئەویش مەیمونەی پیّ دا لە ڕێگا وشترەکانیان لیّ ون بوو چەند رۆژێك لە ( رابغ ) مانەوە تا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە ( قودەید ) پێیان گەیشت و لەوکاتەدا حوشترەکانیان دۆزیبوووەوە لەگەڵیدا رێیان کرد هەتا گەیشتنە مەککە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یەکێکی ناردە لای ( عباس ) و لەلای باسی کرد ، خاتوو ( مەیمونە ) کاری خۆی دابوویە دەست ( عباس ) ەوە(رضي الله عنه) ئەویش دوای داخوازیکردنی

---

[1] – واتە سالّی رێکەوتن ( رێککەوتنی حودەیبیە ، ( وەرگێر ) رحیق المختوم ص ٣٥٢ .

[2] – حاکم ریوایەتیکردووە ( ٤ / ٣٠ ) دەلّێت ( صحیح الاسناد )ە . زەهەبیش هاورایە .

لەلایەن  پێغەمبەری خوا وە ( ﷺ ) ، پێیدا [1] .. ئەمیش دوایەمین ئافرەت بوو  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هێنای .. وە کەسێکی دنیا نەویست و خواپەرست بوو .

مامۆستا رشید رەزا ، ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ، دەڵێت : ( گێڕدراوەتەوە کە مامی  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ( عباس ) هانی داوە  بیخوازێت  و هەر ئەویش دوای وەرگرتنی مۆڵەتی ( میمونە ) مارەی کردووە ، خۆ ئەگەر (عباس)(ﷺ) لەو هاوسەرگیری یە بەرژەوەندی یەکی مەزنی بەدی نەکردبایە ئەم هەموو چاودێری یەی لە مەیمونە نەئەکرد لە پێناو ڕازی کردنی خێزانەکەیدا ) .

هەروایش بوو ، بەرژەوەندی گەورە لەم هاوسەرگیریەدا نزیك بوونەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو لە هۆزی ( هیلالی )یەکان ، ئەوە بوو ئەم پیاوەتی و جوامێری و هانایەیان لەلا بەنرخ و گەورە بوو ، بۆیە پۆل پۆل دەهاتنە ڕیزی ئیمانداران و بوونە پاڵپشت و پشتیوان و هاودەمی  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

کاتێ  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خواستی ، خاتوو ( مەیمونە ) بە ساڵا چوو بوو ، ئیتر خوێنەری بەڕێز هیچ شوێنەوارێك بۆ حەز و ئارەزوو لەم جۆرە هاوسەرگیری یە دابەدی ئەکەیت ؟

بەڵکو ئەمە گەورەیی و بەزەیی  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نیشان ئەدات لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە سیاسەت و لێزانی و زیرەکی ئەو نیشان ئەدات ...

خۆ ئەگەر  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) هیچ نیشانەیەکی بۆ حەزو ئارەزو هەبوایە لە هاوسەرگیری یەکانیدا کە هەموویان بێوەژن بوون بێجگە لە ( عائشە ) ، ئەوا دەچوو کچانی هاوتەمەنی خۆی مارە ئەکرد وە هەموانیش بە ئاواتی ئەوە بوون کە خزمایەتی لەگەڵ ئەو زاتە خۆشەویست و لە دڵا جێگیر و بەڕێزەدا بکەن ، بەڵام ئەو زۆر لەوە باڵاترە کە بانگەوازی حەز و ئارەزوو وەلامبداتەوە هەزار جار حاشا بۆ  پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) و هەموو مرۆڤایەتی و لوتکەی ڕەوشت و پیاوەتی .. لەو قسە پوچ و بێ بنەمایانەی دوژمنانی ئیسلام دەیدەن بە گوێی خەڵکیدا .. بەڕاستی ئەو زاتێکی پارێزراو و (عصوم)ە لە هەموو گوناهێك [2] .

---

[1] – طبقات / ئیبنو سعد ( ٨ / ١٣٢ )

[2] – زوجات النبي المطهرات ( ٨١ ، ٨٢ )

## " خاتوو ( میمونە ) (رضي الله عنها) لەبەرەی جەنگدا !!

خانمی بەڕێز مەیمونە ش ( رضي الله عنها ) لە جەنگدا بەشداری کرد تاوەکو ئەویش پشکی هەبێت لە خەبات لە پێناوی خوادا ، کاتێ کە خێزانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو !! مەگەر خوای گەورە نا فەرموویێت کە : ﴿ ... وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ سورة النساء ، آية (٩٥) .

واتە : خوا فەزڵ و رێز و پاداشتی گەورە و بێ سنووری ئەو تێکۆشەرە موجاهیدانەی داوە بەسەر ئەو دانیشتوانەدا ( کە نەچوون بۆ شەڕ ) .

کەواتە ئەو پێویستی بەو پاداشتە مەزنە هەیە !!

لە غەزای ( تبوك ) دا خاتوو ( میمونە ) لە ڕێزی خەباتکاراندا بوو ، تیماری بریندارەکانی ئەکرد و ئاوی دەدتایە موجاهیدان و لە پێناوی خوادا باشترین خەباتی ئەکرد .

وتراوە کە ئەو ( رضي الله عنها ) یەکەم ئافرەت بووە تیمێکی لە ئافرەتان پێکەوە ناوە بۆ بەدەمەوە چوونی بریندااران و هەڵسان بە ئەرکی خەباتکاران لە مەیدانی شەڕدا ، ئەوە بوو لە میانەی خەباتیدا بە تیرێك لە تیرەکانی دوژمن پێکرا لە کاتێکدا ئاوی بۆ بریندارەکان دەگواستەوە ، و ئەگەر ڕەحم و میهرەبانی خودا نەبوایە ، شەهید دەبوو .

## " وەفاتی "

پاش ئەوەی خاتوو ( مەیمونە ) لە ڕێوڕەسمەکانی ( حەج ) بوویەوە لە ئیحرامدا سەری تاشی ، و کاتێ وەفاتی کرد تازە مووی سەری هاتبوونەوە [1] ، لە ( یەزیدی کوڕی ئەصەم )ەوە ، دەڵێت : هەر لە ژێر ئەو کەپرەدا ناشتمان و سپاردەمان کرد کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تیایدا گواستیەوە ، ئەوە بوو سەری لە ( حەج ) تاشیبوو .. من و ابن عباس چووینە ناو گۆڕەکەی [2] .

---

[1] – سەنەدەکی ( صحیح )ە / ئیبنو سعد ریوایەتی کردووە ( ٨ / ١٣٨ ) لە یەزیدی کوڕی ئەحمەدەی ارنؤوط دەڵێت : لەوانەیە میمونە ( رضي الله عنها ) ئەوەی پێ نەگەیشتبێ کە نابێ ئافرەت لە ( حەج ) دا سەری بتاشێت ، بەڵکو کورتی دەکاتەوە .. ابو داود ( ١٩٤٨ ) لە فەرموودەی ( ئیبنو عباس ) ریوایەتی کردووە ( کە ئافرەتان ئەوەیان لەسەر نی یە کە سەریان بتاشن ، بەڵکو ئەوەیان لەسەر کە قژیان کورت کەنەوە ) ( حافظ ) یش لە ( التلخیص ) دا ئیسنادەکەی بە ( حسن ) داناوە ( ٤ / ٢٦١ ) سیر ( ٢ / ٢٤٣ ) . پەراوێز .

[2] – حاکم ریوایەتی کردووە ، و دەڵێت : ( صحیح الاسناد )ە و زەهەبیش هاورایە ( ٤ / ٣١ ) .

لە ( عطاء ) ەوە ، دەڵێت : میمونە ( ﷺ ) لە چۆڵەوانیدا وەفاتی کرد ، من و ( ابن عباس ) چووین بەدەمیەوە ، وتی : ئەگەر تابوتەکەیتان بەرزکردەوە ، مەیهەژێنن و مەیخزێنن [1] .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ابن عباس ( ﷺ ) فەرموویەتی : " لەگەڵیدا میهرەبان بن ، ئەو دایکتانە " .

## " پیاهەڵدان "

خاتوو عائیشە ( ﷺ ) پاش وەفاتی میمونە ( ﷺ ) فەرمووی : " ئەوا مەیمونە ڕۆیشت .. سوێند بە خوا .. لە هەمووومان لە خواترس تر بوو ، وە لە هەمووومان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بە جێ ئەهێنا [2] ! "

---

[1] – حاکم ڕیوایەتی کردووە ، و دەڵێت : ( صحیح الاسناد )ە ( ٤ / ٣٣ ) و زەهەبیش هاوڕایە .

[2] – جانەپاڵەکەی ( حسن )ە / حاکم ڕیوایەتی کردووە ( ٤ / ٣٢ ) و ارنؤوط بە ( حسن ) دایناوە ، ( سیر ٢ / ٢٤٤ ) .

## " ٢٤ - ئوم وەرەقەی کچی حارث ( رضي الله عنها ) "

## " لەگەڵمان وەرن با سەردانی ئەو شەهیدە بکەین "

کێیە ؟

هاوەڵی پایەبەرز ، ئوم وەرەقەی کچی عبدالله ی کوڕی حارث ی ئەنصاری یە یەکێ بوو لەوانەی ، بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) .

ابن الجوزی ، دەڵێت : ( ابن الحصین )بە ئیسنادێك لە ئوم وەرەقەی کچی عبدالله ی کوڕی حارثە وە هەواڵی پێ داوین کە قورئانی کۆکردوەتەوە ( رضي الله عنها ) و پێغەمبەری خوا (ﷺ ) فەرمانی پێ کردووە کە ئیمامەتی بۆ خانەوادەکەی خۆی بکات وە بانگبێژێکی هەبوو ، و ئیمامەتی بۆ خانەوادەکەی دەکرد [١] .

هەر لەوەوە ، لە نەنکی یەوە لە دایکیەوە ( ئوم وەرەقەی کچی عبدالله ی کوڕی حارث ی ئەنصاری یەوە : - پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەردانی ئەکرد و بە (شەهیدە ) ناوی ئەبرد .. وە ئەو قورئانی کۆ دەکردەوە .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتێ غەزای بەدری ئەنجامدا ، ئوم وەرەقە پێی وت : مۆڵەتم بدە ، ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) با لەگەڵتان بێم و تیماری بریندارەکانتان بکەم و بەدەم نەخۆشەکانەوەبم ، بەڵکو خوا شەهادەتم پێ ببەخشێت . ئەویش فەرمووی : ( إن الله عزوجل مهد لك الشهاده ) .

بێگومان خوای پەروەردگار شەهادەتی پێ بەخشیویت .. ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی پێ کرد بوو کە ئیمامەتی بۆ بنەماڵەکەی بکات .. تا جارێك لە نوێژدا کەنیزەکێکی و غولامێکی پێکەوە شەهیدیان کرد لەسەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا ( عمر ) دا ( رضي الله عنه ) ، وتراوە کە ئوم وەرەقە کەنیزەك و غولامەکەی خۆی شەهیدیان کرد عمریش ( رضي الله عنه ) فەرمووی : بەڕاستی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕاستی فەرموو کە دەیوت : وەرن باسەردانی ( الشهیدة ) بکەین [٢]... " ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت .

---

[١] - فەرموودەی ( حسن )، صحیح ی سوننەتەکانی ( ابی داود ) ( ٥٥٣ ) و ئەلبانی دەڵێت :(حسن)ە.

[٢] - صفه الصفوه ( ٢ / ٥١ ) .

وە لە لای ( ابی داوود ) هاتووە لە ئوم وەرەقەوە ، دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چوو بۆ بەدر ، پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، با منیش بێم لەگەڵتان بۆ مەیدانی شەڕ ، لەوێ تیماری بریندارەکان بکەم ، بەڵکو خوا شەهادەتم پێ ببەخشێ ، ئەویش فەرمووی : " قري في بيتك ، فإن الله تعالى يرزقك الشهاده " لە ماڵەکەی خۆتدا بمێنەرەوە ، بێ گومان خوا شەهیدین پێ دەبەخشێ . لەبەر ئەوە بە ( شەهید ) بانگ دەکرا .

دەڵێت : ئەو قورئان خوێن بوو ، مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وەرگرت کە لە ماڵەکەیدا بانگبێژێك دانێ و بانگی بۆ بدات ، دەڵێت : کەنیزەکێك و غولامێکی لە ماڵەکەیدا هەبوو ، جارێك بە قوماشێك لە لۆکە دەمیان گرت هەتا خنکا و پاشان بۆی دەرچوون ، کە ڕۆژ بوویەوە ( عمر ﷺ )، وتاری بۆ خەڵکەکە دا و فەرمووی : هەر کەس زانیاری لە شوێنی ئەو دوانە هەیە یان ئەوانی بینیوە ، با بیانهێنێت بۆم ، ئەوە بوو فەرمانی کرد لە خاچیان دان ، و بوونە یەکەمین لە خاچدراو لە مەدینەدا[1] .

[1] – فەرموودەی ( حسن ) صحيح سنن ابی د ئەلبانی دەڵێت : ( حسن ) .

## "٢٥ - ئوم خلاد ( رضي الله عنه ) "

## " لە دوای تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )

## هەرچی مەینەتی یە ئاسانە "

ئوم خلاد ، خێزانی هاوەڵی پایەبەرز ( عمری کوڕی جموح )ە[١] . " ئوم خەلاد (رضي الله عنه) لەگەڵ هاوسەرەکەی و کوڕەکەی و براکەیدا چوون بۆ غەزای ئوحود ، و کاتێ هەرسێکیان شەهید بوون ئەم هاوەڵە پایەبەرزە بەسەر وشترەکەیەوە هەڵیگرتن و بەرەو مەدینە بەڕێ کەوت ، و لە ڕێگا عائشە ، ( رضي الله عنه ) ی پێ گەیشت بە ئوم خلادی فەرموو : دیارە کە هەواڵت پێیە ، دەنگ و باس چیە ؟ ئوم خلادیش ( رضي الله عنه ) فەرمووی : سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەوە سوپاس بۆ پەروەردگار سەلامەتە ، و لە دوای ئەویش هەرچی کارەسات هەیە ئاسانە ، وە خوای گەورە لە موسڵمانان چەند شەهیدێکی بردەوە بۆلای خۆی ، عائشەیش(رضي الله عنه) فەرمووی : ئەمانە کێن ؟ ( هەواڵی لە شەهیدەکان پرسی ) وتی : براکەم و کوڕەکەم ( خلاد ) و هاوسەرەکەم عەمری کوڕ جموح )ن ، عائشە فەرمووی : ئەی بۆ کوێیان ئەبیت ؟ وتی : بۆ مەدینە و لەوێ سپاردەیان ئەکەم ، پاشان وشترەکە گیر بوو ، نەیتوانی بەردەوام بێ لەرێ کردندا ، کەچی کاتێ ڕووی حوشترەکەی وەرگێڕا بەرەو و مەیدانی جەنگەکە حوشترەکە بەپەلە ڕۆیشت ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ مایەوە تا شەهیدەکانی سپاردە کرد ، و پاشان فەرمووی : (ترافقوا في الجنة : عمر و ابن الجموح و ابنك خلاد ، و اخوك عبدالله ) واتە : هەرسێکیان عەمری کوڕی جموع و کوڕەکەت ( خلاد ) و ( عبدالله ) ی برایشت لەبەهەشت پێکەوەن ..

ئوم خلادیش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) داوا لە پەروەردگار بکە منیش بکاتە هاوەڵی ئەوان ، ئەویش دوعای بۆ فەرموو .. بەو ئەندازەیە ، بە پێوەری هەست کردن بە بەرپرسیارێتی و بەرگە گرتنی دەرئەنجامەکانی ، ئافرەتی خەباتکار ئارامی لەسەر ئەم هەڵوێست و میحنەتە گەورەیە گرتووە ، وە بووەتە نیشانێك لە نیشانەکانی هێز ، و لە ئاستی بەرپرسیارێتی ئیمان دا بوو بەو ئارامگری یە و بەو بەیانە جوانەی وێنەی ئەو ( تحدی ) ئیسلامی یەی نیشانی دوژمندا کە بووە دڕکێك لە گەروویاندا

---

[١] – باسی ژیانیمان لە بەشی پیاوانی دەوری پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) کرد .

تـاوەکو وانـەزانن بـەو سـەرکەوتنە چـاوەر واننـەکراو و ڕفێنـەرەیان موسـڵمانانیان لـەناو بردووە ...

خوێنەری بەڕێز لە بەهێزی ورد بەوە ، لە جوانی ئـەم دەربڕینـەی کە دەفـەرموێ : ( أما رسول الله فصالح ) سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەو سەلامەتە ...

جا چ سەلامەتی یەك هەیە بۆ ئوممەت بە بێ سەلامەتی سـەرکردەیەکی بە ئیمـانی بەهێز ، کە ئوممەتێکی لەگەڵ بێت لە کاتی نەهات و دژواریدا بەو وێنەیە پشتی بگرن .

کاتێ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) موژدەی ئەوەی پێ دەدات کە شەهیدەکانی لە بەهەشتدان ، سۆز و شەوقی دەبزوێ بۆ هاوڕێیەتی یان لە بەهەشتدا ، وەك چۆن لەمەیدانی جەنگدا لە گەڵیاندا بوو .

بەڕاسـتی هـەر نەتەوەیـەك ئـەم بـاوەڕە پتـەوەی هـەبێت و ئـەم بڕیـارەی دئـەبوت .. هەرگیز نامرێت [1] . وە بە ژیانی ئەم هاوەڵە چاکەخوازە ، کتێبەکەمان تەواو دەبێت .

" والحَمدُلله ألَذي بِنعمَةِ تَتم الصالِحات "

[1] – نحو اسره بلا مشكل د . محمود عماره ( ١٩٥ – ١٩٩ ) بەدەستکارییەوە .

# " کۆتایی "

پاش ئەم کایە پیرۆزە ..

لەگەڵ پێشنەی پیاوچاکانی ئوممەت و هەڵبژێراوان .. وامان بینی کە : –

" خوای پەروەردگار بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ، لە مرۆڤەکان بەڕێزترین نەژاد و لایقترین فیکر و بۆچوون و پاکترین و بە تواناترینیانی هەڵبژاردووە ، و لە ناو ژینگەیەکدا پەروەردەی کردوون کە بە گەورە پیاوان دەورەدراوە ، بەو جۆرە بڵاوبوونەوەی بانگەوازی ئاینی لە پیاوانێکەوە کە ئەوە پلەو پایەیان بێت .. شتێکە لە جێی خۆیدایە ، چونکە کاری گەورە هاوتای گەورە پیاوان و نافرەتانی مەزنە ...

وە ناساندنی خوای پەروەردگار بە خەڵکی و ڕێنیشاندانیان بۆ سەر ڕێگای ڕاست و کردنەوەی گرێ دەروونی و کۆمەڵایەتی یەکانیان لە شەریعەتی خوادا ، هەموو ئەمانە پێویستیان بە کەسانی شایستە هەیە ، بە بەهرە و ئەهلیەت نەك بە قسە .. لەبەر ئەوەیە ابن مسعود دەڵێت : ( خەڵکی حاڵیان باشە مادەم زانست لە گەورەکانیان وەرگرن ، خۆ ئەگەر لە بچوکەکانیان و پیاو خراپەکانیان زانست وەرگرن .. تیا دەچن )

مەبەست لە گەورەکان ئەوانەنین کە خاوەنی لاشەیەکی زل و خاوەن سامانێکی زۆر و پیشەو کارێکی سامناك بن ..

بەڵکو گەورەکان لە دیدی ئیبنو مسعوددا ئەوانەن کە خاوەنی هیمەتێکی بێ سنوور و مافدۆستێکی بالاّ و عیفەتێکی دیار و بەرچاو ڕوونیەکی ڕاست و دڵێکی پاکن ... بۆی هەیە لە پێشەوایان بن بۆی هەیە لەوان نەبن ، وە بۆی هەیە دەوڵەمەندبن ، بۆیشی هەیە نەداربن .. وە ئەوانە پارە و پێگەشتێکی تێپەڕ بووە لەلایان و هەرگیز توخنی بەها تایبەتەکانیان ناکەوێت و بە هیچ شێوەیەك شوێن لەسەریان دانانێت [1] .

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەو جۆرە بیریان کردوەتەوە ، وە حاڵی ئەم ئوممەتەش باش نابێت بەوە نەبێت کە حاڵی پێشینەکانی باش کردووە . خوای پەروەردگار یارمەتیمان بدات بۆ شوێن کەوتنیان و لە خراپەی (داهێنان – ابتداع ) بمانپارێزێت ...

﴿ ... وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنْ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾

سعد یوسف محمود ابو عزیز

ذوالعقدة ١٤١٩ کۆچی ، مارس ١٩٩٩ م .

وەرگێڕ : ١١ / نیسان / ٢٠٠٨ زایینی

---

[1] – ( معركة الضعف في العلم الاسلامي ) ( ١٢١ ، ١٢٢ ) .

((پێڕست))

بەشی دووەم